تصوير ابو عبدالرحمن الكردي

دیوانی

# شێخ نووری شێخساڵح

بەرگی یەکەم



ئازاد عەبدولواحید

کۆی کردووەتەوە و ساغی کردووەتەوە و

لەسەری نووسیوە

دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی



زنجیرەی ڕۆشنبیری

*

**خاوەنی ئیمتیاز: شەوکەت شێخ یەزدین**

**سەرنووسیار: بەدران ئەحمەد حەبیب**

* * *

ناونیشان:

دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، شەقامی گوڵان، هەولێر

## دیوانی

# شێخ نووری شێخ ساڵح

چاپی دووەمی بژارکراو

بەرگی یەکەم

**ئازاد عەبدولواحید**

کۆی کردووەتەوە و ساغی کردووەتەوە و

لەسەری نووسیوە

ناو کتێب: دیوانی شێخ نووری شێخ ساڵح - بەرگی یەکەم
کۆکردنەوە و ساغکردنەوە و لەسەر نووسینی: ئازاد عەبدولواحید
بلاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٦٩٠
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل + تریسکە ئەحمەد حەمید
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: ئاراس ئەکرەم
بەرگ: مەریەم موتەقییان
چاپی دووەم، هەولێر- ٢٠٠٨
لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (٥٥)ی ساڵی ٢٠٠٨ی دراوەتێ



شێخ نووری شێخ ساڵح
لە ساڵانی چلەکاندا

# لە بارەی چاپی دووەمی ئەم دیوانەوە

زۆر بەهەڵە دادەچین ئەگەر وا تێبگەین پرۆژەی نوێبوونەوەی شیعری کوردی لە سەرەتای سەدەی بیستەم، یا ڕاستتر وایە بڵێین لە بیستەکانی سەدەی بیستەمەوە سەری هەڵدابێ، یان وا بزانین نوێخوازی لەو کاتەوە دەستی پێ کردووە کە بەکێشی هیجایی - برگەیی شیعر نووسراوە، چونکە چەمکی نوێبوونەوە بەتەنیا چەمکێکی تەکنیکی نییە، بەڵکو پرۆسەیەکە زۆر لەوە قووڵتر و هەمەلایەنترە. نوێخوازی بەلای منەوە دوو کاری بنەڕەتییە و لەسەر دوو کۆڵەگە ڕاوەستاوە:

**یەکەم:** ئەو چەمکەیە کە دەڵێ شیعر، یان هەر کارێکی هونەری دیکە بنیادێکە، بەشێوەیەکی توندوتۆڵ و ئۆرگانیک پێکەوە نووساون، واتە بریتی نییە لە کۆمەڵە ڕەگەزێکی جیا و بەتەنیشت یەکەوە ڕیزکراو، تا بتوانین وا بەئاسانی لە یەکتریان جیا بکەینەوە و لێکیان دابڕین، کە ئەم دیاردەیە زۆر بەزەقی لە شیعری کلاسیکی کوردیماندا بەدی دەکرێ.

**دووەم:** یاخیبوون لەسەر هەر داوونەریتێکی شیعری کە دەبێتە کۆسپ لە بەردەم شاعیرەکە و شێوەی دەربڕینەکەی، بەشێوەیەکی ئەوتۆ کە ببێتە دەربڕینێکی ڕاستگۆیانە لە ئەزموون و سەردەمەکەی خۆی.

کاتێک بەو پێودانگە لە چەمکی نوێخوازی تێدەگەین، ئەوساکە دەتوانین بێجگە لە (گۆران) سەنگ و قورسایی و ئیعتیبار بۆ پێشەنگەکانی دیکەش بگێڕینەوە کە لەو پرۆژەیەی نوێخوازیدا بەشداربوون، بەنەسلەکەی پێش خۆیان و دوای خۆشیانەوە. هەر ئەو کاتە نموونەگەلێک لە شیعری نوێخوازانەی ئەو شاعیرانەدا دەبینین وەک ڕەحیم ڕەحمی هەکاری و پیرەمێرد و ڕەشید نەجیب و عەبدولڕەحمان بەگی نفووس و ڕەفیق حیلمی و هەندێ شیعری ڕۆمانسییانەی دیکە کە لە نێوانی ئەو دوو جەنگەدا نووسراون، بەڵام گرنگ لێرەدا سووربوونی شێخ نووری و گۆرانە لەسەر پرۆژەی نوێخوازییەکەی خۆیان کە بەباوەڕ و متمانە بەخۆوەبوونەوە لە ناو ئەو ڕێبازە نوێییەدا کاریان بۆ کردووە؛ هەر ئەمەش ڕاڕایی و دوودڵی لە لای شاعیرانی دیکەی پاش ئەوان ڕەواندووەتەوە، بۆ ئەوەی زیاتر ڕەگوڕیشەی نوێخوازی دابکوترێ، ئەمەش بڕیاردان لە بارەی شاعیرایەتی شێخ نووری نییە، ئەوەندەی کارێکە پێوەندی بەڕەخنەگران و مێژوونووسانی ئەدەبەوە هەیە، لەم ڕووەوە

ئەوانەی خاوەنی ئینسافن هەرگیز ناتوانن گرنگی ڕۆڵی شێخ نووری لە پرۆسەی نوێکردنەوە و دامەزراندن و پەرەپێدانی شیعری نوێخوازانە لە ئەدەبی کوردیدا پشتگوێ بخەن.

***

شێخ نووری بەهۆی زانینی زمانی تورکی و فارسی و عەرەبی، بەتایبەتیش لە پەنای زانینی زمانی تورکی و فارسی شنە بای شیعرە ڕۆمانتیکییەکانی هەڵی کرد و لەو پەنجەرە کراوەیەوە هاتە ناو ئەدەبی کوردییەوە و ڕەنگ و ڕووی ئەوە لە ناو زۆر لە شیعرەکانی بەدەرکەوتن، بۆیە هەر ڕۆشنبیرییەک ئەگەر ئەوەی لە دەرەوەی خۆی ڕوو دەدات، پشتگوێی بخات، ئەوە هەر زوو دەبێتە ڕۆشنبیرییەکی داخراو و بەرەو پووچانەوە و دەست بەتاڵی دەڕوات.

زۆر کەس گلەیی ئەوە لە شێخ نووری دەکەن گوایە تا دوا هەناسەی ژیانی دەستبەرداری قافیە نەبووە، لە کاتێکدا سەرەتای شیعری شێخ نووری و لوتکەی بەخششی شیعری بەبەراورد لەگەڵ شاعیرانی دەر و دراوسێ زۆر لێکترەوە نزیکن، بۆ نموونە یەکەم کاری نیما تا ئەوپەڕی سنوور بەکارێکی لاساییکەرەوە دادەنرێ کە لە قالبی مەسنەوی داڕشتووە، لە ژێر ناونیشانی (چیرۆکێکی ڕەنگ زەرد) کە لە ساڵی ١٩٢١دا نووسیویەتی، ئەم شیعرە لە لایەنی هونەرییەوە لە ڕیزی پاشماوەی شێوازی تەقلیدی دادەنرێ، بەڵام لە ناوەڕۆکدا دەچێتە ژێر کاریگەریی شیعری ئەورووپاییەوە، بگرە بەتۆمارێک دەزانرێ بۆ زۆربەی ئەو ناوەڕۆکانەی کە لە ناو شیعری ئەورووپایی هاوچەرخدا باون، هەر لە گۆرانی وتن بۆ ژیانی ئازادی و بێزاری لە دەست ژیانی شار و ئاهو حەسرەت هەڵکێشان بۆ خۆشەویستییەکی بەئاکام نەگەیشتوو، یان خۆشەویستییەکی ون بوو، تا دەربڕینی ئاوات و خواستی لاوێک و خەونەکانی. هەرچەندە ئەو قۆناغەی شیعرەکانی فۆرمێکی زیهنی تێدا بەدی ناکرێ، کە یەکێتی شیعری تێدا بێ، واتە کێش و وێنە و زمان و بابەتەکە بەیەک ئاراستەدا کاریگەری هەبێ، بەڵام شیعری (ئەفسانە) بەسەرەتای ڕاستەقینەی ئەو دادەنێن، هەروەک چۆن بە(پاڵتۆی گۆگۆل)ی شیعری فارسی ئازادی دەژمێرن، کە دوورکەوتنەوە لە شاعیرە تەقلیدییەکانی فارس بە ڕوونی بەسەرییەوە دیارە و شاعیر بەڕاشکاوی تێیدا ڕەخنەی لە حافزی شیرازی گرتووە، شیعرەکەش بایۆگرافیایەکی درێژە کە بریتییە لە سەد و بیست و شەش بڕگە و تێیدا هەر بڕگەیەک لە پێنج نیوە دێڕ پێکدێ کە شاعیر لەو شیعرەیدا دەستی بەقافیەوە گرتووە و وەک دوا

ڕواڵەتی خۆپارێزی لە لای ماوەتەوە، بەڵام هەرچی لایەنی عەرووزی تەقلیدییە، ئەوە دەستی لێ هەڵگرتووە، پاشان بەیتی شیعر لە لای ئەو وەک خۆی ماوەتەوە، بەڵام وەک یەکێتی مانا نەماوەتەوە. ئەو قسانەی لێرەدا سەبارەت بەنیما یۆشیج کراون زۆر لە هەنگاوەکانی شێخ نووری نزیکمان دەخەنەوە، کە ڕاستە لە شیعرەکانیدا وەک ڕواڵەتێک دەستبەرداری قافیە نەبووە، بەڵام عەرووزی دەسکاری کردووە، لەم هەنگاوی نوێکردنەوەیەیدا کێشی عەرووز و کێشی هیجایی تێکەڵ بەیەکتر کردووە.

***

بێگومان شێخ نووری یەکێکە لەو کەسانەی کە ڕەوشت و خوو و خەسڵەتی، پلە و پایەی کۆمەڵایەتی، لایەنی مرۆڤانەی، فرە بەهرەییبیەکەی دەیکەنە یەکێک لەوانەی بڵێین بەڕاستی ئەو پیاوە بۆ شیعر و ئەدەب زاوە، ئەگەر هەلومەرجی لەبارتر لە ژیانی کەسی ئەودا هەبوایە، ئەوە ئەو بەهرانەی زۆر گەورەتر و درەوشاوەتر دەردەکەوتن، چونکە سەرەڕای ئەو فرە بەهرەییبیەی، ئەو توانایی و هێزە خۆڕسک و سروشتییەی لەودا بووە، هەر خۆشی پیاوێکی جگەرسۆزی میللەت و وڵاتپارێزیش بووە، ئەو هەمیشە هەستی بەمەزڵوومییەتی میللەتی خۆی کردووە، بۆیە وەک دڵسۆزێکی خەمخۆر بۆ میللەتێکی بێ پشتیوان و بێ کەس و دواکەوتوو لە هەموو شتێکی ئەو دنیایە، هەوڵی داوە و تێکۆشاوە و بەهرە و توانایی خۆی لە زۆر بواری جۆراوجۆردا تاقی کردووەتەوە، نەک ئەوەی کردوویەتی هەر بەتەنیا لە بواری تاقیکردنەوەدا بمێنێ، بگرە ویستوویەتی ئەو ئەرک و کارەی ڕایدەپەڕێنێ جێ دەستی تێدا دیار بێت و وەک شوێن پێ هەڵگرێکی چاکی سەردەمی خۆی حەزی کردووە لە زۆر بواردا کەموکوڕییەک، بۆشاییبیەک پڕ بکاتەوە و ڕچە و دەق و مۆرەکەی بشکێنێ و بیسەلمێنێ کە میللەتی ئەو هیچی لە میللەتانی دیکە کەمتر نییە، بۆیە دەتوانین بڵێین لێهاتووانە بۆ ئەو بوارانە هاتووەتە مەیدان، ئەویش لە پاڵ بەهرەی شاعیرێتی، ڕۆژنامەنووسیی، وەرگێڕان، پیەس و ئۆپەرێت نووسین، ڕەخنەگری، وتارنووسین، دەنگخۆشی، دەرکەوتووە و وەک ئاڵا هەڵگرێکی (بیری نوێ) لە کوردستان حیسابی بۆ دەکرێ، کە بۆ هەموو ئەو بوارانە چی لە دەست هاتبێ درێغی نەکردووە، لە پێناوی گەیشتنەوەی نەتەوەکەی بەئاستی کاروانی پێشکەوتووی میللەتانی پێشکەوتوو و بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی نوێخوازانە و پێشکەوتنخوازانە تا ئێمەش وەک ئەو میللەتانە لە ڕەوتی شارستانیەت دوا نەکەوین.

***

لە ڕاستیدا باسکار و لێتوێژەوەی کورد باسی ئەو قۆناغە هەستیارە بکات کە شێخ نووری شێخ سالح-ی تێدا ژیاوە و کاری کردووە، ناکرێ خۆی لە کەسایەتییەکی گرنگی وەک ئەو ببوێرێ، چونکە کار و بەخشش و بەرهەمەکانی دەتوانم بڵێم لەگەڵ دەستاوێژەکانی ئەو سەردەمە تەواوکەری یەکترین، من وەک کەسێک کە بایەخم بەشیعری نوێ و شاعیرە نوێخوازەکانێ دەدا نەدەکرا بۆ گەڕان بەدوای بەرپاکەر و دامەزرێنەری سەرەتا و ڕەگوڕیشاڵەکانی ئەو بزاڤە نوێخوازانەیە ئاوڕی جیددییانە لە بەرهەم و شیعری شێخ نووری نەدەمەوە، بۆیە لەو تافی گەنجێتییەمدا کەوتمە کنە و پشکنین و گەڕان و سەر و سۆراخکردنی بەرهەمی ئەو شاعیرە، بەمەش کاتێکی زێڕین و گرنگی ژیانی لاوێتیم بۆ ئەو شاعیرە تەرخان کرد کە دەتوانم بڵێم تا ڕۆژی گەیاندنی پرۆژەکەم بەچاپخانە لە لای من بووبووە (کێشە) و (مەسەلەیەک)، ئەو پرۆژەیەش بەو پەرشوبڵاوی و پچڕ پچڕی و ڕووناککردنەوەی سەردەم و شیعرەکان نزیکەی (٥ - ٦) ساڵی لە تەمەنی جوانی لاوی من برد، کە لەو کاتانەدا بەو هێز و توانایییەوە بۆ هەر کارێک، ئامانجێک تەرخانم بکردایە، زۆر بەرەو پێشی دەبردم و دەستکەوت و داهاتی زۆریشی دەستم دەخست، بەڵام من هەمیشە لە نووسینی خۆمدا کردوومە بەعادەت ڕێگای ڕاستگۆیانەی پڕ زەحمەت و مەینەتی و پڕ دڕک و داڵ و کێشەم هەڵبژاردووە، کە ئەوەش هەمیشە تووشی سەریەشە و بگرە و بەردە و زەرەر و زیانی ماددی و مەعنەوی کردووم. بۆ ئەم قسانەشم هاوڕێ و برادەرە نزیکەکانم ئاگادارن و شایەدی ئەوەم بۆ دەدەن، منیش ئێستا نەک هەر لەو کارانەم پەشیمان نیم، بگرە ئەگەر جارێکی دیکەش تێهەڵبچمەوە هەر ئەو ڕێگا سەختانە بۆ ڕێبازی نووسینی خۆم دەگرمە بەر، با سەرانە و باجی زۆرتریشی لێم بوێت.

***

ئاخر لەو سەردەمەدا کێ سەر و ملی خۆی لەو چەقۆیە دەسوی شێخ نووری-یەک کە وەک یەکێک لە ئەندامە بەڕێزەکانی خانەوادە سەربەرزەکەی بەمنی وت ئاگامان لێیە سەبارەت بەو کارەی گرتووەتە دەست چ حەشر و پەتپەتێنێکت پێ دەکرێ، تۆش وەک ئێمە و بنەماڵەکەمان بەر نەفرەتی فیرعەونەکان کەوتووی. هۆیەکەشی ئەو زمان بەدانە بوون کە لە هەموو سەردەمێکدا ئاشیان دەگەڕێ و بەناز پەروەردەکراوی هەموو ڕۆژگار و دەسەڵات و بارودۆخێکن، ئەوساکەش لە ژێرەوە لەگەڵ دەسەڵات و شەیتان دەستیان تێکەڵ کردبوو و فاوستیانە هەڵسوکەوتیان دەکرد، لە سەرەوە ڕۆڵی فریشتەیان دەگێڕا، لە ژێرەوەش هەموو کار و کردەوەیەکی ئێمەومانانیان بۆ ڕژێم تەفسیر دەکرد، تەنانەت وەک لە کاتی

(لێکۆڵینەوە) لە دائیرەی ئەمنە سوورەکە پێیان وتم دەزانین تۆ چای زەرد، یان بەرەنگ دەخۆیتەوە، بەڵێ ئەو کاتانە کە ئەو بنەماڵەیە لە لایەن ئەوانەوە بەگەورەترین (مخرب - تێکدەر) لە قەڵەم درابوون، منیش خەریکی ساغکردنەوە و کۆکردنەوەی ئەو بەرهەمە بووم، بۆیە پریشکێکی زۆری ئەو ئاگرەی ئەوانی پێ دەسووتا بەر من و ماڵ و منداڵم کەوت و لە هێنان و بردن و سەر و دڵ گرتن و هەڕەشە و تەنانەت قوتکردنەوەی کتێبێک و بەچاپ گەیاندنی لە لایەن کەسێک کە نەک هەر پێوەندی بەدنیای پاک و بێ گەردی نووسینەوە نەبوو، بگرە لە کاتی خۆیدا جەللادێکی بەناو و دەنگی هەیئەی کەرکووکیش بوو، ئەمانە هەمووی تەنیا بۆ ئاستەنگ دروستکردن بوون بۆ من و بۆ دەرنەچوون، یان شێواندن و دروستکردنی غەڵبە غەڵب و هەرا و ئاژاوەیەک بوو لە دەوروبەری کتێبەکەم، تا چاپ نەکرێت یان لە بایەخ و گرنگییەکەی کەم بکرێتەوە. تەنانەت قسەی وایان دەکرد کە هیچ کوردێک زەڕەیەک کوردبوون لە گیانیدا هەبووبێ، ڕووی نەهاتووە بیکا وەک ئەوەی من خەڵکی ئەو شارە نیم بۆچی هاتووم خۆم بەشیعر و ژیانی شێخ نووری-یەوە خەریک کردووە؟ بەڵام من وەک تەحەداکردن لە بەیاننامەیەکدا کە بەسەد دانە چاپ و بڵاوم کردەوە باسی دزینی کتێبەکەم کرد و لە داهاتووشدا زیاتر لەمەڕ چەوسانەوەی ئەو کتێبە و شێوەی چاپکردن و قەرزەکانی کەوتە ئەستۆم و پاشقوڵ گرتنەکان بەدووررودرێژی دەنووسم و خەڵکانێکی زۆریش شوکر ماون و لەو کێشانەی بۆیان نامەوە ئاگادارن، زۆر نووسەر و باسکاری لاوازی کوردیش هەبوون، ئەو کتێبە دزراوەیان دەکردە سەرچاوەی نووسین و باسەکانیان، وەک مەراییکردن و مامە حەمەیی بۆ خاوەنەکەی تا بکەونە بەر ڕەحمەتی بەخشندەیی ئەوەوە. ئەوەی کە جێی ئەسەفی گەورەش بوو لە پاش ڕاپەڕین هەر ئەو کەسانە بوونە قارەمانی یەکەمی سەر گۆڕەپانەکە و هەر ئەوانیش بوون جارێکی دی وەک نە بایان دیبێ و نە بۆران، کەوتنەوە دابەشکردنی ناسنامەی نیشتمانپەروەریتی بەسەر ئەم و ئەودا.

***

چاپی یەکەمی ئەم کتێبە وەک پێشتر باسم کرد تووشی گێرمە و کێشەی زۆری کردم، ئەمە چ لە لایەن نووسەران و ئەدیبانی کوردەوە بووبێ، یان لە لایەن داوودەزگای ڕۆشنبیری و سیاسی ئەو سەردەمەوە بێ، ئەمە باسێکە لە دەرفەتێکی نزیکدا بەتێروتەسەلی لێی دەدوێم. ئەوەی باسم کرد چەند ئاماژەیەکی خێران کە پێویست بوو خۆمی لێ نەبوێرم و بەسەرپێییش بێ باسێکی لێوە بکەم، بۆیە چاپی یەکەمی ئەو دوو

بەرگـەی بڵاوکـرایەوە زۆر بەنارێکی و بەناشـیـرینی لە چاپ دران، سـەرەڕای ڕوودانی هەڵەیەکی ئێـجگار زۆر کـە هەندێکیـانم لێ دەسـتنیـشـان کـرد و لە کـاتی خۆیدا بڵاوم کردنەوە، بەڵام زۆریش لەوە زیاتر مابوون کە پەنجەم بۆیان ڕانەکێشابوو، ئەم هەڵە هونەری و چاپییانە و ئەو بڕ و بیانوو و کێشە و بەرەیەی بۆ چاپی کتێبەکە و بۆ من دروست کران، سەرەڕای قـەرزێکی زۆر کە کـەوتە سەر شـانم لە ئەنجامی سووربوونمەوە بۆ لە چاپدانی و زۆری ئەم هەموو سەفەرانەی کردمن تا لە دەمی حەزیای سانسۆر ڕزگارم کرد و پاشان ئەو تەگـەرانەی لەوێ ڕووبەڕووم کـرانەوە بەلابردنی بەشـێکی زۆری شـیـعـرەکـان و لاپەڕەیەکی زۆری نووسـینەکـەم، سووربوون و پێداگـری منیش بۆ ئەوەی کـار و پرۆژەکـەم بەکـامـڵی و بەتەواوی دەربچێ و پاشـان بۆ ڕوونەدانی هەڵەی چاپ لە سلێـمـانییـەوە بەدەیان سـەفـەری بەغـدام کـرد، بەڵام ئەنجـام کـارەکـە هەر بەخـواسـتی من هەڵنەسووڕا، لە پاشـان ئەوانەی چاویان بەکارەکە هەڵنەدەهات ئەو هەڵە چاپییانەشیان لەسەرمان کرد بەماڵ و بەکەموکوڕی بۆیان حـیـسـاب کـردین، هەرچەندە ئەوانە چەند دەنگ و نووزەیەکی بچـووک و سنووردار بوون کە لە بەرانبەر دەنگی دڵسۆزان و ڕووناکبیران و نووسەرانی خاوەن ئینسـاف و ویژدان و کەسایەتی خـۆی بەپێـوە ڕانەدەگرت، چونکە هـیـچ نەبێ ئەو کـەرەسـتـەیەی من تـا ئێـسـتـا بووەتە کـەرەسـتـەی سـەرەکی بۆ وەرگـرتنی دوو نامـەی دکـتـۆرا لە بارەی ئەو شـاعـیـرەوە، هەروەها ناوی ئەو شاعـیرە کـەوتەوە سیاقی مێژوویی خۆی و لە شوێنی شیـاوی خۆی دانرا و سـاڵانـە یاد دەکـرایەوە و تەنانەت مـامـۆسـتـایەکی وەک د. مـارف خـەزنەدار وەک سەرپەرشتیکاری تێزی خوێندنی باڵا ناوی لە کتێبەکەم نا ئینسیکلۆپیدیای شێخ نووری و کـتێـبی سەر مێز، واتە نابێ بخرێتە ناو کـتێـبخـانەوە و زۆر سـتـایشـی تر کە زیاتر بوونە مـایەی دڵخـۆشـبـوونی مـن و زۆر لەو دەردەسەری و ئازار و پاشـقـوڵ لێگرتن و هیـلاکی و ماندوویێتییەی لە بیرم بردەوە.

***

من کـە بۆ چاپی دووەم خـۆم گـورج کـردەوە بەمـەبەسـتی سـەرلەنوێ لە چاپدانەوەی ئەم دیوانە، زۆر حەزم دەکرد سەرلەنوێ بکەومەوە کارکردن لەسەر پرۆژەکە و فراوانتری بکەم، پاشـان کـە سـەیرم کـرد، دەسکاری نەکـردنی جـوانتـر و چاکـتـرە، چونکە ئەوەی لە هەشتایەکاندا چاپ کراوە وەک پرۆژەیەکی ئەدەبی و بەیاننامەیەکی سیاسی - ڕووناکبیری خراوەتە ڕوو، من لە ئێـسـتادا تەنیا بەوەندە وازم لێ هێنا کە هەڵەبڕی بکەم و لە ڕووی زمـان و کەمـوکـوڕی هونەری و هەڵەی چاپەوە بنبـڕ بکرێ، هەروەها ئەوەی لە بارەی ئەو

شاعیرەوە نووسراوە بیانخەمە ناو بیبلیۆگرافیایەکەوە و ئەوی تریش پێم چاکتر بوو وەک نووسینی قۆناغێکی ئەدەبی خۆم دەسکاری نەکەم و وەک خۆی بەجێی بهێڵم، لەو ماوەیەشدا کە نزیکەی بیست و ئەوەندە ساڵ بەسەر چاپی یەکەمیدا تێپەڕیوە و لەبەرئەوەش کە ماوەیەکی زۆر دوورودرێژە لە شاری سلێمانی دوورکەوتوومەتەوە، بێجگە لەوەی ئەوساکە لە بەرهەمەکانی شاعیر بەدەستم هێنابوو، هیچی ترم وەگیر نەکەوت و کەس لە هیچ لایەکەوە شتێکی بڵاو نەکردەوە، شیعرێک یان بیروڕایەکی نوێی لەوانەی من زیاتری پێ بێ، بۆیە ئەم چاپەش وەک خۆی هێڵرایەوە، تەنیا لایەنی هونەری و تەکنیکی نەبێ، بڕیاریشم دا هەر بۆچوونێک و باس و بابەتێکی دیکەم هەبێ لە دوو توێی کتێب و نووسینی جیاواز و تایبەتدا بەجودا چاپ و بڵاویان دەکەمەوە، ئەوە سەرەڕای ئەوەش کە ئەو قەناعەتەی ئەوساکە بەرانبەر بەشاعیریەتی و بەهرە و کەسایەتی شێخ نووری هەمبوو، ئێستاش هەر هەمان قەناعەت و بڕیار و بۆچوونم لە بارەیەوە هەیە و لێرەدا پێم وایە هەر شتێ بنووسم و بڵێم شتێکی نوێ و جیاواز نابێ لەوە زیاتر کە لەوێدا وتوومە، بەڵام بەداخەوە ئێستاش هەندێ کەس هەن، لەسەر قەوانی ئایدیۆلۆژیانەی کۆنکریتیانەی خۆیان بەردەوامن و پێیان وایە وەزیفە دیتن و کارکردنی شێخ نووری لە وەزیفەدا بەهرەی شاعیرێتی تێدا کوشتووە، وەک بڵێی هەرچی نووسەر و شاعیری ئەوسا و ئێستا هەیە هەموویان خۆیان تەنیا بۆ نووسین و شیعر تەرخان کردبێ و نان و بژێوی ژیانیان بەشیعر و نووسین مەیسەر کردبێ، تەنیا ئەوە شێخ نووری-یە کە وەزیفە دەستی ناوەتە بینە قاقای و بەهرەکەی لاواز کردووە و کوشتوویەتی، بەحیساب ئەو قسانە لە نیەت پاکی و لە دڵسۆزی و خەمخۆرییەوە بۆ شێخ نووری دەکرێن، وەک بڵێی وەزیفە پەکی خستبێ و لە داهێنان و نوێبوونەوە دووری خستبێتەوە و لە پەلوپۆی خستبێ و بەقسەی ئەوان دەبوایە شێخ نووری تەنیا خۆی بۆ نووسینی شیعر و ئەدەب تەرخان بکردایە و بۆ شیعر بژیایە چاکتر بوو!

دۆست و ئاشنای دێرینم کاک عەلی بەگی حوسێن بەگی جاف کە هاوڕێیەتی لەگەڵ مامۆستا گۆران-دا هەبووە و لە ئاشتیخوازانیشدا لە ساڵانی ١٩٥٨ بەدواوە هەر پێکەوە کاریان کردووە و لەگەڵی بووە بۆی گێڕامەوە: جارێکیان بەمامۆستا گۆرانم گوت لە دەستم بهاتایە ژیان و بژێویتم بۆ دابین دەکرد بۆ ئەوەی دەستت بەتاڵ بوایە خۆت بۆ شیعر نووسین تەرخان بکردایە و تەنیا خەریکی سەفەر و گەشتکردن بویتایە، تا دەیان شتی دیکەی وەک گەشتەکەی هەورامان و قەرەداغت بنووسیایە. منیش پێم وت ئنجا کاک عەلی کێ

دەڵێ مامۆستا گۆران ژیانی مسۆگەر بوایە و بژێوی ژیانی بۆ دابین بکرایە دەیتوانی شیعری جوان بنووسێ و لە شیعر نووسینی جوان نەدەچووەوە؟

***

بەراوردکردنی شاعیرێکی کورد لەگەڵ شاعیرێکی دیکەی کورد کارێکی نەشیاو و نەگونجاوە و ناکرێ دوو شاعیری یەک نەتەوە بەیەکتر بەراورد بکرێن و بەباڵای یەکترییان ببڕین، چونکە ئەدەبی بەراوردکردن بەهەردوو قوتابخانەی فەرەنسی و ئەمریکیشەوە هەلومەرجی تایبەتی خۆیان هەیە و ئەو جۆرە بەراوردە هەڵانەی ئێمە لەگەڵ پرەنسیپەکانی ئەدەبی بەراوردکاری یەک ناگرنەوە، بۆیە وەک چۆن ناکرێ (کامەران) و (دیلان) پێکەوە بەراورد بکەین، هەر بەو جۆرەش ناکرێ (شێخ نووری) و (گۆران) لەگەڵ یەکتری بەراورد بکرێن، چونکە ئەو دوو شاعیرە کە پێکەوە دەیانڕوانییە یەک کلاوڕۆژنە، من بەتەواوکاری یەکترییان دەزانم، بۆ تۆخ کردن و قەتمەرکردنی سیمایەکانی شیعری نوێخوازانەی قۆناغێک، چونکە ڕاستە هەریەکەیان تایبەتمەندی و جیاوازی هونەری و شیعری و ژیان و گوزەرانی خۆیان هەیە، هەردووکیشیان لە پێناوی یەک ئامانجدا کاریان کردووە کە دامەزراندن و ڕیشە داکوتانی دیاردەی نوێخوازییە لە ناو شیعری کوردیدا.

***

پێشتر وتمان شێخ نووری فەرمانبەرێ نەبووە لەسەر تەختی شاهانەی شیعری نوێ دانرابێ، چونکە پرۆسەی نوێبوونەوە بەشەو و ڕۆژێ پێ ناگات و سەر هەڵنادا، بەڵکو ڕێگە بۆ خۆشکردن و ماوە و پشووی دەوێ تا ئەو تێڕوانینە نوێخوازانەیە و کەرەستەکانی دەربڕینی پێ دەگات، ئەمەش هەلومەرجی تایبەتی و بارودۆخی ژیانی سەردەم و قۆناغەکەی دەوێ، وەک چۆن هەلومەرجی پێگەیینی کەرەستەی دەربڕین و ڕەخسانی هەلومەرجی خۆیی شاعیرەکەی دەوێ، بەڵام هەردوو هۆیە خۆیی و مەوزووعییەکە بۆ شاعیرێکی وەک شێخ نووری ڕەخساوە تا بتوانێ بەپیر ئەو داوایەی مێژوو و حەتمیەتی مێژووەوە بچێ و لەگەڵ ڕووداو و پێشهاتەکانی سەردەم و ڕووداوەکانی، شان بەشان لەگەڵ ڕیتمی سەردەمەکە بڕوات.

شێخ نووری لەگەڵ هەڵایسانی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازانەی نیشتمانی و بەرپابوونی ڕاپەڕین و شۆڕشەکان لە دژی داگیرکەران دەستی دایە نوێبوونەوە و هاتە مەیدانی نوێخوازییەوە، چونکە هۆشیاری کۆمەڵایەتی و سیاسی و ڕووناکبیری گونجاوی پێ بوو،

خۆشی وەک ئازادیخوازێک چاوی بڕیبووە ئازادی و لە ئاسۆی دەروانی و لە بواری کاری کۆمەڵایەتیش دوانەکەوتبوو، ئەمانە هەموویان لە پاڵ هۆیە گرنگەکانی دیکەی دەستی کە تویشووی ڕۆشنبیری هاوچەرخ بوو، دابونەریتی شیعری پێ گۆڕی و چیتر نەیتوانی بەرانبەر بەو گۆڕانکاریانە دۆش دابمێنێ و دەستەپاچە بوەستێ، بۆیە ئەوەی بەدیدی خەیاڵ و جیهانبینی و دڵ و ویژدانیدا گوزەریان دەکرد، بزاڤێکی نوێخوازانە گرتییە خۆیەوە.

لێرەدا شێخ نووری کە شیعری بەرەو دنیای نوێبوونەوە برد و لە بواری نووسینی شیعر و ئەدەبیات دەستی دایە شۆڕشێک، ئەوە ناگەیەنێ کە ئیتر بەیەکجاری دەستبەرداری کێشی عەرووز بووبێ، بەڵکو لە زۆر هەوڵدا کێشی عەرووزی لەگەڵ کێشە هیجائییەکان تێکەڵ کردووە و هەندێ جاریش بەتەواوی لەسەر کێشی خۆماڵی گیرساوەتەوە (بە نموونە لە شیعری پەپوولەدا)، تا بتوانێ ئەو ئازادییەی دەستی، کراوەتر بێ و بەتێروتەسەلی گوزارشت لە ژیان و قۆناغێکی نوێ بکات، کارکردن لەسەر دوو دنیای جیاواز مانای دوودڵی و بێ باوەڕی نییە بەچەمکی نوێخوازی، ئەوەندەی دەرفەتی گەورەتر و بەرینتر لە بەردەمی شاعیر دەکاتەوە بۆ ئەوەی هەندێ جار بەکێشی (عەرووز) یان بەمەجزووئاتی پەی بەگرفتی دەربڕین ببات، چونکە هەندێ بابەت و گوزارشتکردن لە هەندێ حاڵەتی ویژدانی بەو کێشە زیاتر دەتوانرێ دەستەمۆ بکرێ و پەی پێ ببرێ، نەک بەزۆرەملێ جلێکی بکاتە بەر، شاعیری چاک دەست لە شیعرەکەی بەردەدا و وازی لێ دەهێنێ خۆی کراسی خۆی هەڵدەبژێرێ، نەک بەزۆر کراسێکی دیاریکراوی بکرێتە بەر. بۆ نموونە مامۆستا هەردی شاعیرێکی نوێخوازە، دید و جیهانبینی نوێیە، بەڵام شیعرەکانی لەسەر شێوەی عەرووز نووسیوە، ئەوەش هەرگیز نابێتە هۆی دەرهێنانی لە ناو بزووتنەوەی نوێخوازی شیعری کوردی. بۆ شاعیرێکی وەک شێخ نووری ناکرێ هەر لە سەرەتای نوێبوونەوەوە، یەکسەر عەرووز توورِ هەڵبدا و هەموو شیعرەکانی بەدوور لە عەرووز و لە قافیە بنووسێ، چونکە لە سەرەتای ئەو نوێخوازییەوە دەبێ بیسەلمێنێ کە توانایی و دەسەڵاتی بەسەر عەرووزدا دەشکێ، ئنجا بەهۆشیارییەوە ڕوو دەکاتەوە کێشە خۆماڵییەکان، کە بەکێشی نەتەوەیی ناوزەد دەکرێن. گرنگ ئەوەیە کە بەردەوامبوونی شێخ نووری بەو قەناعەتەوە تا دوا هەناسەی ژیانی وەک لەو نامەیەدا دەردەکەوێ کە بۆ مامۆستا (عەلائەددین سەجادی) نووسیوە و داکۆکی لە نوێخوازی ڕاستەقینە و هۆشیار دەکات، نەک نوێخوازییەک کە ببێتە مایەی ناشیرین کردن و دزێوکردنی ڕووی نوێخوازی و لە نەفامییەوە دەستی بۆ درێژ بکرێ، کە ئەمەش سووربوونە لەسەر ئەو میتۆد و ڕێبازەی

خۆی، هەر بۆیەش ئێمە ویستوومانە ئەو حەقیقەتانە بخەینە ناو چوارچێوەی مێژوویی خۆیەوە، بۆیەش هیچ ڕەخنەگرێک یان مێژوونووسێکی ئەدەب ناتوانێ گرنگی شێخ نووری لە هەنگاونان و جوولانەوەی لەسەر نەخشەی نوێخوازی بەلاوە بنێ و نادیدەی بگرێ.

# پێشەکی

ماوەیەکی کەم نەبوو بیری نووسین لەسەر قۆناغی ڕاچەنیوی شیعری هاوچەرخی کوردی لەسەرمدا دەخولایەوە، هەرچەند لێکم دەدایەوە و دەمهێنا و دەمبرد، نەمدەوێرا و زاتم نەدەکرد خۆم لە قەرەی ئەو ئیشە بدەم، چونکە هەستم دەکرد خۆ خەریک کردن بە لێکۆڵینەوەیەکی وا بەو شێوە لێڵ و هەڵماوییەی ئەمڕۆکە دەیبینین، جۆرە سەرکێشی کردن و هەوڵدانێکی بێهوودەیە. سەرەنجام و ئاکامەکەشی بەدەستهێنانی کۆمەڵێ بیروڕای هەڕەمەییە، کە دوورە لە گیانی لێپرسینەوە و لەوسەریشدا نە مەوزووعیەت و نە زانست پەروەران ئەو ڕایانەیان لێ وەرنەدەگرتم.

بێگومان ئەمڕۆکە هەموو ئەوانەی خەریکی لێتوێژینەوە و لێکۆڵینەوەن، کەرەستەی نووسینی ئەم قۆناغە شیعرییە ڕاپەڕیوە لە کتێبخانەی کوردیدا شک نابەن، بەلانی کەمەوە تەواوی بەرهەمی شاعیرانی ئەو قۆناغەیان لە بەردەستدا نییە، کە ئەمەیان کەرەسە سەرەتاییە هەرە پێویستەکەی دەستی لێتوێژەرەوەیە. کە حاڵ بەم شێوەیە بێت، چۆن دەرەقەتی نووسین لەسەر ئەو تەکانە شیعرییە دێم، کە لق و پۆپی بۆ زۆر لایەن و سووچی تری ژیانی ئەو سەردەمە پەرش و بڵاو کردووەتەوە؟! چۆن بوێرم خەریکی کارێکی وا ببم، لە کاتێکدا ئەو شاعیرانەی کە ڕێبەرایەتی بزووتنەوەی شیعری هاوچەرخیان کردووە، بەرهەمەکانیان لە چاپ نەدرابێ و کەس مشووری کۆکردنەوە و ساغکردنەوەیانی نەخواردبێ؟! ئەگەر وا نییە ئەی کوا بەرهەمی چاپکراوی (شێخ نووری شێخ سالح) و (عەبدولڕەحمان بەگی نفووس) و (ڕەشید نەجیب) و (ڕەفیق حیلمی) کە مامۆستا (گۆران) دەوری لە تازەکردنەوەی شیعری کوردیدا دیار کردووە؟! یان کوانێ ئەو دیوانەی (پیرەمێرد) کە جێی متمانە پێکردن بێت و بەتەواوی ساغ کرابێتەوە، کە (پیرەمێرد) ڕێگە خۆشکەری تازەکردنەوەکەیە؟! ئیتر کە ئەمەیە واقیعی حاڵی شیعری هاوچەرخی کوردی، چۆن دەکرێ لە بارەیەوە بنووسرێت و ڕای لەسەر بدرێت، لە کاتێکدا زۆربەی کەلوقوژبنەکانی تاریک و لێڵ بێ؟! دەبێ بەرنامەی ئەکادیمییانەی ئەو لێکۆڵینەوەیە لەسەر چ کۆڵەگەیەک وێستا بێت کە باسی قۆناغێ بکات، بەڵام قۆناغەکە هێشتا پڕ بێ لە کەلەبەر و تەمومژ و پێچوپەنای دەق و مۆر نەشکاو؟! یا دەبێ ئەو لێکۆڵینەوەیە چەند مەوزووعیەتی پێکا بێ و بەگیانێکی زانستییەوە نووسرا بێ، تا لەوسەر بتوانێ



ئازاد عەبدولواحید (٢)

بڕیارێکی ڕەخنەیی ڕاست و دروست لەمەڕ ئەو قۆناغە بداتە دەستەوە؟!

خۆ دەکرا منیش وەک ئەو کەسانەی لەم باسە دواون بێم و هەندێ شتی گشتی دوور لە بەرنامەی زانستی بڵێم و بەم کارە زیانم لە بزووتنەوەی شیعری تازە بدابایە و گرێ کوێرەکەیم ئەوەندەی دی ئاڵۆز بکردایە، لەجیاتی ئەوەی سوودی پێ بگەیەنم و ڕووناکی بخەمە سەر لایەنە تاریک و نووتەکەکانی، لە زۆر سەرەوە حەقیقەتم بخستبایە ژێر لێومەوە و لەو سەریشدا ئەگەر بیانوتایە بۆچی بەلای ئەو شاعیرانەدا تۆزت نەکردووە و مافی ئەوانی دیکەت خواردووە؟ ئەوە دەستبەجێ لە وەرامێکی حازر بەدەستدا دەمگوت: (بەرهەمی شیعریی ئەوانەم لەبەر دەستدا نەبوو)!!.

ئەمڕۆکە دوای ئەوەی سی و پێنج ساڵ زیاترە بەسەر بەرپاکردنی بزووتنەوەی شیعری عەرەبی هاوچەرخ تێدەپەڕێ و دوای ئەوەی بەدەیان نامەی ماستەر و دکتۆرا و بەهەزاران لاپەڕە لەسەر ئەو بزووتنەوەیە نووسراوە، لە یەکێک لەو لێکۆڵینەوە هەرە تازانەی دەربارەی شیعری هاوچەرخی عەرەبی نووسراوە - کە نامەیەکی ماستەرە - بگوترێ: (زۆربەی ئەو نووسینانە «واتە ئەوانەی لەسەر شیعری تازە نووسراون - ئا - ع » لەگەڵ ئەوەش کە زۆرن بەرنامەیەکی تەواویان نییە، یا لە قۆناغێکی زوودا نووسراون، کە پێویستە ئەمڕۆکە چاویان پێدا بگێڕینەوە، یا چەمکێکی باس کراوە، زۆر چەمک و لایەنی دیکەی پشتگوێ خراوە)[1] یا بڵێت: (بۆم ڕوون بووەوە لەو ساڵانەدا بارودۆخی عێراق بەگشتی، لە لایەنی ڕامیاری و فیکری و ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە هێشتا بەتەواوی لێی نەکۆڵراوەتەوە، لەو بوارەشدا سەرچاوەیەکی ئەوتۆ بەدەستەوە نییە کە لێتوێژەرەوە وا لێ بکات نەگەڕێتەوە سەر ئەو سەرچاوە پەرش و بڵاوانەی ئێرە و ئەوێ، کە پەنجەی بۆ ئەو بابەتانە ڕاکیشاوە)[2] لە کاتێکدا ئەمە دەڵێت، کە تا ئەمڕۆ بەتەنیا شاعیرێکی وەک (عەبدولوەهاب ئەلبەیاتی) کە هێشتا خۆی لە ژیاندایە، کەچی بەدەیان نامەی ماستەر و دکتۆرا لەسەر شیعری ئەو وەرگیراوە و بەدەیان لێکۆڵینەوەی قووڵی لەسەر نووسراوە و چەند جارێک سەرجەمی شیعرەکانی لە چاپ دراونەتەوە، جگە لەو هەموو سەرچاوە جۆر بەجۆرەی دەربارەی ژیانی کۆمەڵایەتی و فیکری و سیاسی ئەو

(١) يوسف الصائغ: الشعر الحر في العراق منذ نشأته حتى ١٩٥٨ - رسالة ماجستير - ١٩٧٨ - بغداد مطبعة الاديب البغدادية ل ٣ - ٤ .

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٤ .

سەردەمە نووسراون. ئەمە ئەگەر ڕای ڕەخنەگرێکی عەرەب بێت کە سەرچاوەیەکی زۆر و زەبەندی لەسەر شیعری تازە لە بەردەستدایە، دەبێ ڕەخنەگرێکی کورد بڵێ چی کە جاریێ شیعری شاعیرەکانی لە بەردەستدا نییە و بەتەواوی بۆی ساغ نەکراوەتەوە؟ یان چ هەوڵ و کۆششێکی بێ پایان و خۆ بۆ تەرخان کردن و کاتێکی زۆری بوێت تا بتوانێ لەو قۆناغە بکۆڵێتەوە؟! ئنجا کە ئەم قۆناغە جارێ شتێکی ئەوتۆی بۆ نەکرابێت، چۆن دەکرێ بکەوینە بەراورد کردنی لەگەڵ قۆناغی بەرەو دوای، کە باری شیعری ئەمڕۆکەمانە؟!.

خوێنەری بەڕێزم، ڕەنگە ئێستا تۆش لەگەڵم بیت لەوەی ئەو قۆناغە شیعرییە پێویستی بەوە هەیە شارەزایان لە زۆر سەرەوە لێی بدوێن، لێدوانی زانستیانە نەک هەڕەمەیی کە وەک (گۆرانی سەرخۆش و وڕێنەی نەخۆش) قسە فڕێ دان بێت، چونکە ناکرێ لە باسکردنی دیاردەیەکی شیعری وا دا کە لە بارێکی ڕامیاری و کۆمەڵایەتی و مێژوویی و ئابووریدا کەوتووەتەوە، سەربەخۆ باسی ئەو دیاردەیە بکرێت و لەم بارودۆخە داببڕین. کە لە هەموو ڕەهەند و سووچ و مەودایەکانی ئەو سەردەمە کۆڵرایەوە، ئەوساکە دەتوانرێ بەجیا لە بەرهەمی شیعری و لە ژیانی ئەو شاعیرانەش بکۆڵرێتەوە و بەدوای سەرچاوەی ڕۆشنبیرییاندا بگەڕێین. بۆ گەڕان بەدوای سەرچاوەی ڕۆشنبیری ئەم شاعیرانە، ئەو کەسەی بیەوێ لەو قۆناغە شیعرییە بدوێ، بێگومان پێویستی بەزانینی زمانی (تورکی) و (فارسی) و تەنانەت ئینگلیزیش هەیە لەپاڵ زمانی (عەرەبی)دا. هەر هیچ نەبێ پێویستی بەزانینی زمانی (تورکی) هەیە کە بە هۆی ئەو زمانەوە لەو سەردەمەدا ئازووقەی ڕۆشنبیری خۆیان خستووە، زانینی ئەو زمانە هیچ نەبێ بۆ وەستان بێت - بەقووڵی - لەسەر ئەو ڕاپەڕینە شیعرییەی کە جەماعەتی (شوعەرای فەجری ئاتی) لە شیعری تازەی تورکیدا بەرپایان کرد، ئەوسا دەزانین چییان وەرگرتووە و چییان بەخشیوە و دەتوانین دەوری هەر شاعیرێک لە شۆڕشی شیعری تازە و شوێنیان لەسەر نەخشەی شیعری ئەو سەردەمە دیاری بکەین، یان ڕێچکە و ڕێ و شوێن و تەرزی بۆچوون و ڕوانینیان بۆ (تازەبوونەوە) و ڕادەی قووڵی و ساکاری تێگەیشتنیان لەو (تازەبوونەوە)یەدا ڕوون بکرێتەوە. ئەوسا دەتوانین ڕوونتر بەر پێی خۆمان ببینین و بەبێ لایەنگیریکردنی پێش وەختەی هیچ کام لەو شاعیرانە و دوور لە مەیلی ئایدۆلۆژی و هوورا و هوتاف کێشان بۆ هیچ کامێکیان، هەریەکەیان لە خانەی ڕاستەقینەی خۆیان دابنێین و وێنەیەکی تەواوی ئەم قۆناغە شیعرییە بکێشین. بەم پێیە دەتوانین بەهەمان پێودانگ وێنەی قۆناغی شیعری ئێستا بکێشین، ئینجا بۆمان هەیە وێنەی هەردوو

قۆناغەکە لە یەکتر نزیک بکەینەوە و هەردووکی بەڕوونی ببینین. ئەوەشمان بۆ یەکلا ببێتەوە کە قۆناغی شیعری ئەمڕۆکە چی وەرگرتووە و چی بەخشیوە و چی خستووەتە سەر تەلاری قۆناغی پێش خۆی.

بەلای ڕای منەوە بایەخدان بەو ئیشە مەیدانیانە، بایەخدانە بەبەشێکی زیندووی کولتوور و کەلەپووری نەتەوایەتیمان، کە ئەمڕۆکە (وەرگێڕان) و پاراستنی کەلەپوور و بەرهەمی داهێنەرانمان و وردبوونەوە لێیان، دوو بنچینەی دروستکردنی کولتوورێکی نەتەوایەتی ڕەسەن و پێشکەوتووە، بۆ دروستکردن و بردنەوەی گرەوی دوارۆژ و چارەنووسمان، بۆیە بەنیوەی ئەرکی ڕۆشنبیرانی کوردی دەزانم، تا زووە ئەو شاعیرە لە یادکراوانەمان سەرلەنوێ بووبووژێنینەوە و ژیانیان بەبەرەوە بکەینەوە و تەپوتۆزی پشتگوێ خستنیان لەسەر بتەکێنین، کە ئەمەش بۆ خۆی بەشێکی بچووکە لە دانەوەی ئەو قەرزەی کە ناوی ئەمەک و وەفایە، بەرانبەر بەو کەسانەی بەدرێژایی ژیانی خۆیان، لەگەڵ وشەی کوردیدا ڕەنجیان کێشاوە، ڕەنجی فەرهادانە و دڵی خۆیان بۆمان کردووەتە گۆرانی خۆشەویستی و پێشکەشیان کردووین. بێگومان داهێنانی ئەمڕۆکەشمان لە خۆڕا دروست نەبووە، ئەگەر لەسەر شانی ئەوانەی دوێنێ نەوەستابێ، بۆیە بەرهەمی ئەمڕۆکەمان منداڵێکی حەڵاڵزادەی بەرهەمی زیندووی دوێنێمانە و دەشبێ سوور بین لەسەر ئەو ئەرکەی دەکەوێتە سەرشانی ڕۆشنبیران و ئەدیبانی کورد، چونکە هەریەکەیان چەندان چرۆکی سووتان و لە ناوچوونی گەنجینەی نەتەوایەتیمان دەزانێ.

شاعیرێکی وەک شێخ نووری شێخ ساڵح دەبوایە زۆر لە زووەوە مشووری کۆکردنەوە و لەچاپدانی شیعرەکانی بخورایە، ئەوسا دەستوبردکردن بۆ لەچاپدانی شیعرەکانی ئەو گرفت و کۆسپانەی هاتوونەتە ڕێی من تەخت دەبوون و لەوانە نەبوو ڕوویان بدایە، کە لە ماوەی ئەو بیست و پێنج ساڵەی بەسەر کۆچ کردنیدا تێپەڕیوە، ڕووی داوە و بووەتە هۆی لە کیس چوون و فەوتاندنی زۆر لە شیعرەکانی. ئەمڕۆکەش دوای بیست و پێنج ساڵ تێپەڕ بوون بەسەر کۆچی دوایی ئەم شاعیرە، کە دەبینین شیعرەکانی بێناز کەوتوون، دەمانەوێ زەرەر لە نیوەی بگەڕێتەوە. کە ئەم شیعرانەی دەخەینە بەردەستتان، چاک دەزانین بەرهەمێکی زۆری ئەم شاعیرە پەرش و بڵاوبوون و لە لای هەندێ کەس بەند کراون، یان لە لای مرۆڤی قەدر نەزان لە دەست دراون و فەوتێنراون. ئیمڕۆکەش کە داهێنانمان زادەی ئەو ڕابردووەمانە، دەمانەوێ لە دوارۆژێکی نزیک، دوای لەچاپدانی بەرهەمی ئەم شاعیرە پێشڕەوانە، هەوڵ بدەین و بزانین شیعری تازەبەخشی ئەمڕۆکەمان چەند چینی خستووەتە

سەر بەرهەمی ئەم پێشڕەوانە، کە ڕێچکەی شیعری کوردییان شکاند و نەریتی شیعری تازەیان ڕشت، یا شیعری ئەمڕۆکە جیاوازی بەخشش و لێ زیاد کردنی بۆ سەر هەوڵی ئەوانە چەندە و چۆنە؟!

من لەو بڕوایەدام بەبێ ئەوەی دیوانی شێخ نووری لەبەر دەستدا بێ، کە ئەڵقەیەکی زیندووی شیعری ئەو قۆناغە پێکدەهێنێ، ناتوانین بەهیچ شێوەیەک لە بەراورد کردنی لەگەڵ شیعری ئەمڕۆکە مەوزووعیەت بپێکین. ئەگەر ئەو حەلە توانیمان بەتەواوەتی وێنەی ڕاستەقینەی قۆناغی پێشوو بکێشین و بگرە لە کێشانی وێنەی قۆناغەکە نیەت پاکی و دڵپاکی بکرێتە سەروەر و بەرەو هیچ ئامانجێکی تایبەتی لار نەبووینەوە، ئەو کاتە دەتوانین حەقیقەتی مەوزووعی و مێژوویی لە شوێنی خۆیان دابنێین و جێگەیان بۆ بکەینەوە، بەمەش هەر شاعیرێک دەخرێتە خانەی ڕاستەقینەی خۆیەوە و مافی خۆی وەردەگرێ، واتە کەسیان لەسەر حیسابی ئەوەکەی تر زیاتر لە مافی خۆی وەرناگرێ، بۆ ئەم مەبەستەش پێویستە لە شێوازی شاعیرەکە و زمان و سستمی دەربڕین و وێنەی شیعر و میتۆدی شیعری شاعیرەکە ورد ببینەوە، لە ناو ئەو چوار چێوە مێژووییەی کە بەخششەکەی تێدا پێشکەش کراوە.

لەبەر دەست نەبوونی بەرهەمی شیعریی ئەو شاعیرانەی بەشداری تازەبوونەوەی شیعری کوردییان کردووە، یا هەر خۆیان - ڕێچکە شکێن - بووەتە مایەی دەرکردنی زۆر بڕیاری بەپەلە و سەرپێیی لەسەر ژیانی ڕۆشنبیریمان. لەو بڕوایەشدام بەرچاوخستنی هەر بەشێکی ئەو قەف و زریزانە دەبێتە هۆی هەڵوەشانەوەی زۆر لەو بڕیارانە و بڕیاری تری ڕاست و دروست جێگەیان دەگرێتەوە. من وای بۆ دەچم کە زۆربەی ئەو ڕایانەی لەسەر کەسی شاعیرەکانە، ئەوەندە لەسەر دەقی شیعرەکان نییە، کە لە لێکۆڵینەوەی زانستیدا هەر ئەو دەقانە قسە دەکەن، بۆیە بەم دواییەش ڕەخنەی (بنیادگەری) کە دوا بەخششی تازەی ڕەخنەی وڵاتانە، ئەو قسەیە دووپات دەکاتەوە و دەقەکە دەکاتە تاقە ڕێگەیەک بۆ دەستنیشان کردنی (شێواز)ی شاعیر و داهێنەرەکە. هەر بەهۆی ئەم دەقانەوە ڕەخنەگر دەزانێ کام شاعیرەیان توانیویەتی بەشدار بوونی چالاکانەی لە دروستکردنی ئەو قۆناغە شیعرییەدا ببێ و کامیان لەوەکەی تر بەقووڵی هەوڵیَ ڕەگ داچوونی بنەما شیعرییە تازەکانی داوە؟ بەبێ ئەوەی ڕێچکەشکێنەکان، دەستپێشخەرییە مێژووییەکانیان لە بیر بکرێ. ئیتر کە وێنەی قۆناغەکەمان لە لا ڕوون بووەوە (کە وێنەکە سەرجەمی شیعری شاعیرانی ئەو قۆناغە دروستیان کردووە) ئەوساکە دەتوانین خاسیەت و بنەما و شێوە جیا

کەرەوەکانی بزانین، ئینجا لەگەڵ خاسیەت و بنەما شیعرییە تازەکانی قۆناغی شیعریی ئەمڕۆکەمان بەراوردیان بکەین، بەبێ ڕوونکردنەوەی قۆناغی شیعری ڕابردوو، ناتوانین بەهیچ شێوەیەک خۆمان بە قۆناغی (گۆران) و قۆناغی دوای (گۆران)ـەوە سەرقاڵ بکەین. کە بەلامەوە ئەم لێدوانە هەر لە بنەڕەتەوە سەرومڕ لاساییکرنەوەی کتومتی ئەو بەراورد و مشتومڕەیە کە لەم ساڵانەی دوایی لەسەر ڕووی لاپەڕەی ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی عەرەبی - عیراقیدا بەرچاو دەکەون کە لە نێوان شیعری پێشڕەوەکانی قۆناغی تازەبوونەوە: (عەبدولوەهاب ئەلبەیاتی) و (بەدر شاکر ئەلسیاب) و (نازک ئەلمەلائیکە) تاد... لەگەڵ قۆناغی شیعری شەستەکان و حەفتاکان (سامی مەهدی) و (حەسەب ئەلشێخ جەعفەر) و (فازڵ عەزاوی) تاد... ئنجا کە قۆناغێکی شیعریی تەنیا شاعیرێک دروستی نەکردبێ، چۆن دەتوانین بیروڕا دەربارەی قۆناغی (گۆران) پێکەوە بنێین؟! یاخود چۆن ئەو ڕایانە پێکەوە دەنێین، لە کاتێکدا لێکۆڵینەوەیەکی تێروتەسەل لەسەر ئەو قۆناغە و شاعیرەکانی نەکرابێت؟!

مامۆستا (گۆران) کە لە چاو هاوڕێ شاعیرەکانی خۆی لە هەموویان بەختەوەرترە، لە ڕووی لە چاپدانی بەرهەمەکانی و نووسینی ڕەخنە و لێکۆڵینەوەوە، کە ڕووبەرێکی زۆری بۆ ئەو تەرخان کراوە، کەچی ئەگەر بەچاوێکی ورد و بەزەینێکی فراوانەوە لەو نووسینانە ڕامێنین، بۆمان دەردەکەوێ کە ئەمیش تا ئێستا جگە لە چەند (وتارێکی ڕەخنەیی) شتێکی ئەوتۆی بۆ نەکراوە هەموو لایەنەکانی شیعر و شاعیرایەتی ئەوی گرتبێتەوە و شایانی پایەی شیعری ئەو بێت. ئەم وتارە ڕەخنەییانەش لایەنێکیان گرتووە و زۆر لایەنی تریان فەرامۆش کردووە، بگرە زۆر لەو وتارانە بریتی بووە لە هوتاف کێشانێ بۆی و هیچی تر. کەواتە هەموو ئەو گوتار و چاوپێکەوتنە ڕۆژنامەنووسییانەی لە کاتی خۆیدا دەربارەی قۆناغی - گۆران - و دوای - گۆران - نووسراون و گوتراون، بەکارێکی زیادی دەزانم، چونکە قسەکان هەرچی بووبن و هەر چۆن گوترابن، بنچینەیەکی مەوزووعی و زانستییان لە پاڵدا نەبووە، کە نووسینیش کۆڵەگەی زانستی نەبوو، قسە هەڵڕشتن و لاپەڕە ڕەش کردنەوە و کات بەفیڕۆ دان و داگیر کردنی ڕووپێوی لاپەڕە کەمەکانی ڕۆژنامە و گۆڤارەکانە و خەریک بوونە بەشتی لابەلایی، لەو سەربشدا خوێنەران تووشی چەندان کۆڵانی دەرنەچوو دەکەن و لە کێشە (جەوهەری)یەکان دوور دەخرێنەوە.

ئەوانەی لاسایی مشتومڕەکەی شیعری هاوچەرخی عەرەبی دەکەنەوە، نەیانزانیوە ئەوەی بۆ ئەوان ڕەخساوە و وەختی هاتووە بیلێین، جارێ لە لای ئێمە پێنەگەیشتووە و وەختی

ماوه قسەی تێدا بکرێت و بە خۆمان ڕابپەڕموین بکەوینە ئەم جۆرە بەراوردکاریانەوە. زۆر دوور نارۆین، هەر جارێک کە خوێنەر کۆمەڵە هۆنراوەیەکی شاعیری نوێخوازی عەرەب (عەبدولوەهاب ئەلبەیاتی) دەخوێنێتەوە، لە پاشکۆی زۆربەی کۆمەڵە شیعرەکانیدا ناوی دەیان کەسی بەرچاو دەکەوێ، کە نامەی ماستەر و تێزی دکتۆرایان لەسەر شاعیرایەتی ئەو وەرگرتووە. بەڵێ شاعیرێک هێشتا خۆی لە ژیاندایە تا ئێستا پتر لە چەند جارێک شیعرەکانی بەسەرجەم و بەجیا جیا چاپ کراونەتەوە، ئیتر پیاو چۆن بەزەیی بەئەدەبێکی گوناح و بێ ناز و بێ کەسی وەک ئەدەبی کوردی نەیێتەوە؟! چۆن بەزەیی بەو واقیعە نەیێتەوە، تا ئەمڕۆکە پێشڕەوەکانی شیعری کوردی دوای زیاتر لە بیست ساڵ تێپەڕ بوون بەسەر مردنیاندا، هێشتا خوێنەر تەواوی شیعرەکانیانی لە بەردەستدا نییە. ئەوە باسی ئەوە ناکەم، لێکۆڵینەوەیان لە بارەوە بکرێت و بەروبوومەکانیان وەربگێڕدرێنە سەر زمانی بێگانەوە.

لە بەرچاو نەگرتنی تەقەللا و کۆششی ئەم شاعیرانە با لەو سەر بوەستێ و بێ کەسی و بێ نازی ئەدەبەکەش هەر لەولا، بەڵام پاشاگەردانی بەرپا کردن لە ناو ئەدەبەکە، بەدەست قەڵەم بەدەستەکان ئەوەندە زیاتر قوڕەکەی خەست کردووە، ئیتر ئەوە بەناوی جیاوازی بیروڕا - کە حاشا فڕی بەسەر جیاوازی بیروڕاوە نییە - شەڕە دەنووک و تەقڵە بەیەکتر لێدانێکە هەر مەپرسن، بەناوی جیاوازی بیروڕا شتی وا دەکرێت و دەگوترێت، لە قووتووی عەتاری هیچ وڵات و میللەتێکدا وێنەی نادۆزیتەوە. ئەوە شەڕە جنێو و درۆ هەڵبەستن بەناوی ڕاستگۆیی و مەوزووعیەت... شێواندن و گێرەشێوێنی بەناوی خزمەت کردن و دڵسۆزی و پێشکەوتنخوازی. مل بادان و نوقرچک گرتن بەناوی عیلمانییەتەوە. ئەوەی لەو ناوەدا تووشی ژانە دڵ و ژانە سەر بووە خوێنەرانن، کە خەریکە لە ناو دووکەڵی ئەو ئاژاوەیەدا نیەتپاک و نیەت پیسیان لێ تێکەڵ ببێ. ئیتر نازانم ئەو نەوەیەی تینوو و تامەزرۆی فێربوون و خوێندنەوەیە، چ تاوانێکیان کردووە، تا بەم جۆرە چەواشە بکرێن، لێفەیان لەسەر چ هەتیوێک هەڵداوەتەوە تا تووشی ئەم مێشک لەق و لێژ کردنە بکرێن؟!

(شێخ نووری) نەک تا ئەمڕۆکە هەر هیچی بۆ نەکراوە، بگرە لە زۆر سووچ و قوژبنی ڕۆژنامە و گۆڤارەکان و بگرە لە بەرنامەی خوێندنی قوتابخانەکانیشدا شیعری بە شێوێنراوی و بەنیوە و ناچڵی و بەناتەواوی بڵاو کراوەتەوە، لە زۆر سووچی ڕۆژنامە و گۆڤار، تانووتی لێدراوە، ڕەنگبێ ئەوەش لە لای ئێمە جۆرێک بێت لە پاداشت دانەوە و خەڵات کردن و چاپ کردنی بەرهەمەکانیان، یان جۆرێ بێت لە دەربڕینی خۆشەویستی و

ئەمەکمان بۆیان. یان کە هەندێ دەستیان بۆ ببەن، تەنیا بۆ مەبەستی بازرگانی پێوە کردن، ئەگینا بۆ هیچ مەبەستێکی تر دەست بۆ کار و بەرهەمیان نابەن و لە گۆڕیشدا هەڵیان دەتەکێنن و ناهێڵن بحەسێنەوە! بۆیە ناهەقم نەبوو کە نەمدەوێرا شتێ لەسەر ئەو قۆناغە بنووسم و ڕوو بەڕووی قۆناغێکی وا پەشۆکاو ببمەوە، بەو هەموو بەخششەی خۆیەوە، دەمزانی هەر هەوڵێک بدەم، ئاسنی سارد دەکوتم!

## له چاپدانی ئەم دیوانە چۆن کەوتە ئەستۆی منەوە؟

وەک زۆر ئێوارەی تر، ئێوارەی ڕۆژێک لە ڕۆژەکانی ساڵی(١٩٧٧) لە هەولێر لام دایە لای مامۆستا (گیوی موکریانی)ی خوالێخۆشبوو.لە چاپخانەی - کوردستان - کە لە شەقامی (مظفریة) بوو کەوتینە گفتوگۆ کردن. مامۆستا وەک نەریتی خۆی ئەو ئێوارەیەش باسی کۆمەڵێ یادگار و بیرەوەری ڕابردووی خۆی بۆ گێڕامەوە، دەرگای زۆر ڕاز و نیازی دڵی خۆی بۆ ئاوەڵا کردم. ڕێکەوت ئەو ئێوارەیە باسمان هاتە سەر ئەو شاعیرانەی ئاشنایەتی و پێوەندی لەگەڵیاندا هەبووە، یەکێ لەو شاعیرانەی مامۆستا لە قسەکانیدا باسی لێوە کرد، (شێخ نووری شێخ ساڵح) بوو، زۆرتر باسی ئەو ماوەیەی ژیانی (شێخ نووری) بۆ کردم کە بەوەزیفەی (کاتبی ئەوەلی خەزێنە) گوێزرابووەوە هەولێر. ئەو دوو ساڵی مانەوەی (شێخ نووری) لە هەولێر، زیاتر ئاشنایەتی و دۆستایەتییەکەی نێوانیانی پتەو کردووە کە زۆربەی ئێواران لە چاپخانەکەیدا سەری لێداوە.

بەلای منەوە لە هەمووی گرنگتر ئەوە بوو، ئەو ئێوارەیە مامۆستا هەواڵێکی خۆشی دەربارەی (شێخ نووری) پێ ڕاگەیاندم، کە لە کاتی خۆیدا لەگەڵ (شێخ نووری) دەربارەی بەرهەمە شیعرییەکانی دواوە و ئەویش واتە - شێخ نووری - کۆمەڵێ شیعری بەدەسخەتی خۆی لەگەڵ کورتەیەک لە ژیانی پێشکەش کردووە، ئەوەشی پێ ڕاگەیاندم کە زۆربەی هەرە زۆری ئەو شیعرانە بڵاو نەکراونەتەوە. مەبەستی (شێخ نووری) لە ناردنی ئەم شیعرانە لەسەر داوای مامۆستا (گیو) بۆ ئەوە بووە کە لە لایەک لە چاپخانەکەیان - چاپخانەی کوردستان - بۆی لە چاپ بدات و لە لایەکی تریشەوە وەک مامۆستا (گیو) بۆی گێڕامەوە، ئەو سەردەمە دەستی دابووە نووسینی کتێبی (مێژووی ئەدەبی کوردی) و نیازی وابوو بەشێکی ئەو شیعرانە هەڵبژێرێ بۆ ئەوەی لەو کتێبەدا جێگەیان بۆ بکاتەوە، وتیشی تا ئێستا سەرقاڵی کارێکی وای کردووە، نەمپەرژاوەتە سەر ئەوەی خەریکی ئەو پرۆژەیە بم و بەرێکوپێکی بیاننووسمەوە و پێشەکییان بۆ بنووسم و لە چاپیان بدەم. لێتان ناشارمەوە منێکی شەیدا و تامەزرۆی بینینی شیعری ئەم شاعیرە، کە بەرهەمێکی زۆر کەمی لەبەر دەستی خوێنەر دایە. شاگەشکە بووم و هەواڵەکە فێنکییەکی زۆری خستە دڵمەوە، بۆیە هەر لەو دانیشتنەدا بە مامۆستا (گیو)م گوت هەوڵ بدات بەزووترین کات ئەو شیعرانە لە تاریکی ڕزگار بکات و چیتر لە لای خۆی بەندیان نەکات. لە هەمان

کاتیشدا ئامادەیی خۆمم نیشان دا کە بۆ ئەم کارە ڕۆژنامەکانی بۆ بپشکنم و هەرچی شیعری بڵاوکراوەی دیکەی هەیە، کە لە دەستنووسەکانیدا نییە، بخرێتە سەریان و تەنانەت ئامادەکردن و نووسینەوەشیان من بیگرمە ئەستۆی خۆم و بەهەموو جۆرێ یارمەتی مامۆستا بدەم لە هەر تەگەرەیەکی دی کە لە بەردەم لە چاپدانی ئەم دیوانەدا دەوەستێ. پێتان سەیر نەبێ ئەمَ کەفوکوڵ و گەرموگوڕییەی لەمنی دیت و ئەو قسانەی لە منی بیست مامۆستای دڵ نەرم کرد کە گفتم بداتێ هەرکە تۆزێ نەخۆشییەکەی چاک بووەوە، بەدوای دەستنووسەکانی شاعیردا بگەڕێ و لە ناو دەستنووسەکانی تردا بیاندۆزێتەوە و بەیەکەوە دەست بدەینە جێبەجێ کردنی ئەم ئیشە. دوا بەدوای ئەم ئێوارەیە، چەند ئێوارەیەکی تریش باسی (شێخ نووری)یمان کرد. یان ڕاستتر وایە بڵێم من سەری باسەکەم لەگەڵ مامۆستا دادەمەزراند، ئەویش دەکەوتە پیاهەڵدانی (شێخ نووری) و دەگەڵ باسی ڕەوشت بەرزی و کەسایەتی و ژیان و شیعری ئەم شاعیرەدا ماوەیەکمان بەسەر دەبرد. لە یەکێک لەو دانیشتنانەدا ئەوەی بەگوێدا چرپاندم کە لەو ڕۆژانەدا بەدوای دەستنووسەکاندا گەڕاوە، بەڵام لە ناو ئەو هەموو دەستنووس و کتێبانەیدا بۆی نەدۆزراوەتەوە. دوو سێ مانگ بەسەر باسکردنی پرۆژەکەدا تێنەپەڕیبوو کە مامۆستا (گیو) نەخۆشییەکەی لە جاران سەختتر و توندتر بوو. لەو ماوەیەدا زۆرتر هاموشۆی (مووسڵ)ی دەکرد، بەمەبەستی چوونە لای دکتۆر و چارەسەرکردنی نەخۆشییەکەی. منیش هەرچەندە لەو ماوەیەدا سەرم لێدەدا، بەڵام لەبەر کزی و بێ تاقەتی مامۆستا، تەنیا بەهەواڵ پرسینی نەخۆشییەکەی ڕادەگەیشتم. وا دیاربوو چارەش نەبوو لە بەرانبەر مردنێکی مسۆگەر و نەخۆشییەکی کوشندەی وەک نەخۆشی (دڵ)، ئەوە بوو مامۆستا لە (١٩٧٧/٧/٢٤)دا کۆچی دوایی کرد.

ماوەیەکی تر بەسەر ئەو ڕووداوە تێپەڕی، بۆ جارێکی دی بیری پرۆژەکە لە لام سەری هەڵدایەوە. بۆ ئەو مەبەستە لە یەکێک لە دانیشتنەکانم لەگەڵ کاک (ئازاد)ی کوڕی مامۆستا (گیو) باسم لەگەڵدا کردەوە، خوا هەڵناگرێ ئامادەیی خۆی نیشان دا کە ئەو دەستنووسانە بدۆزێتەوە، بەڵام لە دواییدا سەر دەرنەکردنی لە دەستنووسەکان و کتێبخانەکەیان منیان لەو بێ هیوا کرد. ئەوەی زۆرتر تەمام پێی بوو و پشتم پێی ئەستوور بوو، خاتوو (کوردستان موکریانی) بوو، کە تاقە منداڵی مامۆستایە حەز لە خوێندنەوە و نووسین بکا و سەریشی لە کتێبخانە گەورەکەی باوکی دەربچێ و ئاگای لە ورد و درشتی دەستنووسەکان بێت. ئەو هیوایەشم زیاتر لەو کاتەدا هاتە دی کاتێ لە

سلێمانی گیرسامەوە و (د. کوردستان موکریانی)یش کرا بەسەرۆکی بەشی کوردی لە کوللییەی ئادابی زانکۆی سلێمانی ئەوسا.

کە بۆ یەکەم جار لەو شارەدا یەکترمان بینی نەدەکرا لەم یەکتر بینینەدا ئەو باسەی لەگەڵدا بکەمەوە، بۆیە دوای چەند جارێک بەیەکەوە دانیشتن و یەکتر بینین و پتر ئاشنایەتی پەیداکردن، باسی ئەو پڕۆژەیەم بۆ کرد کە وەختی خۆی لەگەڵ باوکی خوالێخۆشبوویدا بەتەما بووین خەریکی ببین و داوام لێ کرد، ئەم جارە کە ڕۆیشتەوە بۆ (هەولێر) دەستنووسەکان بدۆزێتەوە و بەیەکەوە خەریکی پڕۆژەکە بین، بەڵام خۆی وای نیشان دا کەوا لە ڕێزمان پسپۆڕە و نایەوێ خەریکی ئەدەب بێت (چونکە تەنیا هیوایەتی ئەدەبی هەیە)، ئەلحەق بەڵێنی دامێ کە دەستنووسەکانم بۆ بهێنێ. بۆ ئەو مەبەستە یەکەم جار تەلەفۆنی بۆ خوشکی کرد کە لە هەولێر بوو، تا بەدوای دەستنووسەکانی شێخ نووری-دا بگەڕێت و لە ناو دەستنووسەکاندا بیاندۆزێتەوە و ئامادەیان بکات تا من بچم لە هەولێر دەستنووسەکانی لێ وەربگرم. سەفەری هەولێرم کرد و چوومە ماڵەوەیان، بەڵام دوای گەڕان و پشکنین خوشکەکەی ئەو دەستنووسانەی نەدۆزییەوە، منیش لە دەسکەوتنی دەستنووسەکان بێ ئومێد و هەناسە سارد بووم. کە گەڕامەوە سلێمانی (د. کوردستان)م بینی و پێم ڕاگەیاند کە دەستنووسەکانمان نەدۆزیوەتەوە، داواشم لێ کرد بەڵکە خۆی هەوڵێ بدات و کاتێ سەری لە هەولێر دا و چووە ماڵەوە، دەستنووسەکان بپشکنێ. هەرواش بوو، ئەوەندەی نەبرد کە خاتوو (کوردستان) سەری ماڵەوەی دا و لەگەڵ گەڕانەوەی بۆ سلێمانی دەمودەست ئەو دەستنووسانەی پێوەندییان بە(شێخ نووری)یەوە هەبوو هەمووی بۆ هێنابووم و کاتێکی بۆ دانام کە بچمە لای لە زانکۆ، دەستنووسەکانم لەوێ بداتێ، ئیتر کە چوومە لای و دەستنووسەکانم لێ وەرگرت، بەگوڕتر لە جاران تێ هەڵچووم و کەوتمە پشکنین و گەڕان و سۆراغکردن. بۆ ئەم مەبەستە سەرم کرد بەزۆر ماڵاندا، ڕووم لە زۆر کەس نا، هەر کەسێکی زانیبێتم تۆزە خزمایەتی و دۆستایەتی و هاوڕێتییەکی لەگەڵ (شێخ نووری)دا هەبووە چوومەتە لای و هەواڵی ژیان و شیعری ئەوم لێ پرسیوە. ئەوەی توانیبێتی یارمەتیم بدا یارمەتی داوم لە شوێنی خۆیدا ناویانم بردووە، ئەوەی نەشیتوانیبێ یارمەتیم بدات ئەوە ناوی کەسانی ترێ بۆ هەڵداوم و منیش چوومەتە لایان.

بێگومان لە پێش هەموو ئەوانەشەوە چوومە لای کاک (شێخ جەناب)ی کوڕە گەورەی شاعیر، کە باسی پڕۆژەکەم لە لا کردەوە و ئەو هەوڵ و کۆششانەی دابووم بۆ دەستگیر

کردنی شیعرەکانی باوکی و بۆم ڕوون کردەوە، زۆر خۆشحاڵ بوو، بگرە ئامادەیی خۆی نیشان دا کە هەرچی لە دەست بێت بۆ سەرکەوتنی پڕۆژەکەم دریغی نەکات. لە ڕاستیشدا کاک (جەناب) وەک بەڵێنی دابوومێ، بەڵێنەکەی هێنایە دی و یارمەتی زۆری دام، بەبەڵگەی ئەوەی دوای ماوەیەکی کەم تەلەفۆنی بۆ کاک (ڕوشدی عەزیز)ی ئامۆزای کردبوو، دەفتەرە دەستنووسەکانیَ باوکی کە لە لای دانا بوو بیانپارێزێ[1]، بۆ پڕۆژەکەمان داوای لێ کردبوو ئەو دەستنووسانەمان بۆ بنێرێتەوە. ئەویش هێندەی پێ نەچوو، دوو دەفتەری دەستنووسی کە لە لا بوو بۆ کاک (جەناب)ی ناردەوە و ئەویش یەکسەر دەستنووسەکانی بۆ من نارد.

بەم جۆرە پڕۆژەکەم ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ڕووی لە فراوانی دەکرد، لە چەند کەسێکیشم بیستبوو کۆمەڵێ شیعری (شێخ نووری) کەوتووەتە لای مامۆستا (هەردی) لە کاتی خۆی (شێخ نووری) داویەتییە ئەو بۆ ئەوەی پێشەکی بۆیان بنووسێ و لە چاپیان بدەن. کاتێ لە لای کاک (جەناب) باسی ئەم شیعرانەم کرد دیاربوو مامۆستا (هەردی)یش خۆی لەگەڵ کاک (جەناب) لە بارەی ئەو شیعرانەوە دوابوو و پێشی گوتبوو یەکێ بنێرە دەستنووسەکانت بۆ بنێرمەوە. بەم شێوەیە ئەو دەستنووسانەی کە لە لای مامۆستا (هەردی)یش بوون کاک (جەناب) بەخەلاتی کوڕی بۆی هەناردم، ئیتر کە بنەماڵەی شاعیر زانییان من بەدڵ و بەگیان خەریکی ئەم ئیشەم و بگرە کارێکی زۆرم بۆ کردووە و بەردەوامیش خەریکم، هاوکاری تەواوی چاپکردنی دیوانەکەیان کردم، چونکە ئەوان مەبەستی سەرەکییان لە چاپکردنی دیوانی شاعیر ئەوە بوو بەشێوەیەکی ڕێکوپێک بکەوێتە بەردەستی خوێنەران، دوور لە مەبەستی بازرگانی پێوە کردن و خەریک بوونی سەرپێیی.

دوای ئەوە تەواو کەوتمە خۆم، هەر کەسێکی وێنەیەکی دەگمەن و دانسقە، نامەیەک، کوتە کاغەزێکی دەستنووسی شێخ نووری لابووبێ لێم وەرگرتووە. هەر کەسێکی تروسکاییەکی خستبێتە سەر ژیانی (شێخ نووری) تۆمارم کردووە و لێی ورد بوومەتەوە و بگرە بەهۆی پرسیار کردنەوە لە کەسانی تر چوومەتە ناو بنجوبناوانی ئەو قسەیەوە، کە شتێکم وەرگرتووە تەواو لێم پێچاوەتەوە ئنجا تۆمارم کردووە. بەو دەستنووسانەی لە لام بوون دڵم ئاوی نەدەخواردەوە، چونکە شیعری وام لەلا بوو لە پێنج دەستنووسی جۆر

(١) وەک زانیم ئەویش لە لای د. کەمال مەزهەر پاراستبووی.

بەجۆری شاعیر نووسرابووەوە، کە لە هەر دەستنووسێکدا شاعیر دەسکاری شیعرەکەی کردووە و گۆڕانی بەسەردا هاتبوو. من هەوڵم داوە دەستنووسی ترم چنگ بکەوێ تا دوا داڕشتنی شیعرەکەم دەسکەوێ و بیکەمە دەستنووسی باوەڕ پێکراو. ئێستاش ڕەنگە شیعری وا لەو دیوانەدا بەرچاو بکەون، لە دەستنووسەکەدا ڕەشنووس - مسودة - بێت، یا دەستنووسی تری ئەم شیعرە هەبێت کە شاعیر دەسکاری کردبێ و دەستی پێدا هێنابێتەوە و من چنگم نەکەوتبێ، لە هەر دەرفەتێکی تر دەستم بکەون دەیانخەمە شوێنی ئەو ڕەشنووسانەوە.

لە ڕاستیدا دانیشتنم لە سلێمانی دەرفەتێکی لەباری بۆ ڕەخساندم، بۆ ئەوەی سوود لە کتێبخانەی (زانکۆی سلێمانی) و (مۆزەخانە) و (ئەوقاف) و (کتێبخانەی گشتی) وەربگرم. هەر لەو کاتەوە کە هاتووم بۆ ئەم شارە، وەک هەر کەسێک کە بەکاروباری شیعری کوردییەوە خەریک بێ، سەودای پشکنین و گەڕان بەدوای شیعری بڵاوکراوەی ئەو شاعیرانەی بەشدارییەکی چالاکانەیان لە تازەکردنەوەی شیعری هاوچەرخی کوردیدا کردووە، کەوتە کەللەمەوە. هەر بەو نیازە کەوتمە هەڵدانەوەی لاپەڕە بەلاپەڕەی ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکان و ڕۆژنامە و گۆڤار نەما بواردبێتم و سەیرم نەکردبێ. بۆ پڕۆژەکەی (شێخ نووری) پەرۆشییەکەم هەر بەتەنیا لە کتێبخانەکانی کە لە سەرەوە ناوم بردن، دانەمرکا، بەڵکو هانام بردە بەر زۆر کتێبخانەی تایبەتی، لەو کتێبخانانەی سوودم لێ وەرگرتن کتێبخانەی مامۆستایان: (شێخ محەمەدی خاڵ) و (شاکر فەتاح) و (دکتۆر مارف خەزنەدار) و (جەمال خەزنەدار) بوون، کە ڕۆژنامە و گۆڤاری کوردی زۆریان تێدا پارێزراون. ئەم گەڕان و پشکنینەش بەناو گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا کەرەستە و ئازووقەیەکی باشی شیعری ئەم شاعیرەی خستە بەر دەستم، ئەوە بێجگە لەوەی بۆ خۆم سوودێکی ئێجگار زۆرم لێ وەرگرتن. بەوەندەش نەوەستام، تا گەڵاڵەکردنی ئەم دیوانە بۆ لە چاپدان، من لە سۆراغکردن و ئیشی (مەیدانی) نەکەوتم. بۆ ئەو ئامانجە لەگەڵ زۆر کەسان دەکەوتمە دەمەتەقێ، بەتایبەتی لەگەڵ ئەوانەی پێوەندییەکی دوور یان نزیکیان بە(شێخ نووری)یەوە هەبوو. یا ئەوانەم دەبینی کە لە نزیکەوە ئەم شاعیرەیان ناسیوە. هەر بۆ ئەوەی نەکەومە هەندێ هەڵەوە لەبارەی ژیان و وەزیفە و جۆری گوزەرانی شاعیر چووم دوای عەزیەت و ماندووبوونێکی زۆر ئیزنم وەرگرت و لە خەزێنەی سلێمانی دۆسیەی شاعیرم لە ناو پێنج سەد دۆسیەدا دۆزییەوە، سەرجەمی دۆسیەکەم نووسییەوە. زۆریشم مەبەست بوو ڕۆشنایی بخەمە سەر هەموو قۆناغەکانی تەمەنی شاعیر، هەر لە منداڵییەوە

تا هەرزەکاری و لاوێتی و پیری، بەڵام هەرچەند کردم و کۆشام لەوە زیاتر ڕۆشناییم پێ نەخرایە سەر، ئەگەرچی ئەوەندەش کە بەدەستم هێناوە، زۆر هەڵەی ژیانی شێخ نووری بۆ ڕاست کردمەوە، تەنانەت دیار کردنی مووچەی مانگانەشی، ڕێگەخۆش کردنە بۆ زانینی باری ئابووری و دارایی و شێوەی گوزەرانی شاعیر، کە بێگومان لە پاشەڕۆژدا یارمەتی ڕەخنەگران دەدات و دەستیان دەگرێ لە لێکۆڵینەوەی بەرهەمەکانیدا، هەروەها لە نزیک بوونەوە لە شیعر و ئەزموونی شاعیرایەتی شاعیر، چونکە کەس ناتوانێ شاعیر لە ناو شیعرەکانی جیا بکاتەوە. ژیانی تایبەتی و گشتی - دەوروبەرەکەی - لە شیعرەکان لە بێژنگ بدات، یان شیعرەکان دوور لە ژیانی تایبەتی و سەردەمی شاعیر جیا بکاتەوە، بۆیە هەوڵم دا زیاتر بەناو شتە وردەکانی ژیانی شاعیردا بچمە خوارێ، ئەگەرچی زۆر لایەنیشی ماوە پێویستی بەڕوونکردنەوە هەیە!

## دەربارەی بەرنامەی ساغکردنەوەی ئەم دیوانەوە

بێگومان تا لە چاپدانی ئەم دیوانەش شتێکی ئەوتۆ نەکراوە، شایانی پایەی شاعیرێتی و بەهرەی تایبەتمەند و بەبڕوێنی (شێخ نووری) بێ. زۆربەی خوێنەران کە (شێخ نووری) دەناسن، ڕەنگە تەنیا وەک شاعیرێک بیناسن و بەس، لە کاتێکدا (شێخ نووری) جگە لە شاعیرایەتییەکەی دەکرێ لە زۆر سەرەوە باسی بکەین. شێخ نووری (ڕەخنەگر) و شێخ نووری (نووسەری سیاسی) و شێخ نووری (ڕۆژنامەنووس) و تاد... بەبێ مشتومڕ (شێخ نووری) موونەوەرێکی بەدەرەوە بووی سەردەمی خۆی بووە و شیعری کوردی زۆر قەرزاری ئەو پیاوەیە کە تا ئەمڕۆکەش مافی تەواوی خۆی نەدراوەتێ - ئەگەر زۆر جار مافی نەخورابێ - جگە لە هەوڵە دڵسۆزانەکەی مامۆستا (ڕەفیق حیلمی).

ئەگەر بەوردی چاوێک بەرۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکاندا بخشێنین، وتارێکی قووڵ و چڕ و پڕ و لێکۆڵینەوەیەکی هەمە لایەنت لەسەر ئەم شاعیرە بەرچاو ناکەوێ، بۆیە دەڵێم ئەوەی دەربارەی ئەم شاعیرە نووسراوە، زۆر لە ئاستی بەهرە و دەسەڵاتی شاعیرانە و هونەری شیعریی ئەو کەمتر و کورتە باڵاترە. هۆی سەرەکی بەسەر نەکردنەوە و پشتگوێ خستنی بۆ فەرامۆش کردنی بەرهەمەکانی دەگەڕێتەوە، کە تا ئەمڕۆکە خەمێکی خەمخۆرانەی بۆ نەخوراوە، ئەمەش کارێکی وای کردووە شیعرێکی ئێجگار کەمی لەبەر دەستی خوێنەراندا بێت. ئەوە جگە لەوەی تا ئەمڕۆکە کتێبخانەیەکی کوردی ڕێکوپێک لە هەموو کوردستاندا نابینی کە ژمارەی تەواوی ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی پاراستبێ، ئەمەش بۆ خۆی تەگەرەیەکە لە بەردەم ڕەخنەگران و لێتوێژەرەوەکان، کە نەتوانن بەرهەمە شیعرییە بڵاوکراوەکانیشی ببینن. بەهەرحاڵ دەکرێ لە چاپدانی ئەم دیوانە ببێتە سەرەتایەک بۆ ئەوەی چیتر ئەم شاعیرە لە لێکۆڵینەوەی ئەدەبی پاشەڕۆژماندا مافی نەخرێتە ژێر لێوەوە و ببێتە پرۆژەی لێکۆڵینەوەی تێروتەسەل و کەرەسەی بەراورد کردن و شۆڕبوونەوە بەناو تاقیکردنەوەی شیعری و ڕادەی تێگەیشتنی لە کێشەی (تازەبوونەوە). یان ببێتە کەرەستەی ڕووناکی خستنە سەر ئەو قۆناغە مێژوویی و کۆمەڵایەتی و سیاسییەی بەهرەی ئەم بەهرەدارەیان تەقاندەوە، تا بتوانێ بەدەنگ داوایەکانی حەتمییەتی مێژووەوە بچێت. ئەم بەرهەمەش کە چمکێکی زیندووی - هەرە زیندووی - ئەم قۆناغەیە، بکەوێتە ژێر نیگای ڕەخنەوە.

ئیدی بەئومێدی ئەوەی ئەو شیعرانەی لەم بەرگەدا بەرچاو ناکەون و نەیگرتووەتە خۆیەوە، چاوەڕوانین هەر کەسێ دەستی دەکەوێ، تا نەفەوتاوە بۆمانی بنێرێ، یان لەسەر ڕووی لاپەڕەی ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا بلاویان بکاتەوە، یان ئەگەر هەر یەکێک کە من دەستم پێی نەگەیشتبێ، ئەگەر ئەو زانیارییانەی لەو چاپەدا خستوومنەتە ڕوو، بوونە هۆی وروژاندنی بیرەوەرییەک لەگەڵ شاعیر ئەوە بخرێنە سەر لاپەڕەی ڕۆژنامە یان بە نامە ئاگادارمان بکەنەوە. بەمەش دەتوانین بەهەوڵ و تەقەللای هەموو لایەک ئەم هەنگاوە سەرەتاییەی ئێمە ڕوو لە تەواوی بکات. بەهەمان شێوەش هەوڵ بدرێ بەرهەمی شاعیرانی بزووتنەوەی تازەی شیعری کوردی (ڕەشید نەجیب) و (عەبدولڕەحمان بەگی نفووس) بخرێتە بەر دەستەوە و بەمەش دەتوانین هەنگاوێکی گەورە بنێین لە ڕوونکردنەوەی قۆناغێکی گرنگ لە مێژووی ئەدەبی هاوچەرخدا، کە ئەم کارەش ئەرکێکی نەتەوەیی سەرشانی هەموو لایەکمانە و بۆ بەئەنجام گەیاندنی پێویستی بەئیشی مەیدانی هەیە.

بەدڵنیاییەوە دەڵێین (شێخ نووری) ژمارەیەکی زۆر لە شیعرەکانی لەناوچووە و بەپەڕاگەندەیی لەملا و لەولا پەرش و بلاو بوونەتەوە و کەوتووەتە لای زۆر کەسەوە. هەر ناچێتە عەقڵەوە شاعیرێک لە تەمەنێکی زووی ژیانیدا دەستی دابێتە شیعر نووسین و هەر ئەوەندە شیعرەی هەبێت. ئەوەندەی من خەریکی شیعری - شێخ نووری - بووم، بۆم دەرکەوت ئەو شیعرانەی کە خۆی لە ژیانیدا بلاوی کردوونەتەوە هەڵەی تێدا نییە، ئەگینا کەم کەس هەبووە بەئەمانەتەوە شیعرەکانی ڕابگوێزن. خاوەنی وتاری گۆشەی (شیعر و شاعیرەکانمان) ناهەقی نەبووە بڵێت: (هەر چەندە ئێمە بیرمان دابووە شیعری ئەو شاعیرانەی کە نەماون زیندوو بکەینەوە، بەڵام ئەترسین نووسەری ئەو بەشە بەم زووانە بمرێ و کەسێکی تر وەک ئەو نەبێ کە پارچە شیعرێکی (شێخ نووری)مان بێ هەڵە بۆ بنووسێ. لەبەر ئەوە ئەم هەڵبەستەیان نووسی)[1] لێرەدا ناتوانین نموونەی ئەو هەڵە زۆرانە بنووسین، کە لە کاتی دووبارە بلاوکردنەوەی شیعرێکیدا ڕوویان داوە، چونکە لاپەڕەیەکی زۆرمان لێ دەگرێ، بەڵام خوێنەری بەڕێز دەتوانێ بەهۆی ئەو بیبلیۆگرافیایەی سازم داوە، بەئاسانی بگاتە سەر ڕاستی بۆچوونەکەم.

خوێنەری شیعرەکانی (شێخ نووری) بۆی دەردەکەوێ، کە لە زۆر شوێندا ئاماژەی بۆ زۆر

---

(١) ڕۆژنامەی ژین: ژمارە (١٣٨٤) ساڵی (٣٣) پێنج شەممە ١٩٥٨/٣/٩ شیعر و شاعیرەکانمان.

ڕووداوی مێـژوویی ئەو سـەردەمـە کـردووە وەک (٦)ی ئەیلوول و (شـۆڕشـەکـەی شـێخ سەعیدی پیران)، یان شیعری بۆ (یانەی سەرکەوتن) و (جەمعیەتی زانستی کوردان) وتووە. یان لە زۆر شیـعـریدا پەنجەی بۆ هەندێ ناو ڕاکێشاوە، یاخۆ نامەی شیـعـری بۆ نووسیون، هەندێ جاریش ئاشنا و خزمی خۆی بەشیعر لاواندووەتەوە، یان باسی کەسانی وای کردووە کە لەو سەردەمە ناسراو بوون و ناویان لە ناو ناواندا بووە، بەشی هەرە زۆری ئەو ناوانەی بەرچاو دەکەون لەو سـەردەمـەدا لە ناو خـوێندەوارەکـانی کـورد نێـوبانگیـان هەبووە، ئەمڕۆکە نەوەی نوێ زۆریان لێ ناناسێ، لەبەرئەوەی کەمتر ناویان دێتە پێشەوە و باسیان لێوە دەکرێ. یان بۆی هەیە لە شارێکدا شەخسێک زۆر ناسراو بێت و لە شارێکی تردا ئەوەندە نەیناسن، بۆیە هەستم بەپێـویسـتی ڕوونکردنەوەی ئەم ئیـشـارەتانە کـرد، تا نەوەی ئەمڕۆکە زیاتر بەو ناوانە ئاشنا بکرێن و هەوڵم داوە زۆربەی ئەو ناوانە لە پەڕاوێزی شیعرەکاندا، بەپێی مەودا و پێویستی - لە هەندێ شوێندا بەکورتی و لە هەندێ شوێنی تر بەدرێژی - لێیان بدوێم. لەگەڵ ئەوەشدا کە درێژەدان بەو لاباسانە دوور کەوتنەوەیە لە ستراتیژییەتی کارەکەم وەک پیاوانی سیاسەت دەڵێن، بەڵام چونکە بۆ خوێندەواری کوردی ئەمـڕۆکـە تازە بابەتن، ئەوە بەلامـەوە قـازانجی لە زیانی زۆرترە، هیچ نەبێ دەبێـتـە هاندەرێک بۆ کەسانی دی تا لە پاشەڕۆژدا بیانکەنە پڕۆژەی باسی سەربەخۆی نووسین تا وەک نـواندنی وەفـایەک بەرانبـەریان بەسـەریان بکەینەوە. سـەرەڕای ئەوەش لەو سەردەمـەمـانـدا پێـویسـتـە لە سـاغکردنەوەی دیوانی شیـعـریی شـاعـیرێک، شیـعـرەکـانی بەڕوونی و بەبێ گرێوگۆڵ و کۆسپ و تەگەرە بخرێتە بەردەم خوێنەران و هێلکەیان بۆ سپی بکرێت، بەبێ ئەوەی بـگەڕێنەوە سـەر فـەرهەنگ و بەدوای ناسنامـەی کـەسدا بـگەڕێن و لەبارەی ژیانی کەسەوە پرسیار بکەن.

ڕاستە ئەمڕۆکە بەرنامەی ساغکردنەوەی دەقی ئەدەبی و بەرنامە لە کاری لێتوێژینەوەدا وەک زانسـتێکی سـەربەخۆی لێـهاتووە و دابونەریتـێکی بۆ دارێژراوە، هەمـوو میـللەتانی ڕووی زەمین سـوودی لێ وەردەگرن و لە بەرژەوەندی ئەدەبی نەتەوایەتی بەکـاری دەهێنن و لە زانکۆکاندا قوتابیان دەیخوێنن، بەڵام دیسان ئەو بەرنامەیە ئەوەندە وشک و برنگ نییە بکرێتە قەفەس و باسکار و لێتوێژەرەوەی بخرێتە ناوەوە، بەڵکو بەپێی مۆرک و خاسیەتی ئەدەبە نەتەوەییـیـەکە سوودی لێوەردەگیرێ، ئێـمـەش وەک میللەتێک کە دەق و مۆری زۆر بوار و لایەنی ڕۆشنبیریمان نەشکاندووە، ناکرێ ئەو بوارانە بە لنگەوقووچی بهێـڵـینەوە، چونکە ئەو لایەنانە لە لای مـیللەتانی تر دەمـێکە حـەقی خـۆیان دراوەتێ، بۆیە تا پێم

کرابێ ئەو ڕووداو و ناوانەی هاتوونەتە پێش، لە باسکردنیدا قسوورم نەنواندووە. هیچ نەبێ بۆ ئەوەی خوێنەران بزانن ئەو ڕووداوە یان ئەو کەسە، شایانی ئەوەیە شیعری بۆ بگوترێ یان نەء؟!

هەر دیسان بەمەبەستی ئەوەی شیعرەکان لەبەر دەستی خوێنەراندا ڕوون بن، (فەرهەنگۆکێک)م بۆ وشە قورسەکان سازداوە و بەپێی پیتەکانی ئەبجەد مانای وشەکانم لێک داوەتەوە. لەم کارەشدا بۆ ئەوەی لەخۆمەوە قسە فڕێ نەدەم و مەعنای وشەکان بەوردی بپێکم، پەنام بردووەتە بەر کۆمەڵێ فەرهەنگی جۆراوجۆر وەک فەرهەنگی (العمید) و (المنجد) و (مختار الصحاح) و (فەرهەنگی خاڵ) و (قامووسی زمانی کوردی) و (مەهاباد) و (دیوانی نالی و فەرهەنگی دیوانی نالی) تا خوێنەر لە مەعنای وشەکان تێبگات و لەو تێگەیشتنەوە لە مەعنای شیعرەکە نزیک ببێتەوە. مەعنا لێدانەوەی وشەکانیش بەوردی دەستنیشانم کردوون، بەبێ درێژ دادڕی و بەبێ هێنانەوەی هەموو مەعنایەکانی وشەکە، بەڵکو ئەو مەعنایەم نووسیوە، کە شاعیر لە شیعرەکەیدا مەبەستی بووە، یان ئەگەر دوو واتای هەبووبێ، هەردووکیانم نووسیوە. هەندێ جاریش بەرانبەرەکەیم نووسیوە واتە - مورادیفەکەی - تا خوێنەر لە بەرانبەر مەعنا جۆر بەجۆرەکانی وشەکە دەستەپاچە نەوەستێ و بە مەعنایە تەواوەکەی شیعرەکە بگات. بۆیەش فەرهەنگۆکم جیا کردووەتەوە، تا پەراوێزەکان لەوە زیاتر قەڵەباڵغ و جەنجاڵ نەکەم و باری گرانتر نەبێ. لە لایەکی تریشەوە خوێنەر ئەوەندە لە خوێندنەوەی شیعرەکە نەپچڕێ و زۆر چاو نەگوێزێتەوە سەر پەراوێز و ئەمەش لە تاموچێژی شیعرەکەی بکات.

گەڕان و سۆراغکردنی بەردەوامم بەدوای دەستنووسی (شێخ نووری)، بەرهەمێکی زۆری شیعری ئەو شاعیرەی خستە بەردەستم. ئەم دەستنووسانە زۆر شیعریان تێدا بوو کە لە ناو زیاتر لە دەستنووسێکدا نووسرابووەوە، بۆیە هەوڵم دا دوا دەستنووسی شاعیر بکەمە بنچینە، لە هەندێکیاندا بەئاسانی دەگەیشتمە سەر دوا دەستنووسەکە، بەڵام لەبەرئەوەی زۆر لەو دەستنووسانە مێژوویان لەسەر نەنووسرا بوو، ئەوە ناچاری دەکردم یەکێکیان لێ بکەم بەبنچینە و جیاوازییەکانی تر لە پەراوێزدا نیشان بدەم. لە بەرنامەی چاپکردنی شیعری ئەو شاعیرانەی دەستنووسی خۆیان لەبەر دەستدایە، پێویست بەپەراوێز نووسین و بەراورد کردن لەگەڵ دەستنووسەکانی تر ناکات، بەڵکو دوا شێوەی داڕشتنی شیعرەکە دەخرێتە بڕبڕەی دیوانەکەوە، لەگەڵ ئەوەش من لە کاتێکدا ئەگەر پشتم بەدوا دەستنووسی شاعیریش بەستبێ هەوڵم داوە ئەو بەیتانەی بۆی زیاد کردووە یان لێی

دەرکردووە و دانیانی پێدا نەناوە، لە پەراوێزدا بیانووسم، جیاوازییەکانی تر لە ئاڵوگۆڕ کردنی شوێنی وشە و دەست پێداهێنان بەشیعرەکە لە پەراوێزدا نەمنووسیون و پشتگوێم خستوون. یان کە شیعرێکی بڵاو کرابێتەوە و من دەستنووسی خۆیم لا بووبێ، پشتم بەدەستنووسەکەی خۆی بەستووە، لەبەرئەوەی نەوەک لە کاتی بڵاوکردنەوەی شیعرەکە دەستکاری کرابێ یان لێیان قرتاندبێ. خۆ ئەگەر زانیبێتم دەستنووسەکەی لای من ڕەشنووسە، ئەوە پشتم بەرۆژنامەکە بەستووە. لە هەموو بارێکدا تا پێم کرابێ نوسخەی پاکی شیعرەکانم کردووەتە بنچینەی ئەم دیوانە، بۆیەش لە هەموو حاڵەتێکدا بەدوای دەستنووسی شاعیردا گەڕاوم، چونکە دەسکاری کردنەکە هی شاعیرەکە خۆیەتی، کە بەهۆی سەنعەتسازی و سانسۆری هۆشیارییەوە کردوویەتی بۆ بژار کردنی شیعرەکەی لە شتی لابەلایی یان شوێنی وشەکانی قایم و پتەوتر کردووە و دوا قەناعەتی خۆیەتی، دەستنووس و بەیازی کەسانی تر نین تا جیاوازییەکان بنووسین و لە هەڵبژاردنی دەقی شیعرە ڕاستەکەدا، بیروڕا و چێژی خۆم بکەمە سەروەر، بۆیە هەر چۆن بووبێ، تەنانەت ئەگەر لە دەسکاری کردنەکەی لەگەڵ دەستنووسی پێشتر جوانتریش نەبووبێ، من کنەم تێدا نەکردووە.

دەمێنێتەوە سەر ڕەشنووسەکان کە کەرەستەی ڕەخنەگرانن و دەتوانن لە دوارۆژدا بیانبینن و ڕای خۆیان لەسەر چۆنیەتی دەسکاری کردنەکەی شاعیر دەرببڕن، یان بۆ باس و لێکۆڵینەوەکانیان سوودیان لێ وەربگرن، وەک چۆن ئەمڕۆکە ئەم ڕەشنووسانە بوونەتە کەرەستەی دەیان لێکۆڵینەوەی نەفسی و سایکۆلۆژی[٢].

شاعیر زۆربەی شیعرەکانی خۆی بەبێ ناوونیشان بەجێ هێشتبوو، بۆیە منیش بۆ چارەسەرکردنی ئەم کەلەبەرە چەند وشەیەکی میسرەعی یەکەمی شیعرەکەم کردووە بەناوونیشان، وەک عادەتی ئەو کەسانەی کە بۆ شاعیرە کلاسیکیەکانمان کراوە، چونکە نەدەلوا من لە خۆمەوە ناونیشان بۆ شیعرەکان دابنێم.

لە بەرنامەی ساغکردنەوەی شیعری شاعیرەکاندا، چەند ڕێگەیەک بۆ دانانی شیعرەکان هەیە.

**یەکەم:** ڕیزکردنی شیعرەکان بەپێی مێژووی نووسینیان.

---

(٢) بۆ نموونە بڕوانە کتێبی: (الاسس النفسية للابداع الفني - في الشعر خاصة) د. مصطفى سويف- القاهرة.

**دووەم: بەپێی بابەتی شیعرەکان.**

لە ساغکردنەوەی دیوانی شاعیرە کلاسییەکانیش بەپێی پیتەکانی ئەبجەد شیعرەکان دەنووسرێنەوە، بەڵام لەبەرئەوەی (شێخ نووری) شاعیرێکی کلاسیکی نەبووە، خۆی بەم دەستوورەوە نەبەستۆتەوە، لەبەرئەوەش کە بەشێکی زۆری شیعرەکانی مێژووی نووسینی بەسەرەوە نەبوو، بۆیە من بەپێی (بابەت) شیعرەکانم جیا کردەوە.

شێخ نووری وەک نەریتی زۆربەی شاعیرە هاوچەرخەکانی خۆی بەرێنووسی فارسی شیعرەکانی خۆی نووسیوە، لەم چاپەدا من شێوەی نووسینی فارسیی ئەم شیعرانەم گۆڕی بۆ شێوە نووسینی ئەمڕۆکە، ئەمەش بۆ خۆی کارێکی سووک و سانا نییە و تەگەرەی زۆری خستە بەردەمم و لە ساغکردنەوەیدا زۆری پێوە ماندوو بووم.

لە زۆر دێرە شیعردا، لە کاتی پاکنووس کردن بێت، یان لە نووسینی ڕەشنووسی شیعرەکە، شاعیر زۆر پیت و وشەی لە بیر کردووە، ئەمەش بووەتە هۆی لاسەنگ کردنی شیعرەکە و تێکدان و شێواندنی مۆسیقایەکەی. من هەوڵم داوە ئەم کەلەبەرە، هەروا بەجێ نەهێڵم و هەوڵی چاککردنی بدەم و لە پەراوێزیشدا پەنجە بۆ چۆنیەتی چاککردنەکە ڕابکێشم تا بوار و دەرفەت بۆ کەسانی تریش بهێڵمەوە بیروڕای خۆیانی لەمەڕ دەرببڕن.

(شێخ نووری) وەک زۆر لە شاعیرانی ئەو سەردەمە، لە شیعرەکانیدا وشەی عەرەبی بەکارهێناوە، لە وشە عەرەبییەکاندا پیتی تێدا بوو وەک: (ذ، ط، ث، ض) من بەپێی شوێنی وشەکە لە شیعرەکەدا کردوومن بە(ز، ت، س، ز) بۆیەش دەڵێم (بەپێی شوێنی وشەکە) چونکە لەو شوێنانەی زانیبێتم تەئسیر دەکاتە سەر مۆسیقای وێنە شیعرییەکە یان بەیتەکە ئەوە وەک خۆی بەجێم هیشتووە. لە هەندێ شوێندا شاعیر پەراوێزی نووسیوە، من لەو شوێنانە بەئەمانەتەوە لە ژێر پەراوێزەکاندا ناوی خۆیم نووسیوە و بەهیچ شێوەیەکیش دەسکاری پەراوێزەکانم نەکردووە!.

## ئەو سەرچاوە و دەستنووسانەی
## لە ئامادەکردنی ئەم دیوانەدا لە بەردەستمدا بوون

وەک بۆمان ڕوون بووەوە (شێخ نووری) خاوەنی بەرهەمێکی زۆر و زەبەند بووە، بەڵام ئەوەندەی لە چاپ درابن، تەنیا یەک کۆمەڵە شیعریەتی، کە بریتییە لە چوار شیعر و قەسیدەیەکی درێژ. ئەم کۆمەڵە شیعرە بەناوی (هۆنراوەی نووری شێخ ساڵح) لە چاپخانەی (کامەرانی) لە ساڵی (٢٥٧٠ک - ١٩٥٨ز)، لە شاری سلێمانیدا لە چاپ دراوە. نامیلکەکە بریتییە لە (٤٠) لاپەڕەی قەوارە ناوەنجی، (٩) لاپەڕەی بۆ پێشەکییەکەی (کامەران موکری) تەرخان کراوە. شیعرەکانیش بریتین لە (شیوەنی شێخ مەحموودی سەرۆک) و (ئەو کارەساتەی لە هێنانەوەی جەنازەکەدا ڕووی دا) و (لە خەوما) و (١٤ی تەممووز) و شیعرێکی تریش هەر بەناوی (چواردەی تەممووز)ەوە.

(کامەران موکری) وەک لە کۆتایی پێشەکییەکەیدا دەری خستووە و دەڵێ: (زۆر سوپاسی مامۆستا نووری ئەکەم کە ئەم سەربەرزییەی بە من بەخشی). (شێخ نووری) ئەم چەند شیعرەی داوە بە مامۆستای ناوبراو تا پێشەکی بۆیان بنووسێ و لە چاپیان بدات. کە مامۆستا (کامەران)یشم بۆ ئەم مەبەستە بینی و دواندم وتی: (بەڵێ من سەرپەرشتی لە چاپدانی ئەم نامیلکەیەم کرد. ئەم چەند شیعرەم بەدەسخەتی مامۆستا شێخ نووری وەرگرت و پێشەکیم بۆیان نووسی و بەیارمەتی خاوەنی چاپخانەی (کامەرانی) خستمانە ژێر چاپەوە. ئەوەندە نەمابوو لە چاپکردنی نامیلکەکە ببینەوە، کاتێ هەواڵی کۆچی دوایی مامۆستامان پێگەیشت و شیعرەکانی خۆشی بەچاپکراوی نەدی. وادیارە دوای ئەوەی ئەم شیعرانەی داوە بەمامۆستا کامەران، بەردەوام لەگەڵ شیعرەکانیدا ژیاوە و دەستی پێدا هێناونەتەوە و لە هەندێ شوێندا دەسکاری زۆر و لە هەندێ شوێنی تر تەنکە دەسکاری کردوون، بگرە لە دەستنووسی تازەی هەندێکیاندا بەیتی لێ لابردوون و لە هەندێ شوێنی تردا دێری تازەی خستووەتە سەریانەوە، بۆیە من پشتم بەدەستنووسی تازەتری هەندێک لەو شیعرانە بەستووە و خستوومەتە بڕبڕەی کتێبەکەوە.

سەرچاوەی دووەمی ئەو دیوانە جگە لەو نامیلکە چاپکراوە، بریتییە لە سەرجەمی ئەو شیعرانەی کە لە ژیانی ئەدەبی خۆیدا پەیتا پەیتا لە گۆڤار و ڕۆژنامە کوردییەکانی کوردستانی عیراقدا بڵاوی کردوونەتەوە، بەتایبەتی ڕۆژنامەی (ژیانەوە) و (ژیان) و

(ژین) و (ڕۆژی کوردستان) و (بانگی کوردستان) و (پێشکەوتن) و گۆڤاری (پەیژە) و (گەلاوێژ) و (زاری کرمانجی) و زۆری تر کە لە بیبلیۆگرافیایەکەدا ناویان هاتووە. زۆربەی ئەم شیعرانەش وەک خۆیان ڕامگوێزاونەتە نێو ئەم دیوانەوە. خۆ ئەگەر دەستنووسێکی دیکەی یەکێ لەو شیعرە بلاوکراوانەم دەسکەوتبێ، ئەوە شیعرە بلاوکراوەکەم، پشتگوێ خستووە و دەستنووسەکەم کردووە بەبنچینە، بۆیەش جیاوازییەکانی ئەم دەستنووس و شیعرە بلاوکراوانەم نەنووسیوە، چونکە شیعرە بلاوکراوەکە لەبەر دەستی خوێنەر دایە و لە هەر کاتێکدا بیەوێ، دەتوانێ بگەڕێتەوە سەریان و لەگەڵ ئەو دەستنووسەی من پشتم پێ بەستووە، پێکیان بەراورد بکات، مەگەر لە هەندێ حاڵەتی پێویستدا نەبێ!

دەستنووسێکی شاعیر کاک (سدیق ساڵح) بۆی هێنام کە کاتی خۆی زۆری بۆ گەڕام، چونکە وەک بنەماڵەی شاعیر گوتیان لە ناو دەستنووسەکان دیار نەمابوو، ئەو دەستنووسە لە قەوارەی دەفتەرێکی بەرباخەڵ گەورەترە. (٢٢) پارچە شیعری گرتووەتە خۆی، بەمەرەکەبی سەوز بەدەسخەتی خۆی ئەو شیعرانەی نووسیبووەوە، لەو شیعرانەدا تێیاندا هەبوو ڕەشنووس بوو، وەک ڕەشنووسی شیعری (پەپوولە) و (بەهار) و (ڕوباعیاتی خەیام). هەروەها وەرامی شیعرێکی شێخ نووری-ش هەر بەدەسخەتی خۆی نووسراوەتەوە کە (ڕەمزی مەلا مارف) بۆ شیعری (هاوار لە دەست مالیە) نووسیبووی. کۆمەڵێ بەیتە شیعری تازەشی تێدایە، ئەم دەستنووسە (٦٤) لاپەڕەییە کە زۆر لە لاپەڕەکانی بە سپێتی ماوەتەوە، دوو - سێ شیعری تازەی شاعیری دەسگیر کردم، مێژووی نووسینی زۆر شیعری دیکەشی بۆ دەرخستم کە لەمەوپێش لە هیچ دەستنووسێکی دیکەدا ئەو مێژووانە لەسەر شیعرەکان نەنووسرابوون، کە ئەوەش بۆ خۆی سوودی زۆر بەڕەخنەگران دەگەیەنێ. سەرباری ئەوەش شاعیر کۆمەڵێ ڕووداوی سیاسی و مێژوویی لای خۆمان و هەندەرانی لەو دەفتەرە خنجیلانەیەدا نووسیبووەوە.

مامۆستا محەمەد مستەفا حەمە بۆر-یش کە دەستنووسی زۆری لە لایە دەستنووسی مینای شکستە کە بەرهەمی شاعیرانی کوردی تێدا نووسراوەتەوە، ئەو دەستنووسە کە سێ بەشە و بەدەسخەتی مامۆستا (نەجمەددین مەلا) نووسراوە، بەشی یەکەم و سێیەمی لای مامۆستای ناوبراو پارێزراوە، کە سەیری ئەو دەستنووسەم کرد لە بەرگی سێیەمی ئەو دەستنووسەدا کۆمەڵێک شیعری شێخ نووری-م بینی، لە ناو ئەو شیعرانەدا، دووانیانم لا نەبوو، کە ئەو دووانەش (بەهاریی شێخ نووری شێخ ساڵح) و (شێوەی زێوەر) بوون.

دەستنووسێکی دی دیسانەوە دەستنووسی مامۆستا (نەجمەددین مەلا) بوو لە ناو دەستنووسەکانی لای مامۆستا (گیوی موکریانی) دەستم کەوت، ئەوەش هەر ئەو دەستنووسەیە کە لە کاتی خۆیدا (شێخ نووری) داوای لە مامۆستا (نەجمەددین مەلا) کردووە، گۆڤار و ڕۆژنامە کوردییەکانی بۆ بپشکنێ، بۆ ئەوەی هەرچی شیعری بڵاوکراوەی خۆی هەیە بۆی بنووسێتەوە. مامۆستاش چاکی لێ کردووە بەلادا و هاتووە ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی بۆ گەڕاوە، چی شیعری شێخ نووری بەرچاو کەوتووە، لە دەفتەرێکی سەد لاپەڕەییدا بۆی نووسیوەتەوە، لەو دەفتەرەدا شیعرەکان (٤٥) لاپەڕەیان گرتووە. من لام وایە تەکلیف کردنی مامۆستا (نەجمەددین مەلا) لە لایەن (شێخ نووری)یەوە بۆ ڕاپەڕاندنی ئەم کارە، لە بنەچەدا مەبەستی بووە بۆ مامۆستا (گیوی موکریانی) بنێرێ[1] مامۆستا (نەجمەددین مەلا) لەسەر بەرگی یەکەمی دیوی ناوەوەی دەفتەرەکە بۆ شێخ نووری نووسیوە و دەڵێ: (کاکە نووری! زۆر زۆر سڵاوت لێ ئەکەم، بەسەری تۆ عموومی مەوجووداتی جەریدەی کوردستان گەڕاوم لەمە زیاترم بۆ نەدۆزرایەوە کە لێرەدا نووسیومەتەوە و هەمووی بەتاریخ و نومرووی خۆی دەرجم کردووە !! دووبارە بۆ کەشکۆڵەکەش قسوور ناکەم، ئەتوانن سێ چارەک دینار بنێرن بۆتان ڕەوانە ئەکەم، ئیتر سەلام. بچووکت - ئیمزا - ٣/ ١٠/ ١٩٣٨) مامۆستا (نەجمەددین مەلا) کە دەفەرموێ (عموومی مەوجووداتی جەریدەی کوردستان گەڕاوم) مەبەستی ئەوەیە کە هەرچی گۆڤار و ڕۆژنامەی کوردیَ تا ئەو ڕۆژە دەرچووە، بۆی گەڕاوە. واتە ئەو مێژووەی کە دەفتەرەکەی بۆ ڕەوانە کردووە لە (٣/ ١٠/ ١٩٣٨). ئەم (٢٣) شیعرەی لە ڕۆژنامەی (پێشکەوتن) و (ژین) و (ڕۆژی کوردستان) ڕایکوێزاوە وا دەردەکەوێ جگە لەم سێ ڕۆژنامەیە، شوێنی تر نەگەڕابێ[2]، ئەگەرچی دەڵێ: (عموومی مەوجووداتی جەریدەی کوردستان گەڕاوم). ئەمە لە لایەک، لە لایەکی تریشەوە وەک بۆم ساغ بووەوە مامۆستا (نەجمەددین مەلا) ئەم چەپکە شیعرەی زۆر بەپەلە نووسیوەتەوە، بۆیە لە نووسینەوەیاندا تووشی زۆر هەڵە بووە، ئەم هەڵانەش شیعرەکانی لەنگ کردووە یان لە هەندێ شوێندا بەئارەزووی خۆی شیعرەکانی نووسیوەتەوە، بۆیەشە لە کۆتایی شیعرەکاندا ئەمە پاساو دەدا و دەڵێ: (تێبینی: لەم وەختەدا زۆر عاجز و دڵتەنگ بووم کە ئەم ئەشعارانەم

---

(١) سەیری ئەو نامەیە بکرێت کە بۆ مامۆستا (گیوی موکریانی) ناردووە و لە پاشکۆی ئەم کتێبەدا بڵاوم کردووەتەوە.

(٢) بۆ ئەو مەبەستە سەیری ئەو بیبلیۆگرافیایە بکە کە لەم کتێبەدا بۆ بەرهەمە بڵاوکراوەکانی شاعیر ڕێکم خستووە.

نووسیوەتەوە. ڕجا ئەکەم لە خەتا چاوپۆشی بفەرموون و بەقەڵەمی عالیتان تەسحیحەی بفەرموون نەجمەددین مەلا ٣/ ١٩٣٨/١٠ ئیمزا) ئەو قسەیە خۆی بۆ خۆی بەڵگەیە کە (عاجزی) و (دڵتەنگی) ئەو کاتانەی ئەم شیعرانەی تێدا نووسیوەتەوە بووەتە هۆی بەوردی نەنووسینەوەیان.

(شێخ نووری) کە دەستنووسەکەی لە مامۆستای ناوبراو وەرگرتووەتەوە و دەستی کردووە بەخوێندنەوەیان هەستی بەکەموکوڕی و لەنگی زۆر لە شیعرەکانی کردووە، بۆیە بەمەرەکەبی سەوز هەوڵی داوە هەندێ لەو هەڵانە ڕاست بکاتەوە، بگرە دڵنیا نەبوونی تەواویشی لەو شیعرانە کە بۆ مامۆستا (گیوی) ناردووە، وای لێ کردووە لە نامەیەکدا کە بۆ مامۆستا (گیوی) نووسیوە بڵێ: (غەزەتە کۆن و شڕەکانم هێشتەوە بۆ ئەوەی بەیەکێکدا بینێرم)، واتە ویستوویەتی ئەو شیعرانەی لەڕۆژنامە کوردییەکاندا بڵاو کراونەتەوە بۆی بنێرێ، لە شوێنێکی تری نامەکەیدا دەڵێ: (لە غەزەتە کۆنەکان، بەخوا هەر ئەمە مابوو کەوا بۆم ناردی. مندالان هەموویان لە ناو بردبوو) ناردنی ئەم ڕۆژنامانەش دوای چوار ساڵە بەسەر تێپەڕ بوونی نووسینەوەی شیعرەکانی لە لایەن مامۆستا (نەجمەددین مەلا)وە، لەگەڵ ئەو ڕۆژنامانەدا هەندێ شیعری بەدەستنووسی خۆی بۆ مامۆستا (گیو) ناردووە. لەگەڵ ئەو شیعرانەی لە ناو دەستنووسەکانی مام گیوی موکریانی دابوون، وێنەیەکیش هەبوو، دەڵێن مامۆستا گیو خۆی بۆی گرتووە. شێخ نووری لە پشت وێنەکەی خۆی نووسیویەتی: (ئەو وێنەی ژیانم لەگەڵ غەزەلێک بۆ ئەوەی لە مەجمووعەی ئەدیبانی کوردا نەشری بکات تەقدیمی خۆشەویستم گیو کرا ١٩٣٨/١١/١٩ ئیمزا).

قسەی خۆمان بێ، لەبەرئەوەی مامۆستا (نەجمەددین مەلا) زۆر بەوردی شیعرەکانی لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکان بۆ شێخ نووری نەنووسیبووەوە، لەبەرئەوەش کە لە کاتی چاوخشاندنم بەڕۆژنامە و گۆڤارەکان زیاتر هەستم بەو هەڵانە کرد[٣].

(٣) بۆ نموونە: شیعری (لە کوردوستاندا گرانی) کە شیعرێکی وەرگێڕدراوە و لە دوو ژمارەی ڕۆژنامەی (ژیان)دا بڵاو کراوەتەوە، کەچی مامۆستا (نەجمەددین مەلا) هەر دوو وەرگێڕانەکەی بەیەک شیعر زانیوە و داویەتییە پاڵ (شێخ نووری)، بەڵام شێخ نووری وەرگێڕانی هەمان شیعر کە لە لایەن (زێوەر)ەوە وەرگێڕدراوە جیای کردۆتەوە. لەبەر ئەوەش دەستنووسەکە لەبەر دەستی خوێنەراندا نییە، بۆیە نەکەوتمە بەراورد کردن و پەراوێز نووسین بۆ هەڵەکان. ئەوەندە نەبێ یەکسەر پشتم بەشیعرە بڵاوکراوەکانی نێو ڕۆژنامە و گۆڤارەکان بەست و کردمن بەسەرچاوەی باوەڕ پێکراو، چونکە ئەگەر بۆ ئەو مەبەستە خەریکی پەراوێز نووسین بوومایە. ئەوە دەبووایە چەندان لاپەڕە ڕەش بکەمەوە.

بۆیە من زۆر پشتم بەو دەستنووسە نەبەست. بەهەرحاڵ ئەو دەستنووسە ئەوەندەش لە سوود گەیاندن بەدەر نەبوو کە بەتەواوی بەلاوەم نابێ، بەڵکو شیعرەکەی کە بۆ (ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ) وتراوە، جگە لە دەستنووسەکانی (نەجمەددین مەلا) لە هیچ دەستنووسێکی تر یان لە هیچ ڕۆژنامە و گۆڤارێکدا بەرچاوم نەکەوت، لەبەرئەوە ناچار بووم بۆ ئەو شیعرەیان بگەڕێمەوە سەر دەستنووسەکانی مامۆستا. ئەمە لەولا بوەستێ، لە لایەکی تریشەوە زۆر شیعری بلاوکراوەی شێخ نووری هەبوون، لە کاتی بلاوکردنەوەیاندا هەندێ وشەیان لێ گۆڕی بوون، وشەی تریان لە جێگەیان دانابوو، بەڵام (شێخ نووری) بەمەرەکەبی سەوز چاکی کردبوون و ڕاستەکەی نووسیبوو. وەک گۆڕینی وشەی (کورد) بە (شەرق) لە شیعرە وەرگێڕاوەکەی (لە کوردستاندا گرانی). یاخود بەچێژی خۆی دەسکاری هەندێ وشەی کردووە کە بۆ خۆی بە لەبارتر و گونجاوتری بینیوە.

سوودێکی تری ئەم دەستنووسە لە ئامادەکردنی ئەم دیوانەدا ئەوەیە کە (شێخ نووری) بەدەستخەتی خۆی سێ شیعری خستووەتە سەری کە شیعری (شەو) و (شەوێ بازێ بە بازێکی وت ئەی یار) و (چاوت کە دوو میسراعی کوتبخانەیی...) بوون. لە لاپەڕەکانی دوایی دەفتەرەکەش بەدوو لاپەڕە بەمەرەکەبی سەوز ژیانی خۆی بەدەستخەتی خۆی بۆ مامۆستا (گیو) نووسیوەتەوە. مامۆستا (گیو)یش شیعرەکەی کە بۆ (مەلا فەندی) نووسیوە بەدەستخەتی خۆی لەو دەفتەرەدا نووسیوەتەوە، چونکە کاتی خۆی (شێخ نووری) ئەم لاوانەوەیەی بەهۆی مامۆستا (گیو)ەوە بۆ (عزەددین)ی کوڕی ناردووە.

دەستنووسێکی تری مامۆستا (نەجمەددین مەلا)م لەلابوو کە بریتییە لە (٢٢) لاپەڕە، وا دیارە ئەم چەند لاپەڕەیە بەشێ بووە لە کەشکۆڵێک و لەو کەشکۆڵە دەرهێنراوە، ئەم بەشە لاپەڕە (١٥ - ٣٦)ی ئەو کەشکۆڵەی گرتووە وەک لەسەر لاپەڕەکانی دەفتەرەکە نووسراوە، ئەم دەستنووسە ئەم شیعرانەی تێدا نووسرابووەوە: (عەسکەر)، (ڕوتبەی عەزەمەت لائیقی زاتێکە بزانێ)، (شین بۆ ساڵی ١٩٢٦م)، (لەسەر نیوە بەیتێکی یاوز سوڵتان سەلیم)، (مرثیە بۆ عەبدولکەریم بەگ حاکمی مونفەرید ساڵی ١٣٤٨ھ)، (دڵ)، (مەدحی متەسەڕیفی سلێمانی ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ).

دەستنووسێکی تری مامۆستا حەوت لاپەڕە بوو[٤]، ئەمەشیان لە کەشکۆڵێک جیا کرابووەوە. ئەم دەستنووسە ئەم شیعرانەی لای خوارەوەی تێدا بوو: (عەسکەر) و (وقت

---

(٤) ئەم دەستنووسەیان بەهۆی کاک (عەبدولڕەقیب یووسف)ەوە دەستم کەوت.

ارشادست) و (ئومێدی زەمانە، ئەمەلێکە بەد و بێ سوود) و (کوردی پەتی: شارەزوور تاکو بلێی جێگەیەکی...) و (فەلسەفەی نووری: نابی موونەوەر بەگوڵی یەخەیی چاکەت)، لەگەڵ شیعری (تاڵعی کوردی بەدبەخت).

کەشکۆڵێکی دیکەی نەجمەددین مەلا کە لە ئەرشیڤی د. مارف خەزنەدار پارێزرا بوو بەناوی (سۆزی نیشتمان)، ژمارە (١١٤٥)ی لەسەرە و ساڵی ١٩٤٥ نووسراوەتەوە. ئەم شیعرانەی شێخ نووری لە لاپەڕە (٤٠٢ - ٤١٠)یان لەو دەستنووسەدا گرتووە و ئەم شیعرانە دەگرنە خۆ: (وا بەهار هات و هەوا غالیە...) و (ئەی بادی سەبا پەیکی خەیالاتی ئەدیبان) و (وەڵامی زێوەر بۆ ئەو شیعرە) و (شین بۆ شێخ عەزیزی برای).

دەستنووسێکی تر بەمەرەکەبی سەوز نووسرابوو، قەوارەکەی لە دەفتەرێکی بەرباخەڵ گەورەتر بوو، بەدەسخەتی شاعیر نووسرابووەوە. ئەم دەستنووسەش یەکێکە لەو دەستنووسانەی بۆ (گیوی موکریانی) ناردووە. نامەیەکیشی لە دوا لاپەڕەی ئەو دەستنووسە لە ساڵی (١٩٤٢)دا بۆ مامۆستا (گیو) نووسیوە، هەر لەو نامەیەدا دەڵێ ئەم دەستنووسەم ناو نا (توحفە). ئەم دەستنووسی (توحفە)یە بریتییە لە (٢٠) لاپەڕە. چوارینێک و دە پارچە شیعری گرتووەتە خۆیەوە، کە ئەمانەن: چوارینێک بەناوی (نوورێکە کە دیدە حەددی بینینی نییە) لەگەڵ شیعری: (شیوەنی ئاوڕەحمانی خاڵۆزای، بەهار، بەهار، بۆ دۆستێکی قەدیمی خۆی نووسیوە، سلێمانی چ خۆشە نەوبەهاران، هاوزبانم زبانی منە، ساقیا مەی بێنە تێکەڵ بەزمە بادی نەوبەهار، ئادەمیزاد، گردی سەیوان، ئەی ڕۆحی ڕەوانم مەبە لەم وەزعە مکەدەر).

لە ناو دەستنووسەکانی کۆڕی زانیاری عێراق - دەستەی کوردی - دەستنووسەکانم پشکنی و چەند دەستنووسێکی ڕەشنووسی شاعیرم دەست کەوت، ئەم دەستنووسانە لەسەر چەند کاغەزێکی خورشیدی نووسرابوونەوە کە سەرەتای نووسین و دامەزراندنی شیعری (بۆ مێژوو) بوو، هەروەها لە ناو ئەم دەستنووسانەدا کە لە کاتی خۆیدا کوڕی شاعیر پێشکەشی کۆڕی زانیاری کردووە، دەستنووسێکی تری شیعری (لە خەوما)م بینی کە بەمەرەکەبی سەوز لە دەفتەرێکی بچکۆلانەی بەرباخەڵ نووسرابووەوە. لە ڕاستیدا لە ناو ڕەشنووسی ئەم دەسخەتانەی شاعیر تەنیا ڕەشنووسێکم بەرچاو کەوت کە لە دەستنووسەکانی لای خۆمدا نەبوون، کە ئەویش شیعرێکی موستەزادی بێ ناونیشانە، بەڵام لەبەرئەوەی نوسخەی پاکنووس کراوی ئەم شیعرەم دەست نەکەوت، بۆیە خستمە

دەستنووسێکی تر کە بەدەسخەتی شاعیر نووسراوە، بریتییە لە دەفتەرێکی دوو سەد لاپەڕەیی، کە دوا پاکنووسی هەندێ لەو شیعرانەیەتی کە لە دەستنووسی (گەڵاڕێزان)دا هەبوون، ئەم دەستنووسە (٩٠) لاپەڕەیە. نووسینەوەی ئەم شیعرانە بۆ چەند مانگێ بەر لە مردنی دەگەڕێتەوە، لەسەر بەرگی ناوەوەی نووسراوە (بەرگی دووەم). بەلامەوە ئەم دەستنووسە زۆر جێگەی متمانە بوو، بۆیە شیعرەکانیم یەکسەر خستە بڕبڕەوە - متن - ئەم شیعرانەش بریتین لە: (لە خەوما، ١٤ی تەمموز ١٩٥٨، ١٤ی تەمموز، بۆ مێژوو، گرتنی شێخ لەتیف، ناچم بۆ بەغدا، بۆ بێکەس). (بەرگی یەکەمی) ئەم شیعرە پاکنووس کراوانە کە شاعیر گەیشتووەتە دوا دارشتنیان زۆری بۆ گەڕام نەمدۆزییەوە.

# کۆمەڵێ بەرهەمی نادیاری شێخ نووری

پریاسکەی شیعری توند گرێ دراو
لە ترسی گەڕان، لە کون ئاخنراو
بیری ئازادی و وتاری نووسراو
لە کونەمشکی قوولا هەڵگیراو

شێخ نووری

ئەمە هەستی شاعیریکە، شێخ نووری لە ترسی زەبر و زەنگی سستمی پادشایەتی، بەرهەمێکی زۆری بووەتە خۆراکی مشک و لە ژێر گڵا ڕزیون. گەواهی شاعیرێکە، مەرگی زادەی فیکر و ئەندێشەی خۆی بینیوە و بەدەستەکانی خۆشی ناشتوونی. یان لە نزیکەوە ئاگای لە دەیان چیرۆکی لەناوچوون و فەوتانی بەرهەمی هاوڕێ شاعیرەکانی هەیە. ئەوەتا مامۆستا (کامەران موکری) دەڵێ: (مامۆستا شێخ نووریش بێگومان زۆر شتی وا سەیر و (بەئەندێشەی) بەسەر هاتووە، وە ئەو بەیتانە هەستی خۆی و ئێمەمانانە)[1] ڕاستە (شێخ نووری) کە هێشتا لە ژیاندا بووە بەرهەمی فەوتاوە، بەڵام لە دوای مردنیشی بەرهەمێکی زۆری بێ ناز کەوتوون و تەپوتۆزی بێنازییان لەسەر نەتەکێنراوە، بۆیە بەشێکی گرنگی ئەو بەرهەمانەی یان فەوتاون یان پەرشوبڵاون و لەبەر دەستدا نین. لە ئەنجامی ئەو سۆراغ و گەڕانەی کردوومە بۆ دەستگیرکردنی شیعر و بەرهەمی (شێخ نووری) گەیشتمە سەر ئەو ڕایەی کە ئەو شاعیرە جگە لەوەی بەروبوومێکی شیعری زۆری لێ ون بووە، کۆمەڵێ بەرهەمی بەنرخیشی دیار نییە. ئەو بەرهەمانەش بەڵگەی ئەوەن کە شێخ نووری خاوەن تاقیکردنەوە و بەهرەیەکی بەپیت و دەوڵەمەند بووە و لە پاڵ ئەوەشەوە ڕۆشنبیرێکی گەورەی سەردەمی خۆی بووە. سەرباری ئەو بەهرە و توانستە سروشتییەی لەو پیاوەدا هەبووە، مرۆڤێکی تا بڵێی جەرگ سۆز و بەهیمەتیش بووە لە ئیشکردن و خۆ پێگەیاندندا، چونکە زوو هەستی بەوە کردووە، ئەو میللەتەی ئەو یەکێکە لە ڕۆڵەکانی، میللەتێکی بێ پشتیوان و بێ کەس و پاشکەوتووە، لەبەر هەندێ ویستوویەتی وەک عادەتی زۆر ڕۆشنبیر و موونەوەری ئەو سەردەمە، بەهرەی خۆی لە زۆر بواری ڕۆشنبیریدا

(١) هۆنراوەی نووری شێخ ساڵح - چاپخانەی کامەرانی سلێمانی - ١٩٥٨ پێشەکی ل ٩.

تاقی بکاتەوە. بەتەنیاش نەیویستووە ئیشەکەی دەیکات خۆ لە قەرەدان و تاقیکردنەوە بێت و بەس، بەڵکو وەک شوێن پێ هەڵگرێکی ڕۆشنبیری ئەو سەردەمە، هەستی بە زۆر کەموکورتی و کون و کەلەبەری ڕۆشنبیری و ئەدەبی کردووە و بەدڵسۆزییەوە دەستی بۆیان بردووە و ڕچەیانی شکاندووە، چونکە هەموو لایەنەکان دەق و مۆر نەشکاو بوون، بۆیە دەبینین لە زۆر لەو بوارانەدا کارامە و دەست ڕەنگینانە هاتووەتە کۆڕ و مەیدانەوە.

ئەم شاعیرە بەجارێ چەند ئیشێکی ڕاپەڕاندووە، بۆیە دەکرێ سەرەڕای شاعیرایەتییەکەی وەک وەرگێڕ و وەک ڕۆژنامەنووسی قۆناغێکی ناسکی کوردستان، وەک یەکەم ڕەخنەگری تیۆری، وەک هەڵگری ئاڵای بیری نوێ و وەک نووسەری سیاسی، وەک شانۆنووس و ئامادەکاری ئۆپەرێت، وەک زمانزان و نووسەری ڕێزمان، وەک یەکێک لە شۆڕەسوارانی بواری شیعری درێژ و چیرۆکە شیعر و سروود، چی لە دەست هاتبێ درێغی نەکردووە. لە پێناوی پێشکەوتنی میللەتەکەی و بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی نوێخوازی و پێشکەوتنخوازانە لە کوردستاندا، تا ئەمیش وەک میللەتە سەرازاد و سەرفرازەکانی دنیا لە ڕەوتی شارستانیەت دوا نەکەوێ. بەهەر حاڵ بەم دەمودەستە مەبەستم نییە لەو بەهرە جۆراو جۆرانەی شێخ نووری بکۆڵمەوە، چونکە لێکۆڵینەوەی بەشێک لەم بەهرانەم خستووەتە بەرگی دووەمی ئەم بەرهەمانەی شێخ نووری، کە لە وتارەکانیدا بەڕوونی بیروباوەڕی خۆی خستووەتە ڕوو. ئەوەی لێرەدا مەبەستمە دەستنیشان کردنی ئەو کۆمەڵە بەرهەمە بەنرخانەی شاعیرە، کە لە دوای مردنی خۆی کەس دەربارەی چارەنووسیان هیچ نازانێ، تەنانەت بنەماڵەی شاعیریش نازانن ئەو دەستنووس و بەرهەمانە کەوتوونەتە لای کێ. منیش ئەگەرچی سەرو سۆراغێکی زۆرم کرد نەگەیشتمە ئەنجامێک. لەو بڕوایەشدام ئازاد کردنی ئەو بەرهەمانە لە زیندانی تاریکی، زیندووکردنەوەی کەلەپووری ئەم شاعیرەیە و بەتەواوی بەهرە و ڕۆشنبیری و شوێن و پایەی لە لامان ڕوون دەبێتەوە. ئێستاش با بزانین ئەم بەرهەمە ون بووانە کامانەن.

* لە بواری وەرگێڕاندا (شێخ نووری) بەرگی یەکەمی کتێبی (کورد و کوردستان)ی (مەردۆخ)ی وەرگێڕاوە. مامۆستا (هەردی) دەڵێ: (من ئەو کتێبەم لە ساڵی (١٩٥٧)دا دیوە و ماوەیەک لە لام بوو. لە دواییدا دامەوە بەشێخ نووری) شێخ جەنابی کوڕە گەورەی شاعیر و هەروەها شێخ حەسیبی کوڕی شێخ ئەحمەدی شێخ غەنی بەشێکیان لەو وەرگێڕانە خوێندووەتەوە و ئاگایان لەوەش هەیە کە وەرگێڕانەکەی تەواو کردووە. واتە وەرگێڕانەکەی تەواوە. کاک (جەمال موفتی)یش دەڵێ: [ لە ساڵی

(١٩٥٧)دا من بەشێکم لەو کتێبە لە سەر تەکلیفی خۆی نووسییەوە. ئەو کتێبەی لە فارسییەوە وەرگێڕابوو، زۆر لەگەڵیدا هیلاک بووبوو). کاتێ وەرگێڕانی ئەم کتێبە لە لایەن (محەمەد فیدا)وە کەوتووەتە بازاڕەوە وتوویەتی: وەرگێڕانەکەی ورد نییە و بگرە لە ئەمانەت بە دوورە). وا دیارە ئەم وەرگێڕانە ئەم دەست و ئەو دەستی زۆری کردووە و لە دواییشدا لە لای کەسێ ماوەتەوە کە جارێ مەعلووم نەبووە کێیە ؟!

* هەر لە بواری وەرگێڕاندا لە زمانی فارسییەوە، کتێبێکی دەربارەی (شاعیرانی فارس) ئامادە کردووە. وەک مامۆستا (محەمەد ساڵح دیلان) دەڵێ: (دەفتەرێکی دوو سەد لاپەڕەیی بوو، بریتی بوو لە ژیان و بەسەرهات و کۆمەڵێ شیعری (شاعیرانی فارس) لەگەڵ لێکۆڵینەوەیەکی تێروتەسەل دەربارەی شیعرەکانیان. شێخ نووری دەیزانی من حەز لە شیعری هەندێ لەو شاعیرانە دەکەم، بەتایبەتی شیعری کەلیمی هەمەدانی، بۆیە هێنای بۆ من تا بیخوێنمەوە) دوای بیستنی ئەم قسەیە لە مامۆستا (دیلان) کەوتمە هەواڵ پرسین و عەوداڵ بوون بەدوایدا، بەڵام نەگەیشتمە هیچ ئەنجامێک، کە کاک (جەمال موفتی)یشم بینی و باسی ئەو دەستنووسەم لا کرد، ئەویش لە لای خۆیەوە ئەوەی دووپات کردەوە و وتی: (لە ساڵی (١٩٥٧) ئەم دەفتەرەم دیوە و شێخ نووری بەتەمابوو لەو ساڵە بەدواوە دیراسە لەسەر کۆمەڵێ شاعیر بنووسێ و شیعرەکانیان وەرگێڕێ، لە ڕاستیدا ئەوەندەی من ئاگام لێی بێ شێخ نووری بەنیسبەت ناوەندی ڕۆشنبیری ئەوسا لە هەموویان پێشکەوتووتر بوو، موتاڵەعەی زۆری دەکرد و ئاگای لە ئەدەبی تورکی و فارسی بوو، ئەو دەفتەرەشم لە لابوو و لەسەر تەکلیفی خۆی بەشێکم بۆ نووسییەوە).

* شێخ نووری لە نامەیەکدا کە بۆ مامۆستا (عەلائەدین سەجادی) نووسیوە و دەڵێ: (نامەکەتانم وەرگرت لێم عایەن بوو ئەدەبیاتەکەتان زۆر جوان خوێندۆتەوە، بەرانبەر بەو زەحمەتەتان سوپاسی بێ پایانتان پێشکەش ئەکەم)[٢]. کە نامەکەم لە مامۆستا (عەلائەددین) وەرگرت، داوای ڕوونکردنەوەشم لێ کرد دەربارەی ئەو ئەدەبیاتەی بۆی ناردووە بیخوێنێتەوە، وتی: (کاتی خۆی شێخ نووری پێش ئەم نامەیە دەفتەرێکی دوو سەد لاپەڕەیی بۆ ناردم کە دەربارەی عەرووز و ڕەوانبێژیٚ نووسیبووی، نموونەکانی لە شیعری کوردی بوون. لە ڕاستیدا ئەم پیاوە لە عەرووز زۆر متەبەحیر بوو.

(٢) بڕوانە نامەی سێیەم کە لە پاشکۆی ژمارە (١)ی ئەم کتێبەدا بڵاو کراوەتەوە.

شارەزاییيەكى تەواوى لەم بابەتەدا هەبوو، بەڵام چونكە متەوازيع بوو، بۆ منى ناردبوو سەرنج و تێبينى خۆمى بۆ بنووسم و پاشان پێشەكييەكى بۆ بنووسم تا لە چاپى بدات. لە كاتێكدا من لە چاو ئەو شارەزاييیەكى ئەوتۆم لە عەرووز نەبوو. ئيتر ئەو دەفتەرە ماوەيەك لە لام مايەوە و لە دواييدا بۆم ناردەوە سلێمانى. جا نازانم چى لێ كرد و چى لێ بەسەر هات؟!).

* (شێخ نوورى) وتوويەتى: (تەبعى موتيعيەتى زۆر تەسادوفى كردووە لەگەڵ مەرحووم ئەحمەد موختار بەگى كوڕى عوسمان پاشادا هەر ئەو مەسرەعێكى وتووە منيش نيوەكەى تر. ئەسەرێكيان هەيە بە(نثر) دەرهەق بەدەستوورى ئەدەبياتى كوردى لە تەواو بوون دايە). ئەمەشم لەو دەستنووسەى مامۆستا (گيوى موكريانى) ڕاگوێزاوە، كە يەكسەر لە دەمى خۆى وەرگرتووە، بۆيەش ڕاناوى قسەكەرى تێدايە، بەڵام داخەكەم ئەو شيعرانەى كە لەگەڵ (ئەحمەد موختار جاف)دا وتوونى دەسمان نەكەوتن، ئەو ئەسەرەش كە بە(نثر) دەرهەق بەئەدەبياتى كوردى نووسيويانە و لە تەواو بوون دايە ديار نييە. مێژووى ئەو دەستنووسەش (١٢/١٢/١٩٤٢)ى پێوەيە.

* لە (١٤/٩/١٩٨٢)دا لە ماڵەوە سەرى مامۆستا (محەمەد مەولوود مەم)م دا دەربارەى شێخ نوورى كەوتينە گفتوگۆ كردن و وتى: (لە گەڵاڵە كاتبى ناحيە بووم، ئەويش موديرى ناحيە بوو، زۆربەى شەوان لەگەڵ يەكتر دادەنيشتين. شێخ نوورى لە قسەكانيدا ديار بوو ژيانى ڕۆشنبيريى تورك زۆر كارى تێكردبوو. زۆريش حەزى لە شاعيرێكى تورك دەكرد كە ناوى (جەناب شيهابەدين)ە.[٣] ئەو كاتە (شێخ نوورى) دەفتەرێكى پانى حيساباتى لە لا بوو، كۆمەڵێ شيعرى تێدا نووسيبووەوە، ئەو دەفتەرەى دا بەمن بيخوێنمەوە و بيروڕاى خۆمى لەسەر دەرببڕم. وەک بيرم بێ شيعرێكى تێدا بوو بەناوى: (دەبى بەوەزير نابى بەپياو)[٤] كە حيكمەتێكى فارسى بوو كردبووى بە شيعر. لەگەڵ شيعرى (پەپوولە) و (ژيانى ئادەميزاد)م لە بيرە. دواى ماوەيەک ئەو دەفتەرەم دايەوە خۆى.) ئەم دەستنووسەشمان دەسگير نەبوو.

* بۆ پرسيار و سۆراغكردن دەربارەى شيعر و ژيانى (شێخ نوورى) دەبوايە پەنا ببەمە بەر كەسێكى وەک مامۆستا (ئەحمەد خواجە)، كە لە لايەكەوە هاونشينى بووە و لە

---

(٣) دوو كوڕى بەو ناوەوە ناو ناوە.

(٤) ئەمە يەكێكە لەو شيعرانەى، دەستم نەكەوتووە.

سەردەمێکدا زۆر بەیەکەوە بوون، لە لایەکی تریشەوە خزمایەتییان لەگەڵ یەکتردا هەیە. کە چوومە لای و باسی پڕۆژەکەم بۆ کرد و هەواڵی دەستنووسی (شێخ نووری)م لێ پرسی وتی: (لە کاتی خۆیدا زۆربەی ئێواران بەیەکەوە بووین و بەزۆری کاتمان بەیەکەوە رادەبوارد. نووری کە شیعرێکی تازەی دەنووسی، دوای ئەوەی بۆی دەخوێندمەوە، دەفتەرێکی بەرباخەڵم هەبوو لەو دەفتەرەدا بەشێخ نووری-م دەنووسییەوە. وای لێ هات ئەو دەفتەرەم بەدەسخەتی خۆی پڕ کردەوە. لە دواییشدا هەر شیعرێکی دەستنووسی خۆی یا نامەیەکی کە بۆمی ناردبوو هەموویم خستبووە دووتوێی ئەم دەفتەرە چکۆلانەیە و لەگەڵ دەستنووسەکانی (خواجە فەندی) باوکم و کۆمەڵێ دەستنووس و کتێبی دەگمەن و دانسقەی تر هەڵم گرتبوون. لە ساڵی (١٩٧٤)دا بەهۆی بارودۆخی ئەو کاتە سلێمانیم بەجێ هێشت. ئەمەش وای لە خوشکە - نەزیرە کەریم - کردبوو کە ئەوسا (بەڕێوەبەری) کتێبخانەی مۆزەخانە بوو، کە لە ڕووی دڵسۆزییەوە بۆ ئەوەی ئەو دەستنووس و کتێبانە نەفەوتێن و لە کتێبخانەی ناوبراودا بیانپارێزێ، هاتبوو لە ماڵەوە ئەو کتێب و دەستنووسانەی بردبوو و لەوێ سجلێکی تایبەتی بۆ ناوی کتێبەکان و دەستنووسەکان کردبووەوە) من کە ئەو قسانەم بیست یەکسەر چوومە لای (نەزیرە خان) کە ئێستا فەرمانبەرە لە - پەروەردەی سلێمانی - تا وەک شارەزایەک لە شوێنی ئەو کتێب و دەستنووسانە یارمەتیم بدات. خوشکە (نەزیرە) بەدەنگمەوە هات و تەلەفۆنی بۆ یەکێ لە فەرمانبەرەکانی مۆزەخانە کرد، ئەوەی پێ ڕاگەیاند ئەو دەستنووس و کتێبانەی لە کوێ داناوە و چۆن لە سجلێک ناویانی نووسیوە، ئنجا داوای لێ کرد ئەو سجلەم بۆ دەربهێنێ و بیدا بە من سوودی لێ وەربگرم. کە چوومە ئەوێ کابرای فەرمانبەر چونکە چاک دەیزانی ئەو دەستنووس و کتێبانە (لرف)یان لێ دراوە و لە دەست یەکێک لە کۆنە فەرمانبەرەکانی لای خۆیان ڕزگاری نەبووە، کە هیوایەتی - لرف - لێدانی کتێب و دەستنووسی کردووە بەپیشەی خۆی، بۆیە دوای چاو و ڕاو کردن و هەندێ هێنان و بردنی سجلەکان وتی: (کاکە شتی وامان لا نییە)!!

دوای ئەوە جارێکی تر چوومەوە لای مامۆستا (ئەحمەد خواجە) وتی: (من دوای گەڕانەوەم داوام لێکردنەوە، ئەو دەستنووس و کتێبانەم بۆ بگێڕنەوە، بەڵام وا دیار بوو هەر ئەوسا بردبوویان). ون بوون و نەمانی ئەو چەند دەستنووسە لە کتێبخانەی ناوبراو ئەوە دەگەیەنی کە لە مەولا کەس بڕوای بەفەرمانبەرانی ئەو کتێبخانانە نەمێنێ و هیچ کتێب و دەستنووسێکیان نەداتێ. لە کاتێکدا ئەو دەستنووسانە کە دەبنە موڵکی

کتێبخانەیەک نابێ بەهیچ جۆرێک بدرێنە دەست کەس و ئەوەی کە زۆر پێویستی پێیان هەبێ بۆی هەیە بە(فـۆتۆکـۆپی) وێنەیان بگرێتـەوە و بیگەڕێنێـتـەوە بۆیان و بەئەمانەتیشەوە ئاماژە بۆ سەرچاوەکەی بکات. نەمانی ئەو دەستنووسانە شێوەیەکی ڕەوای تێدا نابینم، بۆیە هەر کاتێ لە هەر کونێکەوە سەر هەڵبدەن، من مەسەلەکە دەخەمە (دادگا)وە تا لەمەولا کتێبخانەکان ڕێزی کەلەپووری کورد بگرن و بازرگان و مافیاکانی ئەدەبی کوردیش، بەم شێوازە ناڕەوایە تەسەروف بەکەلەپووری کوردەوە نەکەن.

* مامۆستا (نەجمەددین مەلا) کە لە کاتی خۆیدا بەپارە بەدەسخەتە خۆشەکەی خۆی بەرهەمی شاعیرانی دەنووسییەوە. یەکێ لەوانە (شێخ نووری) بوو کە وەک چەند برادەرێک دەڵێن لە دەفتەرێکی دوو سەد لاپەڕەیی بەرهەمێکی زۆری شێخ نووری نووسیبووەوە، وتیشیان ڕەنگە ئەو دەستنووسە کەوتبێتە لای مامۆستا (شێخ محەمەدی خاڵ) و هەواڵی ئەم دەستنووسەم لێ پرسی وتی: (من نەمدیوە و نازانم کەوتووەتە لای کێ). دوای ئەوەش لە زۆر کەسی تر پرسیاری ئەو دەستنووسەم کرد، بەڵام هەر دەستم نەکەوت[٥].

---

(٥) سەرەڕای ئەو دەستنووس و دەفتەرانەی کە لە سەرەوەدا باسمان کردن، ئەوەندەی من بزانم چەند شیعرێکی تری (شێخ نووری) گووم بووە و جارێ چەندی هەوڵم دا دەستم نەکەوتن، لەوانە شیعرێکی کە لە ساڵی (١٩٢٥)دا شێخ نووری داوای کۆمەڵە شەتڵێکی لە مەلا خالیدی مەحوی کردووە، کە مەلا خالید لە خانەقاکەی (مەحوی)دا بایەخی زۆری بەگوڵ و شەتڵ داوە. کاتێ کە سەر لە ئێوارەی ڕۆژی ١٩٨١/٩/٢ لەگەڵ کاک (کەمالی ڕەمزی مەلا مارف) چووینە لای مامۆستا (شێخ محەمەدی مەحوی) پێی ڕاگەیاندم کەوا شیعرەکە نەماوە، ئەگەرچی خۆی شیعرەکەی بینیوە و ئەم دێرەشی لە بیر مابوو بۆی خوێندینەوە. (گوڵی مینا و جۆری و شەستپەڕ و شەوبۆ ڕەفیقم بێ). کە بەمامۆستا (ئەخۆڵ)م وت سەد و ئەوەندە شیعری شێخ نووری-م دەست کەوتووە، وتی: (من لەو بڕوایە دام شێخ نووری زیاتر لە حەوت سەد شیعریشی هەبووبێ).

# شیعری شێخ نووری لە دیوانی (بێخود)دا

لە کاتی ئامادەکردنی دیوانی (شێخ نووری) چەند دەستنووسێکم لەبەر دەستدا بوون، لە ناو ئەو دەستنووسانەدا چەند شیعرێکم کەوتە بەرچاو، پێشتر لە دیوانی (بێخود)دا بینیبوومن، بۆیە بۆ ساغکردنەوەی ئەم چەند شیعرە، هەوڵ دەدەم لەسەریان بوەستم و هەڵوێستەیەک بکەم تا ڕۆشنایی زیاتریان بخەمە سەر. لەو بڕوایەش دام نە من و نە کاک (محەمەدی مەلا کەریم) کە سەرپەرشتی لە چاپدانی ئەم دیوانەی کردووە مەبەستێکمان هەبێ، جگە لەوەی بەهەموو لایەک هەوڵ بدەین ڕاستی بپێکین و ئەم جۆرە گرێ کوێرانە بکەینەوە تا بەرهەمی هەر شاعیرێک بچێتەوە لای خاوەنە ڕاستەقینەکەی خۆیەوە. کاک (محەمەد)یش هەر ئەو مەبەستەی هەیە، بۆیە لە کۆتایی ئەو وتارەی دەربارەی (دلاوەران)ەوە نووسیویەتی دەڵێ: (هێشتا مەسەلەکە پێویستی بە لێکۆڵینەوەی ترە و ئەبێ زیاتری لەسەر بنووسرێ).

***

شیعری یەکەم کە دراوەتە پاڵ مامۆستا (بێخود) پارچە شیعری (دلاوەران)ە. کە لە لاپەڕە (١٣٦ - ١٤٠)ی دیوانەکەدا بڵاوکراوەتەوە. بەڵگەی سەرەکی بە هی (بێخود) زانینی ئەم شیعرە پشت بەستنە بەو ڕایەی مامۆستا مستەفا سائیب (١٩٠٤ - ١٩٨١) کە بۆ کاک (عەبدولڕەحمان موفتی) نووسیوە و دەڵێ: (لە ساڵی (١٩٢٢) لە کەرکووک قوتابی بووین، بەیانییان بەتورکی گۆرانییان پێ ئەوتین. بیستم کە جەنابی (بێخود) تەشریفی هاتووە بۆ کەرکووک، چوومە خزمەتی لە (بەرتەکیە)، وە لە دوای بەخێرهاتن عەرزم کرد لێرە بەتورکی گۆرانیمان پێ ئەڵێن، ئەویش فەرمووی جا مستەفا چیت ئەوێ؟ وتم: قوربان سروودێکمان بە کوردی بۆ دابنێ هەتا ئێمەش لەبەری بکەین. فەرمووی باشە، بەیانی وەرەوە تا سروودەکە بەری. بەیانی چوومەوە خزمەتی ئەم (سروودەی فەرموو بوو)! خوێندییەوە بۆم، منیش ڕەوانم کرد و بردم بۆ قوتابخانە وە بەقوتابییە کوردەکانم ڕەوان کرد. (خۆیشی نوسخەیەکی نارد بۆ سلێمانی بۆ شێخ نووری شێخ ساڵح کە لە ڕۆژنامەکاندا بڵاوی بکاتەوە). ئنجا قوتابخانەکان هەموو بردیان و قوتابییەکان لەبەریان کرد. سروودەکە لە سلێمانی بڵاوکرایەوە و ناوی شێخ نووری-یان لەسەر دانابوو، وە لە کتێبی (گۆرانی کوردی)دا بەئیمزای (م. نووری) بڵاوکراوەتەوە. ئەم سروودە لەسەر

ئاوازی (دیشب که مرا وضع وطن در نظر آمد) ئەوتریَ) جاریَ با لەپێش هەموو شتێکدا و پێش ئەوەی هیچ بەڵگەیەک بهێنمەوە دەمەویَ هەنگاو لەسەر ئەو قسانە بوەستم و موناقەشەیان بکەم. لە دواییشدا دێمە سەر دوو وتارەکەی کاک (محەمەدی مەلا کەریم) کە دوا بەدوای لە چاپدانی دیوانەکە بلاَوی کردوونەتەوە[1] ئنجا خاسیەتەکانی ئەم شیعرە باسَ دەکەم، تا لەگەڵ خاسیەتی شیعریی هەر شاعیرەیان بەراوردی بکەم.

لە پێشەوە کە مامۆستا (مستەفا سائیب) دەفەرموویَ: (لە ساڵی ١٩٢٢ لە کەرکووک قوتابی بووین) وەک کاکە (حەمە) لەسەر قسەکەی (کاکەی فەللاح) ئامـاژەی بۆ کردووە، ئەم شیعرە لە ئەسڵدا لە ژمارە (٢١)ی ڕۆژنامەی (ژیانەوە) ساڵی(١)، (٢٤)ی شەعبان ١٣٤٣، (١٩)ی مارتی ١٩٢٥دا و پاشماوەکەی لە ژمارە(٢٢)ی ساڵی (١)، (١)ی ڕەمەزان ١٣٤٣، (٢٦)ی مارتی (١٩٢٥)دا بلاو کراوەتەوە، کە ئەم شیعرە ناوی (ئینتیباه)ە و بەپەخشان لە فەرەنسییەوە، لە لایەن مامۆستا (مەحموود جەودەت)ەوە کراوە بەکوردی و خۆی لەم بارەیەوە دەڵیَ: (بینائەن عەلەیهی دەرحەق ئەم گۆرانییە کە گۆرانی (عەزیمەتە) نەختیَ عەرزی مەعلوومات بەلازم ئەزانم. ئەم گۆرانییە لە تەرەف ژنە فرانسزێکەوە کە ناوی (ماری ژوزەف شەنی)یەوە وتراوە و لە ناو فرانسزەکاندا بووە بەگۆرانییەکی زۆر مەرغووب و مەشهووری میللی. بەندە کە خوێندمەوە ئەم مەوزووعەم وەک فەوەرانی حسیاتێک...) تا ئەڵیَ: (فیکری مونەزیمەکەی کە ئەساس تەشکیل دەکا بەنەزەر ئەحواڵی ڕوحییە و تەمایلاتی خۆمانەوە نەختیَ هەڵمگێڕایەوە، بەمقەدیمەکەیەوە عەرزم کرد. لە تەرجومە کردنی عەرزی ئەسڵیشم ئەگەر یەکیَ لە شاعیرەکانمان مەوزووعەکەی لا چابوو بەزمانی خۆمان نەزمی بفەرموویَ، تاکو لە تەرەف منالەکانی مەکتەبەوە بەگۆرانی ببێژریَ. لام وایە ئەم هیمەتە هەموو هاوخوێن و هاوزمانمان خۆشحاڵ دەکا). مێژووی بلاوکردنەوەی ئەم پەخشانە لە ڕۆژنامەی (ژیانەوە)دا ئەوە دەردەخات کە ئەو مێژووەی خوالێخۆشبوو (مستەفا سائیب) باسی لێوە دەکات لەگەڵ یەکتردا یەک ناگرنەوە، چونکە ساڵی بلاوبوونەوەی پەخشانەکە (١٩٢٥)ە، کەچی ئەم دەڵیَ: (لە

---

(١) بڕوانە ڕۆژنامەی (بیری نویَ) ژمارە (٦٦) ١٩٧٣/٩/٢٦ وتاری: دیسانەوە لە بارەی شیعری (دلاوەران)ەوە. هەروەها گۆڤاری برایەتی ژمارە (١) ساڵی (١) خولی دووەم. نووسینی (محەمەدی مەلا کەریم).

ساڵی ١٩٢٢ لە کەرکووک...). پێش ئەم مێژووەش پەخشانەکە لە هیچ شوێنێکدا بڵاو نەکراوەتەوە، بێگومان بیری شیعرەکەش هەر لەو پەخشانەوە وەرگیراوە. هەر بۆ ئەو مەبەستە لەگەڵ کاک (جەمال موفتی) چووینە ماڵی کاک (عەبدولڕەحمان موفتی)، داوای دەستنووسی ئەو شیعرەم لێ کرد، بەدەسخەتی مامۆستا (بێخود) نووسرابێتەوە. چونکە ئەو زووتر پێی ڕاگەیاندم کە هەموو شیعرەکانی مامۆستا (بێخود)ی بەدەسخەتی خۆی لە لایەو لای خۆی پاراستوونی، بەڵام خۆی لە داوایەکەم بێدەنگ کرد. کە وتارەکەی کاک (حەمەی مەلا کەریم)م بینی بۆم دەرکەوت هۆی پشت خستنی داوایەکەم لە لایەن کاک (عەبدولڕەحمان موفتی)یەوە ئەوەیە کە کاک (محەمەد) نووسیویەتی: (کە دەستنووسەکانی خوالێخۆشبوو (بێخود)یان دایە دەستم بۆ ئەوەی ڕێکیان بخەم و لێیان بکۆڵمەوە و ئامادەیان بکەم بۆ چاپ، پارچەی (دلاوەران)یش یەکێک بوو لەو پارچانە کە لە ناو ئەو دەستنووسەدا بوون. بەڵام نەک بەخەتی (بێخود)ی خوالێخۆشبوو خۆی، بەڵکو بە خەتێکی تازە) ڕەنگە ئەم خەتە تازەیەش هەر خەتی کاک (ئاوڕەحمان) خۆی یان خەتی کەسێکی دیکە بێت.

هەر چۆنێ بێت (شێخ نووری) وەک شاعیرێکی چالاک و پڕ لە جموجووڵی ئەو سەردەمەی تەمەنی خۆی، بەتەنگ داوایەکەی مامۆستا (مەحموود جەودەت)ەوە چووە و ئەم شیعرە بەپەخشان وەرگێڕاوەی کردووە بەشیعر. وەک کاکە (حەمە) نووسیویەتی، بۆ یەکەم جار لە (دیاری لاوان)دا بڵاو نەکراوەتەوە، بەڵکو بۆ یەکەم جار هەر لەو ساڵەی مامۆستا (مەحموود جەودەت) وەرگێڕانەکەی تێدا بڵاو کردووەتەوە ئەم شیعرەش لە سیپارەیەکی بچووکی (١٥) لاپەڕەیی، لە ساڵی (١٩٢٥ - ١٣٤٤)دا لە چاپخانەی - بلدیة - لە سلێمانی لە چاپ دراوە و بەناوی (گۆرانی کوردی) بڵاو کراوەتەوە و لەسەر بەرگەکەی ناوەوەیدا نووسراوە: (لەسەر ئەمری عالی موتەسەریف و موفەتیشی ئیداری چاپ کراوە) وەک دەزانین ئەو کاتە موتەسەریفی لیوای سلێمانی پیاوێکی خزمەتگوزار و موونەوەری وەک (ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ) بوو کە دۆست و هاوڕێی (شێخ نووری) بووە. لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ کە هەر لەو ساڵەدا (مەحموود جەودەت) شیعرە بەپەخشان وەرگێڕاوەکەی بڵاو کردووەتەوە، ئەم گورج کردوویەتی بەشیعر و لەم نامیلکەیەدا بڵاوی کردووەتەوە. لە دواییدا (کوردی و مەریوانی) دوای تێپەڕینی حەوت ساڵ بەسەر لە چاپدانی ئەم نامیلکەیەدا لەسەر هەمان پێودان و ڕێ و شوێن لە ساڵی (١٩٣٢)دا نامیلکەیەکیان هەر بەناوونیشانی (گۆرانی کوردی) لە چاپخانەی - الأیتام - لە چاپ

داوە و شیعری (دلاوەران)یشیان لە نامیلکە چاپکراوەکەی ساڵی (١٩٢٥) وەرگرتووە و سەرلەنوێ لە (گۆرانی کوردی)یەکەی خۆیاندا بڵاویان کردووەتەوە، ناوەکەشیان لە (ئینتیباه)ەوە کردووە بە(دلاوەران)، کە (دلاوەران) لە نامیلکەی یەکەمدا دەستەی یەکەمن. جگە لەوەش (کوردی و مەریوانی) بەئەمانەتەوە شیعرەکەیان ڕانەگوێزاوەتە ناو نامیلکەکەی خۆیان و بە شێکی ئەم شیعرەیان قرتاندووە، بگرە لە زۆر شوێندا لەنگیان کردووە. هەر ئەمەش وای لە کاک (حەمە) کردووە لە کۆتایی شیعرەکەدا بڵێت: (لە خوێندنەوەی ئەم شیعرانە دەرئەکەوێ لە هەندێ (مصرع)یانا لەنگییەکی ئاشکرا هەیە. ئێمە جارێ ئەم لەنگییەمان پێ چار نەکرا، چونکە لە کتێبی (گۆرانی کوردی) بەو لاوە سەرچاوەیەکی ترمان لا نەبوو. لەوێشا بەم جۆرە نووسرابووەوە کە ئێمە لێرەدا بڵاومان کردوەتەوە). ئەم قسەیە ئەوە دەگەیەنێ کە ئەم دەستنووسی (دلاوەران)ەی خراوەتە بەر دەستی کاک (محەمەد) جێی متمانە پێکردن نەبووە، چونکە بەهەڵە لەبەر ئەو نامیلکەیەیان نووسیوەتەوە، بۆیە دەڵێ: [لە کتێبی (گۆرانی کوردی) بەولاوە سەرچاوەیەکی ترمان لا نەبوو] ئەوە لە کاتێکدا (کوردی و مەریوانی) بەبێ پەنجە ڕاکێشان بۆ نامیلکەی یەکەم زۆربەی هەرە زۆری سروود و گۆرانییەکانیان نەقڵ کردووە.

مامۆستا (بێخود) وەک کاکە (حەمە) بۆی چووە (وەرگێڕانێکی تری پارچە فەرەنسییەکەی پێش مێژووی شیعرە بەپەخشان وەرگێڕاوەکەی نەدیوە تا شیعرەکەی لەسەر ئەوە دانابێ، جگە لەوەی بڵاوکراوەتەوە. فەرەنسیشی نەزانیوە تا بڵێین ئاگای لە وەرگێڕانەکەی (مەحموود جەودەت) نییە، گومانیش لەبەردەم ئەوە ناهێڵێتەوە کە (مەحموود جەودەت) پێش ساڵی (١٩٢٥) ئەم شیعرەی وەرگێڕابێتە سەر زمانی کوردی و پێشانی (بێخود)ی دابێ، تا (بێخود) لەسەر ئەوە بنچینەی شیعرەکەی داڕشتبێ و پاش سێ ساڵیش ئنجا (مەحموود جەودەت) شیعرە بەپەخشان وەرگێڕاوەکەی خۆی بڵاوکردبێتەوە، چونکە کاک (محەمەدی مەلا کەریم) هەر خۆی بەڵگەیەکی بەهێزی بەدەستەوەیە کە دەڵێ: (لێرەدا ئەوەی کە من بیرم بۆی ئەچێ ئەوەتە کە مەحموود جەودەت هەر لە ساڵی ١٩٢٤- ١٩٢٥دا ئەم پارچەیەی کردووە بەکوردی، چونکە هەندێ پەلاری تیا داناوە بەرابەر بەڕەوشتی حکوومەتی خوا لێ خۆش بوو شێخ مەحموودی حەفیدا (من لێرەدا ئەو پلارانەم نەنووسییەوە) کە لەو ساڵانەدا لە شۆڕشدا بوو بەرانبەر بەئینگلیز)، ئەمەیان ساڵەکەی کە مامۆستا پەنجەی بۆ ڕاکێشا بوو بەهەڵەی دەخاتەوە. ئنجا کە دەڵێ: (عەرزم کرد لێرە بەتورکی گۆرانیمان پێ ئەڵێن، ئەویش فەرمووی جا مستەفا چیت

ئەویٚ؟ وتم: قوربان سروودێکمان بەکوردی بۆ دابنێ هەتا ئێمەش لەبەری بکەین. فەرمووی باشە. بەیانی وەرەوە تا سروودەکە بەری. بەیانی چوومەوە خزمەتی ئەم سروودەی فەرموو بوو).

که زانیمان بیری سەرەکی و هەوێنی ئەم شیعرە نە هی مامۆستا (بێخود) و نە هی (شێخ نووری)یە، ئەی چۆن بەم دەمودەستە مامۆستا (بێخود) ئەو وەرگێڕانەی دەسکەوت و بەشەوێک توانی بۆی دانیشێ ئەم ئۆپەرێتە جوان و بەهێزەی لێ بهۆنێتەوە؟! لە کاتێکدا ئەگەر ئەم پێش بڵاوکردنەوەی وەرگێڕانەکەش ئەم شیعرە بەپەخشان وەرگێڕاوەی دەسکەوتبێ و بەسەردان چووبێ بۆ کەرکووک ئایا لەم سەردانەدا، شیعرە بەپەخشان وەرگێڕاوەکەی لەگەڵ خۆی بردووە؟ کەواتە ئەم ئۆپەرێتە پێشتر نووسراوە، بگرە ئامادەکراوە و ئینجا لە نامیلکەیەکیشدا بڵاوکراوەتەوە. ڕەنگە لەم حاڵەتەدا (بێخود) لەسەر داخوازی (مستەفا سائیب) ئەم نامیلکەیەی پەیدا کردبێ و شیعرەکەی (شێخ نووری) لەبەر نووسیبێتەوە. کە ئەم شیعرەشی داوە بەکاک مستەفا ئەوە بەهیچ شێوەیەک بەڵگە نییە بۆ ئەوەی شیعرەکە بە هی (بێخود) بزانین، چونکە کە سەلماندمان ئەو ساڵەی مستەفا سائیب ناوی بردووە هەڵەیە، ئەوە تەنیا ساڵی دەرچوونی شیعرە بەپەخشان بڵاوکراوەکە و نامیلکە چاپکراوەکەی ساڵی (١٩٢٥)مان لەبەر دەستدا دەمێنێتەوە. کاتێ ئۆپەرێتەکەش لە سلێمانیدا بڵاوکرابێتەوە و مامۆستا (بێخود)یش بەسەردان چووبێ بۆ کەرکووک، (مستەفا سائیب) چۆنی زانی: (نوسخەیەکی نارد بۆ سلێمانی بۆ شێخ نووری شێخ ساڵح کە لە ڕۆژنامەکاندا بڵاوی بکاتەوە...)؟! ئنجا کە دەڵێ مامۆستا (بێخود) سەری کەرکووکی داوە، سەردانیش جێنشین بوون نەبێ بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ چ پێویست دەکات ئەو شیعرە بۆ (شێخ نووری شێخ ساڵح) بنێرێ، تا لە ڕۆژنامەکاندا بڵاوی بکاتەوە؟!.

شیعرێک وەک کاک (مستەفا) دەڵێ: لەسەر داخوازی خۆی و بەشەوێ نووسرا بێ، باوەڕ ناکەم خاوەنەکەی ئەوەندە پەلەی بێ وا زوو بڵاوی بکاتەوە، پێش ئەوەی چاوی پێدا بگێڕێتەوە و لە ڕووی (سەنعەتسازی)یەوە دەستی پێدا نەهێنێتەوە. لەو سەردەمەشدا، واتە لە ساڵی (١٩٢٥)دا شێخ نووری هیچ پێوەندییەکیَ بەڕۆژنامەوە نەمابوو، بەتایبەتی ئەو ڕۆژنامانەی خۆی ئیشی تێدا کردوون، وەک (ڕۆژی کوردستان) و (بانگی کوردستان). ئیتر نازانم بەچ بۆنەیەکەوە ئەم شیعرەی بۆ (شێخ نووری) ناردووە؟ لە کاتێکدا خۆی بەسەردان چووبێ بۆ کەرکووک بۆچی خۆی نەیناردووە بۆ ڕۆژنامەکان بۆی

بلاو بکەنەوە؟! یان کە بەناوی (شێخ نووری)یەوە بلاوکرایەوە، بۆچی (شێخ نووری) خۆی بێدەنگ کردووە و (بێخود) نەهاتووەتە قسە؟! بۆیەش کاک (محەمەد) ناهەقی نەبووە کە دەڵێ (منیش کە ئەمەم دی کەوتمە دوودڵییەوە، ئاخۆ بەڕاستی ئەم پارچەیە هی (بێخود) بێ وەک کاک (مستەفا سائیب) نووسیویە (یا وەک لە دیاریی لاواندا بلاو کراوەتەوە، هی شێخ نووری شێخ سالح بێ؟ سرنجم ئەدا شێوە و ناوەرۆکی شیعرەکە لە شێوە و ناوەرۆکی شیعرەکانی تری بێخود ناچن کە لە بەردەممان دان، بەڵکو لە شێوە و ناوەرۆکی شیعری شێخ نووری یان پیرەمێرد یان گۆران نزیکن. ئەمە وای لێ کردم کە شیعرەکە بە هی (شێخ نووری) دابنێم. لەولایشەوە قسەکانی کاک مستەفا سائیب مەودای ئەوەی نە ئەهێشت کە دوودڵیم بمێنێ و (ناچار بڕیارم ئەدا) کە ڕاستە شیعری بێخود خۆیەتی و دیارە لەبەر هۆیەکی تایبەتی بەناوی (م. نووری)یەوە بلاوی کردوەتەوە).

وا دیارە کاکە (حەمە) وەک خۆی دەڵێ (ناچاری) وای لێ کردووە بڕیار بدات کە ئەمە شیعری (بێخود)ە، ئەگینا هیچ هۆیەکی تایبەتی و گشتی لە ئارادا نییە، ئەم شیعرە بەناوی (م. نووری)یەوە بلاو بکاتەوە. تۆ بلێی کەسێک شیعرێکی نووسیبێ وەک کاک «مستەفا» دەڵێ پەرۆشی بلاوکردنەوەی بووبێ و ناردبێتی بۆ سلێمانی بۆ ئەوەی لە ڕۆژنامەکاندا بلاوی بکاتەوە، شیعرەکەش جارێک لە ساڵی (١٩٢٥)دا بلاوکرابێتەوە و جارێکی تر لە ساڵی (١٩٢٧)دا بەئۆپەرێت پێشکەش کرابێ و لە ساڵی (١٩٢٨)(*) و (١٩٣٢)دا بۆ جارێکی دیکە بلاوکرابێتەوە، هەر دەرفەت بۆ مامۆستا (بێخود) هەڵنەکەوتبێ هیچ نەبێ بەقسە، پەنجەیەک بۆ ئەو ڕاستییە درێژ بکات؟ ئەوە دەڵێم و نابێ ئەوەش لەیاد بکەین کە مامۆستا (بێخود) لە ساڵی (١٩٠٠)دا کە (هەڵەبجە)دا حاکم بوو، کچێکی مارە کردووە، ئەو کچە بەڕووداوێک مردووە، لەو کاتەوە لە شیعر وتن ساردبووەتەوە، مەگەر تاک و تەرا ئەگینا لە شیعری ئاینی بەولاوە شیعری تری نەنووسیوە. لە کاتی گەڕان و عەوداڵ بوونیشدا بەدوای ساغکردنەوەی ئەم شیعرە، چەندان کەس کە هاوچەرخی ئەم دوو شاعیرەن و لە سەردەمی ئەواندا ژیاون، ئەوەیان بۆ دووپات کردمەوە کە شیعرەکە هی «شێخ نووری»یە نەک (بێخود).

---

(*) مەبەست لە بلاوکردنەوەی لە (گۆرانی کوردی) کە لە ساڵی ١٩٢٨دا لە لایەن کەریم سەعید زانستی لەگەڵ کۆمەڵێک سروود و گۆرانی چاپ و بلاوکراوەتەوە.

له لایەکی تریشەوە مامۆستا (بێخود) شیعرێک ناڵێ دێرێکی کورت و دێرێکی درێژ بێت. جگە لەو شیعرەی ئێستاکە دراوەتە پاڵی هیچ نموونەیەکی شیعری تری نابینین، لەم جۆرە کێشانە و ئەو شێوازەی تێدا ڕەچاو کردبێ، بۆیە وەک کاک (حەمە) دەڵێ: [کە دیوانەکەی بێخود دەرچوو بەهۆی «دلاوەران»ـەوە لە ناو کۆڕ و کۆمەڵە ئەدەبییەکانی سلێمانیدا بولخاخێک پەیدا بوو، وا دیارە ئەوان زیاتر تەماشای شێوە و ناوەڕۆکیان کرد بۆ دیاریکردنی خاوەنی ڕاستەقینەی «دلاوەران»]. پەیدابوونی ئەو مقۆمقۆیەش لەبەرئەوەیە زۆر لەو کەسانەی لە نزیکەوە لەم مەسەلەیە ئاگادارن ماون و ئەگەر بەوردیش لە مەسەلەکە نەزانن، ئەوە لە شاعیریان بیستووە و ئاگایان لە بەهرە و توانایی ئەو بووە، یان لە کەسانی پێش خۆیان بیستووە، چونکە هیچ کامێکیان ناحەزی مامۆستا (بێخود) نین تا لە ناحەق شیعرەکەی لێ بکەن بە هی «شێخ نووری». (کاکەی فەللاح)یش هەنگی لە داری کلۆر نەدۆزیوەتەوە کە (گەیشتە) ئەوە بتوانێ پارچەیەک پەخشان بدۆزێتەوە کە ناوەڕۆکەکەی بەتەواوی لە ناوەڕۆکی «دلاوەران» ئەچێ)، چونکە ئەم مەسەلەیە، شتێکی زۆر زەق و ئاشکرا و ڕوونە و کەم کەسی ئەدەب دۆستی ئەم سەردەمە، نەخوازەڵا ڕۆشنبیر و ئەدیبەکان دەدۆزیتەوە ئەم مەسەلەیە نەزانێ. بێگومان (کاکەی فەللاح)یش هەر لە دەمی ئەوانەوە بیستوویەتی و لەوانەوە قۆزتوویەتییەوە. بەزیرەکی و تەقەللای خۆی نەگەیشتووەتە ئەو ڕاستییە، ئنجا شیعرە بەپەخشان وەرگێڕاوەکەش نەک هەر لە «دلاوەران» دەچێ، بەڵکو تەواوی پەخشانەکەیە لە قاڵبی ئۆپەرێتێکدا کە لە ژیانی کوردەوە نزیک بێ. مامۆستا (شاکر فەتاح) دەربارەی ئەم شیعرە دەڵێ: [لە ساڵی ١٩٢٧ من قوتابی بووم لە قوتابخانەی (فەیسەلییە) کە شێخ نووری خۆی هات و ئەم شیعرەی پێ لەبەر کردین و من یەکێک بووم لە ناو کۆرسەکان کە بەشداربووم لە ئەداکردنی ئەم ئۆپەرێتە. شێخ نووری بەدەنگی خۆی، کە دەنگێکی تا بڵێی نایابی هەبوو بە ئێمەی ڕەوان کرد] ئنجا دەڵێ: [هەر ئەوسا پێی ڕاگەیاندین کە شیعرەکە بەبۆنەی شۆڕشی گەورەی فەرەنسەوە دانراوە. خوالێخۆشبوو (مەحموود جەودەت) کە ئەفسەر و ئەدیبێکی کورد بوو لە ساڵی ١٩٢٥دا بەپەخشان گۆڕییە سەر زمانی کوردی، (شێخ نووری شێخ ساڵح) کە هونەرمەند و ئەدیبێکی بەناوبانگی ئەو سەردەمەی کورد بوو کردی بەهۆنراوە. لەنگەرێکی تایبەتی جوانیشی بۆ دۆزییەوە لەسەر لەنگەرێ [دیشب کی مرا وضع وطن در نظر آمد] کە ئاوازێکی فارسی بوو[2] لە ساڵی (١٩٢٧) لە لایەن تیپی

---

(٢) ئێستاش مامۆستا (شاکر فەتاح) ئەو ئاوازەی لە بیر ماوە و پێش دوو ساڵ لەسەر بەکرەیەک تۆماری کردووە و پێشکەشی ئەرشیڤی ئەمینداریتی ڕۆشنبیری و لاوانی کردووە.

لاسایکردنەوە و ساز و ئاوازی قوتابخانەی یەکەمی سولەیمانییەوە، ئەم گۆرانییە لە شێوەی (ئۆپەریت)دا لاسایی کرایەوە و گۆرانییەکەش گوترا. بەلای دانیشتوانی ئەو سەردەمەوە زۆر پەسند بوو، هەروەها بۆ جارێکی تر لەسەر شانۆی [یانەی فەرمانبەرانی شەقلاوە] لە سالی (١٩٥٤)دا لە ژێر چاودێری مامۆستا (شاکر فەتاح) خۆی، بۆ جارێکی تر ئەم ئۆپەرێتە بووژێنراوەتەوە و پێشکەش کراوە. ئەوانەی دەوریان تێدا یاری کردووە، بریتی بوون لە فەرمانبەران و قوتابیانی (شەقلاوە). مامۆستا (شاکر فەتاح) دەلێ ئۆپەرێتەکە جێگەی ڕەزامەندی بینەران بوو[٣] ئەم ئۆپەرێتە لە چەند دەنگێکی جیاجیای وەک: [دلاوەران - دایک - باوک - منالەکان - کچەکان - ئافرەت بەمنالەوە - کۆرس][٤] پێکهاتووە و ئەم حەوت دەنگە جیاوازە، هەریەکەیان بەجیا، کۆمەلە کەسانێک دەوری تێدا دەبینن و هەریەکەیان بەجلوبەرگی تایبەتی خۆیانەوە دێنە سەر شانۆ.

ئێستا دەمەوێ بزانم کاک (مستەفا سائیب) چۆن توانی ئەو شیعرە دوورودرێژە بەقوتابیان لەبەر بکات؟! ئەوە گومان پەرۆشی قوتابییەکان بۆ سروودی کوردی وای لێکردن وا زوو ئەزبەری بکەن، بەلام دەبێ بزانین کێ ئاوازی بۆ داناون و پەراوەی پێ کردوون، بۆ ئەوەی ئەو دەورە جۆر بەجۆرانە ئەدا بکەن؟ یان بۆچی مامۆستا (بێخود) کە

---

(٣) لەم قسانەی سەرەوەمدا سوودم لە موحازەرەیەکی دەستنووسی مامۆستا (شاکر فەتاح) وەرگرت، کە لە پایزی سالی (١٩٧١) لە هۆلی (تطبیقات دار المعلمین في السلیمانیة)دا پێشکەشی کردووە. موحازەرەکەم لە خۆی وەرگرت.

(٤) ئەمە یەکەم دەستپێشخەرییە لە بزووتنەوەی هونەری ئۆپەرێتدا. کاک مەحموود زامداریش لە کتێبەکەیدا «دەروازەیەک بۆ ئاواز و گۆرانی کوردی» ل ١٥٥ دەلێ: [لە نێو ئێمەشدا، تا ئێستا گەلێ هەولی سادە و سووک بۆ پەرەپێدانی ئەم هونەرە بەرزە دراوە یەکە هەولێ - بەبۆچوونی من - کە وەک بەلگەنامەیەکی نووسراو، بۆمان مابێتەوە، ئۆپەرێتی «دلاوەران»ـە کە لە سالی (١٩٣٠) و بەخامەی «ع. نووری» نەمر نەخشەی کێشراوە، کە خۆی لە خۆیدا، نیشانەیەکی سەوزی وەچەی یەکەمی بزووتنەوەی ڕۆشنبیری کوردیمانە لەم بارەیەوە). بەلام ئۆپەرێتەکە لە سالی (١٩٢٥)ـەو بەخامەی «م. نووری»یە نەک «ع. نووری». هەروەها بڕوانە ڕۆژنامەی (هاوکاری) ژمارە «٣٥٥» ١٩٧٧/٢/١٦ گۆشەی (دەنگێ) وتارێکی کاک مەحموود زامدار بەناوی (بەلگەنامەییکی تر) کە دەلێ: [لام وایە ئەمە یەکەم دەس پێشکەری و یەکەم ئۆپەرێتی کوردییە، کە بە شیعر نووسرابێتەوە... سەیرە...!].

مـەبەسـتی بووە سروود بەشـەوێک دابنێ، سـروودێـکی کـورتی خـۆی نەداوەتێ و پەنای بردووەتە بەر ئەم پارچە شیعرە بەپەخشـان وەرگێڕاوە درێژە، کە ئەرک و ماندوویێتی زۆرتری دەوێ وەک لەوەی خـۆی بینووسێ؟! دوایی شێـخ نـووری کە شیـعـرەکـە هی خـۆی نەبووبێ چۆن بەو گـەرمـوگـوڕی کـەفـوکـوڵـەوە دەچێ لە قـوتابخـانە بەدوای کـۆکـردنەوەی (کـۆرس) دەگەڕێ و بەدەنگی خۆی ڕاهێنان و پەراوەیان پێ دەکا؟!

ئەو سـروودانەی کـە لە نامـیلکەی (گـۆرانی کـوردی)دا لە سـاڵی (١٩٢٥) لە چاپ دراون، بەئاگاداری حکوومەت و [کاپتن لاین][*] تا ساڵی (١٩٣٠) لە قوتابخانەکانی سلێـمانی وتراونەتەوە، هونەرەکـەشی بۆ مـتـەسـەڕیفی ئەوسا ئەحـمەد بەگی تۆفـیق بەگ دەگەڕێتەوە، بۆیە من وای بۆ دەچم ئەگەر قسەکەی (مستەفا سائیب) ڕاستیش بێ ئەوە لە سـاڵی [٩٢٥ - ١٩٣٠] بووە، نەک سـاڵی (١٩٢٢)، کـە ئەمـەش وابێ دیسـان دەپرسینەوە چۆن کاک (مـسـتەفـا سائیب) زانیـویەتی (بێـخود) نوسخـەی ئەم شیـعرەی ناردووە بۆ سلێـمانی، لە کاتێکدا شیـعرەکە لە ساڵی (١٩٢٥) تەنیـا لەو سەرچاوەیەدا بڵاوکراوەتەوە کە نامیلکەی (گۆرانی کوردی)یە؟!

کە ئەم شیعرە لەم نامیلکەیەوە کەوتبێتە دەستی خوێندەواران و قـوتابیان و بەشێوەیەکی ڕەسمی لە قوتابخانەکان خوێندرابێ، ئیـتر نـازانم کێ لە خۆیەوە ناوی (م. نووری) لەسەر ئەم سـرووده داناوە؟!. کـە زانیـمـان سـەرچاوەی یەکـەمی ئەو شیـعـرە پشت بەسـتنە بەو نامـیلکەیە، جـارێکی تر دەپرسین: (بێـخـود) کـە بەسـەردان چووبێ بۆ کـەرکـووک، کـاک (مـستەفـا) خـۆشی لە کەرکووک بووبێ و لە نزیکەوە ئاگای لە مەسەلەکە نەبووبێ کە ئەم شیـعـرە چۆن هاتووەتە نووسین، ئەوەشی بەچاکی ڕوون نـەکـردبێـتـەوە کـە چۆن زانیـویەتی (بێـخود) ئەم شیـعـرەی ناردووە بۆ سلێـمـانی؟ لە کاتێـکدا ئەم قـوتابی بووە و (بێـخـود) پیـاوێکی بەتەمەن و خـاوەن پایەی خـۆی بووە، بە چ شێـوەیەک ئەو هاوڕێتـییە بەتـینە لە نێـوانیـاندا پەیدا بووە؟! کەواتە ئەم قسـەیە کە لە پەڕاوێزی ئەم شیـعرەدا نووسراوە، تەنیا وەک قسە دەمێنێتەوە.

لە مەسەلەی بڵاوکردنەوەی ئەم شیعرەش بەناوی شێخ نووری کاکە (حەمە) دەڵێ: (جا

---

(*) لەجیاتی کاپتن چاپمن کە سەرپەرشتی شالاوی بەسەردادانی شاری سلێمانی کردووە، ئەفسەرێکی یەدەگی ئینگلیزیان خسـتە شوێنی ئەو کە کاپتن لاین بوو. ل ٢٤. كشف القناع عن بعض الوقـائع العراقية - الجزء الأول - مذكرات عبدالعزيز ياملكي في العراق - ١٩٥٧ - حقوق الطبع محفوظة للمؤلف - مطبعة دار المعرفة - بغداد.

نازانم مەبەستی کاک مستەفا لەم بلاوکردنەوەیە، بلاوکردنەوەی ناو ڕۆژنامەیە یان بلاوکردنەوەی بەدەمە. خۆزگە ئەمەی ڕوون ئەکردەوە و بۆی دەرئەخستین ئاخۆ چۆن و لە کوێدا بلاو کراوەتەوە، تا زیاتر مەسەلەکەمان بۆ ڕوون ببێتەوە). هەر چەند کاک (محەمەد) لەسەرەتای وتارەکەیدا ئەوەی دەرخستووە کە لە گۆڤاری (دیاری لاواندا) بلاو کراوەتەوە، بەلام من سەرچاوەیَ یەکەم جاری بلاوکردنەوەی ئەم شیعرەم دەستنیشان کرد، بەهیچ جۆرێکیش لە گۆڤاری دیاری لاوان و یادگاری لاوان-دا بلاونەکراوەتەوە، دوای ئەوەی بۆمان دەرکەوت ئەم چەند قسەیە نە لە ڕووی مێژووەوە ڕاستە، نە بەڵگەیەکی ڕاست و دروستی ئەوتۆی داوە بەدەستەوە کە پیاو دڵی پێی ئاو بخواتەوە، بۆیە ئەو کەسەی باسەکەی بۆ کاکە (حەمە) گێڕاوەتەوە، قسەکانی وەک بلقی سەر ئاو وان و هیچیان ناچنەوە سەر یەک، بۆیەش موناقەشەم کرد تا بیسەلمێنم ئەو قسانە هاوسۆزی و لاربوونەوەیەکی تێدایە بۆ لای مامۆستا (بێخود)، بەلام بەشێوەیەکی نارەوا، ناهەقیشم نییە ئەو قسانە بکەم، فەرموون بزانن کاک (مستەفا سائیب) خۆی چی لە لای کاکەحەمە وتووە: (ئەمە سەرلەنوێ بیری ورووژاندمەوە و وتم بۆ سەرێک لە کاک مستەفا سائیبیش نەدەم، بزانم بەڵکو شتێکی نوێی لابێ؟ لەگەڵ کاک محەمەد ڕەسوڵ هاوار چووینە لای و سەرلەنوێ باسەکەم بۆ گێڕایەوە فەرمووی (ئاگام لێیە وەختی خۆی مەحموود جەودەت پارچە نەثرێکی فەرانسزیی کردبوو بەکوردی، بەمن و ئەنوەری برامی وت خۆزگە کەسێک بیکردبایە بەشیعر، ئێمەش بەعەلی کەمال باپیر و شێخ نووری-مان وت و شێخ نووری کردی بەشیعر و ئێمەش خستمانە سەر ئەو وەزنی فارسییە (وەزنی سروودی: دیشب کە مرا وضع وطن در نظر آمد) و بەیانییان لە قوتابخانە ئەمان خوێندەوە).[٥] کە ئەم قسانەش تەواو پێچەوانەی قسەکانی کاک (عەبدولڕەحمان موفتی)یە کە بەناوی مستەفا سائیبەوە بەکاک (محەمەدی) وتووە.

هەر لەو نووسینەدا کاک محەمەد نووسیویەتی: (منیش مەسەلەی نامەکەی نێوان خۆی و کاک عەبدولڕەحمان موفتی-م هێنایەوە بیری کە لە (دیوانی بێخود)ەکەدا ئیشارەتم بۆ کردووە و گوایە فەرموویەتی شیعرەکە هی بێخودە. فەرمووی: (نەخێر بێخود شیعرێکی کەی داومەتێ)[٦]. کە ئەم قسەیە هەموو مەسەلەکە دەبڕێنێتەوە و بەتەواوی ئەوە ئاشکرا

---

(٥) بڕوانە ڕۆژنامەی بیری نوێ، ژمارە (٦٦)، ١٩٧٣/٩/٢٦، محەمەدی مەلا کەریم.

(٦) سەرچاوەی پێشوو.

دەکات کە کاک (عەبدولڕەحمان موفتی) بەلێپرسینەوەوە قسەکەی بۆ کاک (حەمە) نەگێڕاوەتەوە و هەر لە ڕاهی خوا ویستوویەتی ئەم بەڕەیە بخاتە مزگەوتەوە، هەر بۆیەش ئەو دەستنووسە کە دراوەتە کاک (محەمەدی مەلا کەریم) بەخەتی (بێخود) خۆی نەبووە.

تا ئێرەیان پێوەندی بەقسەکەی مامۆستا (مستەفا سائیب) و گێڕانەوەی لە لایەن کاک (عەبدولڕەحمان موفتی)یەوە هەبوو، لێرە بەدواوە دەگەڕێمەوە سەر قسەکانی کاکە (حەمە) کە لەو دوو وتارەدا دەربارەی ئەم شیعرە نووسیویەتی. کاک (محەمەد) لە وتاری یەکەمیدا دەربارەی ئەم شیعرە دەڵێ: (بێخود) گەلێ شیعری تری وتووە کە بەناوی (م. نووری)یەوە بڵاوکراونەتەوە و شارەزایانی ژیانی بێخود و شێخ نووری ئەمە ئەزانن و کەسیان نکوڵییان لەم ڕاستییە نییە. کەواتە دوور نییە (دلاوەران)یش یەکێک بێ لەو شیعرانە). بۆ وەرامی ئەم قسەیە دەڵێم (شێخ نووری) شاعیرێکی ئەوەندە دەستەپاچە و داماو نەبووە بەرانبەر بەشیعر دۆش دامابێ و چاوی لە ناو و شوهرەتێک بووبێ لامێژانە لەسەر خوانی خەڵکی تر خواردبێتی. کەسیش بەچەند شیعرێک و بڵاوکردنەوەی چەند نووسینێک نەبووە بەشاعیر و ڕۆشنبیر، چونکە مرۆڤی بێ بەهرە و توانست وەک چەمە زستانە وایە هەر هاوین هات وشک دەکات و چک دەبێ، بۆیە من لەگەڵ ئەوە نیم (بێخود) شیعری خۆی دابێ بەشێخ نووری، خوێندنەوەی ئەم شیعرانەی لەو دیوانەدا هەیە باشترین بەڵگەن کە شاعیرایەتی شێخ نووری دەسەلمێنن، کاتێک شێخ نووری بەدەسخەتی خۆی بڵێ: (لە منداڵییەوە خەریکی خوێندنەوە و نووسینم) و لە تەمەنێکی زووەوە دەستی دابێتە خوێندنەوە و نووسین، دەشێ شیعری خۆی بردبێتە لای (بێخود) و بۆی دەسکاری کردبێ، وەک چۆن دەسکاری شیعری مامۆستا (گۆران)یشی کردووە[(٧)] بەڵام بڵێین شیعری بۆ نووسیبێ ئەمەیان ستەمە دەرهەق بەشاعیرێکی لێوەشاوەی وەک شێخ نووری.

سەرەڕای ئەوەش قسەکەی کاک (حەمە) هەر بەتەنیا قسەیە کردوویەتی و هیچ بەڵگەنامە و پاڵپشتێکی زانستی لە پاڵدا نییە، چونکە بۆمان دەستنیشان ناکات (بێخود) کە گەلێ شیعری تری بەناوی (م. نووری)یەوە بڵاو کردووەتەوە، ئەم شیعرانە کامانەن؟! یان ئەو شارەزایانەی ژیانی بێخود و شێخ نووری کێن کە نکوڵییان لەو ڕاستییە نییە؟! ئەگەر مامۆستا (بێخود) کە موونەوەرێکی ئەو سەردەمە بووە و خزمێکی

(٧) بڕوانە ل ١٥١ (شیعر و ئەدەبیاتی کوردی) نووسەری: ڕەفیق حیلمی - بەغدا ١٩٥٦.

نزیکی شاعیره، دەسکاری شیعری شێخ نووری کردبێ، ئەوە هیچ خەوش و نەنگییەکی تێدا نابینم، چونکە (بێخود) خۆی زۆر ڕێزی هەبووە بۆ بەهرە و توانایی شاعیرایەتی شێخ نووری و بەشایەتی زۆر لەو کەسانەی کە لە مەجلیسەکانی مامۆستا (بێخود) دانیشتوون[٨] ستایشی شێخ نووری و شیعرەکانی کردووە. ناکرێ ئەوە بەدوور بزانین کە شێخ نووری لە کارتێکردنی (بێخود)ی خاڵی دوور بووبێ، لە کاتێکدا (شێخ نووری) لە زۆربەی دانیشتنەکانی (بێخود) ئامادە بووە. ئەو کۆبوونەوانەش جگە لە (شێخ نووری)، کەسانی تری وەک (گۆران) و (بێکەس) و (ڕەمزی مەلا مارف) و (عەلی کەمال باپیر ئاغا)ی تێدا بەشدار بوون. مامۆستا (بێخود) لەو شیعرەیدا کە بۆ (عەلی کەمال باپیر)ی شاعیری نووسیوە باسی (شێخ نووری)یش دەکات، کە وەک دەردەکەوێ ئەو کاتەی ئەو نامە شیعرییەی نووسیوە (شێخ نووری) لە دانیشتنەکانی (بێخود) دوور بووە، بۆیە دەڵێ:

لە بەزمی حوسنی خۆتا توخودا جار جارە یادم کە
کە من پەروانەکەی ڕوخساری شەمعی مەجلیس ئاراتم
بە(شێخ نووری) بفەرموو چاوەکانت ماچ ئەکا (بێخود)
بەیادی خانەیی خەمماری ئەو مەستانە وا هاتم[٩]

دوا بەدوای ساغکردنەوەی ڕایەکەی مامۆستا (مستەفا سائیب) ئەم جارە کاک (محەمەد) نووسیویەتی: (شتەکە هەر بەچارە نەکراوەیی مایەوە، تا لەم دواییەدا ئاڵۆزییەکی تریشی هاتە سەر. نامەیەکی بەڕێز مامۆستا ڕەمزی مەعرووفم بۆ هات تیا نووسیبوو (ئەو غەزەلەی کە لە دیوانەکەی خاڵە مەلا مەحموود بێخوددا چاپ کراوە بەناوی (دلاوەران)ەوە، ئەو غەزەلە زۆر چاک ئەزانم کە هی مەلا مەحموودی خاڵمە کە لە وەختی خۆیدا دای بەشێخ نووری شێخ ساڵح کە بڵاوی بکاتەوە). لە ڕاستیدا کە ئەو قسەیەم خوێندەوە، گومانم کرد ویستم بۆ ڕەواندنەوەی ئەو گومانە بچمە لای چەند کەسانێکی باوەڕ پێکراوی ئەو سەردەمە. یەکەم کەس کە چوومە لای مامۆستا (هەردی) بوو، چونکە لەو شتانە پێویستی بە نامەوزوعیەت نییە، کە باسەکەم لە لا کردەوە ئەو لەوسەری

(٨) لەوانە برایان (کەمال ڕەمزی مەلا مارف و ناسح حەیدەری و شێخ جەناب و ئەخۆل و شێخ حەسیبی شێخ ئەحمەد و ئەحمەد خواجە).
(٩) دیوانی بێخود- ل ٤٣.

مەسەلەکە هاتبووەوە و وتی: (ئەم شیعرە هی شێخ نوورییە و لە کاتی خۆیدا - واتە کە دیوانی بێخود بڵاوکرایەوە - خەریک بوو وتارێک بنووسم، بەڵام لەبەرئەوەی هەر خۆم لە نووسین نەختێ سست و تەمبەڵم مەسەلەکەم پشتگوێ خست.) هەر بۆ ئەو مەبەستە خزمێکی نزیکی شێخ نووری کە ئەویش (نووری کاکە حەمە)یە کە بە نووری غەریبی ناسراوە، دەربارەی ئەم باسە وتی: (لە سالّی ١٩٣٠-١٩٣١دا لە ماڵی باپیرم کە ناوی (حاجی فەتاح قادر)ە کە خاڵی شێخ نووری بووە، ئەم شیعری (ئینتیباه)ی بۆ (میرزا ئاوڕەحمان)[١٠] و (حاجی حەمە ئەمینی) برای خوێندەوە و لەوێ منیش یەکێک بووم لە ئامادەبووەکان.

دوای ئەوەی لە خوێندنەوەی شیعرەکە تەواو بوو گوتی: (ئەگەر منالّەکان و کەسەکان یەک بەیەک لێرە دەورەکانیان نەبینێ، جوان دەرناچێ) کاک (عەبدولقادر قەزاز) کە یەکێک بووە لەوانەی دەوریان لەم ئۆپەرێتەدا بینیوە و ئاگای لە چۆنیەتی نووسین و پێشکەش کردنیەتی دەڵێ: (شێخ نووری پیاوێکی زۆر هەڵکەوتوو بوو. من یەکێک بووم لەوانەی بەشداری ئەم ئۆپەرێتەم کردووە. لە سالّی (١٩٢٧) لە سلێمانی قوتابی پۆلی چوارەم و پێنجەمی ئیبتدائی بووم لە قوتابخانەی (فەیسەلییە) لەگەڵ مامۆستا (شاکر فەتاح) بەیەکەوە بووین، شێخ نووری خۆی هات و پەراوەی پێ کردین. من یەکێک بووم لەوانەی تەمسیلی دەستەی کوڕانم دەکرد. هیچ نەمبیستووە ئەم شیعرە هی مامۆستا (بێخود) بێ، هەر لە سەرەتاوە لە دەمی شێخ نووری بیستوومە و لەبەرم کردووە و خۆشی پێی وتین و لەبەرمان کرد، هەر ئەویش وتی شیعرەکە مامۆستا (مەحموود جەودەت) لە فەرەنسییەوە تەرجومەی کردووە و منیش کردوومە بەشیعر. ئیتر بەهەموو توانایەکییەوە هەوڵی لەگەڵ ئێمە دا بۆ سەرکەوتنی ئەم ئۆپەرێتە، تیاشیا سەرکەوتین)[١١].

ئینجا کاک (حەمە) نووسیویەتی (لەم دواییەدا ئالۆزییەکی تریشی هاتە سەر: نامەیەکی بەرێز مامۆستا ڕەمزی مەعرووفم بۆ هات تیا نووسیبوو: (ئەو غەزەلەی کە لە دیوانەکەی خاڵە مەلا مەحموود بێخوددا چاپ کراوە بەناوی (دلاوەران)ەوە، ئەو غەزەلە زۆر چاک ئەزانم کە هی مەلا مەحموودی خاڵمە کە لە وەختی خۆیدا دای بە شێخ نووری شێخ ساڵح کە بڵاوی بکاتەوە). دوای ئەوەی کاک (محەمەد) خۆی چووەتە لای مامۆستا (مستەفا سائیب) و ئالۆزییەکەی یەکەمی نەهێشتووەتەوە و منیش قسەکانم موناقەشە

(١٠) مەبەستی (میرزا ئاوڕەحمانی) خالۆزایەتی کە شیعرێکی شیوەنی بۆ نووسیوە.

(١١) قسەکانی مامۆستا (عەبدولقادر قەزاز) بەشریتی کاسێت لە لام پارێزراوە.

کرد که هەڵەی زۆری تێدا بوو، ئێستا تەنیا ئەوە ماوە لەو قسانە بدوێین که لە نامەکەی (ڕەمزی مەلا مارف)دا هاتووە. وەک دەردەکەوێ ماموستا (ڕەمزی مەلا مارف) ئەویش ئاگای لەو نامیلکە بچووکە نەبێ کە بۆ یەکەم جار ئەم شیعرەی تێدا بلاوکراوەتەوە کە لە ساڵی (١٩٢٥)دا بە ناوی (گۆرانی کوردی)یەوە دەرچووە و هەر لەگەڵ دەرچوونی شیعرە بەپەخشان وەرگێڕاوەکە ئەمیش کردوویەتی بەشیعر، کە ئەو گورجی و دەستوبرد کردنە لە شێخ نووری بەدوور نییە لەو کاتەدا کە لە ناو گەرمەی کارکردن و داهێنان و نووسین بووە، ئەگەر وەک خۆشی دەڵێ ئاگای لەوە بووە (بێخود) ئەم شیعرەی داوە بە(شێخ نووری) دەبوایە پەنجە بۆ ئەو نامیلکەیە ڕابکێشێ کە بۆ یەکەم جار شیعرەکەی تێدا بلاوکراوەتەوە. یان لەو ماوە دووردرێژەی دوای بلاوکردنەوەی شیعرەکە تا مردنی بێخود کە دەکاتە (٣٠) ساڵ ئەم حەقیقەتەی ساغ بکردایەتەوە. یان بەپێی توانایی ڕۆشنبیر و قوتابییەکانی ئەو ئۆیەرێتەیان نمایش کردبوو، لەو ڕاستییە حاڵی بکردایە، تا شیعرەکە بە هی (شێخ نووری) وەرنەگرن، بەلام ئەو هاتووە دوای مردنی (شێخ نووری) و (بێخود) ئەو نامەیەی بۆ کاکە (حەمە) ناردووە، چونکە دەزانێ ئەوان مردوون و لێی نایەنە دەنگ، بەلام خۆ بەری خۆری ڕاستی بەبێژنگ نەگیراوە، تاکو ئەمڕۆکەش بەدەیان کەسی تر جگە لەو زاتانەی ناوم هێناون، ماون و ئەوە دەزانن کە ئەمە شیعری (شێخ نووری)یە، لێرەدا نازانم کاکە (حەمە) لە پای چی ئەم بەڵگە بەهێزە دەداتە دواوە کە دەڵێ: (ئەوانەی لایان وایە هی شێخ نوورییە، بەڵگەی گرنگیان ئەوەیە بێخود شیعرێکی تری لەم بابەتەی نییە و شیعرەکەش بەناوی شێخ نوورییەوە بلاوکراوەتەوە، بەڵکو بێخود شیعری نیشتمانپەروەریی کەمە، ئیتر چۆن ئەبێ تەنها بەشایەدیی یەک کەس بیدەینە پاڵ بێخود؟) کاکە (حەمە) ئەوە دەڵێ لە کاتێکدا هەر خۆی تەنیا بەقسەی (ڕەمزی مەلا مارف) دەیەوێ ئەم شیعرە بداتە پاڵ (بێخود) و قسەی ئەم هەموو خەڵکە باوەڕپێکراوانە بداتە دواوە. کە قسەکەیشی بۆ خۆی بەڵگەیەکی بەجێیە و دەیان کەسی دوور و نزیک لە شاعیر، بگرە دۆست و خزمەکانیشی ئاگایان لە دانانی شیعرەکە هەیە.

کەواتە چۆن دەکرێ قسەی هەموو ئەمانە بدەینە دواوە و بەقسەی تاقە کەسێک بڵێین نامین؟! من تێناگەم ئەگەر شێواز و هەندێ لایەنی هونەریی وەک (کێش) نەکرێ بەبەڵگەی ناسینەوەی شیعری دوو شاعیری وەک شێخ نووری و بێخود چی بکەینە بەڵگە، لە پاڵ ئەو بەڵگانەی هێنامانەوە؟! ڕەنگبێ بەڵگەی هەرە گەورەی کاک (محەمەد) لەم گومانکردنە لەسەر ئەو ڕایەی لە سەرەوە هێنامانەوە پێداگرتن بێ لەسەر ئەو ڕایەی کە

گوایە (بێخود گەلێ شیعری تری وتووە کە بەناوی (م. نووری)یەوە بلاوکراوەتەوە و شارەزایانی ژیانی بێخود و شێخ نووری ئەمە ئەزانن و کەسیان نکولییان لەم ڕاستییە نییە) ئەگەر لە پێودانگی ئەو قسەیەوە سەیری دیوانەکەی (شێخ نووری) بکەین دەبێ بڵێین (شێخ نووری) شاعیر نەبووە، چونکە هەرچی شیعری هەیە - کە بەشێکی زۆری بریتییە لە شیعرە نەتەوایەتی و سیاسییەکانی - هی بێخود بن و زادەی ئەزموون و هەڵقولاوی تاقیکردنەوەی شێخ نووری نەبن و بێخود دابێتی پێی تا بەناوی خۆیەوە بلاویان بکاتەوە و بەزۆر بیکات بەشاعیر!

کاک (محەمەدی مەلا کەریم) جگە لەوەی ڕایەکی بێ بەڵگە بەدەستەوە دەدات، بەناوی کۆمەڵە کەسانێکی نادیاریشەوە قسە دەکات بۆ مەبەستی پینە کردنی ئەو ڕایە بێ کۆڵەکە و بنچینەیە. هێنانەوەی ئەم قسە بێ بەڵگەیە کە بەتەمومژ پێچراوە، جگە لە خۆی کەسی دی بڕوای پێ ناکا و کەسیش بەو ئاسانییە ناچێتە عەقڵییەوە، بۆیە زۆر بڕ ناکات و هەر زوو دەپووکێتەوە. کە شارەزایانی ژیانی بێخود و شێخ نووری ئەمە دەزانن، ئەی بۆچی بە بەڵگەکانیانەوە نایەنە مەیدانەوە، تا زووە ئەم تێکەڵ و پێکەڵییە لە شیعری ئەم شاعیرانە جیا بکەنەوە. من واتێدەگەم مەبەستی کاک (محەمەد) لەو شارەزایانە بەتەنیا کاک (عەبدولڕەحمان موفتی) بێ[١٣]. کە زۆرتر لەگەڵ (بێخود)ی مامیدا هاوسۆزی هەیە. هەر ئەم قسە هەڕەمەییانە وای لە کاکە (حەمە) کردووە ئەم قسانە بکات و پشتیان پێ ببەستێ. ئەوە بۆ چەند ساڵ دەڕوا من خەریکی لێکۆڵینەوە و ساغکردنەوەی ژیان و شیعری (شێخ نووری)م و بۆ ئەو مەبەستە چەندان کەسم دیوە، تا ئێستا تووشی کەسێ نەهاتم لە گوڵ ناسکتری بەم شاعیرە گوتبێ، یان کەسێ گومانی لە توانایی و بەهرەی شاعیرایەتی ئەو کردبێ. شێخ نووری، شاعیرێکی داردەست نەبووە بەدەست کەسانی ترەوە قورمیش کرابێ. یان خاوەنی کەسایەتی خۆی نەبووبێ، کرابێتە (ڕووکار - واجهة) و کەسانی تر کردبێتیان بەکێلگەیەک بۆ تاقیکردنەوەکانی خۆیان و شیعریان بەناوی ئەوەوە بلاو کردبێتەوە.

بەڵگەی تری کاک (محەمەد) لەوەی ئەم شیعرە بداتە پاڵ مامۆستا (بێخود) ئەوەیە کە دەڵێ: (هیچ سەیر نییە بێخود ئەم شیعرەی خۆی بەناوی شێخ نوورییەوە بلاوبکاتەوە،

---

(١٣) سەر لە بەیانی ڕۆژی ١٩٨٣/٧/٦ لە سلێمانی چاوم بەکاک (عەبدولڕەحمان موفتی) کەوت و ئەو پرسیارەم لێ کرد کە شیعری (دلاوەران) هی کێیە وتی: (هی کاکە نوورییە و هەموو جار بەدەنگی خۆشی دەیگوت...!!).

چونکه شیعری وا نیشانەی (موونەوەریەتی)یەکە بۆ پیاوێکی خانەدانی ئاین پەرستی وەک (بێخود) لەو ڕۆژەدا بەئاسانی لە لایەن خەڵکەکەوە پەسند نەکراوە و لەبەر ئەوە ناچار بووە کە بەناوی (م. نووری)یەوە بڵاوی بکاتەوە کە کوڕێکی گەنجی تازە پێگەیشتوو بووە. من خۆم مەیلم بۆ لای ئەو باوەڕەی دواییە و...) جارێ نازانم کاک (محەمەد) بۆچی ویستوویەتێ جامی ڕقی خۆی لێرەدا قلْپ بکاتەوە و بەهەر جۆرێ بێت دەیەوێ ئەم شیعرە بداتە پاڵ (بێخود)؟ کەس نکوڵی لەو ڕایەی کاکە (حەمە) نییە کە (بێخود) پیاوێکی موونەوەر و خانەدانی ئاین پەرست بێ، بەڵام (خانەدانی) چ پێوەندی بەوەوە هەیە ئەم شیعرە بداتە (شێخ نووری)؟! یان ئینسانی (موونەوەر) چۆن دەبێ لەگەڵ خۆی و لەگەڵ مێژوو ڕاست نەڕوات و شیعر بەناوی کەسانی ترەوە بڵاو بکاتەوە؟! یان مەرجە ئادەمیزادێک موونەوەر و ئاین پەرست بێ، لە هەمان کاتدا شاعیرێکی گەورەش بێ؟! ئنجا برا بۆچی ئەوە بەڕەوا نازانی شێخ نووری شتێکی لەو خانەدانییەی خاڵی بەرکەوێ؟ بەم جۆرە دەبینین کاکە حەمە چاکی لێ کردووە بەلاداو لە شێخ نووری هەڵکێلاوە و دیسان ئیستەرەمی لەسەر ئەوەیە کە ئەوە شیعری (بێخود)ە و بۆ ئەم مەبەستەش وەنەبێ بەڵگەی مەوزووعی بەدەستەوە بێ، نا، بەڵکو خۆی بەملا و ئەولا دادەدات و لە زۆر جاردا لە بابەتەکە دوور دەکەوێتەوە. بۆیە لە وتاری دووەمیشیدا هەر سوورە لەسەر ئەو ڕایە و دەڵێ: (کە کاک مستەفا داوای سروودی نیشتمانی و نەتەوەیی لە بێخود کردبێ، ئەوە واتە بێخود وا ناسراو بووە بتوانێ شیعری وا بڵێ هەرچەند شیعری وا لە دیوانەکەیدا نییە، کەواتە ڕێی تێناچێ (دلاوەران) هی ئەو بێ و لەبەرئەوە کە بەوتنی شیعری وا ناسراوە، بۆیە داویە بەشێخ نووری کە گەنج بووە و خەریکی سیاسەت بووە، تا بەناوی خۆیەوە بڵاوی بکاتەوە) جارێ کاک (مستەفا) داوای سروودی کوردی واتە (بەزمانی کوردی نووسرابێ) لە (بێخود) کردووە.

ئنجا کە ئەو داوایەی عەرزی بێخود کردووە، کەی دەبێتە بەڵگە بۆ ئەوەی (بێخود) بتوانێ شیعری وا بڵێ؟ پاشان کە کاک (مستەفا) دەڵێ (لە ساڵی (١٩٢٢) ئەوسا قوتابی بووین لە کەرکووک)، هەرچەند کاک مستەفا نەینووسیوە لەو تەمەنی هەژدە ساڵییەی خۆی لە چ پلەیەکی خوێندن بووە، بەڵام وەک دەردەکەوێ کوڕێکی گەنجی وەک ئەم کە هەستی نەتەوایەتی هەبووبێ و حەزی لە سروودی نیشتمانی و نەتەوەیی کردبێ و ویستبێتی بەیانیان بەزمانی خۆیان سروود بڵێن، هەر ئەو کەفوکوڵە گەنجانەیە پاڵی پێوە نابێ هانا بباتە بەر مامۆستا (بێخود)، بەبێ ئەوەی بزانێ ڕێڕەوی شیعریی (بێخود)

لەگەڵ داوایەکەی ئەم کەمتر یەک دەگرێتەوە. وەک گەنجێکیش وای زانیوە شاعیر دەتوانێ لە هەموو بابەتێک بنووسێ و دەتوانێ لە هەموو بابەتێک قەڵەم بخاتە کار.

ئیتر بەم ڕوو لێنانە (بێخود)ی شاعیری ڕێچکەی ئاین و ستایش کردنی خوا و پێغەمبەر، نابێتە شاعیرێکی ناسراو بەشیعری سیاسی و نەتەوەیی. سەردەمی (بێخود)یش ئەوەندە لێمانەوە دوور نییە تا نەتوانین هاوچەرخەکانی ببینین و ئەوەمان بۆ ڕوون بکەنەوە کە (بێخود) بەم جۆرە شیعرە ناسراوە یان نەناسراوە؟! ئنجا کاکە حەمە دوای دوو ڕستە پێچەوانەی ئەو ڕایەی خۆی دەوەستێ و دەڵێ: (کەواتە ڕێی تێ ئەچێ «دلاوەران» هی ئەو بێ و لەبەرئەوە کە بەوتنی شیعری وا نەناسراوە، بۆیە داویە بە شێخ نووری) لەوسەر کاک «محەمەد» دەیویست ئەوەمان تێبگەینێ کە کاک مستەفای قوتابی ڕووی لە (بێخود) کردووە سروودی نیشتمانی و نەتەوەیی بۆ بنووسێ، چونکە (وا ناسراو بووە بتوانێ شیعری وا بڵێ)، بەلام ئەم جارەیان دەڵێ شیعرەکە هی ئەوە، چونکە بە(وتنی شیعری وا نەناسراوە) نازانم ئەمەیان چەندی بەچەند؟! ئنجا کە شێخ نووری لە بواری سیاسەتدا ئیشی کردبێ و دەیان سەروتاری لە ڕۆژنامەی (ڕۆژی کوردستان) و (بانگی کوردستان)دا نووسیبێ، شرۆڤە و شیکردنەوەی سیاسی پێگەیشتوانەی لە ڕۆژنامەی (ژیان)دا بلاوکردبێتەوە، تا ئەو ساڵەی ئەم سرووده یان بڵێین ئەم ئۆپەرێتەی کە داوە بەدەستەوە بەدەیان شیعری چاکی بلاوکردبێتەوە و بەشاعیر ناسرابێ، ئیتر نازانم شێخ نووری چ پێویستی بەوە هەبووە شیعر لە (بێخود) وەربگرێ و بەناوی خۆی بلاویان بکاتەوە؟!

کاک (محەمەد) درێژە بەقسەکانی دەدا و دەڵێ: (جا ئەگەر وەک کاک مستەفا سائیب ئەفەرمووێ بێخود شیعرێکی تری سروودی دابێتێ، ئەبێ ئەم شیعرە کامە بێ و چی لێ هاتبێ و چۆن کە - بەگوێرەی قسەی کاک مستەفا سائیب - لە ناو قوتابییەکاندا بلاوبووەتەوە، نەخراوەتە کتێبی (گۆرانی کوردی) و ئێستا کەس ئاگای لێ نییە؟ ئەمە جارێکی تر زیاتر ئەو بیرەم لا ئەچەسپێنێ کە (دلاوەران) هی بێخود بێ و وەک وتم بۆیە دابێتی بەشێخ نووری، چونکە خۆی خەریکی سیاسەت نەبووە و شێخ نووری خەریکی بووە). دوای ئەوەی کاک (مستەفا سائیب) وەک کەسێک ئاگای لەو سرووده بێ دەڵێ سروودێکی تر بوو دای بە من، کاک (محەمەد) هەر مەسەلەکە دەباتەوە سەر ئەوەی (مریشک لە هێلکەیە، یان هێلکە لە مریشکە)، ئەگینا ئەو سروودەی کە کاک (مستەفا سائیب) باسی دەکات کە لە دیوانەکەدا نەبێ، بۆچی ئەمە جارێکی تر ئەو بیرە لای کاکە

حەمە ئەچەسپێنێ کە(دلاوەران) هی (بێخود) بێ؟ یان لە پای چی دابێتی بەشێخ نووری؟!

ئنجا کەی مەرجە (گۆرانی) هەموو سروودەکانی ئەو سەردەمەی تێدا بوو بێ، تا ئەو سروودەشی تێدا بلاو بکرێتەوە؟ لە کاتێکدا (گۆرانی)یەکەی - کوردی و مەریوانی - لەگەڵ ڕێزم بۆ کۆشش و تەقەللایان، ڕاگوێزرانەوەی ئەو نامیلکە بچووکەیە کە بەناوی (گۆرانی کوردی) لە ساڵی (١٩٢٥) لە سلێمانی لە چاپ دراوە!! واتە دوای بلاوبوونەوەی شیعرە بەپەخشان وەرگێڕاوەکە بەماوەیەکی نێجگار کەم و هەر لە هەمان ساڵدا لە لایەن (ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ)ی ئاشنا و دۆستی شێخ نووری لە چاپ دراوە، ئەو کاتەش شێخ نووری لە ترۆپکی دەسەلاتیدا بووە بەسەر شیعر نووسین و خوێندنەوە و داهێناندا، چونکە وەک هەموو لایەک دەزانین و مامۆستایان (گۆران) و (ڕەفیق حیلمی) و (عەلائەددین سەجادی)یش دانی پێدا دەنێن، کە شێخ نووری لە ساڵانی(١٩٢٠-١٩٣٠) دا شیعری کوردی ناوچەی سلێمانی تازە کردووەتەوە. وەک کاک حەمە دەڵێ: (شێخ نووری کورێکی گەنجی تازە پێگەیشتوو) نەبووە، تەمەنیشی (٢٩) ساڵ بوو. لە ناو خەڵکیشدا ناسراو بووە، بگرە شیعر و نووسینەکانی لە ناو خوێنەرانی ئەو سەردەمەدا پەسند کراوە و جێگەی ڕەزامەندییان بووە.

بەنیسبەت ئەم ئۆپەرێتەشەوە دوای دوو ساڵ تێپەڕ بوون بەسەر نووسینیدا، واتە لە ساڵی (١٩٢٧)دا کە خراوەتە سەر شانۆ خەڵک زۆر پەسندیان کردووە. جا نازانم کاک (محەمەد) لەسەر بناغەی چ بەڵگەیەک دەڵێ: (بەئاسانی لە لایەن خەڵکەوە پەسەند نەکراوە، لەبەرئەوە ناچار بووە کە بەناوی (م. نوورییەوە بلاوی بکاتەوە...؟!). گریمان لەو ساڵەی نیشان دراوە، جێگەی ڕەزامەندی و پەسەندی خەڵکەکە نەبووبێ، ئەی بۆچی لە ساڵی (١٩٢٨) و (١٩٣٢) کە دووجارێکی تر لە نامیلکەی (گۆرانی)ی کەریم سەعید زانستی و کوردی و مەریوانی-دا بلاو کرایەوە ئەم نهێنییە هەر نەخرایە ڕوو؟

وەک وتمان (شێخ نووری) لە ساڵی (١٩٢٥)دا لە تەمەنی (٢٩) ساڵیدا بووە، لەو تەمەنەشدا وەک لە بیبلیۆگرافیاکەی ڕێکم خستووە دەردەکەوێ تا ئەو کاتە چەندان شیعر و وتاری سەرکەوتووی نووسیوە، گرینگترینیان ئەو (٢٥) زنجیرە وتارەیە کە لە ڕۆژنامەی (ژیان)دا بلاوی کردووەتەوە کە بەسەرەتای ڕەخنەی تیۆری کوردی دادەنرێ. پێشتریش وەک موونەوەرێکی سەردەمی خۆی، یان باشتر وایە بڵێین لە سەردمی حوکمدارێتی شێخ مەحموودی نەمردا، سەرنووسەر و بەڕێوەبەری دوو ڕۆژنامەی سەردەمی شێخ مەحموود بووە

کە ڕۆژنامەی (ڕۆژی کوردستان) و (بانگی کوردستان) بوون، هەروەها لەگەڵ پیاوە بەدەرەوە بووەکانی سەردەمی خۆی ئیشی کردووە و هەڵسوکەوتی کردووە. زۆر لەو کەسانەی چوومەتە لایان و دەربارەی (شێخ نووری) پرسیارم لێکردن، لەسەر ئەو ڕایە یەک دەگرنەوە کە شێخ نووری ئەوەندە زرنگ بووە، بەگوێرەی سەردەمی خۆی لە هەموو هاوەڵەکانی پێشکەوتووتر و باخەبەرتر بووە و ئاگادارییەکی زۆری لە ئەدەبیاتی فارسی و تورکیدا هەبووە. واتە وەک کاک (محەمەد) دەریخستووە، کابرایەکی دەستەپاچە و سێبەری (بێخود) نەبووە، مامۆستا (بێخود) خۆیشی بمایە ئێستاکە قبووڵی نەدەکرد بەو شێوەیە باسی (شێخ نووری) بکرێت!

ئەگەر وەک کاک (محەمەد) دەڵێ، مامۆستا (بێخود) لەوە ترسا بێ ئەم شیعرە لە لایەن خەڵکەوە پەسەند نەکرێ، بۆچی ناوێکی خوازراوەی بۆ خۆی هەڵنەبژارد و بڕیاری دا بەناوی - شێخ نووری -یەوە بڵاوی بکاتەوە؟! شێخ نووری کە یەکەم هەنگاوی بەرەو تازەکردنەوەی شیعری کوردی هاوێشت، سڵی لەوە نەکردەوە شیعرەکە پەسەند دەکرێ یان نە،، بەقەدەر ئەوەی ویستی ببێتە پیاوی سەردەمی خۆی و بەتەنگ داوایەکانی مێژووەوە بچێ. مەنتیقی مێژووی بەگەورەتر زانی لە مەنتیقی سادە و ساکار و عەفەوییانەی خەڵک. ئەگەر یەکێک خۆی ئەو تێگەیشتنە تەواوەی لە لا پێگەیشتوو و کامڵ نەبووبێ چۆن قبووڵی کرد لە پەسندکردن و نەکردنی شیعرەکە لە لایەن خەڵکەوە بکرێتە قوچی قوربانی تا (بێخود) شیعری خۆی بەناوی ئەوەوە بڵاو بکاتەوە؟ ئەوە لە کاتێکدایە خۆی لەو سەردەمەدا خاوەنی پلە و پایە و پێگەی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ڕۆشنبیری گەورەی خۆی بووە. دوا بەدوای ئەوە شیعرێکی نیشتمانپەروەرانەی وا بۆ دەبێ جێگەی ڕەزامەندی و پەسندی خەڵک نەبێ؟! چ دابونەریتێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی ئەو سەردەمەی بەزاندووە؟! جگە لەوەی هەنگاونانێکە بەرەو بابەتێکی تازە بەخوێنەران و بینەران کە ئەویش هونەری (ئۆپەرێت)ـە؟!

(شێخ نووری)یەک لەو سەردەمەدا دەستپێشخەری لە زۆر بواردا کردبێ و بگرە شۆڕەسواریش بووبێ لەو دەستپێشخەرییانە و گرەوی مێژووی بۆ خۆی بردبێتەوە، ئیدی چ پێویست بەوە دەکات لەم هەنگاوەشیان بترسێ و گوێ بداتە ئەوەی پەسەند دەکرێ یان ناکرێ؟ ئەگەر شاعیر و نووسەر لە پشت خەڵکەوە بڕوا، ئەی پێشڕەوایەتی نووسەر چییە و لە کوێدایە و چۆن دەتوانێ لە بواری نووسیندا شۆڕشگێڕایەتی خۆی بسەلمێنێ، لەوەی خەڵک بۆ تێڕوانینی پێشکەوتووتر ببات و چێژیان پێش بخات؟

وەرگێڕی ئەم شیعرە دەنووسێ: [فیکر و مەنزیەکەی کە ئەساس تەشکیل دەکا بەنەزەر ئەحوالی ڕوحییە و تەمایولاتی خۆمانەوە هەڵگێڕایەوە و بەموقەدیمەییێکەوە عەرزم کرد] شێخ نووریش هەر لەسەر هەمان شێوە بە [نەزەر ئەحوالی روحییە و تەمایولاتی خۆمانەوە] شیعرەکەی هەڵگێڕاوەتەوە و تاموبۆیەکی خۆماڵییانەی داوەتێ. لەم پێشەکییەی وەرگێڕیشدا هیچ ئیشارەتێکی دوور و نزیک نابینین کە زووتر وەریگێڕا(*) بێ.

بەڵگەیەکی ترم بۆ ئەم شیعرە کە هی - شێخ نووری -یە ئەوەیە، کە شێخ نووری لە بواری نووسینی شانۆدا کە شیعری تێهەڵکێش کردووە ئەوەیە کە [فاتمە خانی محیەددین پەری] دەیگێڕێتەوە: [هەر ئەوەندە بیستمان فوئاد ڕەشیدی مامۆستای کوڕان شانۆگەریی «نیرۆنی زۆردار»ی پێشکەش کردووە و بەو کارەی هەستی زۆر کەسی بزواندووە، ئێمەش هاتینە مەیدان و ویستمان هەنگاوێکی باشتر بنێین. بیری یەکێکمان بۆ ئەوە چوو کێشەیەکی ئەوتۆی ناو کۆمەڵەکەی خۆمان باس بکەین کە زۆر تووشی یەکێک لە قوربانییەکانی دەهاتین، بەڵام کەسمان دەست و زاتی نووسینمان نەبوو. بۆیەکا پەنامان بردە بەر شێخ نووری و ئەویش لەسەر پێشنیاری خۆمان شانۆگەریی «دایک»ی بۆ ئامادە کردین. قوتابخانەمان ڕازاندەوە و پەردەمان هەڵواسی و نزیکەی حەفتەیەک ژنانی شار ڕوویان تێ کردین و بەپەرۆشەوە سەیری «دایک» یان دەکرد. بەیجەی خوشکم دەوری دایک و شەفیقە سەعید کە قوتابییەکی وریای قوتابخانەکەمان بوو دەوری دکتۆرەی بینی. دیار بوو لە تەلی دڵی بینەرانیان دەدا] تا ئێمڕۆش چ خۆی، چ خوشکی ناوەڕۆکی «دایک»یان لە بیرە کە بەشێکی بەشیعر هۆنرابۆوە. «دایکەی نەخوێندەوار بەهەڵە دەرمانێکی عەتارەکان دەرخواردی کوڕەکەی دەدات، دەرمانە دەیخاتە گیانەڵا، هاوار و قیژە و گریەی دایکی کڵۆڵ گەرەکی دێنێتە سەیر. یەکێک لەسەر سپییە ژیرەکانی دراوسێ بەهەڵەداوان خۆی دەکات بەژووردا دەپرسێت:

(*) شێخ نووری لە ژیانی شیعر نووسینی خۆیدا جگە لەو پەخشانەی کە بەشێوەی نۆیەرێت کردوویەتی بەشیعر، ئەزموونێکی دیکەشی هەیە لە شیعری (مەقبەر)دا، چونکە ئەو شیعرەی عەبدولحەق حامید وەک خۆی نووسیویەتی یەکسەر لە تورکییەوە وەرینەگێڕاوە، بەڵکو (عەرەب فەهمی) بەپەخشان کردوویەتی بەعەرەبی و شێخ نووری-ش لەو وەرگێڕانەوە بەشیعر دایڕشتووەتەوە، ئەوە دووەم تاقیکردنەوەیەتی لە پاش نۆیەرێتی (ئینتیباه)، دیسان ئەمەش دەیسەلمێنێ کە ئەو جۆرە بەپیرەوە چوون و کارانە زیاتر جێگەی بایەخی شێخ نووری بووە نەک بێخود کە کاری لەو جۆرەی نییە.

چیـیـه ئەم گـریه و زاریـیـه
بۆ چیـتــه هاوار و تەلاش

دایکە بە شپرزەیی:

هەرگــــیــــز خـــەوی نەبـوو منـیش
چووم دامێ تۆزێک شیلەی خاش خاش

دراوسێکەیان کە ئەمە دەبیستێت، دەستوبرد دەچێت بەدوای دکتۆرەی شاردا، دکتۆره بەهەمان دەستوور دەپرسێت:

چییه ئەم گریه و زارییه

دایک: چووم دامێ توزێک شیلەی خاش خاش

دکتۆره:

جا
کێ بەتۆی وت دەوایەکی زەریف و باشه
تیلفی وا قابیلی دەرمانی وەک خاش خاشه؟
خێراکه ئەم دەرمانەی بدەرێ
بەڵکو بەجارێک چارەی بکرێ
ئیتر هەرگیز لەو دەوایانەی نەدەیتێ

دایک:

تۆبه بێ، تۆبه بێ یا رەبی
هەتا ماوم دەرمانی وای نەدەمێ(١٤)

***

شیعرێکی تری (شێخ نووری) کە دراوەتە پاڵ مامۆستا (بێخود) شیعرێکی شیوەنە کە شێخ نووری بۆ هاورێی خۆی «عەبدولکەریم بەگی حاجی عەبدوڵڵای کەرکووکلی زادە»ی نووسیوه. ئەم شیعرەی ناو ناوه (تاڵعی کوردی بەدبەخت). کەرَیم بەگ حاکمی مونفەریدی

(١٤) د. کەمال مەزهەر ئەحمەد – فاتمە محی الدین پەری پێشڕەو و سەربازی نەناسراو ژمارە (٧٣)ی گۆڤاری رۆشنبیری نوێ ئادار ١٩٧٩ل ١٧– ١٨ منیش هەمان زانیاریم لەو چاوپێکەوتنەی لەگەڵ فاتمە خان ئەنجامم دا لەسەر شریتی کاسێت تۆمار کردووه.

سلێمانی بوو، له (١٨)ی ئەیلوولی ساڵی (١٩٢٠)دا کۆچی دوایی کردووه. ئەم شیعره له لاپەڕه (٩٦ - ١٠٠)ی دیوانەکەی بێخودی گرتووه. یەکەم بەڵگەی بە هی «شێخ نووری» زانینی ئەم شیعره ئەوەیه که (شێخ نووری) داوای له مامۆستا (نەجمەدین مەلا) کردووه شیعره بڵاوکراوەکانی نێو ڕۆژنامه و گۆڤارەکان له دەفتەرێکدا بەدەستخەتی خۆی بنووسێتەوه. ئەمیش داوایەکەی شێخ نووری بەجێ هێناوه و لەسەر بەرگی ناوەوەی ئەو دەفتەره سەد لاپەڕەییەی بۆ نووسینەوەی شیعرەکانی تەرخان کردووه نووسیویەتی: [کاکه نووری زۆر زۆر سڵاوت لێ ئەکەم. بەسەری تۆ عموومی مەوجووداتی جەریدەی کوردستان گەڕاوم، لەمه زیاترم بۆ نەدۆزرایەوه کە لێرەدا نووسیومەتەوه و هەمووی بەتەئریخ و نومرووی خۆی دەرجم کردووه!] ئەو قسەیه ئەوه دەردەخات ئەم شیعری - تاڵعی کوردی بەدبەخت -ه یەکێک بێ لەو شیعرانەی بەقەڵەم و دەستخەتی مامۆستا (نەجمەدین مەلا) نووسراوەتەوه و لاپەڕه [٢٠ - ٢٤]ی ئەو دەستنووسەی گرتووه، بەڵام وەک شیعرەکانی تری دەستنووسەکه نەینووسیوه له چ ڕۆژنامەیەک یان گۆڤارێکدا بڵاوکراوەتەوه. منیش له کاتی گەڕان و هەڵدانەوەی لاپەڕەی ڕۆژنامه و گۆڤارەکانما ئەم شیعرەم بەرچاو نەکەوت. وا دیاره نوسخەیەکی ئەم شیعره له لای مامۆستا (نەجمەددین مەلا) بووبێ و لەگەڵ شیعرەکانی تر نووسیویەتییەوه. لەوانەیه ئەم شیعرەی شێخ نووری چەند نوسخەیەکی لەبەر نووسیبێتەوه و یەکێ لەو نوسخانه کەوتبێته لای مامۆستا (بێخود). شێخ نووری که دەفتەرەکەی له مامۆستا (نەجمەددین مەلا) وەرگرتووەتەوه، خۆشی هاتووه چاوی پێدا گێڕاوەتەوه و سەرگورشتەی ژیانی خۆی لەگەڵ هەندێ پارچه شیعری تری له لاپەڕه سپییەکانی ئەو دەفتەره نووسیوەتەوه، بگره له زۆر شوێندا بەمەرەکەبی سەوز لەنگییەکانی چاک کردووه و وشەی تازەی له باتی هەندێ وشەی تر داناوه. یەکێ لەو شیعرانەی چاوی پێدا گێڕاوەتەوه، شیعری (تاڵعی کوردی بەدبەخت)ه. دیاره ئەگەر ئەو شیعره هی خۆی نەبوایه، وەک چۆن لەو دەستنووسەدا لەسەر شیعرێکی وەرگێڕدراوی (زێوەر)ی نووسیوه هی (زێوەر)ه، بەبێ ئەوەی له ڕۆژنامەکەدا ناوی زێوەر نووسرابێ، بەم شێوەیه دڵنیا بووم ئەگەر ئەم شیعره هی مامۆستا (بێخود) بوایه دەیبردەوه لای ئەو.

بۆ جارێکی تر مامۆستا (نەجمەددین مەلا) چەند پارچه شیعرێکی تری (شێخ نووری) له چەند لاپەڕەیەکی بەیەکەوه نووساوی (٢٢) لاپەڕەییدا نووسیوەتەوه. وا دەردەکەوێ ئەم چەند لاپەڕەیەی له کەشکۆڵێکی گەورەدا نووسیبێتەوه و ئەو لاپەڕانەی پێوەندی به (شێخ نووری)یەوه هەیه مامۆستا (نەجمەددین مەلا) داویەتی به(شێخ نووری). لەو

دەستنووسەشدا هەمدیسان شیعری (تاڵعی کوردی بەدبەخت) نووسراوەتەوە و لاپەڕە (١٢ - ١٦)ی ئەم دەستنووسەی گرتووە.

دەستنووسێکی تری مامۆستا (نەجمەددین مەلا) بریتی بوو لە حەوت لاپەڕە، ئەمەشیان لە کەشکۆڵێک جیا کراوەتەوە. یەکێ لە شیعرەکانی ئەم دەستنووسەش، شیعری (تاڵعی کوردی بەدبەخت) بوو.

مامۆستا (بێخود) تەنیا یەک شیعری نیشتمانی هەیە لە لاپەڕە (٦٩)ی دیوانەکەیدا بڵاو کراوەتەوە. لەم شیعرەدا دەڵێ:

ئەی بەماڵ و بەسەر فیدای وەتەن
وەی وەکو کاکی خۆت برای وەتەن
دامەنی کام و دەستی تۆ دوورن
تا بەرۆح نەبیە گەردی ڕای من
تا من و تۆ نەبینە پەروانە
شەوقی چۆن خۆش ئەبێ چرای وەتەن

وەک مامۆستا (هەردی) دەگێڕێتەوە و دەڵێ: (بێکەسی شاعیر هەموو جارێ کە سەرخۆش دەبوو، بەم شیعرەوە دەیگرت...) بەڵێ وەک دەردەکەوێ، شیعرێکی نیشتمانی لاوازە و سەرکەوتوو نییە. ئەمەش توانجێک نییە بۆ پلە و پایەی کەسێکی وەک مامۆستا (بێخود) کە پایەیەکی ئاینی بەرزی هەبووە، بەڵکو ئەوە دەگەیەنێ کە لە بواری شیعری نیشتمانیدا دەسەڵاتدار نەبووە بەو شێوەیەی کە لە بواری تردا ئەسپی خۆی تاوداوە. ئەوە سەرەڕای ئەوەش، شیعرەکە بەتەکلیف نووسراوە و بەڕادان دراوە، شیعریش بەم جۆرە بووترێ، هەڵبەتە زۆر لە خۆکردن و ونکردنی کەفوکوڵی شاعیرانەی تێدا دەردەکەوێ.

خوێنەری شیعری (تاڵعی کوردی بەدبەخت) ئەوەی بۆ ڕوون دەبێتەوە، کەسێک ئەو شیوەنە بەکەفوکوڵ و بەسۆزە بۆ کەسێک دەکات کە تێکەڵییەکی گیانی بەگیانی و نزیکی و خۆشەویستییەکی ئەوتۆیان لە نێواندا بووبێ، کە مردنەکەی بووبێتە هۆی بەجێ هێشتنی کار تێکردنێکی زۆر گەورە لەسەری. هەر بۆیەش مردنەکەی بەبەدبەختی (تاڵعی کورد) دادەنێ و بەو شێوە گەرموگوڕە فرمێسکی بۆ دەڕێژێ و شیوەنی بۆ دەکا. وەک زانراویشە ئەم تێکەڵاوی و ئاشنایەتی و خۆشەویستییە بەتینە لە نێوان (بێخود) و (عەبدولکەریم بەگی حاجی عەبدوڵڵای کەرکووکلی زادە)دا نەبووە، تا مردنەکەی لە لای ئەوەندە

کۆستێکی گەورە و گران و جەرگبڕ بێ، ئەم لاوانەوە پڕ لە سۆزەی بۆ بنووسێ!

مامۆستا - شێخ محەمەدی خاڵ - دەربارەی ئەو شیعرە و پێوەندی (بێخود) بە(عەبدولکەریم بەگ)ەوە دەڵێ: (کەریم بەگ بە هیچ شێوەیەک ئەو پێوەندییەی لەگەڵ (بێخود)دا نەبووە، بەڵام لەگەڵ (شێخ نووری)دا هاوپیاڵە بوون، بۆیە شیعرەکە هەر بە هی شێخ نووری دەزانم نەک (بێخوَد). هەروەها مامۆستا (هەردی)یش هەر ڕای وایە (ئەم شیعرە هی شێخ نوورییە، چونکە پێوەندی دۆستایەتییان لەگەڵ یەکتردا زۆر بەتین بووە و زۆربەی شەوان بەیەکەوە دانیشتوون و خواردوویانەتەوە) مامۆستا (ناسح حەیدەری) دەڵێ: (لەبەرئەوەی عەبدولکەریم بەگ کوردێکی موستەقیم بوو، شێخ نووری زۆر خۆشی دەویست و زۆر بەیەکەوە بوون) بەڕێز (فەتحوڵلا شێخ ڕەشید) دەڵێ: (عەبدولکەریم بەگ ئەگەر پێوەندیشی بە(بێخود)ەوە بووبێ، ئەوە پێوەندییەکی زۆر کز بووە، بەڵام زۆرتر لەگەڵ شێخ نووری هەڵسوکەوتی دەکرد. تا مردنیش هەر بەیەکەوە بوون. شەوان بەیەکەوە دادەنیشتن و هامۆشۆی یەکتریان دەکرد). مامۆستا (حیلمی) شاعیر لە بارەی ئەم شیعرەوە دەڵێ: (بەدەسخەتی خۆی شێخ نووری نوسخەیەکی ئەم شیعرەی بۆ من نارد بۆ هەڵەبجە، ئێستاش لە بیرمە بەمەرەکەبی سەوز بۆی نووسیبوومەوە. تا ئەم دواییە ئەم دەستنووسەم هەر مابوو، هەوڵ دەدەم بیدۆزمەوە.)[15]. ئیتر نازانم بە چ بەڵگەیەک ئەم شیعرەی - شێخ نووری - دراوەتە پاڵ مامۆستا بێخودەوە؟!

جگە لەو دوو شیعرەی باسمان کردن کە درابوونە پاڵ مامۆستا (بێخود)، لە لاپەڕە (١٥٨)ی دیوانەکەیدا - بەشی تاکەکان - کاک (محەمەدی مەلا عەبدولکەریم)، دێرە شیعرێکی ئاشکرای - نالی -یشی خستووەتە ناو تاکە شیعرەکانی (بێخود)ەوە کە نەدەبوایە ئەوەیان بەسەردا تێپەڕێ. ئەمەش تاکە شیعرەکەیە:

دەستم کە بەصەد وەعدە لە صەد لاوە شکاوە
جەبری نییە ئەم کەسرە، هەتا نەیخەمە ئەستۆم[16]

---

(١٥) هەر لەو دانیشتنەدا مامۆستا (هەردی)یش کە لەوێ ئامادە بوو، ڕای وابوو کە ئەم شیعرە هی شێخ نوورییە.

(١٦) بڕوانە دیوانی نالی - مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس و فاتح عەبدولکەریم هەمان بەیت لە لاپەڕە (٣٨٤)دا بلاوکراوەتەوە. هەروەها دیوانی نالی و فەرهەنگی نالی - د. مارف خەزنەدار لاپەڕە(٨٩) ساڵی ١٩٧٧ .

ئەم دێرە شیعرەی - نالی - وەک شیعرەکانی پێشتر باسمان کردن، هەرکە لە ناو دەستنووسەکانی مامۆستا - بێخود - دۆزراوەتەوە، یەکسەر بەشیعری ئەوی تێگەیشتوون، لە کاتێکدا ئەمە تاکە شیعرێکە لە ناو شیعرێکی درێژی - نالی -دا کە ئەم تاکە شیعرە بەناوبانگەی - نالی - چووبێتە ناو ئەو دیوانەوە، ئیتر قسە بۆ ئەوە ناهێڵێتەوە کە شیعرەکانی تریش هەر بەم چەشنە ڕێگەی ناو ئەم دیوانەیان گرتبێتەبەر. جگە لە مانەش، شیعرێکی چوار بەیتیی تر لە دیوانەکەدا لە لاپەڕە (١٤٩)دا بڵاوکراوەتەوە، کە دەبێ ڕەشنووسی یەکەمی ئەو شیعرە بێت کە (شێخ نووری) بۆ (شێخ برایمی) برای وتووە. ئەمەش پارچە شیعرەکەیە:

بڵا فرمێسکی خوێنین بۆ نەڕێژێ بیلبیلەی چاوم
بەحەرفی ناڵە بۆ نەپژێ، زمانی لاڵ و گیراوم
نەمامی عەیشەکەم نێژرا، خەفەت گۆیکە و چڕۆی دەرکرد
سەراپا تەرزی غەم، ئاڵایە گیانی هەڵکرووزاوم
دەسا ئەی (میرزا مەهدی)ی زەمان، ئەی (کاشی)یی نادر
لە کێڵی قەبرەکەی تەئریخی کۆچی کاکە ئیبراهیم
بنووسن (شێخ برایم ڕۆ) بەخوێناوی گەشی چاوم

جۆری تەعبیر کردن لەم شیعرەدا، هەوێن و وێنە و داڕشتن و شێوازی بەئاشکرا دیارە هی - شێخ نووری-یە. جگە لەوەش ئەم تەعبیرانە لە شیوەنەکەی کە بۆ (مەلا فەندی) و بۆ (شێخ برایم)ی برای وتووە هەر هەمان دەربڕین و شێوازە، بگرە یەکەم بەیت و دوا بەیت کتومت ئەوەیە کە لە شیوەنەکەی (مەلا فەندی)دا هەیە کە بەر لە دە ساڵ لە کۆچی دوایی (شێخ برایم)دا نووسیویەتی. هیوادارین لە چاپێکی تری دیوانەکەی مامۆستا (بێخود)دا ئەو شیعرانەی لێ بژار بکرێت و هەوڵ بدرێ زۆر شیعری بڵاونەکراوەی خۆی هەیە لەگەڵ شیعرەکانی تریدا بڵاو بکرێنەوە، کە بەشێوەی (نامە) بۆ زۆر دۆست و هاوەڵی خۆی نووسیوە!!

# سەربردەی ژیانی شێخ نووری شێخ ساڵح

* ناوی تەواوی شێخ نووری کوڕی شێخ ساڵحی کوڕی شێخ غەنی کوڕی سەیید عەبدولقادری کوڕی سەیید حەسەنی کوڕی سەیید عەلی کوڕی سەیید محەمەدی کوڕی سەیید مستەفای کوڕی ئیسحاقی کوڕی سەیید بابە ڕەسووڵی گەورەیە و لە ساداتی بەرزنجەیە[١]، وەک لەم شەجەرەیەی لاپەڕەی دواتردا دەردەکەوێ.
* شێخ نووری لە ساڵی (١٣١٢)ی ڕۆمی[٢]، واتە لە ساڵی (١٨٩٦)ی زایینی[٣] لە شاری سولەیمانی و لە گەڕەکی (دەرگەزێن) لە دایک بووە و چاوی بۆ ئەفسانەکانی ژیان

---

(١) مامۆستا (ڕەفیق حیلمی) لە کتێبەکەیدا (شیعر و ئەدەبیاتی کوردی) بەرگی دووەم ل ١٩٩ دەربارەی ڕەچەڵەکی شێخ نووری نووسیویەتی: (شێخ عەبدولقادر کوڕی سەیید حوسەینی کوڕی سەی محەمەدی سەی عەلییە). کە وەک ڕوونم کردەوە (سەی حوسەین) کوڕی (سەیید حەسەن)ە نەک باوکی. هەروەها (سەی عەلی) کوڕی (سەیید محەمەد)ـە نەک باوکی. ئەم شەجەرەی عائیلەیەم لە مامۆستا (فەتحوڵلای کوڕی شێخ ڕەشیدی کوڕی شێخ عەبدولقادر) وەرگرت کە (ئەرشەدی ئەولادە) و لە کاتی خۆیدا بەئیرس بۆی ماوەتەوە، چونکە برایەکانی بەر لە خۆی مردوون، ئەویش لە (شێخ عەبدولقادر)ی باپیری بۆیان ماوەتەوە. لەبەرئەوەی ئەو شەجەرەیە نووسرابوو و لە بەردەستم بوو، زیاتر بەڕاستم زانی. هەڵەکەش، هەڵەی مامۆستا (ڕەفیق حیلمی) بێ یان لە کاتی نووسینەوە و وەرگرتنی هەڵەی تێکەوتبێ یان (شێخ نووری) خۆی بەو شێوەیە دابێتێ بە مامۆستا (ڕەفیق حیلمی) من بەپێویستم زانی ڕاستی بکەمەوە.

(٢) مامۆستا (ڕەفیق حیلمی) هەر لە کتێبەکەیدا لاپەڕە (١٩٩) وای دەرخستووە کە (شێخ نووری) لە ساڵی (١٣١٥)ی ڕۆمی لە دایک بووبێ. ساڵی زایینی لە دایک بوونەکەشی نەنووسیبوو، کەچی شێخ نووری خۆی لە دەستنووسێکی خۆیدا دەربارەی ژیانی خۆی (١٣١٢)ی ڕۆمی، واتە (١٨٩٦)ی زایینی نووسیوە، کە دەسخەتی خۆی زیاتر جێی متمانە و باوەڕ پێکردنە.

(٣) دکتۆر مارف خەزنەدار لە وتارێکی کە لە گۆڤاری (الثقافة الجديدة)دا لە ژمارە (٩)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٦٩)دا بەناوی (الأتجاه الرومنطيقي في الأدب الكردي) (النصف الأول من القرن العشرين)دا بلاوی کردووەتەوە و نووسیویەتی: نووری شێخ ساڵح (١٨٩٨- ١٩٥٨) واتە لە ساڵی (١٨٩٨)دا لە دایک بووە. دکتۆر (کامیل حەسەن بەسیر) لە کتێبەکەیدا دەربارەی (شێخ نووری شێخ ساڵح لە کۆڕی لێکۆڵینەوەی ویژەیی و ڕەخنەسازیدا نووسیویە: (لە ساڵی (١٨٠٦ز) لە شاری سلێمانی لە دایک بووە) لاپەڕە (٥) وادیارە ئەمە هەڵەی چاپە. هەروەها لە دۆسیەکەی =


سەیید بابە ڕەسووڵی گەورە
سەیید ئیسحاق
سەیید مستەفا
سەیید محەمەد
سەیید عەلی
سەیید حەسەن
شێخ حەسەن
شێخ عەبدولقادر
شێخەلی
شێخ غەنی
حاجی شێخ فەتحوڵڵا
شێخ ئەحمەد
شێخ ساڵح
شێخ سەعید
شێخ نووری

و نهێنییەکانی کردووەتەوە و ئەم مێژووە بووە بەلاپەڕەکانی یەکەمی ژیانی منداڵێک، کە لە دواییدا شوێن و پایەیەک بۆ خۆی دیار دەکات.

* بەپێی ئەو زانیارییەی کە لە ئەنجامی پشکنینی دۆسیەی شاعیرەوە بۆم دەرکەوت ناوی (محەمەد نووری شێخ ساڵح)ە. ئەو ناوەش لەسەر فۆرمی (دفتر خدمة)کەیدا بەدەستخەتی خۆی نووسرابوو، بۆیە دەبینین سەرجەمی شیعر و وتارە بڵاوکراوەکانی بەئیمزای (م. نووری)یەوە بڵاو کردووەتەوە، کە کورت کراوەی (محەمەد نووری)یە[٤].

* دایکی ناوی(ڕەحمە خانی کچی قادری حاجی ڕەسوڵی حەماغای گووروونی ڕۆستەم ئاغایە، کە ڕۆستەم ئاغاش کوڕەزای (زوڵاڵ ئاغایە)، ئەمەش یەکێک بووە لە جەنگاوەرە دلێرەکانی دوانزە سوارەی مەریوان.) (ڕەحمەخانی) دایکی شەش کوڕ و کچێکی هەبووە، ناوی ئەو منالانەش بەپێی ساڵی لە دایک بوونیان بەم جۆرەیە: (نووری، ئیبراهیم، جەمیلە، ئیسماعیل، عەزیز، ڕەئووف، بابە عەلی) وەک دیارە (شێخ نووری) نۆبەرەی دایکی بووە. دایکی لە تەمەنی حەفتا و پێنج ساڵیدا، لە ڕۆژی هەینی (٢)ی مایسی ساڵی (١٩٤١)ی زایینی (٦)ی ربیع الثاني (١٣٦٠)دا کۆچی دوایی کردووە.

* شێخ غەنی باپیری بەکاروباری بازرگانییەوە خەریک بوو، حەیوانی هەبووە و خەریکی سەلەم و تووتن کڕین و فرۆشتن بووە. چووە بۆ حەج و لەوێ مردووە. ژنی بۆ هەر سێ کوڕەکەی هێناوە و هەریەکەیانی لە خانوویەکی سەربەخۆی خۆیدا نیشتەجێ کردووە، ئنجا (شێخ ساڵح)ی باوکی شێخ نووری ئەویش بەپیشەی بازرگانییەوە خەریک بووە.

---

=شاعیردا ساڵی لە دایک بوونی بە(١٨٩٧) دانرابوو. بەپێی ئەو دەفتەر نفووسەی کە بەبڕیاری دادگای (سولح)ی سولەیمانی چاک کراوە، بەپێی نووسراوی ژمارە (١٨٤٣ / ١٤٩) لە ٨-١١-١٩٤٩، ساڵی لە دایک بوونی شاعیر بە(١-٧-١٩٠٢) دانراوە، بەڵام ئێمە پشتمان بەو دەستنووسە بەست کە بەدەسخەتی خۆی نووسراوە. مامۆستا (گیوی موکریانی)یش لە دەستنووسێکی خۆیدا کە دەربارەی ژیانی (شێخ نووری) نووسیوە، لە نووسینەکەدا وا دەردەکەوێ لە دەمی خۆی وەرگرتووە، بەڵام ساڵی زایینییەکەی بە(١٨٩٨) داناوە.

(٤) دکتۆر کامیل حەسەن بەسیر لە هەمان کتێبیدا لە لاپەڕە (٥) نووسیویەتی: (ناوی «م. نووری» بۆ خۆی هەڵبژاردووە) وەک ڕوونم کردەوە ئەم (م. نووری)یە کورت کراوەی ناوی (محەمەد نووری)یە و هەڵی نەبژاردووە.

یەکەم جار لە ولاتی ئێرانەوە کەلوپەلی دەهێنا و لێرەوە کەلوپەلی دەبردە ئەوێ. لە ساڵی (۱۹۱۲)ەوە وازی لە بازرگانی کردن و هاموشۆی دەرەوەی ئێراق هێناوە و دەستی کردووە بەبازرگانی کردنی ناو ئێراق. تووتن و پێستە و خوری بردووە بۆ (بەسرە) و لەوێ ئەو کەلوپەل و پێویستییانەی لێرە دەستنەکەوتووە لەگەڵ خۆی هێناویەتی. بێگومان ئەم بازرگانی کردنەش بەهۆی ولاغەوە ئەنجام دراوە، چونکە ئەو کاتە ئوتومبیل نەبووە، خۆیشی قەتارچی هەبووە.

لە پێش هەڵگیرساندنی شەڕی جیهانی یەکەم تووتنێکی زۆری دەبێ و ئەو تووتنە پارەیەکی زۆری بۆ دەکات و بەهۆیەوە سەرمایەیەکی باشی دەستگیر دەبێ. لە ساڵی (۱۹۱٤) بەولاوە (شێخ ساڵح) تاقەتی لە پیشەی بازرگانی نامێنێ، چونکە پیر و نەساغ و نەخۆش کەوتبوو. ئیتر هەر لەو ساڵەوە (شێخ ساڵح) ئیشەکەی خۆی بە(شێخ نووری) و (شێخ برایمی) کوڕەکانی خۆی دەسپێرێ. ئەم دوو برایەش دەست دەکەن بەهاموشۆ کردنی ولاتی ئێران و شێخ نووری لە تەمەنی (١٦) ساڵیدا دەکەوێتە بێنە و بەرەو زەحمەتیی نان پەیداکردن، کە گرانی و (سەفەربەر) باڵی بەسەر گوزەرانی خەڵکیدا کێشابوو، بەڵام لەبەرئەوەی شێخ نووری پیاوێکی دەست بلاوبووە، دوو سێ جار لە بازرگانی نووچی داوە و پارە و پووڵی بەدەستەوە نەماوە. هەر لەو دانیشتنەدا کە مامۆستا (ئەحمەد خواجە) قسەی لەگەڵ کردووە وتوویەتی: (ئێستا هەمیشە بە توجارەتی ئێرانەوە خەریکم. لە سولەیمانییەوە شەکر و چاو ڕەنگ و شتی بابەتی ئێران ئەبەم و لەوێشەوە قاڵی وماڵی ئاوریشم ئەهێنم. (پێکەنی) بەڵام قازانجەکەی ئەخۆم وە پاشەکەوتم پێ ناکرێ. ئێسترەکانی باوکم ئەتەقێنمەوە، خۆ ئەگەر یەکێکیان بتۆپێ، ئەوە لە مایەکەشی زەرەر ئەکەین، برایم یاریدەدەرمە). باوکی لە تەمەنی شەست ساڵی لە مانگی تەمووزی ساڵی (۱۹۲۰)دا کۆچی دوایی کردووە.

* شێخ نووری وەک نەریتی باوی ئەو سەردەمە، خراوەتە بەر خوێندنی (حوجرە). لەسەر دەستی چەند مەلایەکی زانا و دانای ئەو سەردەمە خوێندوویەتی، لەوانە (خواجە فەندی و حاجی مەلا سەعیدی زلزلەیی و شێخ بابە عەلی شێخ عەبدوڵلا). مامۆستا (ئەحمەد خواجە) دەربارەی خوێندنی (شێخ نووری) لە لای (خواجە فەندی) باوکی دەڵێ: (لە چایخانەکەی «ساڵحی وەستا بستە، بەشەو لە لایەن سەیید حەسەنی سەعاتچییەوە شانامە ئەخوێنرایەوە، پڕ ئەبوو لە گوێگرانی داستان، ئەو داستانانەش وەک تەلەفزیۆن و

سینەمای ئێستا جێگیر بوو، بەڵام ئێمە (حەمە ڕەشید، ئاوڕەحمانی ئامۆزام، حەمە سەعید قەزاز، حەمە کاکە، ئەنوەر سائیب، حەمە ڕەشید نەجیب) هاوڕێ و خزم، کۆمەڵێکی لە تەمەنی پانزە تا حەڤدە ساڵیدا بووین. نەک بۆ شانامە، لەبەر پەنا و بێدەنگی بەشەو لەم چایخانەیەدا ڕامانده‌بوارد. بەئارەزوو نێرگیلەم ئەکێشا. لە تەنیشتمەوە دوو لاوی جوان و چالاک بە بەرگی کوردی ئێرانییەوە دانیشتبوون، ئەوەی تەنیشتم وتی: (نێرگیلە باش نییە) من قسەکەیم پێ خۆش نەبوو. وردە وردە کەوتینە وتووێژ، وتی: (ئەحمەد نامناسی، ئێمە خزمین؟ نەبوو لە خوێندنگەکەی باوکت لەگەڵ برایمی برامدا ئەمان خوێند، جار جاریش تەبەقە قاقەزی خورشیدیت لێ ئەسەندم؟ من (نووری)م. ناسیمەوە ڕاستە دایکمان خالۆزا و پوورزان. ئیتر (نووری) و (برایمی) برای ئاوێتەی ئێمە بوون. کەوتینە جێ گواستنەوە بۆ ماڵی (شێخ نووری) و ماڵی ئێمە کە جێگای لاوپەڕمان هەبوو. وتی: (تا مردن خۆم بەبەندەی خواجە فەندی[5] باوکت ئەزانم، چونکە ئەو سەرمایەیەی هەمە لە سایەی ئەوەوەیە).

مامۆستا (ئەحمەد خەواجە) لەسەر قسەکانی بەردەوام دەبێ و دەڵێ: وتم (نووری) تۆ لەگەڵ زمانی فارسیدا چۆنی؟ بەپێکەنینەوە: (من فارسی، تورکی، عەرەبیش زۆر باش ئەزانم، بەڵام بەعەرەبی ناتوانم بەتەواوی قسە بکەم. خواجە فەندی وای دانەڕشتووم پێویستم بەهیچ زمان و شتێک بێ، پەکم ناکەوێ). بەمەوە بۆمان دەردەکەوێ کە مامۆستا (خواجە فەندی) دەورێکی باڵای لە فێرکردن و گۆشکردنی (شێخ نووری)دا هەبووە. وەک خۆی دانی پێدا ناوە و لەبەرئەوەی بەعەرەبییەکە زۆر باش قسەی نەکردووە، یان چاکتر وایە بڵێین خۆی بەدڵی نەبووە و لەگەڵ خواست و ئاواتی خۆی نەگونجاوە، بۆیێ پەنای بردووەتە لای مەلایەکی زانای وەک (شێخ بابە عەلی شێخ عەبدوڵڵا) کە دەرسی (نحو و صرف و بلاغە)ی لا بخوێنێ. بەم جۆرە شێخ نووری لە حوجرەدا تا قۆناغی (جامی) خوێندووە، دوای خوێندن و تەحسیلی لە قوتابخانەی سەرەتایی، قۆناغی جامیش دوا قۆناغی سوختەیە و یەکەم هەنگاوی پێ خستنە مەلایەتییە. لەو قۆناغەدا پێیان دەوترێ (موستەعید) و کتێبەکانی (السیوطي) و (الفية بن مالك) و (نورەددین عەبدولڕەحمان جامی) کە یەکێکە لە شاعیرە عیرفانییەکانی ئێران دەخوێنن. بۆیەش بەو قۆناغە دەڵێن

(٥) وشەی (خواجە) لە باوی عوسمانییەکاندا نیشانێک بوو دەدرا بەو پیاوە زانا و دانا یان ئەوانەی پیاوی ئایینی بوون، خەرجی مانگانەشیان لیرەی زێڕ بووە.

(جامی)[٦]، چونکە کتێبێکی (مەولانا عەبدولڕەحمان جامی) دەربارەی (نحو) دەخوێنن. هەر لەو قۆناغەدا لە پاڵ خوێندنی خۆیان، جار بەجاریش دەرس بەفەقێیەکان دەڵێنەوە. شێخ نووری لەو قۆناغەدا (حوجرەی) بەجێ هێشتووە. لەو سەردەمەدا زمانی خوێندن و نووسین فارسی بووە، ئەو کەسەی بیویستایە لە میری نزیک ببێتەوە، خۆی فێری زمانی (تورکی)یش دەکرد. بەڵام (شێخ نووری) نەک مەبەستی نزیکبوونەوە لە میری، بەڵکو وەک سەودایەکی دوای فێربوون و قوتابییەکی زانست، خولیای فێربوونی ئەو زمانەی کەوتووەتە سەر.

لەو سەردەمەشدا زمانی تورکی لە پاڵ زمانی کوردی خوێندراوە، بگرە بەشێکی ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی ئەو سەردەمەشی بۆ تەرخان کراوە، ئەمەش بەهۆی درێژە خایاندنی دەسەڵاتی عوسمانییەکان بووە بۆ ناوچەکەمان کە نزیکەی چوار سەدەی خایاندووە، بۆیە شێخ نووری ئەگەر بەزمانی تورکیش شیعری وتبێ زیاتر ویستوویەتی لەو بوارەدا توانایی خۆی تاقی بکاتەوە، بۆیەش دەبینین شیعری تورکی ئێجگار کەم نووسیوە.

لەو بڕوایەشدا نیم (بێخود) کە خاڵی شێخ نووری بووە و فارسی زانێکی گەورەی سەردەمی خۆی بووە، شێخ نووری عەوداڵی فێربوون لەسەر دەستی ئەو فارسی نەخوێندبێ و سوودی لێ وەرنەگرتبێ! بەم جۆرە سەرنج دەدەین (شێخ نووری) خوێندنی حوجرەی لە لای مەلا زانا و ناودارەکانی ئەو سەردەمە خوێندووە، خوێندنەکەشی شێوەیەکی ڕێکوپێک و یەک جۆر نەبووە، وەک دەبینین دوای خوێندنی حوجرە دەستی کردووە بەخوێندنی سەرەتایی و قۆناغی سەرەتاییشی تەواو کردووە. ئنجا لەگەڵ (ئاوڕەحمانی شێخ ڕەشید) کە ئامۆزایەتی لە هاوینی ساڵی (١٩١٦)دا بەیەکەوە چوونەتە قوتابخانەی (ڕوشدی)یەی عەسکەری لە سلێمانی، بەڵام (شێخ نووری) لە پاش ساڵێ دوای (ئاوڕەحمانی) ئامۆزای بۆ ئەوێ نێردراوە. مردنی ئاوڕەحمانی ئامۆزای بووەتە هۆی وازهێنانی (شێخ نووری) لەو قوتابخانەیە کە بەئارەزوو و خواستی خۆی بۆی نەچووبوو، چونکە لە خوو و نەریتی ئەو سەردەمە وا باو بووە کە داهاتووی مناڵ، باوک و دایک

(٦) ضیا پاشا دەڵێ:

می نحویله مست اولمق دیلرسن
کیجه گوندز، الندن صالمه جامی

واتە ئەگەر دەتەوێ خۆت بە مەی مەحو و مەست بکەی، شەو و ڕۆژ (جامی) لە دەست فڕێ مەدە. واتە جامی مەی و کتێبی (جامی).

ڕەنگیان بۆ ڕشتووە، بۆیە باوکی شێخ نووری ناردوویەتی بۆ ئەو قوتابخانەیە، زوو بەهۆی جەنگی جیهانی یەکەمیشەوە کە لەو قۆناغە دەردەچوون دەنێردران بۆ جەنگ. ئەم قوتابخانەیەش لە سالّی ١٣١١ک. دا بەکردە و کۆششی خەستی سەرۆکی شورای دەولّەت (سەعید پاشای خەندان) بەناوی (ڕوشدییەی عەسکەری) لە سلێمانی بەچوار پۆل کرایەوە. قوتابیان پاش چوار سالّ خوێندن دەچوونە بەغدا. لەوێش (٣) سێ سالّ دەیانخوێند ئەوسا ئەبوونە ئەفسەری سوارە، پیادە، تۆپچی. پاش ئەمەش هەقیان هەبوو بچنە ئەستەمبوّل کە لە پاش سێ سالّ خوێندن بەپلە و پایەی بەرز دەرئەچوون و جێگا و شوێنی گرنگیان بۆ خۆیان لە دامودەزگای عوسمانیدا ئەکردەوە)[٧]. ئەم قوتابخانەیەش وەک قۆناغی ناوەندی ئەمڕۆکە بووە و لەبەرئەوەی ئەوساکە لە سلێمانی خەلّک زۆرتر حەزیان لە ڕوتبەی عەسکەری کردووە، بۆیە منالّەکانیان بۆ ئەوێ ناردووە.

ڕاستە شێخ نووری بۆ ئەو قوتابخانەیە نێردراوە، بەلاّم زوو هەستی بەوە کردووە ئەو بۆ ئەو کارە نەخولّقاوە، یان لەگەلّ خولیاو ئاواتی ئەو ناگونجێ ببێتە (ئەفسەر)، بۆیە دەستی لێهەلّگرتووە. ئەگەر شێخ نووری بەردەوام بوایە لەسەر خوێندنی ڕوشدییەی عەسکەری و بەدوای حەزە ڕەسەن و ڕاستەقینەکانی خۆی نەچووبا، ئێمەش ئەمڕۆکە باسی خۆی و کەس و کار و دەوروپشتەکەیمان نەدەنووسی. کەواتە هەروەک شێخ نووری بەدەسخەتی خۆی لە دۆسیەکەیدا نووسیویەتی: (لە قوتابخانەی ئاینی و سەرەتایی و ئەهلیدا خوێندوویەتی. زمانی عەرەبی و تورکی و فارسی بەخوێندنەوە و نووسین دەزانێ)، ڕوونمان کردەوە شێوەی خوێندنەکەی چۆن بووە.

* شێخ نووری لە هەرەتی لاوێتیدا کچە پوورێکی هەبووە، کە ناوی (زەکیە خانی محیەددین قادر)ە و زۆری خۆش ویستووە، بەشوودانی ئەو کچە بەدەست کاک (سەعید حەسەن)ەوە بووە، بەلاّم بەڕێوەبەری ئەوساکە (حاجی حەسەن ئاغا) بەڕجا و تکا و بەهۆی دەست ڕۆیشتن لە (عەزیزی کەرکووکلی زادە)ی مارە دەکەن، لەبەرئەوەش کە (شێخ سالّح)ی باوکی شێخ نووری لەگەلّ (ڕەحمەخانی) دایکی (زەکییەخان) ناکۆکی و ناتەباییان دەست پێدەکا، ئەم ڕووداوە بووەتە هۆی ئەوەی (شێخ نووری) بەمراز نەگات و ئامێزی ئەو ئەویندارەی خەونی پێوە بینیوە گەرمی نەکاتەوە. دوای ئەوەی

---

(٧) بڕوانە گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ: ژمارە (٩٠) مانگی کانوونی دووەم و شوبات سالّی ١٩٨٢ ل ٧٩ غەفووری میرزا کەریم.

(زەکییە خان) دراوە بە(عەزیزی حاجی سالّحی کەرکووکلی زادە) کچێکی لێ بووە، ناوی ناوە (ناجیـە). دوای لە دایک بوونی ئەم نۆبەرەیە، (عـەزیزی حـاجی سـالّح) تووشی نەخۆشی هاتووە و کۆچی دوایی کردووە. لە پاش ئەو ڕووداوە هاموشۆی یەکتریان کردووەتەوە و پەیوەندی خزمایەتییان گەڕاوەتەوە دۆخی جارانی، بگرە دوای سالّ و نیوێک تێپەڕ بوون بەسەر کۆچی دوایی (عەزیزی حاجی سالّح) لە سالّی (١٩٢٦)دا -شێخ نووری- بەکۆنە دلّخواز و دلبەرەکەی شاگەشکە دەبێت و مارەی دەکات.

مامۆستا (ئەحمەد خواجە) دەربارەی ئەم خۆشەویستییە دەلّێ: (جار جارێک نووری هەناسەیەکی هەلّدەکێشا هەستی کەدەرێکم لێ ئەکرد، بەلاّم بەباشم نە ئەزانی پرسیاری لێ بکەم. تا ڕۆژێک لە مالّی خۆیان بەجووتە، دوو بەدوو نانی نیوەڕۆمان ئەخوارد، لەپڕ هەناسـەیەکی پڕ ئاهی هەلّکێشـا. بەتووڕەیییـەوە وتم: تۆ بەو هەناسـەیە دلّی من ئەشێوێنی، چیتە بۆچی دەری نابڕی...؟ لە وەلاّمدا بەپێکەنینەوە وتی: کوڕە تۆ چیت لە دەست دێ، نە بەئێمە و نە بەباوکی ئێمە چارە ناکرێ. ئەوەی چوو چوو). وازم نەهێنا و زۆرم وت. لە ئەنجامی لەسەر ڕۆیشتنم وتی: (ئەحمەد گیان ئەمە سرڕێکە بەشەراکەتی مێشک و دلّم. شەریکی تر قبوولّ ناکا. کەوا بوو با دەردەکەم هەر پۆشراو بێ) بەلاّم بەرەلّلاّم نەکرد. دیسان چووم بەگژیا، وەرامەکەیم دایەوە، ئیتر بەناچاری وتی (نابێ من لەگەلّ تۆدا سرڕییاتم هەبێ، بەلاّم ئەبێ تۆش ببی بە یەکێک لە دلّ و مێشکم. یەعنی نەیدرکێنی. من و(......) دلّدار و دەستگیران بووین، لە عیشق و دەسەلاّتی هەردووکمان بەهێزتر یەکێک خواستییەوە. لەو ڕۆژەوە چاوەڕێی چەرخ ئەکەم چۆن ئەسووڕێ، بڕیارم داوە تا ئەمرم چاوەڕێی بم)! وا تێگەیشتم کە (نووری) تەنیا خۆشەویستی گەل نەبوو، خۆشەویستی خواو سروشتیش بوو، چونکی لە دواییدا خوا ئەو نێچیرەی دلّی خستە ژێر کەمەندی و بەیەکتری گەیاندن).

* باپیرە گەورەی شێخ نووری سەر بەتەریقەتی قادری بوو، بەلاّم (شێخ عەبدولقادری بەغدادی) باپیرە گەورەی (شێخ نووری) خەلیفەی حەزرەتی (مەولانا خالیدی نەقشبەندی) بووە و ڕوتبەی (سراجەددین)ی داوەتێ کە دەکاتە (سەرۆکی خەلیفەکان). ئەم هەلّگەڕانەوەیەشی لە قادرییەکان بەهۆی ناکۆکی و ناتەبایییەک بووە لەگەلّیاندا. کە لێیان هەلّگەڕاوەتەوە چووەتە بەغدا و لەسەر دەستی (مەولانا خالید) تەریقەتی نەقشبەندی وەرگرتووە. هەر ئەم (سەیید عەبدولقادر)ەیە (مەولانا خالید) خوشکی خۆی پێشکەش کردووە. لە سالّی (١٩٢٩)دا (شێخ عەبدولقادر) لە بەغدا بەنەخۆشی

تاعوون کۆچی دوایی کردووە و هەر لەوێشدا نێژراوە، بۆیە پێیان وتووە (بەغدادی)[8] لە هەمان کاتیشدا (شێخ مارفی نۆدێ) کوڕەکەی کە ناوی (شێخ محەمەد)ە و برا گەورەی کاک (ئەحمەدی شێخ)ە ناردوویەتی بۆ بەغدا تا خێزانەکەی (سەیید عەبدولقادر) و منداڵەکانی بهێنێتەوە بۆ سلێمانی، ئەویش کە دەچێتە بەغدا تووشی نەخۆشی تاعوون دەبێ و لە تەنیشت (سەیید عەبدولقادر) لە غەوسی گەیلانی دەینێژن.

* شێخ نووری پێوەندی پێوەندی خزمایەتی و دۆستایەتی پتەوی لەگەڵ شێخ مەحموودی نەمردا هەبووە. پێوەندی خزمایەتییەکەی بەهۆی (بەهیە خانی ئەمینی عەتار)ەوەیە کە خێزانی دووەمی شێخی نەمر بووە، کە دایکی (شێخ ڕەئووف و شێخ بابە عەلی و حەلاو خان) بووە.

لە مەسەلەی شێخایەتییەکەشیدا «شێخ مەحموود» بەپشت دەگەڕێتەوە سەر «شێخ عەلی» و (شێخ نووری)یش دەگەڕێتەوە سەر (سەیید ئیسحاق). کە ئەم دووانە برا بوون و کوڕی بابە ڕەسووڵی گەورەن. وەک لەم شەجەرەیەی خێزانی شێخ مەحموودی نەمر ئەم قسەیەمان دەسەلمێنین (شێخ مەحموود کوڕی شێخ سەعید کوڕی شێخ محەمەد کوڕی کاک ئەحمەدی کوڕی شێخ مەعرووف نۆدێ کوڕی شێخ مستەفای نۆدێ کوڕی سەیید ئەحمەدی غەزالی کوڕی محەمەدی نۆدێیی کوڕی شێخ عەلی کوڕی بابە ڕەسووڵی گەورەیە) کە ئەم (شێخ عەلی)یە دووەم کوڕی بابە ڕەسووڵە لە دوای (شێخ ئیسماعیل). ئەم (بابە ڕەسووڵ)ەش حەڤدە کوڕی هەبووە، لەبەر زۆری ژمارەی کوڕەکانی ناویان ناوە (ئادەمی دووەم) کە یەکێک لە کوڕەکانی (سەیید سادق)ی ناوە کە ناحیەی (سەیید سادق) بەو ناوەوە ناونراوە. جگە لە مەسەلەی خزمایەتی و شێخایەتییەکەیان، (شێخ نووری) هەستی نەتەوایەتی بەرزی هەبووە و بەبیروباوەڕ پیاوێکی ئاینی بووە، ئەم هەستە نەتەوایەتی و ئاینییەی لە کەسی (شێخ مەحموودی نەمر)دا دۆزیوەتەوە، ئەم دوولایەنەش دوو هۆی سەرەکین بۆ نزیکبوونەوەی شێخ نووری لە شێخی نەمر. بێجگە لەوەش ئەم دووانە لە ڕقی ئەستووریان بەرامبەر بەداگیرکەری ئینگلیز بەیەکتر دەگەنەوە، کە شێخ نووری بەهۆی ئەم ڕقەیەوە تا دوا دوای ژیانی باج و سەرانەیەکی زۆری کەوتووەتە سەر.

(٨) لە بەرگی یەکەمی کتێبی (یادی مەردان) کە مامۆستا (مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس) بەچاپی گەیاندووە، لە زۆر شوێندا (مەولانا خالید) نامەی بۆ (عەبدولقادر)ی زاوای نووسیوە ئەم (سەیید عەبدولقادر)ە ئەوەیە کە ئێمە باسمان کرد. وا دیارە مامۆستا کاتی خۆی ئەو ناوەی بۆ ساغ نەبووەتەوە کێیە!.

(شێخ نووری) ئادەمیزادێکی موونەوەر بووە، بەڵکو یەکێکە لە ڕۆشنبیرە بەدەرەوە بووەکانی سەردەمەکەی خۆی، ئەگەر لە ڕۆشنبیرانی سەردەمی خۆی پێشکەوتووتر نەبووبێ، بۆیە خاوەنی کەسایەتی و بیروڕای تایبەتی خۆی بووە، لە بارەی بارودۆخی سیاسی و مێژوویی ئەو ڕۆژەی گەلی کورد. وتارە سیاسییەکانی کە کردبوونی بە سەروتاری ڕۆژنامەی (ڕۆژی کوردستان) و (بانگی کوردستان)، لە دواییشدا وتارەکانی ڕۆژنامەی (ژیان) کە بەشێوەی وەرام بەرپەچی ڕۆژنامەی (نەجمە)ی داوەتەوە، ئەمانە هەموویان بەڵگەی پێگەیشتنی هۆشیاری و بیروڕای سیاسی ئەم شاعیرە نیشان دەدەن، بۆیە ئاساییە شێخی نەمر بیکاتە جێگەی متمانە پێکردن و لێپرسراوی ئەو ڕۆژنامەیەی کە زمانی حاڵی خۆی بووە. لەگەڵ دامەزراندنی (شێخ مەحموود) بەحوکمڕانی کوردستان، تا ئەو ڕۆژەی مرد، وەک شاعیرێکی بەئاگا و وریا لە دەوروپشتی خۆی و لە سیاسەتی ئەو ڕۆژگارە، هەمیشە ڕقی لە ئینگلیز بووە و هیوا و متمانەی پێیان نەبووە. هەر ئەو ڕقە ئەستوورەشی لە ئینگلیز وای لێ کردووە لە وەزیفەدا پێش نەکەوێ و بۆ ماوەیەکی زۆر تەرفیعەکەی تەگەرەی تێبکەوێ. واتە لە (١٢) دینارەوە نەیانکردووە بە(١٥) دینار، ئەمەش لەو یاداشتەدا (مذكرة)یەدا دیارە کە بۆ مەئمووری خەزێنەی لیوای سلێمانی نووسیوە و ئەویش بەپێی نووسراوی ژمارە (١٧٥٠) لە (١٢-٨-١٩٤١) خستوویەتییە بەرچاوی متەسەڕیفی لیوای سلێمانی و تێیدا دەڵێ:

لا يخفى على سعادتكم أن السيد نوري صالح الكاتب في خزينة لواء السليمانية هو من ذوي المقدرة والكفاءة في أمور المالية. وإنه مثال الأخلاص والنشاط في أداء الواجب. وبالنظر الى خدماته المسبوقة في هذه الدائرة التي بلغت خمسة عشرة عاما لم ينل خلالها أي ترفيع سوى مرة واحدة و ذلك في (١٩٣٧/١٠/٣٠) (أي ان راتبه المعين له في أول تعينه و قدره ١٠,٥٠٠ دينارا) قد بلغ الى (١٢,٠٠٠) دينارا. فعليه وبالنظر لما عرضته أعلاه، أن بقاء المومى اليه في هذه الدرجة طول مدة خدماته مما يستحق العطف. هذا من جهة، من جهة أخرى أنني أعلم شخصيا بما يقاسيه المومى اليه من ضيق بخصوص أعالة أفراد عائلته الكثيرة براتبه الحالي الضئيل و لاسيما في هذه الظروف الاقتصادية الراهنة. فبناء على ما تقدم ذكره اعلاه وبما أن الشروط القانونية متوفرة في الكاتب المومى اليه للترفيع، أرجو التفضل بالتوسط لدى المراجع



لە ڕیزی یەکەم دانیشتووەکان: (١) عەلی ناجی (٢) میرزا مارف (٣) مستەفا ئەفەندی (٤) عەزیزی جوولەکە (ژمێریار) (٥) جەمیل سائیب (٦) شێخ نووری شێخ ساڵح (٧) عارف ئەمین (٨) مەحموود حەمەئاغا (٩) ئەحمەد ڕەفیق (١٠) عەزیز شێخ ساڵح (١١) حسەین کەریم بەگ (١٢) کوڕی عەزیز جوولەکە (١٣) کەریم ساڵح ئەفەندی (١٤) عەبدولڕەحمان مەلا سەعید (١٥) کابرایەکی کەرکووکییە (١٦) مەلا حەمەسەعید (١٧) عەبدلوەهاب کەرکووکی (١٨) حەمەساڵح سەعید زەنگنە (١٩) ئەحمەد سەبری (٢٠) حیلمی (٢١) نەزهەت ئەفەندی (٢٢) قادری فەڕاش (٢٣) سەعید بائع (٢٤) سەعیدی فەڕاش (٢٥) فەڕاش.

ئەمانە لە نێوان ساڵانی (١٩٣٠ - ١٩٣٥) کارگێڕ و بەڕێوەبەر و بەردەستی خەزێنەی سلێمانی بوون

المختصة لترفيع درجته إسوة بزملائه و تلافيا لبقائه في تلك الدرجة مدة طويلة.

له (١٩٤٣/٧/٧) دوای چەندان بگرە و بەردە و (كتابنا و كتابكم) ئنجا مووچەكەیان لە (١٢) دینارەوە كردووە بە(١٥) دینار. پاڵپشتی نەكردنی سیاسەتی ئینگلیز و ڕقی لە كاربەدەستانی نۆكەر و ملهوڕی ئەو سەردەمە، هەمیشە وای كردووە لێی بترسن و ئازاری دەروونیی پێ بگەیەن. هەر بەوەندەش نەوەستاون، بەڵكو بەردەوام بڕو بیانوویان پێگرتووە، بۆ یەكەم جار و دوای ئەوەی بۆیان ساغ بووەتەوە كە ناتوانن ملی پێ كەچ بكەن، نۆكەر و داردەستەكانی ئینگلیز لەو كاتەی بەڕێوەبەری ناحیەی (باڵەك) بووە، سزای (ئینزاریان) بۆ دەركردووە، ئەم سزایەش لە متەسەریفیەتی لیوای هەولێر (قلم التحريرات) دەرچووە و بەپێی نووسراوی ژمارە (٨١٧٧) لە١٢ - ١٩٤٨/٩/١٤ كە ئەمەش دەقی سزاكەیە.

الي السيد نوري الشيخ صالح

مدير ناحية بالك السابق و مدير ناحية طق طق الحالي

الموضوع / أنذار

أعلمتنا مديرية واردات لوائنا بكتابها المرقم ٣٢٧٥ والمؤرخ في ٥-٩-١٩٤٨ انه بنتيجة التدقيقات الجارية تبين بأنكم فيما كنتم في مركزكم السابق أي (ناحية بالك) لم تعتنوا بواجباتكم المرتبة عليكم، حيث قد أهملتم مسك سجلات التحقيقات هناك، الأمر الذي أدى الى تأخير تحصيل البقايا المدورة في الناحية المذكورة، فعليه وبما ان عملكم هذا جاء مخالفا للأوامر والتعليمات المبلغة اليكم فاننا قررنا انذاركم وفق الفقرة (آ) من المادة السادسة من قانون انضباط موظفي الدولة رقم (٦٨) لسنة ١٩٣٦ وعند تكرار عدم اهتمامكم بمسك السجلات المبحوث عنها بصورة منتظمة ومطلوبة فسوف نطبق بحقكم عقوبة أشد.

متصرف لواء أربيل

بەم جۆرە دەبینین بەردەوام بەدوای هەلێ گەڕاون بۆ دەست وەشاندن لێی. جگە لەوەش هەر ڕۆژێ لە شوێنێكەوە گوێزراوەتەوە بۆ شوێنێكی دی. بەوەش دڵیان ئاوی نەخواردووەتەوە، (عومەر عەلی) كاسەلێس و چڵكاوخۆری ئینگلیز (شێخ نووری) لە

وەزیفـە فـەسڵ کـردووە، بەبێ ئەوەی هۆی فـەسڵ کـردنەکـەی دەسـتـنیـشـان بکات. متەسەڕیفیەتی لیوای سلێمانی (قەڵەمی خەزێنە) بەژمارە ٥٥٦/٤٧ لە (١٩٥٥/٢/١)دا (فەرمانێکی کارگێڕی) دەرکردووە و دەڵێ:

## أمر إداري

### الموضوع / فصل مديري ناحية

بناء على موافقة مجلس الوزراء بجلسته الثامنة المنعقدة بتأريخ ١٩-١-١٩٥٥ قررت وزارة الداخلية بأمرها الوزارى المرقم (١٥٧٠) والمؤرخ في ١٩-١-١٩٥٥ فصل كل من السيد (عارف حكمت عبدالمجيد مدير ناحية ماوت و السيد الشيخ نوري الشيخ صالح مدير ناحية (وارماوا) براتب (٣٠ر٠٠٠) دينارا شهريا من الخدمة لمدة ثلاث سنوات وفقا لاحكام المادة ال(١٥) المعدلة عن قانون انضباط موظفي الدولة رقم ٦٩ لسنة ١٩٣٦ وأعتبارا من تأريخ تبليغهما وانفكاكهما من الوظيفة...

١-يقوم الملاحظ كمال علمدار بوكالة مديرية ناحية (وارماوا) حتى إشعار آخر.

٢-يقوم السيد عبدالرحمن حلمي كاتب الناحية بوكالة مديرية ناحية (ماوت) حتى إشعار آخر.

**متصرف لواء السليمانية**

(شێخ نووری) لە (١٩٥٥/٢/٣)دا لە وەزیفـەکـەی دەسـتی لە کـار هەڵگرتووە، بەڵام وەک بەدوای هۆی دەرکـردنی شـێخ نووری لە وەزیفـەدا سـۆراغم کـرد و لێم پێـچـایەوە، لە ئەنجامدا بۆم دەرکـەوت هۆیەکەی ئەوەیە کە دوا جار شێخ نووری گوێزرایەوە (وارماوا - قلیجە)، قایمقامی (هەڵەبجە) کە ناوی (خالید نەقشبەندی) بووە، چووە بۆ (وارماوا) تا بزانێ (شـێخ نووری) بۆچی لە دائیـرەکەی دەوام ناکـات؟ مـامۆسـتـایان (فەتحوڵڵا شـێخ ڕەشـید و شـێخ ئەحـمـەدی شێخ غەنی و بێخـود و شـێخ سـمـایلی شێخ ڕەزای ئەحـمـەد، نەجیبی بەرزنجی، شێخ سەعیدی شـێخ غەنی) بە کۆمەڵ چووبوون بۆ خوازبێنی کردنی (گەلاوێژ)ی کچی (شێخ نووری). (شێخ قادری شێخ نەجیب) بەمامۆستا (فەتحوڵڵا شێخ ڕەشید)ی وتبوو، (شێخ نووری) دەوامی دائیرە ناکات و خەڵکەکە ئیشی خۆیان بۆی دەبەنە ماڵەوە بۆیان ئیمزا دەکات. مامۆستا (فەتحوڵڵا) دەڵێ کە لێم پرسی هۆی نەچوونی

بۆ دائیره چییه؟ وتبووی: (من ناتوانم لەو تەویلەیەدا ئیش بکەم). ئەم قسەیەی بەقائیمقامی هەڵەبجەش وتبوو، قائیمقامی هەڵەبجەش بۆ متەسەڕیفی لیوای سلێمانی (عومەر عەلی) نووسیبوو، ئەویش بۆ وەزارەتی ناوخۆیی ڕەوانە کردبوو، وەزارەتیش بەئیمزای(سەعید قەزاز) بڕیاری فەسڵ کردنیان بۆ دەرکردووە. لە دواییدا کە شێخ نووری بۆ تەواوکردنی موعامەلەی خانەنشینی خۆی دەچێتە وەزارەتی ناوخۆ لە بەغدا (سەعید قەزاز) دەبینێ ئەو پێی ڕادەگەیەنێ کە کارەکە لە دەست ئەودا نەبووە و ئەگەر نەیکردبا گلەیی دەهاتە سەر. ئەوەشی پێ دەڵێ کە بەمەرجێ ماوەیەکی کەم وەزیفە ببینێ دوایی دەکرێ بەقائیمقام. لە دواییشدا (عومەر عەلی) خۆیشی ناردبووی بە شوێنیدا تا بگەڕێتەوە سەر وەزیفەکەی و دوای ماوەیەک وەزیفەی بەرزتری بدرێتێ، یان هەر وەزیفەیەک خۆی هەڵیبژێرێ، بەڵام ئەو بەتەواوی تاقەتی لە وەزیفە دیتن چوو بوو، داوای ئەوانیشی ڕەت کردبووەوە، چونکە نەیدەویست لە ژێر دەسەڵاتی (عومەر عەلی) و گەورەکانی ئەو وەزیفە ببینێ.

بەم شێوەیە دەبینین ئەو وەزیفانەی (شێخ نووری) لە ژیانیدا بینیویەتی زۆر بچووکتر بووە، لەو تێکۆشان و خۆبەخت کردن و پایەیەی بوویەتی، بەڵام شێخ نووری سادە و بێ فیز، قەت چاوی لەوە نەبووە بۆ دەسکەوت و پارە و سامان هەوڵ بدات، ئەوەندەی بڕوا بە کەسایەتی خۆی هەبووە، ڕۆژێ لە ڕۆژان هەڵپەی خۆ بردنە پێشەوە و دەستخستنی پایەی بەرزی وەزیفە لەو ئامانجەی بۆ خۆی کێشابوو، دووری نەخستووتەوە، بۆیە تاسەر خۆی نەدا بەدەستەوە، تا ئەو ڕۆژەی مرد وەک کێوە سەرکەشەکانی کوردستان بە سەربەرزی مایەوە، ئەگەرچی ئەوانەی لە شوێن و پایەی بەرز دانرابوون بەهیچ شێوەیەک لەو بەهرەدارتر و زیرەکتر نەبوون. لەو کاتانەشدا کە هاوڕێ نزیکەکانی دەستیان ڕۆیشتووە، ئەم جگە لە مافی خۆی، داوای شتی زیاتری لێیان نەکردووە، تا بەهۆی ئەوانەوە پایەی وەزیفەی خۆی بەرز بکاتەوە. چەوساندنەوەی شاعیر لە سەردەمی پادشایەتیدا وای لێ کردووە، هەر لەگەڵ کەوتنیان و بەرپابوونی شۆڕشی چواردەی تەممووزی گەلاوێژ، دوو شیعر بۆ ئەم شۆڕشە بڵێت و موژدەی ڕۆژێکی تازەی پڕشنگداری لێوە ببینێ، بەڵام داخەکەم هەر لەو ساڵەدا، واتە لە (١٩٥٨/١٢/٢٠)دا کۆچی دوایی کرد و ئەنجامی ئەم دواڕۆژەی بەچاوی خۆی نەدیت کە چۆن شکایەوە و چۆن ئەو شۆڕشەیان لە ڕاستەڕێی خۆی لادا!.

* شێخ نووری دوای دەسەڵاتی عوسمانلییەکان، ژیانی ژێر دەسەڵاتی داگیرکەرانی ئینگلیزی بەکۆیلایەتییەکی تر زانیوە، بۆیە هەر زوو چووەتە ناو کۆڕی خەباتی قەڵەم و

کردەوە و شان بەشانی خەباتگێران وەستاوە و پاڵپشتی سیاسەتی شێخ مەحموودی نەمری کردووە کە قەڵایەکی سەخت بووە بەرووی ئینگلیزەکاندا وەستاوە. بەشیعر و وتارە ئاگرینەکانی ڕۆڵەکانی نەتەوەکەی هۆشیار کردووەتەوە و خەڵکی لە خەوی غەفڵەت ڕاچڵەکاندووە، بەمەش لە ڕیزی هەرە پێشەوەی ئەوانەدا وەستاوە کە دژی دەسەڵاتی ئینگلیز بوون، هەر لە سەرەتای دەرکەوتن و سەرهەڵدانیان لە عیراقدا، حەزی بەشێوە و شەمایل و بیچمیان نەکردووە، ئەمەش بۆ خۆی جووتکردن و کۆکردنەوەی شیعر نووسین و هەڵوێستی ڕۆژانەیە، چونکە زانیویەتی لە لای ئەو میللەتانەی وەک خۆمان وان شاعیر پێویستە لە پاڵ شاعیرایەتییەکەی هاولاتییەکی خێرخواهی بەرەی ئازادیخوازان بێت. کردەوە و ڕەوشت و خووی بەرز و دەست و دڵ و مێشکی پاکی شان بەشانی ڕۆشنبیری و شاعیرایەتییەکەی ڕۆیشتووە، بەکردەوە و بەشیعر خەباتی کردووە کە چەکی بڕند و کوشندەی دەستی بووە بۆ گۆڕان و هەڵتەکاندنی دامودەزگای چەوسانەوە و پێشێل کردنی سەربەستی و ئازادی مرۆڤ.

لە ساڵی (١٩٢٢)دا و لەسەر مەسەلەی نەتەوایەتی، کاتێ بەڕێوەبەری ڕۆژنامەی (ڕۆژی کوردستان) دەبێ، لە سلێمانی و کەرکووکدا بۆ ماوەی سێ مانگ دەیخەنە بەندیخانەوە، تەنانەت لە (٧-٦-١٩٢٣)دا کە بۆ جاری سێیەم ئینگلیز سلێمانی داگیر کردەوە، لە نیشتمانپەروەرەکانی کورد یەکەم کەس (شێخ نووری)یان خستە بەندیخانە و تووشی چەرمەسەرییان کرد. لە ساڵی (١٩٢٦)یشدا بۆ جارێکی دی لەسەر مەسەلەی نەتەوایەتی هەر لە سلێمانی بۆ ماوەی (١٢) ڕۆژ خستیانە گرتووخانەوە، لەبەرئەوەی بەوتار و شیعرە بەسۆزەکانی بۆ مافی گەلی کورد سکالای دەکرد. لەو ماوەیەی (شێخ مەحموودی حەفید) کرایە حوکمداری کوردستان یەکسەر (شێخ نووری) کردە سەرۆکی شارەوانی و ماوەیەکیش کردی بەیاوەری تایبەتی شاهانە. وەک مامۆستا (ئەحمەد خواجە) بۆی گێڕامەوە وتی: (مێجەرسۆن) بە(مستەفا ئەفەندی) کاتبی تایبەتی خۆی - کە لەم دواییەدا بەڕێوەبەری مەعاریف بوو - وتبوو: خۆزگە قەفەسێک بوومایە و (نووری)یش مەلێک، ئیتر لەگەڵیا بژیامایە. یان بمتوانیایە بچمە ناو مێشکییەوە بمزانیایە ئەوە چۆن دروست بووە؟.

* لێرەدا ئەو کار و وەزیفانەی - شێخ نووری - لە ژیانیدا بینیویەتی دەنووسین، لە لایەک بۆ دەرخستنی لایەنی ئابووری و باری گوزەران و جۆری ژیانی، لە لایەکی تر بۆ ئەوەی خوێنەر بزانێ کە وەزیفە چۆن بووەتە مۆتەکە بۆ کزکردن و بێ هێزکردنی گیانی

شاعیرایەتییەکەی شێخ نووری. ئەگەر وەک میللەتە سەربەست و ئازادەکان (قەدری سنعەت کار)یان بزانیبایە ئەوە بۆی هەبوو شێخ نووری پایەی زۆر لەوە گەورەتر بوایە کە ئێـمـە دەیزانین، بەخـشـشی داهێنەرانەی زۆرتر بوایە لەوەی ئەمـڕۆکـە بۆی بەجێ هێشتووین. ئەمانەش ئەو کار و وەزیفانەن کە (شێخ نووری) لە ژیانیدا بینیویەتی:

* کاتبی دووەم لە شارەوانیَ سلێمانی.
* لە ١٥-١-١٩٢١ تا ٣٠-٨-١٩٢١ بەمووچەی (١٢٠) ڕوپیەی مانگانە.
* کاتبی ئەوەل لە شارەوانی سلێمانی.

لە ١-٩-١٩٢١ تا ٥-٩-١٩٢٢

ئەو ماوەیە کەوتووەتە سەردەمی دەسەڵاتداریێتی (شێخ مەحموودی نەمر) و بەمووچەی (١٦٥) ڕوپیەی مانگانە کردوویەتی بەسەرۆکی شارەوانی.

* مأمور تسجيل أرباب الحرف والمصانع.

لە ١٤-٩-١٩٢٦ تا ١٥-١-١٩٢٧ بەمـووچەی (١٤٠) ڕوپیـەی مـانگانە. وەک دەردەکەوێ دوای نەمانی دەسەڵاتی شێخ مەحموود لە وەزیفە دەرکراوە. نزیکەی چوار ساڵ بەسەر وەزیفەکەی پێشووی تێپەڕیوە، ئنجا ئەم ئیشەی دۆزیوەتەوە.

لە دواییشدا بۆم دەرکەوت گرتنی (شێخ نووری) لە لایەن ئینگلیزەکانەوە بووەتە هۆی دوور خستنەوەی لە وەزیفە.

* کاتبی دووەمی مەسرەف لە موحاسەبەی سلێمانی.

لە ٢-٤-١٩٢٧ تا ٣١-٧-١٩٣٥ بەمووچەی (١٤٠) ڕوپیەی مانگانە.

* کاتبی مەسرەفی خەزێنە لە سلێمانی.

لە ١-٨-١٩٣٥ تا ٢٩-١٠-١٩٣٧ بە (١٠,٥٠٠) دیناری مانگانە.

* کاتبی مەسرەفی خەزێنە لە سلێمانی.

لە ٣٠-١٠-١٩٣٧ تا ١٩-١٢-١٩٣٧ بە (١٢,٠٠٠) دیناری مانگانە.

* کاتبی مەسرەفی خەزێنەی لیوای هەولێر.

لە ٢٥-١٢-١٩٣٧ تا ٢١-٣-١٩٣٩ بە (١٢,٠٠٠) دیناری مانگانە.

(بەپێی نووسراوی مـتەسەڕیفیەتی لیوای سلێمانی - قەڵەمی خەزێنە - ژمارە ٢٠-٣- ٤١٨٤. لە مێژووی ١٨-١٢-١٩٣٧، بڕیار درا (شێخ

نووری شێخ سالّح) لەسەر بەرژەوەندی گشتی وەزیفەکەی بگوێزرێتەوە لە کاتبی خەزێنەی لیوای سلێمانی بۆ کاتبی خەزێنەی لیوای هەولێر و گوێزانەوەی (جەمیل ئەحمەد) کاتبی خەزێنەی لیوای هەولێر بۆ کاتبی خەزێنەی لیوای سلێمانی و هەریەکەیان بەمووچەی خۆیان. ئیمزا متەسەڕیفی لیوای سلێمانی).

بێگومان گوێزرانەوەی (شێخ نووری) هەر لەبەرئەوەیە کە بەنارەزووی پیاوەکانی سەردەمی پادشایەتی نەجوولاوەتەوە، بۆیە لە شیعرێکیدا کە لە هەولێر نووسیویەتی، ئەم گوێزرانەوەیە بە(دەربەدەر و نەفی) دادەنێ بۆ ئەوانەی (سیرەتیان چاکە) کە یەکێک لەوانە خۆیەتی.

لە مێژووی (١٩٣٧/١٢/٢٥)دا لە هەولێر دەستبەکار بووە و (١٠-٣-١٩٣٧)دا لە خەزێنەی سلێمانی دەستی لە کار هەڵگرتووە. وا دیارە ماوەی گوێزانەوەکەیان بە(٢) ساڵ بۆ دەستنیشان کردووە، بۆیە دوای دوو ساڵەکە نووسیویانە:

(بناء على الأمر الديواني الصادر من مديرية المحاسبات العامة المرقم (١٣٥) والمؤرخ في ١٩-٣-١٩٣٧ يحول الشيخ نوري صالح كاتب خزينة لواء أربيل براتب (١٢,٠٠٠) دينار و الشيخ (جميل أحمد) كاتب خزينة لواء السليمانية براتب (٨,٠٠٠) دينار كل بمحل الآخر وبراتبهما الحالين - متصرف لواء السليمانية).

ئنجا (شێخ نووری) لە مێژووی (٢١-٣-١٩٣٩)دا لە هەولێر دەستی لە کار هەڵگرتووە.

* کاتبی مەسرەفی خەزێنەی لیوای سلێمانی

لە ٢٥-٣-١٩٣٩ تا ٥-٧-١٩٤٣ بە(١٢,٠٠٠) دیناری مانگانە.

* کاتبی مەسرەفی خەزێنەی لیوای سلێمانی.

لە ١٥-٧-١٩٤٣ تا ٨-٩-١٩٤٣ بە (١٥,٠٠٠) دیناری مانگانە بەڕەزامەندی وەزارەتی ناوخۆ شێخ نووری کرا بەژمێریاری (تموین)ی لیوای سلێمانی و بەپێی نووسراوی ژمارە (٣٣٠) لە مێژووی (٤-٩-١٩٤٣) و (٩-٩-١٩٤٣)دا لەو دائیرەیە دەستبەکار بووە، ئنجا عەریزەیەکی داوە بۆ چوونە ناو تاقیکرنەوەی بەڕێوەبەرانی (ناحیە). متەسەڕیفی لیوای سلێمانی بەپێی نووسراوی ژمارە (٢٥٨/٤١) لە (٢٠-

٢-١٩٤٤)دا لەم بارەیەوە نووسراوێکیان ئاراستەی وەزارەتی ناوخۆی ئەوسا کردووە، دوای وەرگرتنی ڕەزامەندی وەزارەتی ناوبراو، لە مێژووی (١-٣-١٩٤٤)دا بەهۆی سەرکەوتنی شێخ نووری لە تاقیکردنەوەی بەڕێوەبەرانی (ناحیە) بەئیمزای وەزیری ناوخۆ نووسراوێک ئاراستەی (مديرية المنتوجات المحلية العامة) کراوە بۆ ئەوەی ڕایان وەرگرێ بۆ گوێزرانەوەی (شێخ نووریَ) تا بکرێ بە (بەڕێوەبەری ناحیە). ئەوانیش ڕەزامەندییان لەسەر ناوەڕۆکی نووسراوەکە داوە. لە نووسراوەکەشدا نووسیویانە: (على أن يعين محاسباً قديراً بدلاً من المومى اليه)، ئەمەش بۆ خۆی گەواهی ئەوە دەدات کە شێخ نووری لەو ماوە دوور و درێژەی کاروباری دارایی پێ سپێردراوە، مرۆڤێکی دەستپاک و ڕەوشت بەرز و لێهاتوو بووە، ئنجا (عەبدوڵلا نووری ئەلموهتەدی) کە مامۆستایەکی خانەنشین کراو بووە، دەکەن بەژمێریار و لە شوێنی (شێخ نووری) دادەنێن. (شێخ نووری)یش دەکرێت بە بەڕێوەبەری ناحیەی (ناودەشت) هەر بەمووچەی جارانی خۆی کە (١٥,٠٠٠) دینار بووە. لە (١٥-٢-١٩٤٥) دەستی کردووە بەکارکردن، بەڵام بەر لەوەی بکەوێتە سەر ئیشەکەی تووشی نەخۆشی (عرق النسا) بووە و (١٥) ڕۆژ مۆڵەتیان داوەتێ و لە دواییشدا، واتە دوای ئەو پانزە ڕۆژە کە چووە بۆ ئەوێ هەر نەیتوانیوە لە وەزیفەکەی دەستبەکار بێ. وەزارەتی ناوخۆ بەنووسراوی ژمارە (٣٨٤٢) لە (١٠-٢-١٩٤٥)دا کە ئاراستەی متەسەڕیفیەتی لیوای سلێمانی کردووە، داوای لێ کردوون لە هۆی موباشەرەت نەکردنی (شێخ نووری) بکۆڵنەوە. بەهەرحاڵ لە ١٦-٣-١٩٤٥دا لە ناودەشت دەستبەکار بووە و بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتی هاووڵاتیان، دەسەڵاتی حاکمی سوڵحی دراوەتێ. قائیمقامی قەزای ڕانیە، بەپێی ڕاپۆرتی پزیشکی ژمارە(٢٨٩) لە مێژووی (٧-٨-١٩٤٥) کە لە نەخۆشخانەی مەرکەزی ڕانیەوە دەرچووە، (شێخ نووری)یان حەواڵەی سلێمانی کردووە بۆ تیمار کردنی قاچی، چونکە لە سەریان بەربووەتەوە.(٩)

لە (٢٨-٨-١٩٤٥)دا کراوە بە بەڕێوەبەری ناحیەی (باڵەک) کە لە نزیک (گەڵاڵە)یە. لە (١٢-٦-١٩٤٨)دا گوێزراوەتەوە بۆ ناحیەی (تەق تەق). لە (٢١-٦-

---

(٩) وەستا عەلی حەسەن (١٩٠٤-١٩٩١/٣/٧) دەڵێ: (لە ماڵی حوسێن مەزلووم لە هەیوانەکە - تارمەکە کە شوێنێکی تاریک بوو دەمانخواردەوە. دوای خواردنەوە لە قاڵدرمەکان کە پێچێکی تێدا بوو، قاچی هەڵەنگووت و بەدەمدا کەوتە سەر قاچەکەی و شکا. ئێمە بەکۆڵ بردمانەوە. (مەحموود بەگی جەرڕاح) خۆی هاتە لای و قاچی گرتەوە. من بۆ ماوەی سێ مانگ هەموو شەو لە پاڵیا بووم و لە لای دەمامەوە.

* (شێخ نووری) بەدەست ئازاری نەخۆشی بەرزبوونەوەی پاڵەپەستۆ (ضغط) و (قرحة المعدة)وە دەیناڵاند. لە ئێوارەی ڕۆژی (١٩)ی مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٥٨) خوێنی هەڵێناوەتەوە. دکتۆر (عەبدولڕەحمان عەبدوڵڵا)ی خزم و دۆستی شاعیریان بۆ بانگ کردووەتە ماڵەوە، بەڵام ئەم دکتۆرە بەماڵەوەیان ڕادەگەیەنێ کە ئەمشەو ئەگەر چاک نەبووەوە، بەیانی بیهێننە نەخۆشخانەوە، بەڵام بەیانی کار لە دەترازێ و بەوە ڕاناگەن فریای نەخۆشخانەی بخەن. لە کاتژمێری هەشت و نیوی سەر لە بەیانی بەنەخۆشی تەقینی (قرحة) لە ڕۆژی (٢٠)ی مانگی گەلاڕێزان سەردەنێتەوە. وەک دەیان هونەرمەند و ڕووناکبیر و شاعیری تری ئەو میللەتە، دەبێ بەمیوانی دار ئەرخەوانەکانی (گردی سەیوان). بەڵێ سەیر نییە شاعیرێک دیوانێکی شیعری خۆی لە قەبارەی دەفتەرێکی (٣٠٧) لاپەڕەدا ناو نابێت: (گەڵاڕێزان) خۆشی لە یەکێ لە ڕۆژەکانی خەزانی پاییزی زەرد، وەک گەڵای درەخت بکەوێتە سەمای مەرگەوە و وەک هەڵوەرینی گەڵای درەخت، گەڵای تەمەنی هەڵوەرێ. بەم مردنەشی زیانێکی گەورەی لە بزووتنەوەی شیعری کوردی و گیانی نیشتمانپەروەرێتیدا[١٠] کە مامۆستای شاعیر

---

(١٠) شێخ نووری لە دەستنووسێکدا کە بەدەسخەتی خۆی نووسراوە و بۆ مامۆستا (گیوی موکریانی) ناردووە، دەربارەی خۆی نووسیویەتی: (م. نووری. ناوی شێخ نووری کوڕی شێخ ساڵح کوڕی شێخ غەنی شێخ عەبدولقادر لە ساداتی بەرزنجەیە. لە ساڵی ١٣١٢ ڕومی ١٨٩٦ میلادیدا لە شاری سلێمانی لە دایک بووە.)، کەچی لە دەستنووسێکی دیکەیدا مێژووی لە دایکبوونی خۆی بەشیعر نووسیوە و دەڵێ:

از داوری دل دوش بجستم امداد
آمد به نظر گلی زباغ اجداد
تاریخ ولادتش چو من پرسیدم
فرمود خرد نور بەشیخ صالح داد

واتە ساڵی لە دایکبوونەکەی بە(١٣١١)ی ڕۆمی بەرانبەر (١٨٩٦) داناوە. هەروەها لەو دەستنووسەدا نووسیویەتی: (تەحسیلی علوومی لە مەدارسی علمییە و مەکاتبی ئیبتدائییەدا کردووە. نووری فێرە شاعیرە شاعیرێتی وەهبییە کەسبی نییە. زۆر منداڵ بووە کە شیعری وتووە. لە شوعەرای کورداندا ئەوی ئینقیلابی بەسەر ئەدەبیاتی کوردیدا هێناوە و لەسەر ئسووڵی غەرب شیعری وتووە نووری-یە. ئەم شاعیرە لە هەموو مەوزووعێک شیعری هەیە. لە عالەمی سەحافیدا مودەتێک ئیشتیغالی کردووە. مودیری غەزەتەی ڕۆژی کوردستان و بانگی کوردستان بووە کە لە سلێمانی دەرچووە، ئیلهاماتی شیعرییە و ئەدەبییەی بەئەکسەر لە بەرابەر بەمەنازری تەبیعە و بەتەنیایی بۆ =

(ڕەمزی مەلا مارف) هەواڵی کۆچی دوایی (شێخ نووری) پێدەگات بەم چوارینەیە مێژووی کۆچ کردنەکەی تۆمار دەکات و دەڵێ:

دڵ خۆش مەکە ئەی ڕەمزی بەم دەیرە کە دنیایە
بڕوانە کە (شێخ) ئێستا لە کوێ دایە[11]

---

=حاسڵ بووە. لە عالەمی شیعر و خەیالاتدا زۆر تەنهایی خۆش ئەوێت. بێجگە لە شاعیریەت نووری وەتەنپەروەرێکی سادقە، خەدەماتی وەتەنپەروەرێتی زۆر سبقەتی کردووە. نووری بەکوردی و فارسی و تورکی و عەرەبی شیعری وتووە و لە نەثریشدا دەستێکی بڵندی لە عالەمی وەضعیەتی ئەدەبیاتدا و لە قەواعیدی ئەدەبیەدا مەقالاتی لە غەزەتەدا زۆر نەشر کردووە.

نووری لە هەموو شوعەرای کورداندا وردی فیکر و ئیجادی شاعیری شەهیر مەولەوی زۆر پەسند ئەکات. حاڵی حازر لە حەیاتدایە و لە وەزائفی حکومەتدا کاتبی ئەوەلی خەزێنەی لیوای ئەربیلە).

مامۆستا گیوی موکریانیش لە زمانی شێخ نووری خۆیەوە نووسیویەتی: (شێخ نووری کوڕی شێخ سالحی کوڕی شێخ غەنی لە بەرزنجییانە. لە ساڵی (١٣١٢)ی ڕۆمی (١٨٩٦)ی میلادیدا هاتۆتە ڕووی دنیا، لە سلێمانی لە مەدارسی عیلمیدا تا پایانی جامی گەیاندووە. فارسی و عەرەبی و تورکی خوێندووە. هەر لە ئیبتدائییەوە زەوقی ئەدەبیاتی بووە. موتالەعەی ئەدەبیاتی زۆر کردووە و زەوقی ئەدەبی لەوەوە حاسڵ کردووە. لە دیتنی بەرچاوانی تەبیعیدا زەوقی تەواوی خشڵی جوانی تەبیعەتی بەنەزم وەسف کردووە و لە ئیجتماعیات و نیشتمانی و غەرامی و هەموو شتێکدا غەزەلیاتی هەیە. ئاسارەکانی هەموویان بەکوردییە، کەمێکی تورکی و فارسیشی هەیە. بەموناسەبەتی تووشبوونی دەورەی سەعادەت (کوردییەت) ئەغلەب شیعرەکانیان بۆیە بەفارسییە. لە (١٩٢٢)دا لەسەر مەسئەلەی قەومی کە مودیری جەریدە بوو (ئومێدی ئیستقلال) لە سلێمانی و لە کەرکووک (٣) مانگان لە گرتووخانەدا ڕای بواردووە. لە ١٩٢٦دا لەسەر مەسئەلەی قەومی لە نەفسی سلێمانیدا (١٢) ڕۆژ گیراوە). لە ڕاستیدا (شێخ نووری) داوای لێ کراوە ببێ بەبەڕێوەبەری (ئومێدی ئیستقلال)، بەڵام خۆی ئەو کاتە تاقەتی لە ئیشی ڕۆژنامەگەری چووە، بۆیە لەوێ ئیشی نەکردووە وەک مامۆستا (گیوی موکریانی) دەری خستووە. ئینجا لە نووسینەکە بەردەوام بووە و نووسیویەتی: (لە سکوونی شەودا دەرگای زەوقی دەکرێتەوە. بەهاران لە ناو شاخ و داخدا کە پڕ سەوزی بێ بۆ وەرگرتنی ئیلهامات بەباشتر دەزانێ. لە پەرۆشی و شادیشدا دەرگای تەبعی دەکرێتەوە. لەم دەرفەتانەی سەرەوە تەبعی موتیعیەتی زۆر تەسادوفی کردووە لەگەڵ مەرحوومی ئەحمەد موختار بەگ عوسمان پاشادا هەر ئەو میسرەعێکی وتووە منیش نیوەکەی تریش. ئەسەرێکیان هەیە بەنەسر دەرحەق بەدەستووری ئەدەبیاتی کوردی لە تەواوبوون دایە. لە زەمانی شێخ مەحموودیدا کە حوکمداری کوردستان بوو ڕەئیس بەلەدیە بووە و مودەتێکیش یاوەری خاسی شاهانە بووە.

(١١) ئەگەر دان بەوشەی (لە کوێ دایە) دانەنێین، ئەم تاکە لەنگ دەبێ



شێخ نووری و منداڵەکانی لەگەڵ کۆمەڵێک کەسایەتی و ناسیاوی خۆی

بۆ ساڵی وەفاتی ئەو پیرێ بەزمانی حاڵ
فەرمووی کە (بەدڵ خۆشی نووری لە جنانایە)[١٢]

ئەوەی خراوەتە ناو کەوانەوە بەحیسابی ئەبجەد بەرانبەر بەساڵی(١٣٧٨هـ - ١٩٥٨ز) دەوەستێ. ئەمە سەرگوزشتەی ژیانی شاعیرێک بوو کە پێویستە هەموومان شانازی بەو لاپەڕە پڕشنگدارانەی پاکێتی و ژیان و تێکۆشانەیەوە بکەین، لام وایە ئەمەش بچووکترین خەلاتی خۆشەویستی گەلە، پێویستە بدرێتە شاعیرێک کە لە ژیانیدا نەحەساوەتەوە و لە پڕیشکی ئازار و چەوسانەوەی میللەتەکەی بەدوور نەبووە، بگرە تا ڕۆژی مردنی هەڵگری جانتای خەمی میللەتەکەی خۆی بووە.

**ئەو سەرچاوانەی لەم بەشەدا سوودم لێ وەرگرتن:**

* دۆسیەی شاعیر کە لە خەزێنەی پارێزگای سلێمانیدا پارێزراوە.
* ژیانی شاعیر بەدەستنووسی خۆی.
* ژیانی شاعیر بەدەستنووسی مامۆستا (گیوی موکریانی) کە ئەویش یەکسەر لە دەمی خۆی وەری گرتووە و هەر بەڕاناوی قسەکەر - متکلم - هێشتوویەتییەوە.
* شیعر و ئەدەبیاتی کوردی - بەرگی دووەم ل ١٩٩ - ٢٠٨.
* چەند دانیشتنێک لەگەڵ (شێخ جەناب)ی کوڕە گەورەی شاعیر.
* چەند دانیشتنێک لەگەڵ مامۆستا (فەتحوڵڵا حاجی ڕەشید)ی خزمی شێخ نووری.
* دانیشتنێک لەگەڵ دکتۆر ئیبراهیم حیلمی فەتاح.
* دانیشتنێک لەگەڵ مامۆستا (ئەحمەد خواجە)ی خزم و ئاشنای شاعیر.
* دانیشتنێک لەگەڵ مامۆستا (ئەخۆڵ)ی شاعیر.
* دانیشتنێک لەگەڵ مامۆستا (حەسیب شێخ ئەحمەد شێخ غەنی).
* دانیشتنێک لەگەڵ مامۆستا (شێخ محەمەدی خاڵ).
* دانیشتنێک لەگەڵ مامۆستا (عەبدوڵڵا جەوهەر).
* دوو دانیشتن لەگەڵ مامۆستا (ناسح عەبدوڵڵا حەیدەری).
* دانیشتنێک لەگەڵ (کەمال ڕەمزی مەلا مارف).
* دانیشتنێک لەگەڵ (وەستا عەلی حەسەن).
* دانیشتنێک لەگەڵ (نووری کاکە حەمە «غەریبی»).
* ڕۆژنامەی ژین:ژمارە(١٣٨٤) ساڵی(٣٣)پێنجشەممە٩-٣-١٩٥٨-شعر و شاعیرەکانمان.

---

(١٢) ئەم چوارینەیەم لە کاک کەمالی کوڕی ڕەمزی مەلا مارف وەرگرتووە.

# شێخ نووری شێخ ساڵح لە کۆڕی هونەری گۆرانیدا

(شێخ نووری) وەک لە شوێنی تریشدا وتوومە پیاوێکی بەهرەدار بووە، بەهرەکەی بەتەنیا لەسەر شیعر نووسین نەگیرساوەتەوە، ئەگەرچی لە لای زۆربەی هەرە زۆری خوێنەرەکانی ئەمڕۆکەمان تەنیا وەک شاعیرێک ناسراوە، ئەو بەهرەیەشی بەسەر کۆمەڵێ بواری جۆراوجۆری دەربڕیندا دابەش کردووە، بۆ ئەوەی ئۆخژنی پێ ببەخشن و خودی خۆی بەو هۆیانەوە بسەلمێنێ. بێگومان دابەشکردنی ئەو بەهرەیەش بەسەر چەند لایەنێکی جیاوازی دەربڕین و کارکردن بۆ نیشتنەوەی خرۆش و هەڵچوون و داچوونەکانی ناخی خۆی، لە هێز و تەکانی ئەو بەهرەیەی کەم کردووەتەوە، کە زۆرتر پێوەندی ڕاستەوخۆی لەگەڵیدا هەبووە، چونکە ئەگەر بهاتایە هەموو ئەو بەهرە و تواناییەی خۆی لە یەک بواری دەربڕیندا نیشان بدایە، ئەوە ئەو بەهرەیەی بەهێزێکی گەورەترەوە دەتەقییەوە و خەونی گەورەتری لەو بوارەدا دەهێنایە دی.

یەکێک لەو بوارانەی (شێخ نووری) کەفوکوڵی دەروونی خۆی بێ دامرکاندووەتەوە و ئازار و ئەندێشەکانی خۆی پێ دەربڕیوە، هونەری (گۆرانی)یە، چونکە خۆی خاوەنی دەنگێکی زوڵاڵ و خۆش بووە و بەهۆی ئەو دەنگەوە ئۆخژن کەوتووەتە دڵییەوە، (گۆرانی) یارمەتی داوە زیاتر لە ژیان نزیک ببێتەوە و لە زمانی برین و فرمێسک تێ بگات!

مامۆستا (محەمەد ساڵح دیلان)ی ئاشنا و هاونشینی (شێخ نووری) لە بارەی دەنگ خۆشییەکەی دەڵێ: (زۆربەی دانیشتنم لە خزمەت (شێخ نووری شێخ ساڵح)دا لە ماڵی خوالێخۆشبوو (سەعید بەگی ئەحمەد بەگ)دا بوو کە بەخزمایەتی ئەگەیشتینە یەکتری. (سەعید بەگ) باوکی جەمیلی جوانە مەرگ. شیعر لەبەر و شیعر خۆش ویست بوو، بەتایبەتی شیعری (حافظ و سەعدی). شێخ نووری-ش دوا بەدوای شیعر خوێندنەوە، بەدەنگە خۆشە مەحزوونە، ئازاراوییەکەی دەستی پێ ئەکرد. زیاتر بەشیعرەکانی خۆیەوە کە بۆ جوانەمەرگی برای - شێخ عەزیز-ی وتبوو. دەنگ خۆشی شێخ نووری تەسەللادەری دڵە برینداراەکان بوو. ئەو جۆرە دڵانەی کە لە گەنجییەوە تا پیری (فرمێسک)یان لا نرخدار بوو. فرمێسکی حەسرەت، نەک هەڵاتن... خۆ سووتاندن - نەک چوونەوە... هاوار بەفرمێسک دەرخستن... نەک پشت کردنە ڕووداو...!! بۆیە ئەڵێین... شێخ نووری... دەنگ خۆش بوو... نەک گۆرانیبێژ...!

دەرخستنی دەنگە خۆشەکەی و تێکەڵاو کردنی بەشیعرەکانی خۆی کە بۆ دڵی خۆی و ئازاری ڕۆژانی ئەگریا... ئەم ئازارانە وای لە شێخ نووری ئەکرد جۆرە نووسانێک لە قوڕگیا پەیدا ببێ، نووسانێک هەموو کەس تێی نەئەگەیی، هەموو کەس نەیئەزانی هۆی نووسانەکە چییە؟ پێویستی ئەکرد لەگەڵیا بیت و لێی بپرسی: بۆ تیماری قورگت ناکەی، یا ئەو نووساوییەی لە قوڕگتایە نەمێنێ، ئەوسا پێی ئەوتی و بۆی دەرئەخستی کە نووساندن و قرخەی ناو قوڕگی لە چییەوە هاتووە! دەنگی لە تاو ئازار و هەست بەژانی دەوروپشتی وای لێ کردبوو دەنگەکەی گریناوی بێت.

ئەم چەند دێرە کورتە یادی چەند جارێ دانیشتنمە لەگەڵیا، شاد بێ ڕەوانی پاکی[1] ڕۆژنامەی (ژین)ی ژمارە (١٣٨٤)ساڵی (٣٣)ی ڕۆژی پێنجشەممە (٦-٣-١٩٥٨) و لە گۆشەی (شیعر و شاعیرەکانمان)دا دەربارەی دەنگخۆشی و هونەری بەهاداری (شێخ نووری) نووسیویەتی: (شێخ نووری شێخ ساڵح بێجگە لەوەی کە ئەمڕۆ لە هونەری شیعر و هەڵبەستدا پایەی بڵندە، هەروەها کە ئێستا پیر بووە و بۆ پیری شاعیران لە بەهاری لاوی خۆیدا دەنگ خۆشێکی بێ وێنە بوو. شیعرەکانی خۆی بە بەستە، وە شیعری (مەولەوی) بە قەتار، لە ئێوارانی بەهار لە دەمی زەردەپەڕدا، لە گوێ ئاو و سەرچاوەکانی کەنار، ڕوو بەڕووی سەوزەزار هەر لە خۆی ئەهات. بەبلبلی کوردستان ناوبانگی دەرکرد بوو. (بەڵام ئێستا کە گوڵشەن پەشێوە... کەڵکی بلبلی نەماوە پێوە). ئەم هونەرمەندە دەنگخۆشە کە لە سەردەمی خۆیدا سەر گوڵی کۆڕ و مەجلیسەکانی سلێمانی و هەولێر و کەرکووک و هەڵەبجە بووە، دەنگ و لە پاش بەجێماوی هونەرە بەرزەکەی، وەک دەیان بگرە سەدان دەنگی تر نەپارێزراوە و تۆمار نەکراوە. نەپاراستنی دەنگی (شێخ نووری) زیانێکی گەورەی لە هونەری گۆرانیی کوردی داوە، بەتایبەتی هونەری (مەقامات)، چونکە مەقام شوناسێکی گەورە بووە و یەکێک بووە لەو شارەزایانەی زۆر بەچاکی مەقامیان ئەدا کردووە. ئەگەر ئەمڕۆکە دەنگی (شێخ نووری) لەبەر دەستمان بوایە، ئەوە بەبێ مشتومڕ یەکێک دەبوو لەو دەنگانەی خاوەنی مۆرک و خاسیەتی تایبەتی خۆی بێ و لە بزووتنەوەی هونەری کوردیماندا جێگایەکی تایبەتی بۆ دادەنرا.

ئەگەر لەو سەردەمەدا، کۆمەڵەکەمان کۆمەڵێکی شارستانی و پێشکەوتوو بوایە،

---

(١) ئەم چەند دێرەی مامۆستا (دیلان)م بەدەستخەتی خۆی لە لایە. وەک خۆیم نووسییەوە و بەهیچ شێوەیەک دەسکاری نەکراوە.

گۆرانی گوتنی بەخەوش و نەنگی دانەنایە و بەچاوی سووک تەماشای دەنگخۆشەکانیان نەکردبا و بەپەللار و توانج لە پلە و پایەی کۆمەلآیەتییانی کەم نەکردایەتەوە، ئەم زیانە گەورەیەش لە بزووتنەوەی هونەریمان نەدەکەوت - کە شێخ نووری یەکێکە لە وێنەکانی - ئەوانیش بەتەنیا هونەرەکەیان بۆ چەند ئان و سەعاتێکی کۆڕ و دانیشتنی سەرمەستانەی دۆستان و ئاشنایان تەرخان نەدەکرد. ئەوسا ئاسایی بوو ئەگەر دەنگی خۆیان تۆمار بکردایە یان بیان هێشتایە تۆماری بکەن...! لەگەڵ ئەوەشدا هەر چۆنێ بوایە دەبوو کەسانی نزیک لە (شێخ نووری) بە(قەوان) و (گرامەفۆن) یان بەریکۆردەری گرۆندیک بەشێ لە گۆرانییەکانی تۆمار بکەن و بۆ ئەم کارە هانی بدەن، هەر نا بەدزییەوە دەنگیان تۆمار بکردایە.

ئەگەرچی شوێنەواری هونەریی (شێخ نووری) بەشێوەی دەیانی وەک دەروێش عەبدوڵڵا لەناو چووە و سڕاوەتەوە، بەڵام ئەو دەنگ و سەدایە ئێستاش لە مێشکی زۆر کەساندا دەزرینگێتەوە و لە بیرەوەری زۆر کەساندا یادگاری خۆی هەڵکەندووە، جار جارە فێنکی دەداتە دڵی خاوەن ئەو یادگارانە، بەتایبەتی لە سەردەمێکی پڕ لە چوورتم و وەیشوومەی وەک ئەمڕۆکە. لێرەدا دەربارەی دەنگخۆشی (شێخ نووری) کۆمەڵێ یاداشت و سەرگوروشتەتان بۆ دەنووسینەوە، کە پێوەندی ڕاستەوخۆی بەهونەری (شێخ نووری)یەوە هەیە، لەو بڕوایەدام تۆمار کردنیان لە سوود بەخشین بەدەر نییە. لە هەمان کاتیشدا دەمانەوێ نووسینەوەی ئەو سەرگوروشتانە، ببنە هاندەرێک بۆ برایانی تر، تا ئەوانیش پێش ئەوەی کار لە کار بترازێ، ئەو یاداشتانەیان بنووسنەوە، یان تۆماری بکەن.

بێگومان نووسینەوەی ئەم سەرگوروشتانەش پایەی هونەری (شێخ نووری) دەردەخەن و بەپێی ئاگاداری هەموو ئەوانەی لەگەڵیدا دانیشتوون، بەهرەی دەنگخۆشی شاعیر دەسەلمێنن. مامۆستا (مەحموود تۆفیق فەتاح - شلک) بیرەوەری خۆی لەگەڵ (شێخ نووری)دا دەگێڕێتەوە و دەڵێ: (ئەو کەسە بەختیارە لە ژیانا سوودی هەبێ بۆ گەل و نیشتمان و لە دووی خۆی بەهرەیەک بەجێ بهێڵێ، بەو بۆنەیەوە هەتا هەتایە بەنگ و باوی لە ناو نەچێت. بێگومان شیعر و دەنگخۆشی دوو بەهرەی بەرێزن زۆربەی خەڵقی ئەم وڵاتە ڕێزی لێ ئەگرن و شایانی شانازییە. مەبەستمان لەو پێشەکییە هۆنراوەکانی مامۆستا شێخ نووری شێخ ساڵح (خوا لێی خۆش بێ) و دەنگە ناسک و نازدارەکەیەتی. کاکە شێخ خوێندەوارێکی هەڵکەوتوو و ناسراو بوو. خاوەنی دەنگێکی نەرم و نیان، لە هەست و نەست کاری ئەکرد. لەگەڵ هاوتای خۆیدا زۆرتر لە ماڵی خوالێخۆشبوو مامۆستا

حوسێن مەزلووم جار جار بەمەستی بادەوە لە ناخی دەروونێکی جۆش سەندوو، ئاوازی بەشێوەیەکی مەلوولانە دەربڕیوە.

ئەوەی بۆ من لوا بێ، کەتا ئێستا یادی لە بیرم دەرناچێ، سەر لە ئێوارەی شەوێکی زستان، وەک بەبیرم بێ ساڵی (١٩٤٤) بوو. چەند کەسانێکی بەڕێز و ناودار میوانم بوون، ئاهەنگی ئاواتی کورِم بوو. پۆست و ئیدارەی (عەبدوڵلا سەیید زادە) خوا لێی خۆش بێ – هاوبەشی ئاهەنگم بوو. لە سەرەتای ئاهەنگەکە باسی کاکە شێخ نووری هاتە کایەوە. بەزۆری میوانەکان هانیان دام بچم بەدوایدا، چونکە دراوسێمان بوون. ناچار چووم لە دەرگەکەیانم دا، لە هەیوانی باڵەخانەکەیانەوە سەیری کردم و فەرمووی سەرەوەی لێ کردم. منیش پێم وت کە لەسەر داخوازی فلان و فلان هاتووم. ناردوومیان بەدووتا هاوبەشی ئاهەنگەکەمان بفەرمووی. پێی وتم، مەگەر لەبەر خاتری خۆت بێم. چاوەڕێم کرد خۆی پۆشتە کردەوە هات لەگەڵما. کە میوانەکان زانییان کاکە شێخ هات لە خۆشییانا هەموو هەڵسان و بەپیرییەوە هاتن. هەتا سەرکەوتە ژووری کەلەگییەکەوە. دانیشتبووین، دانیشتوان بەگەرمی بەخێرهاتنیان کرد. بەو بۆنەیەوە (سەیید زادە) دەستی کرد بەگۆرانی (گوڵم گوڵم هەر تۆی فێنکی دڵم) شادمانی ئەوەندە پەرەی سەند هەر کەس لە جێی خۆی وەک چرا داگیرسا. کاکە شێخ بەو بۆنەیەوە لام وایە پێکێ ویسکی نۆش کرد و کردی بە دوو. لە پاش چەندانێ لە پشووێکی بێ دەنگیدا، بۆ هاندانی کاکە شێخ خۆم دەستم کرد بەگۆرانی (ئازیز و سەفەر) بەشیعری (مەحوی)یەوە کە ئەڵێت (دیارم دەیری عەشقە جێ بەسووتن بێ...) هەرکە من سەرەتاکەی لێ بوومەوە شێخی ڕەحمەتی وەڵامی دامەوە، ئەمما چۆن وەڵامێک هەموو کشومات، ورتەمان لێ نە ئەهات گۆرانییەکەی بەبەیتێک لە شیعرەکەی (مەحوی) سەندەوە (نەگەیە دامەنی دەستی دوعا...) لە دوای ئەو من تێهەڵچوومەوە، هەروەها ئەویش وەڵامی دایەوە هەتا دوا بەیتی هۆنراوەکە. داخەکەم نازانم لەمە بەولاوە چۆن هەستی ئەوکاتە دەربڕم کە هێشتا هەر لە مێشک و دڵ و دەروونمان ئەزرینگێتەوە. ئنجا دوای قەرایی سەعات و نیوێک داوای لێبووردن و ڕۆیشتنی کرد، چووین لەگەڵیا هەتا ماڵەوەیان ڕەوانمان کرد).

مامۆستا (ئەخۆڵ)ی شاعیر کە دۆستێکی نزیکی (شێخ نووری) بووە لەم بارەیەوە دەڵێ: (لە ساڵی (١٩٣٦)ەوە (شێخ نووری)م ناسیوە. بۆیەش درەنگ ناسیم، چونکە ئەو لە تەمەنا زۆر لە ئێمە گەورەتر بوو، بگرە لە تەمەنی باوکما بوو، بەڵام لەو ساڵەدا کە ناسیم من لە مەحکەمە مووەزەف بووم و ئەویش لە خەزێنە بوو... سەرەڕای ئەوەی

خزمایەتیمان لەگەڵیان هەبوو، لەگەڵ براکانی (شێخ نووری) (شێخ عەزیز و شێخ ڕەئووف) هاوسنف بووم و لە حوجرە و مەکاتبی علمییەدا بەیەکەوە خوێندبوومان. زۆرتر دانیشتنەکانم لەگەڵ (شێخ نووری) لە ماڵی (حوسێن مەزڵووم) بوو، کە ماڵیان کەوتبووە سەرەتای شەقامی (کاوەی) ئەمڕۆکە. حوسێن مەزڵووم کاکەیی بوو، پیر و بەساڵاچوو بوو، ژنیشی نەهێنابوو. بەهۆی ئەوەی خانووەکەی سەربەخۆ بوو، کەسوکاری نەبوو، لەوێ کۆ دەبووینەوە. زۆر کەسی تریش لەو دانیشتنانە بەشدار دەبوون. کابرا خەڵەفاو بوو، مەزاقیان پێ دەکرد.

حوسێن مەزڵووم (شێخ نووری) زۆر خۆش دەویست و دانیشتنی ئەوی زۆر لەلا خۆش بوو. هەر کەسێک (حوسێن مەزڵووم) لێی عاجز بوایە، ئەگەر لەگەڵ شێخ نووری بچووبایەوە ماڵەکەی لەگەڵی ئاشت دەبووەوە. ئەگەر (شێخ نووری) شەوێک درەنگ هاتبا، ئەوە یەکێکی وەک (ڕەشۆڵ) یا من وەیا هەر کەسێکی دی تۆزە تۆزە گۆرانیمان دەگوت. هەر کە شێخ نووری دەردەکەوت، (حوسێن مەزڵووم) بێدەنگی دەکردین و دەیگوت: (گۆیندەی ڕاستەقینە هات!) (شێخ نووری)یش دڵی نەدەشکاند و چی بووتایە بۆی دەگوت). دوای کەمێ بێدەنگی، مامۆستا (ئەخۆڵ) بیرەوەرییەکانی هێنایەوە بیر خۆی و گوتی: (لە ساڵی (١٩٤٥)دا کە شێخ نووری بەڕێوەبەری ناحییەی - باڵەک - بوو، بەسەردان هاتە کەرکووک. شێخ ڕەئووفی برای لە کەرکووک لە دائیرەی ئیشغال بوو. شێخ نووری لە ماڵی ئەو برایەی دابەزیبوو، لەگەڵ (شێخ کەریمی تاڵەبانی) کە تا ئەمڕۆش ماوە، ئەوسا لە کەرکووک بەیەکەوە لە مەحکەمە فەرمانبەر بووین. شێخ نووری لەگەڵ بنەماڵەی تاڵەبانییەکان ئاشنایەتی و تێکەڵاوی هەبوو. (شێخ کەریم) کە خوشکەزای حەبیب و حەسیب تاڵەبانی بوو، شەو دەعوەتی بۆ کردین. زستان بوو، ئەوساکە شێخ نووری مودیر ناحیە بوو، لەبەرئەوەی لەوێ مقەیەد بوو، نەیدەخواردەوە. کە لە ماڵەوە دانیشتین، کوڕانی شێخ حەسیب تاڵەبانی هەموویان دەنگیان خۆش بوو، کۆڕ گەرم کرا و دەست کرا بەگۆرانی گوتن. لە ناوەڕاستی ڕابواردن و خواردنەوەدا، لەسەر تەکلیفی شێخ ڕەئووف و من و جەماعەت، داوای گۆرانی(گڵکۆی تازەی لەیل)ی حەماغای دەربەند فەقەرەمان لێ کرد. لە عەینی کات لەو بەرەوە خێزانی تاڵەبانییەکان لە ژوورەکانی ئەو بەرمانەوە دانیشتبوون. ئەوانیش گوێیان لە دەنگی شێخ نووری بوو، کە لەو شەوەدا دەیچریکاند و دەنگی وەک زەنگوڵە دەزرینگایەوە. ئەو شەوەمان بەو شێوەیە بەسەر برد. بەیانی کە چووینەوە سەر ئیش لە دائیرە (شێخ کەریم) هاتە ژوورەکەم و پێی وتم: (دەک

ماڵت کوێر ببێتەوە، وەک ماڵت کوێر کردمەوە! ئێستاش کە هاتم و لە ماڵەوە دەرچووم، خوشک و دایک و خێزانەکەم دەگریان...!) مامۆستا (ئەخۆل) تۆزێ بێدەنگ بوو و وتی: (موعجیزە بوو، هەموو سیفاتێکی باشی تیا کۆ بووبووەوە. مرۆڤێکی هێمن بوو، دەنگێکی داوودی مەلائیکی هەبوو. لە هەر مەجلسێکدا ئەو گۆرانی بووتایە، هەموو بێدەنگ دەبوون... شیعرێکم هەیە (شەرتە شەرتە) کە شێخ نووری دەیگوت، داروبەردی دەجووڵاند. بەم دواییەش هەمان شیعر و مەقام لە لایەن مامۆستا (عەلی مەردان)ەوە دەگوترێ کە لە شێخ نووری وەرگرتبوو.

لە زۆر مەجلیسدا ئیلحاحم لێ دەکرد ئەو مەقامە بڵێت کە شیعرەکەی شیوەنێکە بۆ (شێخ عەزیز)ی برای گوتبوو. کە دەستی دەکرد بەگوتن هەردووکمان دەستمان دەکرد بەگریان. تا ئاخیری ڕۆژێ گەیشتە تینی و وتی: (وام لێ دەکەیت جارێ ئینتیحار بکەم)[٢]. مامۆستا (ئەحمەد خواجە) دەربارەی پێوەندی (شێخ نووری) بە(ئەحەی ناسر)ەوە[٣] ئەم قسەیە دەگێڕێتەوە: (ئەحەی ناسر کە زۆر مەشهوور بوو بەدەنگخۆش و شیعری خەییام و حافز و زۆرتر لە فارسی، بابەتایەر و نالی و هەموو شاعیرەکانی کوردی لەبەر بوو. ئەیانبرد بۆ ئێران، ئەیان هێنایەوە بۆ سولەیمانی. کێشیان ئەکرد بۆ هەڵەبجە. هەر مانگە و ساڵە لە جێگایەک بوو، دەنگی (ئەحەی ناسر) بەهەر لایەکدا زرینگابووەوە، بەڵام لە وتنا ئینکار بوو. زۆری نەئەوت کەسێک وەیان جێگایەک ئەگەر بەدڵ و ئارەزووی خۆی نەبوایە، هیچ مومکین نەبوو کورکەیەک بکات، بەڵام شێتی دەنگی (شێخ نووری) بوو. زۆر لە ئێواران لە کەناری شار و لەسەر جۆگە ئاو کۆ ئەبووینەوە، لەپڕ ئەحە ئەهات ئەی قیژاند و ئەیوت: نووری (سلام علیکم)، خۆتم لێ ئەشاریتەوە دەسا شارِ گڕ، کە لە لای (نووری)یەوە بەچیچکانەوە کوشک هەڵئەهات. ئەم کەم جار ئەیخواردەوە. بەنگ - حەشیشەی - ئەکێشا. ئەیوت نووری وا دڵم پچڕا کورکەیەکم بۆ بکە. نووری پێئەکەنی. ئەیوت: (ئەحمەد زۆرت بەسەرەوەیە، بەڵام قەیناکا...). لە مەقامی (سێ گا و چوار گا و

---

(٢) ئەو قسەیە ئەوە دەسەلمێنێ کە مردنی (شێخ عەزیز)ی برای زۆر کاری تێکردووە، تەنانەت مردنەکەی بووەتە هۆی کەم کردنەوەی بەرهەمی شیعریشی. بۆ ماوەی شەش مانگیش گۆرانی نەگوتووە.

(٣) ئەحەی ناسر: لە سلێمانی لە ساڵی (١٨٧٦)دا لە دایک بووە، بەگوڵلەی وێڵ هەر لەو شارەدا لە ساڵی (١٩٢٣)دا کۆچی دوایی کردووە. بنۆڕنە نامیلکەی (ئەحەی ناسر)ی هونەرمەند - چاپخانەی کامەرانی - سلێمانی - ساڵی ١٩٧١ غەفوور ڕەشید داراغا.

هومایۆن) و زۆر مەقاماتی تر چەند پارچەیەکی بۆ ئەوت. ئیتر ئەحەی ناسر بەرەڵلا ئەبوو. ئەمانوت: بەسە! ڕۆژێک وەک ڕۆژان (ئەحە) هات. بڕیارمان دا نووری هیچ نەڵێ تا ئەو نەیلێ. پاش زۆر پاڕانەوە لە نووری، ئەحە ڕووەو قیبلە وەستا و دەستی هەڵبڕی و وتی: خوایە ڕووڕەشی ئەم منالانەم مەکە. مەبەستەکەم بزواندنی (نووری)یە، دەنگم ساز بکە. لە کاتی پاڕانەوەیدا وا ڕێکەوت بایەکی لێ دەرچوو. بێگومان ئەمە بۆ پێکەنین بوو، وتی خوایە هەموو دەستکردی خۆتە: نازانی ئەمە (ق...)ە و ئەمەش دەمە... زۆر پێکەنین.

مامۆستا (فەتحوڵلا شێخ ڕەشید) پێوەندی نێوان (ئەحەی ناسر) و (شێخ نووری) زیاتر ڕوون دەکاتەوە و دەڵێ: (ئەحەی ناسر هونەرمەندی ناسراو، یەکێک بووە لەوانەی عاشقی دەنگی ساحیرانەی شێخ نووری بوو. زۆر لەگەڵیدا دانیشتووە و لە زۆربەی دانیشتنەکانی سلێمانی بەیەکەوە بوون، بەڵام کە ئەحەی ناسر لەگەڵ (شێخ نووری) دادەنیشت لەبەر ئەوە بوو کە ئەم نەخوێندەوار بوو[٤]، (شێخ نووری)یش ڕۆشنبیر و شاعیر و مەقامزان بوو، لە ئوسووڵی مەقامات شارەزا بوو.

(ئەحەی ناسر) گوێی لێ دەگرت، تا ئوسووڵی مەقامات لەوەوە فێر ببێ، هەروەها بەوردی گوێی لەو شیعرانە دەگرت کە شێخ نووری بەگۆرانی و مەقام دەیانی وت، تا شیعرەکەی بەتەواوی و بەبێ هەڵە لێ فێر بێ و لەبەری بکات و ئەویش لە کاتی گۆرانی وتنا شیعرەکان بەتەواوی بڵێتەوە. بۆیە (ئەحەی ناسر) لە دانیشتنەکانی (شێخ نووری)دا کەمتر گۆرانی وتووە، چونکە (شێخ نووری)ی بەمامۆستای خۆی زانیوە. مامۆستا (فەتحوڵلا) لەسەر قسەکانی بەردەوام دەبێ و دەڵێ: (جارێک شێخ نووری لەگەڵ ئەحەی ناسر بەیەکەوە چوونەتە وڵاتی ئێران و لە (تەبریز) لایان داوە. جارێکی دیکەش کە شێخ نووری بەکاروباری بازرگانییەوە دەچێتە (ئێران) پێی ڕاگەیاندم کە (ئەحەی ناسر)ی لە (سابلاغ) بینیوە، بەسەرگەردانی بەشەقامەکاندا سووڕاوەتەوە. (شێخ نووری) کە چاوی پێکەوتووە لەگەڵ خۆی بردوویەتی بۆ ئەو شوێنەی لێی دابەزیوە، ئیدی لەگەڵی بووە هەتا بەیەکەوە گەڕاونەتەوە سلێمانی). ئەم پێوەندییەی لە نێوان (ئەحەی ناسر) و (شێخ نووری)دا دروست بووە، یان ئەو هۆگر بوون و ئاشنایەتییەی بەیەکەوە کۆی کردوونەتەوە،

---

(٤) مامۆستا وای دەرخستووە کە ئەحەی ناسر نەخوێندەوار بووبێ، بەڵام ڕاستەکەی: (کاک ئەحە هەر چەند لە خوێندنگە نەی خوێندووە، تەنیا لە لای مەلای مزگەوتەکان سەرەتای خوێندنی فارسی تەواو کردووە) ل٤٤ نامیلکەی (ئەحەی ناسر)ی هونەرمەند.

هۆیەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە (ئەحەی ناسر)ی هونەرمەند بۆیە حەزی لە هاوڕێیەتی (شێخ نووری) کردووە و لە مەجلیسەکانیدا گوێی لێگرتووە، تا وەک شارەزا و ڕووناکبیرێک سوودی لێ وەربگرێ!

کاک (حەمەی بەکر) کە ئەویش یەکێکە لە دەنگخۆشەکانی شاری سولەیمانی و یەکێک بووە لەوانەی لە کۆڕ و دانیشتنەکانی (شێخ نووری)دا بەشداری کردووە و لە نزیکەوە ناسیویەتی، کە داوای گێڕانەوەی یادگاری خۆیم لێ کرد لەگەڵ (شێخ نووری)دا ئەم یادگارەی بۆ گێڕامەوە کە ئەویش لە خۆی پیرتری بیستووە و وتی: (لە پێش بیستەکان شێخ نووری هاوڕێی (ئەحەی ناسر) بووە. لەو سەردەمەدا شێخ نووری تووشی نەخۆشییەکی سەخت دەبێ و لە جێگای دەخا، کاتێ (ئەحەی ناسر) دەچێتە ماڵەوە بۆ بەسەرکردنەوەی شێخ نووری، دەبینێ نەخۆشییەکەی لە پەلوپۆی خستووە و بێهۆش کەوتووە. (ئەحەی ناسر) لە بەردەم ئەو دیمەنە خۆی بۆ ناگیرێ، بەم شیعرەی (مەولەوی)یەوە گۆرانییەک دەڵێ:

ئەی فەلەک چون من ئازیزەش مەمەرد
یانە چون من لەرەی ئاهی سەر مەکەرد
ئێشی دڵەی ویش هەر مەشنەفتەوە
جێ مەرگ ئازیز، دور مەکەفتەوە

دوای تەواوبوون و لێبوونەوە لە گوتنی گۆرانییەکە بەچاوی پڕ لە فرمێسکەوە لێدەدا دەڕوا. دوای ڕۆیشتنی ئەوەندە نابا (شێخ نووری) عارەقە دەکات و چاو هەڵدێنێ. یەکێک دەنێرن بەشوێن (ئەحەی ناسر)دا بۆ ئەوەی بیگێڕێتەوە، بەڵام نابینرێتەوە و لەبەر چاوان ئاوا دەبێ...)

سەی عەلی ئەسغەری کوردستانی (١٨٧٦ - ١٩٣٧) هەر لە زووەوە بەهرەی هونەری تێدا دەرەوشاوەتەوە. وێڕای زانینی ئەدا کردنی گۆرانییە کوردییەکان، شارەزای تەواوی گوتنی گۆرانی و مەقامی فارسیش بووە کە لەو سەردەمە باو بووە. زۆرتریش مەقامیان بەشیعری (فارسی)یەوە گوتووە، بەڵام ئەم زۆر لەو مەقامانەی کە بە شیعری فارسی گوتراون، بەشیعری کوردییەوە گوتوونی. (سەی ئەسغەر) خاوەنی دەنگێکی ناسک و پڕ سۆز بووە، بەڵام داخەکەم ئەم دەنگە نایاب و کەم وێنەیە وەک زۆر دەنگی ترمان کەمی لێ تۆمار کراوە و بەمەش زیانێکی لە ڕادەبەدەر لە سامانی هونەریمان کەوتووە. ئەم زیانەش بۆ

زۆر هۆی خودی و مەوزووعی دەگەڕێتەوە کە ئێرە جێگای باسکردنیان نییە...!

لە ساڵی(١٩٣٦)دا - واتە ساڵێ بەر لە مردنی - سەیید عەلی ئەسغەری کوردستانی لە شاری هەڵەبجەدا بینراوە. ئەمەش هەر ئەو جارە بووە کە هاتووەتە شاری سلێمانی. مامۆستا (ئەخۆڵ)ی شاعیر دەڵێ: (ئێوارە وەخت بوو چایخانەیەک هەبوو، لە شەقامی کاوەی ئەمڕۆکەدا بوو. سەی ئەسغەر لەو چایخانەیەدا دانیشتبوو، کە بیستم لەوێیە، چوومە خزمەتی. وردە وردە بۆ بزواندنی ئەو کەوتمە گۆرانی و مەقام گوتن. سەی ئەسغەر جووڵا. ئەو ئێوارەیە تا درەنگانێ لە گۆرانی گوتن نەکەوت، شەو داهات ئەو دەنگە لەو شەوەدا دەزرنگایەوە... خەڵکێکی زۆر لەو ناوەدا کۆبووبوونەوە. تا بڵاوەمان لێ کرد و هەر کەسەمان بەرەو ماڵی خۆی ڕۆشتەوە. بەیانییەکەی بیستم (سەی ئەسغەر) گیراوە. تومەز پیاوخەراپان خەبەریان لێدا بوو کە ئەوە (سەی ئەسغەر)ـە و پەساپۆرتی نییە و لەو دیوەوە هاتووە بۆ ئەو ناوە. من ئەوساکە لە مەحکەمە کاتب بووم، حاکمی جەزام دەناسی، هەوڵێکی زۆرم بۆ دا بەری بدەن، یان جەزایەکی کەمی لێ وەربگرن. ئەوە بوو بەهیمەتی حاکمی جەزا، دوو دینار غەرامەیان خستبووە سەر، بەڵام حاکمەکە خۆی پارەکەی بۆ دابوو و ڕەوانەی هەڵەبجە کرا، تا حەواڵەی ئەو دیوی بکەنەوە. کاتی ڕەوانەکردنی (سەی ئەسغەر)، (سەعید قەزاز) قایمقامی هەڵەبجە دەبێ، ئەمیش وەک لێی دەگێڕنەوە پیاوێکی مەجلیس ئاراو بەزەوق بووە. هاوڕێیەتی لەگەڵ زۆربەی ئەدیبان و ڕۆشنبیران و هونەرمەندانی ئەو ڕۆژە هەبووە. شێخ نووری وەک یەکێ لە کۆنە هاوڕێکانی بەشداری زۆر کۆڕ و مەجلیسی - حەمە سەعید قەزاز -ی کردووە و بەمەقام و بەستە بەسۆزەکانی دانیشتوانی هەژاندووە. هەر ئەو کاتە(سەعید قەزاز)، (سەی ئەسغەر) لای خۆی گل دەداتەوە، پێش ڕەوانەکردنەوەی بۆ ئەو دیو، شەو کە لە (یانەی فەرمانبەرانی هەڵەبجە) دادەنیشن و لە دانیشتنێکی سەرمەستانەدا دانیشتنەکەیان بەگۆرانی گەرم دەکەن. بەڕێز (ئەحمەد میرزا ١٩٠٤- ١٩٨٢) کە یەکێک بووە لە بەشدارانی ئەو دانیشتنە دەڵێ: (دانیشتوان دوای سەر گەرم کردن داوای گۆرانییان لە (سەی ئەسغەر) کرد، ئەویش پێیانی وت: لەبەرئەوەی من تازە لە گرتووخانە بەربووم، هیچ زەوقی گۆرانی وتنم نییە، بەڵام ئەگەر هەر حەزیش دەکەن گۆرانی بڵێم و بەشداریتان بکەم، ئەگەر یەکێکی دەنگخۆشتان تیایە با لە پێشان ئەو کورکەیەک بکات، بەڵکو منیش بجووڵێم و بتوانم شتێ بڵێم...) ئەوەی لەو دانیشتنەدا بووبێ و بەدەنگ خۆش ناسرا بێ (شێخ نووری) دەبێ، بۆیە هەموویان ڕوو دەکەنە (شێخ نووری) و داوای گۆرانیی لێدەکەن. (شێخ

نووری) لەسەر داوای هەموو لایەک مەقام و بەستەیەک دەڵێ. کە لێدەبێتەوە (سەی ئەسغەر) بەخەڵکەکە دەڵێ: (ئێوە ئەوەتان هەبێ منتان بۆ چییە؟ سا وەڵڵا تا ئەو پیاوە لێرە دانیشتبێ، من لە حزووری ئەو گۆرانی ناڵێم و بێ ئەدەبی وا ناکەم...).

(وەستا عەلی حەسەن ١٩٠٤ - ١٩٩١/٣/٧) یەکێکە لەوانەی لە زۆربەی دانیشتنەکانی شێخ نووری بەشدار بووە. بیرەوەری خۆی لەگەڵ شێخ نووری بۆ گێڕامەوە و وتی: (بەزۆری لەگەڵ شێخ نووری لە دوکانی (عەبەی دەلاک) یان (عەلی مەمەد)ی بەرگدروو یان لە ماڵی (حوسێن مەزڵووم) دادەنیشتین، بەڵام زۆرتر دانیشتنەکانم لەگەڵ (شێخ نووری) لە ماڵی (حوسێن مەزڵووم) بوو کە زۆر کەسی تریشی لێ کۆدەبووەوە. بەدەم گۆرانی گوتن و نوکتە و قسەی خۆش و هەندێ جار شیعری پێکەنین شەومان بەسەر دەبرد و هەریەکە لە لای خۆیەوە بەیتە شیعرێکی ڕێک دەخست. شێخ نووریش بۆ سوحبەت و پێکەنین شیعری بەسەر (حوسێن مەزڵووم) هەڵدەدا. تا ئێستا ئەو بەیتەم لە بیر ماوە کە دەڵێ:

داڵی کەر خۆرم خۆشبێ، جەولان ئەکا لە ئاسمان
کێ خۆی بەمەرد دەزانێ فەرموو بابێتە مەیدان

یان دەیگوت:

ماڵی حوسێنە فەندی جێگای ڕاز و تەگبیرە
بارام حاکمی شارە، (عەبە دەلاک) وەزیرە

زۆر جاریش بەگۆرانی شەومان بەسەر دەبرد، (حوسێن مەزڵووم) کە شێخ دەهات دەیگوت (موغەنی ئەخوێنێ) بێدەنگ بن. (شێخ نووری) کە سەرخۆش دەبوو و دەکەوتە گۆرانی گوتن پیاوی دەهێنایە گریان. لە ساڵی (١٩٣٢ - ١٩٣٣) شەوێ چووینە ماڵی (عیزەت بەگی وەسمان پاشا) بۆ لای (حوسێن بەگی مەحموود پاشا) ئەو کاتە (حوسێن بەگ) ماڵی لە هەڵەبجە بوو، بەسەردان هاتبوو بۆ سلێمانی. هەر ئەو کاتەش من خەریک بووم خانووم بۆ دەکرد. کە من و شێخ نووری چووین بۆ ئەوێ، (عزەت بەگ) لە ماڵ نەبوو، دوو کوڕی عەبابەیلی لەوێ بوون کە ناویان (شێخ جەعفەر و شێخ حەیدەر) بوو. شەو کە تۆزێ دانیشتین (حوسێن بەگ) تەکلیفی زۆری لە شێخ نووری کرد گۆرانی بڵێ. شێخ نووری-ش چەند گۆرانییەکی وت. کە هاتمە دەرەوە سەیرم کرد خەڵکێکی زۆر لە ئافرەت و منداڵ و گەنج لەو سەربان و گوێسوانەیە کۆبوونەتەوە و هەندێکیان دەگریان.

سەیید ئەحمەدی خانەقا کوڕی سەیید حوسەینی کوڕی شێخ ئەحمەدی سەردار (١٨٧٠-١٩٥٢)[٥] مرۆڤێکی ڕووناکبیری سەردەمی خۆی بووە و یەکێکە لە پیاوە ناودار و بەدەرەوە بووەکانی شاری کەرکووک. سەیید ئەحمەد پیاوێکی ئاینی پایەدار و نیشتمانپەروەرێکی ڕاستگۆی کورد بوو. لەگەڵ ئەوەشدا مەجلیس ئاراو ڕوو خۆش بووە. زۆر حەزی بەهەڵسوکەوتی ئەدیبان و شاعیران و هونەرمەندان کردووە و دڵی بەدانیشتنەکانیان کراوەتەوە. سەیید ئەحمەد لە نزیک پردی خاسەوە دیوەخانەیەکی گەورە و فراوانی هەبووە و لە گشت لایەکی کوردستانەوە خەڵکی ڕوویان تێکردووە، بەتایبەتی پیاوە نیشتمانپەروەر و ناودارەکانی کورد. ئەوە جگە لەوەش ماڵەکەی ڕووگەی هونەرمەندان و ئەدیبانی ئەو دەور و زەمانە بووە. سەرەڕای ئەوەی پیاوێکی خواردە و جوامێر بووە.

کاک (شێخ جەناب) کوڕە گەورەی شاعیر وەک بیستوویەتی دەگێڕێتەوە و دەڵێ: (پاش کۆچکردنی (شێخ عەزیز)ی مامم بەماوەیەکی کورت، باوکم ڕێی دەکەوێتە کەرکووک و لە ماڵی (سەیید ئەحمەدی خانەقا) لادەدا. شەو بەشیعر خوێندنەوە و باس و خواسی جۆراوجۆر کۆڕ گەرم دەکەن، ئنجا دەست دەکرێت بەگۆرانی گوتن. باوکم لەو دانیشتنەدا ئەو شیعرەی کە بۆ کۆچی دوایی (شێخ عەزیزی) مامم نووسیبووی بەمەقامی سەفەر دەڵێ، دانیشتوان حەیران و سەراسیمە دەکات. لەبەرئەوەی گۆرانییەکە زۆر کار لە دانیشتوان دەکات، زۆری لێدەکەن ئەو گۆرانییەیان بۆ دووبارە بکاتەوە. ئەو دەنگە بەسۆزە بەڕادەیەکی ئەوتۆ موچڕکی بەلەشیاندا هێناوە و سەراسیمەیانی کردووە، گەورە و بچووک مەست و سەرسام دەبن!)

مامۆستا حیلمی شاعیر دەڵێ: (شێخ نووری کەم کەم گۆرانی دەوت، بەڵام کە دەیوت پیاو حەزی دەکرد قووتی بدا. زۆرتر گۆرانی (لەو کەلە دەنگی ساز دێ)ی دەگوت، بەڵام زۆر خۆش دەیگوت) مامۆستا (هەردی)یش کە لە دانیشتنەکە بوو کاتێ لە هەڵەبجە لە ماڵی (حیلمی) سازمان کرد وتی: (بەپیری بەهێمنی دەیگوت). مامۆستا مەحموود شەوقی-ش کە چوومە لای وتی: (ئینسانێکی تا بڵێی دەنگخۆش بوو، خەڵک لە

---

(٥) مامۆستا (عەلائەددین سەجادی) لە کتێبەکەیدا (مێژووی ئەدەبی کوردی) چاپی یەکەم (١٣٧٢-١٩٥٢) چاپخانەی مەعاریف - بەغدا لە لاپەڕە (٥٤٨ - ٥٤٩) لە باخی شاعیراندا (سەیید ئەحمەد)ی وەک شاعیرێک باس کردووە.

دانیشتنی وەڕس نەدەبوو. لە ساڵانی نێوان(١٩٣٠-١٩٤٠)دا زۆر جار ڕێکەوتووە گوێم لە دەنگی بێ و لەگەڵی دابنیشم). شێخ نووری دەنگی لە ڕادە بەدەر زەنوێر بووە. ئەوەندە دەنگی خۆش بووە، هەندێ شتی لێ دەگێڕنەوە، دەتوانم بڵێم نزیکە لە ئەفسانە. لێرەدا نامانەوێ ئەو قسانە بنووسینەوە بۆیە پشتگوێیان دەخەین.

کاک(نووری کاکە حەمە «غەربی») دەگێڕێتەوە و دەڵێ: (حەمە ساڵحی حاجی فەتاحی قادر) کە لە ساڵی (١٩١٧) بەنەخۆشی (گرانەتا) لە سەفەربەرا لە تەمەنی (٢٥) ساڵیدا مردووە، ئەم (حەمە ساڵح)ـە کوڕی خاڵی (شێخ نووری)یە. شێخ نووری کە هاتووە بۆ لای و لە ماڵەوە سەری داوە، (حەمە ساڵح) ماوەیەکی زۆر بەهۆی نەخۆشییەکەیەوە چاوی هەڵنەبڕیوە. باوکی (حەمە ساڵح) کە خاڵی شێخ نووری-یە، تەکلیفی لێ کردووە گۆرانییەک بڵێت (کە کوڕەکەی یەکێک بووە لە موعجەبەکانی دەنگی شێخ نووری)، بەڵکە کوڕەکەی چاو هەڵبڕێ! شێخ نووری بەدەنگە تەلیسماوییە خۆشەکەی کە گۆرانی وتووە، (حەمە ساڵح) لە دوای تۆزێ چاوی کردووەتەوە.!

ئەم چەند سەرگوروشتەیەم بۆ سەلماندنی دەنگخۆشییەکەی (شێخ نووری) هێنایەوە، کە ئەم شاعیرە بەهرەدارەمان وەک (وەفایی) شاعیر و دەنگخۆش، خاوەنی دەنگێکی ئێجگار خۆش و پڕ لە سۆز و بێ وێنە و بێ هاوتا بووە[٦] بەڵام ڕووی دواکەوتن ڕەش بێ کە لەو سەردەمەدا ئەو ڕێز و پایەیان نەداوەتە ئەو جۆرە هونەرمەندانە. نەک لە ناو کۆمەڵدا، تەنانەت لە ناو ڕۆشنبیرەکانی ئەو سەردەمەش، ڕوانینیان بۆ هونەرمەند ناجۆر و بەنزمی سەیرکردن بووە، یەکێکیش لەو هونەرمەندانە (دەروێش عەبدوڵلا)ی لەمەڕ (گۆران)ـە کە یەکێکە لە قوربانییەکانی کۆمەڵێکی دواکەوتوو، ئەگەر مامۆستا (گۆران) بەو شیعرە مەزنە نەمری نەکردایە، ئەوە ئەمڕۆکە ناوی لە کوولەکەی تەڕیشدا نەدەما.

شێخ نووری لەگەڵ ئەوەشدا کە لە زۆربەی دانیشتنەکانی سلێمانی و هەولێر و کەرکووک و هەڵەبجەدا دانیشتووە و گۆرانی وتووە، بەڵام هەرگیز بەزۆر لێکردن نەیگوتووە، بگرە لە پێش هەموو شتێکدا گۆرانی بۆ ئازار و فرمێسک و ناخ و برین و چێژی خۆی گوتووە، بۆیە ئەگەر خۆی کەیف و ئارەزووی نەکردبێ، قەت مومکین نەبووە گۆرانی بڵێت. ئەوە ناڵێم زۆر کەڕەت ڕێکەوتووە لە کۆڕی گۆرانی گوتن لەگەڵ (شێخ مەحموودی نەمر) کە ئەویش دەنگخۆش و مەقامزان بووە گۆرانی گوتووە. یان لە ناو هاوڕێکانی خۆی ئارەزووی

---

(٦) وەک باسمان کرد دەنگی شێخ نووری لە تەبەقەی (تینۆری تیژ) بووە.

بزواوه یان جوولاندوویانه و گۆرانی گوتووه، وەک لە دانیشتنەکانی (حوسێن مەزلووم)دا دەردەکەوێ. بێگومان ئەوانەی لەگەڵیان دانیشتووه خۆشیانی ویستووه و دانیشتنەکەی لەگەڵ هەموو کەسێک نەبووه، بۆیە لێرەشدا حەز و ئارەزووی خۆی تێدا کردووه بەسەریشک. ئەگینا بەفرمان و خواهیشتی هیچ کەسێک گۆرانی نەوتووه و کەس نەیتوانیوه بیهێنێتە وتن. هیچ گەوره پیاوێک، هیچ دەسەڵاتدارێک نەیتوانیوه بیبزوێنن[٧].

ئەگەر بهاتایە دەنگی شێخ نووری تۆمار بکرایە، ئەوە یەکێک دەبوو لەو دەنگە جیاواز و تایبەتمەندانەی کەلێنێکی گەورەی لە مەیدانی گۆرانی کوردیدا بۆ پڕ دەکردینەوە و لاپەڕەکانی هونەری گۆرانی کوردی بەچەلەنگییەوە ناوی لە لاپەڕەکانی خۆی تۆمار دەکرد، چونکە وەک بۆمان دەرکەوت لە ئەداکردن و وتندا خاوەنی خاسیەتی تایبەتی بووه. رووپێوی فراوانی قوڕگی یارمەتی داوه بەسەر مەقام گوتندا زاڵ بێت بۆ چینەکانی ئەو مەقاماتانەی پێویستییان پێی هەیە، وەک خۆی دەریان بهێنێ. سەرەڕای دەنگ خۆشییەکەی، شارەزایی لە مەقاماتدا دەیخاتە ڕیزی ئەوانەی کە دەزانن بەشێوەیەکی زانستی قوڕگی خۆیان بەکاردەهێنن. ئەو مەرجانەش بەسن بۆ ئەوەی وەک هونەرمەندێکی دەنگخۆش بدرەوشێتەوە و شوێنێک بۆ خۆی داگیر بکات. مامۆستا (حەسیبی کوڕی شێخ ئەحمەدی شێخ غەنی) دەڵێ: (لەم دواییەدا کە تەسجیل داهاتبوو، زۆر هەوڵم لەگەڵ دا بەدەنگی خۆی گۆرانی تۆمار بکات، بەڵام قبوولی نەدەکرد!) ڕاستە (شێخ نووری) لە کۆڕی قەدەح نۆشان گوڵی مەجلیسان بووه و دانیشتنەکانی گەرم کردووه، بەڵام بەئێمەی ئەوەی ئەمڕۆکە چی، کە لەو دەنگە ئەفسووناوییەی بێ بەش بووین...

---

(٧) شێخ نووری جگە لەوەی دەنگخۆش بووه، وەک شارەزایەک دەربارەی گۆرانی و مەقام بیروڕای خۆی هەبووه. مامۆستا (ناسح حەیدەری) دەگێڕێتەوه و دەڵێ:(ڕای لە ئەداکردنی گۆرانی و مەقامی ڕەشۆڵ نەبوو، دەربارەی ڕەشۆڵ دەیگوت جوانی ناڵێ... گۆرانی (کەتان کەتانە) و (هەوری لار)ی بەلاوه هەڵە بوو. دەیگوت پێویستە ئەو دوو گۆرانییە قورستر و خاوتر بگوترێن، بەڵام زۆر ڕای لە ئەدا کردنی مەقام گوتنی (ئەخۆڵ)ی شاعیر بووه).



شێخ نووری شێخ ساڵح، لە ساڵی ١٩٣٨

# شێخ نووری شێخ ساڵح: شاعیری ڕچەشکێن

چاو گێڕانێکی خێرا بەو بیروڕایانەی دەستنیشانی پلە و پایەی شاعیریی (شێخ نووری) دەکات، ئەوەمان بۆ دەردەخات کە بەشێکی هەرە زۆری ئەو بیروڕایانە، (شێخ نووری شێخ ساڵح)، بەپێشەوای بزووتنەوەی شیعری تازەی کوردی دادەنێ. لە پاڵ ئەو بیروڕایانە هەندێ بیروڕای دی هەن ماموّستا (گۆران) بە پێشەنگی کاروانی شیعری تازە دادەنێ. خوێنەران ئێستاکە بۆیان هەیە جارێکی دیکە بپرسن: بزووتنەوەی شیعری کوردی تازەمان لەسەر دەستی (شێخ نووری) و (گۆران) بەرپا بووبێ، ئەی وەک لایەنە مێژووییەکە کامەیان زووتر دەستپێشخەری کردووە: (گۆران) یان (شێخ نووری)؟ یان کامەیان پێش ئەوەکەی دیکەیان کەوتووە و ڕچەی ئەم ڕێی تازەبوونەوەیەیان شکاندووە؟ بەر لەوەی بکەوینە لێدوان لەو مەسەلەیە، حەز دەکەم بڵێم: مەبەستم لەو نووسینە ئەوە نییە بکەومە بەراورد و بەراوردکاری لە نێوان (شێخ نووری) و (گۆران) و باسی ئەوە بکەم، کە کامەیان زیاتر دەوری لە تازەبوونەوەکەدا هەبووە، یان لە دەسەڵات و توانایی ئەو دوو شاعیرە بکۆڵمەوە. بەتەنیا مەبەستم تۆمارکردن و جێگیرکردنی مەسەلەیەکی مێژووییە لە شیعری کوردیدا، کە مەسەلەی (دەستپێشخەری) و (ڕچەشکاندن) و ڕێگا کردنەوەیە.

دەبێ ئەو ڕایەی ماموّستا (گۆران)یش لە بیر نەکەین کە دەڵێ: (ڕەنگ بێ ڕەفیق حیلمی-ش پێش (نووری) کەوتۆتەوە، بەکوردی و تورکی شیعری بڵاوکردۆتەوە... تەنانەت شاعیرێکی تر (عەبدولڕەحمان بەگی نفووس) لە سەرەتای ژیانی شاعیریەتیدا زۆر بەگەرمی دەستی دایە تازەکردنەوەی هەڵبەست وە لە (نووری) کۆنترە، بەڵام ئەو شیعرەکانی بڵاو نە ئەکردەوە، ئەگەرچی عەبدولڕەحمان لە دوایی ژیانیا لە هەڵبەستەکانیدا (تطویر)ێکی نەکرد و وەستا.[1]

پێویستە لە کاتی لە چاپدان و بڵاوکردنەوەی بەرهەمی ئەو دوو شاعیرەی ماموّستا (گۆران) ناویان دەبات، بەدوای مێژووی شیعرە سەرەتاییەکانیاندا بگەڕێین، تا بتوانین بەهۆی مێژووی شیعرەکانیانەوە، بەبەڵگەوە ئەو ڕاستییە ساغ بکەینەوە کە کامەیان زووتر

(١) بڕوانە: دانیشتنێک لەگەڵ گۆراندا، گۆڤاری بەیان، ژمارە (٢)ی شوباتی (١٩٧١)، نووسینی: عەبدولڕەزاق بیمار.

شیعری تازەیان نووسیوە، ئەو کاتە بەهۆی مێژووی شیعرەکەوە، ئەو ڕایەی ئێمە هەڵدەوەشێتەوە و ئەو مێژووە تازەیە شوێنی ئەو مێژووەی ئێمە لێی دەدوێین دەگرێتەوە. پرسیار کردن دەربارەی پێشەوایەتی و دەستپێشخەری کردن لە هەر بوارێکی تازەکردنەوە و ئەزموونگەریدا، مەسەلەیەکی تازە بابەت نییە و هەر بەتەنیا لە ناو ئێمەدا باس ناکرێت، بەڵکو لە مێژووی ئەدەبیاتی هەموو گەلانی دنیا لێی دەکۆڵرێتەوە و هەمیشە دەپرسن کێ لەم بوارەدا سەرکردە و دەستپێشخەر و پێشەوایە؟

لە ڕاستیدا هەرچەندە ئەم مەسەلەیە لە پرۆسەی داهێنان و خوڵقاندندا هاتووەتە پێشەوە، بەڵام دیسان بایەخ پێدانی هۆیەکە بۆ دەرخستنی هێڵی بەیانیی لە ناو بزووتنەوەی داهێناندا، یارمەتی ڕەخنەگران دەدات بۆ دەرخستنی شێوازی جیاوازی هەریەکەیان. ئەگەر قەناعەتیش کرا (شێخ نووری) پێشەوای شیعری تازەیە و یەکەم کەسە بەردی بناغەی ئەو تازەبوونەوەیەی دانابێ، ئەوە مانای وا نییە ئیدی (شێخ نووری) ببێتە سەرەتا و کۆتایی داهێنانی شیعری ئەو سەردەمە.

لە لای میللەتانی پێشکەوتوو و شارستانی، کە نرخی زانست دەزانن، ئەو میللەتانەی لێتوێژەرەوەکانیان ئامادەن لەسەر مەسەلەیەکی زانستی خۆیان نان بڕاو بکەن، هەوڵی فەرهادانە دەدەن لە پێناوی ڕاستکردنەوەی مێژوویەکی ئەوها ناسک، بۆ ڕاستکردنەوەی ئەم جۆرە مێژووانەش پەنا دەبەنە بەر بەڵگەنامە و دوکیومێنت، یان بەموناقەشە کردنێکی مەوزووعییانەی بیروڕایەکان کێشەکانیان یەکلا دەکەنەوە. عەرەبەکانیش لە دەستنیشان کردنی یەکەم ڕچەشکێنی شیعری تازەیان کەوتبوونە ناو مشتومڕێکی زۆر و تا ئەمڕۆش ئەوەیان لە لا ساغ نەبووەتەوە کە کێ یەکەم شیعری تازەی بەتەفعیلەی نوێ نووسیوە و بۆ یەکەم جار کەرتی کردووە، لە کاتێکدا مەسەلەکەی لەمەڕ خۆیان زۆر ڕوون و ئاشکرایە و هەندێ کەس حەز دەکات بەدەستی ئەنقەست حەقیقەتەکە بشێوێنێ و بیخاتە ژێر لێوییەوە، چونکە هیچ نووسین و موناقەشە کردنی ناوێ، بۆیە ئەو حەقیقەتەی دان بەیەکەم دەستپێشخەری (شێخ نووری) دادەنێ لە ژێر هەر پەردەیەکدا بشاردرێتەوە، ئەوە مێژوو بەرانبەر بەو کەسانە بڕیاری دڵڕەقانە و بێ زەییانەی خۆی دەدات و شێواندنی ئەو ڕاستییە لە کەسیان وەرناگرێ، چونکە مەبەستیان نییە بەلێپرسینەوەوە بەرانبەر بەمێژوو بدوێن و حەقیقەتەکانی ژیان وەک خۆی وەربگرن و بگێڕنەوە. وەک زانیمان دەربارەی ئەم مەسەلەیە، دوو دەستەی سەر بەدوو بیروڕای جیاواز هەن، بەشێکی ئەو ڕایانە لەبەرئەوەی مەنهەجەکەیان ڕوون نییە و بەرانبەر بەمێژووی ئەدەبەکەمان کەمتر هەست بەلێپرسینەوە

دەکەن یان لە ڕووی عاتیفییەوە گرەوی ئەم ڕچەشکاندن و پێشڕەوایەتی کردنی شیعرە تازەیە دەدەنە پاڵ مامۆستا (گۆران). لەو بڕوایەش دام ئەگەر مامۆستا (گۆران) خۆیشی بمایە بەو بڕیارە قایل نەدەبوو، وەک زووتریش پێی قایل نەبووە. هەر لەبەر نەبوونی مەنهەجێکی ڕوون لە لای ئەو نووسەرانە، چەند شتێ تێکەڵ بەیەکتر دەکەن، یان بڵێین تەپوتۆزێک بەرپا دەکەن تا مەسەلەی (ڕچەشکاندن) و دەستپێشخەرییە مێژووییەکە لە (شێخ نووری) بسەنرێتەوە، ئنجا یان دەڵێن (شێخ نووری) لاسایی ئەدەبی تورکی کردووەتەوە، یان وەستا و پێش نەکەوت، یان وەزیفە بواری نەدا لەسەر تازەبوونەوەکەی بەردەوام بێ.

(د. کامیل بەسیر) لە کتێبەکەیدا دەپرسێ: (کە بڕیار دراوە مامۆستا (گۆران) سەرکردەی ڕێباز و قوتابخانەی تازە کردنەوەی هۆنراوەی کوردییە، ئایە ئەم بڕیارە تا چ ڕادەیەک فەرامۆشی ئەرکی شێخ نووری شێخ ساڵح لەو بوارەدا دەکات؟)(٢).

بێگومان بڕیاردانی سەرکردایەتی کردنی ئەو ڕێباز و قوتابخانەیە بۆ هەر کامێکیان بگەڕێتەوە نابێ ببێتە هۆی فەرامۆش کردنی دەوری ئەوەکەی دیکەیان، چونکە (دەستپێشخەری) مێژوویی و ڕچەشکاندن لە هەر کایە و بوارێکی ڕۆشنبیریدا، ئەوە ناگەیەنێ ئەو کەسەی دەستپێشخەرییەکەی کردووە، تا سەر تێیدا سەرکەوتووە و بواری بۆ کەسی دی نەهێشتووەتەوە، بەڵکو پێویستە بەبایەخێکی زۆرەوە لا لەو کەسانەش بکرێتەوە کە بەشداری ڕچەشکێنەکە دەکەن و پەرە بەڕێبازەکەی دەدەن و دەیچەسپێنن.

دیسان (د. کامیل بەسیر) دەپرسێ و دەڵێ: (تازەکردنەوەی هۆنراوەی کوردی بەدیاردەیەکی دوا بەدوای سالانی (٤٠) لە قەڵەم بدرێ، تا چ ڕادەیەک ئەم کردەوەیە لەگەڵ مێژووی ڕاستەقینەی وێژە و ڕەخنەسازیی کوردیدا دەگونجێ...)(٣).

لەوە دەکات (د. کامیل بەسیر) ئەم قسەیەی سەرزارەکی بیستبێ، دەنا دەبوایە سەرچاوەکەی دەستنیشان بکات، چونکە لە هەموو گەڕان و سۆراخەکەمدا بەدوای ئەو نووسینانەی لە بارەی شێخ نووری نووسراون، ڕای وام بەرچاو نەکەوتووە. کە قسەکە سەرزارەکی بێت وا بەئاسانی جێگەی خۆی ناکاتەوە... ئەوەی تۆزقاڵێ ئاگای لە باری

---

(٢) بڕوانە کتێبی (شێخ نووری شێخ ساڵح) لە کۆڕی لێکۆڵینەوەی وێژەیی و ڕەخنەسازیدا د. کامل حەسەن عەزیز ئەلبەسیر -بەغدا- ١٩٨٠ لە بلاوکراوەکانی کۆڕی زانیاری عێراق دەستەی کورد ل٧ .

(٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٧-٨ .

ئەدەبی و ڕۆشنبیری کورد بێت، دەزانێ کە بزووتنەوی تازەکردنەوەی شیعری کوردی شان بەشانی بزووتنەوەکانی شێخ مەحموودی نەمر لە سالانی بیستەوە تەقیوەتەوە و بەرپا بووە، نەک دوای سالانی (١٩٤٠)، بۆیە ئەم قسەیە لەگەڵ مێژووی ڕاستەقینەی بزووتنەوەکە ناگونجێ و بەقسەی هیچ کەسێکیش ناچەسپێ.

تازەکردنەوە لە ئەدەبدا خەمێکیَ هەمیشەیی ئەو کەسانەیە کە خاوەنی بەهرەی ڕەسەن و گەورە و زەمینەی ڕۆشنبیری فراوان و پتەون، هەر ئەمەشە بەردەوام سەرنجی ڕەخنەگران و لێتوێژەرەوەکان ڕادەکێشێ. ئەو تازەبوونەوەیەی (شێخ نووری) لە کۆڕی شیعری کوردی هاوچەرخماندا بەرپای کرد، خۆی لە ناو پەرەسەندنێکی ئاسایی شیعری کوردیدا حەشار دابوو، واتە کارێک نەبووە بەزۆری زۆردارەکی ملی گرتبێ و هێنابێتی بۆ ناو شیعری کوردی. ئەو تازەبوونەوەیەی (شێخ نووری) بەرپای کرد و خەت و خاڵ و نەریتی بۆ ڕشت، پێشکەوتنێکی لەبار و زەمینە خۆشکەرێکی چاک بوو بۆ تێپەڕاندنی ئەو شێوازەی شیعری پێش خۆی دەقی پێوە گرتبوو، بەمەش وازی لەو (بنەما – قیم)ـە شیعرییانە هێنا کە شاعیرانی بەر لە خۆی دەکەوتنە ژێر تەئسیری تەوژمەکەی و لاساییان دەکردەوە. ئەم پێی خەوش و نەنگی نەبوو کاتێ بەهۆی تەوژمە تازەکەی ڕۆشنبیری سەردەمەکەی خۆی، بەرووی شیعری کلاسیکی هەڵگەڕایەوە و چاوی لە شاعیرانی پێش خۆی نەکرد، پەیڕەوی دابونەریتی ئەوان بکات، کە شیعری بەشێوازێکی تازە نووسی گوێی نەدایە لێشاوی توانج و ڕەخنە، بۆیە دەڵێین (شێخ نووری) شاعیرێکە نەریتی شیعری گۆڕی و قاچی نایە ناو قۆناغێکی تازەوە لە شیعری کوردیدا یان وەک مامۆستا (کامەران موکری) دەڵێ: (مامۆستای ماوەی گوێزرانەوەیە (فترة الانتقال) لە هۆنراوەی کوردیدا)(٤).

شێخ نووری لە سەردەمی ڕاپەڕینەکانی شێخ مەحموود، دەرفەتی یاخیبوون و هەڵگەڕانەوەی زیاتری بۆ ساز بوو، چونکە هەر لەو کاتەدا یاخیبوون بەسەر بنەمای کۆمەلایەتی و سیاسی و شۆڕش بەرپاکردن بەسەر کۆندا دەرگای بۆ خرایە سەر گازەرای پشت. لەبەرئەوەی هەنگاونان بەرەو داهێنان پێویستی بە(ئازادی) هەیە، ئەو بارودۆخە ئازادی زیاتری بۆ مسۆگەر کرد و ڕێگای بۆ خۆش کرد بەهۆی ئەو ئازادییەوە زیاتر تەعبیر بکات و خۆی لە کۆتی دابونەریتی شیعری کلاسیکی دەرباز بکات.

---

(٤) بڕوانە: (هۆنراوەی نووری شێخ سالح) – چاپخانەی کامەران – سلێمانی ٢٥٧٠ک – ١٩٥٨ز پێشەکی کامەران موکری ل ٣ .

شێخی نەمر ئەو ئاووهەوایەی ساز کرد تا شۆڕشەکەی ببێتە شۆڕشێکی هەمە لایەن و هەموو سووچ و کون و قوژبنێکی ژیان و ڕواڵەتەکانی بگرێتەوە. بەشێکی زیندووی ئەو شۆڕشە فراوانە، گۆڕینی جیهانبینی و فۆرم و شێوەی شیعر و تازەکردنەوەی کەرەسەکانی بوو، هێنانە پێشەوە و سنگ کوتانی ڕێبازی تەعبیر کردنێکی تازەبوو لەو ژیانە نوێیە، کە گۆڕینی بنەما سیاسی و کۆمەڵایەتییەکە هێنایانە پێشەوە و ڕەپێشیان کرد. ئەم بارودۆخە تازەیە هەلێک بوو بۆ نوێخواز و تێکۆشەرەکانی مەیدانی شیعر، تا ئەوانیش بەکردەوەی ڕۆژانە و بەفیعلی شیعر دژی چەوساندنەوە و دەمکوتکردن و کۆت و پێوەند بجەنگن و سەربەستی بۆ خۆیان و میللەتەکەیان زامن بکەن. هەر ئازادیشە داهێنان دەتەقێنێتەوە. کەواتە سەرەتای شیعری نوێی کوردی لە باوەشی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازانەی میللەتی کورد چاوی هەڵێناوە.

هەنگاوەکەی (شێخ نووری) تا ماوەیەکی زۆر، خەڵکی تووشی کاردانەوە کردبوو، چونکە ئەم بزووتنەوەیەیان بە لادان و یاخیبوون دەهاتە بەرچاو، وەک هەر هەنگاوێکی دی بەرەو گۆڕین و داهێنان کەوتووەتە بەر لێشاوی تانە و تەشەر، لەبەرئەوەی (نوێبوونەوەکە) لە ژیانی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی میللەتی کورددا بەتەواوی ڕەگوریشەی دانەکوتابوو و ئاشنایانی کەم بوو، بەڵام (لە ئەنجامــا بەتایبەتی لەم ساڵانەی دواییدا دەرکەوت کە شۆڕشێک بوو پڕ بەپڕی (واقیع و پێویستی)[٥] زۆربەی ئەوانەش کە دەربارەی ئەم بزووتنەوەیە نووسیویانە و بەکزی ڕۆڵی شێخ نووری تێدا نیشان دەدەن، جگە لە بینینی بەشێکی کەمی شیعرەکانی ئەم مەسەلەیەش پشتگوێ دەخەن. بەموغامەرەکردنی شێخ نووری بۆ نووسینی یەکەم شیعری تازە کە جیاواز بوو لەگەڵ دابونەریتی شیعری کلاسیکی و شاعیرانی بەر لە خۆی، بووە یەکەم شاعیری ڕچەشکێن. بەهۆی زمانی ڕووخاندن و خاپوورکردن و بنیادنان و دروستکردنەوە بووە خاڵی وەرچەرخان لە شیعری کوردیدا و ڕێڕەوی شیعری کوردی بەرەو ڕاستە شەقامێکی دیکە گۆڕی، بەم کارەشی چەمک و مانای شیعری گۆڕی.

شێخ نووری شۆڕشە شیعرییەکەی بەشۆڕشی شێخ مەحموود بەستەوە، کە شۆڕشێکی بەدیهاتوو بوو، وەک لە دواییدا باسی دەکەم ئەم خۆ بەستنەوەیە لە سەرێکەوە تەئسیرێکی سەلبی کردە سەر بەخشش و داهێنانی شیعری، بەڵام وەک شاعیرێک لە سەرەتاوە هەوڵی

---

(٥) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٣ .

دا بەشێکی کەمیش بێت سووچ و مەودای شۆڕشی داهاتووی شیعری کوردی دیار بکات، چونکە وەک داهێنەری ڕێچکەیەک موغامەرەی کرد، هەموو موغامەرە کردنێکیش بوونمان بەرەو ژیانێکی باشتر دەگۆڕێ، دەستپێشخەری کردن لە موغامەرەدا نەبێ نامانگۆڕێ و نابینە خاوەنی خۆمان و چارەنووسی خۆمان، موغامەرە نەکەین خۆمان نادۆزینەوە و ناتوانین بەهۆی ئەو موغامەرەیەوە جیهانی نەزانراو بکەین بەمەعلووم و زانراو. کەواتە شیعری کوردی زۆر قەرزاری ئەو موغامەرەیەیە کە (شێخ نووری) کردی.

شێخ نووری ئەو جۆگەلەیەی ئاوی شیعری پێدا دەڕۆیشت، بەرەو ڕێرەوێکی دی ئاوی جۆگەلەکەی گۆڕی. ئەگەر هیچی بۆ نەنووسرێ، ئەوەندەی بەسە کە شاعیرێکی بوێر بوو، بەرانبەر بەو دەستپێشخەرییە بەبێ دۆش دامان و ئازایانە کەوتە بڵاوکردنەوەی بەروبوومی شیعری خۆی، کە لەسەر تانوپۆی ئەو ڕێبازە تازەیە نووسیبوونی. با لەو سەردەمەدا کەسانی دی هەبووبن لەسەر هەمان شێوە و ڕێباز شیعریان دانابێ، بەڵام کە قەناعەتیان بەڕێبازە تازەکە پتەو نەبووبێ وەک چۆن لای (شێخ نووری) هەبووە و پێگەییوە یان نەیانوێرابێ شیعرەکانیان بڵاو بکەنەوە، ئەوە دیسان ئافەرینەکەی بۆ (شێخ نووری)یە، کە بەهەرەمەیی و لە خۆڕا یان بەڕێکەوت دەستی نەدایە ئەو تازەکردنەوەیە، بەڵکو لە ئەنجامی ورد بوونەوە و لەسەر وەستان و ئەزموون و زەمینەیەکەوە گەیشتە ئەو قەناعەتە و بەجورئەتەوە لە ناو خوێنەرانی ئەو سەردەمەدا بەرپای کرد و ئاڵای تازەبوونەوەی هەڵگرت و بۆی چووە مەیدان. هەر بەتەنیاش چووە مەیدانەوە و کەوتە جەنگ لەگەڵ ئەوانەی ڕووبەڕووی ڕاپەڕینە شیعرییەکەی بوونەوە. خۆ ئەگەر کەسانی دیکەش هەبووبن لە تازەبوونەوەکەیدا لەگەڵی بووبێتن، ئەوە کەفوکوڵ و سووربوونەکە بۆ ئەو ڕێبازە زیاتر لە لای (شێخ نووری) بەدەردەکەوێ. بەم عینادی و سووربوونەی خۆی دەبێتە لوتکەیەکی دیکە و دەچێتە پاڵ ئەو لوتکە هەڵکشاوانەی دیکەمان، کە لە چەرخ و زەمانی خۆیان ئەوانیش ئاڵای داهێنان و تازەبوونەوەیان هەڵگرتووە. بەمەش نیشانەیەکی تازەی لە شیعری کوردیدا دیار و دەستنیشان کرد، کە کەس ناتوانێ نکوڵی لێ بکات.

(شێخ نووری) شاعیرێکە گوزارشت لە گیانی سەردەمەکەی خۆی دەکات، چونکە شاعیرێکە زۆر بەڕاستگۆییەوە بەتەنگ داوایەکانی سەردەمەکەیەوە چووە و بووەتە دەمڕاستی و توانیویەتی بەڕوانینێکی تازەوە بچێتە کۆڕی ژیانەوە و شیعری نوێ بەژیانی نوێوە ببەستێتەوە و ببێتە نوێنەرێکی زیرەکی گەیاندنی ئەو پەیامە شارستانییە. واتە (شێخ نووری) تازە بوونەوەکەی تەنیا لە بواری کێش و قافیە دابین نەبوو، بەڵکو

نوێبوونەوەی تێڕوانینی بوو، تا بەو تێڕوانینەوە سەیری داهاتوو و چارەنووس و مەسەلەی نەتەوەکەی بکات و لەگەڵ ورد و درشتی ڕووداوەکانی سەردەمەکەی دڵی لێی داوە و لەگەڵیان هەڵچووە و داچووە. ئەزموون و تاقیمانەی ئەو ژیانە تازەیەی لە خۆیدا گوشیوە و لەگەڵ خوێندنەوەکانی خۆی تێکەڵی کردووە، تا شیعرەکانی کردووە بەخولاسەیەکی ئەو قۆناغە ڕاپەڕیوەی مێژووی نوێی نەتەوەکەمان و وەک هۆیەکی ڕاگەیاندنی ئەو بارە تازەیەی لەو قۆناغەدا سەری هەڵدا بوو، خۆی هێنایە پێشەوە. واتە شیعرە تازەکانی لەگەڵ بزاڤی سیاسی و کۆمەڵایەتی ئەو سەردەمە لە دایک بووە و لەگەڵ چەکەرەکردنی ئەو شۆڕشە، شۆڕشی شیعری خۆی ڕاگەیاندووە و جیهانی شیعری خۆی پێ ئاوەدان کردووەتەوە، بۆیە شێخ نووری شیعری کردووە بەتەرجومانێکی ئەو بارە نوێ و تازەیە.

خوێنەر بەوردی شوێن پێی شیعر و نووسینەکانی شێخ نووری هەڵگرێ، ئەوەی بۆ ڕوون دەبێتەوە کە لەگەڵ (نوێبوونەوە)کە سەرپێی و ڕاگوزار نەبووە، بەڵکو بەدڵ و بەگیان و لە قووڵایی ناخییەوە هەڵتەکاوە و چووەتە ناو ئەزموونی تازەی شیعری کوردییەوە، یەکەم جار کە ویستی بەشیعری تازە تەعبیر لە ژیان و ڕوانینی تازە بکات، بێگومان ئەم پەیڕەوکردن و ڕێچکە تازەیەی گرتییە بەر، لادان بوو لەو عورف و دابونەریتەی شیعر، کە خوێنەران و شاعیرانی ئەوسای لەسەر ڕاهاتبوون و هۆگری بووبوون. هێنانە پێشەوەی شتی نائاشنا بەخوێنەریش پێویستی بەجورئەت هەیە، بەڵام نەک جورئەتێ لە نەزانییەوە سەری هەڵدابێ، بەڵکو جورئەتێکە لە ئەنجامی تێکەڵ بوونێکی گیانی بەگیانی بەسەردەمەکە و لە تێگەیشتنێکی قووڵ بۆ کێشەی (نوێبوونەوە) هاتبێتە وجوود. ڕەنگە لەو سەردەمەدا مەسەلەی (تازەکردنەوە) مێشکی زۆر کەسی دیکەی گوشیبێ و بەبیر و زەینی زۆر کەساندا تێپەڕیبێ، یان زۆر کەسی دی هەبووبن حەزیان کردبێ بەدوای ئەو ئاسۆ فراوانەدا بگەڕێن کە ژیانی تازەی لێوە ببینن و گوزارشتی لێ بدەنەوە، بەڵام هونەری دەست پێشخەرییەکەی بۆ شێخ نووری دەگەڕێتەوە کە خۆی لە قەرەی دا و زەفەری پێ برد و ڕچەکەی شکاند. خۆ لە قەرەدانی کارێکی وەهاش پێویستی بەپێگەیاندنی کەرەسەکانی دەربڕین هەیە، لە پاڵ بەهرەی ڕەسەن و ئەزموون و ڕۆشنبیری سەردەم.

شێخ نووری وەک موونەوەر و ڕووناکبیرێکی ئەو سەردەمە هەموو هەلومەرجێکی خۆ لە قەرەدانی ئەو تازەکرنەوەیەی تێدا کۆبووبووەوە و بەبێ سڵەمینەوە ئەنجامی دا، بەڵام بەشێوەیەکی سروشتی و ئاسایی، نەوەک دەستکرد و زۆرەملێ، لەبەرئەوەی (تازەکردنەوە) پێداویستییەکی مێژوویی و نەتەوەیی و شارستانی بوو، دەبوایە لەسەر دەستی (شێخ

نووری)یش نەبێ هەر ئەنجام بدرێت. ئەوەی بەوردی چاوێک بەشیعرەکانیدا بخشێنێ، بەچاکی هەست بەعەفەوییەتی شیعری و خوڕی دەربڕین و ئاهەنگی وشە و ڕستە و وێنەکانی دەکات.

مامۆستا(ڕەفیق حیلمی) لە بەرگی دووەمی کتێبەکەیدا (شیعر و ئەدەبیاتی کوردی) دەربارەی سەرەتای دەستپێکردنی شاعیریەتی مامۆستا (گۆران) نووسیویەتی: (هەر لەو سەردەمەدا گۆران غەزەلێکی یەکەمی حەوت بەیتی وتووە کە مەتڵەعەکەی (واتە سەرەتاکەی - ئازاد) ئەمەیە:

لە تاو فـــرقـــتی یارم، دڵم دائم پریشـــانە
وەکو مجنونی حی ویلی کەژ و دەشت و بیابانم

ئەم غەزەلەی گۆران پیشانی بەرەحمەت چوو، (بێخود)ی شاعیری بەناوبانگی ئەو ڕۆژە ئەدەن و پێی ئەڵێن کە منالێکی (١٢) ساڵی نووسیویە. پەسەندی ئەکاو وشەی «یارم» ئەگۆڕێ بە«لیلی» بەلام وادیارە کە لەو دەمەدا گۆران لە مەبەستی مامۆستا (بێخود) لەم گۆڕینە نەگەیشتووە و نەی زانیوە کە بەلای (مجنون)ەوە یار هەر ئەبێ (لیلی - لەیلا)بێ)[٦]. ئەم قسەیەی مامۆستا (ڕەفیق حیلمی) نووسیویەتی وەک مامۆستا (گۆران) خۆی دەڵێ: (مامۆستا ڕەفیق حلمی بۆ نووسینی باسەکەی هات لە خۆمی پرسی)[٧]. واتە لە خۆی وەرگرتووە. ئەم قسەیە ئەوە دەگەیەنێ کە ئەگەر مامۆستا (گۆران) لە دایکبووی (١٩٠٤) بێ، ئەوە نووسینی ئەو شیعرەی نیشانی مامۆستا (بێخود)ی داوە ساڵی (١٩١٦) بووە، ئەگەر لە (١٩٠٥)یش لە دایک بووبێ ئەوە ساڵی (١٩١٧) بووە. کەواتە کە شێخ نووری لە ساڵی (١٩٢٠)دا بزووتنەوەی شیعری نوێی کوردی ڕاگەیاندووە مامۆستا (گۆران) لە تەمەنی (١٤-١٥) ساڵان بووە، ئەگەر لە ساڵی (١٩١٦- ١٩١٧)دا ئەمە سەرەتای شیعری مامۆستا (گۆران) بێت، بڕوا ناکەم دوای سێ - چوار ساڵ تێپەڕبوون بەسەر نووسینی ئەو شیعرەی نیشانی مامۆستا (بێخود)ی داوە و بۆی سەیر کردووە، ئەو قەڵەمبازە گەورەیەی دابێ و شان بەشانی شێخ

(٦) بڕوانە (شعر و ادبیات کوردی) بەرگی دووەم - چاپخانەی الشباب، بەغدا، نووسەری: ڕەفیق حیلمی ل١٥١.

(٧) گۆڤاری بەیان، ژمارە (٢) شوباتی (١٩٧١)، دانیشتنێک لەگەڵ - گۆران -دا، نووسینی عەبدولڕەزاق بیمار.

نووری دەستی دابێتە تازەکردنەوەی شیعری کوردی، چونکە شیعرێکی دیکەی مامۆستا (گۆران)مان لەبەر دەستە لە ساڵی (١٩٢١)دا نووسیویەتی لەو شیعرەدا دەڵێ:

ئەی دایە، ئەگەر ئەپرسی حاڵم!
«ئێ: تۆیش وەکو باقی بێ ڕەحم نیت،
تۆزقاڵێ، کەمێ ڕەحم ئەزانیت!»
ڕاستی شەو و ڕۆژ هەر دەناڵم!
دەگریم و دەسووتێم هەر وەکو مۆم،
ئاهم ئەگاتە گۆشی گەردوون،
مات و کز و مەلوول و مەحزوون
بۆ حاڵی غەریبی، بێ کەسیی خۆم!(٨)

لەم شیعرەدا مامۆستا (گۆران) ئەو زەمینە ڕۆشنبیری و ئەو ئەزموونە شیعرییەی نەبووە بتوانێ شان بەشانی شێخ نووری بەشداری تازەکردنەوەکەی ساڵی (١٩٢٠)ی بکات، بەڵکو ئەم شیعرە کە لە سیمایەکانی شیعری کلاسیکی دوور کەوتووەتەوە، لە ژێر تەئسیری هەنگاوەکەی شێخ نووری بەرەو تازەکردنەوەی شیعری کوردیدا نووسراوە. مامۆستا (ڕەفیق حیلمی)یش لە دەمی مامۆستا (گۆران)ـەوە ئەو قسەیەی وەرگرتووە کە دەڵێ: (شیعر دانانی ڕاستەقینە و بەدڵی گۆران لە ساڵەکانی ١٩٢٩ و ١٩٣٠ەوە دەس پێ ئەکا. لە هاوینی ١٩٣٠دا ڕەشید نەجیب چەن هەڵبەستێکی لە غەزەتەی (ژیان)دا بۆ بڵاوکردووەتەوە و تخلصی (گۆران)یش هەر ئەو حەلە ڕەشید نەجیب بۆی داناوە)(٩).

ئەم قسەیەش چەند لایەنێکمان بۆ ڕوون دەکاتەوە. لە پێشەوە ئەو بیروڕایە ئەوە دەسەلمێنێ کە شێخ نووری ئەگەر وەک مامۆستا (ڕەفیق حیلمی) دەستنیشانی کردووە، لە ساڵی (١٩٢٠) نوێبوونەوەکەی ڕاگەیاندبێ، مانای وابووە شێخ نووری لەو ساڵەدا لە تەمەنی (٢٤) ساڵیدا بووە، کە ئەمەش تەمەنێکی زۆر لەبارە بۆ موغامەرە کردن لە پرۆسەی تازەبوونەوەدا، چونکە موغامەرە کردن لەو تەمەنەدا سیفەتێکی گەنجانەیە و گەنج

(٨) بڕوانە دیوانی گۆران - سەرجەم بەرهەمی گۆران - بەرگی یەکەم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عیراق - بەغدا لە بڵاوکراوەکانی یەکێتیی نووسەرانی کورد - ١٩٨٠ ل ٢٣٠

(٩) بڕوانە کتێبی (شعر و ادبیات کوردی) بەرگی دووەم، چاپخانەی الشباب، بەغدا، نووسەری: ڕەفیق حیلمی ل١٥٢

خۆی لەو تەمەنانەدا - بەتایبەتیش لە بواری شیعردا - کاتەکەیان زۆر لەبارە و گیانی موغامەرەکردنیان زیاترە بۆ داهێنان و ڕچەشکاندن و سڵ نەکردنەوە. لە ماوەی ئەو دە ساڵەشدا واتە [ ١٩٢٠ - ١٩٣٠ ]دا (شێخ نووری) تاقە شاعیرێکی مەیدان و گۆڕەپانەکە بووە کە لەسەر نەخشەو ڕووپێوی شیعری کوردیدا جوولاوەتەوە و ئەرکی تازەکردنەوەی شیعری کوردیٔ لە ئەستۆ گرتووە و خۆی بەرپرسیار بووە لە ئەنجامەکانی بەرپاکردنی ئەم بزاڤە و بەتاقی تەنیاش چووە بەگژ چێژی مەییوی ئەو خوێنەرانەی کە گوێچکەیان لەسەر ڕیتم و ئیقاعی شیعری کلاسیکی ڕاهاتووە.

شێخ نووری لە ماوەی ئەو دە ساڵەدا بەشێوەیەکی تیۆری (٢٥) وتاری ڕەخنەیی بڵاوکردووەتەوە و تیۆریزە (تنظیر)ی بۆ ئەو تازەبوونەوەیە کردووە و ڕچەشکێن و بەرهەم هێنەری کۆمەڵێ شیعری تازەیە و بەم کارەشی لە خوو و نەریتی شیعری کلاسیکی هەڵگەڕاوەتەوە و یاخی بووە. وەک پێشتر وتمان لەو سەردەمەدا یاخیبوونی سیاسی و شۆڕش بەرپاکردن بەسەر داگیرکەرانی کوردستان هەبوو، تەقینەوە هەبوو بە ڕووی ئەوانەی دەستیان گرتبوو بەسەر سەربەستی و چەوسانەوەی نەتەوایەتییان دروست کردبوو، ئەو تەرزە شیعرەش تەنیا لە لای ئەو کەسانە بوو بەجێی بایەخ و سەرنجدان کە تۆوی یاخیبوون و حەز لە ژیانێکی شەنگتر و پێشکەوتووتریان تێدا بوو، ئەو کەسانەی کە لە ئاستی گەورەیی و مەزنی ئازادیدا بوون، ئەم کەسانەش ژمارەیان کەم بووە، مامۆستا (گۆران) یەکێکە لەو کەسانە و ئەو شێوازەی (م. نووری)یان کردووە بەسەرمەشق و قەبووڵیان بووە، بەڵام لەبەرئەوەی جەماوەر ئەنجامی زەق و ڕاستەوخۆی لەو تەرزە شیعرە چاوەڕێ دەکرد، بۆیە بزووتنەوەکە بۆ ماوەیەک لە جەماوەر و خوێندەواران دوورکەوتەوە، لە لایەن ئەوانەی حەزیان بەشیعری کلاسیکی دەکرد و ئەوانەی خەریکی نووسینی شیعری کۆڵەگەیی بوون، ڕەت کرایەوە و بەچاوێکی سووک و کەم بایەخ سەیر کرا.

بۆی هەیە وشەی (لاساییکەرەوە) کە بەباڵای شێخ نووری-دا براوە، لەو کاتەوە بۆی مابێتەوە کە ڕەسەنایەتی لە شیعری کۆڵەگەییدا بینراوە، دەرچوون لە کۆت و پێوەندی ئەو شیعرە ئەو وشەیەی بەسەریدا ساغ کردبێتەوە، بەڵام بەوە چاکە یاسای ژیان و ڕەوڕەوەی بەرەو پێشەوە چووی ئادەمیزاد کارێکی وای کردووە، مرۆڤ وەک دەنکە نۆکێک نەبێت هەر بیچێنی و بەروبوومی نۆک بدوورێتەوە. ئادەمیزاد خۆی بەفیترە و زگماک شۆڕشگێڕایەتی و گۆڕانی لە خۆیدا دیوە، بۆیە ئەگەر لە سەرەتاوە لەگەڵ ئەو جۆرە هەنگاوانەدا نەبووبێ، ئەوە لە دواییدا، لە ئەنجامی وردبوونەوە و تێڕامانی سەر گازەرای

پشت و له یەکێک لەو شەوانەی کە تێدا چاوی بڕیوەتە ئەستێرەکان و لە ژیان و لە خۆیان راماون و بیریان لێ کردووەتەوە، بۆیان دەرکەوتووە هەندێ بڕیار پێویستی بە پێداچوونەوەیە، بۆیە بەگوێرەی هەنگاوی تازەبوونەوەکەش هەندێ کەس بەبیروڕایەکانیان داچوونەوە و لەولاشەوە دەستەیەک لاوی خوێن گەرم پەیدا بوون ئەو بزووتنەوەیە بگرنە باوەشی خۆشەویستی و میهری خۆیان و داکۆکی لە (حەلاڵ زادەیی)یەکەی بکەن و وەک پێداویستییەکی مێژوویی و نەتەوەیی و شارستانی تەماشای بکەن.

لە سالانی سی بەولاوە و هەر لەو کاتەوە کە مامۆستا (گۆران) کەوتە بلاوکردنەوەی شیعرەکانی خۆی، ئیدی شیعری تازە وردە وردە ئاشنا و مریدانی خۆی بۆ پەیدا بوو و لە سەردەمی مامۆستا گۆران و پەیتا پەیتا بلاوکردنەوەی شیعرەکانی، (تازەکردنەوە) بووە بە«دیاردە»یەک و خوێنەرانی خۆی بۆ پەیدا بوو، شاعیرانی دیکەش چوونە ژێر ئالاکەیەوە کە (شێخ نووری) تا گەیشتە ئەو فۆرم و شێوەیە باج و سەرانەیەکی زۆری بۆ داوە. لەبەرئەوە ئەگەر شاعیری دی چووبێتنە پاڵ ئەو بزووتنەوەیە و لەو سالانەدا (واتە لە چلەکان و پەنجاکاندا) تازەبوونەوەکە زیاتر بلاوبووبێتەوە و پەلوپۆی هاوێشتبێ، ئەوە کارێکی زۆر ئاساییەو ناکرێت ئەو پەرەسەندن و بلاوبوونەوەیە لە سەرەتایەکەی دابڕین، بەڵکو پێویستە هەمووی بەسەریەکەوە سەیر بکەین و بڕیاری رەخنەیی لە بارەی قوتابخانەی شیعری تازەوە بدەین. خۆ ئەگەر شێخ نووری بەدوودڵییەوە ساختمانی شیعری نوێی کوردی هەڵچنیبێ و مامۆستا (گۆران) هاتبێ کون و کەلەبەر و کەموکورتییەکانی پڕ کردبێتەوەو لێی زیاد کردبێ و لە شێخ نووری تێپەڕاندبێ و لەو پێشکەوتووتریش بووبێ، نابێ مافی شێخ نووری وەک ڕچەشکێنێک فەرامۆش بکرێت. پێداگرتنیش لەسەر دەرخستنی دەوری تەنیا یەک کەس لە دروستکردنی قوتابخانەیەکدا کە - کۆمەڵێ شاعیر - سیمایەکەیان نەخشاندووە، بڕوا بوونە بە(میری شاعیران) کە وا بزانم لەو سەردەمەدا بەهۆی جیاوازی چێژ و بۆچوونی خوێنەران باوی نەماوە، ئەمڕۆکە هەر شاعیرە و خوێنەر و مریدی خۆی هەیە و بۆ بینینی ژیان و گوزارشت لێدانی، هەریەکەیان خاسیەت و شێواز و گۆشەنیگای تایبەتییان هەیە. لە لایەکی ترەوە ئاستی خوێندەواری و ڕۆشنبیری شیعری هەر خوێنەرێک لەگەڵ خوێنەرێکی دی جیاوازە، بۆیە لە هەڵبژاردنی شاعیری خۆشیان جیاوازن، لەلایەکی دیکەوە (میری شاعیران) قوت بکەینەوە دەبێ تاکو ماوین سەری داهێنان بکوتینەوە و بڕوامان بەوە نەبێ کەس هەبێ ئەو (میری شاعیرانە) تێپەڕێنێ، هەمووشیان بەدەست و پێوەند لە لای ئەو میری شاعیرانە ڕاناگیرێن. ئەم قسەیەم ئەوە

ناگەیەنێ - خوانە خواستە - بڵێم خوێنەری وا هەن حەز بەشیعری مامۆستا (گۆران) ناکەن، چونکە ئەو کەسەی حەز لە شیعری مامۆستا (گۆران) نەکات لە لای من بێ زەوقە، بەڵام دەڵێم با تەرکیزکردن لەسەر مامۆستا (گۆران) نەبێتە هۆی لە بیرچوونەوەی ئەوانی دیکەو شاردنەوەی دەور گێڕانیان لە بزووتنەوەی شیعری تازەماندا. لە کاتێکدا مامۆستا (گۆران) خۆی لە چاوپێکەوتنەکەیدا لەگەڵ (عەبدولڕەزاق بیمار) ئەوەی دەورێکی بچووکیشی لە تازەکردنەوەکەدا هەبووبێ ناوی بردووە.

هەرچەندە لەم باسەمدا تەنیا مەبەستم ڕچەشکاندن و دەستپێشخەری کردنە لە بواری تازەکردنەوەی شیعری کوردیدا، بەڵام حەز دەکەم بپرسم: بۆچی مامۆستا (ڕەفیق حیلمی) تازەبوونەوەکەی شێخ نووری لە ساڵی (١٩٣٠)دا دەکوژێنێتەوە و نازانم بۆ ئەم ساڵەی هەڵبژاردووە و بەڵگەی چییە؟! من زیاتر بۆ ئەوە دەچم کە مامۆستا خۆی نووسیویە: [شیعر دانانی ڕاستەقینە و بەدڵی گۆران لە ساڵەکانی ١٩٢٩و ١٩٣٠وە دەست پێ ئەکا] کەوابێ کە مامۆستا (گۆران) کەوتە بڵاوکردنەوەی شیعری ڕاستەقینە و بەدڵی خۆی لە ساڵی (١٩٣٠) بەولاوە، ئیتر (شێخ نووری) لە بەرهەم و بەخششی شیعری تازە کەوتووە؟! کە من لەگەڵ مامۆستا (ڕەفیق حیلمی) لەم دەستنیشان کردنەدا یەک ناگرمەوە، چونکە دوو شیعرەکەی شێخ نووری (ژیانی ئادەمیزاد) و (پەپوولە) کە لە بەرگی دووەمی کتێبەکەیدا لەسەریانی نووسیوە بەرهەمی چلەکانی (شێخ نووری)یە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە شێخ نووری تا ئەو ساڵانەش بەکەفوکوڵ و بەجۆش و گەرمییەوە بەپیر تازەکردنەوەوە چووە.

مەسەلەی تازەکردنەوە لە شیعری کوردیدا وەک ڕچەشکاندن و دەستپێشخەریی مێژوویی تووشی ئیلتیباسێکی وا نەبووە وەک ئەو ئیلتیباسەی شیعری تازەی عەرەبی تووشی هاتووە و کۆمەڵێ بیروڕای جیاواز دەربارەی ڕچەشکاندنەکە و مێژووی نووسینی یەکەم شیعری تازەی ئەوانەوە هەیە، چونکە ئەوەی لای خۆمان مەسەلەیەکی زۆر ڕوون و ئاشکرایە و پێویستی بەهیچ بەڵگە و سەلماندنێک نییە، جگە لە سەرقاڵکردنی نەوەی خوێندەواری ئەمڕۆکەمان و گرتنی پانتاییەکی فراوانی ڕۆژنامە و گۆڤارەکانمان بەو باسەوە کە مامۆستا (گۆران) هەر لە سەرەتاوە خۆی براندوویەتییەوە.

کێشەی تازەکردنەوەی شیعری کوردی لە نێوان مامۆستا (گۆران) و (شێخ نووری) لە چەند ڕۆژێکدا بەند نەبووە، تا لێی بکەوینە گومان کردن، چونکە (کات) و (مێژووی) دەستپێشخەرییەکە بڕاوەتەوە و مامۆستا (گۆران) خۆی لە دوو شوێندا گرەوی

ڕچەشکاندنەکە بۆ لای (شێخ نووری) دەباتەوە. دەبینین کێشەی مێژووی نووسینی یەکەم هۆنراوەی تازە لە لای عەرەبەکان لە نێوان [عەلی ئەحمەد باکثیر و لویس عەوز و سیاب و نازک]دا بەند کراوە. ئەوان لەوەدا تووشی بگرە و بەردە هاتوون کە (نازک ئەلمەلائیکە) یەکەم شیعری تازەی بەناوی (الکولیرا) لە ڕۆژی (٢٧/ ١٠/١٩٤٧)دا نووسیوە و لە (١)ی کانوونی یەکەمی هەمان ساڵدا بڵاوکراوەتەوە. (بەدر شاکر ئەلسیاب)یش لە دیوانی (أزهار ذابلة)دا کە لە بەغدا لە ناوەڕاستی کانوونی یەکەمی هەمان ساڵدا دەرچووە، لەو دیوانەیدا شیعرێکی بڵاوکردووەتەوە بەناوی (هل کان حبا). خۆشی ئەوەی دەستنیشان کردووە و لە پەراوێزی شیعرەکەیدا نووسیویەتی: [لەو جۆرە شیعرانەیە کە کێش و قافیەی جیاوازە] لەگەڵ ئەوەشدا کە ڕەخنەگرانی عەرەب (بدر شاکر السیاب) زۆر بەشاعیرتر دەزانن لە (نازک ئەلمەلائیکە)، بەڵام بۆ مەسەلەی دەستنیشان کردنی مێژووی یەکەم شیعری تازە و یەکەم کەسی دەستپێشخەر کەوتوونەتە ناو ئەو مشتومڕەوە، کەچی وەک وتم لە لای ئێمە مەسەلەکە تەواو جیاوازە، (شێخ نووری) بەچەند ساڵ پێش مامۆستا (گۆران) دەستی داوەتە چەکی تازەکردنەوە و بەتیۆر و پراکتیک چووەتە مەیدانی تازەکردنەوە و دەستی خۆی وەشاندووە و بەکۆمەڵێ وتاری ڕەخنەیی چەند چەمکێکی تازەی دەستنیشان کردووە کە لەگەڵ چەمکی شیعری کلاسیکی ڕێک ناکەوێ، بەشیعریش لە بواری شیعری تازەدا بەرهەمێکی زۆری بەدەستەوە داوە. کەواتە شێخ نووری لە شیعری کوردی هاوچەرخماندا سەرەتایەکی تازەی بۆ داڕشت و بناغەی بۆ دانا. وەک ڕوونیشم کردەوە ڕاگەیاندنەکەی ڕاگەیاندنێکی بێ زەمینە نەبوو، بەڵکو قەناعەتێک بوو ڕوانینی گۆڕیبوو، بەپێی ئەو ڕوانینە تازەیەوە شیعری دەنووسی. کە شێخ نووری ئاڵای تازەبوونەوەی هەڵکرد و سەرکردایەتی بزووتنەوەی شیعری تازەی کوردی گرتە ئەستۆی خۆی تا ماوەیەکی زۆر، یان باشتر وایە بڵێین تا ماوەی دە ساڵ هەر خۆی بە بەرهەم لەسەر تازەبوونەوەکە بەردەوام بوو، ئەو بەردەوام بوونە وەک مامۆستا (گۆران) دەڵێ: (تەئسیری دەبەخشییە سەر ئەدەبی کوردی).

لە دوای ساڵانی سییەوە مامۆستا (گۆران) هەر چەند بەهۆی زانینی زمانی ئینگلیزی و ئاگاداری لە ئەدەبیاتی ئینگلیزی تا دەوروبەری ساڵی (٩٣٥) پەیڕەوی ڕێبازی (هونەر بۆ هونەر) دەکرد[١٠].

(١٠) بڕوانە: گۆڤاری بەیان، ژمارە (٢)ی شوباتی ساڵی ١٩٧١، دانیشتنێک لەگەڵ - گۆران -دا، نووسینی عەبدولڕەزاق بیمار ل ٣٠.

بەڵام ئەویش بەهێز و توانستێکی شیعری گەورەوە شان بەشانی (شێخ نووری) کەوتە هەنگاونان و تاقیکرنەوەی توانایی خۆی لە بزووتنەوەی شیعری تازەدا. بەهۆی تەختکردنی ڕێگای تازەبوونەوە و ڕێگە خۆش کردن بۆی، مامۆستا (گۆران) توانی بە بەخششە شیعرییەکانی خۆی و بەشدار بوون و قۆڵ هەڵماڵینی دڵسۆزانەی بۆ تازەبوونەوە، هێز و تەکان و گوژمێکی تازە بداتە بزووتنەوەکە و هەنگاوەکانی خێراتر کرد و خوێنی تازەی کرد بەدەمارەکانیدا، چونکە تا ئەو کاتەش تازەبوونەوەکە تەنیا هەوڵ و تەقەللا و کۆششی تاکەکەسی بوو، ئەگەرچی لە سەرەتاوە (عەبدولڕەحمان بەگی نفووس) و (ڕەشید نەجیب)یش هەریەکەیان بەپێی توانست و دەسەڵات لەو تازەبوونەوەیەدا بەشدارییان کرد. بەشداربوونەکەیان هەرچەندێک بێت نابێ لە لێکۆڵینەوەی ئەو قۆناغە شیعرییەدا دەوری هیچ کامێکیان فەرامۆش بکرێت.

ئەگەر وەک دەستپێشخەری مێژوویی سەیری تازەبوونەوەی شیعری کوردی بکەین (شێخ نووری) وەک پێشەوایەک خۆی دەسەپێنێ، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو دەستپێشخەری و موغامەرە کردن و شۆڕشەی لەسەر دەستی (شێخ نووری) بەرپا بوو، لە سەرەتاوە جۆرە ترسێکی پێوە دیارە، چونکە لەو کاتەی ئەو دەستی داوەتە ئەم پرۆسەیە خوێنەرانی ئەو سەردەمە وەک گوناحێک سەیری هەنگاوەکەیان کردووە، بەڵام لە دواییدا واتە دوای ئاشنایەتی پەیداکردن لەگەڵ بزووتنەوەکەدا و هاتنە پێشەوەی مامۆستا (گۆران) کە شیعرەکانی نوێنەری ڕاستەقینە و ڕەسەنی (تازەبوونەوە) بوون بەرە بەرە تازەبوونەوەکە بووە بە(دیاردە)یەکی ئاسایی. لە کاتێکدا لە سەرەتاوە کە شێخ نووری بەتەنیا لەگەڵ بزووتنەوەکە خەریک بوو هەلومەرجی لەبار و دەستگرۆییکردن و پشتگیریکردن زۆر کەم بوو. یان کەم کەس هەبوون انی خێر بەو بزووتنەوەیە دابنێن و ئافەرینی بکەن، چونکە بەهۆی گۆڕانی ئیقاعی ئەو تەرزە شیعرانەوە لەگەڵ ئیقاعی گوێچکەیان و ڕوانین و چێژیان جۆرە ساتمەیەک بوو، بۆیە سەیر نییە تانووتی لێ بدەن و ناو و ناتۆرەی خراپی بۆ بدۆزنەوە. سوور بوونی پێشەوای ئەم بزووتنەوەیە و پێداگرتنی لەسەر تازەبوونەوەکەی و سارد نەبوونەوە لێی، کارێکی وای کرد، وردە وردە خوێنەرانی لێ نزیک ببێتەوە، تەنانەت تا ماوەیەکی زۆریش خوێنەرانی ئەو سەردەمە شیعرەکانی مامۆستا (گۆران)یان بە(هەللور مەللور، تەکامە) بەراورد کردووە و بەگاڵتە و لاقرتێوە باسیان لێوە کردوون. وایانزانییوە هەموو کەس لە عۆدەیدا هەیە شیعری وەک ئەوانەی (گۆران) بنووسێ.

لە گەرمەی بەخشش و داهێنانی (گۆران) و هەنگاونان بەرەو چەسپاندن و پەرەپێدانی

ئەو بزووتنەوەیە، کۆمەڵێ شاعیری دی هاتنە مەیدانی نووسینی ئەو جۆرە شیعرە لەوانە مامۆستایان: (هەردی) و (دڵدار) و (دیلان) و (کامەران موکری) و (ع. ح. ب) و (کاکەی فەللاح) و (حەسیب قەرەداغی)، کە ئەوانە هەر خۆیان پێش ئەوەی شاعیر بن، خوێنەری وریا و زیرەکی ئەو شیعرە تازانە بوون و لە مەزنی و گەورەیی ئەو بزووتنەوەیە دەگەیشتن، ئینجا بەبەرهەمیش بەشدارییان تێدا کرد، تا وای لێهات ئەو تازەبوونەوەیەی لەسەر دەستی (شێخ نووری) بەرپا کراو بەتەنیا قورساییەکەی کەوتبووە سەر شان، لە سەردەمی مامۆستا (گۆران) بوو بە(دیاردە)یەک، پەیڕەوکەران و مورید و شەیدایانی زۆر بوون، لەو ماوەیەشدا ڕاو و بۆچوون و چێژی خوێنەرانیش بەرانبەر بەتازەبوونەوەکە تەواو فەرقی کرد و زیاتر پاڵپشتی لێدەکرا و لەسەری دەکرایەوە، ئەمانە هەمووی بوونە هۆی چەسپاندنی تازە بوونەوەکە، تا وای لێهات بەهۆی زۆربوونی دەنگی ئەوانەی دەنگی خۆیان دایە پاڵ تازەبوونەوەکە و نووسینی شیعر لەسەر پێودانی تازە لە لایەن شاعیرانەوە، توانی دابونەریتی شیعری تازە لە لای خوێنەران و لە ئەدەبی کوردیدا بڕێژن و ڕێبازەکەی پەیڕەویان دەکرد، ببێتە قوتابخانەیەکی خاوەن سیما و خاسیەتی شیعری خۆی، کە ئەمڕۆکە ئەو قوتابخانەیە لەگەڵ ناوی مامۆستا (گۆران) جووت بووە و لە زۆر نووسیندا ئەم کۆشش و تەقەللا هەرەوەزی و کۆمەکییە و نەشونوما کردن و پێگەیشتن و کامڵ بوونی ئەو قوتابخانەیە بەشێوەیەکی فراوان و هەمەلایەن پشتگوێ دەخرێ، کە ئینکار ناکرێ لەو هەوڵە کۆمەکییەدا مامۆستا (گۆران) دەورێکی باڵای لە پاڵ دەوری (شێخ نووری)دا هەبووە.

کە شێخ نووری پێشەوای تازەکردنەوەی شیعری کوردییە، ئەوە مانای وانییە ئەو پێشەوایەتییە لەسەر ئەو بنچینەیە دروست کرابێ، کە ببێتە کۆسپ و تەگەرە لەبەردەم داهێنان و ئیتر کەس نەیتوانیبێ و نەیوێرابێ ئەو تێپەڕێنێ. یان پێشەوایەتییەکەی داهێنانی کەس بسڕێتەوە، بەڵکو پێشەوایە لە دۆزینەوەی ئەو ڕێگایە و ڕێچکە بەستن بۆی. ئیتر باسی ئەوە ناکەم لەو ڕێگایەدا چەند پێچ و پەنا و کووچە و کۆڵان و جادەی تێدا دەدۆزرێتەوە، چونکە ڕێگای داهێنان، ڕێگایەکی بێ کۆتایی و بێ بڕانەوەیە، تا زیاتر بەدوایدا بگەڕێی و بەدوایدا بچی هێشتا هەر کەمە. ڕێگای داهێنان کوێرە ڕێگایەک نییە دەرچوونی نەبێت، ئەگەر داهێنان دەرگایەکی هەبێ داهێنەرێک بیکاتەوە، لەو دەرگایەوە دوو دەرگای دیکە دەدۆزێتەوە، کە داهێنەرێکی دیکە دێت یەکێک لەو دوو دەرگایە هەڵدەبژێرێ بیکاتەوە، چوار دەرگای دیکە دەبینێ و بەم جۆرە تا ئادەمیزاد خولیا

و ئاواتێکی مابێ جێبەجێ نەکرابێ و نەهاتبێتە دی لە داهێنان ناکەوێ، تا یەک شت مابێ لە پاشەڕۆژ و چارەنووسی خۆی نەیزانێ، لە پرسیارکردن و سۆراخ و گەڕان و موغامەرە کردن ناکەوێ و ناسرەوێ، بۆیە ئەگەر (شێخ نووری) دەرگایەکی بەسەر دنیای پەلکەزێڕینەیی تازەکرنەوەدا کردبێتەوە و دوو دەرگای لێوە بینیبێ، ئەوە مامۆستا (گۆران) وەک شاعیرێک کە چەسپێنەری ئەم بزووتنەوەیەیە ئەگەر لە یەکێک لەو دوو دەرگایەی (شێخ نووری) دۆزیویەتییەوە، ڕوانیبێتی بۆ دنیای شیعر، ئەوە چوار دەرگای دیکەی بەسەر شیعری تازەی کوردیاندا کردووەتەوە. ئێمەش لێرەدا تەنیا مەبەستمان ئەوەیە ڕچەشکێنی و دەرگا کردنەوەکە بۆ لای (شێخ نووری) ببەینەوە، چونکە دەستپێشخەری، تۆمارکردنێکی مێژووییە، بەڵام داهێنان خوێنی مێژوو و جووڵێنەری ئەو مێژووەیە. شێخ نووری ئاسۆیەکی تازەی لە بەردەمی شیعری کوردیدا کردەوە، کۆمەڵێ شاعیر بۆ ئەو ئاسۆیە کەوتنە ئەسپ تاودان، بێگومان جۆری ئەسپەکانی ئەو شاعیرانە سواری بووبوون لەگەڵ چۆنیەتی ڕاکردنیان بەرەو ئەو ئاسۆیە جیاوازە، هەیانە ئەسپەکەی خۆشڕۆ بووە، هەشیانە ئەسپەکەی سست ڕۆ بووە، ئەمەیان باسێکی سەربەخۆیە و بۆ جیاکردنەوەی ئەو دوو دەستە شاعیرە پێویستی بەلێکۆڵینەوەی تێروتەسەل و زانستی هەیە.

شاعیرێک لە دەلاقەی داهێنان و بەخششی خۆیەوە تەماشا دەکرێ و لە چوارچێوەی بارودۆخی مێژوویی خۆی باسی لێوە دەکرێت. ئەو دەستپێشخەرییە مێژووییەی لێ دەرکەی کە (شێخ نووری) کردوویەتی، دەنا هەریەکەیان زۆر و کەم خاوەنی پلە و پایەی شاعیریی خۆیانن. بەرهەمەکانیان باشترین وەرامی هەموو قسەیەکە. لێکۆڵینەوەی ورد و هێمنانە بۆ دەستنیشانکردنی پایەی هەریەکەیان ئامانجی سەرەکی نووسینی پاک و بێ مەبەست و زانستییە. تەنیا مەبەستی ئێمەش لەو نووسینەدا دەرخستنی لایەنە مێژووییەکەیە کە مامۆستا (گۆران) بەوپەڕی لە خۆبووردەیی و بێ فیزییەوە دەستی بۆ ڕاکێشاوە، پێویست ناکات چیتر تەمومژ بخرێتە سەر ڕووی ئەو حەقیقەتە کە (شێخ نووری شێخ ساڵح) یەکەمین شاعیری کوردە، بەردی بناغەی تازەبوونەوەی بۆ شیعری کوردی داناوە، ئەو ئەزموونەی شێخ نووری چەند گەورە و قووڵە یان چەند بچووک و تەنکە، ئەمەیان نابێ تێکەڵی ئەو مەنهەجەمان بکەین، چونکە بەراوردی نێوان میتۆدی ئەو دوو شاعیرە لە ڕوانگەی شیعرەکانیانەوە ئەم لایەنە ڕوون دەکاتەوە، ئەگەرچی بەپێی داوونەریتی بەراوردکاری ناکرێ دوو شاعیری میللەتێک بەراوردیان لە نێواندا بکرێ، بۆیە دەڵێم لە ڕوانگەی بەرهەمەکانیانەوە، چونکە مەوزووعیەت بەتەنیا قسە فڕێ دان

نییە، ئەوەندەی تیۆر و پراکتیکە، ئەوانەی ویستوویانە لە شاعیرایەتی (شێخ نووری) کەم بکەنەوە من لە لای خۆمەوە ئەو کەسانە بەنامەوزووعی دەزانم، چونکە بەرهەمێکی کەمی (شێخ نووری)یان لە بەردەستدا بووە و ئەو بەرهەمانەش کە زۆربەیان لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی سالانی (١٩٢٠) بەرەو ژوورتر بلاوکراونەتەوە، زۆر بەدەگمەن هەولیان داوە ئەو گۆڤار و ڕۆژنامانە بپشکنن و بەنموونەی شیعرەکانییەوە بێنە مەیدانی ڕەخنەگرتن و لێکۆلینەوەوە، زۆربەی ئەوانەش قسەکانی یەکتریان وتووەتەوە. ئەوانەی لەسەر ئەو قۆناغە دەنووسن، نابێ ئەوەش لە بیر بکەن کە (شێخ نووری) کارتێکردنی بەسەر مامۆستا (گۆران)یشەوە هەبووە، ئەوەتا خۆی دەلێ: (یان ئەو جۆرە شێوازەیان تیا کراوە بەسەرمەشق کە مامۆستا (م. نووری)و هاوڕێکانی لە ئەدیبە تازەکانی تورکی عوسمانییان وەرگرت و لە سەردەمێکی سنووردارا (١٩٢٠ - ١٩٣٠) شیعری کوردیی ناوچەی سلێمانییان پێ تازە کردەوە)[١١] ئەو سەرەتایەی شێخ نووری تۆماری کرد، هەرگیز لە بیر و یادی مێژوو ناسڕێتەوە، با زۆر کەسیش هەبن بیانەوێ ئەو حەقیقەتە بسڕنەوە.

ڕەنگە زۆر کەس هەبێ شیعری (شێخ نووری)یان بەدڵ نەبێ، بەلام دەبێ ئەوە بزانن کە شێخ نووری، گولێکە بۆنی لە گولەکانی پێش خۆی جیایە، کە لەو سەردەمەدا باخچەی شیعری کوردی زۆر پێویستی بەو جۆرە گولە هەبوو، بەوەی دەنگێکی جیاوازە لە دەنگی شاعیرانی پێش خۆی و پەنجەرەیەکی تازەی بەسەر شیعری کوردیدا کردەوە و ئاسۆیەکی تازەی لێ بەدی کرد. هەر چۆنێک بێت (شێخ نووری) لە دنیای شیعری کوردیدا دەستی دایە تاقیکردنەوەیەک، دەبێ سەری ڕێز و خۆشەویستی بۆ دانەوێنین. ئەگەر مامۆستا (گۆران) لە دوای سییەکانەوە هاتبێ ئەو ئەزموونەی درێژە پێدابێ و قوولی کردبێتەوە یان لە شێخ نووری شاعیرتر و هونەرمەندتر بێت و زیرەکانەتر ساتوسەوای لەگەڵ ئەو کێشەی تازەبوونەوەیە کردبێ، ئەوە هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێ و وەک ڕچەشکێنێک هیچ لە نرخی شێخ نووری کەم ناکاتەوە، بگرە دەتوانین بەهۆی زۆری داهێنەرەکانمان زیاتر مەسەلەی میللەتەکەی خۆمان دەولەمەندتر و فراوانتر بکەین، چونکە میللەتێ تا داهێنەری زۆرتر بێ، ئەوەندە زیاتر خاوەنی مەسەلەیە. میللەتی بێ داهێنان، میللەتێکی مردووە، گۆڕەپانەکەش ئەوەندە فراوانە کەس جێگەی کەس ناگرێ.

کە دەلێین (شێخ نووری) شاعیرێکمان بیر دەکەوێتەوە کە لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا

---

(١١) بەهەشت و یادگار - گۆران - چاپخانەی مەعاریف - بەغدا - ١٩٥٠ - ١٢٦٩ لەسەر ئەرکی عەلائەددین سەجادی لە چاپ دراوە سەرەتا ل ج.

نرخی کەم نییە، بەوەی پێوەندییەکی توندوتۆڵ و زیندووی بەقۆناغێکەوە هەیە، ئەگەر بەرهەمی بکەوێتە بەردەستان، ڕەنگە زۆر بڕیاری بەپەلەی نووسەران بگۆڕێ و ببێتە کەرەسەیەک تا پێوەری ڕاست و دروست شوێنی پێوەری هەڵە بگرێتەوە و ڕاستیان بکاتەوە. یان ببێتە هاندەرێک ڕووی گەش و ڕووناک و ڕاستەقینەی شێخ نووری دەربخات، بەبێ ئەوەی کەس بیکاتە پرد بۆ پەڕینەوەی بیروڕای وا کە لەگەڵ پایەی شاعیرێک نەگونجێ کە سیمای قوتابخانە و ڕێبازێکی تازەی لە شیعری کوردیدا دروست کردووە!

هەندێک لە نووسەران و ڕۆژنامەنووسان لەجیاتی ئەوەی بنووسن (قوتابخانەی شیعری نوێ) دەنووسن (قۆناغی گۆران) و مامۆستا (گۆران) بەسەرەتای نوێکردنەوەی شیعری کوردی و سەرۆکی ئەو قوتابخانەیە دادەنێن، بەمەش حەقیقەتێکی مێژوویی بەهەڵە دەنووسنەوە، ئەوانە پێ بزانن یان نەزانن مێژوویەکی نزیک دەشێوێنن. ئەم بڕیارەش تێنەگەیشتنە لە زاراوەی (قۆناغ) و (قوتابخانە)، چونکە (قۆناغێک) یان (قوتابخانەیەک) بەتەنیا یەک کەس دروستی ناکا. لە لایەکی دیکەوە پشتگوێ خستن و دوورکەوتنەوەیە لەو بڕیارەی مامۆستا (گۆران) کە بەوپەڕی ڕاستگۆیی و بێ فیزیی دان بەو ڕاستییە مێژووییەدا دەنێ و جێگیری دەکات و وابزانم بەکەسیش هەڵناوەشێتەوە. ئەوەتا خۆی دەڵێ: (نووسەر و شاعیرانی ئەوسا، بەتایبەتی شێخ نووری و ڕەشید نەجیب و من کە پێکەوە بەئەدەبی تورکی موتەئەسیر بووین و پێکەوە ئەمماننووسی، بەڵام تەنها شێخ نووری شیعرەکانی بڵاو ئەکردەوە و من بڵاوم نەئەکردەوە و ئەم لەم بارەیەوە نیشاطی دەردەکەوت، وە ئەدەبی تورکی قوتابخانەی شیعری تازەی تیا پەیدا بووبوو. کە پێیان ئەوترا (ئودەبای فەجری ئاتی) لەوانە (تۆفیق فیکرەت) و (جەلال ساهیر) بوون. وە ئەدیبێکی تری تورک کە (عەبدولڕەحمان خالید)ـە، ئەگەرچی لەم کۆمەڵە نەبوو بەڵام هەرپێی موتەئەسیر بووین. کەوابێ هەموومان بەیەکەوە ئەمان ڕوانییە یەک کڵاوڕۆژنە، بەڵام ئەتوانرێ بەشێخ نووری شێخ ساڵح بووترێ سەرۆک، بەهۆی:

**یەکەم:** زۆریی بەرهەمی.

**دووەم:** بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکەی کە بێگومان تەئسیری ئەبەخشیە سەر ئەدەبی کوردی.[12]

---

(١٢) بڕوانە گۆڤاری بەیان، ژمارە (٢)ی شوباتی ١٩٧١، دانیشتنێک لەگەڵ گۆراندا، نووسینی عەبدولڕەزاق بیمار.

مامۆستا (گۆران) خۆی ئەو مێژووەی دەستنیشان نەکردووە کە بەیەکەوە ڕوانیویانەتە یەک کلاوڕۆژنە و ئەوانەی لەسەر (شێخ نووری) و (گۆران)یشیان نووسیوە دیسان ئەمەیان ڕوون نەکردووەتەوە، واتە تەئسیرەکە لە پێش سالانی (سی) بووە یان لە پاش (سی)یەکانەوە بووە. یان کارتێکردنی ئەدەبی تورکی بەسەر مامۆستا (گۆران) لە سەرەتاوە یەکسەر لە ڕێگەی خوێندنەوەی ئەدەبی تورکییەوە بووە یان بەهۆی (شێخ نووری)یەوە بووە، چونکە مامۆستا (گۆران) لە سەرەتای (بەهەشت و یادگار)دا نووسیوبەتی: (یان ئەو جۆرە شێوازەیان تیا کراوە بەسەرمەشق کە مامۆستا (م. نووری) و هاوڕێکانی لە ئەدیبە تازەکانی تورکی عوسمانییان وەرگرت و لە سەردەمێکی سنووردارا (١٩٢٠ - ١٩٣٠) شیعری کوردی ناوچەی سلێمانییان پێ تازەکردەوە) لەم قسەیەدا ئەوە دەردەکەوێ کە لە سەرەتاوە تازەبوونەوەکەی بەهۆی (شێخ نووری)یەوە ناسیوە و لەو قۆناغەشدا لاسایی شێوازەکەی ئەوی کردووەتەوە، چونکە لەوکاتەدا هێشتا خۆی دەستی نەگەیشتووەتە سەرچاوەی ئەدەبی تازەی تورکی و لەو ماوەیەدا ئاسۆی ڕۆشنبیری و ئەدەبی لە بەردەمدا ئەوەندە فراوان نەبووە، تا سالانی (سی) و بەرەو ژوور لە ڕێگەی زمانی تورکی و فارسی ئاسۆیەکی فراوانتری لە بەردەمدا کرایەوە و لەسەر ئەزموونی شاعیرانی دەوروپشت وەستا و بەقوولی لێی وردبووەوە. ئەو دەڵێ:(م. نووری و هاوڕێکانی لە ئەدیبە تازەکانی تورکی عوسمانییان وەرگرت) واتە لەوکاتەی ئەوان وەریان گرتووە، ئەمی تێدا بەشدار نەبووە، ئەگەر نا دەبوایە بیوتایە (وەرمان گرت و ...)، جگە لە مامۆستا (ڕەفیق حیلمی) و (گۆران) کەسی دی باسی ئەوەی نەکردووە و ئیشارەتی بەوە نەداوە کە لەو سەرەتایەدا مامۆستا (گۆران) لە ژێر تەئسیری شێوازی (شێخ نووری)دا بووبێ. دوای سالانی سییەکانیش (شێخ نووری) لەو سوود وەرگرتن و بەرهەم بەخشینە دوور نەکەوتووەتەوە. مامۆستا (ڕەفیق حیلمی) لە پاش سالانی (سی)یەوە هیچ دەورێک لە تازە کردنەوەدا بەشێخ نووری ڕەوا نابینێ، لە کاتێکدا ئەو دوو شیعرەی لە کتێبەکەیدا (شیعر و ئەدەبیاتی کوردی) بەنموونەی شێوازی تازە دەیانخاتە ڕوو و باسیان لێوە دەکات، لە پاش سییەکانەوە نووسراون. کەواتە شێخ نووری لە دوای (سی)یەکانیش لە بەخشش و تازەبوونەوە بەردەوام بووە.

ئەگەر مامۆستا (گۆران) لەو قسەیەدا (بەیەکەوە ئەمانڕوانییە یەک کلاوڕۆژنە)، مەبەستی پێش سییەکان بێت، ئەوە دیسان دانی بەوەدا ناوە کە بەرهەمەکانی (شێخ نووری) (تەئسیری ئەبەخشییە سەر ئەدەبی کوردی) بەپێی ئەو تۆمارکردنە مێژووییە،

(شێخ نووری) شاعیرێکه له پێش مامۆستا (گۆران)ـەوە بنەمای ئەدەبیی ئەو سەردەمەی شڵەقاندووە، بەهۆی تەمەن گەورەیی بێ، یان هەر هۆیەکی دیکەوە، دەستی وەشاندووە و بەشداری هاوڕێ شاعیرەکانی دوای خۆشی کردووە. ئەم قسەیەشمان هیچ ڕێی لە گەورەیی شاعیرێکی وەک مامۆستا (گۆران) نەگرتووە، بەڵکو مامۆستا (گۆران)یش بمایە حەزی دەکرد ئەو ڕاستییە بەو جۆرە ببرێتەوە لای خاوەنەکەی. ئەگەر بڕوامان بەمەنتیقی پێشکەوتن بێ، دەبێ شاعیرانی دوای (شێخ نووری) و (گۆران) لاسایی ئەوان نەکەنەوە، پێویستە وەک چۆن مامۆستا (گۆران) چەند چینێکی خستە سەر تەلاری شیعری کوردی، ئەوانیش بەردەوام بن لە خستنەسەر و لەو خەرمانەی زیادکەن و پەرەی پێ بدەن، تا بتوانن بنەمای زیندوویێتی و ڕەسەنایەتی لەناو ئەدەبەکەمان بپارێزن. وەک چۆن هەموو ڕوانینێکی تازە بۆ ژیان پێویستی بەداهێنان و داهێنەری خۆی هەیە، بەو شێوەیەش زەمان و سەردەمی تازەش پێویستە داهێنان و داهێنەری خۆی هەبێ. مامۆستا (ڕەفیق حیلمی)یش هەر ڕای وایە کە دەڵێ: (بەم شیعرە تازانەدا ئەوە بەبیردا دێت کە دوور نییە هەندێک لە شاعیرە لاوەکانی ئیمڕۆ وەیا شاعیرانی تری دواڕۆژ بگەنە بەرزترین پلەی وێژەوانی)(١٣).

ئەوانەی بیانەوێ لەمەولا لەسەر قۆناغی ڕاپەڕیوی شیعری ئەو قۆناغە بنووسن، ئەگەر خۆیان لە مەوزووعیەت تەوەلا نەکەن دەبێ دان بەو ڕاستییەدا بنێن کە (شێخ نووری شێخ ساڵح) ڕچەشکێن و سەرکردەی ئینقلابی شیعری کوردیی ناوچەی سلێمانی بووە، لە چارەگی یەکەمی سەدەی بیستەم و سالانی بەرەو دوای. کە دەڵێین (شێخ نووری) سەرکردەی ئەو ئینقلابەیە، لە خۆمانەوە ئەو قسەیە ناکەین و بەگۆترەکاری و لە ڕووی عاتیفەیەکی ساویلکانەوە بڕیارەکە دروست نەبووە، ئەوەتا شاعیرێکی وەک (پیرەمێرد) کە لە ناو ئەدەبیاتی تورکیدا کولاوە و یەکێک بووە لەو شاعیرانەی تاموچێژی شیعری تازەیان کردووە، لە ڕێگای زانینی زمانی تورکی و ئاگادار بوون لە ئەدەبیاتەکەی و تەنانەت ژیان و گوزەران بەسەربردن لەو مەڵبەندەی بزووتنەوەکەی بەهۆیەوە بەرپا کراوە و شاعیرە نوێخوازەکانمان لە کارێزی ڕۆشنبیری ئەوییان خواردووەتەوە و لەگەڵ ئیقاعە تازەکەی گونجاوە بەم جۆرە وەرامی نامەیەکی شیعریی (شێخ نووری) داوەتەوە:

---

(١٣) گۆڤاری پێشکەوتن: ژمارە(١)ی سالی (١) شوباتی سالی ١٩٥٨، وتارێک بەناوی (ئینقیلاب لە شیعری کوردیدا)، ڕەفیق حیلمی.

شووکری خوا ئەکەم کە لە نووری کوژاوەوە
پرشنگی جوانی شیعر و ئەدەب کەوتە ناوەوە
(نووری)! بەنووری ئێوەوە زولمەت لادەچێ[١٤]
(یارەب)ی ! ئەم زیایە نەبێ قەت بە چاوەوە

شێخ نووری ئەرکەکانی وەک شاعیرێکی ئەو سەردەمە زۆر بووە، بۆیە لە پاڵ شاعیرایەتی، لێکۆڵینەوەی نووسیوەو بەکاروباری ڕۆژنامەنووسییەوە خەریک بووە، جگە لە وەرگێڕان و چالاکی کۆمەڵایەتی و سیاسی، واتە تەنیا بەهرە و توانایی خۆی لە بواری شیعردا تاقی نەکردووەتەوە و تەنیا بۆ شیعر نەژیاوە. ئەو قسەیەم پێنەکردنی ئەوە نییە کە بۆچی شێخ نووری بەرهەمی زۆرتر و پوختەتری نەداوە بەدەستەوە، چونکە موغامەرە کردنەکەی (شێخ نووری) لە مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا نرخێکی گەورەی هەیە، کە لە پاش ئەو مامۆستا (گۆران) زیاتر بەهرە و سەلیقەی شیعریی خۆی پێ بگەیەنێ یان ئەم بارودۆخێکی تایبەتی و گشتی زیاتری بۆ بڕەخسێ و لە (شێخ نووری) زیاتر بەرهەمی پوختەتر و هونەریی تر بدا بەدەستەوە، ئەمە شتێکی سەیر نییە، بەڵکو دەستوور و یاسای ژیانە و هەر دەبێ وابێ، نەک پێشڕەوایەتی شیعری کوردی لە شێخ نووری بسەنرێتەوە و وا لە خوێنەر بگەیەنرێ کە شێخ نووری شاعیرێکی ڕەسەن نەبووە و هەر خەریکی لاساییکردنەوە بووە و بەقوتابی و موریدی (قوتاغی گۆران)یشی ڕانەگرن، لە کاتێکدا هەردووکیان تەقەللادەری خۆشکردنی یەک زەمینە و ڕێگان.

لە ئەنجامی ئەو وردبوونەوەیەدا، دەگەینە ئەو سەرەنجامە کە شێخ نووری شێخ ساڵح بەپێی بیروڕای مامۆستا (گۆران) و (ڕەفیق حلیمی) و کەسانی ڕۆشنبیر و شاعیری دیکەی ئەو سەردەمە، تازەبوونەوەی شیعری کوردی لەسەر دەستی ئەو هاتە کایەوە. شیعری کوردی لەسەر دەستی (شێخ نووری)دا بەرەو هەوارێکی دی ڕێگەی مەبەستی گرتە بەر. لە پاش سالانی سییەکانیشەوە چەند شاعیرێکی دی کەوتنە هەنگاونان بۆ ئەوەی خوێنی زیاتر بدەنە ئەو بزووتنەوە تازەیەوە. ئەو شاعیرانەش هەریەکەیان بەجۆرێک و بەپێی شێوازی خۆی بەرەو پیری ئەو تازەبوونەوەیە چوون کە سەرەتاکەی (شێخ نووری) ڕایگەیاند و لە سەرەتاوە ئەو شاعیرانە بەکارتێکردنی هۆنراوەکانی ئەو شیعریان

---

(١٤) ڕۆژنامەی ژین، ژمارە (٦٢١)ی ساڵی (١٥)، (١٥)ی صفر ١٣٦٠هـ، جیاوازییەکی لەگەڵ ئەمەیان هەیە و هەر ئەمەشی داوەتە مامۆستا ڕەفیق حلیمی لە کتێبەکەیدا بلاوی کردووەتەوە.

دەنووسی، لە سەرووی ئەو شاعیرانەش مامۆستا (گۆران)، کە خاوەنی بەهرەیەکی گەورە بوو، توانی ڕوانینی خۆی بۆ مەسەلەی تازەبوونەوە قووڵ بکاتەوە. بەدەرکەوتنی ئەو لە دوای سییەکانەوە و پێگەیاندنی کەرەسەکانی دەربڕینی شیعری خۆی، هەوڵێکی زۆری دا بۆ جێگیر کردنی (ئەزموونی شیعری تازە)و بەرەو مەیین و پێگەیشتن پاڵی پێوەنا. هەر لەو کاتەشدا کە شیعری کوردی تازەمان خەریک بوو پێی دەگرت، چەند شاعیرێکی دیکەش لە ژێر تەئسیری ئەو کەشوهەوا شیعرییە تازەیەدا کە بەجووتە تا ئەو کاتە (شێخ نووری) و (گۆران) دروستیان کردبوو، کەوتنە کنە و تەقەللا و هاتنە مەیدانەوە. ئەوانیش شاعیری بەتوانا بوون و توانییان بەهرە و سەلیقەی شیعری خۆیان بسەلمێنن. بەسەرهەڵدانی ئەو دەستە شاعیرە و بەشداربوونیان لە کۆڕی تازەبوونەوەکە، زیاتر تازە بوونەوەکە وەک (دیاردە)یەک لە ناو شیعری کوردیدار ڕەگاژۆ بوو، ئەم ڕێبازە لەلایەن خوێنەرانەوە زیاتر لە جاران ئاوڕی لێ درایەوە و جەمهووری خۆی بۆ دروست بوو، لە کاتێکدا لە سەردەمی شێخ نووری ئەو جەمهوور و ڕەواجەی نەبوو. ئەو دەستە شاعیرە یەکەم جار بەتەئسیری شێوازی (شێخ نووری) و پاشان (گۆران) و لە دواییشدا بەسەرچاوە و چاووگەکانی تازەبوونەوەیان زانی و بینیان پێوە نا.

هەر لەو کاتەوە کە شێخ نووری سەرەتای شیعری تازەی کوردی دامەزراند، تا ئەو ڕۆژەی (تازەکردنەوە)کە بووە (دیاردە)، تاقمێک شاعیر کەوتنە خۆ پێگەیاندن و قووڵکردنی ئەزموونیان لەلا بووە خولیا. هەندێک لەو شاعیرانە توانییان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر خۆیان پێ بگەیەنن و ئەستێرەی بەهرەیان بدرەوشێتەوە و بجریوێنێ. هەندێکیشیان دەرفەتی خۆ پێگەیاندن و پێشکەوتنیان بۆ ساز نەبوو، ئیدی یان لە نیوەی ڕێگا وازیان هێنا، یان بەبەخششی خۆیان ڕازی بوون و نەیانتوانی لەوە زیاتر خۆیان تێپەڕێنن.

شێخ نووری شوێنی لەسەر نەخشەی تازەبوونەکە هەر چەندە بێت، ئەوەندەی بەسە کە خاوەنی چەند پارچە شیعرێکی زیندووە، مێژووی ئەدەبی کوردی بەچەلەنگییەوە لە لاپەڕەکانی خۆیدا تۆماری دەکات و دەینووسێتەوە، ئیدی ئێمە چ کارمان بەوەوە هەیە وەزیفە دەرفەتی داوە یان نەداوە شتی زیاتر و باشترمان بداتێ. ژیان بۆ هەریەکێک بەجۆرێک دەیگونجێنێ، زۆر جار داوا کردنی شتی گەورەتر و باشتر لە ئادەمیزاد، یان ڕەمڵ لێدان بۆ پاشەڕۆژی بەکارێکی ڕەوا نازانم، چونکە ژیانی تایبەتی شاعیرەکە موڵکی خۆیەتی و بەپێی قەناعەتی خۆی تەسەرووفی پێوە دەکات. شێخ نووری توانایی هەر

چەندێک بەسەر شیعردا شکابێ و هەر چۆنێ بووبێ، هەر ئەوەندەی بۆ ڕەخساوە کە پێشکەشمانی کردووە، ئێمەش لەسەر ئەو بەرهەمانەی لە بەردەستمانە ڕای خۆمان دروست دەکەین، ئەوەی ئێمەش مەبەستمانە مێژوو نەشێواندنە، کە ئەمە حەقیقەتێکە لە نرخی مامۆستا (گۆران) کەم ناکاتەوە، تەنانەت بەراوردکردنیش نییە لە نێوانیان. مامۆستا (گۆران) لە چاوپێکەوتنەکەیدا وەک دەربارەی (عەبدولڕەحمان بەگی نفووس) وتی: (بەڵام لە دواییدا وەستا و تطوری نەکرد) دەیتوانی ئەمەش بۆ شیخ نووری بڵێ، بەڵام مامۆستا (گۆران) لە نزیکەوە لە بەهرە و دەسەڵاتی شاعیریی (شێخ نووری) گەیشتووە بۆیە ئەمەی نەگوتووە!

جارێکی دی دێمەوە و پێ لەسەر ئەوە دادەگرم کە شێخ نووری لە ئەنجامی ورد بوونەوە و تێگەیشتن و دیراسەکردنەوە شیعری کوردی تازە کردووەتەوە. ئیشەکەی ئیشێکی هەڕەمەیی نەبووە ڕێکەوت پێی ناساندبێ، بە هۆشیاری و ڕووناکبیریی خۆی زەمینەی بۆ خۆش کردووە و خۆی لە سیمایەکانی شیعری تەقلیدی ڕاپسکاندووە و بەرەو بەکارهێنانی کێشی تازە و یەکێتی بابەت و قافیەی مەسنەوی و زمانی تازە و دەربڕینی هونەری (بەوێنە) پەلی هاوێشتووە و یەکەم ئەزموونی شیعری تازەی وەک بەردی بناغە بەناوی خۆیەوە لە لاپەڕەیەکی تازەی مێژووی ئەدەبەکەماندا نووسیوە. مامۆستا (گۆران)یش بەئایدیۆلۆژییەتی داهێنان و شیعرە نەمرەکانییەوە دەچێتە ڕیزی شاعیرە پێشکەوتنخواز و نەمرەکانەوە، ئەگەر ڕەخنەگری کارامە و هونەرمەند و داهێنەر هەبێت، ئەوە دەتوانێ پایەیەکی زۆر لەوە گەورەتری بۆ دابنێ و لە دنیای داهێناندا جێگەی بۆ بکاتەوە. پێویستی بەوە نییە لە شاعیرێک بدرێت و نرخی کەم بکرێتەوە تا دەوری ئەو لە گۆڕەپانەکە گەورەتر دیار بێ. هەمووومان دەزانین ڕۆژ نییە سەدان کەس سەر بەهەمان ئایدیای مامۆستا (گۆران) نەمرێ، بەڵام کەسیان لەبەرئەوەی داهێنەر نین، وەک ئەو ناویان لە کوولەکەی تەڕیشدا نامێنێ. هەندێک تەنیا لە دەلاقەی ئایدیۆلۆژییەوە دەڕواننە مامۆستا (گۆران)و هەر لەو ڕووەشەوە بەشاعیری دەزانن، ئەم جۆرە بینینەش -کە بینینی یەک چاوە- زیانی زۆر لە ئەدەب و بزووتنەوەی داهێنانمان دەدات. دەنگی نارەزاییش بەرانبەر بەوانە بەرز دەکەمەوە کە دەیانەوێ هۆیەک بدۆزنەوە -بچووکیش بێت- تا لە نرخی مامۆستا (گۆران) کەم بکەنەوە، چونکە لە لایەک ئەوانە ئاسنی سارد دەکوتن و لە لایەکی تریشەوە خۆیان شەرمەزاری مێژوو و پاشەڕۆژ دەکەن. بەهیچ شێوەیەکیش لەگەڵ ئەوەدا نیم (شێخ نووری) بکرێتە دار دەستێ بۆ لێدان و کەم کردنەوەی نرخی مامۆستا

(گۆران)، چونکە هەردووکیان دوو شاعیرن و هەریەکەیان کەسایەتی خۆیان هەیەو هیچیان پێویستییان بەو جۆرە شێواز و ڕێگایانە نییە و کەسیان نایانەوێ لەسەر خوانی شاعیرایەتی ئەوەکەی دیکەیان بخوات.

گرنگترین شت بەلای منەوە ئەوەیە ڕەخنەگر و لێتوێژەرەوە دڵپاک و نییەت پاک بێت، ناپاکی لەگەڵ (مێژوو) و (حەقیقەت) و ویژدانی خۆی نەکات و هەر شتەی لە خانەی خۆی دابنێ و مافی خۆی بداتێ، ئەوساکە گرنگ نییە، خەڵک چۆن باسی دەکەن و چۆنی لێ دەڵێن و پاداشتی بەچی دەدەنەوە. وا جارێ مەوزووعیەت ئەوەی لێ داوا کردم بڵێم: هەر شاعیرە کە لە قۆناغی لاساییکردنەوە دەردەچێ و دەبێتە خاوەنی کەسێتی و شێوازی خۆی، دەبێتە خاوەنی (قوتابخانە)یەک، ڕەنگە لە قۆناغی سەرەتای شیعر وتنی زۆر شاعیراندا دوای ئەو قوتابخانەیە بکەون و بۆ ماوەیەک لاسایی شێوازی ئەو شاعیرە بکەنەوە، بەڵام ئەوە تا سەر نییە و هەر ئەوەندە شاعیرەکە دەنگی خۆی دۆزییەوە و کەسێتی شیعریی خۆی دروست کرد، ئیتر ئەو شاعیرە بەوە قایل نابێ ببێتە قوتابی لە هیچ قوتابخانەیەکدا، چونکە ئەو کاتە دەیەوێ بەدەمی خۆی هاوار بکات، نەک بەدەمی کەسێکی دی، بەلێوی خۆی زەردەخەنە بیگرێ و بەچاوی خۆی فرمێسک هەڵڕێژێ و بەبرینی خۆی ئازار بچێژێ، بۆیە (شێخ نووری) و (گۆران) دوو قوتابخانەن، واتە دوو کەسێتی شیعریی جیاوازن، دوو دەنگن لە کەسێتی و دەنگ و ڕەنگیاندا هەندێ شتی هاوبەش هەیە، بەڵام ئەو شتە هاوبەشانە تۆزقاڵێ کەسێتی هیچ کامێکیان ناسڕێتەوە. هەر ئەو (شتە هاوبەشانە) کە هەریەکەیان بەشێوە و ڕێوڕەسم و شێوازی خۆیان وتوویانە سیمای قوتابخانەی شیعری تازە دروست دەکەن، بەبێ ئەوەی دەوری شاعیرانی دیکەش لە دروستکردنی ئەو سیمایانە فەرامۆش بکەین. هەر ڕایەکی پێچەوانەی ئەو ڕایە بدرێت، تێنەگەیشتنە لە چەمکی (قوتابخانە).

دەیڵێمەوە مەسەلەی ڕچەشکاندن، پێوەندی بەدەستپێشخەری و تۆمارکردنە مێژووییەکەوە هەیە و دوورە لە مەسەلەی بەراوردکردن. ئەمەشیان مەوزووعیەت ناچارم دەکات شتێ نەڵێم پێچەوانەی ڕایەکەی مامۆستا (گۆران) بێت، لەوەی کە (شێخ نووری) بەڕچەشکێن یان باشتر وایە بڵێم: بە(سەرۆک)ی ناو دەبات، هەر ڕایەکی پێچەوانەی ئەو ڕایە بنووسرێت، خۆ بەدوور گرتنە لە حەقیقەتێکی مێژوویی ئاشکرا و ڕوون!

# شێخ نووری نوێخواز و سەردەمەکەی

لە چارەکی یەکەمی ئەم سەدەیەدا، کوردستانی خۆمان وەک سەرتاپای عیراق لەبەر زەبری چەوسانەوە و ژێردەستەیی دەینالاند. بەهۆی هەڵوەشانەوە و لێک داپچڕانی ئەندامەکانی لەشی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و لە پاش شکان و سەرنەکەوتنی خۆیان و هاوپەیمانەکانیان لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا (١٩١٤- ١٩١٨) و سەرکەوتنی بەرەی ئینگلیز و سوێندخۆرانی، ئینگلیزەکان لەشکریان کردە سەر عیراق و بەناوی ڕزگارکردن و سەربەخۆییەوە بەهەموو فرتوفێڵێکەوە توانییان لە ساڵی (١٩١٧)ەوە عیراق بخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە؛ بەڵام ئەوەندەی پێ نەچوو هێزەکانی ئینگلیز لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستاندا لەسەر دەستی هێرشی مەردانەی میللەتی کورد تێک شکێنران و بەتوندی بەرپەرچ درانەوە و تێیان گەیەنرا کە میللەتی کورد لە جەوهەر و نیازی گلاویان گەیشتووە و ئەوەشی بۆ دووپاتکردنەوە کە بەهیچ شێوەیەک حەز بەژێردەستەیی ناکەن. ئەم لە ڕوو هەڵگەڕانەوەیەش لەلاپەڕە پڕشنگدارەکانی مێژووی هاوچەرخی گەلی کوردماندا نووسرا، کە یەکەمین ڕاپەڕینی چەکداری میللی بوو بەرووی داگیرکەرانی ئینگلیزدا، چونکە یەکەم میللەتی ئازادیخواز بوو، تەفرەدان لەگەڵی دادی نەدا و یەکەم میللەتی جەسوور بوو لەم ڕۆژهەڵاتی نزیکەدا بانگی بەرگری چەکدارییان دژ بەئینگلیزەکان ڕاهێشت و تەقەیان لە هێزەکانی کردو سەلماندیان کە دەکرێ لەگەڵ بەهێزترین دەوڵەتی ئیمپریالیستی داگیرکەر شەڕ بکرێ. میللەتی کورد ویستی وەک هەموو گەلانی دنیا ڕاپەڕێ و داوای مافی چارەنووسی خۆی بکات، لەو کاتەشدا خەباتی میللەتانی ژێردەستە لە زۆر شوێنی دیکەی ئەو جیهانە پان و پۆڕە لە ئارادا بوو، کە بەتەئسیری شۆڕشە مەزنەکانی جیهان کەوتبوونە کارکردن، لەسەرووی ئەوانەشەوە شۆڕشی ئۆکتۆبەر بوو. موونەوەرانی ئەو سەردەمەش بەهۆی بڵاوکردنەوەی (بیری نوێ) لە کوردستاندا ڕۆڵێکی چاکیان گێڕا، لە جۆشدانی خەبات و جووڵاندنی زیاتری هەستی نەتەوایەتی لە لایان.

گومان لەوەشدا نییە پاشماوەی پیاوەکانی دامودەزگای پێشوو، کە هەڵوێستی سەیر کردن هەڵدەبژێرن، هەلپەرستان و کۆنەپەرستانی ناوخۆ یارمەتی ئەو هێزەیان دەدا و حەزیان دەکرد جێ پێی خۆیان زیاتر بکەنەوە و بەرژەوەندی خۆیان بپارێزن، یان دەسکەوتی تازەیان ببێ، بەڵام ئەوانە نەیانتوانی لە ژێر زەبری ئەو شاڵاوە توند و بەهێزە خۆیان

ڕابگرن، کە زۆربەی جەماوەری گەلەکەمانی تێدا بەشدار بوو.

لە ڕاستیدا سەرەتای دەستپێکردنی ڕاپەرینە جەماوەرییەکانی (شێخ مەحموود)ی پێشەوا لە سلێمانی و لە پارچەکانی دیکەی کوردستان لە پێشەوە بۆ مافی چارەنووس بوو، بۆ نەهێشتنی چەوسانەوەی نەتەوایەتی بوو، هۆی سەرەکی داگیرساندنی ئەو ئاگرە و هەڵسانی گەلی کوردمان لەبەر ئەوە بوو، بەدرێژایی چەند سەدەیەک لە ژێر باری چەوساندنەوەو پاڵەپەستۆی سیاسی دەیناڵاند، بۆیە دەیویست لەو بارەدا نەمێنێتەوە، ڕۆڵەکانی ئەم گەلە دلێرە کاتی ئەوەیان هاتبوو تێبگەن، مردن لە پێناوی سەربەستی و سەربەخۆیی، سەد جار لە ژیانی کۆیلایەتی و ژێردەستەیی باشتر بێ لە لایان. لەلایەکی دیکەشەوە وەک هەموو لایەکمان دەزانین کوردستان ناوچەیەکی کشتوکاڵییە و خاکەکەی بەپیت و فەڕە، جگە لەوەی دەسکەوت و خێر و بێری سروشتی دیکەی زۆرە، داگیرکەرانی تازە چاوی تێببڕن و مرغی خۆیانی لێ خۆش بکەن، دەست بەسەر بەرهەم و ڕەنجیان دابگرن و بەروبوومە کشتوکاڵییەکانی لە پیشەسازی تازەدا وەک کەرەسەی خاو بەکاربهێنن و لە بازاڕدا بەنرخێکی گران پێیانی بفرۆشنەوە، کە ئەمەش جەوهەری ئیمپریالیزمی نوێیە. ئابووری کوردستانیش لە حاڵی حازردا کە بەشێکی ئابووری عیراق پێکدەهێنێ جارێکی دی لەسەر دەستی داگیرکەرانی تازە کەوتە هەڕەشە لێکردن و مەترسییەوە. کۆمەڵانی خەڵکیش زوو بەو مەترسییەیان زانی کە ئەم کارە درێژە بەژێردەستەیی و ئیستیغلال کردنیان دەدات، بۆیە بەشی هەرە زۆری میللەت، بەهەموو توێژ و چین و بەرەکانییەوە دژی ئینگلیز کەوتنە ڕاپەڕین.

ڕاپەڕینەکانی شێخ مەحموودی حەفید کاردانەوەیەک بوون، پاڵەپەستۆی سیاسی و چەوسانەوەی نەتەوایەتی دروستی کردبوون. سەرکوتکردنی سەربەستی ئەو تەقینەوەیەی بەرپا کرد، کە ڕۆڵە ئازادیخوازەکانی کورد داوای مافی چارەنووسی خۆیان دەکرد، دەیانویست لە ناو شاری سلێمانیدا سەرکردە و ڕیش سپی خۆیان بەخۆیان هەڵیانبژێرن- لەبەر گەلێک هۆی مێژوویی کە لێرەدا جێگای باسکردنیان نابێتەوە- ڕۆڵەکانی ئەو شارە پێش شوێنی دیکە کەوتن و زووتر هەستیان بەو لایەنە کرد. ئەو هەستەش زیاتر لە ناو موونەوەر و ڕووناکبیرەکان ڕوونتر خۆی نواند، چونکە زۆربەیان بەهۆی زانینی زمانی تورکی، سوودێکی باشیان لە بزووتنەوە و شۆڕشی گەلان وەرگرتبوو. بێگومان خەباتکردنیش بۆ سەربەستی و سەربەخۆیی لە ژێر چنگی داگیرکەر - بێجگە لە خەباتی چەکداری - شێوەی زۆرە، لەبەرئەوە ئەو موونەوەرانە بەهۆی ئاگاداری خۆیان لە خەباتی

گەلان، کارێکی زۆری کردە سەر هەستی نەتەوایەتی و نیشتمانییان تا وای لێهات ئەوانیش زوو بەچەکی خەباتی خۆیان هاتنە مەیدان و هەوڵیان دا زیاتر کار بکەنە سەر هەست و نەستی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان و ورووژاندنی هەستیان بەرانبەر بەچەوسانەوە و خەبات کردن لە دژیدا. لەلایەکی دیکەشەوە هەوڵیان دەدا بۆ هەڵتەکاندنی بنەما سیاسییە کۆنەکان لەلایان و سڕینەوەی پاشماوەکەی لە مێشکی جەماوەردا.

لەو کاتانەدا کە بارودۆخی گونجاو بۆ ڕووخاندن و هەڵتەکاندنی بنەمای سیاسی و کۆمەڵایەتی دەڕەخسێ، ڕۆشنبیری شۆڕش دروست دەبێ، کە ئەوانیش دەبنە دەستێک بۆ ئەو هەڵتەکان و بوومەلەرزەیە کە واقیع لە ڕەگوڕیشەوە دەگۆڕێ و بەڕوانینێکی تازەوە دێنە کۆڕی ژیان و تێی دەڕوانن. کەواتە پێویستە ڕۆشنبیری شۆڕش خاوەنی ئەو ڕوانینە تازەیە بێت بۆ ژیان، ئەو ژیانە تازەیەی شۆڕشە تازەکە دەیهێنێتە دی. کە شۆڕشێک دەست پێ دەکا، ڕۆشنبیری خۆشی دەخولقێنێ تا ئەو ڕۆشنبیر و داهێنەرانە بتوانن لە پاڵ شۆڕشە بەدی هاتووەکە نوقلانەی شۆڕشی بەدی نەهاتووش لێ بدەن، کە ژیانێکی خۆشتر و شەنگتر و دادپەروەرانەتر بۆ ئادەمیزاد دەهێنێتە دی. داهێنەر و ڕۆشنبیری پێشڕەو تەنیا لەسەر شۆڕشی بەدیهاتوو ناگیرسێتەوە، ئەوەندەی هەوڵ دەدات ئەرکی شۆڕشگێڕانەی بەردەوامی خۆی بەجێ بهێنێ، بۆ هێنانە دی ئاواتە بێ سەروبنەکانی مرۆڤ. بەم شێوەیە ڕۆشنبیری شۆڕش دەتوانێ هەموو بارێکی دواکەوتوو تێپەڕێنێ و کاتێکی تازە دروست بکات کە کاتی (شۆڕش)ـە و ئیقاعی ئەوکاتە تازەیە لە بەرهەمەکانیدا بەرجەستە دەکات.

ڕۆشنبیریی تازەش لەسەر دوو کۆڵەگە قاچی خۆی قایم کرد کە ڕۆشنبیریی (شۆڕشگێڕایەتی) و (ئیلتیزام)ـە، بۆیە لەو سەردەمەدا تێکەڵی ترپە و لێدانی دڵی شۆڕشی سیاسی و کۆمەلایەتی و ڕاپەڕینەکانی گەلی کورد بوون. کە دەڵێم (ئیلتیزام) ئەم وشەیە ئەوە ناگەیەنێ، وەک زۆر کەس تێی گەیشتوون، بەرگێک، پۆشاکێک بێت و بکرێتە بەر کە لەگەڵ سروشتی داهێنان و خولقاندندا نەگونجێ. ڕۆشنبیری ڕەسەن ئیلتیزام بەمەسەلەیەک نازانێ وەک ئەوەی کەسێک بێت کۆمپالەیەک بەرانبەر خەڵک لەگەڵ کەسێک یان چەند کەسانێکی دی پڕ بکاتەوە، بەڵکو ڕۆشنبیری شۆڕش لە ناو شۆڕشەکەدا هەڵوێستی کۆمەلایەتی خۆی قووڵ دەکاتەوە و ئەو هەڵوێستە هەر بەو قووڵییە لە بەروبوومیدا ڕەنگ دەداتەوە و ئاوەژوو دەبێتەوە. ئەوساکە مەسەلەکە نابێتە خۆ بەستنەوەیەک هەر کاتێ بیەوێ لێی دوورکەوێتەوە، بەڵکو دەبێتە بەشێک لە خود و زاتی

خۆی. نابێتە شتێک، لە دەرەوەی ئەو خودە خۆی ببینێ. ئەو جۆرە ڕۆشنبیرانەش کە (مەسەلە)ی نەتەوەکەیان دەکەن بەخۆیان و خودی خۆیان، ڕۆشنبیری مولزەم نین، چونکە هەڵوێستی کۆمەڵایەتی ئیلزام نییە، لەبەر هیچ نا لەبەرئەوەی مرۆڤ خۆی لە خۆیدا «هەڵوێستە». هەر لەو تێگەیشتنەوە ڕۆشنبیری ڕەسەنی شۆڕش دروست دەبێ و ئەو هەڵوێستی ئیلتیزامە بەقووڵی لە بەرهەمەکانیدا ڕەنگ دەداتەوە.

شێخ نووری شێخ سالح-یش وەک شاعیر و ڕۆشنبیری شۆڕش لەو سەردەمەدا مەسەلەی کورد بووەتە بەشێکی زیندوو لە خودی و تا دوا هەناسەی ژیانی دەستبەرداری نەبووە و لێی جیا نەبووەتەوە. ئەگەر لەلایەنی شۆڕشگێڕایەتیشەوە مەسەلەکە بگرین، کە دەڵێین ڕۆشنبیری شۆڕشگێڕ بەو مەبەست و واتایە نایڵێین کە ڕۆشنبیرەکە چووبێتە کۆڕی خەباتی چەکدارانە و بەو ئەزموونەدا تێپەڕیبێ، بەڵکو شۆڕشگێڕایەتی شاعیر ئەوەیە کە تۆوی ڕەتکردنەوە و یاخیبوونی لە گیانی خۆیدا هەڵگرتبێ، بۆ ئەوەی خۆی لە کارتێکردنە سەلبییەکانی ڕابردوو سەرفراز بکات و لە تەعبیر و ڕوانینی کۆن خۆی ڕاپسکێنێ، تێڕوانینی تازە جێگەی کۆنەکە بگرێتەوە و لە ژیانە تازەکەدا ڕێی خۆی ببینێ و بە کەرەسەی تازەوە بەپیرییەوە بچێت.

شێخ نووری سەرەڕای ئەوەی شاعیرێکی خاوەن بەهرەیە، شاعیرێکی ڕۆشنبیر و هۆشیاریشە بەچەکی ڕۆشنبیری لەگەڵ ئەو گۆڕان و ڕاپەڕینانە بووە، ئەگەرچی لە لای زۆر کەس ئەو چەکە بەکاریگەر و بڕندە ناژمێررێ، بەڵام چەکێکە لە ناوەوەڕا مرۆڤ دروست دەکات، ئەنجامی ئەو جۆرە خەباتەش ڕاستەوخۆ نییە، وادیارە ئەنجامی ئەو خەباتەی شێخ نووری بەڕاستەوخۆیی کەمێکی دەستگیر بووبێ، بۆیە دووجار بەگرتن و بەندیخانە باجی خۆی داوە.

شێخ نووری هەستی بەگرنگی هەڵگرتنی چەکی هۆشیاری کردووە، بۆ ئەوەی لە پاڵ بەهرەی داهێنانی خۆی زیاتر هەست بەپێویستی کۆت شکاندنی شیعری ئەو سەردەمە بکات، هەستیشی کردووە پێویستی بەدەرباز بوونە لە ترسی دەربڕین و دوودڵی و سانسۆر، ئنجا کەوتووەتە تەقەللا و کۆشش بۆ ئەوەی لە دنیای شیعردا خۆی ڕزگار بکات، لە واقیعێک بەهەموو نووچدان و پاشکەوتوویی و چەوسانەوەیەکی، بەرەو واقیعێکی پێشکەوتووتر کە ئینسانیەتی خۆی زیاتر تێدا مسۆگەر بکات.

شێخ نووری وەک شاعیرێکی ڕچەشکێن، نرخی (سەربەستی) زانیوە و ڕۆشنبیرێکی پێشڕەوی ئەو شۆڕشەیە، سەربەستی ئەو لە لای شتێکی کەم نرخ و بێ بایەخ نییە، بەڵکو

هۆیەکە بۆ دەرخستن و سەلماندنی ئینسانیەتی خۆی، کە لە پەرژین و کۆتەکانی زات رزگاری دەکات، چونکە نارازییە لەو واقیعەی تێیدا دەژیت، واقیع دەخاتە قەفەسی تاوانباری و پەنا دەباتە بەر واقیعی ئەو خەونانەی جارێ بەدی نەهاتوون و خەلکی بۆ هان دەدات بەدی بهێنن. ئەم راپەرینە شیعرییەی شێخ نووری لە شیعری کوردیدا بەرپای کرد، هەلسانەوەی میللەتی کوردە لە سەردەمێکدا کە خەریک بوو بارە سیاسییەکەی دەبووژایەوە، تەکانە شیعرییەکەی شێخ نووری لەگەل چەسپاندنی بنەمای سیاسی و کۆمەلایەتی و فیکری تازەی ئەو سەردەمە هاتە گۆرێ. وەک چۆن حەزرەتی (نالی)ی بووە هۆیەکی ئیعلامی گەورەی سەردەمی بابانەکان و نوێنەرایەتی لایەنە رۆشنبیرییەکەی کرد، شێخ نووری-ش ویستی بەداهێنان و روانینی تازەوە ئەو بارە تازەیە رابگەیەنێ، بۆ ئەوەی بەهۆی داهێنان و تازەبوونەوەکەی (مەسەلە)ی میللەتەکەی گەورە بکات، چونکە لەوە گەیشتبوو کە میللەتێک ئەوەندە بوونی هەیە ئەگەر داهێنان و تازەبوونەوەی هەبێ، بۆیە هات و ئەو واقیعە تازەیەی بەتێگەیشتنێکی قوولەوە چۆراندە ناو ئەو تەقینەوەیەوە کە سەرەتای شیعری تازەی لێوە دەست پێکرد، تێگەیشتن لەو لایەنانەی دەبنە هۆی تەقینەوە و گۆران بەرپاکردن لە جیهانی دەرەوەدا، دەبێتە هۆی پێگەیاندنی تەقینەوەکانی جیهانی ناوەوەو بەم جۆرە وشە لە ناو شیعردا دەبێتە (کردەوە) و (هەلوێست) بۆ گۆرین و یارمەتی گۆرانیش دەدات.

لێتوێژەرەوە ناتوانێ بەهیچ شێوەیەک شێخ نووری لەو سەردەمە دابېرێ کە تێیدا ژیاوە، چونکە شایەتێکی راستگۆی رووداوەکانیەتی. وەنەبێ شێخ نووری بەتەنیا وەک شایەتێک بەسەر رووداوەکان وەستابێ و بەس، بەلکو خەمخۆری گەلەکەی بووە و بەهەموو هەولێک دەیویست لە گۆرینی واقیع بەشدار بێت و بەهۆشێکی کراوە و زەینێکی تیژەوە لەگەل رووداوەکان دەژیا. کە دەلێم (شێخ نووری) شاعیرێکی شۆرشگێرە، مەبەست ئەوەیە بە(وشە) بارێکی باشتر دەخولقێنێ، لە هەموو شۆرشێکدا وشەی «رۆشنبیری پێشرەو» بەرانبەر بەو خەباتە دەوەستێ کە تێکۆشەرێک لە کۆری خەباتدا دەیدا بەدەستەوە. شێخ نووری وەک پاشکۆیەک یان کەسێکی زەلیل و تەمبەل دوای رووداوەکان و بارودۆخەکە نەکەوتووە، بەلکو زۆر هۆشیارانە لەگەل رووداوە سیاسییەکانی سەردەمی خۆی خرۆشاوەو تێیدا قوول بووەتەوە و شان بەشانی رۆیشتووە، هەولێکی بێ وچانیشی داوە بۆ ئەوەی رێرەوی رووداوەکان بگۆرێ، بەشیعر و کەرەسە تازەکەیەوە ئەوەندەی لە وزە و توانایيدا هەبووە هەولی داوە، بەهۆی هەلسووراندنی کاروباری

ڕۆژنامەوە، کۆمەڵێ وتاری نووسیوە کە لەگەڵ گەرموگوڕی و خێرایی ڕووداوەکە بێت و ڕاستەوخۆ بیروڕای خۆی لە بارەیانەوە دەربڕیوە، ئەمەش هەوڵێکی دڵسۆزانەی شاعیرێکە کە بەتەواوی لە سەردەمی خۆیدا لە دەوری خۆی گەیشتبێ بۆ دەرخستنی ڕووداوەکان و ڕوونکردنەوەیان و نەبوونیان بەژێرەوە، کە ئەو ڕووداوانەش بەشێکی گرنگ و زیندوون لە مێژووی تازەماندا. لە ناو سەرجەمی ئەو ڕووداوانەشدا کە لەو سەردەمەدا ڕوویان داوە زانیویەتی کامەیان بۆ شیعر مالی و دەستەمۆ دەکات، بەتێگەیشتنێکی قووڵ و لێکدانەوەیەکی هەمەلایەن ساتوسەوای لەگەڵ ڕووداوەکان کردووە و لە ڕاگەیاندنی سەرپێیی خۆی بەدوور گرتووە کە شێوەی هەواڵێکی ڕۆژنامەیی وەرنەگرێ و هەندێ لایەنی هونەریی لەکیس نەدات.

کە خوێنی ڕاپەڕین زیاتر لە لەشی میللەتدا کەوتە جموجووڵ، هەندەی پێنەچوو خوێنی ڕاپەڕین و بزووتن لە لەشی شیعری کوردیشدا گەڕاو کەوتە جووڵە و تەکان، دڵی شیعری کوردی لە جارانی خێراتر کەوتە لێدان و لەسەر دەستی (شێخ نووری) زیاتر لە پێشان گوێمان لە ترپەی لێدانی دڵی بوو، دوای ئەوەی ئەو دڵە ماوەیەک بوو بەسستی لێی دەداو لەسەر یەک شێوە و ڕێباز دەقی گرتبوو. ئەو لەشە سڕ و تەزیوە لەسەر دەستی (شێخ نووری) کەوتەوە جووڵە، چونکی شێخ نووری بەتیۆر و پراکتیک بۆی چووە مەیدان و جاڕی بۆ دا، ئەوەشی بەگوێدا چرپاندین کە شیعری کوردی پێویستی بەجووڵاندن و شڵەقاندنە، تا بتوانێ لەگەڵ هەنگاوەکانی سەردەم و گۆڕانەکانیدا هەنگاو هەڵبگرێ. ئەم بارودۆخە تازەیەی لە سەرەتای ئەو سەدەیەدا دروست بوو یەکێکە لە هۆبە سەرەکییەکانی تەقاندنەوەی بەهرەی شاعیرایەتی (شێخ نووری)و بەیەکەم شیعری تازە، ڕاپەڕینی شیعریی خۆی ڕاگەیاند، چونکە زانی ئەم ڕاگەیاندنە پڕ بەپێستی واقیع و سەردەمەکەیە و کۆمەڵێ پێداویستی مێژوویی و نەتەوەیی و شارستانیی ڕەپێشی کردووە، گوێی بەوە نەدا ئەو بزووتنەوەیە پاڵپشتی دەکرێ یان نە.... بێ سێ و دوو لێکردن و دوودڵی ڕێبەرایەتی کرد و ساختمانی تازەی شیعری کوردی هەڵچنی، لە دواییشدا بەکۆمەڵێ وتاری ڕەخنەیی هەوڵی دا بیروڕای خۆی بچەسپێنێ. لەوەدا بۆمان ئاشکرا دەبێت کە شێخ نووری لە ناو گەرمەی ڕاپەڕینەکانی ئەو سەردەمە و لە باوەشی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازانەی میللەتی کورددا چاوی هەڵێناوە و چەپ و ڕاستی خۆی ناسیوە، کە دەستیشی دایە تازەکردنەوەی شیعری کوردی، تەوژمی بیری نەتەوایەتی زیاتر چاوی کردبووەوە.

لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا بزووتنەوەی نەتەوایەتی لە نێو گرووپی ڕۆشنبیرانی کوردا لە

برەودا بوو، ئەم بزووتنەوەیە شان بەشانی هەستی نەتەوایەتی ئەو گەلانەی کە تورک نەبوون دەستی کرد بەنەشونوما، بەتایبەتیش دوای ڕاگەیاندنی (مەشروتییەت) لە ساڵی (١٩٠٨) پریشکی بەتینی شۆڕشی گەورەی فەرەنسا (١٧٨٩) و بڵاوکردنەوەی بیروڕای پرشنگداری برایەتی، ئازادی، یەکێتی، یەکسانی، ئاگری لە تەخت و تاراجی ڕزیوی دەوڵەتی عوسمانلی بەردا، چاو و مێشکی ڕۆشنبیران و گەلانی ژێردەستی عوسمانلی ڕووناک کردەوە و بەئاگای هێنان، بۆیە گەلانی عوسمانلی بۆ خەباتکردن هاتنە کۆڕی تێکۆشان و ڕووبەڕووبوونەوەی پیاوە نەخۆشەکە، کە سەری لە گوێ قەبر دەلەرزی، بۆ یەکەم جار دژی سوڵتان و دامودەزگایەکانی شۆڕشی (مەشروتییەت) لە ساڵی (١٩٠٨)دا بەرپا بوو. بەم شۆڕشە سوڵتان عەبدولحەمید بەناچاری مل بۆ هێزی گەلانی عوسمانی و داخوازییە ڕەواکانیان شۆڕ دەکات. کۆمەڵی (ئیتیحاد و تەرەقی) سەرکردەی ئەم ڕاپەڕینە بوو. گەلانی ژێردەستەی دەوڵەتی عوسمانلی هیوا و ئومێدێکی گەورە و بەهێزیان بەم ڕاپەڕینە هەبوو، بەڵام بەداخەوە ئاواتی ئەو گەلانە هەر لە یەکەم ڕۆژەوە نەهاتە دی، لەم هەڵوێستەدا گەلانی ژێردەستە هەریەکەیان لە کلاوڕۆژنەی بەرژەوەندی نەتەوەیی خۆیەوە لە پێناوی پاراستنی خۆیان و وڵات و چارەنووسیان ڕێبازی خۆی گرتەبەر. ئەم خەبات کردنە بەهۆی هاتنی جەماعەتی (ئیتیحادییەکان) بەیەکجاری شیرازەی یەکێتی گەلانی ژێردەستەی دەوڵەتی عوسمانلی پسان و بارودۆخێکی تازەی هێنایە کایەوە. جێگای خۆیەتی لێرەدا بڵێین ڕاپەڕینی (مەشروتییەت) بەڕووداوێکی گرنگ و وریابوونەوەیەکی ڕۆشنبیرانە بۆ گەلانی ژێردەستەی دەوڵەتی عوسمانلی دەژمێررێ.

(مەشروتییەت) گۆڕانێکی بنەڕەتی گەورە بوو، بیری ڕووناکبیرانی ڕاچڵەکاند و نەتەوە ژێردەستەکانی ژێردەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانلی بەئاگا هێنانەوە، لە کاتێکدا ئەو دەسەڵاتە تێکڕای گەلانی ژێردەستەی خۆی، نەتەوەی تورک دەیچەوساندنەوە، بۆیە لەو قۆناغە مێژووییەدا خەباتی نەتەوایەتی سڕ و لاواز بوو، لێرەدا دەتوانین سەرەتای ڕاپەڕین و بیرکرانەوە و هەست بەکێشەی نەتەوایەتی کردن لە ساڵی (١٩٠٨)ەوە دەست پێدەکا. بە بەرپاکردنی (مەشروتییەت) بەجارێ دڵ و دەروونی ڕووناکبیرانی کورد هەژا، بیر و مێشکی ڕاچڵەکاندن و ڕاپێچی کۆڕی خەباتی نەتەوایەتی هاوچەرخی کردن و کەوتنە ئەوەی هەست و هەڵچوونی نەتەوایەتی خۆیان بەتوندی و بەهێزی دەربخەن[1].

(١) بۆ مەسەلەی مەشروتییەت سەیری گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ژمارە (٩٩)ی ئەیلوولی ساڵی١٩٨٣ کراوە.

که لەو کاتەدا گەلی کورد بەکۆمەڵێ ڕووداوی گرنگدا تێپەڕی، نۆبەرەی ئەو جووڵانەوانە جووڵانەوەی (شێخ عوبەیدوڵلای نەهری) و (شێخ عەبدولسەلام بارزانی) بوو، تا هاتنی (شێخ مەحموودی حەفید). (شێخ مەحموود)یش پیاوێکی نیشتیمانپەروەری ئازا بوو، هەر لە زووەوە حەزی بەسەربەخۆیی دەکرد. تورکەکان لە کاتی جەنگی جیهانی یەکەمدا بەتاوانی ناپاکی، بڕیاری لە سێدارە دانیان دا، ئەگەر لەپڕ فەرمانی گوێزرانەوەی سوپاسالاری ئەو کاتە (سەلاحەددین جولاغ) دەرنەچووبایە، کە سوپاسالاری تورکی بەناوبانگ (عەلی ئیحسان پاشا) جێگای گرتەوە، ئەوە بڕیاری لە سێدارە دانەکەی (شێخ مەحموود)ی نەمریان جێبەجێ دەکرد.

ئینگلیزەکان لەگەڵ هاتنیان بۆ عیراق، لە کۆتایی ساڵی (١٩١٨)دا کە هاتنە کوردستان یەکسەر (شێخ مەحموود)یان کردە حوکمداری کوردستان، لەبەرئەوەی شێخی نەمر لە ناو ڕۆڵەکانی نەتەوەکەی خاوەنی پلە و پایەیەکی بەرز بوو. پێش ئەوەی ڕوو لە هیچ کەسێک بنێن لە عیراق، ڕوویان لەو ناو ئەویان بەلایق زانی ئەو پایە و شوێنەی بدەنێ، ڕەنگبێ لە سەرەتاوە ویستبێتیان خۆیان لە مەترسی (شێخ مەحموود) بپارێزن تا شوێن پێی خۆیان قایم دەکەن. وە نەبێ شێخی نەمر ئەو پایەیە بەرچاوی گرتبێ و ئیدی کەوتبێتە موساوەمە کردن لەگەڵیان، چونکە وەک مێژوو بۆمانی دەگێڕێتەوە شێخی نەمر خۆ تێهەڵقورتانی ڕاوێژکاری ئینگلیزی بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری کارگێڕییەکەی ئەوەندە پێ ناخۆش بوو، هەر زوو لەگەڵی نەگونجاو ڕایەکانی لەگەڵی جووت نەبوو، بۆیە بەسەر ئینگلیزدا یاخی بوو و فەرمانی دا هەموو ئەفسەرە ئینگلیزەکان بگرن، کە لە ناوچەی دەسەڵاتدارێتی ئەودا دەژیان، هەر ئەو کاتەش سەرکردایەتی لەشکرەکەی خۆی کرد و بەرگری لە سنووری دەسەڵاتدارێتییەکەی کرد و کەوتە جەنگ لەگەڵ هێزەکانی ئینگلیز کە بەرەبەرە دەهاتنە پێشەوە بۆ داگیرکردنی ئەو ناوچانەی لە ژێر دەسەڵاتی شێخی نەمردا بوون. لە (١٩-٥-١٩١٩)، (شێخ مەحموود) بەبرینداری لە لایەن ئینگلیزەکانەوە بەدیل گیرا، ئەوە بوو دادگایەکی سەربازی ئینگلیزەکان بڕیاری کوشتنیان بۆ دەرکرد، بەڵام لە دواییدا ئەو بڕیارەیان کرد بەبەندکردنی تاسەر و بۆ دوورگەی (هنگام) دوورخرایەوە کە یەکێکە لە دوورگە دوورەکانی (هیند) تاکو کاتی بەندێتییەکەی تێدا بەسەر ببات. ئینگلیزەکان دوای ئەوەی ئەو بڕیارەیان بۆ دەرکرد تامی حەسانەوەیان نەچەشت، هەر ئەو کاتە ڕاپەڕین لە هەموو ناوچەکانی کوردستان بەرپا بوو، تا ناچار بوون لە ئەیلوولی ساڵی (١٩٢٢)دا بیگەڕێننەوە، لەو کاتەدا کە ساڵێک بوو دەوڵەتی عیراقیان دروست کردبوو،

بەوپەڕی ڕێزەوە کردیان بەحوکمداری کوردستان، ئەم جارەش وەک جاری پێشوو گەڕایەوە سەر بەرەنگاربوونەوەی ئینگلیز و پاش ماوەیەکی کەم دەستی کردەوە بەدەرکردنی ئینگلیز و بەسەریاندا یاخی بوو، بەخۆی و بەلەشکرەکەی دایەوە شاخەکان کە ژمارەیەکی زۆر لە ئەفسەرە نیشتمانپەروەرەکانی کورد بەڕێوەیان دەبرد، دوای ئەوەی لە لەشکری عوسمانی دەستیان لە کار کێشایەوە و چوونە پاڵ هێزەکانی شێخ مەحموود، بۆ بەرگریکردن لە خاکی کوردستان، پاش ئەوەی ئینگلیزەکان شاری سلێمانییان بۆردومان کرد و دەیان کەسی بێ تاوانیان لە دانیشتوانی شارەکە کوشت و بریندار کرد، شێخ مەحموود بەم جۆرە تاکو ساڵی (١٩٢٧) مایەوە لەگەڵ هێزەکانی ئینگلیز جەنگا، دوای تەواو بوونی ئەو ڕاپرسینەی دەربارەی ولایەتی (مووسڵ) کرا، کە لەلایەن (کۆمەڵەی نەتەوەکان - عصبة الامم)ەوە ئەنجام دراو بڕیاریان دا لە چوارچێوەی دەوڵەتی عیراق بهێڵرێتەوە. ئەوە بوو ئەویش چەکی داناو لە سەرکەوتنی بزووتنەوە ئیستیقلالییەکەی بێ هیوا بوو، ئینجا ڕووی کردە هەندێ لە گوندەکانی سەر سنووری ئێران و لەوێ دانیشت، بەپێی ئەو ڕێکەوتننامەیەی لەگەڵ حکوومەتی عیراقی و ئینگلیز بەستی.

لە ساڵی (١٩٣٠) جارێکی دیکە (شێخ مەحموود) بەهۆی ڕووداوەکانی شەشی ئەیلوول، شەڕی ڕاگەیاند. ئەم جارەیان بزووتنەوەکەی تا ساڵی (١٩٣٢) درێژەی کێشا و خۆی دا بەدەست هێزەکانی حکوومەت و ڕەوانەی باشووری عیراقیان کرد، چەند ساڵێک بەدەستبەسەری لە باشوور و ناوەڕاستی عیراق مایەوە و بەم جۆرە دەوری تێکۆشەرانەی خۆی دی لە پێناوی سەربەخۆیی نەتەوەکەی و مافە ڕەواکانی[٢].

(شێخ نووری) وەک شاعیرێکی هۆشیار کە بیری نوێی لەگەڵ خۆی هەڵگرتبوو، دژی داگیرکەران و سیاسەتی ئینگلیز وەستا. لەو سەردەمەدا بزاڤی ڕزگاری کورد دوو دەستە بوون، دەستەیەکیان کە سەر بە(جەمعیەتی کوردستان) بوون بە ڕێبەرایەتی (مستەفا پاشای یامولکی) داوای کۆمەڵێ مافی نەتەوایەتییان دەکرد. هەرچی (شێخ مەحموود)یش بوو وەک لەمەوپێش باسمان کرد هەڵگری ئالای سەربەخۆیی بوو بۆ کوردستان. شێخ نووری یەکێک بوو لەو شاعیرە موونەوەرانەی کە چووە پاڵ ڕێباز و داوایەکەی (شێخ مەحموود)ی نەمر و پاڵپشتی لە بیروڕایە سیاسییەکانی دەکرد، بۆیە

---

(٢) بڕوانە نامیلکەی: الحركة القومية الكردية - نقد وتحليل كتاب، بقلم علي كمال، طبع عام ١٩٧٣ ل ٦-٧-٨-٩ بۆ ئەم بیرخستنەوە مێژووییە سوودی لێ وەرگیراوە.

ئەو ژیانە سیاسییەی (شێخ مەحموود) دروستی کرد، کارتێکردنێکی زۆری بەسەر (شێخ نووری)یەوە هەبوو. لەلایەنی کۆمەلایەتیشەوە هەوڵی دا شۆڕش بەسەر بنەمای کۆندا بەرپا بکا بۆ دروستکردنی بنەمای تازە تا ئەو بنەما تازانە لەگەڵ پێداویستییەکانی کۆمەڵگای تازەدا بگونجێن، چونکە دەیزانی ئەو خەباتە کۆمەلایەتییەش بەشێکی گرنگە لە خەباتی هونەر و شیعر و گۆڕینی باری کۆمەلایەتی وا لە خوێنەر دەکات بەرەو هێنانە دی ئامانجی گەورەتر خەبات بکەن، بۆیە زۆرجار وا ڕێ دەکەوێ شۆڕشی ئەدەب و تازەکردنەوە پێش شۆڕشی کۆمەلایەتی دەکەوێ تا بتوانێ ڕابەرایەتی هۆشیاری زۆربەی خەڵک بکات، ئینجا شۆڕشی سیاسی و کۆمەلایەتی سەر هەڵدەدەن بۆ ڕێنماییکردنی ئەو هۆشیارییە سەربەستە و هێنانە دی داوایەکانیان. شێخ نووری وەک ڕۆشنبیرێک باری دواکەوتووی کۆمەڵی ئەوسای ڕەت کردەوە و کەوتە خەبات کردن بۆ ژیانێکی باشتر، شۆڕشە ئەدەبییەکەشی لەگەڵ سەرەتای شۆڕشە سیاسی و کۆمەلایەتییەکە سەری هەڵدا. لەلایەنی ڕۆشنبیریشەوە، ڕۆشنبیریی باوی سەردەمەکەی خۆی ڕەت کردەوە و هەوڵی تێپەڕاندنی دا بۆ ئەوەی جۆرە ڕۆشنبیرییەکی دی جێگای بگرێتەوە کە لەگەڵ ئامانجەکانی ژیانی تازە بسازێ.

گومان لەوە ناکەم کە گۆڕین و نوێکردنەوەی شیعری کوردی لەسەر دەستی شێخ نووری تەنیا گۆڕینی شێوە نەبووە، واتە تەنیا کێش و سەروا نەبوو، یان هێنانی عیبارەتی تازە نەبوو، بەقەدەر ئەوەی گۆڕینی چەمکی شیعر بوو، واتە شیعری زیاتر لە ژیان نزیک خستەوە و فڕێی دایە ناو باوەشی ژیان و لەوێوە لە گۆشەنیگایەکی تازەوە ساتوسەودای لەگەڵدا کرد. ئەگەر کەسێک بیەوێ بەشێوەیەکی مەوزووعیانەوە سەیری شیعرەکانی شێخ نووری بکات، ئەوە دڵنیام ئەو کەسە ناتوانێ هیچ شیعرێک لە ناو شیعرەکانی شێخ نووری دەربهێنێ، چونکە ئەو وێنە ڕاستگۆیانەیەی کە بۆ سەردەمەکەی خۆی کێشاوە، تەواو دەشێوێ. شێخ نووری لە شیعرەکانیدا تەعبیر لە ویژدانی زیندووی میللەتەکەی دەکات و زۆربەی ڕووداوەکانی میللەتەکەی بەڕاستگۆییەوە گوشیوەتە ناو شیعرەکانی خۆی. وەک شاعیرێکی نیشتمانپەروەر شان بەشانی بزووتنەوەی نیشتمانی دەنگی ڕەتکردنەوە و یاخیبوون بووە، لە دژی داگیرکەران و نۆکەران و چڵکاو خۆرەکانی ئینگلیز، بەشیعر و بەخەباتی ڕۆژانە ڕووبەڕوویان وەستاوە. ئەو تێکۆشان و خەباتەی خۆشی دایە پاڵ شێخی نەمر، کە ئەمڕۆکە کەم کەس هەیە گومان لە جگەرسۆزی ئەو پیاوە بکات بۆ کورد و کەس نییە- بەرچاو تاریکەکان نەبێ- گومان لە نیشتمانپەروەریتی و

دڵسۆزییەکەی بکات. شێخ نووری-یش شان بەشانی هەموو سەرکەوتن و نووچدانێکی پەیتا پەیتا شیعرە نەتەوەییەکانی خۆی بڵاودەکردەوە و لەگەڵ هەموو ڕووداوێکی ئەو سەردەمە دڵی داچڵەکیوە و بەشیعر ئەو هەستەی خۆی دەربڕیوە. هەر بەوەندە نەوەستاوە کە لەگەڵ بزووتنەوەی ڕزگاریخوازانەی نەتەوەکەی بێت، بەڵکو وەک خەمخۆرێک زوو هەستی بەگرنگی چەکی ڕۆشنبیری کرد و بەبیروباوەڕی تازەو پێشکەوتووانە لەگەڵ هۆشی نەوەی تازە هەڵچووی ئەو سەردەمە دەدواو گۆشی دەکردن وەک لە شیعری (ئەی شەباب) و (عەسکەر)دا زیاتر ئەمە دیارە.

شیعرەکانی شێخ نووری ئاوێنەیەکی باڵانومای سەردەمێکی ناسکی میللەتی کوردن، بۆیە وەک شاعیرێکی سەر بەمیللەت بەوردی زۆربەی ڕووداوە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی ئەو سەردەمەی نووسیوەتەوە و لە شیعرەکانیدا ڕەنگ دەدەنەوە. ئەو شیعرانە ڕەنگدانەوە و عەکس کردنەوەی هەموو ئەو ڕواڵەت و دیاردە تازانەیە کە ئەو قۆناغە تازەیەی هێنایە پێشەوە. ئەم حاڵەتە تازەیەش بۆ کات و سەردەمی خۆی بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕانە بوو، ئەگەر هەندێ کلێشەی شۆڕشگێڕایەتی ئەمڕۆکەی بەسەردا نەسەپێنین. شێخ نووری ئەم بارە تازەیەی بەشیعری تازە - کە ئەویش کردەوەیەکی شۆڕشگێڕانەیە - بەرجەستە کرد و شان بەشانی بزووتنەوەکەش دەڕۆیشت. دەتوانین (شێخ نووری) بەیەکێک لەوانە دابنێین کە لە کوردستاندا تۆوی (بیری نوێ)یان ڕواندووە، وەک کەسێکی خاوەن پەیام بەشیعر و بەوتار و بەکردەوەی ڕۆژانەی خۆی، دەیویست بەشدار بێت لە دروستکردنی باری ژیان و گوزەرانێکی خۆشتر و بێ چەوسانەوە و دەست بەسەری. لەبەرئەوەش بوو بەدوای چەمکێکی تازە دەگەڕا بۆ ئەدەب، تا توانی لە ئەنجامدا، ئەو چەمکە دەستگیر بکات و لە مێژووی ئەدەبیاتدا ئەو سەرەتایە بەشانازییەوە جێگەی خۆی لە لاپەڕەکانیدا بکاتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا کە بارە سیاسییەکە و ئەنجامەکانی پێوەندی ڕاستەوخۆیان بەژیانی گەلەوە هەبوو، کەچی شێخ نووری چەکی شیعر و ڕۆشنبیری فەرامۆش نەکرد، کە چەکێکی ناڕاستەخۆیە لە کاری گۆڕاندا.

شێخ نووری شاعیرێکی میللی نەبوو، لەو سەردەمەدا شیعری ڕۆژانە و سەرپێیی نووسیبێ، تا لەگەڵ چێژی گشتی بڕوات، بەڵکو وەک شاعیرێکی هونەرمەند و شارەزا بەسنعەتەکەی، دەستی دایە نووسینی شیعری سیاسی و بابەتی کۆمەڵایەتی. هەرچەندە شاعیرێکی خاوەن توانایی و دەسەڵات بووە، بەڵام لەو کاتەدا هەر ئەو جۆرە شیعرانەی پەسند کردووە، تا مردنی ئەو خەتەشی بەرنەداوە. بۆ نموونە لە (١٩٤١) شیعرێکی

نووسیوه بەناوی (پەچە) و تێیدا باری دواکەوتووی ئافرەتی کورد نیشان دەدا و لایەنگیری دەکات بۆ سەربەست بوونی و هانی دەدات بۆ (پەچە) فڕێدان و بەشداربوون لە گۆڕانەکانی کۆمەڵ و خەباتکردن بەسەر باری دواکەوتنیدا، ئەم داوایەش ئەگەرچی لە بانگ ڕاهێشتنەکەی (قاسم ئەمین و عائیشە تەیموور)ی میسر و (ڕەسافی و زەهاوی) عیراق دوور نەبووە، بەڵام دیسان بەڵگەی موونەوەرێتی و هەڵگرتنی پەیامێک دەگەیەنێ.
هەر لە بیستەکاندا بەدوو شیعر (جووتیار)ی بەسەر کردووەتەوە و هانیان دەدات بۆ ئەوەی بەروبوومی کشتوکاڵی و ئاژەڵداری زیاد بکەن و ڕوو بکەنە ئەو لایەنە گرنگەی ژیانی میللەتەکەمان کە خۆی میللەتێکی کشتوکاڵییە و ئابووری کوردستانی پێوە بەندە. ئەوەش ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە شێخ نووری ناوەرۆکی شیعرەکانی تازە کردووەتەوە و مەستی کردوون بەناوەرۆکی کۆمەلایەتی هاوچەرخ و بەشیعری نیشتمانی و سیاسی لەسەر دیاردە تازەکانی ژیانی کورد وەستاوە کە لە سەرەتای ئەم سەدەیەوە ڕووی کردە گۆڕان، بۆ ئەوەی زیاتر سەرنجی خوێنەر بۆ لای ئەو دیاردانە ڕابکێشێ و تێیدا قووڵ ببنەوە.
لە ئەزموونی شاعیرایەتی شێخ نووری-دا زیاتر (واقیعیەت) بەسەریدا زاڵە و ئەگەر لە سەرەتاوە بەڕۆمانتیکیش دەستی پێ کردبێ، ئەوە ئەوەندە لە باوەشی ڕۆمانتیکدا نۆقرەی نەگرت و زیاتر هەنگاوەکانی بەرەو ڕیالیزم ناوە، ڕۆژ لە دوای ڕۆژیش زیاتر پەرەی بەو ڕێبازەی دەدا و تا مردیش هەر ئەو ڕێبازەی بەرنەدا. گرنگترین شت لە شیعری شێخ نووری لایەنی (ڕاستگۆیی)یە لە دەرخستن و بەرەو پیرەوە چوونی ڕووداوەکانی سەردەمەکەی کە ئەو ڕاستگۆییە گەرموگوڕی زیاتری داوە بەشیعرەکانی، ڕووداوەکانیش وەک (ئەزموون و تاقیمانە) لە ناوەوە خۆیان داڕشتووە و بوونەتە بەشێک لێی، بۆیە ساتوسەوا کردن لەگەڵ ڕووداوەکان کاری نەکردووەتە سەر پووچکردنی بەرهەمەکانی و لە دەستدانی هەندێ لایەنی هونەری لە شیعرەکان و تەنیا ڕاگەیاندنی ڕووداوەکەی نەگرتووەتە ئەستۆی، بەڵکو لە قاڵبێکی هونەری و جوانیدا مشتومالی کردوون و لە گۆشەنیگایەکی نوێوە ئەدای کردوون، وەک وتمان بەروبوومی شیعری و نووسینەکانی شێخ نووری کە دەخوێنینەوە بەئاشکرا هەست بەتەوژمی (بیری نوێ) لەسەر ڕووی شیعرەکانی و لە ناو بیروڕایەکانیدا دەکەین، ئەم کارتێکردنەش ڕەوتەنی و سەرپێیی نەبووە، بەڵکو کارتێکردنێکی قووڵ بووە کە قەوارە و کیانی گۆڕیوە و هەڵی تەکاندووە، ئەویش بەشیعر خۆی لە قەرەی ئەو مەسەلانە داوە کە خۆی بڕوای تەواوی پێیان هەبووە و بەچەکی شیعر لەگەڵ بەرەی دژ بەمیللەتەکەی کەوتووەتە زۆران گرتن.

شێخ نووری دژی داگیرکەران و چەوسانەوەی میللەتەکەی خەباتی دەکرد، بەقەد تۆزقاڵێ لە کێشەکانی نەتەوەکەی دانەبڕاوە و ئەو بیروباوەڕەی بەهیچ شتێک نەگۆڕیوەتەوە و ئەو هەستە نەتەوایەتییەی تێکەڵ بەبیرێکی پێشکەوتنخوازانە کردووە. بێجگە لەوەش بەکارە شیعرییەکانی چووەتە ڕیزی شاعیرە پێشکەوتووخوازەکان، چونکە هەموو ڕچەشکێن و داهێنەرێک پێشکەوتووخواز و شۆڕشگێڕن. بنەڕەتی کۆنەپەرستی و پێشکەوتنخوازی لە ئەدەبدا هەر لە ڕوانگەی داهێنان و بینینی ژیان بەچاوێکی تازەوە سەیر دەکرێت. شێخ نووری خۆی بەورد و درشتی کێشە و مەسەلەکانی میللەتەکەیەوە بەستووەتەوە، لەگەڵ هەموو کەوتن و نووچدان و خەمێکی بووە و تا مردن ئەو ڕێگایەی بەرنەداوە کە لەسەری ڕۆیشتووە، لەسەر چەند بیروڕا و سەنگەرێکی جیاواز جیاواز جێ گۆڕکێی نەکردووە و خۆی نەدیوە، ئەمەش حەقیقەتێکە لە شیعرەکانیدا بەڕوونی بەدی دەکرێت. لەبەرئەوەی شێخ نووری خاوەنی باگراوەندێکی ڕۆشنبیریی گەورەیەو زەمینەیەکی پتەوی هەیە، کە ئەمەش هێزێکی وای داوەتێ، بتوانێ بەتەواوی جێ پێی خۆی لەسەر ئەو زەمینەیە قایم بکات و وەک پووشی لێ نەیێت (با) بەملا و بەولادا بیبا و بیهێنێ.

ژیانی شێخ نووری کتومت ڕەنگدانەوەی ئەو ژیانە سیاسی و کۆمەڵایەتییە تازەیەیە کە ڕاپەڕینەکانی شێخ مەحموود و ڕووداوەکانی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەم هێنایانە پێشەوە. ئەگەر بەوردی سەرنجی مێژووی شیعرەکانی (شێخ نووری) بدەین، بەتایبەتی ئەو شیعرانەی لەو ساڵانەدا نووسیونی کە ڕواڵەتەکانی ژیانی تێدا جووڵاوە، بێگومان دەگەینە ئەو قەناعەتە کە لوتکەی دەسەڵاتی شاعیرانەی شێخ نووری و تەقینەوەی بەهرەکەی و پڕانی زمانە شیعرییە تازەکەی بۆ ئەو ساڵانە دەگەڕێتەوە، کە هۆیەکی یاریدەدەر و مەوزووعی بوو لە پاڵ هۆیە زاتییەکان کە لە کەسی شێخ نووری-دا کۆ بووبوونەوە، خۆشی یەکێک بوو لەوانەی دەورێکی گورج و گۆڵانەی لە جۆشدانیدا گێڕاوە و وەک ڕۆشنبیرێکی هۆشیاری سەردەمی خۆی هەستی بەئەرکی سەرشانی خۆی کردووە.

مەسەلەی بەستنەوەی ڕاپەڕینە شیعرییەکەی شێخ نووری بەجموجووڵی سیاسی ئەو سەردەمە کارێکی زۆر پێویستە، چونکە زمانی شیعری ئەو، زمانی ئەو بارە تازەیە بوو کە زۆرانبازی و ململانێی ئەو هێزانە دروستیان کرد کە ڕوو بەڕووی کورد بووبوونەوە. واتە شێخ نووری بە زمانی ئەو ڕووداوانەوە نووسیویەتی کە ویستی گۆڕان لە واقیعی کوردستان بەرپا بکات و ژیانی ئینسانی کورد بگۆڕێ. ئەمیش لە لای خۆیەوە

ویستوویەتی شیعر لە کۆت و پێوەند ڕاپسکێنێ. لەبەرئەوەی سەرەتای داهێنان و تازەبوونەوەکەی (شێخ نووری) پێوەندییەکی بەهێز و توندوتۆڵی بەجووڵانەوەی سیاسی کۆتایی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای ئەم سەدەیەوە هەبێ، بۆیە تازەبوونەوەکەی زادەی کات و شوێن و سەردەمی خۆیەتی، وەک شایەت و بەشداربوویەک لە ڕووداوەکان دەردەکەوێ.

«شۆڕش» بەرپاکردن لە واقیعدا، گۆڕان دروست دەکات، چونکە واقیعەکە بەرەو بارێکی باشتر و پێشکەوتووتر دەبات. هیچ گۆڕانێکیش بەبێ پاڵپشتی کردنی خوڵقاندن و داهێنان، ڕێڕەو و سەمتی خۆی وەرناگرێ و بەناتەواویش دەمێنێتەوە، بۆیە هاوکێشە ڕاستەکە بۆ (گۆڕان) وای لێ دێ:

**واقیع ⟵ شۆڕش ⟵ داهێنان ⟵ گۆڕان**

ئەو گۆڕانەی داهێنان دەیهێنێ، بەکاری ڕووخاندن و خاپوورکردنی ئەو بنەمایانەدا کە (چێژ) و (تێڕوانین) و (بیر) و (بۆچوون) لە بارێکی (باو- سائد) و مەیبو دەکات بەبارێکی جووڵاو. بمانەوێ و نەمانەوێ هەموو گۆڕانێکی سیاسی بۆ ئەوەی دەسەڵات و سستەمەکەی وەک خۆی بهێڵێتەوە (ڕۆشنبیری باو) جێگیر دەکات، بەڵام داهێنان لە شۆڕشی تازەی خۆی بەرەو گۆڕان و دروستکردنی پاشەڕۆژ، بەزمانێکی تازەوە بەدوای ئاسۆیەکی دەربڕینی تازەدا دەگەڕێ. بۆ ئەوەی بەشێوازێکی تازەوە ئەم تێڕوانین و بارە تازەیە بگرێتە باوەشی میهرەوە. ئەو کاتە پێش هەموو شتێک گۆڕان لە هۆشیاری و تێگەیشتن و تێڕوانینی شاعیردا دروست دەبێت. بەم جۆرە (شێخ نووری) شاعیرێکی خاوەن هەڵوێستە لە بەرانبەر مەسەلەکانی ژیان و مێژوو و سەردەم و میللەتەکەی، تازەبوونەوەکەشی زادەی واقیعێکە کە تەعبیرێکی ڕاستگۆیانەی لێ کردووە و زیاتر لە زۆرانبازییەکانی تێگەیشتووە و لە ڕەهەند و مەودا و سووچە دوور و نزیکەکانی کۆڵیوەتەوە و ئینجا لە شیعردا هەوڵی تەقینەوەی داوە.

شێخ نووری وەک ڕۆشنبیرێکی پێشڕەو کە لە سەردەمەکەی خۆی و دیاردەکانی ورد بوویێتەوە و لە جووڵانەوە و تەکانەکانی گەیشتبێ، هەوڵی داوە چاک لە دەوروپشتەکەی خۆی تێبگات و کێشەکانی لە شیعردا ئاوەژوو بکاتەوە. بەم پێیە زۆرانبازییەکانی (واقیع)ی لە بەرانبەر هێز و توانایی شاعیریی خۆی تاقی کردووەتەوە و کردوویەتی بەیاسای بنەڕەتی داهێنان و پەرەسەندنی، لە کاتێکدا کە قۆناغەکە پڕ بووە لە زۆرانبازی سیاسی و کۆمەڵایەتی و هەر بەو عەقڵەوە یەکێک لە داهێنانەکانی کە (یەکێتی بابەت)

بوو هێنایە ناو شیعری کوردی و خۆی لە (یەکێتی بەیت) دوور خستووەتەوە، تابتوانێ لە پشت ئەو (یەکێتی بابەت)و تێکەڵکردنی ڕەگەزی چیرۆک لە شیعرەکەدا زیاتر ئەو زۆرانبازییە نیشان بدات و ئەمەش لە جەوهەردا - پێی زانیبێ یان نەزانیبێ - هەنگاوێکە بۆ نزیکبوونەوە لە شیعری (دراما). بەشێکی زۆری ئەو کەرەسانەشی، لە مێژووی گەلەکەی یان لە واقیعی زیندووی سەردەمەکەی خۆی وەرگرتووە، کە بۆ شاعیرێکی بەدەسەڵات و بەهرەداری وەک ئەم لێواولێو بووە لە کەرەسەی شیعر، بۆیە هەستێکی (درامی) لە شیعری (شێخ نووری)دا دروست بووە کە خوێنەر دەست دەداتە خوێندنەوەی شیعرەکانی، لە نێوان مردن و ژیان، واقیع و خەون و بەربەرەکانی کردن و کێشە لەگەڵ شەڕخوازی و چەوسانەوە، خۆی لە بەردەم ئەو ململانێیەدا دەبینێ، کە ئەمەش بۆ خۆی جەوهەری شیعری (دراما)یە، ئینجا ئەمە لە هەندێ شیعریدا بەخەست و خۆڵی و بەزەقی بەدەردەکەوێ، لە هەندێکی دیکەشیدا بەتەنکی و بەهێمنی سیمایەکەی دەبینین. ئەم ئەزموون و تاقیکردنەوەیەشی تێکەڵ بە(خەیاڵ) کردووە و خستوویەتییە ناو سستمێکی تەعبیری تازەوە و بەدەربڕین و کەرەسەیەکی نوێوە گوزارشتی لێ کردووە، ئەمەش زەمینە مەوزووعیەکەی ئەو تازەبوونەوەیەیە کە شێخ نووری لە چارەکی یەکەمی ئەم سەدەیەدا ڕایگەیاند، کە تاقیکردنەوە و ڕووداوە سیاسییەکانی ئەم میللەتە دەستێکی باڵای لە بەرپاکردنیدا هەبوو.

وەک دەردەکەوێ سەرەتای ئەو تازەبوونەوەیە لە بۆشەوە دروست نەبووە، ئەوەندەی گونجاندنی داهێنان و جۆری دەربڕینە لەگەڵ ئەو بارودۆخە و ئاووهەوای گونجاوی بۆ ساز بووە، تا شیعریش وەک هەموو ڕواڵەتەکانی دیکەی ژیان لەو قاوغەی کرووشکەی تێدا کردبوو خۆی دەربهێنێ و ئەو کەرەسانەی شیعری کوردی دەقی پێوەیان گرتبوو، تازە ببێتەوە و خۆی لە شتە ئاشنا و مەئلووفەکان دوور بخاتەوە. ئەو بارە سیاسییە تازەیە لەو سەردەمەدا چەمکی تازەی هێنایە پێشەوە و تێڕوانینی موونەوەرانی بۆ ژیان تازە کردەوە و کارتێکردنی زۆری بەسەر بزووتنەوەی داهێنان بەجێ هێشت. بەلای منەوە داهێنان و تازەبوونەوەش لە بارودۆخی سیاسی دوور نییە، چونکە تازەبوونەوە و داهێنان پێویستییان بە(سەربەستی) هەیە.

تازەبوونەوە و داهێنانەکانی (شێخ نووری)و تەقینەوەی کانیی بەهرەی لە سازبوون و خۆشکردنی ئاو و هەوای سیاسی ئەو سەردەمە دانابڕێت، بەتایبەتی لەو سەردەمانەدا کە خەباتی بێ وچان دەکرێت لە پێناوی سەربەخۆیی و ئازادی. هەرچەندە ڕام وایە هیچ پارت

و سیاسەتێک لە دنیادا نییە، بتوانێ شاعیرێکی چاک دروست بکات، بەڵام زۆر جار هاتنە پێشەوەی سیاسەتێکی پێشکەوتنخوازانەی سەر بەمیللەت و نەتەوە، بەهۆی خەبات کردنەکەی، بارێکی تازەتر دەخولقێنێ، ئەو بارە تازە خولقاوە، لە لایەک دەبێتە هۆی یارمەتیدانی تەقاندنەوەی بەهرەی خولقێنەران، لەلایەکی دیکەشەوە دەبێتە مایەی گۆڕینی بنەمایەکانی ئەدەب، ئەمەش لە ئاستی خۆیەوە جۆری ساتوسەوا کردن لەگەڵ ئەدەب دەگۆڕێ. چارەنووسی داهێنانیش پێوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە(سەربەستی)یەوە هەیە و چارەنووسی (سەربەست)یش بەستراوە بەبارودۆخی سیاسیی سەردەمەکەوە، بۆیە شاعیر ناتوانێ لە سیاسەتی سەردەمەکەی خۆی دوور بکەوێتەوە. ئەو ژیانە تازەیەی بارێکی سیاسیی تازە دروستی دەکات، هەستی تازە دەورووژێنێ و کێشە و دیاردەی تازە لەگەڵ خۆی دەهێنێ. داهێنەریش ئەگەر لەگەڵ ئەو بارە تازەیەدا بژیت و لە ناوەوەڕا لەگەڵی بێت و ئاگاداری هەموو جووڵان و تەکانێکی بێت، نەک لەگەڵ ڕواڵەتەکانی خەریک بێت، ئەم لەگەڵ ژیانە - معایشة - ئەزموونێکی لە لا پێدەگەیەنێ، ئەو ئەزموونەش لەگەڵ ڕۆشنبیری خۆی و تێڕوانینە قووڵ و شارستانییەکەی تێکەڵ دەکات، بەمەش کۆمەڵێ ئەزموونی زیهنی و حسی تێدا کۆدەبێتەوە.

کورد لە مێژووی هاوچەرخیدا کۆمەڵێ ڕووداوی گرنگی بەخۆیەوە دیوە، ئەو ڕووداوانەش ڕێڕەوی ژیانیان گۆڕیوە و چاوی خەڵکیان زۆرتر کردووەتەوە و کاریان لە هەست و نەستیان کردووە. لە هەمان کاتیشدا ئەو ڕووداوانە کاریان کردووەتە سەر باری ڕۆشنبیری و شڵەقاندنی گۆمە مەنگەکەی، هەر ئەو ڕووداوانە ڕێڕەوی داهێنانی ئەدەبیی ئەو سەردەمەیان گۆڕیوە. شێخ نووری-یش ئەو دیاردە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییانەی لە بەرچاو گرتووە و تێگەیشتنی بەرانبەر بەئەدەب گۆڕاوە و ئەم تێگەیشتنە لە شیعر نووسیندا ڕەنگی داوەتەوە، تابتوانێ ئەو فۆرمە هونەرییە گونجاوە بدۆزێتەوە بۆ دەربڕینی ئەو تێڕوانینە تازەیەی بۆ ڕووداوەکانی ژیانی ئەو کاتە هەیبوو. نزیکی شێخ نووری لە شێخی نەمر چ وەک خزم و چ وەک موونەوەرێکی ئەو سەردەمە و چ وەک کەسێک کە لایەنگیری سیاسەتەکەی بووە، لەوەوە بەوردی لە بارە سیاسییەکە گەیشتبوو، ئەوەش وەک وتمان کارتێکردنێکی ڕاستەوخۆ و ڕاستگۆیانەی بەسەر شێخ نووری-یەوە هەبووە. بۆیە وەک شاعیرێکی سەر بەڕێبازی نەتەوایەتی پێشکەوتنخواز، وای لە شێخی نەمر کرد لە دواییدا بیکاتە دەمڕاستی خۆی و لە ڕۆژنامەی (ڕۆژی کوردستان) کە زمانی حاڵی حوکمدارییەتییەکەی شێخ مەحموودە، ببێ بەسەرنووسەر و ئەویش بەکۆمەڵێک وتاری

سیاسی و کۆمەلایەتی و مێژوویی و ڕۆشنبیری پاڵپشتی لێ کردووە. نەک هەر ئەوەندە، تەنانەت شێخ مەحموود لە ماوەی دەسەلاتدارێتییەکەیدا کردوویەتی بەڕاوێژکاری تایبەتی خۆشی.

شێخ نووری زوو ئەو بارەی قۆستەوە بۆ گۆڕینی شێوازی تەعبیرکردنی خۆی، چونکە دەیزانی شێوە تەقلیدییەکەی شیعر دەستی کورتە و ناتوانێ بەتێروتەسەلی تەعبیر لەو تێڕوانینە تازەیەی بکات. بەشداربوونەکەی بەشداربوونێکی ویژدانییە لەگەڵ جووڵانەوەی مێژوو و ئەو بارودۆخەی کەرەسە هونەرییەکانی پێگەیاند. لە دواییشدا بنەمای داهێنان و تازەبوونەوەی لە لای شێخ نووری دروست کرد، ئەویش ئەو کەشوهەوا تازەیەی کردە هۆیەک بۆ تازەکردنەوەی کەشوهەوای شیعری کوردی. پێتان سەیر نەبێ ئەگەر بڵێم کۆتایی هاتن بەجووڵانەوەی (شێخ مەحموود) کە خەون و ئاواتی (شێخ نووری)و هەموو کوردێکی پێوە بەند بوو، بەدی نەهاتنی ئەو هیوا و ئاواتانە و ڕووخانی (قەلای ئەو ئاماله) وای کردبێ شێخ نووری بەخششی خۆی بەڕەوتی ئەو جووڵانەوەیە ببەستێتەوە و لە دواییشدا ئەو کەفوکوڵ و بەگەرمی چوون بەپیر ئەو (تازەبوونەوە)یەی لە لا کز ببێت، ئەگەر وا نەبوایە دەیان شاکاری دیکەی بۆ بەجێ دەهێشتین، ئەوەتا خۆی لە شیوەنی (شێخ مەحموود)ی نەمردا دەڵێ:

به کۆچی تۆ قەلای ئامالی کورد بنچینەکەی ڕووخا
بەلافاوی خەفەت، شاری ئەمەل ڕووی کردە وێرانی

ئەمە هۆیەکی سەرەکی بوو لە پێش نەخستنی داهێنانەکانی خۆی. لەگەڵ مردنی (شێخ مەحموود)یش دوو شیعری بۆ نووسی، یەکێکیان شیوەنە و ئەوەکەی دیکەیان باسی هێنانەوەی تەرمەکەی و چۆنیەتی پێشوازی لێکردنەکەی لە لایەن جەماوەری شاری سلێمانی و باسی هەستی خۆی و ئەو خەڵکە دەکات بەرانبەر بەو سەرکردە قارەمانەیان.

شێخ نووری لەو کاتەوە کە زانی (شێخ مەحموود) هیچی بۆ نەکرا و ئەو ئاواتانەی بۆ کورد نەخشەی کێشا بوو، نەهاتنە دی و نایەنە دی، ئیدی وەک شاعیرێکی سەر بەبزووتنەوەی ڕزگاریخوازانەی میللەتی کورد (بلبلی تەبعی مەیلی خوێندنی) کەم بووەتەوە و پشتی لە داهێنان و بەردەوامبوون لەسەر تازەبوونەوەکەی سارد بووەتەوە، لەبەرئەوە ئەو پێداگرتن و سووربوونەی جاری جارانی نامینێ. سەروساختی لەگەڵ خوێندنەوەش کەم دەبێتەوە. ئەمانەش کارێکی وایان لێ کرد، تاقەتی ئەوەی نەمێنێ ڕوانینی بۆ تازەبوونەوە قووڵتر بکات و ئەزموونەکەی بەبڕشت و بەبژۆینتر بێ و وردە

وردەش کەوتە ناو ساڵانی تەمەنەوە، ئادەمیزادیش هەرچەندە ڕۆشنبیر و داهێنەر بێت، کە لە کاروانی ڕۆشنبیری دابڕا، ئیتر ناتوانێ لەگەڵ گیانی سەردەم و داهێنان بڕوا و بەردەوام بێت لە تێپەڕاندن و بەرهەم و بەخششی چاکتر و چاکتر بدات و بیخاتە سەر خەرمانی ڕەنج و داهێنانەکانی پێشووی خۆی.

هۆی سەرەکی سنووردارییٔ بەخششی شێخ نووری لە بواری تازەکردنەوە و داهێناندا بۆ ئەو هۆیە دەگەڕێتەوە، هەموو هۆیەکانی دیکە لە چاو ئەمەیان بچووکن، چونکە ئەگەر وەزیفە دیتن و نان پەیداکردن ئەو تەئسیرە گەورەیەی لەسەر داهێنان هەبوایە، ئەوە دەبوایە لە وڵاتانی جیهانی سێیەم حاڵی داهێنان زۆر پەرێشان بێت، چونکە کەس نییە وەزیفە نەبینێ و بەدوای نان پەیداکردندا عەوداڵ نەبێت و کەم کەس هەیە خۆی بەتەنیا بۆ ئەدەب و خوێندنەوە تەرخان کردبێ و ژیانی مسۆگەر بووبێ، بەڵام مەسەلە سیاسییەکەی ئەو سەردەمە بەلای شێخ نووری-یەوە شتێکی زۆر گرنگە، ئەو ویستوویەتی بەقەدەر ئەوەی شاعیر بێت، ئەوەندەش بۆ میللەتەکەی هاووڵاتییەکی کوردی پاک و خێرخوا بێت، بۆیە هەرچەند توانایی و بەهرەکەی گەورە بووبێ، ئەو توانایی و بەهرەیەی تەنیا بۆ شیعر تەرخان نەکردووە و هەر بۆ شیعر نەژیاوە و خولیای سەرەتا و کۆتایی ئەو نەبووە، بەڵکو لە پێناوی سەربەخۆیی و ئازادی میللەتەکەشی ژیاوە و شیعریشی وەک چەکێک هەر بۆ کێشە و مەسەلەی نەتەوەکەی تەرخان کردووە، ئەگینا وەک بەشیعر و ئاستە ڕۆشنبیرییەکەیەوە دیارە دەیتوانی وەک هەر شاعیرێکی دی پێ بنێتە ناو مەملەکەتی شیعر و لەوە زیاتر نهێنییەکانی بدۆزێتەوە و دەیان شیعری جوانی وەک (پەپوولە) و (شەو) و (ژیانی ئادەمیزاد) بنووسێ. لەبەر ئەو هۆیە ناتوانین لە دیراسەکردنی شیعری شێخ نووری، بارودۆخی سیاسیی کورد لە سەرەتای ئەو سەدەیەدا فەرامۆش بکەین. بەرزکردنەوەی ئاڵای ئەو تازەبوونەوەیە لە قاوغی کات و شوێن و سەردەمەکەی دابڕین و یەکسەر بچینە سەر بەراوردکردنی شیعرەکانی بەڕاپەڕینی شیعری تازەی تورکی و جەماعەتی فەجری ئاتی، چونکە من لە لای خۆمەوە ئەمە بەلایەنە شەکڵییەکەی (تازە بوونەوە)کە دەزانم و لایەنە جەوهەرییەکەشی بەستنەوەیەتی بەو سەردەمەی زمانی شیعری تازەی پژاند کە ئێمە نەختێ ڕۆشناییمان خستە سەری!

## ئایا چاووگی ڕۆشنبیری شێخ نووری هەر ئەدەبی تورکی بوو؟

وەک لە پێشەوە پەنجەم بۆ ڕاکێشا، شێخ نووری شاعیرێکە گیانی تازەبوونەوەی تێدا بووە، واتە وەک مامۆستا ڕەفیق حیلمی وتوویەتی: (شاعیرێکی تەجەدودپەروەر) بوو. ئەم گیانی تازەییە زۆرتر لە ئەنجامی خوێندنەوە و ڕۆشنبیرییەوە لە پاڵ (بەهرەی شاعیری) بەدەستی هێناوە. بزووتنەوەی سیاسی سەردەمی (شێخ مەحموود) هاندەر و هۆیەک بوو بۆ بەرپاکردنی ئەو تازەبوونەوەیە و شێخ نووری-ش هەر بەتێگەیشتن و لێوردبوونەوە و قەناعەت پێ کردنەوە دەستی دایە بەرپا کردنی ئەم شۆڕشە، بەبێ ئەوەی سڵی لێبکاتەوە. وەک لە بەشی پێشوودا ڕوونم کردەوە، تازەبوونەوەکە دوو کارتێکردنی بەسەرەوە هەبوو، کارتێکردنی (مەوزووعی)و کارتێکردنی (زاتی). لەوێ نەختێ بەتانای لایەنە مەوزوعییەکە هاتینە خوارێ، ئێستاش دەمەوێ لەم دەلاقەیەوە لە لایەنە ڕۆشنبیرییەکەی (شێخ نووری) بکۆڵمەوە و پرسیار بکەم: (ئایا چاووگی ڕۆشنبیری شێخ نووری هەر ئەدەبی تورکی بوو؟).

ئەگەر بەوردی بەدوای چاووگ و کاریزی ڕۆشنبیری (شێخ نووری)دا بچین، کە ئەو ئازووقە ڕۆشنبیرییە هەلومەرجی ئەو تازەکردنەوە و تاقیکردنەوەیەی بۆ ڕەخساندووە و ڕێگەی بۆ خۆش کردووە، ئەوە زوو دەگەینە ئەو قەناعەتە کە شێخ نووری چاووگە ڕۆشنبیرییەکەی بەتەنیا ئەدەبی تورکی نەبووە. شێخ نووری لە ناو خێزانەکەی خۆیدا، باوکی وەک ڕۆشنبیری و شیعر هیچ کارتێکردنێکی بەسەرەوە بەجێ نەهێشتووە، لەبەرئەوەش کە خۆی کوڕە گەورەی باوکێتی، هیچ یەکێک لە برایەکانی دیکەشی کارتێکردنیان بەسەر (شێخ نووری)یەوە نییە، بەڵام بەپێی بەدواداچوون و دەمودوو کردنی ئەو کەسانەی خۆم قسەم لەگەڵیاندا کردووە و دەربارەی (شێخ نووری) زانیارییان داومەتێ، ئەوەیان بۆ دەرخستووم کە (بێخود)ی شاعیر وەک خزمێکی نزیکی شێخ نووری، کارتێکردنی بەسەرەوە هەبووە.

وەک دەزانین (بێخود)یش جگە لە شاعیرایەتییەکەی زانایەکی ئاینی گەورەی ئەو سەردەمە بووە. شێخ نووری وەک زۆر لە شاعیرانی ئەو کاتە وەک: (گۆران، بێکەس، عەلی کەمال باپیر ئاغا، ڕەمزی مەلا مارف) و چەندانی دی بەشداری گوێ گرتنی کۆڕ و مەجلیسەکانی بێخودی خاڵی بووە. هەر لەوێ چاوی بۆ دنیای شیعر کردووەتەوە و

بەشاكاری شیعری كلاسیكیمان مەست بووە. دوور نییە شیعرە سەرەتاییەكانی پێش ساڵی (١٩٢٠) كە جارێ لە بەردەستماندا نین، بەچاولێكەری شێوازی كلاسیكی نووسرابن و هەر لەو كاتانە بردبێتییە لای (بێخود) و بۆی سەیر كردبێ. وەك چۆن بەم دواییەش شیعرەكانی بۆ دەخوێندەوە، بێگومان لێرەدا شێخ نووری لە منداڵییەوە شیعری وتبێ -وەك خۆی دەڵێ- لە دروستكردن و پێكەوەنانی چێژی ئەدەبی و ڕۆشنبیری باوی ئەو سەردەمەی لای (بێخود)یشی بەدوور نازانم، بۆیە ئەو سەرەتای بەرچاو ڕۆشنكردنەوەیە هونەری زۆری بۆ مامۆستا (بێخود) دەگەڕێتەوە. شێخ نووری لە حوجرە و مزگەوتدا وەك عادەتی باوی ئەو سەردەمە، لەسەر دەستی چەند مەلایەكی زانا و دانا خوێندنی تەحسیل كردووە، لەوانە: (خواجە فەندی و مەلا سەعیدی زلزلەیی و شێخ بابەعلی تەكیەیی). لەسەر دەستی ئەمانە زمانی (فارسی و توركی و عەرەبی) خوێندووە و فێر بووە و لە كولتووری عەرەبی ئیسلامی قووڵ بووەتەوە و شارەزایی و ئاشنایەتی لەگەڵ هونەرەكانی ڕەوانبێژی و عەرووز پەیدا كردووە. وردە وردە لە پاڵ بەرنامەی خوێندنی (حوجرە) بەو سێ زمانە دەستی داوەتە خوێندنەوە و موتالاكردن، گەلێ زووتریش بە سەرگورشتە و داستان و هەقایەت و پەند و بەیتی فۆلكلۆری و مێژوویی گەلەكەمان مەلاشووی هەڵدراوەتەوە. دوای ئەوەش نابێ ڕۆڵی چایخانەكانی سلێمانی لە بیر بكەین، كە پڕ بوون لە (بەیت بێژ) و (هەقایەت خوان) و (داستان خوێنەوە)، وەك لە شوێنی خۆیدا مامۆستا (ئەحمەد خواجە) ئەوەمان بۆ دەردەخا، كە چۆن لە چایخانەیەكدا یەكتریان ناسیوەتەوە كە شانامەیان تێدا خوێندووەتەوە. كەسێك (وەك خۆی دەڵێ) هەر لە منداڵییەوە دەستی دابێتە شیعر نووسین، دیارە هەر لە زووەوە تامی شیعری كردووە و بەرە بەرە ئەو چەشە و تام كردنەی لە لا گەورە بووە. شیعر نووسینەكەشی وای لێ كردووە تا ساڵی بەرپاكردنی بزووتنەوە تازەكەی مومارەسەیەكی باشی لەگەڵ شیعر نووسیندا هەبێ و هەر لەو كاتانەشەوە لەگەڵ لێكۆڵینەوە و دیراسەتكردنی شیعری شاعیرانی ئەو سەردەمە خەریك بووبێ.

شێخ نووری وەك خوێندەوارێكی زیرەكی سەردەمی خۆی، توانیویەتی بەچێژ و ڕۆشنبیرییەكەی لە كەڵەشاعیرەكانی پێش خۆی ورد ببێتەوە و دەستنیشانیان بكات. ئەوانەی كە لە نزیكەوە لەگەڵ (شێخ نووری)دا ژیاون ئەوە دووپات دەكەنەوە كە زۆرتر خۆی لەگەڵ لوتكە بەرزەكانی شیعری كلاسیكی خەریك كردووە و (نالی) و (مەولەوی) و (مەحوی) زۆر بەگەورە زانیوە.

وەک ئاشکرایە شیعری کوردی پێش ئەوەی لەسەر دەستی (شێخ نووری)دا ڕێگەیەکی نوێ بگرێتە بەر لە ڕەوتی درێژ خایەنیدا چەند ڕاپەڕینێکی دیکەی بەخۆیەوە دیوە، ئێمەش لێرەدا ناتوانین ئەم بزووتنەوە تازەیەی لێ داببڕین، چونکە دەستی گرتووە و ڕێی بۆ ڕووناک کردووەتەوە و زیاتر پێی گەیاندووە. بەر لە هەموو شتێ ماموستای گەورەی شیعر (نالی) توانیویەتی بەحەقیانەت بێتە ڕابەر و ماموستای قوتابخانەی شیعری کوردستانی جنووبی. ئەگەر (نالی) توانیبێتی وەک چۆن لادێنشینەکان لە کاتی پایزاندا کەڵەکە بەرد لەسەر «زەوارەڕێ» و «کۆچەڕێ» و «توولەڕێ»یەکان دابنێن کە دەیانباتەوە ناو ئاوایی بۆ ئەوەی لە زستاندا کاتێ بەفر باری و ئەو «کۆچەڕێ» و «توولەڕێ»یانەی داپۆشی ڕێگاکەیان ون نەکەن. (نالی)یش توانیویەتی نیشانە بۆ شاعیرانی پاش خۆی دابنێ، تا شاعیرەکان ڕێی خۆیان گووم نەکەن. بەڵێ (نالی) ڕچە و ڕێگەیەکی لە شیعردا دیار کرد، هەتا دنیا دنیابێ و کورد مابێ دەبێ بیکاتە بەڵگە و نموونەی مەزنی شیعر و لاف و گەزافی پێوە لێبدا. شاعیرێکی دیکەش کەوا دیارە سەرنجی (شێخ نووری) ڕاکێشاوە و لە مەغز و شێوازی ورد بووەتەوە ئەویش (شێخ ڕەزای تاڵەبانی)یە، (شێخ نووری) لە وتارە ڕەخنەییەکانیدا کە دێتە سەر باسی شێواز دەربارەی (نالی)و (شێخ ڕەزا) دەڵێ: «شێخ ڕەزا بەبەلاغەت و شەعشەعەی ئەلفاز و تەنتەنەی ئاهەنگ، نالی بەدەقیقی ئەفکار و جیناس و نوکتەسەنجی ئەوەندە مەعرووفن کە ئەو کەسەی مەراقی شیعر و ئەدەبیاتی هەبێ و تەتەبوعاتی شیعری کردبێ و شێوازی تەدقیق کردبێ هەر بەخوێندنەوەی شیعریاندا ئەم دوو ئەدیبە دەسبەجێ ئەناسێ»[1].

شێخ نووری لەو وتارەیدا کە بەناوی «لە شێوازدا شەخسییەت» نووسیویەتی و دەڵێ: «شێواز نەزەر بەوەی کە عیبارەتە لەو شکڵە کە ئەدرێ بەئەفکار لە هیچ زەمانێکدا مالیکی ماهییەتێکی موجەڕەد نابێ، بەڵکو لە تەختی تەئسیری ئەو عەلائیقە دایە کە ڕابیتەداری لیسان و ئەدەبیاتن. یەعنی ئەدەبیات چۆن شەخسییە، شێوازیش شەخسییە. چۆن هەر شەخسێ مەخسووسی خۆی زەوقێکی ئەدەبی و تەرزێکی تەجەسوسی و تەنەکوری هەیە، عەینەن مەخسووسی خۆی شێوازیشی هەیە، عەلاقەی شێواز بەشەخسەوە ئەوەندە موهیمە چۆن وتمان بێ ئەوەی ڕووی ڕەفیقەکەت ببینی بەڕۆیشتنیا ئەیناسیتەوە،

---

(١) ڕۆژنامەی ژیان، ژمارە (٤٠)ی سالی(١)، (٢٨)ی ربیع الآخر ١٣٤٥، (١٤)ی تەشرینی دووەم، ١٩٢٦، ئەدەبیاتی کوردی، شێخ نووری شێخ ساڵح.

نووسـینی یەکـێـکیش کـە زۆر خـوێندتەوە قـابیـل نیـیـە تەرزی مـەخـسـووسی بەیانی نەناسـیـتـەوە، لەمـانـە مەقـالەی هەر مـوحـەریرێکت دی بێ ئەوەی کە ئیمزاکەی ببینی، دەسبەجێ ئەیناسیتەوە»[٢].

بەم شـێـوەیە شـێخ نووری لە ئەنجـامی لێکۆڵـینەوەی شـێـوە و ناوەرۆک دەسـتنیـشـانی چەمکی «شێـواز»مان بۆ دەکات کە بە«زۆر خوێندنەوە» لە شێـوازی ئەو کەڵەشاعیرانەی پێش خـۆی ورد بووەتەوە. لەوەوە تێـگەیشـتـووە هەمـوو کەسـێکی خـولـقـێنەر پێـویسـتـە شێوازی خۆی هەبێ، بۆیە هەر لە سەرەتاوە بەدوای شێـوازی خۆیدا گەڕاوە. دیراسەکردنی شـێـوازی شاعـیرانی پێش خـۆی بۆ ئەوە بووە کە ئەو شێـوازەی بۆ خـۆی دەیچنێ، لە هی کەسیان نەکات و نەبێتە لاساییکەرەوەیان. کەواتە شێخ نووری پێش هەموو شتێک لەگەڵ ئەدەبیاتی نەتەوەکەی خۆیدا ژیاوە و هەوڵی لێ وردبوونەوەی داوە.

وەک مـامـۆسـتـا (ڕەفـیـق حیلمی) دەڵێ: «لە شـیـعـری (کلاسـیکی) بەشـێـکی زوبدەی وەرگرتووە وە لە سەلیـقـەی ئەدەبی تۆزێـک فـیـتـری (فطری) و تۆزێکیش ئیرسی (ارثی)ی خـۆی خسـتـووەتە سـەر، ئینجا چاوی بەدەوری خـۆیا گێـڕاوە و شـیـعـری شاعـیرە گەورەکانی تورکی دەوری ژیانەوە و ئیـنقـلابی (عـثـمـانی) بەوردی خـوێندووەتەوە وە باش سـەرنجی داوەتە مـەغـز و شـێـوازی ئەدەبی تازە. بەبێ ئەوەی ئەبلـەق و حـەپەسـاو دامـێنێ دوایان کەوتووە، بەڵام لەم شـوێنکەوتن و پەیڕەوی کـردنەدا لەوانە ناچێ کـە لاسـایی ئەکـەنەوە. بەڵکو شان بەشانی ئەوان ڕۆیشتووە»[٣].

لەم قسانەی مامۆستا (ڕەفیق حیلمی) ئەو چەند ڕاستییەمان بۆ ساغ دەبێتەوە:

**یەکەم:** شێخ نووری دیراسەی تەواوی شیعری کلاسیکی کوردی کردووە و زوبدەی شیعری ئەو قوتابخانەیەی لە ڕاپەڕینە تازەکەیدا فەرامۆش نەکردووە.

**دووەم:** سـەلیـقـەی ئەدەبی تۆزێک فـیـتـری (فطری) و تۆزێکیش ئیـرسی (ارثی)ی خـۆی خسـتـووەتە سـەر. واتە لە شیـعـرەکانیـدا بەهرەی شاعـیرایەتی تێکەڵ بەخـوێندنەوەی بەجێماوەکانی شیعری کوردی کردووە و بەقووڵی میرات (موروث)ی شیعری پێش خـۆی خـوێندووەتەوە، بۆیە دەڵـێ: (خسـتـووەتە سـەر) کە ئەمـەش ئیزافـە و لێ زیاد کردن دەگەیەنێ.

---

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(٣) شیعر و ئەدەبیاتی کوردی. نووسەری: ڕەفیق حیلمی، بەرگی دووەم ل١٩٩.

**سێیەم:** دانەبڕان لە ئەدەبی دەورووپشت بەهۆی ئەو زمانانەی زانیویەتی و پەنجەرەکردنەوە بەسەر ئەدەبی گەلانی دراوسێ. بەتایبەتی ئەدەبی تورکی تازە.

**چوارەم:** سەرنجدانی ئەو ئەدەبە تازەیە و سوود وەرگرتن لە شێوازی شیعرە تازەکان بەڕێگەی (وەرگرتن) و (بەخشین)، کە ئەمەش بۆ خۆی کارێکی زۆر پێویستە بۆ خزمەتی ئەدەبی نەتەوایەتی ڕەسەن و بەپێچەوانەوە ئەم هەنگاوە بەلاساییکردنەوە ناژمێردرێ، ئەوەندەی بەتازەکردنەوەی کەشوهەوای ئەدەبەکەمان دادەنرێ و هەر میللەتێک بیەوێ بەرەو پێشخستنی لایەنی شارستانی و ژیوار هەنگاو بنێ، ناتوانێ ئەم پەنجەرە کردنەوەیە بەسەر تاقیکردنەوەی هەموو گەلان پشتگوێ بخات، چونکە تاقیکردنەوەی هەموو گەلان ئەڵقەیەکی لەیەک دانەپچڕاوە، لە ڕووبەڕووبوونەوەی چارەنووس و پاشەڕۆژی ئادەمیزاد.

**پێنجەم:** تەنکیدکردنی مامۆستا (ڕەفیق حیلمی) لەسەر ئەوەی کە شێخ نووری لەو پەیڕەوی کردن و شوێنکەوتنەدا، لەوانە ناچێ کە لاسایی دەکەنەوە، بەڵکو بەپێی ڕای خۆی- کە ڕایەکەی لە ڕاستییەوە دوور نییە- شان بەشانی ئەوان ڕۆیشتووە. ئەم بیروڕایەی مامۆستا (ڕەفیق حیلمی) ئەوە دەگەیەنێ کە (شێخ نووری) پێش ئەوەی سەرنجی ئەدەبی تازەی تورکی بدات، تێر تێر لە کارێزی شیعر و ئەدەبیات و فۆلکلۆری نەتەوەکەی خواردووەتەوە.

شێخ نووری هەر لەو کاتەی شیعرەکانی (مەولەوی) خوێندووەتەوە، حەزی بەشێوازی کردووە. ئەوەتا خۆی دەڵێ: «نووری لە هەموو شوعەرای کورداندا وردی فیکر و ئیجادی شاعیری شەهیر (مەولەوی) زۆر پەسند ئەکات» ئەم پەسندکردنەی (مەولەوی) لە ناو شاعیرانی کورد لە لایەک زەوق بەرزی شێخ نووری دەگەیەنێ، لە لایەکی دیکەشەوە دیراسەی شێوازەکەی کردووە و لە قوتابخانە تازەکەیدا سوودی لێ وەرگرتووە چ وەک (کێش)و چ وەک هەوێنی (ڕۆمانسییەت). تۆوی ئەو ڕۆمانسییەتەشی هەر لە لا ماوە و ڕێگەی بۆ خۆش کردووە، بۆ تەقینەوەی ئەو حەز و ئارەزووە خنکاوەی ناخی. هەر لەو کاتەوە کە بەهۆی زمانی تورکی ئاگاداری شیعری تازەی تورکی بوو، بەتایبەتی شیعری (جەماعەتی فەجری ئاتی) وەک مامۆستا (ڕەفیق حیلمی) نووسیویەتی: «بەبێ ئەوەی ئەبلەق و حەپەساو دامێنێ دوویان کەوتووە» هۆی ئەوەش هەر ناسینی (مەولەوی)یە پێش ئەدەبی تازەی تورکی.

ڕاستە (شێخ نووری) لە کارتێکردنی ئەدەبی تازەی تورکی بەدوور نەبووە، بەڵام لە

سەرەتاوە (مەولەوی) کارتێکردنی بەسەرەوە بەجێ هێشتووە بۆ سەوز بوونی تۆوی (ڕۆمانسیەت) لە لای. بەر لەوەی لە کارێزی ڕۆمانسییەتی شیعری تورکی بخواتەوە، تینوێتی خۆی لە کارێزی ڕۆمانسیەتەکەی (مەولەوی) شکاندووە. کە (مەولەوی) بەحەقیانەت سەرەتای قۆناغی ڕۆمانتیکە و زۆربەی ڕەگەزەکانی ڕۆمانتیک لە شیعرەکانیدا ڕەگاژۆ بووە. لەگەڵ خوێندنەوەی شیعرەکانی مەولەوی لە لایەن (شێخ نووری)یەوە ئاشنایەتییەکی ڕۆحی لەگەڵدا پەیدا کردووە. لێرەدا لێتوێژەرەوە ناتوانێ یەکسەر (شێخ نووری) بەوە تاوانبار بکات، گوایە قۆپیەی لە شیعری تازەی تورکی کردبێ. شێخ نووری تەواو لە ناو شیعری کوردیدا کولاوە، ئینجا کە زمانی (تورکی) باش زانیوە شاعیرە بەناوبانگەکانی ئەو سەردەمەی تورکی ناسیوە و لەسەر شێوازی جەماعەتی شوعەرای فەجری ئاتی وەستاوە و شیعری شاعیرانی وەک: (نامیق کەمال) و (تۆفیق فیکرەت) و (جەلال ساهیر) و (عەبدولحەق حامید)ی خوێندووەتەوە. لەسەر وەستانەکەی، وردبوونەوەیە لە شێواز و تەرزی نووسینیان. ئەوانەی بەلاساییکردنەوەی دادەنێن، پێویستە کەمێک بەرانبەر بەقسەکەیان خاوەنی لێپرسینەوە بن و هەر قسە نەبێت و بەس، چونکە ئەمە پێوەندیی بە ئەدەبی بەراوردکارییەوە هەیە، بەراوردکردنیش زیاتر پێویستی بەبەڵگە و نموونە هێنانەوە هەیە. لە لای منیش خوێندنەوەی بەرهەمی شاعیرانی گەلانی دەرودراوسێ و سوود وەرگرتن لە تاقیکردنەوەیان کارێکی پێویستە و هەقێکی ڕەوای هەموو شاعیرێکە، بۆ دروست کردنی شەخسییەتی شیعریی خۆی و دۆزینەوەی شێوازی تایبەتی بۆ خۆی، ئینجا بەهۆی زانینی زمانی فارسییەوە خەریکی موتالاکردنی ئەدەبیاتی فارسی بووە و لە ڕێگەی ئەو خوێندنەوەیە، بێجگە لە «گوڵستان و بۆستان» کە لە حوجرەدا دەخوێندرێ، شاعیرە گەورەکانی ناسیوە و لەسەر شێواز و دنیای پەلکەزێڕینەیی هەریەکەیان وەستاوە، لەم شاعیرانە: «کەلیمی هەمەدانی و نیزامی گەنجەوی و فیردەوسی و خەییام و سەعدی و حافز» لە دواییشدا کتێبێکی لەسەریان نووسیوە و بەرهەمی زۆربەی ئەو شاعیرانەی لەو کتێبەیدا وەرگێڕاوە کە جارێ ئەو کتێبە- دەنگی هەیە و ڕەنگی نییە-. لە ئەنجامی ئەو هەموو وردبوونەوە و گەشت و گەڕان و بەدواداچوونەدا، گیانی تازەپەروەری، خۆی بەسەریدا سەپاند و داگیری کرد، بۆیە کەسی (شێخ نووری) بەزەمینەیەکی بەپیت زانی بۆ چرۆ دەرکردن و سەوز بوون و بەرگرتن.

شێخ نووری وەک شاعیرێکی هۆشیار و ڕووناکبیری سەردەم، زانی ناکرێ شاعیر خۆی لاتەریک بگرێ و هەموو دەرگا و پەنجەرەیەک لەسەر خۆی دابخا و بەتەنیا لەسەر ئەزموون

و تاقیکردنەوەی شیعری کوردی ڕانەوەستا، چونکە دەیزانی ئاو و هەوای ژوورەکەی بۆگەن دەکات، بۆیە ڕووی کردە پەنجەرەکان و بەسەر تاقیکردنەوەی گەلانی دەروودراوسێ پەنجەرەکانی کردەوە، بەتێگەیشتنێکی قووڵ لە کێشەی (وەرگرتن و بەخشین)(*). ئەو تاقیکردنەوانەی لە خۆیدا گوشی و چۆڕاندییە ناو تاقیکردنەوەی شیعریی خۆی و سەرەتای ڕاپەڕینی شیعری کوردی نوێمان، لە ئەنجامی ئەو ڕوانین و تێگەیشتنە گزنگی دا. ئەو کارێزە ڕۆشنبیرییانە هەر هەموویان ڕێگەیان بۆ شاعیر خۆش کرد، هەلومەرجی تازەکردنەوەی تێدا دروست بێ و تۆوی تازەبوونەوەی تێدا بڕوێ، شاعیر هەرچەند بەهرەدار بێت، ئەگەر نەتوانێ وەک هەنگ شیلەی گوڵی شاعیرانی دیکە هەڵنەمژێ و سوودیان لێ وەرنەگرێ، ناتوانێ بەبەهرە ڕووتەکە ئەنجامی باش بەدەستەوە بدات، ئەوەتا (پۆل ڤالیری)ی شاعیری گەورەی فەرەنسا دەڵێ: (هیچ شتێ هێندەی هەڵمژینی بیروڕای خەڵک ڕەسەنایەتی نووسەر دەرناخا، شێر تەنها چەند کاوڕێکی هەزم کراوە و هیچی تر)(٤) کەواتە ئەگەر شێخ نووری سوودیشی وەرگرتبێ، ئەو زیاتر تەئکید لەسەر ڕەسەنایەتییەکەی دەکاتەوە لەوەی شتێکی تازەی هێناوەتە ناو ئەدەبی کوردی و بەم کارەشی زیاتر ئەدەبی نەتەوایەتی دەوڵەمەند کردووە.

ئەوەش بەدوور نازانم شێخ نووری لە ژیانی خۆیدا حەزی لە شیعری جەماعەتی (ئەپۆلۆ) و (مەهجەر) کردبێ. شیعرێکی (ئیلیا ئەبوو مازی)یشی کردووە بەکوردی، هەرچەندە شیعرەکە مێژووی بەسەرەوە نییە، تا بزانین کەی وەریگێڕاوە، بەڵام پێ دەچێ لە پاش چلەکانەوە کردبێتی بەکوردی، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ زووتر شیعری ئەمانەی خوێندبێتەوە و ئاگای لێیان بووبێ، بۆیە (شێخ نووری) لەو سەردەمەدا کە هەڵگری (بیری نوێ) بووە و لە هەموو بیروڕایەکی پێشکەوتوانەی سەردەمەکەی خۆی ئاگادار بووە و بەپیر هەموو

---

(*) لە دوای بەچاپ گەیاندنی دیوانی ئەم شاعیرە و لە سایەی بینینی شیعرەکانی شێخ نووری، برای نووسەر کاک ئەحمەد تاقانە کە تورکیزانێکی باشە بەدوو ژمارە لە گۆڤاری ڕامان-ی ژمارە (٤١ - ٤٢)دا بەناوونیشانی (تۆفیق فیکرەت و شاعیرە نوێخوازەکانی کورد) بۆ یەکەم جار بەراوردێکی لە نێوان چەند شیعرێکی شێخ نووری و تۆفیق فیکرەت کرد کە لە دواییدا بەکتێبیش لە چاپی دا. نووسەر هەوڵی داوە زانستییانە و لە ئەنجامی بەراوردکردنی شیعری ئەم دوو شاعیرە ئەم کاریگەرییە ڕوون بکاتەوە.

(٤) ئەدەبی بەراوردکاری - عەزیز گەردی - لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا ١٩٧٨ - ل ٣.

جووڵانەوەیەکی ئەدەبی تازەوە چووە.

هەرچەندە (شێخ نووری) لە زووەوە بەهرەی شیعری تەقیوەتەوە و دەستی داوەتە شیعر نووسین، بەڵام شیعری ئەو قۆناغە سەرەتاییەی سەرجەم بزر بووە و شیعری ساڵانی بیست و سەرووتریش، ئەوەندەی دەرفەتی بۆ لوا بێ و سیاسەتی ئەو سەردەمە ڕێگەی پێ دابێ بڵاوکراونەتەوە، ئەمەش بۆ خۆی زۆر بڕیاری ڕەخنەیی هەڵدەوەشێنێتەوە، چونکە کەسێک لەو تەمەنی منداڵی و مێردمنداڵییەدا ممارەسەی نووسینی شیعری کردبێ، گومانی تێدا نییە شیعرەکانی لەسەر دابونەریتی باوی ئەو سەردەمە نووسیوە، ئەوجا بمانەوێ و نەمانەوێ شیعری ئەو قۆناغە سەرەتاییەی دەبێ مۆرکی لاساییکردنەوەی پێوە دیار بێ. هەرچەندە شیعرەکان لەبەر دەستدا نین، بەڵام شاعیر لەو جۆرە سەرەتایانەوە، بەهرەکەی گەورەش بێت، ناتوانێ بەهۆی پێنەگەیشتنی کەرەستەی دەربڕین و تێڕوانینی شیعری یەکسەر شیعرێکی باڵای دوور لە لاساییکردنەوە بنووسێ، ئەمەش لەبەر کامڵ نەبوون و پێنەگەیشتنی کەرەسەی دەربڕینەکانی.

شاعیر زۆر جار بەرانبەر (دەربڕین)، (لێکدانەوەی دەروون) و (قسەی زمان)ی لە یەکتر دوور دەکەونەوە، بۆیە پەنا دەباتە بەر شاعیرێکی دیکە جوانتر و گەورەتر تەعبیری کردبێ و تینوویێتی کوڵەواریی تەعبیری خۆی پێ دەشکێنێ، لێرەدا شێخ نووری ئەگەر شاعیرێکی لاساییکەرەوەش بێت، ئەوە لەو قۆناغە سەرەتاییەدا لاسایی کردووەتەوە، لە دوای ئەوە بەرەبەرە بەهرەکەی پێگەیاندووە و ڕۆشنبیری شیعری و ممارەسەکردن، کەرەسەکانی زیاتر لە لا پێگەیاندووە. لەو شیعرانەشدا کە دەست ئێمە کەوتوون و لە ڕۆژنامەکانی دوای ساڵانی (١٩٢٠) بڵاوی کردوونەتەوە، ئەوە نەک بەتەنیا دەنگی ڕاستەقینەی شێخ نووری دەبینین و بەشاعیرێکی لاساییکەرەوەی نازانین، بگرە ئەگەر بەچاوێکی مەوزووعیانەوە سەیری بەرهەمی سەرەتایی شاعیرانی دوای خۆی بکەین، ئەوە بۆمان دەردەکەوێ کە هیچیان سەرەتاکەیان لە کارتێکردنی شیعرەکانی (شێخ نووری) دوور نەبووە، ئەم کارتێکردنەش لە وتاری تایبەتی و سەربەخۆدا دەتوانین دەستنیشان بکەین.

خوێندنەوەیەکی وردی ئەو شیعرە سەرەتاییانەی شێخ نووری کە لە ڕۆژنامەی (پێشکەوتن) و (ژیانەوە) و (ڕۆژی کوردستان)دا بڵاوکراونەتەوە، ئەوەمان بۆ دووپات دەکەنەوە کە شاعیرێکە خاوەنی بەهرە و توانایی شاعیریی و دەنگی جیاوازی خۆیەتی. ئەو دەنگە لە شیعری کوردیدا نییە و لاسایی هیچ شاعیرێکی نەکردووەتەوە لەگەڵ ئەو

ڕایەی (د. کامیل بەسیر)یش یەک ناگرمەوە کە نووسیویەتی: (لە هیچ سەرچاوەیەکی بێگانە بەگشتی و تورکی بەتایبەتی کەرەسەی بەرپاکردنی بزووتنەوەکەی بەچنگ نەهێناوە)[٥] چونکە وەک ڕوونم کردەوە موتروبەکردنی ئەدەبی نەتەوایەتی و سوود وەرگرتن لە سەرچاوەی بێگانە بەخەوش ناژمێردرێ، با لەگەڵ ئەو ڕایەشی بم کە دەڵێ: (هۆشیارانە هەستی بەمۆری لاساییکردنەوە لە هۆنراوەی دێرینی کوریدا کردووە و ئاگای لە هۆیەکانی بووە و ڕێگای تازەکردنەوەی زانیوە و مەبەستی هونەری و ناوەڕۆکی لەم تازەکردنەوەیەی دەستنیشان کردووە و ئەمجا بڕیاری بزووتنەوەکەی داوە)[٦].

لە ساڵی (١٩٢٠)دا کە بەسەرەتای تازەبوونەوەکە دانراوە چوار دانە شیعری (شێخ نووری)مان لەبەر دەستە کە ئەویش لە ڕۆژنامەی (پێشکەوتن)ی ساڵی (١٩٢٠)دا بڵاوکراونەتەوە. ئەو کاتەش تەمەنی (٢٤) ساڵ بووە، ناچێتە عەقڵەوە (شێخ نووری) پێش ئەو تەمەنە بێ بەرهەم بووبێ. وەک خۆشی دەڵێ: (زۆر منداڵ بووە کە شیعری وتووە). کەوا بوو بەرهەمی منداڵی و مێردمنداڵی و لاوێتییەکەی تا دەگاتە تەمەنی (٢٤) سالان لەناوچووە. وەک دەردەکەوێ کولتووری عەرەبی ئیسلامی، بەهۆی خوێندنی لە حوجرە کە خوێندنی باوی ئەو سەردەمە بووە و قووڵبوونەوە لە ناو ئەو کولتوورە، وای کردووە وەک ئیشارەت پێدان ئەم ڕۆشنبیرییە لە شیعرەکانی شێخ نووری دەرکەوێ، هەندێ جاریش تەمێکی سۆفییانە بەتەنکی لەسەر ڕووی شیعرەکانیدا خۆی بنوێنێ، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە (خوێندنەوە) کۆکردنەوەی زانیاری و ڕۆشنبیری نەبووە لە لای، بەڵکو لەگەڵ ئەو ڕۆشنبیرییە تێکەڵ بووە و بەقووڵی چووەتە بنجوبناوانی و کردوویەتی بەبەشێک لە تێڕوانین و تاقیکردنەوەی شیعریی خۆی، وەک لەم چوارینەیەدا ئەم تەمە سۆفییانەیە دەبینین:

نوورێکە کە دیدە، حەددی بینینی نییە
ئاگر لە بەرابەری ئاوا تینی نییە
زەڕڕاتی سیفاتی زاتی پڕ کەون و مەکان
نابینرێ بەدیدەیە، کە دوور بینی نییە

---

(٥) شێخ نووری شێخ سالح لە کۆڕی لێکۆڵینەوەی وێژەیی و ڕەخنەسازیدا - د. کامیل حەسەن عەزیز بەسیر- لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری عیراق (دەستەی کورد) بەغدا، ١٩٨٠ ل٨٤ .

(٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٨٤.

شێخ نووری وەک لە کاریگەری کولتووری ئیسلامی دوور نەبووە، عەقیدەی ئاینیشی بەهێز بووە. شیعرەکانی لە گەڕان بەدوای پاکێتی و باسی مردن و عەدەم و گۆڕ و دوورکەوتنەوە لە خۆشییە ساتەوەختییەکانی ژیان و جیهانە ماددییەکەی و ڕواڵەتە خەڵەتێنەکانی بێبەش نەبووە!

ئەمەش بۆی هەیە دیوێکی دیکەشی هەبێ کە لێرەدا وەک پەنجەنوما کردن دەیخەینە ڕوو، ئەو دیوەش ئەوەیە: زۆر جار ڕووکردنە نووسینی ئەو جۆرە شیعرانە لە ئەنجامی هەڵچوون و داچوونی ئەو شاعیرانەوە سەرهەڵدەدا کە لە ژیانیاندا ڕوو دەکەنە لەزەتی دنیایی. وەک دەزانین شێخ نووری لە ژیانیدا مەیخۆریش بووە، عەقیدەی ئاینیشی تێدا بووە، ڕەچاوکردنی لایەنە ئاینییەکە بۆ ئەوەیە ئۆخژن و ئارامی بەدەروونی خۆی بدا، چونکە لەزەتی دنیایی بەلای خۆیەوە، لەزەتێکی لە ناوچوو و ڕاگوزارە، بەڵام ئەم جۆرە شیعرانە (هیوای) پێ دەدەن.

بەهەرحاڵ شارەزایی و ئاگاداری شێخ نووری لە مێژوو و فۆلکلۆر و ئەدەبی نەتەوەکەی، یان خوێندن و دیراسەکردنی کولتووری عەرەبی ئیسلامی و شارەزایی پەیداکردنی لە مەسەلەی عەرووز و هونەرەکانی ڕەوانبێژی، ڕێگەی لێناگرێ پەنجەرە بەسەر ئەدەب و ڕۆشنبیری بێگاناندا بکاتەوە، بەتایبەتیش بۆ کەسێک کە حەز لە فێربوون بکات و زمانی گەلانی دەوروپشت بزانێ. لەبەرئەوەیە شێخ نووری تا مردووە دەستبەرداری ڕۆشنبیری گەلانی دراوسێ و دنیا نەبووە و لێیان دانەبڕاوە و بەبەردەوامی لەگەڵ ڕۆشنبیری ئەو گەلانەدا ژیاوە و پەیتا پەیتا ئەو بەرهەمەی بەدڵی بووبێ وەریگێڕاوە. لە ئەنجامی ئەو ڕۆشنبیرییە فراوانەی (شێخ نووری) توانی زمانێکی تازە، بۆ قۆناغێکی تازە لە ژیانی میللەتەکەماندا بدۆزێتەوە و پێی بنووسێ. ئەو تازە بوونەوەیەش وەک ڕوونم کردەوە ڕەگوڕیشەی هەیە و بەتەنیا (ئەدەبی تورکی تازە) نییە، بەڵکو پێش ئەوە لەسەر شانی (مەولەوی) و (نالی) دەستی پێ کردووە کە لە ناو بەهرە و ڕۆشنبیرییەکەیدا شوێنی تایبەتی بۆ تەرخان کردبوون. ئینجا ڕۆشنبیری شێخ نووری لە حوجرە و خوێندنی لەسەر دەستی کۆمەڵێ مەلای زانای ئەو سەردەمە و لە پاشان ڕووکردنە خوێندنەوەی ئەدەبی تورکی و فارسی و تەنانەت (مەهجەر) و (ئەپۆلۆ)ش بەشێوەیەکی کەم یا زۆر جێی سەرنجی شێخ نووری بووە، ئینجا (لەسەر ئوسووڵی غەرب) شیعری وتووە وەک خۆی نووسیویەتی. ئەم ڕایەش بۆ خۆی دەیسەلمێنی کە تاقە سەرچاوەی تازەبوونەوەکەی (ئەدەب و ڕۆشنبیری تورکی) نەبووە، بەڵکو ئەدەبی تورکی تازەش لە ژێر کاریگەری ئەدەبی تازە و

ڕاپەڕینی شیعری ئەورووپی شیعری خۆیان تازەکردووەتەوە و کۆمەڵێ شاعیری نوێخوازی تورک جەماعەتی (دیوان) و (شوعەرای فەجری ئاتی)یان پێکەوە ناوە. بەدووری نابینم (شێخ نووری) بەهۆی شارەزایی لە زمانی تورکیدا، جگە لە شاعیرانی تورک ئاگای لە ئەدەب و شیعری ئەورووپاش بووبێ و بیروڕای ڕەخنەیی ڕۆشنبیرەکانیانی خوێندبێتەوە. ئەمانە تێکڕا بنەمای تازە بوونەوەیان لە لای دروست کردبێ. لەم دوو بەشەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ، تازەبوونەوە لەسەر دەستی شێخ نووری تەنیا کاریگەری ئەدەبی تورکی تازە نەیهێنایە ناومانەوە، بەڵکو کۆمەڵێ هۆی خودی و مەوزووعی لە پشتی بوون و بوونە سەرچاوەی دامەزراندنی سەرەتای شیعری کوردی تازەبەخشمان!.



بۆنەی ژنهێنانی شێخ قادری حەفید – ١٩٢٢

وەستاوەکان: قادر ئاغای حاجی مەلا سەعید، عەبدولقادر سەعید (قالەی ئایشەخان)، ساڵح زەکی ساحێبقڕان، عیززەت بەگی وەسمان پاشا، سەیید نووری نەقیب، محەمەد ئاغای ئاوڕەحمان ئاغا، شێخ محەمەدی گوڵانی.

دانیشتووی ڕیزی دووەم: ئەحمەد موختار جاف؟، حەمەسەعید بەگی حەمەڕەشید بەگ؟، فایەق کاکەمین.

دانیشتووی ڕیزی یەکەم: عەبدوڵڵا عادیل ئەفەندی، شێخ نووری شێخ ساڵح، عەبدوڵڵا عەونی، شێخ محێدینی شێخ ڕەشید.

# شێخ نووری شاعیری ئەزموون

شێخ نووری شاعیرێکی داهێنەر و نوێخوازە، ڕۆشنبیرییەکەی هیچی لە داهێنانەکەی کەمتر نییە، ئەگەر زۆر بالاتر نەبێت. ئەو ڕۆشنبیرییەی شێخ نووری لە شیعر نووسین و بەردەوامبووندا هەناسەی درێژ کردووە. ئەگەر شاعیری چاک بریتی بێت لە (بەهرە + ڕۆشنبیری + ئەزموون و مەشقکردن لە نووسینی شیعر) ئەوە شێخ نووری زۆر لەو ڕەگەزانەوە نزیکە، چونکە ئەویش شاعیرێکە توانست و بەهرەی لەگەڵ ڕۆشنبیری و خوێندنەوە و هەوڵی خۆ پێگەیاندن گونجاندووە، تا توانیویەتی (خەیاڵ)ی شاعیرێکی بەدەسەڵاتی دەسکەوێ و بەڕوانینێکی فراوان و هەمە لایەنەوە بڕوانێتە ژیان و لە گۆشەنیگای بۆچوون و خەیاڵی خولقێنەرانەی خۆیەوە سەیری بکات، ئەمە حەقیقەتێکە ئەگەر لە چەند شیعرێکیشیدا هاتبێتە دی، کەس ناتوانێ لاری لێ هەبێ، یان گومان لە بەهرە و توانایی و بەخششی بکات.

شێخ نووری ناوی شاعیرێکە لە ناو دەیان شاعیردا لێکۆڵینەوە و قەڵەمی زانستی لە بەرانبەریدا دەبێ بوەستێ، لەبەرئەوەی سەرەتای ڕاپەڕینێکی گەورە و تەکانێکی بەهێزی شیعری کوردی ناوچەی سولەیمانی پێ دەستنیشان دەکرێت. ساڵێک بەر لەوەی شێخ نووری ئەو سەرەتایە دابنێ، ڕاپەڕینێکی سیاسی لە سەرتاپای کوردستاندا دەستی پێکرد و بۆ یەکەمین جار دەرگای هەڵمەت و هێرش بردنی چەکداریی بۆ گەلی عیراق لە تێکۆشانی جەماوەریدا خستە سەر گازەرای پشت. وەک لە شوێنێکی دیکەی ئەو کتێبەمان وتمان، ئەو ڕاپەڕینە بووە هۆی هەڵتەکاندنی کۆمەڵێ بنەمای سیاسی و کۆمەلایەتی و کۆمەڵێ بنەمای تازە جێگەیان گرتنەوە. هۆی سەرەکی ئەو ڕاپەڕینە جەماوەرییە و هۆشیاربوونەوەی خەڵکی بوو لە کوردستان، چونکە هەستی نەتەوایەتی زیاتر لە لایان چەکەرەی کردبوو و هەستیان بەچەوسانەوە و ژێردەستەیی خۆیان دەکرد. ئەمەش لە سایەی ئەو گۆڕانە بنەڕەتییانەوە بوو کە سەرپاکی جیهانی گرتەوەو لە زۆر لاوە خەباتکردن لە پێناوی سەربەخۆیی و یەکسانی و مافی ڕەوای ئەو میللەتانە هاتە کایەوە. ئامانجی زۆربەی ئەو شۆڕشانەش لە جەوهەردا یەکی دەگرتەوە و دەبوونە یەک زنجیرەی لە یەک دانەپچڕاو لە خەباتی هاوبەشیاندا بۆ دەرچوون لە چنگی ئیمپریالیزم و داگیرکەران، کە خەریکی ژێردەستە کردن و دەستەمۆ کردنی ئەو گەلانە بوون. شۆڕشی ڕزگاریخوازانەی

گەلانیش لە جەوهەردا دەستنیشانکردن و ڕەنگ ڕشتنی چارەنووسی خۆیان بوون بەدەستی خۆیان. کوردیش یەکێک بوو لەو نەتەوانە، کە لە چارەکی یەکەمی ئەو سەدەیەدا کەوتە خەبات بۆ ئەو مەبەستە و قوربانیدان لە پێناویدا. سەرەتای ئەو سالانەی کە دەولەتی عوسمانی ئەژنۆی دادا و لەپەورووکەوت و میللەتانی سەر بەئیمپراتۆریەتەکەیان کەوتنە خۆیان، تا ئەوە بوو خۆیان و هاوپەیمانەکانیان جەنگەکەیان دۆڕاند.

لە سالی (١٩١٧) ئینگلیز هاتە عیراق، بەهاتنی ئەوان گەلانی عیراق بەگشتی و کورد بەتایبەتی زوو لە فاک و فیکیان گەیشتن، بۆیە وەک «د. ن کوتلۆف» مێژوونووسی بەناوبانگی ڕووسی نووسیویەتی: «گەلی کورد بەوەی کە لە ڕاپەڕینی ١٩١٨-١٩١٩ دا پێشەنگی جوولانەوەی گەلی عیراق بوو نەخشێکی گرنگی لە ئامادەکردنی ڕاپەڕینی سالی (١٩٢٠)ی عیراقدا دیاری کرد». هەر لەو کاتەوە ڕاپەڕینی جەماوەری بەسەرۆکایەتی ڕابەری بزووتنەوە (شێخ مەحموود)ی نەمر دژی دەسەلاتی داگیرکەرانی تازە دەستی پێکرد، شیعری کوردیش کەوتە تەکاندنی ئەو تەپوتۆزەی چەند سال بوو بەبالایەوە نیشتبوو، بزووتنەوەکەش لەسەر دەستی یەکێک لە موونەوەرەکانی ئەو سەردەمە چاوی بۆ ژیان کردەوە، کە ئەو موونەوەرە لە نزیکەوە ئاگای لە باری سیاسی و کۆمەلایەتی و ڕۆشنبیری میللەتەکەی خۆی و دەوروپشتەکەی بوو، ئەوە بوو شێخ نووری دەستپێشخەری کرد لە نووسینی شیعری تازە و لە لاپەڕە تازەکانی ئەو مێژووە تازەیەدا جێگەی شیاوی بۆ کردەوە.

میللەتی کورد هەر لە ڕێگای زانینی زمانی تورکییەوە ئاگاداری بزووتنەوەی سیاسیی و نەتەوەیی گەلان نەبوون، موونەوەرەکان هەر لەو دەلاقەیەوە لەسەر تاقیکردنەوەی شیعری تورکی وەستان و تام و بۆ و هەناسەی شیعری هەندەرانیشیان هەر لە پەنجەرەی ئەو زمانەوە بۆ هات. شێخ نووری وەک نووسیویەتی: «ئەوی ئینقیلابی بەسەر ئەدەبیاتی کوردیدا هێناوە و لەسەر ئوسوولی غەرب شیعری وتووە، نوورییە». بێگومان شیعری تورکیش لە ژێر کارتێکردنی ڕاپەڕینەکانی شیعری ئەورووپا، شیعری خۆیان تازە کردەوە، بەشێکی زۆری ئەو شیعرە تازانە و بیروڕا ڕەخنەییەکانیان کردووە بەتورکی، ئەوانیش ورد ورد کەوتوونەتە خوێندنەوەیان و سوودیان لەو تەوژمە تازەیە وەرگرتووە. شیعری کوردیش بەپێی ئەو بارودۆخەی بۆی ڕەخسابوو، بەهۆی (شێخ نووری) خوێنی تازە کرایە ناو دەمارەکانییەوە.

هۆی سەرەکی سەپاندنی ئەم بزووتنەوەیە بۆ ئەمان و رووخانی ئەو کۆڵەگانە دەگەڕێتەوە، کە لە رووی سیاسی و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری کۆمەڵی کوردەواری پێوە بەند بوو، رووخانی ئەم کۆڵەگانەش خۆ ڕانەگرتنیانە لە بەردەم تەوژم و شاڵاوی ئەو بزووتنەوە تازەیە. ئەم بزووتنەوە سیاسییە تازەیەی لە کوردستانی عیراقدا بەرپا بوو لە خۆیەوە سەری هەڵنەدا، بەڵکو بەهۆی کۆمەڵێ بارودۆخی مەوزووعی و خۆیی هاتنە گۆڕێ، ئەویش لە لای خۆیەوە کارێکی وای کرد کە شیعری کۆڵەگەیی- کلاسیکی خۆی لە بەردەم ئەو ڕاتەکان و هەژانە قووڵ و گەورەیە ڕانەگرێ، بگرە ئەویش وەک چەکێکی خەباتکردن و گەورەکردن و هەڵایسانی زیاتری (مەسەلە) نەتەوەییەکە ڕژایە ناو رووباری خەباتی سیاسی و هەر لەوەوە ئەزموونی شیعری تازە کەوتەوە، بەڵام لەسەر دەستی کەسێک کە هەلومەرجی ئەو تازەکردنەوەیەی تێدا بوو، تا بتوانێ ڕۆشنبیری باوی ئەو سەردەمە ڕەت بکاتەوە و بەشێوەیەکی تازەتر لە ئامانج و چەمکی شیعر تێ بگات.

ڕاستییەکەی تا ئێستاکە لەبەر نەنووسینی مێژووی نووسینی شیعرەکانی شێخ نووری، یان بەهۆی دەست نەکەوتنی کۆمەڵێک شیعری دیکەی ئەو شاعیرە، نەمتوانی لە خۆمەوە یەکەم شیعری شێخ نووری دەستنیشان بکەم کە لەسەر ڕێچکەی تازە نووسیویەتی، چونکە بەپێی ئاگاداری ئێمە شێخ نووری بەرهەمێکی ئێجگار زۆری فەوتاوە، وەک خۆشی دەریخستووە (زۆر منداڵ بووە کە شیعری وتووە) ئەم ڕاستییەش بۆ خۆی بەڵگەیە کە ژمارەیەکی زۆر لە شیعرە سەرەتاییەکانی گووم بوون یان دەست ئێمە نەکەوتوون. ئەمەش بۆ نووسینی رەخنە و لێکۆڵینەوە، بڕیارە ڕەخنەییەکان بەدرشتی و ناکاملی دەهێڵێتەوە. لە لایەکی دیکەوە پشتگوێ خستنی مێژووی نووسینی شیعرەکان وامان لێ دەکات نەتوانین هێڵی بەیانیی پێشکەوتن و دواکەوتنی شیعری شێخ نووری دەستنیشان بکەین، بەپێچەوانەی مامۆستا (گۆران)ـەوە کە وەک لە پێشەکی دیوانەکەیدا نووسراوە: «ئێمە پێ بزانین گۆران شیعری بلاونەکراوەی زۆر کەمە، هەرچیی وتووە لە گۆڤار و ڕۆژنامە کوردییەکانی دەرەوە و ناوەوەی عیراقدا بلاوکراوەتەوە»[1].

شێخ نووری وەک ئینسان و وەک شاعیر شێر و خەتی پارەیەکن و ناتوانین لە یەکیان جودا بکەینەوە، واتە ژیانی لە ناو شیعرەکانیدا، شیعرەکانیشی لە ژیانیدا هاوکێشەیەک

(١) دیوانی گۆران- سەرجەمی بەرهەمی گۆران- بەرگی یەکەم- ١٩٨٠ بەغدا، چاپخانەی کۆڕی عیراق- لە بلاوکراوەکانی یەکێتی نووسەرانی کورد ل م.

پێکدەهێنن. ژیانی خۆشی چەندان لاپەڕەی ژیانی میللەتەکەی و ئەو سەردەمەیە کە تێیدا ژیاوە. شاعیر لە سەردەمێکدا ژیاوە و چاوی هۆشی کردووەتەوە، کە کارتێکردنێکی زۆری لەسەر ژیان و بەرهەمی بەجێ هێشتووە. ئەو کارتێکردنەش هەر هەمان کارتێکردنە بەسەر گەلی کوردماندا، بەڵام لە لای کەسێکی وەک ئەم کە چەکی شیعری بەدەست بووە، هەوڵی داوە ئەو ژیانە بکات بەبەشێک لە شیعرەکانی و بیگوشێتە ناو بەرهەمەکانی و ببێتە هەوێنێک بۆیان. ئەو ڕووداوانە بەشێکی گرنگ لە ئەزموونی شیعریی شێخ نووری پێکدەهێنن و بوونەتە بەشێک لە تێڕوانین و بوون و خودی ئەو، بەرەنگاربوونەوەی ئەو ڕووداو و سەردەمەی تێیدا ژیا، وای لێ کرد ببێ بەشاعیری (ئەزموون- تجربة)، بۆیە دەتوانم بڵێم ئەزموونی شێخ نووری بێجگە لە چاووگە ڕۆشنبیرییەکانی بینی پێوە ناون و سوودی لێ وەرگرتوون، بەهرەی شاعیرایەتی و خوێندنەوە و ئەزموونێکی زیندوو، کەسایەتی شیعریی شێخ نووری پێکدەهێنن، کە ئەزموونەکەی لە ژیانی خۆی و دەورپشتەکەی وەرگرتووە، وەک کەسێک کە لە ناو ڕووداوەکاندا ژیابێ و بەچاوی شاعیرێکی هۆشیار و بەدەسەڵات لە شیعردا بەرجەستەیانی کردبێ و بەهۆی ئەزموونی ژیانە تایبەتییەکەی، ئەزموونە شیعرییەکەی خۆی دەوڵەمەند کردووە و نەیویستووە وەک شاعیرێکی سەر بەمیللەت لە ئەزموونەکانی ژیان دابیبڕێت و لەسەنگەری گەلەکەی بچێتە دەرەوە، هەر ئەوەش وای لێ کردم ناوی بنێم شاعیری ئەزموون.

شێخ نووری تەنیا پشتی بەئەزموونی ناو کتێب نەبەستووە، کە ئەم جۆرە ئەزموونانە، زیاتر ئەزموونی زیهنین و ڕووی لە ڕۆشنبیری ناو کتێبە و پشتی لە واقیع و کەرەسەکانیەتی، چونکە ئەو لەگەڵ هەموو ئازار و ئاواتێکی میللەتەکەی بووە. لە بورجێکی بەرزەوە سەیری ژیانی نەکردووە و بۆی نەڕوانیوە. هەوڵی بەردەوامی داوە ئاسۆی فراوان لە بەردەم شیعرەکانیدا بکاتەوە و بدۆزێتەوە، ئەمەش بەهۆی بەستنەوەی بەرهەمەکانی بەڕووداو و بەسەرهات و خەباتی میللەتەکەیەوە بووە. ئەزموونی ژیانی گەلەکەی لە ناو بیر و ناخ و ویژدانیدا جێگەی خۆی گرتووە، بەمەش توانیویەتی بەشیعری ڕەسەن و ڕاستگۆیانەوە گوزارشت لەو خەون و خولیا و ئاواتانە بکات.

شێخ نووری شاعیرێکی (کسبی) نەبووە، شیعر نووسینی لە ئەنجامی خوێندنەوە دەسکەوتبێ، یان هاتبێ شەڕی پێ فرۆشتبێ و زۆری لە خۆی کردبێ شیعر دابنێ، بەڵکو شیعر لە کانگای دڵییەوە هەڵقووڵاوە و لە ناخی دەروونییەوە هەڵچووە و بەخوڕی دایڕشتووە، شاعیرێکی شیعر سوار و بەدەسەڵات بووە، بەرانبەر بەوشە و تەعبیر دانەماوە

و شیعر لە دڵییەوە قەڵبەزەی داوە و ئەم سیفەتە زاتییەی تەرخان کردووە بۆ ژیانی گەلەکەی و دڵی شیعری هەر بۆ ئەو مەسەلەیەی میللەتەکەی لێی داوە. تا دوا هەناسەی شیعر لە ویژدانیدا ماوەتەوە و ئاگری شیعر لە دڵیدا نەکوژاوەتەوە و ئاوی ڕۆژگاریش نەیتوانی پشکۆی شیعر لە دڵ و دەروونیدا بکوژێنێتەوە. بەدی کردنی ئەم لایەنەش لە شیعرەکانی شێخ نووری وا لە لێتوێژەرەوە دەکات پانتاییەکی زۆر لە نووسینەکانی بۆ لایەنی (ڕیالیزم ) لە شیعری ئەو شاعیرەدا تەرخان بکات. هەتا میللەت فەرهەنگەکەی وشەی (نا)ی تێدا بێت لە بەخشش و داهێنان ناکەوێ. تا داهێنان بەپێوە بوەستێ، گۆڕان و شۆڕش و میللەت بەردەوامن و بەپێوە دەوەستن و ئەزموونەکانیان تێکەڵی ئەزموونە شارستانییەکانی ئادەمیزاد دەکەن. ئەو ئینقیلابەی شێخ نووری لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا گێڕای و سەرکردایەتی کرد، بەپێوە وەستان و زیندوویێتی ئەم میللەتە نەبەزەیە کە هەرچەند لە ژێر چنگی وەیشوومەکانی ڕۆژگار ڕزگاری نەبووە، بەڵام میللەتێکە لە بەخشش نەکەوتووە.

شێخ نووری بەتەنگ پێداویستییە نەتەوایەتی و شارستانییەکانی ئەم چاخەوە چووە، بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەو ڕاپەڕینە سیاسییە، بتوانێ بەهۆی داهێنان و ڕۆشنبیری، خۆی لە گیانی سەردەمەکەی نزیک بکاتەوە، تا شیعرێک بڵێ بەقەدەر ئەوەی خزمەتی ئێستای دەکات، ئەوەندەش لە دەرگای داهاتوو بدات و خۆی لە جوولانەوەی مێژوو دانەبڕێ، بۆیە زۆر زیرەکانە لە مەنتیقی پێشکەوتن و گۆڕانی کۆمەڵ و سەردەمەکەی گەیشتووە، ئینجا توانیویەتی تێکەڵی ببێ و پاڵپشتی بکات. بەڕوانینی تازە و جۆرە دەربڕینێکی تازەترەوە ئەو تێگەیشتنەی خۆی خستە ڕوو. هەوڵی دا لە نیشتمانی داهێنان و کاتی داهێنان و تازەیی دانەبڕێ، چونکە دەیزانی بزووتنەوەی مێژوو دەیداتە دواوە. لە دواییدا چووە ناو ئەو نیشتمانە و زەفەری پێ برد، لە ئەنجامی تێگەیشتن لە جەدەلی مێژوو، توانی ڕابردوو تێپەڕێنێ و تازەبوونەوە بگرێتە باوەش، کە ئەو جەدەلە بێ سنوورە دەیسەپێنێ. شێخ نووری لە زمانی سەردەمی خۆی نەگەیشتبێ هەرگیز نەیدەتوانی بەدەنگ ئەو داوایەوە بچێت!.

قەبارەی بوونی میللەتێک کە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ڕوو لە گەورە بوون دەکات بەهۆی ئەوەیە کە ئەو میللەتانە بەزمانی تازە گوزارشت لە سەردەمی خۆیان دەکەن. میللەتێک دان بەبوونی زمانێکی تازەدا نەنێ بۆ ئەوەی ڕەنگی چارەنووس و مەسەلەکەی خۆی پێ بڕێژێ و خەون و ئاواتەکانی پێ بنووسێ، ئەو میللەتە ڕوو لە نەمان و قڕ تێکەوتنە. شێخ نووری

هەستی بە هەموو ئەمانە کردووە، بۆیە داوایەکانی ئەو قۆناغەی بە ئەمانەتەوە بەجێ هێناوە. ئەو زمانە تازەیەی شێخ نووری خەونی کوردی پێ تۆمار کرد، زمانێکە خوێنی چارەنووسی خۆی دەدا، چونکە زمانی داهاتوو و پاشەڕۆژە. زمانی ڕابردوو نییە، شتەکانی پێ گێرە بکاتەوە. ئەو زمانەش نییە لە وڵاتێکی دیکەوە قەرز کرابێ و خوازرابێتەوە، بەجۆرێ وەک ڕەشەبایەک ڕەگوڕیشە و ڕەسەنایەتی ئەوی هەڵکەندبێ، ئەگەر زۆر کەسیش هەبن ئەمە وا تێبگەن، من تازەبوونەوەکەی شێخ نووری بەحەڵاڵ زادە دەزانم، چونکە زادەی واقیعێکی دیاریکراوی سەردەمێکی ژیانی کوردە و لە واقیعی شیعری کوردی دانەبڕاوە.

ساتوسەوای شێخ نووری لەگەڵ شیعری تازە، ساتوسەوای خوێنەرێکی هۆشیاری سەردەمە کە بەقەدەر ئەوەی شت وەردەگرن، ئەوەندەش هەست دەکەن کەوا پێویستە شت بدەن و بەخششیان هەبێت. ئەمەش دیاردەیەکی شارستانی چاکە و هیچ ڕەخنە و گلەییەک قبووڵ ناکات. ئەم شاعیرە ڕۆشنبیرە زوو دەرکی بەوە کرد شێوەی شیعری تازە، پێویستی بەڕوانینی تازەیە بۆ ژیان و بوون و مرۆڤ. من لە لای خۆمەوە لەگەڵ ئەوەدا نیم «تازەکردنەوە» تەنیا لە شێوەدا بەرپا بێت، ئەگەر لە پێش هەموو شتێکەوە ڕوانینی شاعیرەکە نەگۆڕێ و ئەو ڕوانینە بەهۆی ڕۆشنبیرییەوە لە ڕەگەوە هەڵنەتەکێ، ئەوەتا شێخ نووری خۆشی لەو بڕوایە دایە کە ڕوونکردنەوەی ئەو بزووتنەوەیە ئەرک و پەیامی «تەجەددودپەروەرەکانمان»ە و دەڵێ : (لە پێشەوە ڕجا ئەکەم ئەم قسەیە کە ئەیکەم، حەملی نەکەنە سەر خود فرۆشی. «هێنانە وجوودی ریسالەیەکی ئەدەبیی کوردی لەسەر شانی ئەدیب و تەجەددودپەروەرەکانمان بەلزوومێکی قەتعی ئەزانم» حاشا سومە حاشا من ناڵێم ئەدبیم، من ناڵێم شاعیرم، بەڵام لەبەرئەوەی لە منداڵیمەوە فیکرم ئیشتیغالی لەگەڵ ئەدەبیاتدا بووە بەتەتەبوعات نەختێ شارەزاییم هەیە وە ئەم شارەزاییییە دائیمەن سەوقی ئەوەی کردووم کە لەم عیلمەدا کە هێشتا بەزمانی کوردی نەنووسراوەتەوە ریسالەیەک تەئلیف و تەبع بکەم. مەعەل تەئەسوف وەزعییەتی خسوسییەم و دەست نەکەوتنی شیعری شاعیرە کۆن و تازەکانمان بوو بەئەسبابی تەئەخوری ئەم تەشەبوسە خێرە)[2] ئەم قسەیەی شێخ نووری کە سەرەتایەکە بۆ ڕۆژنامەی (ژیان)ی نووسیوە، کۆمەڵێ لایەنی جۆربەجۆری

(٢) ڕۆژنامەی ژیان، ژمارە (٢٠)ی ساڵی (١) (١٩)ی ذی العقدة ١٣٤٤، (١٠)ی حوزەیران ١٩٢٦ (بۆ دائیرەی عالیەی ژیان تەقەیە).

تێدایە کە ئێمە لە شوێنی دیکەدا دەستنیشانمان کردووە و لێرەدا لەم چەند نوقتەیەدا خەستیان دەکەینەوە:

**یەکەم:** گرتنە ئەستۆی پەیامێکی شارستانی، کە ئەم پەیامە تا ئەو کاتە بەو شێوەیە کەس بۆی نەچووبووە مەیدان و خۆ لە قەرەدانی شێخ نووری بۆ ئەم بابەتە تازەیە، هەستکردنی ڕۆشنبیرێکی شارستانییە بە پێویستی ئەم لکە لە ئەدەبەکەماندا کە کاتی هاتبوو دەربارەی بنووسرێ.

**دووەم:** نیشاندانی بێ فیزی و تەوازوع لە لایەن (شێخ نووری)یەوە کە ئەم سیفەتەش وەک سێبەرەکەی لێی جیانەبووەتەوە تا ڕۆژی مردنی، ڕەنگە هەر ئەم لایەنەش بێت لە ژیانی، کە حەزی لە خۆ بردنە پێشەوە و هەڵپەکردن نەکردووە، پایە و پلەی شایانی خۆی وەرنەگرێ. ئەوەتا خۆی دەڵێ: «من ناڵێم ئەدیبیم، من ناڵێم شاعیرم» ئەمەش سیفەتی هەموو ئەدیبێکە بەگەورەیی لە پەیامە شارستانی و مێژووییەکەی سەرشانی خۆی گەیشتبێ.

**سێیەم:** شێخ نووری هەر لە منداڵییەوە لەگەڵ هونەری شیعر و ئەدەبیاتدا خەریک بووە و «ئیشتیغالی» کردووە، ئەمەش شارەزایی تەواوی لە لا دروست کردووە و ئەو خیبرە دوورودرێژە هەلومەرجی ئەوەی تێدا دروست کردووە خۆی لە قەرەی ئەو کارە بدات.

**چوارەم:** خوێندنەوە و ڕۆشنبیری شێخ نووری و شوێن پێ هەڵگرتنی ڕۆشنبیری سەردەم کە وەک خۆی دەڵێ: (بەتەتەبوعات) ئەو شارەزاییەی فێر کردووە لە پاڵ مەشق کردنی خۆی بۆ هونەری شیعر.

**پێنجەم:** ڕووکردنی ئەم شاعیرە بۆ چەند لایەنێکی ڕۆشنبیری جۆراوجۆر و مشوور خواردنی بۆ پڕکردنەوەی کەلەبەرەکانی لە ئەدەبەکەماندا، ئەم پەل هاوێشتنەش بۆ لایەنە ڕۆشنبیرییەکان وای کردووە بەتەنیا خۆی تەرخان نەکات بۆ شیعر.

**شەشەم:** ڕووی دەمی کردووەتە «ئەدیبە تەجەدودپەروەرەکان»و بە پێویستییەکی گەورەی زانیوە ئەم ئەدیبانە پەیامەکەیان بەجێ بگەیەنن و ئەم ئەرکە ڕاپەڕێنن، چونکە نووسین دەربارەی ئەم لایەنە لە زمانی کوردیدا نییە.

**حەوتەم:** شێخ نووری زووتر بیری لەم مەسەلەیە کردووەتەوە، واتە پێش ساڵی (١٩٢٦) و (١٩٢٧) کە وتارە ڕەخنەییەکانی تێدا بڵاو کردووەتەوە، بەڵام لەبەر «وەزعی

تایبەتی» خۆی و نەبوونی کەرەستەی تەواو بۆ ئەم ئیشە کە «شیعری شاعیرە کۆن و تازەکانە» ئەم پرۆژەیەی دوا خستووە.

شێخ نووری بەر لەوەی دەست بداتە «تازەکردنەوە» هەستی بەوە کردووە، شیعری کوردی پێویستی بەتەکانێکە، بەڵام پرۆژە ڕەخنەییەکەی پێش کاری تازەبوونەوەکە نەخستووە، دواخستنی ئەم زنجیرە وتارە ڕەخنەییە زیاتر لە بەرژەوەندی بزووتنەوە تازەکە بووە، چونکە لە ساڵی (١٩٢٦-١٩٢٧)دا کە دەستی کرد بەبڵاوکردنەوەیان، (تنظیرات)ەکەی لەسەر بۆشایی دانەنابوو، بەڵکو کۆمەڵێک بەرهەمی شیعریی نووسیبوو کە نوێنەری تازەبوونەوەکە بوون و بوونە نموونەی پراکتیکی بۆ ڕا و بۆچوونەکانی.

# سیمایەکانی قوتابخانەی شیعری نوێ

لەم بەشەدا پێویستە ئەو خاڵانە بخەینەوە بەرچاو کە بەبنەمای شیعری تازە دەناسرێن و سیمای ئەو قوتابخانەیان ڕشتووە و ئەم سیمایانەش لە شیعری کلاسیکی جیای دەکەنەوە. یان بە(یاخیبوون) و هەڵگەڕانەوە لەسەر دابونەریت و دەستوور و یاسایەکانی دەژمێردرێن. زۆربەی ئەو خاڵانەش کە من لێرەدا پەنجەیان بۆ ڕادەکێشم و دەیانخەمەوە بیرتان، لەو بڕوایەش دام شیعری تازە لەسەر دەستی شێخ نووری بەشێکی زۆری ئەم خاڵانەی تێدا بەدی دەکرێت، لە دواییشدا لەسەر دەستی شاعیرێکی وەک مامۆستا (گۆران) پەرەی پێ درا و جێگیر کرا و بەفراوانی لە ناو خوێنەراندا شوێنی خۆی کردەوە و خوێنەری زیاتر باوەشیان بۆ کردەوە و لێی کۆبوونەوە. ئەو خاڵانەی لێرەدا بەرچاویان دەخەین زۆربەمان ڕامان لەسەری یەک دەگرێتەوە. هەر ئەو لایەنانە کە باسیان لێوە دەکەین دەتوانرێ بکرێنە کەرەستەی تێروتەسەل بۆ لێتوێژینەوەی جیا جیا لەسەر ئەو شاعیرانەی ئەو قۆناغە شیعرییە تازەیەیان دروست کرد و جێگیر کرد و تەنانەت لە ژێر ڕۆشنایی ئەو خاڵانەوە دەتوانرێ بزانین هەریەکە لەو شاعیرانە ئەو خاڵانەی دەیخەینە ڕوو کامیان زیاتر تێیدا ئامانجی پێکاوە. لەگەڵ ئەو بەباڵابڕینە نابێ ئەوەمان لە بیر بچێت کە مەسەلەی (مێژوو)ی ئەنجامدانی هەر کارێک نرخی خۆی هەیە، بۆیە پێویستە هەنگاو بەهەنگاو بەپێی مێژووی نووسینی شیعرەکان بڕیاری ڕەخنەیی بدرێ و هەر شتە ببرێتەوە لای خانەی خۆیەوە.

یەکێک لە هەنگاوەکانی ئەم بزووتنەوە تازەیە دروستکردنی هاوکێشەی نێوان (شێوە و ناوەڕۆک)ـە. شێخ نووری ویستی شیعر بخاتە باوەشی ژیانەوە و لەوێوە چاو هەڵبێنێ، بۆیە ئاڵۆز بوونی ژیان و گەورە بوونی (مەسەلە)ی نەتەوەکەی و بەیەکداچوونی ڕووداوەکانی سەردەمەکەی کارێکی وایان لە شێخ نووری کرد، بەدوای بەرگێکی تازەدا بگەڕێ بۆ ئەوەی خۆی لە زەخرەفە دوور بخاتەوە و بۆ ئەو ناوەڕۆکە تازانە شێوەیەکی گونجاو هەڵبژێرێ، تا بتوانێ لە جووتکردنی ئەم لایەنی (شێوە و ناوەڕۆک)ـە شێوازێکی تازە بدۆزێتەوە، بەرێچکە و شێوازێکی جیاوازتر لە جاران شیعر بنووسێ. بەڕوانینێکی تازەی هونەری و فیکری سەیری شیعری کردووە، هەر ئەو ڕوانینە وای لێ کرد بەدوای سستمی دەربڕینی تازەدا بگەڕێ، بۆ دۆزینەوەی شێوازی تایبەتی خۆی. شێخ نووری کە

هەوڵی دا هاوکێشەی نێوان شێوە و ناوەڕۆک ڕابگرێ و هیچیان لەسەر حیسابی ئەوەکەی دیکەیان بەرز نەبێتەوە، شاعیرێکی دەستە وەستان نەبوو، تا بڵێین بەهونەرەکانی شیعری کلاسیکی نەوێراوە و لە ناچاریدا شیعری تازەی نووسیبێ، بەڵکو تێڕوانین و بیری گەورە و فراوانی بەدوای شێوەی دەربڕینی سووک و ئاسانتردا گەڕاوە. بەلای منەوە شێخ نووری تەنیا شێوەیەکی تازەی لە داڕشتن و دەربڕینی شیعرەکانیدا پەیڕەو نەکردووە، بەڵکو لە پاڵ ئەو شێوەیەشدا کۆمەڵێ بابەتی تازەشی بۆ شیعری کوردی هێنایە پێشەوە، کە لەمەو پێشتر لە دەرگای ئەو بابەتانە نەدرابوو، ئەم ئەو بابەتانەی خستە بەرگێکی هونەری و بەکەشوهەوایەکی نوێ، شیعری کوردی گۆش و متوربە کرد.

شێخ نووری بەڕاستگۆییەوە بەدوای ژیاندا گەڕاوە و لەگەڵ خۆی ڕاستگۆ بووە، شیعرەکانی کە بریتین لە ئەزموونی ژیانی خۆی و سەردەمەکەی و ڕۆشنبیری و خوێندنەوە جۆر بەجۆرەکانی، ئەمانەش بەبابەتی تازە ئاشنایان کردووە. ئەگەر شیعری کلاسیکی بریتی بێت لە (سەنعەتسازی) و زیاتر بایەخ بەشێوەی شیعر بدات، ئەوە شیعری هاوچەرخ لەسەر دەستی (شێخ نووری)دا وازی لە جادووی ئەو جۆرە سەنعەتسازییە هێناوە کە تەنیا بایەخ بە شێوە دەدات لەسەر حیسابی ناوەڕۆک. ئەگەر بایەخیشی بە سەنعەتسازی دابێ، ئەوە لەگەڵ ناوەڕۆکەکەیدا گونجاندوویەتی، لە کاتێکدا ئەو گونجاندنە شێوەی گوتنی ناوەڕۆکەکە و ئەو گۆشەنیگایەی لێیەوە سەیری ناوەڕۆکی کردووە دەستی کردووە و سازاندوویەتی، شێخ نووری نەیتوانیوە خۆی لەو هەموو بیرە تازانە دابڕێ کە پەیدا بوون و بەیەکداچوون و ڕۆژ لە دوای ڕۆژیش بەیەکا چووتر دەبوون، بۆیە بەدوای شێوەی تەعبیر کردنی ئاساندا دەگەڕا، تا دەرەقەتی ئەو بیرە زۆر و زەوەندانە بێت و لە شیعردا دەستەمۆیان بکات. ئەم شۆڕشە شیعرییە گۆڕانی (جەوهەر)ـە و سەپاندنی گۆڕینی شێوەی دەربڕینە و گەڕانە بەدوای شێوەی دەربڕینی ئاسانتردا، تا بتوانێ زەفەر بە ئاڵۆزی ئەو بیرە تازانە ببات. وەک بڵێی لەو کاتەدا پێش ئەوەی (ژان کۆکتۆ) ئەو قسەیە بکات، ئەویش بڕوای وا بووبێ (شێواز دەربڕینی شتی ئاڵۆز و بەیەکا چووە بەشێوەی ئاسان و سادە و ڕەوان، نەک دەربڕینی شتی سادە و ساکار بێت بەشێوەی ئاڵۆز و پڕ گرێ و گۆڵ). شێخ نووری ئەوەی سەلماندووە و کاری پێ کردووە، چونکە نەیویستووە وەک شیعری کلاسیکی بیری بچووک و تەنک لە ناو زەخرەفەدا حەشار بدات، ئەوەشی سەلماند کە شیعری هاوچەرخ ئەوەندەی سەنعەتسازی و هونەرە، ئەوەندەش (بیرسازی)یە لە پاڵ تازە کردنەوەی هەموو کەرەستەکانی دەربڕین (کێش و ئاواز و وشە و وێنە).

بەلای منەوە ئەو بزووتنەوە تازەیە تەعبیرکردنە لە جەوهەری ژیان و بەئەدەبێکی ڕەسەنی دەزانم، خوازراوە و تەقلیدی نییە، ئەگەر سوودیشی لە ئەدەبی گەلانی دراوسێ وەرگرتبێ، لە بەخششی خۆیدا دەستەپاچە نەوەستاوە، لەو بڕوایەشدا نیم ئەدەبی ناڕەسەن و لامێژ تەمەنی درێژ بێت، چونکە وەک هەر جۆگەلەیەکی بچووک لە زستاندا دروست دەبێت، بەڵام لە هاویندا وشک دەکا.

بۆ ئەوەی بەتەواوی ئەم لایەنە بەپێی بۆچوونی شێخ نووری خۆی ڕوون ببێتەوە، خوێنەریش بگاتە قەناعەتێک کە ئەو شاعیرە لەخۆڕا ئەم هەنگاوەی نەگەیاندووەتە ئەنجام دەڵێ: «لێرەدا نوقتەیەک هەیە تەعریفی لازمە. لەم ئەسەرانەدا کە ئێمە تەدقیقمان کرد ئەو هەیەجانەی کە بۆ ئینسان حاسڵ ئەبێ لەوە ناچێ کە بەڕێگایەکدا بڕۆی و پارە یاخود شتێکی چاک بدۆزیتەوەو مەمنوون ببی. یا لە وەختی برسیەتیدا تەعامێکی خۆش بخۆی، کەوا بوو لە بەینی ئەم دوو هەیەجانەدا کە ئێمە حسی ئەکەین فەرق زۆرە. وەک ئیزاحمان کرد لەوحەیەک، بینایەکی زەریف هەیکەلێکی ماهیرانەمان کە تەماشا کرد، مۆسیقێک یاخود (قصە)یەکی جوانمان کە بیست، یا وەزعێکی موئەسرمان تەماشا وەیا حیکایەتێکی فاجیعمان کە ئیستیماع کرد، ئەو هەیەجانەی کە بۆ ئێمە پەیدا دەبێ بۆ ئەوەی لەگەڵ حسیاتی حەیواندا تەفریق بکرێ پێی دەڵێن هەیەجانی بەدیعی، عەجەبا هەموو ڕەسمێ، هەموو (قصە)یەک، هەموو هەیکەلێک، هەموو مۆسیقێک حەز و هەیەجانێکی بەدیعی لە ئێمەدا حاسڵ دەکا؟ نەخێر... ئەو منداڵانەی کەوا بە قەڵەمێکی فەرەنگی یا تەباشیرێک چ لە دیوار و چ لەسەر تەختە ڕەسمی حەیوان و ئینسان و شتی تر ئەکێشن لەمەدا جوانی و تەڕاوەتێکی وای تێدایە کە لە ڕووحی ئێمەدا حەز (حظ) و مەمنوونییەتێک حاسڵ بکا؟ نە ٫... کەوابوو هەموو قسەیەکیش هەیەجانی بەدیعی حاسڵ ناکات. مەسەلەن ئەچم بۆ مەکتەب، ئەم قسەیە بۆ ئێمە هەیەجانێکی بەدیعی حاسڵ ئەکا نەخێر... یاخود لە مەوسمی زستاندا لە وەقتی بەفر بارینا منداڵان لە بەفر (شێرە بەفرینە) یەعنی ئەنواعی ڕەسم و هەیکەل دروست ئەکەن، عەجەبا حەز و مەمنوونییەتێکی بەدیعی بۆ ئێمە حاسڵ ئەکا؟! نەخێر... یاخود شەخسێک کە بەفەننی مۆسیقا بێگانە بێ، هەر لە خۆیەوە دەست بداتە عوود وە یا کەمانێک و لێبدا، عەجەبا تەئسیرێکی مەعنەوی، حسێکی بەدیعی بەئێمە ئەگەیەنێ؟ نەخێر... کەوا بوو لەم وەسائیتی موختەلیفەیەدا کە حیسابمان کرد، ئەوەی کە لە ڕووحی ئێمەدا حەزێکی بەدیعی حاسڵ بکا، ئەوەیە کە لە دەستی ساحیبی مەهارەتێک و سنعەتکارێک دەربچێ. یەعنی هەموو وەقتێک ئەوەی کە

هەیەجانێک بۆ ئێمە حاسڵ ئەکا ڕەسم و مۆسیقا نییە، بەڵکو ئەو سنعەت و مەهارەتەیە کە قیمەت ئەدا بەمانە. کەوا بوو میسالێکی تر بهێنینەوە، بەڵام ئەم میساڵە بۆ ڕەسم نەبێ بۆ ئەلغاز بێ. ١- کاسبی پیاو ئەژێنێ. ٢- زەحمەت، ڕەحمەت ئەهێنێ. مەعنای ئەم دوو جوملەیە ئەگەر تەحلیل بکرێ، هەردووکیان زۆر نزیکی یەکن، ئەتوانم بڵێم عەینی یەکترین. بەڵام میسالی ڕاست و ڕەوان مەقسەدەکە ئیفاو بەیان ئەکا. میسالی دووەمیان، بۆ ئەوەی کە کاسبی پیاو بەخێو ئەکا و ئەیژێنێ بەجوملەیەکی جوان و ئەدەبی نیشان بدرێ، هێناویانە جوملەی (زەحمەت، ڕەحمەت ئەهێنێ)یان وتووە، ئەمجا دیقەت بکە بزانە لە ئیفادەی میسالی ئەوەلدا حەزێکی بەدیعی تیا نییە کە ئینسان مەمنوون بکا مەسەلەن (دوو کەڕەت چوار هەشت) ئەم جوملەیە هەر چەند ئیخباری حەقیقەتێک ئەکا، بەڵام حەز و مەمنوونیەتێک حاسڵ ناکا، میسالی ئەوەلیش وایە، فەقەت تەماشای میسالی دووەم بکەین ئەم جوملەیە، جوملەیەکی سادە نییە، بەڵکو پێچوپەنای زۆری تیایە چونکە (زەحمەت، ڕەحمەت ئەهێنێ) هەرچەند زاهیرەن جوملەیەکی تەزادە، بەڵام ئیفادەی حەقیقەتە بەتەرزێکی جوان و مەعنادار. یەعنی ئینسان کە ئیختیاری سەعی و زەحمەتی کرد، فەیز و ڕەحمەت دەسگیری ئەبێ. بێ زەحمەت ئیسراحەت تەئمین ناکرێ، بێ هەوڵدان پیاو دەوڵەمەند نابێ، بێ خوێندن پیاو عالم نابێ، خولاسە هەزار مەعنای حەقیقی لێ ئەدۆزرێتەوە»[٣] لێرەدا دەتوانین مەبەستی (شێخ نووری) لەم چەند خاڵەدا کۆ بکەینەوە:

**یەکەم:** (هەیەجانی بەدیعی) کە بەزاراوەی ڕەخنەی ئەمڕۆکە (اثارة الحس الجمالي) ورووژاندنی هەستی هونەری و جوانی دەگرێتەوە بە ڕێگەی هەڵچوونەوە کە لە ئەنجامی خوێندنەوەی شیعرێکدا، یان گوێ گرتن لە پارچە مۆسیقایەک، بینینی بینایەک پەیدا دەبێ و جیاوازی هەیە لەو هەستە خۆشەی لای مرۆڤێک دروست دەبێت لە ئەنجامی (پارە دۆزینەوە) یان لەو هەستەی کە لە کاتی برسێتیدا دێتە ئەنجام کاتێ (تەعامێکی خۆش بخۆی)، ئینجا جیاوازی نێوان هەستی مرۆڤ و ئاژەڵ بەو (هەیەجانی بەدیعی)یە ڕادەگرێ. ئەوەش مانای وایە شێخ نووری شیعری لە نێوان هونەر و دروستکردنی ئەو (هەیەجانە)ی بەرپای دەکات

(٣) ڕۆژنامەی ژیان، ژمارە (٢٠)ی سالی (١)، (١٩)ی ذي القعدة ١٣٤٤، (١٠)ی حوزەیران (١٩٢٦)، هەروەها ژمارە (٢١)ی ڕۆژنامەی (ژیان)ی سالی (١)ی (٦)ی الحجة ١٣٤٤، (١٧)ی حوزەیران (١٩٢٦).

دانەبڕیوە، ئەگەر بڕواشی بەوە بووبێ بەشیعر پەیامێک بگەیەنێ لایەنە (جوانی) و (هونەری)یەکەی شیعری فەرامۆش نەکردووە.

**دووەم:** شێخ نووری نموونەی زۆری هێناوەتەوە تا بیسەلمێنێ هەموو شیعرێک، مۆسیقایەک، قصەیەک، (هەیەجانی بەدیعی) دروست ناکات، تەنیا کەسانێک دەتوانن ئەو جۆرە بەرهەمە بدەن بەدەستەوە کە هونەرمەند بن (سنعەت و مەهارەت)یان تێدا بێت، کە ئەو (سنعەت و مەهارەت)ەی شێخ نووری باسی لێوە دەکات، هەموو هەلومەرجەکانی وەستایی و شارەزایی و کارامەیی و هونەرمەندێتی دەگرێتەوە. بۆیەش سەرکەوتوویی و گەورەیی هونەرەکە بەڕادەی زۆری ئەو (هەیەجانە بەدیعی)یە دەکێشێ و نرخی بۆ دادەنێ.

**سێیەم:** بەرهەمێک بتوانێ (هەستی جوانی و هونەری) بورووژێنێ، واتە (هەیەجانی بەدیعی) دەبێت لەو بەرهەمەدا کە بە وشە تەعبیری کردووە، تەنیا وشەکە نەبێتە هۆیەک بۆ ڕاگەیاندنی ئەو بابەتە، چونکە لەو دوو نموونەیەی هێناویەتییەوە، تەئکید لەسەر ئەوە دەکات کە شیعر نابێ ڕاستەوخۆ و رووکەش و ڕاپۆرت ئاسایی (تقریر)ی بێت و ڕاگەیاندنی بابەتەکە لەسەر حیسابی لایەنە هونەرییەکە بێت. بەو نموونەیەش کە دەڵێ: (دووکەرەت چوار، هەشت) دەیسەلمێنێ کە حەقیقەتی هونەریی جیاوازی زۆرە لەگەڵ ئەو حەقیقەتە واقیعییەی کە هەموومان پێی ئاشناین و لەبەر دەستمانە و دەیزانین، بەمەش ویستوویەتی بەرهەمی هونەری لە شتی ڕۆژانە و سەرپێیی جیا بکاتەوە.

شێخ نووری جارێکی دیکە دەگەڕێتەوە سەر مەسەلەی (شێوە و ناوەڕۆک) و ئەم جارەیان بەشێوەیەکی روونتر دەڵێ: «ئەساسی ئەدەبیات جوانییە، یەعنی لیباسێکی جوان بدرێ بەمەعنایەک و ئەساسی مەنتقیش ڕاستییە. لە تەئلیفی ئەسەرێکی ئەدەبیدا ئەو نوقتەیەی کە لازمە دیققەتی لێ بکرێ لە ڕووحدا تەحسیلی هەیەجانی بەدیعییە، فەقەت بۆ ئەوەی کە قسەیەک موافقی مەنتیق بێ لازمە لە نوقتەی حەقیقەت تەجاوز نەکرێ»(٤)

لێرەدا شێخ نووری کە دەڵێ: «لیباسێکی جوان بدرێ بەمەعنایەک» مەبەستی وایە بڵێت نە (لیباسە جوان)ـەکە بەبێ (مەعنا) هیچ بەهیچ دەکات و نە (مەعنا) کە

---

(٤) ڕۆژنامەی ژیان، ژمارە (٢٤)ی ساڵی (١)، (١٤)ی موحەرەم (١٣٤٥)، (١٥)ی تەمووز (١٩٢٦).

ناوەرۆک دەگـەیەنێ بەبێ (لیبـاسـێکی جـوان) کـاریگەریی خـۆی دروست دەکـات، بۆ (تەحـسیلی هەیەجانی بەدیعی) واتە پێکەوە نە گونجاندنی ئەو لایەنە کـار ناکاتە سەر هەستی هونەری و جوانی خوێنەر. ئینجا کە دەڵێ: «کە قسـەیەک موافـقی مەنتـیق بێ لازمە لە نوقتەی حەقیقەت تەجاوز نەکرێ» تەواو دەیەوێ شیعر لە زێدەڕۆیی و (پێ لێ هەڵبڕین- موبالەغە) ڕزگار بکات کە یەکێکە لە خاسیەتەکانی شیعری کلاسیکی و هەوڵ دەدات هونەرەکـەی بکاتە هۆیەک بۆ گـەڕان و سـۆراغکردن بەدوای (حـەقـیـقـەت) و نزیکبوونەوە لێی، تا بتوانێ وەک ڕۆشنبیر و شاعـیرێکی سەردەم و قۆناغە ناسکەکەی میللەتەکەی پێیدا ڕەت دەبوو، ببێ بەکـوڕی ئەو سەردەمە و بەتەنگ داوایەکـانییەوە بچێت، ئینجا پاش ئەوەی زانیمان شێخ نووری نەک تەنیا بەشیعر، بەڵکو بەنووسینیش هەوڵی داوە بەزاراوەی ڕەخنەیی هاوچەرخ بۆ شیعری تازە بێتە مەیدان، ئینجا دێتە سەر لایەنێکی گـرنگی دیکە کـە پێـوەندی بەشـێـوە و نـاوەرۆکـەوە نەپچـڕاوە، ئەو لایەنەش سستمی دەربڕینە (نظام التعبير).

شاعیر کە توانی بەلێزانی و کارامەیی پێوەندی نێوان (شێوە و ناوەرۆک) تێبگات، مانای وایە دەتوانێ کەسایەتی تایبەتی بۆ خۆی دیاری بکات، چونکە سستمی دەربڕینی تایبەتی خۆی هەیە کە ئەو سستمی دەربڕینەش وەک خۆی دەڵێ: «ئەدەبیات سەعی بۆ ئەوە دەکا کە تەزاهوراتی کوناوکونی حەیات بەسورەتێ کە دیویەتی یا تێگەیشتووە تەسویر و شکلێکی بەدیعی و جوانی بدەیتێ»[٥] شێخ نووری کە دەڵێ: «بەسورەتێ کە دیویەتی یا تێگەیشـتـووە، تەسویر و شکلێکی بەدیعی و جـوانی بداتێ» کـتـومت ئەو پێناسەیە دەگـونجێ (سـسـتـمی دەربڕین)ی پێ تەعـریف بکەین، چونکە (سـسـتـمی دەربڕین) لە ئەنجامی ئەو گۆشە نیگایەوە دروست دەبێ کە ڕوانین و تێگەیشتنی داهێنەرەکە بۆ ژیان و شتەکان دروستی دەکات. بێگومان ئەمەشیان خاسیەتێکی ئیبداعییە و هەموو کەسێک ناتوانێ ببێ بەخاوەنی (سستمی تەعبیرکردن)ی تایبەت بەخۆی تا بتوانێ بەتۆڕی وشە ئەو تەونە بچنێ کە تێڕوانینی تایبەتی خۆی بۆ ژیان ڕەپێشی دەکات. بەپێی ئەم بۆچوونە، شێخ نووری شـاعـیـرێکە بەوپەڕی هۆشـیـارییـەوە ئەو هەنگاوەی ناوە بۆ ئەوەی بیکاتە یەکێک لە سیمایەکانی شیعری تازە. لە لایەکی تریشەوە بۆ ئەوەی نەبێتە نوسخەیەکی کاربۆنیی یەکێک لە شاعیرەکانی پێش خۆی، لەسەر مەسەلەی (چۆنیەتی وتنی بابەتەکە

(٥) ڕۆژنامەی ژیان، ژمارە (٢٤)ی ساڵی (١)ی تەممووز، (١٩٢٦).

و جۆری بینین و دەربڕینەکەی) ڕادەوەستێ. جارێکی دی شێخ نووری ڕای خۆی دەردەبڕێ و دەڵێ: «ئەدەبیات شەخسییە، یەعنی بەنیسبەت شەخسەوە ئەتوانن نیشانی بدەن. فەقەت عیلم و فەن غێر شەخسییە. حەقایقی علمییە و فەنییە هیچ زمانێکی ئەشخاس تەبەدولی ناکات. دوو کەڕەت دوو لە هەموو وەقتێکدا بۆ هەموو کەسێک هەر چوار ئەکات»[٦].

شێخ نووری لێرەدا دەیەوێ بڵێت (بابەت) هەر بابەتە، بەڵام هەر کەسێک بەپێی شێواز و بۆچوون و تێڕوانینی خۆی ئەو (بابەتە) نیشان دەدات، چونکە مەسەلەی (داهێنان) کارێکی زاتییە وەک چۆن پەنجەمۆری کەس لە کەس ناکات، بەم جۆرەش داهێنانی دوو داهێنەریش لێکتر جیاوازن، لەبەرئەوەی ئەو دوو داهێنەرە هەریەکەیان شێوازی خۆیان هەیە. (شێوازی)یش دیسان هەر ئەنجامی تێگەیشتنی وردی ئەو هاوکێشەیە دەگەیەنێ کە «شێوە و ناوەڕۆک» بەیەکەوە دەبەستێتەوە و «لە ڕووحی قاریئیندا تەئسیرێکی مەعنەوی حاسڵ دەکات» لەم تێکەڵ بوونە گیانی بەگیانی و دەسلەملانەی نێوان شێوە و ناوەڕۆک شیعری تازە (یەکێتی بابەتی)[٧] بۆ شیعری کوردی دەستەبەر کرد کە تا ئەو کاتە شیعر زیاتر لەگەڵ (مانای بەیت) خەریک بوو، هەر ئەوە لە لای شاعیری کلاسیکی هونەر بوو شاعیر بتوانێ لە شیعرێکدا زیاتر لە چەند بابەتێک کۆبکاتەوە و هەریەکە لەو بابەتانە لە بەیتێکدا دەربخات. لە شیعری کلاسیکی چەند قەسیدەیەکی (نالی) و (مەولەوی) توانیویانە (یەکێتی بابەت) بۆ شیعر بەدەست بهێنن، بەڵام ئەوە نەبووە بەڕێچکە و ڕێبازێک و تا سەر پەیڕەو بکرێت. لە زاراوەی ڕەخنەیی جیهاندا لای (هۆراس)یش (البقعة الارجوانیة - پەڵەی ئەرخەوانی) لەجیاتی (معنی البیت) بەکار هاتووە، کەچی لەسەر دەستی شێخ نووری شیعر دەستبەرداری ئەو مانای بەیتە هات و وازی لە کەڵەکە کردنی چەند بابەتێک لە شیعر هێنا و کەوتە ئەوەی بابەتێک فۆرمێکی گونجاوی بۆ هەڵبژێرێ و بابەتەکە لەگەڵ فۆرمەکە یەکێتییەکی عوزوی لە نێوانیاندا هەبێ. هەروەها لە چەند شیعرێکدا ڕەگەزی چیرۆکیشی خستووەتە ناو شیعر تا زیاتر ئەو (یەکێتی بابەت)ـە بچەسپێنێ، لەو شیعرانەشدا کە شێخ نووری تێیدا پەیڕەوی (یەکێتی قافیە)ی کردووە، ڕووی لە (یەکێتی بابەت) وەرنەگێڕاوە. لێرەدا (یەکێتی بابەت) هەوڵدانە بۆ

---

(٦) ڕۆژنامەی ژیان، ژمارە (٢٥)ی ساڵی(١)، (١)ی موحەڕەم ١٣٤٥ (٢٢)ی تەمووز، ١٩٢٦ .
(٧) مامۆستا (گۆران)یش لە چاوپێکەوتنەکەیدا (یەکێتی بابەت)ی بەداهێنانی شیعری نوێ داناوە.

دروستکردنی مەرکەزییەت لە شیعردا و خۆ ڕزگار کردنە لە شتی لابەلایی و پەل هاویشتن بۆ شتی وا کە خزمەتی ساختمانی شیعرەکە نەکات. واتە وەک لە شیعری کلاسیکیدا دەبینین شیعر وەک ئاوێک وایە پلووکە بەردێک فڕێ دەدەینە ناو ئاوەکە بازنە دروست دەکات و ئەو بازنانە گەورە دەکات، بەڵام لە شیعری تازەماندا شێخ نووری هەوڵی داوە ئەو بازنانە بەرەو ناو یەکتر بچنەوە و لە یەکتر کۆببنەوە و مەوزووعەکە چڕ بکەنەوە و قووڵتری بکەن.

بایەخدان بە(یەکێتی بابەت) هەوڵێکە بۆ دروستکردنی ساختمانێکی توند و تۆڵ و بەهێز، کە لە ناو خۆیدا بەشەکانی ئەو ساختمانە پێکدەهێنن و پێوەندییەکی پتەو لە نێوانیاندا هەبێ، چونکە تا ئەو کاتە شیعری کۆڵەگەیی- کلاسیکی لەبەرئەوەی پشتی بە(یەکێتی مانای بەیتەکان) دەبەست، بۆیە شیعر ساختمانی نەبوو. هەر دێرێک یا جاری وا هەیە دوو بەیتیش لە شیعرێکی کلاسیکی دەربهێنی کاری لە مەعنای شیعرەکە نەدەکرد، بەڵام بزووتنەوەی شیعری تازە بەهۆی یەکگرتنی بەشەکانی شیعرەکە، بەلابردنی هەر بەشێکی کار دەکاتە سەر شلۆق کردنی و هەندێک جار ڕووخاندنی ساختمانەکەی. من ناڵێم شێخ نووری لەم کارە سەرەتاییەدا سەد دەرسەد سەرکەوتووە، چونکە ناکرێ شاعیر وا زوو خۆی لە کارتێکردنی شیعری کلاسیکی ڕزگار بکات، کە ئەویش ساختمانەکەی لە یەکتر داپچڕاوە و کەرت کەرت و سەربەخۆیە. دیسانەوە زاڵبوونیش بەسەر دروستکردنی ساختمانێکی تەواو لە شیعری تازەدا کارێکی ئەوەندە ئاسان نییە. شێخ نووری لەم بارەیەوە لە وتارێکی ڕەخنەییدا نووسیویەتی: «بۆ نووسینی شتێکی ئەدەبیی یاخود عادی لە پێش هەموو شتێکدا ڕیعایەت کردنی بەعزێ ئەساسات لازمە، ئەم ئەساساتە قسمەن لە پێش نووسینا بەعزەن لە ئەسنای نووسینا لازمە بەدیقەت تەماشا بکرێ لە وەقتی نووسینا ئەو ئەساسانەی کە ڕیعایەتیان لازمە ئەمانەن:

١- وەحدەت ٢- ئیجاد ٣- تەرتیب. وەحدەت، مەوزووعێکت بەدەستەوەیە کە بینووسی لە پێش هەموو شتێکدا لازمە دیقەت لەوە بکەیت کە خەلەل بەوەحدەتی مەوزووعەکەت نەگات. لە دنیادا هیچ مەوزووعێک نییە لەگەڵ هەموو مەوزووعێکی تردا دوور و نزیک بەچەند تاقم و عەلائیق و ڕەوابیتەوە محتەوا نەبێ. بینائەن عەلەیهی لە وەقتێکا کە مەوزووعێکت نووسی لە پێش هەموو شتێکدا لازمە حدوودی بۆ تەعین بکەی و لەو حدوودە نەچیتە دەرەوە، بۆ ئەوەی زۆر چاک تێبگەین، لازمە میسالێک بهێنینەوە. ئەتەوێ محارەبەیەک تەسویر بکەی، ئەسڵی مەقسەد ئەوەیە کە محارەبەکە لە

چ ئەحوالێکدا وقووعی بووە وە بەچ سورەتێک نەتیجەی هاتووە. لە وەقتی نووسینا جارێ بازێک ئەدەی بۆ بەحسی تۆپ کە چۆن ئیستیعمال کراوە و بەمەش ئیکتیفاء ناکەیت بەتول و تەفسیل بەحس لە ئەعمالی تۆپ و فابریقەکەی ئەکەی وە بەکوللی حدوودی مەوزووعەکە کەم ئەکەی»[8]. کەواتە شێخ نووری ئەم هەنگاوەی بەهەڕەمەیی نەناوە، بەڵکو لە پاش وردبوونەوە و تێگەیشتن و دیراسە کردن گەیشتووەتە ئەو قەناعەتە، بۆ ئەوەی بتوانێ (خەلەل بەوەحدەتی مەوزووعەکەی) نەگات و ئەو بابەتەی کە ویستی بۆ شیعر دەستەمۆی بکات لە پێوەندییە لابەلا و پەلوپۆدارەکانی دووری بخاتەوە و لە کرۆکی ئەو بابەتە دەرنەچێ. مامۆستا (گۆران)یش کە شێخ نووری بەسەرۆکی ئەو بزووتنەوەیە ناو دەبات دەڵێ: «یەکێتی بابەت (وەحدەی موضوع)یان هێنایە کایەوە». کە نالێ (هێنامانە کایەوە) واتە بەر لە خۆی کەسانێک هەبوون ئەوەیان کردووە، بێگومان وەک دیارە شێخ نووری بەتیۆر و پراکتیک ئەو هەنگاوەی ناوە.

ڕەنگە کەس سێ و دوو لەسەر ئەوە نەکات کە شێخ نووری یەکەم کەسە، هەنگاوی نابێ بەرەو تازەکردنەوەی (کێشی) شیعرەکانی. واتە بەردانی (عەرووز) و گەڕانەوە بۆ مەجزوئاتەکانی. مامۆستا (گۆران) دەڵێ: «ئەگەرچی شیعر هەر لەسەر عەرووزی عەرەب هۆنراوەتەوە لەم سەردەمەدا، بەڵام مەجزوئەکانی بەحری عەرووزیان وەرئەگرت، وە ئەو بەحرانەی کە زۆر بەکار نەئەهێنران لە لای شاعیرە کۆنەکان. بۆ وێنە نالی و سالم و هاوڕێکانیان زیاتر بەحری (هەزج) و (ڕەمل)یان بەکارهێناوە، بەڵام ئەمانە لە بەحری سەریع و خەفیف و لە هەزج (مەجزوئاتیان) وەرئەگرت وە زیاتری (زواحف) و (علل)یان بەکار ئەهێنا. ئەم تازەکردنەوەیە بەتەقلیدکردنی ئەدەبی تورک ڕووی دا، بەڵام ئەدەبی تورکی جولانەوەی تازەتری لێ دەرکەوت کە تورکەکان لە ڕووی گیانێکی (قەومی)یەوە ئەهاتن کێشی هەڵبەستە شەعبییەکانیان ئەژیانەوە و لەسەر ئەم کێشانە هەڵبەستیان دائەنا. کە ئەمەش کێشی هیجایە. ئیتر من تەنها بەکۆششی ئەوان نەوەستام و وەزنی هیجاشم وەرگرت و بەکارهێنا»[9].

ئەگەر شێخ نووری ویستبێتی بە کێشی تازە و جیاواز، کە لە شیعری کلاسیکی

---

(٨) ڕۆژنامەی ژیان، ژمارە (٣٧)ی ساڵی (١). (٧)ی ربیع الآخر ١٣٤٥ (١٥)ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٦.

(٩) گۆڤاری بەیان، ژمارە (٢)ی ساڵی (١٩٧٠). دانیشتنێک لەگەڵ گۆران، عەبدولڕەزاق بیمار.

کوردیدا بەکار نەهاتووە، بابەتی تازە دەربڕێ وا تێبگەین (تەقلید)کردنی ئەدەبی تورک بووە، ئەوە مامۆستا (گۆران) خۆشی بەکاریگەریی جوولانەوەی تازەتری ئەدەبی تورک کە کێشی هیجایان بەکار هێناوە و ئەمیش وەری گرتبێ و بەکار هێنابێ بە(تەقلید) بۆی دەژمێردرێ! کە من لە لای خۆمەوە ئەمە بەتەقلید نازانم. تەنانەت عەرووز زانە عەرەبەکانیش بەم دواییە گەیشتوونەتە سەر ئەو ڕایە کە (عەرووز)ەکەی (خەلیلی کوڕی ئەحمەدی فەراهیدی) لە کێشی سانسکریتی و یۆنانی کۆن وەرگیراوە. بەو شێوەیە کێشی پەنجەش لە لای هەموو نەتەوەیەکدا هەیە، میللەتی کوردیش وەک دەزانین شیعری فۆلکلۆری و ئەدەبیاتی بەشی گۆرانەکەی بەو کێشە نووسراون، شێخ نووری یەکێکە لەو شاعیرانەی وەک پێشتر ڕوونمان کردووەتەوە زۆر حەزی بەشیعری (مەولەوی) کردووە و لەسەر وردەکاری و سەنعەتی شیعریی ئەو شاعیرە وەستاوە. (مەلەوی)یش وەک شاعیرێکی هونەرمەند توانی ڕچە و ڕێگەیەکی تایبەتی لە شیعر بەشێوەی (گۆران) بێنێتە کایەوە کە لادانە لە هەموو بنەما شیعرییەکانی پێش خۆی. یەکەم شاعیرە بەکێشی پەنجە (٥+٥) شیعرەکانی داڕشتووە و یەکەم کەسە سوودی لە سەرچاوە ڕوونەکەی خۆمان وەرگرتووە، کە سامانی شیعری فۆلکلۆرە.

هەر لەو کاتەدا کە شێخ نووری خەریک بوو مەجزوئاتی بەحرەکانی عەرووزی وەردەگرت و بەکاری دەهێنا، ناو بەناو شیعری بەکێشی (هیجاء)یش نووسیوە، بەڵام ڕاستییەکەی شیخ نووری شیعری بەکێشی (هیجا) کەمە. ئەم کەمییەش وەنەبێ لە بێ دەسەلاتی و زەفەر پێ نەبردنی ئەو جۆرە کێشانەوە هاتبێ، بەڵکو بەڕای من هۆیەکەی ئەوەیە شێخ نووری کە تێری لە کارێزی شیعری کلاسیکی کوردیان خواردووەتەوە و تەواو لە مەسەلەی کێش قووڵ بووەتەوە، کە دەستی داوەتە بزووتنەوە تازەکەی نەیویستووە یەکسەر لە جیهانی ئەو جۆرە شیعرانە دابڕێ، بەڵکو وەک پێشتریش پەنجەمان بۆ درێژ کرد و مامۆستا (ڕەفیق حیلمی)یش دووپاتی دەکاتەوە (زوبدەی شیعری کلاسیکی) هێناوە و لە بەرانبەر کێشی شیعرەکانیدا نەیتوانیوە خۆی بەشێوەیەکی یەکجارەکی لە کارتێکردنی مۆسیقای شیعری کلاسیکی ڕزگار بکات. بۆیە دەبینین بایەخ بەمۆسیقای دەرەوەی شیعر دەدات کە کێش و قافیە و دانانی شوێنی وشە دروستی دەکەن، کە خوێنەری ئەو کاتە زۆرتر حەزی لەو جۆرە شیعرانە دەکرد و مۆسیقاکەی بەگوێچکەیان ئاشنا بووە، شێخ نووریش نەیویستووە یەکسەر لە چێژی خەڵکەکە بدات، لەبەرئەوەش لە لای شێخ نووری لە کۆمەڵێ شیعریدا سیمای شیعری کلاسیکی دەبینین. هۆی نووسینی ئەو شیعرانە

ئەوەیە، بۆ خوێنەرانی بسەلمێنێ کە ئەم دەتوانێ شیعر لەسەر ئەو پێودانە بنووسێ، تا لە کاتی خوێندنەوەی شیعرە تازەکانی بەبێ دەسەڵاتی نەزانن بەرانبەر بەو جۆرە هونەر و وەستایەتییەی لە شیعردا لەسەری ڕاهاتوون. بۆ بەڵگەی قسەکەم کە شێخ نووری لە زووەوە دەرکی بەو لایەنە کردووە و جۆرەکانی کێشی دەستنیشان کردووە، لە یەکێ لە وتارە ڕەخنەییەکانیدا کە بۆ لایەنی کێشی تەرخان کردووە دەڵێ: «وەزن- لە لوغەتدا بەگرانی سقلەت ئەڵێن. فەقەت نەزەر بەئیزاحاتی سەرەوە لە لیسانی ئەدەبیاتدا کەلیمەیەکە لە مەعنای معیار، مقیاس، تەرازوو دایە، لەم ئیزاحاتەوە وا دەرئەکەوێ کە وەزن (تەرازووی ئاهەنگە)، مەقسەد لەم تەرازووە ئەوەیە لەوەقتێکدا کە سیلسیلەی ئەفکارمان بەیان کرد و نووسی، جوملەکانی موعەیەن و بەتەرزێکی ئاهەنگدار تەقسیم بکا. مەسەلەن «ئەی جەوان و شەبابی وەتەن تەجەدود ئەمڕۆ سبحەینێ بۆ تۆیە، چونکە تۆ ئومێدی وەتەن و خادیمی حەیاتی» ئەم جوملەیە کە بەسورەتێکی موسەلسەل بەیان و ئیفادە کرا پێی ئەڵێن مەنسوور، فەقەت کە بەو تەرازووە کێشرا و موافیقی ئەو معیارە جیا کرایەوە، بەچەند پارچەیەکی مەوزون و کەم و زۆر بەعزێ تەعدیلاتی تیا کرا ئەبێ بە:

سبحەینێ ئەم تەجەدودە بۆ تۆیە ئەی شەباب

بۆ تۆیە ئەی ئومێدی وەتەن، خادیمی حەیات

وە بەم ڕەنگە مەوزون ئەبێ ئەگەر دیقـقەت بکەین زۆر چاک تێ ئەگەین کە وەزن لە ئاهەنگی ئەسوات، ئەسواتیش لە حروفی سەداوار مورەکەبە، بەتەعبیرێک کە ئەسوات لە هیجا حاسڵ ئەبێ، کەوابوو ئەم پێوانەی ئاهەنگە ئەساسەن هیجا تەشکیل ئەکات. لەبەر ئەمە وەزن دوو نەوعە ١- وەزنی هیجائی ٢- وەزنی عەرووز، وەزنی هیجائی بەعیبارەتێکی موسەلسەل ئەڵێن کە خرابێتە شکڵێکی مەوزونەوە. وەقتێ کە پارچەکانمان جیا کردەوە، عەدەدی هیجای میسرەعی ئەوەل لەگەڵ عەدەدی هیجای میسرەعی سانیدا مساوییە و بەقەدەر یەک بن. کەوابوو موافیقی وەزنی هیجایی لە میسرەعێکدا چەند هیجایێ لازم ئەکا لە میسرەعەکەی تریشدا ئەوەندە هیجا بێ. میسال:

چونکی ئێوە جەسوور ئەبینم

نامێنێ ئازاری برینم

ئەم میسرەعانە هەر یەکی مورەکەبە لە (٩) هیجا. ئەگەر هیجاکان یەکە یەکە بژمێرین زۆر چاک ئەوە تێ ئەگەین. لێرەدا نوقتەیەک هەیە لازمە دیقـقەتی لێ بکەین. هەموو

وەزنێکی هیجائی لازم ناکا مورەکەب بێ لە (٩) هیجا، واقع ئەبێ لە (٧) و لە (١٦) هیجاش ئەبێ.

هەر لــە ئێستاوە بمرن

کفن بۆ خۆتـــان ببــڕن

لەم میسرەعانەدا عەدەدەی هیجا (٧)ە و لە گۆرانی کوردیدا بەعزێ ئەشعاری موتەداوەلە موافیقی وەزنی هیجائییە. میسال:

کەس نازانێ بۆ بێ ڕەنگم

گیرۆدەی دەستی فەرەنگم

عەدەدی هیجای ئەم میسرەعە ئەگەر بژمێری، ئەزانی کە عەدەدی هیجاکانی (١٦)یە. لە وەزنی هیجائیدا دائیمەن ئینسان ئەتوانێ کە عەدەدی هیجای میسرەعەکان بەئەمووست بژمێری، بینائەن عەلەیهی بەم وەزنە، وەزنی حیسابی ئەمووستیشی پێ دەڵێن. ئەم نەوعە وەزنە لە هەموو مەنزومەی ئەلسینەی غەربییەدا ئیستیعمال ئەکرێ و لە کوردیشدا کراوە. لە زبانی کوردیشدا ئێستاش هەرچەند لازم بوو کە سەرفی ئەم وەزنە ریعایەت بکرایە، فەقەت لەبەر ئینقیلاباتی تاریخی قەومی کورد دائیمەن مەدەنییەتی عەرەب و عەجەمی تەقلید کردووە. کەلیماتی عەرەبی و عەجەمی تێکەڵ بەزمانی خۆی کردووە. بەتوولی زەمان تەحەولاتێکیان داوە بەشێواز و ئاهەنگی زبانەکەی خۆیان. لەبەر ئەم جیهەتانە، شاعیرەکانمان وەزنی هیجائییان تەرک کردووە و وەزنی عەرووزیان ئیستیعمال کردووە»(١٠).

شێخ نووری لەم بەشەدا کە باسی کێشی (هیجا) دەکات، یەکەم کەسە باسی کێشی شیعری کردووە و لەم بەشەدا دەیەوێ چەند لایەنێک ڕوون بکاتەوە. لە پێشەوە هەوڵ دەدات پێناسەیەک بۆ (کێش) پێشکەشی خوێنەران بکات و ئاسانی بکات، بۆیە بەرانبەر بەکێش «معیار، مقیاس، تەرازوو» دادەنێ، بەڵام تەرازووی ئاهەنگ. کەوا بێ دەتوانین بیروڕای شاعیر لەم نووسینەدا لەم چەند لایەنەدا چڕ بکەینەوە:

**یەکەم:** شاعیر کە دەڵێ: «وەزن لە ئاهەنگی ئەسوات، ئەسواتیش لە حرووفی سەداوار مورەکەبە» ئەمە ڕەچاوکردنی ئاهەنگی ئەو دەنگانەیە کە لە پیتی ئاوازداردا دیویەتی و مانای وایە کە (کێش)ی شیعرەکانی پەیوەستە بەوشە و سەواکردنێکی

(١٠) ڕۆژنامەی ژیان، ژمارە (٢٨)ی سالی (١)، (٢)ی صفر ١٣٤٥ (١٢)ی ئاغستۆس ١٩٢٦ .

زیرەکانەیە لەگەڵی. ئەمەش کارێکی وا دەکات شاعیر بزانێ چۆن وشە بەکار دەهێنێ و لە کوێ لەسەر کورسی دایان دەنێ بۆ بەرپا کردنی ئەو ئاهەنگە و ڕاگرتنی تەرازووی کێشەکەی پەیڕەوی کردووە. کە وشەش لە لای خۆیەوە دەلالەت لەو مانایە دەکات کە لەگەڵ خۆی هەڵیدەگرێ.

**دووەم:** هەوڵی داوە پێناسەیەکی وردی ئەم جۆرە کێشە بکات کە دەڵێ: «وەزنی هیجائی بەعیبارەتێکی موسەلسەل ئەڵێن کە خرابێتە شکڵێکی مەوزونەوە، وەقتێ کە پارچەکانمان جیاکردەوە عەدەدی هیجای میسرەعی ئەوەل لەگەڵ عەدەدی هیجای میسرەعی سانیدا مساوییە و بەقەدەر یەک بن» دوای ئەوەی نموونەی بەیتێک کە بریتییە لە (٩) هیجا پیشان دەدات ئینجا دەڵێ: «هەموو وەزنێکی هیجائی لازم ناکا مورەکەب بێ لە (٩) هیجا، واقع ئەبێ لە (٧) و لە (١٦) هیجاش ئەبێ» واتە جۆراوجۆری ژمارەی ئەو هیجایانەش نیشان دەدات.

**سێیەم:** شێخ نووری ئەوەش دەردەخات کە شارەزایی لە گۆرانی فۆلکلۆری کوردیدا هەیە، کە ئەو گۆرانییانەش هەر بەکێشی (هیجا) نووسراون وەک نووسیویەتی «لە گۆرانی کوردیدا بەعزێ ئەشعاری موتەداوەلە موافیقی وەزنی هیجائییە » واتە شێخ نووری کە لە فۆلکلۆری کوردی و شیعری (مەولەوی) ورد بووەتەوە زوو کێشی هیجایی دەستنیشان کردووە.

**چوارەم:** ئەوە دەردەخات ئەو جۆرە کێشە لە هەموو مەنزومەی ئەلسینەی غەربییەدا ئیستیعمال ئەکرێ، واتە کێشەکە لە لای هەموو میللەتان هەیە و کوردیش وەک یەکێک لەو میللەتانە ئەم کێشە برگەییانەی لە ئەدەبیاتی فۆلکلۆریدا بەکارهێناوە، بەڵام (ئینقیلاباتی تاریخی) ئەم کێشانەی داوەتە دواوە.

**پێنجەم:** هۆی بەکار نەهێنانی ئەم کێشانەی پەنجەنومایان دەکات بۆ ئەوە دەگێڕێتەوە (قەومی کورد دائیمەن مەدەنییەتی عەرەب و عەجەمی تەقلید کردووە). ئەم قسەیەش ئەوە دەگەیەنێ کە بەدرێژایی مێژوو هەردوو کێشەکە بەکار هاتووە، بەڵام بەپێی (ئینقلاباتی تاریخی) لە دەرکەوتن و ونبووندا بووە، بۆیە گەڕانەوە بۆ بەکارهێنانی ئەم کێشە (دوای تەرک کردنی) دیسان بووژانەوەی گیانی نەتەوایەتییە لە لای شاعیرانی ئەو بزووتنەوەیە. واتە تەنیا بەکاریگەریی ئەدەبی تازەی تورکەکان ڕووی نەداوە، وەک هەندێ کەس دەیانەوێ بۆ لاساییکردنەوەی ئەدەبی تورکی ببەنەوە و بووژانەوەی هەست و گیانی نەتەوایەتی لە لای ئەو

شـاعـیـرانە پشـتگوێ بخـەن، کـە لە سـەرەتای ئەو سـەدەیەدا کـەوتبـوونە ژێر تەوژمـەکـەیەوە، ئینجـا گـەڕانەوە بەرەو سـەرچاوە ڕەسـەنەکـە و دەست درێژکـردن بۆ کێشی نەتەوایەتی (خۆماڵی) و سوود وەرگـرتن لە فۆلکلۆر، بۆ ئەوەی بەرە بەرە شیعری کوردیان خۆی لە (عەرووز) ڕزگار بکات. شێخ نووری لە سەرەتاوە خۆی لە قەرەی ئەو کێشانە دا کە پێشتر لە شیعری کوردیدا بەکار نەدەهاتن وەک بەحری (سـەریع) و (خـەفـیف) و مـەجـزوئاتی (هەزج)، ئینجـا لە دواییـدا کـۆمـەڵێ شیـعریشی بەکێشی (هیـجا) نووسی وەک شیـعری (بولبـول فـیداتم) و (ساقـیا نەوبەهارە ڕۆیی دەی) و (بۆ مێژوو) و (ئینـتیـبـاه) و (بۆ چواردەی تەمموز) و (بۆ ڕەشیـد سدقی) و (بۆ گـرتنی شێخ لەتیف) و (بۆ بێکەس) و... تاد. زۆربەی ئەو شیـعرانەی بەکێشی (٥+٥) نووسراون، کە ئەمە کێشی هەرە باوی ئێمـەیە، کە دەتوانین بەکـێـشی نەتەوایەتی دابنێین. وێنەی ئەم جـۆرە شیـعـرەش کـە لەسـەر تانوپۆی ئەم کێـشـە هۆنرابێـتـەوە بەزۆری لە لای شـاعـیـرێکی وەک (مـەولەوی)دا دەبینرێ. وەک چۆن لە زمانی فـەرەنسـیدا کـێشی دوانزە بڕگـەیی (ئەسکەندەری) بەکێشی نەتەوایەتی دانراوە، لە لای ئینگلیزەکانیش کێشی (ئیامبیک) بـەکێشی نەتەوایەتی دانراوە، لای تورکـەکانیش کـێشی (١١) بڕگـەیی بەکـێشی نەتەوایەتی دانراوە[11].

لە شیعرەکەی (ئینتـیباه)دا چەند کێشـێکی جیاوازی بەکار هێناوە، سەرەتا عـەرووزی بەکار هێناوە پاشان تێکەڵی کردووە لەگەڵ چەند کـێشـێکی هیـجایی وەک: (٧ + ٧) و (٩ + ٩) (١٢ + ١٢) کە ئەو شیـعرەی لە ساڵی (١٩٢٥)دا بڵاوکردووەتەوە. ئەمەش بەڵگەیە بۆ دەسـەڵاتی شـێخ نووری بەسـەر زۆربەی کـێـشـەکـان و نووسـینی ئەم وتارە ڕەخنەییـیـە و بڵاوکـردنەوەشی بەڵگەی ئەوەیە شێخ نـووری هەنگاوەکـەی بۆ ئەو ئەزمـوونە (واتە لایەنی کـێش) ئەزموونێکی هۆشیـارانەیە، چونکە بڕیارەکەی بۆ تازەکردنـەوەی کێش و مەشقکردن لەسەری دوای ئەوەی ماوەیەک پشـتگوێ خرابوو، کارێکی هەڕەمەیی نەبوو، بەلایەنی کـەمـەوە ویسـتی لە سەرەتاوە بەهەندێ کـێشی وا بنووسێ کە باو نین. ئینجـا لە دواییدا لەلایەن مـامۆستا (گـۆران)ەوە تەجرەبەی فراوان کردنی ئەو کێشـانە و بەکارهێنانی کێشی جۆراوجۆری دیکەی گرتە ئەسـتۆی خۆی لە پاش ئەوەی شێخ نووری سەرەتاکەی بۆ بزووتنەوەکـە دیاری کـرد و چەند ڕەگـەزێکی تازەی بۆ شـیـعری کـوردی دەسـتـەبەر کـرد.

(١١) ڕۆژنامەی ژین، ژمارە (٢٤)، ١٩٧١/٥/٢٧ ئەو کێشە بڕگەییانەی ئێستا باون، گۆران.

مامۆستا (گۆران) سوودی لە چەند کێشێک وەرگرت کە وێنەیان لە لاوک و حەیراندا هەبوو. ئەگەرچی وەک خۆی دەڵێ: «بەشی زۆری کۆنەکانم بەوەزنی عەرووز و کوردییەکی تێکەڵاو بەزمانی بێگانە نووسراون». وەک دەزانین شێخ نووری شارەزاییەکی زۆری لە عەرووزدا هەبووە و لە شیعر نووسیندا بەسەریدا زاڵ بووە، شیعری بەهەر جۆرە کێشێک نووسیبێ خۆی زانیویەتی چی دەکات و چی ناکات و چۆن لەگەڵ شیعردا هەڵسوکەوت دەکات. بەڕای من ئەم لایەنە دەکرێ ببێتە کەرەسەیەکی نووسینی تێروتەسەل بۆ ئەوەی لە نێوان (شێخ نووری) و (گۆران)دا بەراوردێک ساز بکەین و بزانین هەریەکەیان چۆن لەگەڵ کێشی شیعر ساتوسەوایان کردووە.

ئەوەی لێرەدا بەلامەوە گرنگ بێ ئەوەیە (شێخ نووری) لە ڕووی کێشەوە جیاوازییەکی دا بەشیعری تازە و لەگەڵ شیعری کلاسیکی هێڵێکی جیاکەرەوەی دانا، ئەو کێشە تازانەش، بابەتی تازەی شیعر بەسەریدا سەپاند، لە پاڵ هەستە نەتەوایەتییە تازەکە، کە وایان لێ کرد هەنگاوێک بەرەو کێشی خۆماڵی نزیکی بخاتەوە، دوای ئەوەش ماوەیەک بەکێشی (سەریع) و (خەفیف) و مەجزوئاتی(هەزج) شیعری نووسی. بێگومان هەنگاوانی شێخ نووری بۆ تازەکردنەوەی کێشی شیعری کوردی، هەنگاوانە بۆ تازەکردنەوەی ئاهەنگ و مۆسیقای شیعریش، ئەوەتا خۆی نووسیویەتی و دەڵێ: «ماهییەتی حەقیقەی وەزن و قافیە، ئاهەنگە. ئەگەر فکرێکی جوان، حسێکی لەتیف، خەیاڵێکی بەدیع، توولی مودەت لە دەماغمانا بمێنێتەوە یەعنی نەیلێین و نەینووسین بەتەبع لە ڕووحی هیچ شەخسێکدا تەئسیر و هەیەجانێکی بەدیعی حاسڵ ناکا. بینائەن عەلەیهی لازمە ئەم فکرە بنووسرێ. فەقەت کە نووسیمان، یەعنی ئەم فکرە جوانەمان کە خستە شکڵێکی مەرئییەوە لازمە دیققەت لە یەک شت بکەین کە ئەو شتەش جوانییە و جوانیش بەئاهەنگ دێتە وجوود. ئەگەر فکرێکی جوان بەتەرزێکی ئاهەنگدار بەیان و ئیفادە بکەین لە ڕووحی قارئین یاخود سامعیندا دوو نەوع تەئسیر حاسڵ ئەکا، یەکێکیان ئەساسەن ئەو فکرە جوانەیە کە لە ڕووحدا هەیەجانی بەدیعی حاسڵ ئەکا، ئەویتریشیان ئیفادەی ئەو فکرەیە کە چەند کەلیمەیەکی مەوزون و قافیەدار و ئاهەنگدار بەیانی ئەکەن کە ئەمەیان عەینەن وەک مۆسیقا لە ڕووحی ئەو سامیعەدا تەئسیرێکی بەدیعی حاسڵ ئەکا»[١٢].

---

(١٢) ڕۆژنامەی ژیان، ژمارە (٢٧)ی ساڵی (١)، (٢٥)ی موحەڕەم ١٣٤٥ (٥)ی ئاغستۆس ١٩٢٦

شێخ نووری لەم دەقەدا مەرجی سەرەکی لە جوانی بەرهەمێک لە (ئاهەنگ)دا دەبینێ و ڕادەی کاریگەریی (ئاهەنگ) باس دەکات لەسەر گوێگر و وروژانی هەستی جوانی ئەو گوێگر و خوێنەرە و لەگەڵ مۆسیقاشدا بەراوردی کردووە، بگرە حەقیقەی (وەزن و قافیە) بەئاهەنگ لێک دەداتەوە. لێرەدا شێخ نووری کە کێشی تازە کردووەتەوە، لەگەڵ ئەویشدا ئاهەنگ و ئیقاعی شیعری تازە کردووەتەوە، چونکە هەوڵی داوە لەگەڵ بایەخدان بەمۆسیقای دەرەوەی شیعر، بایەخ بەمۆسیقای ناوەوەی شیعریش بدات. واتە شێخ نووری لەپاڵ ئەوەی کە مۆسیقای شیعرەکانی بۆ گوێچکەن، لە هەمان کاتیشدا بۆ ناخیشن، ئەمەش تا ڕادەیەک هەڵگەڕانەوەیە لە چێژی باوی ئەو سەردەمە، کە بەو جۆرە کێش و ئاهەنگ و دەربڕینانە ڕانەهاتبوون و هێشتا ئاشنایەتییان لەگەڵیاندا پەیدا نەکردبوو. بەم جۆرە هەوڵیدا لەنگەری نێوان مۆسیقای دەرەوەی شیعر کە لایەنی جوانی و فۆرمەکەیە، لەگەڵ مۆسیقای ناوەوەی شیعر کە ناوەرۆکەکەیە ڕابگرێت، لێرەوە لە شیعری کلاسیکی جیا دەبێتەوە و نابێتە نوسخەیەکی کتومتی شیعری کلاسیکی و لاساییکردنەوەی، بەڵکو جیایی دەداتە شیعرەکان. گومانی تێدا نییە مەسەلەی ئاهەنگ لە شیعردا پێوەندییەکی توندوتۆڵی بە(وشە)وە هەیە، (وشە) خۆی بۆ خۆی چەند دەنگێکە ڕستەیەکی شیعریی کۆمەڵە دەنگێک پێکدەهێنن، ئەگەر شاعیر وەستایانە وشە بەکار نەهێنێ و حەقی خۆی نەداتێ، ئەوە ئاهەنگی شیعرەکەش تووشی پەشێوی دەبێ، وەک ئەو کەسەی لە مۆسیقا نەزانێ و دەست بداتە ژەنینی ئامێرێکی مۆسیقایی. وشە لە فەرهەنگدا، مردوو و بێ گیانە، بەڵام شاعیر لە وشک و برنگی ڕزگاری دەکات و تەڕوپاراوی دەکات، پڕی دەکات لە سۆز و هەست و هەڵچوون. کە زیرەکانە وشەی لە جێگای خۆی دانا، مۆسیقایە مت بووەکەی ناو وشەکە لەو شوێنەدا ئاشکرا دەبێ و لەگەڵ دەنگ و ئاهەنگی وشە دراوسێکانی شەپۆلێک ئاواز و ئاهەنگ دروست دەکەن.

شیعرەکانی شێخ نووری خوڕ و عەفەوین. وەک ڕووبار خوڕە دەکەن و خوێنەر هەست بەشیعر سواریی ئەو شاعیرە دەکات، لە خوێندنەوەی شیعرەکانیدا هەست بەگرێوگۆڵ و قۆرت و ساتمە ناکات. ئەم عەفەویەتە مەرجێکی سەرەکی شاعیری ڕەسەنە. ئەم ڕەسەنایەتییە لەگەڵ زاڵبوونی بەسەر لایەنی سەنعەتسازی وایان کردووە بەزۆر لە خۆ کردن شیعر نەڵێت و سواری کۆڵی بێت، بەڵکو بەرەوانی تەعبیری لە نەزیفەکانی ناوەوەی خۆی کردووە. ئاهەنگی شیعرەکانی تەعبیر لە ڕیتم و ئاهەنگی ناوەوەی دەکەن، هەرچەندە ویستوویەتی لە هەندێ شیعریدا وەک شاعیرێکی (هزرڤان- مفکر) خۆی نیشان بدات و

ئەو شعرانەشی زیاتر بەلای (هۆنراو- نظم)ەوە دەشکێنەوە، بەڵام وەنەبێ ئەوە سیمایەکی زەقی هەموو شیعرەکانی بن و بەجارێ هۆشیاری نەبووەتە دەستێک و بینی شیعرەکانی گرتبێ و ڕەسەنایەتی و تەقینەوەی شیعریی لە کیس دابێ، بەڵکو بەهۆی سانسۆری هۆشیاری و سەنعەتسازی دەستی بە شیعرەکانیدا هێناوەتەوە و ڕێگەی بۆ عەفەویەتی شیعری خۆش کردووە.

شیعر وەک دەزانین پیلان دانانێکی پێش وەختە بەخۆیەوە ناگرێ، چونکە ئەو گەرموگوڕی و وزە ویژدانییەی تێدا ناهێڵێ کار بکاتە سەرخوێنەر. کەواتە جلەو شلکردن بۆ خوڕی- انسیابیة - لە دارشتنی شیعر لەلایەن شاعیرەوە بێگومان چەمکێکی سەرکەوتنی لایەنی (ئاهەنگە) لە شیعردا کە ئەو ئاهەنگەش لە ئاستی خۆیەوە جوانی دەداتە شیعرەکە و کاریگەریی لەسەر خوێنەران بەجێ دەهێڵێ.

لایەنێکی دیکەی تازەبوونەوە کە (زمان) و بەکارهێنانی (وشە)یە، ئەم شاعیرە و شاعیرانی دیکەی ئەو قوتابخانەیە زمانێکی شیعریی تازەیان بەکارهێنا کە جووت بوو لەگەڵ تێڕوانینی تازەیان بۆ ژیان، بۆیە کەوتنە خۆیان بۆ ئەوەی لە لایەک ساتوسەوایەکی تازە لەگەڵ زماندا بکەن تا لەگەڵ گیانی سەردەم و بزووتنەوەی تازەبوونەوە بیگونجێنن، لە لایەکی دیکەشەوە کەوتنە پاک کردنەوەی زمانی خۆیان و بژار کردنی لە وشەی بێگانە. شێخ نووری خۆی شاعیرێک بوو، بە تەواوی شارەزایی لە زمانی کوردیدا هەبوو، زەخیرەیەکی زمانی چاکی هەبوو.

لە ساڵی (١٩٢٠) کاتێ (مێجەر سۆن) لە ڕۆژنامەی (پێشکەوتن)دا پێشبڕکێی نووسینی کوردی پەتی بڵاو کردەوە، شێخ نووری یەکێک بوو لەو کەسانەی ویستی خۆی لەو بوارەدا تاقی بکاتەوە و شیعرێکی بۆ ناردن بەناوی (جووت و گا شتێکی چاکە)، لەو پێشبڕکێیەدا شێخ نووری بەیەکەم دەرچوو. ئەم هەنگاوە بەلای منەوە ئەوە دەگەیەنێ ئەم شاعیرە و شاعیرانی بەرەو دوایی لە ڕووی گیانی نەتەوەیییەوە هەوڵیان داوە بۆ پاکژکردنەوەی زمانی کوردی، شێخ نووری پێش ئەوەی ئەو پێشبڕکێیە بانگەوازی بۆ بڵاو بکرێتەوە، خەریکی بایەخدان بووە بەو لایەنە گرنگە، کە کەرەسەیەکی گەورەی دەستی شاعیرە بۆ دەربڕینی خەون و خۆزگە و پرسیارە بێ کۆتاییییەکانی، تا بتوانێ بەپێی هەڵسوکەوتی زیرەکانەی خۆی لەگەڵ (وشە)دا ساختمانی هونەریی شیعرەکەی هەڵچنێ، بەشێوەیەکی مەحکەم و توندوتۆڵ، نەک رفۆک و لاواز، چونکە شاعیر چەند فەرهەنگی وشەی دەوڵەمەند بێت، مانای وایە ئەوەندە لە ڕووی هزرەوە دەوڵەمەندە، بۆیە زمانی

خسته خزمەتی (یەکێتی بابەت) و (گونجاندنی شێوە و ناوەرۆک) تا بتوانێ خۆی لە شتی زێدە و لابەلایی بپارێزێ کە شیعر بەرەو لای (لامەرکەزییەت) دەبات، لەجیاتی ئەوەی (بابەتە)کە لە سەنتەر و بوئرەیەکدا کۆ بکاتەوە، دەبینین ئەو کاتە بەهۆی زاڵ نەبوون بەسەر (وشە)دا، (بابەتەکە) پەرش و بڵاو دەکاتەوە، بێگومان هەر زاڵ بوونیشە بەسەر زماندا، چڕکردنەوەی تێڕوانینی شیعر دروست دەکات. لەبەر ئەوە شاعیرانی ئەو قوتابخانەیە نرخی وشەیان زانی و تێگەیشتن وشە چۆن و لە کوێ دابنێن، مامۆستا (گۆران) لە پێشەکی (بەهەشت و یادگار)دا نووسیویەتی: «هەچ هەڵبەستێک وشە و تەرکیبی عەرەبی و فارسیی زۆری تیابێ، بەئەندازەی ئەو زۆرییە کۆنە، پێچەوانەی ئەوەش دیارە پێچەوانەیە» لێرەدا مامۆستا (گۆران) بایەخدان بە زمان و بەوشەی کوردی کردووەتە پێوانەیەک بۆ (تازەیی) بەرهەمە شیعرییەکە، بۆیە ناکرێ ڕوانین تازە بێت، بەبێ تازەکردنەوەی کەرەسەکانی دەربڕین، واتە بابەت و بۆچوونی تازە، زمانی دەربڕین و پێ نووسینی تازەیان گەرەکە. بەپێچەوانەی شیعری کلاسیکی کە زۆرتر بابەتی بچووک لە ناو (فخامة) شکۆی شێوازدا دەشارێتەوە، لەبەرئەوەش کە زمانی ڕۆشنبیری ئەو سەردەمە (تورکی) و (فارسی) و (عەرەبی) بووە، بۆیە شیعرەکانیان تا بنا گوێچکەیان لە وشەی (تورکی) و (فارسی) و (عەرەبی)دا نقوم کردبوو.

لایەنێکی دیکەی تازەکردنەوەی شیعری کوردی، دەست بەردانە لە (یەکێتی قافیە) کە لە شیعری ئەو سەردەمەدا باو بووە. مامۆستا (گۆران)یش پەنجەی بۆ ڕاکێشاوە کە دەڵێ: «تەرتیبی قافیەکان گۆڕا». واتە تەرتیبی قافیە بەم جۆرە بوو: «أ+أ+ب+أ+ب+أ... تاد» بەڵام لە قوتابخانەی شیعری تازەدا پەیڕەوی جووت قافیە کرا، واتە «أ+أ+ب+ب+ج+ج» و تاد... شاعیران لەجیاتی (یەکێتی قافیە)، قافیەی (مەسنەوی)یان بەکار دەهێنا، کە جووت قافیە دەگرێتەوە. هەرچەندە لەسەرەتاوە شێخ نووری پەیڕەوی (یەکێتی قافیە)ی دەکرد، بەڵام لەدواییدا زۆر شیعری لەسەر ئەو یاسایە نووسی، وەک لەم دیوانەیدا بەرچاومان دەکەون، هەرچەندە ئەم یاسای پەیڕەویکردنی (جووت قافیە)یە سەربەستی زیاتر دەداتە شاعیر بۆ ئەوەی زیاتر جڵەو بۆ خەیاڵی خوڵقێنەرانەی شل بکات و ڕوانینەکانی خۆی لە قاڵب نەدات. یا بتوانێ وشە و وێنە و تابلۆی شیعری زیاتر لە شیعردا دەستەمۆ بکات، بەڵام بەڕای من ئەم مەسەلەیە زیاتر پێوەندی بەدەسەڵات و توانایی شاعیرەوە هەیە و بەپێی بابەتی شیعرەکە پەنای بۆبردووە، لەبەرئەوەی دەبینین شێخ نووری لەگەڵ ئەوەشدا کە لە شیعرە سەرەتاییەکانی تازەبوونەوەکەیدا پەیڕەوی

(یەکێتی قافیە)ی کردووە، کەچی زیانی بەسەربەستی دەربڕین نەگەیاندووە و لە (یەکێتی بابەتی) شیعرەکەی دوور نەخستووەتەوە.

لە لایەکی دیکەوە شیعری تازە هەرچەندە لە ڕەگەزی «خەیاڵ» دوورە پەرێز نییە، بەڵام شاعیرانی ئەو قوتابخانەیە خۆیان لە مەسەلەی (پێ لێ هەڵبڕین - مبالغة) دوور ڕاگرتووە کە «خەیاڵ» لە لای شاعیرە کلاسییەکان خەیاڵێکی تەفسیرییە و پشت بە هونەری ڕەوانبێژی دەبەستێ. لەم بارەیەوە شاعیری ڕچەشکێن و (منظری) ئەو قوتابخانەیە دەڵێ: «موافەقەت - ئیجاد و تەرویج - بەدەلالەت کردنی ئەلغاز ئەڵێن بەسەر مەعانی مەقسوددا، بۆ ئەوەی کە ئەم مەسەلەیە بەتەواوی ئیزاح و بەیان بکەی، لازمە چەند کەلیمەیەک بدۆزینەوە کە لەگەڵ یەکتریدا نەختە فەرقێکیان بێ. مەسەلەن: لە شتێکدا کە لە بوون و نەبوونیا تەرەدود هەبێ بۆ وقووعی ئەم شتە ئەڵێین یا وا زەن ئەکەین یا وا ئومێد ئەکەین یا وا شەبەهـ ئەکەین. لەم کەلیمانە هەر کامێکیان ئیستیعمال بکەین، بەیانی تەرەدودێک ئەکەین، فەقەت ئەگەر دیقـقەت بکەین لە بەینی ئەمانەدا چەند فەرقێک هەیە. مەسەلەن: وقووع لەگەڵ زەن هەم لەگەڵ مەئموول هەم لەگەڵ مەشکووک زەعیفترە لە وقووع لەگەڵ ئومێد، بینائەن عەلەیهی بەوقووع شتێکی موتەرەدەد، یان ئەڵێین مەزنوونە، یا مەئموولە، یا مەشکووکە. ئەمجا ئەگەر ورد ببینەوە تێ ئەگەین لە بەینی ئەم سێ تەرزە ئیفادەیەدا وەک لەسەرەوە بەیانمان کرد چەند فەرقێک هەیە. کەوابێ لەوەختێکا ئەگەر ئیحتیمالی وقووع وەیا عەدەم وقووع موقابل بەیەکتری فایق نەبێ و بڵێین (فلان شت وقووعی ئومێد ئەکەین) غەڵەتە، چونکە بەم سوورەتە ئیحتیمالی وقووعی زیاتر بەقووەتتر ئەبێ. لەم ئیزاحاتەوە بۆمان دەرکەوت، بەعزێ ئەلغاز کە موتەرادف ئەبینرێن فەرقێکی کەم لە بەینیانا هەیە، موافەقەتی ئەم فەرقە ئەدۆزینەوە و کەلیمە موافق بەحاڵ و مەوقیع هەڵئەبژێرێ»[(١٣)].

لەم قسانەدا (شێخ نووری) لێپرسراویی شاعیر و نووسەرەکان نیشان دەدات بەرامبەر بە(وشە)، کە بەشێوەیەکی ورد لەگەڵیدا بجووڵێنەوە و بەپێی (حاڵ و مەوقیع) هەڵیبژێرن، لە پاشان دێتە سەر لایەنی (مەنتیق) لە شیعردا، کە دوای سەرکەوتنی شاعیر بەسەر لایەنی وردیی بەکارهێنانی (وشە) دێتە گۆڕێ. ئەگەر (مەنتیق) لە شیعردا لە ناو

(١٣) ڕۆژنامەی ژیان، ژمارە (٥٧)ی ساڵی (٢)، (٧)ی ڕەمەزان ١٣٤٥ (١٠)ی شوبات ١٩٢٧.
هەروەها ژمارە (٥٩)ی ساڵی (٢)، (٢١)ی ڕەمەزان ١٣٤٥ (٢٤)ی مارت ١٩٢٧ .

خۆیدا لە پێوەندییەکی تەبا و گونجاودا بوو، ئەو کاتە قەناعەتی زیاتر لە لای خوێنەر دروست دەکات، وەک لەوەی شیعرەکە لە ناو وشەی قەبە و تونێکڵەکەیدا نقوم ببێ و پێ لێ هەڵبڕینیش ئامانجی شیعرەکە بسڕێتەوە، کە بەرپاکردنی (گۆڕانە) لە چێژ و تێڕوانینی خوێنەر و هەوڵدان بۆ جوانکردنی ژیان و بەرەو پێشەوە بردنی، بۆیە کە لە شیعردا ڕستەیەک، وێنەیەک دەخوێنینەوە، بەپێی مەنتیقی ناو شیعرەکە پێویستە (ئیحتیمالی وقووعی) ئەو شتە بکەین کە لە دوای ئەو ڕستەیەوە دێت، نەک هەموو ڕستەیەک ڕێکەوتێک بەڕێوەی ببات و کەشتی مەبەستی ئەو ڕستەیە بەرەو بەندەرێکی دیکە ببات، کە هەرگیز خەیاڵ و مەنتیقی ناو شیعرەکە چاوەڕوانی نەبێ. واتە لە دوای هەر ڕستەیەک پێویستە وقووعی ئەو شتەی کە چاوەڕێی دەکەین بۆی بەهێزتر بێت، لەو شتەی ئیحتیمالی وتنی ناکەین. ئەوەش بەواتایەکی دیکە گەڕانەوەیە بۆ باوەشی حەقیقەتە بەردەست و بەرچاوەکانی ژیان و ئادەمیزاد و کردنیانە بەکەرەسەی بەبزوێنی شیعر، تا بە(خەیاڵی خولقێنەرانە) واقیع دەوڵەمەند بکەن و سەرلەنوێ دایڕێژنەوە، نەک لە ناو دەریای (وەهم) و (موبالەغە) و (خەیاڵ پڵاوی)دا مەلەوانی بکەن. کە مەبەستم لەم (خەیاڵ پڵاوی)یە ئەو جۆرە خەیاڵەیە کە وەک سەراب وایە، تا بەدوایدا بڕۆی نایگەیتێ و هیچت بۆ بەهیچ ناکا، بەمەرجێ تەعبیر کردن لەو حەقیقەتانە نابێ شاعیر لەلایەنی هونەری دابڕێ، ئەمەش هۆیەکە بۆ بەرزکردنەوە - تعالی- لە مرۆڤدا بۆ نزیکبوونەوە لە - کەمال- کە هەرگیز نایەتە دی، چونکە گەیشتن پێی سڕینەوەی بزووتنەوەی بێ کۆتاییە - لا متناهی - کە لەوەوە (گۆڕان) ڕێگەی ئەبەدی خۆی دەبڕێ.

یەکێک لە دەسکەوتەکانی ئەم قوتابخانەیە بۆ شیعری کوردی ڕووکردنە (ڕوونی نووسینە) ئەم بیرەش لە ئەنجامی ئەوەوە هاتە کایەوە، کە ئەدەب کەوتە ناو باوەشی ژیان و زیاتر بەخەم و ئاوات و خەبات و تێکۆشانی گەلەوە نووسا و هەوڵی دا ببێتە ئەدەبێکی پەیامدار و خاوەن لێپرسینەوە. من ناڵێم پێش ئەو بزووتنەوەیە شاعیری دیکەمان نەبووە شیعری ڕوون و ئاسان بۆ تێگەیشتنیان نەبووبێ، بەڵام ئەو قوتابخانە تازەیە ئەو سیمایەی کردە ڕێباز و ڕێڕەوێکی پەیڕەوکراو و بەشێوەیەکی زەق و ئاشکرا ویستیان ڕووی ئەم سیمایە دەربخەن. ئەوە (شێخ نووری)یە دەیەوێ وەک کارێکی بەرنامە بۆ دانراو بۆ ئەو لایەنە بڕوانێ بۆیە دەڵێ: «وزووحی ئەفکار و حسسیات بەسەهلی تێگەیاندنە. وزووح، بۆ هەموو ئاساری موحەرەرە زۆر حائیزی ئەهەمییەتە بۆ ئەوەی ئەم ئەهەمییەتە تێبگەین لازم ناکا دووورودرێژ تەدقیقات بکەین. مەقسەد لە نووسین ئەوەیە ئەو ئەفکارەی

که له دەماغمانا حاسڵ ئەبێ بەشەخسی ئاخر ئیفهامی بکەین. ئەگەر لەو نووسینەدا کە ئێمە ئەینووسین مەعنایەک نەبێ، کولفەتی نووسین بۆچی ئیختیار ئەکرا؟ نەزەر بەم ئەحواڵە وزووح بۆ هەموو ئاساری ئەدەبییە و قەواعیدی تەحریرییە یەگانە ئەساسە میسال بەشیعرێکی وازح:

حوجرەیەکم هەیە بەقەدەری لەپێ
ڕۆژ عیلاجی ئەکەم بەشەو ئەتەپێ
سەر و ڕیشم لە تۆزی قسل و گەچا»[١٤]
وەک پەلاستیکە پڕ لە ڕشک و ئەسپێ

ئینجا دێتە سەر لایەنی (ئاڵۆزی) لە دەربڕیندا و لە باسی ئەمەشدا دەڵێت: «تەعقید زدی وزووحە، یەعنی بە فکرێک ئەڵێن ئینسان وازیحەن تێی نەگات. بۆ قسەیە کەوا وزووحی ئیخلال بووبێ ئەڵێن (موعەقەد)، ئیفادە بەچ سورەتێک موعەقەد ئەبێ؟ تەعیقد بەدوو نەوع ئەبێ. یا ئەو شتەی کە ئەینووسین لە مێشکمانا هیچمان تەعین نەکردووە. یەعنی ئەو فکرەی کە لە دەماغمانایە بەتەواوی کەسبی وزووح و سەراحەتی نەکردووە، یاخود ئەو فکرەی کە ئەینووسین ئەلغاز و تەعبیراتەکەی سەحیح نییە و سەبەب، بەبێ دیققەتی لە تەرتیبی کەلامدا تەشەوشێک دێتە وجود، لەبەر ئەمە تەعقید یا مەعنەوی ئەبێ، یا لەفزی، سەبەبی تەعقید ئەوەیە فکرێک لە دەماغمانا بەتەواوی کەسبی وزووحی نەکردووە. تەشەبوس بەئیفادەی ئەکەین، ئەگەر ئەوەی کە ئەنووسرێ مەوزووع و حدوودی تەعیین نەکرێ. ئەکسەرییەن نووسین لەگەڵ فکرەکەدا جیاواز ئەبێ و هەم لە بەینی ئەفکار و ئەلفازدا ئیختیلاف و موبایەنەت واقع ئەبێ و مەعنا لە جوملە نەزع ئەکات»[١٥]، لەم بەشەشدا شێخ نووری هۆی ئاڵۆزی نووسین دیاری دەکات. لەم قسانەشیدا بۆمان دەردەکەوێ کە لە باسی (وضوح)دا مەبەستی وزووحی ڕووکەشانە نییە، چونکە ئەو جۆرە ڕوونییەک باس دەکات کە شتێ لە مێشکی ئەو کەسە بێ و خۆی بسەپێنێ بۆ ئەوەی بنووسرێ، نەک بەبێ ئەوەی شتێکی دیاریکراو جووڵاندبێتی دەست بداتە قەڵەم و لاپەڕە ڕەش بکاتەوە. ئینجا دوای ئەوەی شتێ پاڵی پێوە نا، قەڵەمی لێ بخاتە کار، لەم

---

(١٤) ڕۆژنامەی ژیان، ژمارە (٤٦)ی ساڵی (١)، (١٠) جمادی الآخر ١٣٤٥ (١٦)ی کانوونی یەکەم ١٩٢٦.

(١٥) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو.

بارەیەوە دەڵێ: پێویستە ئەو شتە (وزووح و سەراحەتی) خۆی وەرگرێ، واتە هەموو ڕەهەند و سووچ و مەودایەکی ڕوون ببێتەوە و هیچ لایەکی بەتاریکی نەمێنێتەوە. لێرەدا مەبەست ئەوەیە هەوێنی نووسینەکە تەواو پێگەیی بێ و شێوەی دەربڕینی خۆی دۆزیبێتەوە، وەک چۆن ئاو لە ناو تاشەبەردا ڕێگەی خۆی دەکاتەوە، ئەو کاتە بنووسرێ، چونکە بیری نەکڵۆک و کاڵوکرچ و پێنەگەیشتوو بەرهەمێکی هونەری ڕوون نادا بەدەستەوە و ئامانج ناپێکێ.

بەنسبەت (شێخ نووری) خۆیەوە ئەوسەر تا ئەوسەری دیوانەکەی بەرهەمی ئاڵۆز نابینین خوێنەر بەدیارییەوە دۆش دابمێنێ، لە پاش ئەویش شاعیرانی دیکەی وەک (گۆران) و (هەردی) و (دیلان) و (ع. ح. ب) و (دڵدار) و (کاکەی فەللاح) و... تاد. پەیڕەوی ئەو ڕێبازەیان کردووە، بۆیە دەتوانم بەیەکێک لە سیمایە ئاشکراکانی ئەو قوتابخانە تازەیەی دابنێم. ئینجا دوای دەستنیشانکردنی سیمایە ئاشکراکانی ئەو قوتابخانەیە دەبێ بڵێین شێخ نووری داهێنان و بەخششەکانی خۆی بەبزووتنەوەی ڕزگاریخوازانەی سەردەمەکەی بەستووەتەوە شێخ مەحموودی نەمری بەڕابەری ئەو بزووتنەوەیە زانیوە، شیعرەکانی بەم ئاواتانەوە بەستەوە کە لە شێخی نەمردا بەدی دەکرد، بەدی نەهاتنی ئاواتەکانی کاری کردە سەر داهێنان و بەخشش و بەرهەمەکانی. وەک سەرەتا دەستی دایێ، هەروا لەسەری نەمایەوە و بەرە بەرە بەرەو ساردبوونەوە ڕۆیشت. لە لایەکی دیکەوە شێخ نووری بەهرەکەی خۆی بەسەر کۆمەڵێ شتی جیاوازدا دابەش کرد، کە ئەو دابەش کردنە کار دەکاتە سەر بەرهەمی شیعری ئەو، چونکە ئەگەر بەتەواوی خۆی بۆ ئەو لایەنە تەرخان بکردایە، لەوانە بوو سەرکەوتنێکی زۆر گەورەتر بەدی بێنێ. ئینجا نەبوونی و دەست کورتی و ماڵ و منداڵ زۆری، سەرقاڵی کرد و کەوتە مشووری بەخێوکردنیان، لە وەزیفەشدا وەک لە شیعری (هاوار لە دەس مالیە) و (ئاوڕێک بۆ دواوە)دا کە بۆ (گۆران)ی نووسیوە، وا دەردەکەوێ (وەزیفە دیتن) کارێکی زۆری کردبێتە سەر داپچڕانی لە ئەدەب و لە خوێندنەوە.

هەر لەو کاتەشەوە کە کرا بە(بەڕێوەبەری ناحیە) ئیتر سەقامگیری بەخۆیەوە نەدی، هەر ڕۆژە و لە شوێنێک هەواری دەخست و دەگوێزرایەوە بۆ (ناحیە)یەک، ئەمەش لە لای خۆیەوە کارێکی زۆر دەکاتە سەر کەسێک کە خۆی تەرخان کردبێ بۆ (ئەدەب)، چونکە هێمنی و ئارامی دەروونیی لەبەر هەڵدەگرێ و ئەو ئیقاعەی لەسەری ڕاهاتووە بۆ (نووسین و خوێندنەوە) بەهۆی جێگۆڕکێی زۆر دەگۆڕێ و خوێندنەوە و نووسینی کەم دەکاتەوە.

ئەمـانە لەولا بوەستن، لەم لایەشـەوە تووشی چەند نووچدان و تێکشکانێکی دەروونیی هات کە ئەمانەش لە شیعر و بەخشش سارد‌بیان کردەوە. لەوانە بەئاوات نەگەیشتنی بەو کچە دڵدارەی کە خۆشی دەویست و بەتەما بوو بیهێنێ، کەچی ساڵی (١٩٢٦)دا بەشوو درا. ئینجا مردنی دوو برای لە خۆی بچووکتری (شێخ عەزیز ) لە ساڵی (١٩٣٦) و (شێخ ئیبراهیم) لە ساڵی (١٩٥٠)، تا ڕادەیەکی زۆر ئەم ڕووداوانە کاریان کردە سەر شێخ نووری و نەیتوانی بەپێی پێویست لە مەسەلەی (تازەبوونەوە) قووڵ ببێتەوە و لەگەڵی بەردەوام بێت و ئەمەش لەسەری کرا بەڕەخنە و وای لە زۆر کەس کرد بڵێن: شێخ نووری سەرپێیی و ڕاگوزار بووە لە (تازەبوونەوەی شیعری کوردی)دا، کە ئەم ڕایە بەلای منەوە ئینسافی تێدا نییە و پێویستە ڕستەکە وا ڕاست بکرێتەوە کە شێخ نووری لەبەر کۆمەڵێ (هۆ) نەبوایە، بەرهەمی بەهێز و بەخششی گەورەتر دەبوو، بەڵام ژیان هەر ئەوەندە دەرفەتی دا، کە بەوەندە بەخششەی خۆی قایل بێت و نەتوانێ لەوە زیاتری لێ زیاد بکات، لە دواییشدا بەپێی داوایە گەورەکانی سەردەم، پشکۆی داهێنان و نوێکردنەوەکەی کز بێت و بەرەو خامۆشی بچێت. ئەم مەسەلەیەش وەنەبێ بەتەنیا (شێخ نووری) گرتبێتەوە، ئەوەتا ڕەخنەگرانی عەرەب دەربارەی دوا قۆناغی شیعری (سەیاب)یش دەڵێن: «شیعری ئەم قۆناغەی هیچ تازەیی تێدا نییە. سیعری زاتی و ئینفعالین، لە زۆر جارانیشدا لاواز. هەندێک شیعری نەبێ لەوانە سفر أیوب»[١٦] کە ئەمەش بەهیچ شێوەیەک ڕۆڵی ئەو لە تازەبوونەوە و پێشڕەوایەتی کەم ناکاتەوە، کەچی لە لای ئێمەدا هەندێک دوا قۆناغی (شێخ نووری) دەکەنە بەهانەیەک بۆ ئەوەی لە نرخی بشکێنن و لە ڕۆڵی پێشڕەوایەتی و ڕچەشکاندنەکەی کەم بکەنەوە. شەکسپیریش لە ناوەڕاستی ژیانی لە لوتکەی بەخشش و داهێنانیدا بوو، وەک چۆن گۆران-یش لە قۆناغی پەیڕەوکردنی ڕیالیزمی سۆشیالیزمدا ئاستی هونەری شیعرەکانی دابەزین. ئەم چەند لایەنەی دەرم خستن لە دواخستنی (شێخ نووری) لە کاروانی تازەبوونەوە، ئەوە ناشارێتەوە کە وەک (مێژوو) دەستپێشخەری نووسینی شیعری تازەی کردووە. لەم سیمایانەی قوتابخانەی شیعری تازەشیان دروست کرد، کەم یان زۆر لە ڕەنگ بۆ ڕشتنیان بەشدار بووە، ئەمەش پێویستە لە لێتوێژینەوە و لێکۆڵینەوەکانی داهاتووماندا ڕوونتر بکرێتەوە و نووسینی زۆرتری بۆ تەرخان بکرێ.

---

(١٦) دیوان بدر شاکر السیاب، المجلد الاول، دار العودة، بیروت، ١٩٧١، ص ث ث، بقلم ناجي علوش.



دیسانەوە ئاهەنگی گوێزانەوەی حەپسەخانی نەقیب بۆ شێخ قادری حەفید – ۱۹۲۲
وەستاوەکان: قادر ئەفەندی قەرەداغی، شێخ محێدینی شێخ ڕەشید، سەیید ڕەئووف (کەرکووکی؟)، شێخ ڕەشیدی شێخ عەلی سەرکار، ساڵح زەکی ساحێبقڕان، سەیید ئیبراهیمی حەفید، شێخ قادری حەفید، عارف سائیب، سەیید ئەحمەدی بەرزنجی (مەرەخەس)، ڕەزا بەگی ئیسماعیل بەگ؟، تۆفیق وەهبی.

دانیشتووی ڕیزی دووەم: محەمەد ئەفەندی جلخوار، ڕەشید سدقی غەفوور، یوونس عەبدولقادر (ماهی)، فایەق کاکەمین، ڕەشید شەوقی.

دانیشتووی ڕیزی یەکەم: شێخ جەلالی شێخ ئەحمەدی حەفید، ڕەمزی عەبدولکەریم، ڕەئووف ئەفەندی؟، شێخ نووری شێخ ساڵح، ئەمین ڕەواندزی.

# پێداچوونەوەیەک بەهەندێ بیروڕا
# کە لە بارەی شێخ نووری-یەوە نووسراون

خوێندەواری خۆشەویست:

هەروەک لەمەوپێشتر پێم ڕاگەیاندی و خۆشت لە من چاکتر دەزانی، تا ئەمڕۆکەش چ بەنووسین و چ بەکۆکردنەوە و لە چاپدانی شیعرەکانی شێخ نووری، کارێکی ئەوتۆ ئەنجام نەدراوە تینوویێتی بشکێنێ و کارەکە شایستەی پلە و پایەی شاعیرێکی وەک شێخ نووری بێ. لەگەڵ ئەو کەمتەرخەمی کردنە بەرانبەری، لەگەڵ ئەو فەرامۆشکردن و کەم بەسەرکردنەوە و لا لێ نەکردنەوەیەشدا، زۆر جار لە نووسینی سەربەخۆ بووبێ، یان لە دووتوێی هەندێ نووسین و وتاردا کە لایان لە شێخ نووری کردووەتەوە، لاکردنەوە و لێدوانەکەیان نیوەوناچڵ بووە، یان نووسەرەکەی بەسەهوودا چووە و سەرچیغ بۆ مەسەلەکە ڕۆیشتووە، یان بەدەستی ئەنقەست بەمەبەستی کەمکردنەوە لە پلە و پایەی ئەم شاعیرە قەڵەمی بۆ خراوەتە سەر کاغەز. ئەمەش بەپێی بۆچوونی من بۆ گەلێ هۆ دەگەڕێتەوە. لە سەرووی هەموو ئەو هۆیانەوە لە بەردەست نەبوون و نەبینینی سەرجەمی شیعری (شێخ نووری)یە.

کەمی بەرهەمی شێخ نووری لە بەردەستی لێتوێژەرەوەکان و کەمی ئاگاداربوون لە چاووگی ڕۆشنبیریی و هێڵە ورد و درشتەکانی داهێنانی ئەم شاعیرە، زۆر هاوکێشەی وەهمیی دروست کردووە، لەم هاوکێشانەوە، هەندێ قسە فڕێ دەدرێ من لێپرسینەوەیان تێدا نابینم. جا لەم بەشەدا بەپێی توانایی خۆم هەوڵ دەدەم هەندێ لەو بیروڕایانە تاووتوو بکەم و بەسەریاندا بچمەوە، ئینجا ڕووناکی زیاتریان بخەنە سەر. لەو پێداچوونەوەیەشمدا پشتم بەو بەرهەمە شیعریانەی شاعیر ئەستوور دەکەم، کە لێرەدا کۆم کردوونەتەوە و باری سەرنجی تایبەتی لە لا دروست کردووم. لە لایەکی دیکەشەوە پەنا دەبەمە بەر ئەو زانیارییە تازانەی دەربارەی شاعیر دەستم کەوتن. حەزیش دەکەم لە پێشەوە ئەوە بڵێم: موناقەشە کردنی ئەو بیروڕایانە و داکۆکی کردن لە شێخ نووری، تەنیا ڕوونکردنەوە و دەرخستنی هەندێ لایەنە، کە بەڕای خۆم بە(ڕاست)یان دادەنێم و حەز دەکەم دوور لە هەموو جۆرە سۆز و مەیل و بڕیارێکی پێش وەختە بدوێم و هەرشتە بۆ لای

خۆمە ببەمەوە، واتە خزمایەتی و کورە گەڕەکی و هەندێ پاڵنەری تر وامان لێ نەکات بەرچاوی خۆمان نەبینین و مەوزووعیەت بکەین بەقوربانی زویر نەکردنی هەندێ کەس کە قارسن بەرەخنە لێگرتن، چونکە ئەمڕۆکە بێ، یان بەیانی مێژوو هەر بڕیاری عادیلانەی خۆی بەسەریاندا دەسەپێنێ. کە من بەو شێوەیە دەدوێم هەموو کەس دەزانێ ئەو شێوە دوانە هیچ بەرژەوەندییەک بۆ من ناهێنێتە دی، جگە لە ڕەنجاندنی هەندێ کەس کە تەنیا حەز بەپیاهەڵدان دەکەن. واتە نە خزمایەتی و کەسایەتی، نە هیچ جۆرە بەرژەوەندییەکی دیکە ئەو ڕایانەی پێ دروست نەکردووم. تەنیا ویستوومە بەڕاستگۆییەوە قەناعەتی خۆم دەرببڕم، حەزیش دەکەم باجی قەناعەتی خۆم بدەم و با لێشم بڕەنجێن، نەک بەریاکردن و فڕوفێڵ و درۆ ئێوەش و خۆشم بخەڵەتێنم.

ئەمڕۆکە شتێک هەیە سێ و دووی لەسەر ناکرێ، ئەوەش دان پێدانانی هەموو لایەکە بەگەورەیی شاعیرێکی وەک مامۆستا (گۆران)، ئەم حەقیقەتە لە لای خوێندەوار و نەخوێندەواری کورد چەسپاوە، دۆست و دوژمنی گۆران - ئەگەر دوژمنی هەبێ - دان بەوەدا دەنێن. هەرکەسێ بیەوێ وەک شاعیرێکی گەورە و لێهاتوو لە نرخی مامۆستا (گۆران) کەم بکاتەوە، وابزانم لە پێش ئەوەی لە نرخی ئەو کەم بکاتەوە، نرخی خۆی دەشکێنێ. دەرخستنی رووی گەشی شاعیرایەتی شێخ نووری و هەوڵدان بۆ ئەوەی مافی خۆی بدەینێ، هیچ لە نرخی مامۆستا (گۆران) کەم ناکاتەوە، وەک چۆن هەوڵدان بۆ کەمکردنەوە لە شاعیرایەتی (گۆران) بەکارێکی ناڕەوا دەزانم، بەو پێیەش لەگەڵ ئەوانەدا نیم سەری شاعیرێک بکوترێتەوە کە مامۆستا (گۆران) خۆی ڕێزی لە شاعیرایەتییەکەی گرتووە. (گۆران) خۆی لەوە گەورەترە لە پاڵ لێدانی شاعیرێکی دیکەوە بەرز بکرێتەوە. لێکۆڵینەوە لە بەهرە و توانایی و داهێنانەکانی ئەو بۆ دەرخستنی جوانی شیعرەکانی پلەیەکی دەداتێ پێویستی بەو شێوازە نەبێ. ئەگەر کەسانێکیش هەبن بیانەوێ لە نرخی مامۆستا (گۆران) کەم بکەنەوە بۆ بەرزکردنەوەی بەناهەقی -شێخ نووری- ئەوە ئەو جۆرە کەسانەش ئاسنی سارد دەکوتن و لەگەڵ ئەوەدا نیم پایەیەکی بۆ دابنرێ کە خۆی موستەحەقی نەبێ. باشترین دەمڕاستی هەر شاعیرێک بەرهەمەکانیەتی، هەر بەوەش دەتوانین بەرهەمەکانیان بکەینە کەرەسەی نرخاندن و هەڵسەنگاندن. گرنگترین شت بەلای منەوە ئەوەیە ڕەخنەگر و لێتوێژەرەوەی کورد عاتیفە بەلاوەبنێ، ئەگەر بیەوێ پێشکەوێ و حەز بەگیانی زانست پەروەریی دەکات و دەیەوێ خوێندەوار بەگیانی زانست پەروەری ئاشنا بکات، پێویستە لە هەندێ هەڵوێستدا - با بەخەراپ بۆ خۆی بکەوێتەوە - پێ

بەجەرگی خۆیەوە بنێ و لە قسەی ڕاست لانەدات. بەو جۆرە دەتوانین ببینە مرۆڤی سەردەمی خۆمان و خوێندەواری زیرەک و شارستانیش هەر لەو کەشوهەوایەدا دێنە گۆڕێ، ئەگەر نا، ئەوە هەتا ماوین گیانی تیرەگەریی و شەڕەگەڕەکی لە کولتووری کوردیدا کۆتایی پێ نایێت!

***

* یەکێک لەو تێبینییانەی سەرنجی بۆ لای خۆی ڕاکێشام، چەند دێرێکی کاک (ساجید ئاوارە)یە. لەو چەند دێرەدا نووسیویەتی: «بوونی گۆڤاری گەلاوێژ لە ساڵی (١٩٣٩)ەوە بۆ ماوەی (١٠) ساڵ سەرەتای جوولانەوەیەکمان پێ ڕائەگەیەنێ لە نووسینی چیرۆکی هونەری کوردیدا، کە وەرگێڕانی چیرۆکی بێگانە لەم گۆڤارەدا بوو بەچاوساغی نووسەرانی کورد وە (نووری شێخ ساڵح) یەکێک لەو نووسەرانە بوو»[1]. لەو بڕوایە دام وەک کاک ساجیدیش دانی پێ داناوە، کەس نییە نکوڵی لەوە بکات کە گۆڤاری گەلاوێژ بەڕاستی سەرەتای جوولانەوەیەکی گەورە بوو لە ئەدەبی کوردیدا، لە ماوەی دە ساڵی تەمەنیدا بێ وچان خەباتی کرد بۆ پەرەپێدان و پێش خستنی ئەدەبەکەمان. تا ئەمڕۆکە تاقە گۆڤارێکی کوردیمانە کە توانیبێتی لە ماوەی دە ساڵی تەمەنیدا ئاستی خۆی بپارێزێ و ئەمەش مایەی خۆ هەڵکێشانی هەموو کوردێکە. بۆیەش شایانە لاف و گەزافی پێوە لێبدەین و پێیەوە بنازین، چونکە لە ماوەی دە ساڵی ڕەبەق پشتی بەئەرز نەکەوت و ژمارە لە دوای ژمارە بەهێزتر دەبوو و ڕۆڵێکی گەورەشی لە ژیانی کولتووریی کورد گێڕا. لەو ماوەیەدا لە هەموو بوارێکدا: «شیعر و چیرۆک و وەرگێڕان و وتاری سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕەخنە و لێکۆڵینەوە» دریغی نەکرد، بۆیە ئەگەر وەک کاک (ساجید) دەڵێ: «بوو بەچاو ساغی نووسەرانی کورد» تا ئێرەیان ڕاست دەکات و منیش دەڵێم ئەمڕۆکە نووسەری کورد ناتوانێ پشت بکاتە ئەو گۆڤارە و سوودی لێ وەرنەگرێ. خۆشم یەکێکم لەو کەسانەی پەڕە بەپەڕەی ئەو گۆڤارەم تاووتوو کردووە و ماوەیەکی زۆریش خۆم لەگەڵی خەریک کرد و سوودی ئێجگار زۆرم لێ وەرگرتووە. کە هاتمە سەر دروستکردن و سازدانی بیبلیۆگرافیایەک بۆ (شێخ نووری) جارێکی دیکە گەڕامەوە سەر ژمارەکانی، بەهیوای ئەوەی بزانم چەند شیعر و نووسینی شێخ نووری تێدا بڵاوکراوەتەوە، یان کێ لەسەری نووسیوە. ئەوە بوو لە دوو شیعر بەولاوە هیچی دیکەم تێدا نەبینی پێوەندی بەشێخ

---

(١) لێکۆڵینەوەی ئەدەبی نوێی کورد، ساجید ئاوارە، چاپخانەی ژین، سلێمانی، ساڵی ١٩٦٧ ل ٥٢ .

نووری-یەوە هەبێ. بەداخەوە ئەوەی کاک (ئاوارە) نووسیویەتی بەرچاوم نەکەوت، گوایە شێخ نووری یەکێک بووبێ لەو نووسەرانەی چیرۆکی وەرگێڕابێ. ئەم قسەیەشم تەنیا گۆڤاری گەلاوێژ ناگرێتەوە، بەڵکو سەرجەمی ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانەش دەگرێتەوە کە من هەڵم داونەتەوە و بەرهەمەکانی شێخ نووریم تێدا بینیوە. لە هەموو گەڕان و پشکنینەکەشمدا، نە چیرۆک، نە وەرگێڕانی چیرۆکم بەرچاو نەکەوتووە. کەسیش ئەوەی بەگوێمدا نەداوە (شێخ نووری) ڕۆژێ لە ڕۆژان چیرۆکی نووسیبێ، یان وەرگێڕابێ، ئیدی نازانم مامۆستا (ئاوارە) لەسەر چ بنچینەیەک ئەو ڕایە دەدات و بۆچی ناوی ئەو چیرۆک و وەرگێڕاوانەی شێخ نووری نابات؟ لە لایەکی دیکەشەوە سیپارەکە باسی شاعیرانی وەک (گۆران و هەردی و دیلان و... تاد) دەکات بەڵام نازانم کاک (ساجید) بۆچی و بە چ بیانوویەک ناوی (شێخ نووری) پشتگوێ خستووە و لەتەک ئەو شاعیرانەدا باسی لێوە نەکردووە؟!

* مامۆستا (جەمال بابان) لە نووسینێکیدا بەناوی: «کە دەست کرا بەکوردی نووسین» دەڵێ: «لەبەرئەوەی زۆر لەسەر شێخ نووری نووسراوە! نامەوێ زۆر لەسەری بڕۆم، چونکە دووپاتکردنەوەی هەر شتێک خەڵک پەست ئەکات و ناخۆشە»[2] خوێندە وا چاوەڕێی دەکرد لەو وتارەدا شتێکی تازە دەربارەی شێخ نووری بخوێنێتەوە، بەڵام بەداخەوە مامۆستا بەو بیانووە خۆی لەو ئەرکە بەدوور دەخاتەوە، لە کاتێکدا خوێندەوار ئەوەش باش دەزانێ کە شێخ نووری زۆری لەسەر نەنووسراوە و ئەوەی نووسراویشە هەر شتی سەرپێیی بووە یان دووبارەکردنەوەی بەشێکی زۆری ئەو بیروڕایانە بووە کە مامۆستا (ڕەفیق حیلمی) دەربارەی شێخ نووری نووسیویەتی، تەنانەت ئەگەر زۆریشی لەسەر نووسرابێ، ئەم زۆر لەسەر نووسینە ڕێگەی لە قەڵەمی بەبڕشت و بەهرەدار نەگرتووە شتی خۆی بڵێ و بیروڕای تازەتر بخاتە سەر خەرمانی بیروڕای ئەو کەسانەی نووسیویانە، بۆیە مامۆستا (جەمال بابان) شتێکی تازەی بەدەستەوە نەداوە و یەکسەر گەڕاوەتەوە سەر بیروڕایەکانی مامۆستا (ڕەفیق حیلمی) کە لە بەرگی دووەمی کتێبەکەی «شیعر و ئەدەبیاتی کوردی»دا دەربارەی شێخ نووری نووسیویەتی، لە باسکردنی شیعری «جووت و گا شتێکی چاکە»شدا سەرپێیی لە شیعرەکەی ڕوانیوە و هەر ئەو شتانەی دووبارە کردووەتەوە کە لە

---

(٢) بلاوکراوەی ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (٣٧) ١١-١-١٩٧٥ «کە دەست کرا بەکوردی نووسین»، جەمال بابان.

شیعرەکەدا باس کراون. واتە کەوتووەتە ڕاڤەکردنی شیعرەکە، کە خۆی ڕوونە و پێویستی بەڕوونکردنەوە نییە. لەبەر ئەوە نووسینەکەی زۆرتر لە ئینشایەک دەکا، کە نووسینی ئەوەندە گران نییە. ئەگەر کەسێک نووسەریش نەبێت زەفەر بەنووسینی ئەو جۆرە وتارانە دەبات!

* دکتۆر عیزەددین مستەفا ڕەسووڵ لە کتێبەکەیدا «الواقعية في الأدب الكردي» وەک سەرچاوەیەک پشتی بەبەرگی دووەمی کتێبی «شیعر و ئەدەبیاتی کوردی» مامۆستا (ڕەفیق حیلمی) بەستووە. لەو کتێبەدا دوو شیعری شێخ نووری نووسراوە، لە زۆربەی ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکاندا شیعری شێخ نووری بڵاوکراوەتەوە، ئەو شیعرانەش بەسن بۆ ئەوەی دکتۆر عیزەددین لە نامەی دکتۆرایەکەیدا بەچەند لاپەڕەیەک جێگەی بۆ بکاتەوە. بواری ئەوەش ناهێڵنەوە کە شیعرو سەرچاوەی لە بەردەستدا نەبووە، چونکە ئەو کاتە نامیلکەیەکی بچووکی (شێخ نووری)یش لە چاپ درابوو بەناوی (هۆنراوەی نووری شێخ ساڵح) کە لە ساڵی (١٩٥٨) بەپێشەکی مامۆستا (کامەران موکری) کەوتە بازارەوە، کەچی دکتۆر لە دێرێک (یان باشتر وایە بڵێین لە چەند ئیشارەتێک بەولاوە) زیاتری بەشێخ نووری ڕەوا نەدیوە، لە کاتێکدا شێخ نووری وەک لەم کتێبەدا دیارە شاعیرێکە، شیعری ڕیالیزمی زۆرە.

زۆر لەو شاعیرانەش کە لە کتێبەکەیدا ناویان هاتووە و باس کراون لە شێخ نووری زیاتر نین، ئەگەر نەڵێین شان بەشانی زۆربەیان ڕۆیشتووە. هەر بەپێی بیروڕای ئەو شاعیرانە شێخ نووری شوێن و پایەیەکی باشی لە شیعری کوردیدا بۆ دەستنیشان کراوە. وا بزانم ئێستا دکتۆر خۆشی لەگەڵ ڕایەکەم دایە کە سەیر دەکات بەئیشارەتێک مەسەلەی شێخ نووری براندووەتەوە کە نووسیویەتی: «پیرەمێرد لەسەر ئەوە بەردەوام بوو، تاکو لەم دوا دواییەدا دەستپێشخەریی دەربڕینێکی ڕیالیزمییانەی لێ بەدەرکەوت. لەگەڵ پیرەمێردا و لە ماوەی نێوان جەنگەکە، ڕیالیزم لەگەڵ بیروباوەڕی ڕزگاریخوازانەدا نەشونومای دەکرد. ئەو نەشونوما کردنەش لە قوتابخانەی ڕیالیزمی نوێدا خۆی داڕشت. شان بەشانی پیرەمێرد (شێخ نووری شێخ ساڵح)یش تەعبیری لە هەمان پێشکەوتن دەکرد لە نەشونوما کردنی داهێناندا»[3] دکتۆر لەو وتارەشیدا کە بۆ پۆلی چوارەمی ئامادەیی نووسیوە دەڵێ: «بەڵام هەروەک گۆران خۆی وردە وردە بەرەو قوتابخانەی ڕیالیزم هات، هەروەها گەلێک لەو شاعیرانەش پێش ئەو یا پاش ئەو بەتەئسیری ژیانی گەل و خوێندنەوەی بەرهەمی

(٣) الواقيعة في الادب الكردي، د. عزالدين مصطفى رسول، بيروت، ١٩٦٦ ل ٩٠-٩١

نووسەرانی جیهانی ڕوویان کردە ڕیالیزم و ئەو ماوە ڕۆمانتیکییە لە ئەدەبیاتی کوردیدا زۆری نەخایاند»[٤].

مادامەکێ «گەلێک لەو شاعیرانەش پێش ئەو یا پاش ئەو بەتەئسیری ژیانی گەل و خوێندنەوەی بەرهەمی نووسەرانی جیهانی ڕوویان کردە ڕیالیزم» دەبوایە شێخ نووری ڕووپێوێکی فراوان لەو کتێبەدا بگرێت، چونکە کەرەسەیەکی زۆری واقیعی بۆ شیعرەکانی دەستەمۆ کردووە و بەتەئسیری ژیانی ئەو سەردەمە شیعری دەنووسی!

* کەمال غەمبار لە باسی کتێبەکەی دکتۆر کامیل بەسیر دەربارەی شێخ نووری شێخ ساڵح نووسیویەتی: «لە ناوەرۆکی نووسینەکەدا دکتۆر ئەلبەسیر لە شێخ نووری و گۆران دەدوێ و باسی هونەری جوان و هونەری بەسوود دەکات و لە سۆزی وێژەیی، پێناسەی وێژە و مەسەلەی فۆرم و ناوەرۆک لە وێژەدا دەدوێ، پاشان دێتە سەر هۆنراوە و پەخشان و کێش و سەروا و کەسایەتیی وێژەر و بنچینەکانی کاری نووسین. لە کۆتاییدا لە شێواز دەدوێ و ئینجا سەرەنجامە گشتییەکان دەدات بەدەستەوە، شێخ نووری شێخ ساڵح بەسەرۆکی ڕێبازی تازەکردنەوەی هۆنراوەی کوردی دەداتە قەڵەم و بەیەکەم ڕەخنەسازی وێژەیی دادەنێ کە خاوەن شەخسیەتێکی تایبەتی خۆی بووە و بەزەینێکی کراوە و مێشکێکی لێکدەرەوە، ڕێگای داهێنان و خوڵقاندنی گرتۆتە بەر»[٥].

تا ئێرە ئەم قسانە چەند شتێک دەگەیەنێ، لە سەرووی ئەو شتانەوە ئەوەیە کە کاک کەمال غەمبار هەرچەندە ویستوویەتی ئەم کتێبە (نمایش - عرض) بکات، بەڵام کتێبەکەی نەخوێندووەتەوە! چونکە ئەگەر کتێبەکەی بەوردی بخوێندایەتەوە، بۆی دەردەکەوت کە کتێبەکە: «بووژاندنەوەی ئەم کۆمەڵە وتارە و دووبارە بڵاوکردنەوەیان»ـە. ئەوەش نازانێ ئەو کۆمەڵە وتارە ڕەخنەییە هی (شێخ نووری)یە و لە ڕۆژنامەی (ژیان)دا بڵاوکراونەتەوە، چونکە ئاگای لە مێژووی ڕۆژنامەنووسیی کوردی نییە. دکتۆر کامیل پێشەکی بۆ ئەو وتارانە نووسیوە و ڕاوبۆچوونی خۆی لەسەر وتارەکان دەربڕیوە، کەچی ئەو ڕق بەری چاوی گرتووە و بە(دەدوێ) و (دێتە سەر) قسە دەکات، واتە وای نیشان دەدات کە ئەم لایەنانە دکتۆر کامیل لێی دواوە و باسیانی لێوە کردووە. ئینجا کە دکتۆر هاتووە شێخ نووری بەسەرۆکی ڕێبازی تازەکردنەوەی هۆنراوەی کوردی دەداتە قەڵەم، ئەمە قسەیەک نییە لە گیرفانی خۆی هێنابێتییە دەرێ، بگرە ئەمە قسەی مامۆستا (گۆران)

(٤) بڕوانە زمان و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی چوارەمی ئامادەیی -چاپی شەشەم- ١٩٨٠ هەولێر.

(٥) بڕوانە: گۆڤاری بەیان، ژمارە (٨٠)ی مانگی حوزەیران ١٩٨٢ ل ٩٤-٩٥ .

خۆیەتی کە دەڵێ: «کەوابێ هەمووما‌ن بەیەکەوە ئەمانڕووانییە یەک کلاورۆژنە، بەڵام ئەتوانرێ بەشێخ نووری شێخ سالح بوترێ سەرۆک بەهۆی یەکەم: زۆری بەرهەمی. دووەمی: بلاوکردنەوەی بەرهەمەکەی کە بێگومان تەئسیری ئەبەخشییە سەر ئەدەبی کوردی». بێگومان ئەو (٢٥) ئەڵقە ڕەخنەییەی لە ڕۆژنامەی ناوبراویشدا بلاوی کردنەوە، دەیسەلمێنێ شێخ نووری نەک هەر شاعیرێکی ڕابەر و ڕچەشکێنە، بەڵکو بەحەقیانەت (مونەزری) ئەو تازەبوونەوەیەیە و بەردی بناغەی قوتابخانەی شیعری نوێی داناوە. ئینجا دەڵێت: (ئایا چۆن شێخ نووری شێخ سالح بەسەرۆکی بزووتنەوەی نوێکردنەوەی هۆنراوەی کوردی دەژمێرێت؟ کوا کارتێکردنی هۆنراوەکانی لە شیعری نوێی کوردی؟»[٦] کە مامۆستا (گۆران) خۆی بڵێت «بێ گومان تەئسیری ئەبەخشییە سەر ئەدەبی کوردی» وا بزانم پێویست بەوە ناکات کەس خۆی بەسەفسەتەوە خەریک بکات، یان خوێنەر بەشتێکەوە سەرقاڵ بکات، کە مامۆستا (گۆران) بڕاندوویەتییەوە.

مامۆستا (گۆران) وەک ئینسانێکی ڕۆشنبیر و مەتەوازیع دانی بەو حەقیقەتەدا ناوە کە شێخ نووری سەرۆکی ئەو قوتابخانەیە بووە. ئەم دان پێدانانەش وەک شاعیرێک هیچی لێ کەم ناکاتەوە. بەڵکو بڕوا بوونە بەبەهرە و توانایی خۆی. ئینجا جارێکی دیکە دەپرسێ: «نووری شێخ سالح چ ڕێبازێکی لە دوای خۆی بەجێ هێشت و کام شاعیری کوردی شوێن پێ کەوت» ئەمە دووبارەکردنەوەی قسەکەی مامۆستا (ڕەفیق حیلمی)[٧] بەبێ ئەوەی بەئەمانەتەوە پەنجە بۆ سەرچاوەکە ڕابکێشرێ. ئێمە وەک لە پێشتر وتمان بەرپاکردنی بزووتنەوەیەکی شیعری گەورە، قورساییەکەی بەتەنیا ناکەوێتە سەرشانی شاعیرێک، بەڵکو ئەو ئەرکە زۆر و کەم کۆمەڵە شاعیرێک ڕایدەپەڕێنن و دەیچەسپێنن.

وەک دەزانین ڕێبازی سوریالیزم لە ئەدەبی فەرەنساییدا لەسەر دەستی (ئەندرێ بریتۆن) هاتە کایەوە و بەرپا بوو، (ئاراگۆن)یش شاعیرێک بوو سەر بەو ڕێبازە و لە دامەزرێنەری ڕێبازەکە شاعیرتر و هونەرمەندتر بوو، ئەم شاعیرێتییە دەوری (بریتۆن)ی وەک دامەزرێنەر نەسڕییەوە. لە لای من مەسەلەکەی نێوان شێخ نووری و گۆرانیش هەروایە، سەرۆکایەتی کردن و دەستپێشخەرییەکەی شێخ نووری لە ڕۆڵی مامۆستا (گۆران) کەم ناکاتەوە، ئەگەر قوتابییش مامۆستاکەی تێپەڕێنێ و پەرە بەهەوڵ و کۆششی ئەو بدات،

---

(٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(٧) بڕوانە: گۆڤاری پێشکەوتن، ژمارە (١)ی ساڵی (١) شوباتی ساڵی ١٩٥٨، «ئینقیلاب لە شیعری کوردیدا» ڕەفیق حیلمی.

کارێکی سەیر نییە، چونکە هەریەکەیان شەخسیەتی شیعریی خۆیان هەیە. ڕەنگە بەبەراورد کردن (گۆران) لە شێخ نووری زۆر شاعیرتر بێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا ڕۆڵی شێخ نووری لە موغامەرەکردنی تازەبوونەوە و خۆ لە قەرەدانەکە ناداتە دواوە، ئینجا خەڵک دوای کەوتبێ یان نەء، ئەمەیان پێویستی بەلێکۆڵینەوەی ورد و لەبار و تێروتەسەل هەیە.

ئەو لێکۆڵینەوانەی لەمەوەدوا لەم بارەیەرە ساز دەدرێن، ئەوە دەسەلمێنن لە ڕەخنەی زانستیدا قسەی ڕووت و بێ بەڵگە بڕناکات. ئینجا یەکسەر دەڵێ: «مەسەلەی نوێکردنەوە و داهێنانی ڕێبازی تازە لە شیعری کوردیدا لە ڕێگەی چەند هۆنراوەیەکەوە مەیسەر نابێ» ئەم قسەیە ئەوەمان پێ ڕادەگەیەنێ کە ئەو نووسەرە وەک کردوویەتی بەعادەت لە قسەکانیدا زۆر هەڕەمەییە، چونکە شێخ نووری خاوەنی چەند هۆنراوەیەک نییە. من بەشێکی شیعرەکانیم کۆ کردووەتەوە، ژمارەی گەیشتووەتە (١١٧) پارچە شیعر، جارێ زۆر شیعری تریشی هەیە لەبەر دەستاندا نین. یان ون بوون، یان بەهۆی ئەو ڕووداوانەی بەسەر میللەتەکە داهاتووە ژنەکەی ناچار کردووە بیانسووتێنێ. لێرەدا گرفتەکە ئەوە نییە شێخ نووری چەند شیعری هەیە نوێنەرایەتی تازە بوونەوە دەکات، بەقەدەر ئەوەی مەبەستمان ڕچەشکاندن و دەستپێشخەرییە مێژووییەکەیە کە دکتۆر بەسیریش هەر ئەوەی مەبەستە، مەبەستی نەبووە بڵێ چەند دوای کەوتوون یان دوای نەکەوتوون. ئەگەر ئەو مەسەلەیەش بەگرنگ نازانێ، ئەی ڕەخنەگران و لێتوێژەرەوەکانی عەرەب لە پای چی زیاتر لە چارەکە سەدەیەکە خۆیان بەدەستپێشخەری لە تازەبوونەوە خەریک کردووە و بەدوای ئەوەدا عەوداڵن بزانن یەکەم شیعری تازە کە بەتەفعیلەی تازە نووسرابێ هی (نازک ئەلمەلائیکە)یە یان (ئەلسیاب) یان (عەلی ئەحمەد باکثیر) و (لویس عەوز) لە کاتێکدا هەموو ئەو نووسەرانە لەسەر ئەو ڕایە یەک دەگرنەوە کە (بەدر شاکر ئەلسیاب) شاعیرێکی گەورەی عەرەبە و زۆر پێش ئەو شاعیرانە کەوتووە کە دەستپێشخەریی تازەبوونەوەکەیان کردووە. بەڵێ منیش لەگەڵ ئەوەدا نیم و بەهەڵەیەکی مێژوویی گەورەشی دەزانم کەسێک بێت و شاعیرێک بکاتە داردەست و بیەوێ بەهۆی ئەو شاعیرەوە سەروپۆتەڵاکی شاعیرێکی دیکە بکوتێتەوە. یان هەوڵ بدات مافی ئەویان بداتە ئەوەکەی دیکە و لەسەر حیسابی ئەو گەورەی بکات، چونکە ئەم کارانە زوو دەتوێنەوە و زووش دەردەکەون. خوێنەرانیش هەر زوو قێزوبێزی لێ دەکەنەوە. کەواتە پێویستە هەر شاعیرە و مافی خۆی بدرێتێ، بەبێ هیچ مەیلبازی و جۆرە سۆز و عاتیفەیەکی پێش وەخت. ئینجا لەبەرئەوەی کاک کەمال ئاگاداری ئەوە نییە ئەم

شاعیرەمان لە سەردەم و قۆناغی خۆیدا چەند هەولّی داوە بۆ شلّەقاندنی گۆمی شیعری کوردی و هێنانی (بیری نوێ) بۆ کوردستان، بۆیە بەچاوێکی سووک دەڕوانێتە هەولّ و تەقەللای ئەم شاعیرە ڕابەرەمان، لە کاتێکدا بەشان و باهووی زۆر شاعیری دیکەی هەلّداوە، کە شێخ نووری ئەگەر لەوان زیاتری نەکردبێ، ئەوە کەمتری بەدەستەوە نەداوە!

* کاک مستەفا سالّح کەریم لە پێشەکی نامیلکەی (کامەران و هۆنراوەی نوێ)دا دەلّێ: «دەستەیەک شاعیری ڕۆمانسی هاتنە مەیدان وەک (بێکەس و گۆران و هەردی و دلّدار و شێخ نووری) لەم دەستەیەشا «گۆران»ی بلیمەت شۆڕشێکی بەرپا کرد لە شیعری کوردی وە بوو بەپێشەنگی شاعیرانی هۆنراوەی نوێ و هەرچەندە لە پێش ئەوا «شێخ نووری» لەم هونەرە تازەیەدا بەشدار بوو، بەلّام سەرکردەی ئەم ئینقیلابە (گۆران) بوو»[(8)].

وەک دیارە کاک مستەفا لە ڕیزکردنی ناوی شاعیرەکان ورد نەبووە. ئەگینا (بێکەس) جگە لە شیعری (ئەی مانگ) لەگەلّ ڕۆمانسیەت کوجا مەرحەبا؟ ئینجا بەشێوەیەکی زەق و دوور لە مەوزوعیەت بەرەو لای مامۆستا (گۆران) لایداوە، بەبێ ئەوەی هیچ بەلّگە و سەلماندن و نموونەیەک بۆ قسەکەی بهێنێتەوە. پاشان یەکسەر مامۆستا (گۆران) دەکاتە سەرکردەی ئینقیلابی شیعری تازە و دەوری شێخ نووری لەم بوارەدا بچووک نیشان دەدات و زۆر بەبایەخەوە سەیری ناکا. دەبوایە کاک مستەفا لەم کورتە پێشەکییەدا پێ بەپێ باسی تازەبوونەوەی شیعری کوردی بکردایە و لە شوێنی شایانی خۆی دابنایە. بێگومان لە هەلّسەنگاندنی ئەدەبدا ڕاستە چێژی نووسەر دەوری خۆی دەبینێ، بەلّام ناسەپێنرێ. بەباشتر زانینی شاعیرێک لە شاعیرێکی دیکە پێویستی بەڕوونکردنەوەیە. ئەگەرچی کاک مستەفا وای دەرخستووە کە ئەم قسەیەی لە بەرگی دووەمی کتێبی (شیعر و ئەدەبیاتی کوردی) مامۆستا (ڕەفیق حیلمی) دەرهێنابێ، بەلّام دەستنیشانی لاپەڕەی ئەو نووسینەی نەکردووە. خوێنەریش کە وتارەکەی (ڕەفیق حیلمی) دەخوێنێتەوە، بۆی دەردەکەوێ ئەم بیروڕای وا زەقی دەربارەی شێخ نووری نەنووسیوە. کاک مستەفا کە ئەم شاعیرانە بەشاعیری ڕۆمانسی ناوزەد دەکا، باسی ئەوەی نەکردووە لەسەر چ پێناسەیەکی ڕۆمانسیەت گیرساوەتەوە تا بەپێی ئەو چەمکە ناوی شاعیرەکان ڕیز بکات؟!

* کاک محەمەد سدیق عارف (حوسێن عارف) لە نامیلکەی (کامەران و هۆنراوەی

---

(8) بڕوانە: نامیلکەی کامەران و هۆنراوەی نوێ، نووسینی محەمەد سدیق عارف، چاپخانەی مەعاریف. بەغدا ١٩٥٩ پێشەکییەکەی ل ٨ .

نوێ)دا بۆ سەردەمی خۆی هەوڵێکی سەرەتایی باشی داوە و لە بواری بابەتێکی بێ ناز ئەسپی خۆی تاو داوە. لەگەڵ ئەوەشەوە کە نامیلکەکە کۆمەڵێ هەڵەی تێدایە کە لێرەدا جێگەی باسکردنیمان نییە، بەڵام ئەوەندەی پێوەندی بەشێخ نووری-یەوە هەبێت لێی دەدوێین. کاک (محەمەد سدیق) لەم نامیلکەیەدا کە دەربارەی (هۆنراوەی نوێ) نووسیویەتی، تەنیا جارێک پەنجە بۆ شێخ نووری ڕادەکێشێ، لە کاتێکدا لە زۆر شوێنی ئەو سیپارەیەدا باسی پشووی گوێزانەوە دەکات. ئەمیش خۆی لەو حەقیقەتە بەدوور دەگرێ کە پشووی گوێزانەوە (فترة الأنتقال) لە شیعری کوردی تازەماندا لەسەر دەستی (شێخ نووری) هاتووەتە دی. وەک یەکەم شاعیر کە لە دابونەریتی شیعری کلاسیکی دوور کەوتبێتەوە و نەریتی بۆ شیعری تازە بەخش ڕشتبێ.!

کاک (محەمەد سدیق) دەربارەی ئەو پشووی گوێزانەوەیە ڕایەکی ڕەها دەردەبرێ و دەڵێ: «هۆنراوەی کوردی لە دەمێکەوە چووەتە ئەو ماوەی گوێزانەوەیەوە، ئەو ماوەیەش بێ کەموکورتی پێویستی سەرشانی خۆی بەجێ هێناوە»[9]. لەم قسەیەدا ڕایەکی لێڵ و هەڵماوی دەربارەی شیعری کوردی دەبینین، دەبوایە زیاتر ئەم ڕایە ڕوون بکاتەوە و دەری بخات لای کام شاعیرەمان کە سەر بەپشووی گوێزانەوەیە (پێویستی سەرشانی خۆی بەجێ هێناوە) و لەسەر دەستی کێ زیاتر ئەم ئەرکە بەهەردوو بارەکەیەوە بەدی هاتووە. بەو بارەی کە شیعری گوێزابێتەوە قۆناغێکی تازەوە، یان بەشداری کردبێ لە دروستکردنی قۆناغە تازەکە؟! یان بەجۆرێکی دیکە شیعری کامە شاعیر زیاتر بەتەنگ ئەوەوە بووە پێویستییەکانی سەرشانی خۆی بەجێ بهێنێ. لە کاتێکدا دەسەڵات و توانایی شاعیران و ڕادەی داهێنان و کارتێکردنیان بەسەر شیعری کوردی، لە یەکێکیانەوە بۆ ئەوەکەی دیکەیان جیاوازە! کاک (محەمەد سدیق) کە بەلای ناوی (شێخ نووری) بەڕاگوزاری ڕابردووە وەک خۆی نووسیویەتی: «بەهەڵە ناچم ئەگەر بڵێم کامەران نزیکترین شاعیرمانە لە هۆنراوەی نوێ»[10] هەر ئەو شاعیرە لە پێشەکی نامیلکە چاپکراوەکەی شێخ نووری، دەڵێ: «بەلای منەوە مامۆستا شێخ نووری شێخ ساڵح مامۆستای ماوەی گوێزانەوەیە (فترة الأنتقال) لە هۆنراوەی کوردیدا»[11] ئینجا وەک کاک (محەمەد سدیق)

(٩) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١٩ .

(١٠) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٤٣ .

(١١) هۆنراوەی نووری شێخ ساڵح، ٢٥٧ک -١٩٥٨ی زایینی چاپخانەی کامەران، سلێمانی، ل٢ پێشەکییەکەی.

نووسیویەتی «کامەران یەکێکە لە شاعیرەکانی هەنگاوی سێهەمی ماوەی گوێزانەوە – فترة الاتنقال-»[١٢] یان کاتێ دێتە سەرباسی ئەوەی کە «ماوەی گوێزانەوە ڕێگا بەرپاکەری دەوێ»[١٣] دیسان بەلای شێخ نووری-دا گوزەری نەکردووە، کە شێخ نووری ئەو شۆڕش بەرپاکەرەیە. یان کە باسی (کامەران) دەکات وەک شاعیرێکی هەنگاوی سێیەمی پشووی گوێزانەوە شوێنێک بۆ شێخ نووری ناکاتەوە. کاک (محەمەد سدیق) ئەگەر لەو بڕوایەشدا نییە، شێخ نووری نوێنەری ئەو پشووی گوێزانەوەیە بێ لە شیعری کوردیدا کە باسی هەنگاوی دووەمی پشووی گوێزانەوەش دەکات ناوی ناهێنێ، کاتێ (پیرەمێرد) و (ئەحمەد موختار) و (بێکەس) و (زێوەر) و (وەلی دێوانە) بەنموونەی شاعیری ئەو قۆناغە دەهێنێتەوە[١٤]. ئەمەش کەمتەرخەمی کردنێکە لەلایەن نووسەرەوە کە کەلەبەری خستووەتە نێو سیپارەکەیەوە، چونکە لەم نووسینەیدا سوودی لە کتێبەکەی مامۆستا (ڕەفیق حیلمی) وەرنەگرتووە، کە سێ ساڵ بەر لە چاپکردنی نامیلکەکەی کەوتووەتە کتێبخانەی کوردییەوە و لەو کتێبەدا شێخ نووری بەسەرکردەی هەنگاوی سێهەمی ئەو پشووی گوێزانەوەیە دەزانێ کاتێ دەڵێ: «ئەوانەی کە ئیمڕۆ خۆیان بەدامەزرێنەری قوتابخانەی شیعری تازە ئەژمێرن ئەبێ بزانن کە یەکەم بەردی بناغەی قوتابخانەکەیان لە لایەن نووری شێخ ساڵحەوە دامەزرا»[١٥].

ئینجا دەڵێ: «بێ گومان دەمەی ڕۆمانسی و ڕەمزی لە دەمێکەوە بەسەر چووە. لەبەرئەوە بەکارهێنانیان لە ئێستەدا، ئەگەرچی تەنها لە شێوەی نووسینیشا بێ لە جێی خۆیا نییە»[١٦] نازانم ئەگەر (دەمەی ڕۆمانسی) بەسەر چووبێ شیعرەکانی (گۆران) و (هەردی) چی لێ دەکا؟! بەپێی ئەو بیروڕایە بێت دەبێ شیعرە (ڕۆمانسی)یەکانیان بخەینە ڕەفەیەک و تەپوتۆزی لەسەر بنیشێ، چونکە کە شتێ دەمەی بەسەر بچێ نابێ شایانی خوێندنەوە بێت! کاک (محەمەد سدیق) کە شیعری (ڕووداو) یان شیعری ڕیالیزم پەسند دەکات، دیسان دەبوایە شوێنێک بۆ شێخ نووری بکاتەوە کە وەک شاعیرێک لەم بابەتە شیعرانەی زۆرە، واتە تەنیا شاعیرێکی (ڕۆمانسی!) نییە وەک دەڵێ، شیعرەکانی

---

(١٢) کامەران و هۆنراوەی نوێ ل ٢٩.

(١٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٩ .

(١٤) بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو ل٢١ .

(١٥) بڕوانە: «شیعر و ئەدەبیاتی کوردی»، بەرگی دووەم، ڕەفیق حیلمی ل ٢٠١.

(١٦) کامەران و هۆنراوەی نوێ ل ٤٨.

دەمەیان بەسەر چووبێ تا لایان لێ نەکاتەوە!

* مامۆستا سەعید ناکام لە نامیلکەیەکدا بەناوی (هۆنراوەی نوێ) دەربارەی سیپارەکەی کاک (محەمەد سدیق عارف) نووسیویەتی، بەڵام مامۆستا ناکامیش کە بەو سیپارەیەدا چووەتەوە، بەهیچ جۆرێک لەسەر (شێخ نووری) نەکردووەتەوە و هەقە خوراوەکەی بۆ نەگەڕاندووەتەوە. واتە ئەمیش وەک کاک (مستەفا ساڵح کریم) و (محەمەد سدیق عارف) بەراگوزار بەلایدا ڕۆیشتووە. ئینجا پاڵپشتی ئەو ڕایەی (محەمەد سدیق)دەکات و دەڵێ: «ڕاستە کە شێوەی ڕۆمانتیکی و ڕەمزی دەمێکە بەسەر چووە»[17].

مامۆستا (ناکام) دەربارەی مەسەلەی (ڕەمز) نەختێ قسەی کردووە، بەڵام دەربارەی بەسەرچوونی دەمەی (ڕۆمانتیک) هیچی نەوتووە. لێرەدا دیسان دەڵێم ئەگەر (ڕۆمانتیک) دەمەی بەسەر چووبێ، ئەوە دەبێ کۆمەڵێک شیعری کوردی بەلاوە بنێین، چونکە ئەوانیش کاتیان بەسەر چووە، لەبەرئەوەی ڕەگەز و بنەمای شیعری ڕۆمانتیکیان تێدایە. ئینجا کە دەمەی ڕۆمانتیکیش بەسەر چووبێ چۆن باسی شیعری نوێ دەکرێ؟! کە ڕێبازی ڕۆمانتیک بەشێکی شیعری نوێی گرتبێتە خۆی؟! ئەگەر شیعری تازە، بریتی بێت لە ڕوانینی تازە بۆ ژیان و ئادەمیزاد و دەوروبەر، پێوەری هەڵسەنگاندنەکەش لەسەر ئەو کۆڵەگەیە دەوەستێ، نەک لەسەر ئەو ڕێبازەی شاعیر لەسەری وەستاوە، یان کێش و قافیەی بەرداوە یان بەرنەداوە. هیچ شاعیرێک بەوە شاعیر نییە کە سەر بە چ ڕێبازێکە، ئەوەندەش ڕێبازەکە شەفاعەتی بۆ ناکا ئەگەر هاتوو لە خۆیدا شاعیر نەبێ، یان خاوەنی ئەو ڕوانین و کەرەسە تازەیە نەبێت، ژیانی تازەی پێ ئاوەژوو بکاتەوە. لەوەدا زۆر لەگەڵ مامۆستا (ناکام) یەک دەگرمەوە کە دەڵێ: «بەڕاستی ئەگەر بەزەیی و ڕابەری و بەرێ ڕووناک کردنەوەی پشت (جیل)ەکانی دوێنێ نەبوایە، ئەم پشتەی ئەمڕۆمان وا بەئاسانی نەئەگەیشتە قۆناغی ئێستای»[18] ئەگەر منیش لەگەڵ ئەو ڕایەدا یەک نەبوومایە قەت ئەوەندە سوور نەدەبووم داوایان لێ بکەم باسی (شێخ نووری) بکەن وەک چۆن باسی (گۆران) دەکەن، چونکە ئەو دەستە شاعیرە بیانەوێ و نەیانەوێ قەرزارباری هەوڵ و تەقەللای ئەم شاعیرە ڕابەر و پێشەنگەن لە بەرێ ڕووناککردنەوەیان. دەبوایە مامۆستا

(١٧) هۆنراوەی نوێ (ناکام)، چاپخانەی کامەران، سلێمانی، ١٩٥٩، ل٣٧

(١٨) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٨ .

که ئەو ڕایە جوانە دەردەبڕێ نەینووسیبایە: «مەیدانی پیلە لەسەر پشتە بۆ لێدوانی پایە و ڕیزکردنی ئەو شاعیرانەی نووسەر ناوی هێناون و ئەوانەی ناوی پەڕاندوون، بەڵام لێی ئەگەڕێین» کە ئەم قسەیە ئاراستەی کاک (مستەفا ساڵح کەریم) دەکات نەدەبوو بڵێ (لێی دەگەڕێین)، چونکە ڕچەشکێنی و ڕابەری شێخ نووری حەقیقەتێکە قابیلی پیلە و لێدوان نییە. ئەم ڕۆڵێکی باڵای لە بزووتنەوەکەدا هەبووە و قۆڵێکی بزووتنەوەکەیە، مامۆستا (گۆران)یش قۆڵەکەی دیکەیە.

* کاک عەزیز گەردی دەڵێ: «حاجی - حاجی قادری کۆیی - لە سەدەی نۆزدەهەم بەهۆی هەڵبەستە نیشتمانپەروەرییەکانی نەختێ لە کلاسیک دوورکەوتەوە»[١٩] لە ڕاستیدا حاجی قادر لە ماهییەتی شیعری کلاسیکی دوور نەکەوتووەتەوە، بەڵکو وەک هەر شاعیرێکی کلاسیکی لەسەر پێودانی شیعری کلاسیکی و خاسیەتەکانی شیعری نیشتمانپەروەریی گیرسایەوە، ئەم بابەتەش لە شیعری کوردیدا شتێکی تازە نەبوو، بەڵکو لە پێش ئەو ئەحمەدی خانی نەمر هەر ئەو ڕێبازەی هەڵبژاردبوو. ئینجا دەڵێ «بەڵام لەو بزووتنەوەیە (واتە هەنگاوەکەی حاجی قادر و شاعیرانی بەرەو دوایی) بەتەواوی قایم نەبووبوو، شەوقی لە کلاسیکی نەبڕی بوو، بەڵکو ئالای کلاسیک هەر شەکاوە بوو تا لە دەوروبەری ١٩٣٨ ئەم بزووتنەوەیە کە ڕۆمانتیکە بەتەواوی چەسپاو هەبوونی خۆی سەلماند»[٢٠] کاک عەزیز لەم ڕایەیدا وەک لە پەڕاوێزدا دەری خستووە سوودی لەو دانیشتنە وەرگرتووە کە لەگەڵ مامۆستا (گۆران) ساز دراوە، نازانم کاک عەزیز ئەو ساڵی (١٩٣٨)ەی لە کوێوە هێناوە و لە ئەنجامی چ قەناعەتێک نووسیویەتی و چەسپاندوویەتی، لە کاتێکدا خوێنەر کە دەگەڕێتەوە سەر دانیشتنەکەی لەگەڵ مامۆستا (گۆران)، ساڵی (١٩٣٨)ی بەرچاو ناکەوێ، بەڵکو مامۆستا (گۆران) دەڵێ: «ئەبێ ئەوەش لە بیر نەکەین کە لە سەرەتاوە بەهۆی ئەدەبی ئینگلیزییەوە بەدوا نظریەی (هونەر بۆ هونەر) ئەڕۆیشتم و بەرهەمی ئەم تەرزە ئەدەبەم ئەخوێندەوە، وەک هینەکانی (جۆن کیتس)و (ئۆسکار وایلد). بەڵام لە ١٩٣٥ بەو لاوە وەدوای هاتنە ناوەوەی جووڵانەوەی پێشکەوتوویی (تقدمی) و کۆمەلایەتی پاڵی پێوەناین کە لە ئەدەبی عەرەبی و

---

(١٩) بڕوانە گۆڤاری هەولێر، ژمارە (٤-٥)ی ساڵی (١) کانوونی دووەم و شوباتی ساڵی ١٩٧١ «دلدار لە نێوانی (کلاسیک) و (ڕۆمانتیک) و (ڕیالیزم)دا»، عەزیز گەردی.

(٢٠) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

ئینگلیزیشدا بەدوا نموونەی ئەدەبێکی تقدمی بگەڕێین»[٢١].

کەواتە مامۆستا (گۆران) بەر لە ساڵی (١٩٣٥) خەریکی ڕێبازی (بەرناسیەت) بووە، مەبەستیشی لە ئەدەبی عەرەبی، ئەدەبی مەهجەرە. ئالآی کلاسیکیش تا ساڵی (١٩٢٠) شەکاوە بووە، واتە تا بەرپاکردنی بزووتنەوەی شیعری تازە لە لایەن شێخ نووری شێخ ساڵح-ەوە، کە یەکەم شاعیرە ڕچەی شیعری تازەی شکاندووە و هەنگاوی ناوە بۆ شکاندنی دابونەریتی شیعری کلاسیکی، بۆیە دەتوانین ئەو یەکەم هەنگاوە بەسەرەتای چوزەرەکردنی ڕێبازی (ڕۆمانسی) لە شیعری کوردیدا دابنێین. جارێکی دیکە کاک عەزیز پێ لەسەر ئەو ڕایەی خۆی دادەگرێ و دەڵێت: «هەروەک باسمان کرد لە کوردیدا ڕۆمانتیک نەمەییبوو و نەکەوتبووە قاڵبێکی تەواوەوە تا دەوروبەری ١٩٣٨ کە بەهۆی گۆران و شێخ نووری شێخ ساڵح و نجیب ڕەشید و بلە و هەردی و دڵدار لە عیراق وە کامەران بەدرخان و قەدری جان لە سوریا چەسپا و پێ گەیشت»[٢٢] ڕاستە ڕێبازی ڕۆمانتیک وردە وردە لە پاش ساڵانی (١٩٢٠)ەوە کەوتە نەشونوما کردن و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەرەو کامڵ بوون دەڕۆیشت، بەڵام ئەو ڕێبازە ئەوەندەی نەخایاند کە کەوتە باوەشی ژیان و ڕووداوەکانی میللەت و لەگەڵ خەباتی سیاسی یەکیان گرتەوە و تەمەنی ئەوەندە درێژ نەبوو. واتە وەک «ڕێباز» زۆر نەمایەوە، بەڵام تاک و تەرا شیعری سەر بەو ڕێبازە لە لای ئەو شاعیرانە دەبینرا. لەوەشدا لەگەڵ کاک عەزیزدا یەک دەگرمەوە کە بەردەوامی بەشێخ نووری داوە لە پاش (١٩٣٨)ەوەش لەگەڵ ئەو شاعیرانە ناوی هێناوە، لە کاتێکدا زۆر کەس لە نووسینەکانیدا شێخ نووری لە ساڵی (١٩٣٠) بەولاوە دەکوژێنێتەوە و هیچ دەورێکی ناداتێ. مەبەستیش لەوە وەستانی (شێخ نووری) لە بەخششی شیعری تازە دەگەیەنێ، کە ئەو نووسەرانە لەم ڕایەدا تەواو لە گیانی هەست کردن بەلێپرسینەوە دوورن.

* کاک ئەژی گۆران بەبێ ئەرکی شۆڕبوونەوە بەناو باری مێژوویی و سیاسی و وێنەکێشانی سەردەمی شێخ نووری چووەتە ناو باسەکەیەوە. ئەو سەردەمەی شاعیری تێدا دەرکەوتووە بەتاریکی و لێڵی ماوەتەوە. لە باسەکەیدا بەهیچ جۆرێک بەلای خاسیەتەکانی شیعری ئەو سەردەمەوە نەچووە. واتە ئەو قۆناغە لەسەر دەستی شێخ نووری

---

(٢١) گۆڤاری بەیان، ژمارە (٢)، ١٩٧٠.

(٢٢) گۆڤاری هەولێر، ژمارە (٤-٥)ی ساڵی (١) کانوونی دووەم و شوباتی ١٩٧١ «دڵدار لە نێوان (کلاسیک) و (ڕۆمانتیک)و (ریالیزم)»، عەزیز گەردی.

چی لێ هاتووە و چ گۆڕانێکی بەخۆیەوە دیوە؟!

کاک (ئەژی) لە نووسینەکەیدا پەیڕەوی هیچ بەرنامەیەکی نەکردووە و زیاتر تێبینی و سەرنج و ڕای سەرپێیی و ڕووکەش دەدات. بێگومان خۆ لە قەرەدانی ئەو جۆرە باسانە پێویستی بە(بەرنامە) هەیە، تا ماددە ڕەخنەییەکە شێوەیەکی زانستی وەرگرێ و بەرێیی ڕووناک بکاتەوە. پەیڕەوی نەکردنی (بەرنامە) لە وتارەکەیدا وای کردووە نەگاتە هیچ حەقیقەتێکی مەوزووعی دەربارەی شێخ نووری، تەنانەت زمانەکەشی زمانی پەخشان و مەجاز و هەڵچوونە، زمانی لێتوێژینەوە نییە. نەبوونی بەرنامەیەک بۆ نووسینەکە ئامانجی نووسینەکە و مەبەست لە نووسینی ون کردووە. واتە هۆی هەڵبژاردنی ئەو بابەتەی دەستی بۆ درێژ کردووە چییە؟! لەم وتارەدا خوێنەر کۆمەڵێ مەبەست و ئامانجی تێکەڵ بەیەکتر دەبینێ، کە پێویستیان بەجیاکردنەوە هەیە، بۆیە ئەم تێکەڵییە لە هەندێ شوێن ئامانجەکەی لە خۆی و لە هەندێ شوێنی دیکە ئامانجەکەی لە خوێنەر شێواندووە. زۆر جاریش هەر ئەو زانیارییانە دووبارە دەکاتەوە کە لەم لاو لەو لا خراونەتە ڕوو، بەتایبەتی بیروڕایەکانی مامۆستا (ڕەفیق حیلمی). پەیڕەو نەکردنی (بەرنامە) کارێکی وای کردووە هەرچی بەخەیاڵیدا بێت بیئاخنێتە ناو نووسینەکەیەوە، ئەوەش وام لێ دەکات بڵێم وتارەکە شتی لابەلایی و زێدە خۆی تێ فڕێ داوە، بۆیە پێویستە ئەم وتارە کورت و چڕ بکرێتەوە و لە هەندێ لەو شتە لابەلاییانە بژار بکرێت.

کاک ئەژی لە سوود وەرگرتن لە سەرچاوە پەیڕەوی ڕێوشوێنی (بەرنامە)ی نەکردووە – نە لاپەڕە و نە ناوی نووسەر و ساڵی چاپکردن و چاپخانەی نەنووسیوە، نە ئەو قسانەی لێیان وەرگیراوە خراوەتە ناو دوو کەوانەوە، تا خوێنەر بتوانێ قسەی ئەو لە قسەی کەسانی دیکە جیا بکاتەوە. بۆ نموونە نووسیویەتی: (١٢– الديوان في الادب والنقد) بێ ئەوەی پەنجە بۆ ناوی نووسەر و لاپەڕە و ساڵی چاپکردن و چاپخانە بنووسێ. کە دەڵێم کاک ئەژی پەیڕەوی بەرنامەیەکی ڕەخنەیی تەواوی نەکردووە، هۆیەکەی ئەوەیە کە هەرچەندە خۆی گلەیی لە دکتۆر کامیل بەسیر دەکات و دەپرسێ: «ئەی بۆچی دوای چەند دێڕێ، دێتە سەر باسی سەرکردایەتی گۆران یا شێخ نووری لە شیعری تازەدا؟» بەڵام خۆشی لایەنی ڕەخنەسازی و لایەنی شاعیریەتەکەی تێکەڵ بەیەکتر کردووە، وەک چۆن دکتۆر بەسیر خۆشی ئەم تێکەڵ کردنە لە کتێبەکەیدا ڕووی داوە. کە نەدەبوایە دکتۆر کامیل لەو باسی ڕەخنەسازی و بووژاندنەوەی وتارەکانی شێخ نووری، مەسەلەی سەرکردایەتی گۆران و شێخ نووری تێهەڵکێش بکات، چونکە ئەوەیان بۆ خۆی باس و

بابەتێکی دیکەیە. لە شوێنێکی دیکەی وتارەکەیدا دەڵێ: «لە ناو تورکەکانیشدا هەر پێش ئێمە هەوڵ و تەقەلا دراوە بۆ زمانی یەکگرتوو»[٢٣] لەم ڕایەدا ڕەنگە مەبەستی بەکارهێنانی وشەی پەتی بێت، یان گەڕانەوە بێت بۆ موفرەداتی ڕەسەن و کوردی لە زمانەکەماندا، چونکە شێخ نووری بەشێوە زاری سلێمانی نووسیویەتی و هەوڵێکی واشی نەداوە بۆ زمانی یەکگرتووی کوردی. ئینجا دەڵێ: «لەوە ئەچێ ماموٚستا بەسیر، بۆی ڕوون بووبێتەوە، کە جارانی پێشوو لەم گوریس کێشەکێیەدا، نەیتوانیوە لە گۆڕان بباتەوە، بۆیە لە باسی ڕائدی ڕەخنەوە ئەکەوێ بەمل باسی شیعر و سەرکردەی ڕێبازی شیعری کوردیدا»[٢٤].

وەک دیارە شێخ نووری شاعیرێکە زۆر کەڕەت لە ناو شاعیرە تازەکاندا یان ناویان نەهێناوە، یان لە شوێنی شایانی خۆیان دانەناوە. هەر ئەو نووسەرانە وەک چۆن نایخەنە لیستی شاعیرە تازەکانمانەوە، هەر بەو جۆرەش لە ناو شاعیرە کلاسکییەکانیشدا ناوی پشتگوێ دەخەن. واتە ئەوەی دەوری شێخ نووری لە شیعری تازەدا بچووک دەبینێ لە ناو شاعیرەکانی سەردەمی خۆی وەک (بێخود و زێوەر و ڕەمزی مەلا مارف و حەمدی)یشدا هەر ناوی ناهێنێ. ئەمەش یان پشتگوێ خستنێکی بەدەستی ئەنقەستە، یان لەبەرئەوەیە تا ئێستاکە بەرهەمی شیعری لە بەردەستدا نییە. شێخ نووری وەک ڕۆشنبیرێکی سەردەمی خۆی بە(٢٥) زنجیرە وتاری ڕەخنەیی زۆر باس و بابەتی وروژاندووە، کە زۆر لە شاعیرانی گۆڕەپانی شیعری ئەمڕۆکەش لێی نازانن. یان نەگەیشتوونەتە ئەو تێڕوانین و تێگەیشتنە بۆ هونەری شیعر، بۆیە ئەگەر (شێخ نووری) بەسەرەتای ڕەخنە دابنێین، شتێکی تازە ناڵێین، چونکە بەرهەمەکەی لە بەردەستە و خۆی ئەو حەقیقەتە دەخاتە ڕوو، بەڵام ئەگەر وەک ئەژی دەڵێ، (د. کامیل) ئەگەر ویستبێتی لە ڕێگەی (باسی ڕائدی ڕەخنەوە، بکەوێ بەمل باسی شیعر و سەرکردەی ڕێبازی شیعری کوردیدا) ئەوە لەو بڕوایە دام شێخ نووری پێویستی بەوە نییە بەشێوازی ناشەرعی بکرێ بە شاعیر، ئەگەر (شێخ نووری) و (گۆران)یش بمانایە و سەیری ئەم نووسینانەیان بکردایە کە گەیشتۆتە (گوریس کێشەکێیی) ئەوە بێگومان تێر پێکەنینیان بەوەزعەکە دەهات و مەسەلەکەشیان هەر زوو بەبارێکی دیکەدا دەخستەوە، چونکە ئەوانیش دەیانزانی ئەمڕۆکە باوی (میری شاعیران)

(٢٣) گۆڤاری بەیان، ژمارە (٧١)ی نیسان و مایسی ١٩٨١، «شێخ نووری شێخ ساڵح و چەند بیروڕا و سەرنجێکی ڕەخنەگرانە»، ئەژی گۆران.

(٢٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

نەماوە و لەم سەردەمەدا کۆمەڵێ شاعیر هەریەکەیان خاوەنی کەسایەتی شیعریی خۆیانن و کەسیان لە نرخی ئەوەکەی دی کەم ناکاتەوە و ڕێگە لەیەکتر ناگرن. شیعر و داهێنان وەک بیردۆزە زانستییەکان نین بیردۆزێک ئەوەکەی پێش خۆی ڕەش بکاتەوە و خۆی شوێنی بگرێتەوە، ئەگەر هەر شتگەلێک هەبن شوێنی یەکتر بگرنەوە و تازە ئەوەی پێشووی ڕەش بکاتەوە، ئەوە داهێنان، داهێنان ناسڕێتەوە تا شوێنی بگرێتەوە، بەڵکو زنجیرەیەکن و بەردەوام بەکتر تەواو دەکەن. ئینجا کاک ئەژی هاتووە دەستی کردووە بەبەراورد کردنی شیعری شێخ نووری و نموونەی لە شیعری سالانی چل بەدواوە هێناوەتەوە کە بۆ (مەلا فەندی) نووسیوە، یان ئەو شیعرەی کردووە بەنموونە کە بۆ شیوەنی شێخ مەحموودی نووسیوە لە ساڵی (١٩٥٦) یان ئەو شیعرەی هەڵبژاردووە کە بۆ شۆڕشی چواردەی تەمموز نووسیوبەتی و ئینجا دەڵێ: (زۆر هەناسە درێژ نەبووە) حەزم دەکرد ئەژی پەلە نەکات و ئەو بڕیارە گەورەیەش نەدات، شیعری سالانی چل بەدواوە بەخراپ دابنێ تا ساڵی مردنی لە (١٩٥٨)، چونکە سەرجەمی ئەو شیعرانەی نەدیوە کە لەو هەژدە ساڵەدا نووسراون. من لێرەدا ناڵێم کاک ئەژی نەڵێ (شێخ نووری هەناسەی درێژ نەبووە)، ئەوەندەی شێوازی زانستی داوای لێ دەکات بەبەڵگە و نموونە هێنانەوە ئەوە بسەلمێنێ و قسەکەی بە ئیرتیجالی نەمێنێتەوە و پاڵپشتێکی هەبێ. ئەم کە دوو شیعری هەڵبژاردووە بۆ بەراوردکردن لەگەڵ شیعری گۆران دەبوایە شیعری (لە زیندانا) و (چواردەی تەمووز)ی ئەو لەگەڵ شیعری (١٤)ی تەمووزی شێخ نووری بەراورد بکات، چونکە لەلایێ ئەو دوو شیعرە شیعری بۆنەن، لەلایەکی دیکەوە لە یەک ساڵدا نووسراون. یان لاوانەکەی (مەلا فەندی و شێخ مەحموود)ی بەراورد بکردایە بەلاوانەکەی بۆ (ڕەفیق حیلمی) نووسیوە یان بەشیعری (یادی بێکەس)و (یادی پیرەمێردی بوێژ) کە ئەم شیعرانە چ وەک بابەت و چ وەک زەمەن لە یەکترەوە نزیکن، هەر بەو بەراورد کردنە لە نێوان ئەم دوو سێ شیعرە ئەژی گەیشتووەتە ئەو ڕایە کەوا: (زۆر هەناسە درێژ نەبووە)، لە کاتێکدا پێویستە لەمەولا کە دیوانەکەی (شێخ نووری) دەکەوێتە بەردەستان، ئەگەرچی ئەم دیوانە بریتی نییە لە سەرجەمی شیعری شێخ نووری، ئەوساکە وردتر شیعرەکانی بخوێنێتەوە و سەرنجی ئەو شیعرانەش بدات کە لە کاتی نووسینی ئەو وتارەدا نەیدیون، ئینجا پێویستە ئەوەشمان لە بیر نەچێت کە شیعری موناسەبە هەر بەتەبیعات لەوە بەهێز و پێزتر نابێت، ئەگەر داوای بەهێزی لێ دەکات. ڕاستە ئەو شیعرانەی شێخ نووری نوێبوونەوە و داهێنانیان تێدا نییە، بەلام دەبێ ئەو جورئەتەشی هەبێت و تەنیا لەگەڵ شیعری سیاسی و موناسەبەی هاوڕێ

شاعیرەکانی شێخ نووری بەراوردیان بکات، ئەوسا بەئینسافەوە بەبێ لایەنگیری بڕیاری خۆی بدات.

وابزانم کاک ئەژی خۆشی لەگەڵمایە کە پەلەی لە نووسینی ئەو باسە کردووە. جارێ وەختی ئەوە نەهاتووە شێخ نووری و گۆران بەراورد بکرێن، لە کاتێکدا ژمارەیەکی کەمی شیعری (شێخ نووری) لەبەردەستدا بوو. لەو ڕایەدا زۆر لەگەڵ کاک (ئەژی) یەک دەگرمەوە کە دەڵێ: «لێرەدا پێویستە ئیشارەتێکیش بۆ ئەوە بکەم کە شێخ نووری لە گۆران بەتەمەنتر بوو، بەر لە گۆران شیعری وتووە. کۆچی دواییشیان زۆر لەیەکەوە دوور نییە. ئەمەش وا ناگەیەنێ کە شێخ نووری هیچی نەکردبێ، بەڵکو (بگرە) وەک تاقیکردنەوە، بۆ ڕایەکانی خۆی لەم ڕێبازەدا هەوڵ و تەقەلایەکی شاعیرانەی بووە، جا ئەگەر گۆران بەهاوکاریی و بەهاوچەرخیش لەم (تەسجیل کردنە زەمەنییەدا)، زۆر دەرکەوتوو نەبوو بێ، بەڵام پەرەپێدانی ئەم ڕێبازە و ڕزگارکردنی لە کێڵگەی تاقیکردنەوە بۆ دارشتنی مێژوویی ڕاستییەکی واقیعە و، هەریەکەیان دەوری خۆی بەجۆرێک بەدی هێناوە»[٢٥] ئەمە ڕایەکی ڕاستە بەڵام کاک ئەژی هەر دوای چەند ڕستەیەکی دیکە دەڵێت: «(گۆران) سەرەتای زۆربەی داهێنانەکانی دامەزراندووە»[٢٦] کە لەم هەڵچوونەیدا دیسان دەگەڕێتەوە سەر سەرەتا و (تەسجیل کردنە زەمەنییەکەی) خۆی پێشتر وتبووی لە بیری دەچێتەوە[٢٧].

* کاکەی فەللاح لە کتێبەکەیدا (کاروانی شیعریی نوێی کوردی)دا دەڵێ: «ئەوەی ڕاستی بێ لە پێشەوە نیازم وابوو، وەک لە دواییشدا ڕوونی دەکەمەوە، کە مەسەلەی نوێکردنەوەی شیعری کوردیی و کاروانی شیعری نوێی کوردیمان کە لە (گۆران)ـەوە دەست پێ دەکات تا ئەمڕۆ لەسەر نزیکەی بیست شاعیرێک بنووسم»[٢٨] لێرەدا کاکەی فەللاح هەر زوو بڕیاری داوە کە (کاروانی شیعری نوێی کوردیمان کە لە (گۆران)ـەوە دەست پێ دەکات) و ئەوەی بەشێخ نووری بەڕەوای حەق نەزانیوە کە ئەگەر (نوێبوونەوە) لەویشەوە

---

(٢٥) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(٢٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(٢٧) لە بەرگی دووەمی کتێبی (شێخ نووری شێخساڵح)دا، لایەنی ڕەخنەسازی ئەو شاعیرە و ئەو وتارانەی دەربارەی نووسراوە، لێیان دەدوێم.

(٢٨) کاروانی شیعری نوێی کوردی، کاکەی فەللاح، بەرگی یەکەم، ساڵی ١٩٧٨ ل ٧-٨ .

دەستی پێ نەکردبێ، خۆ بەشداری کردووە لە کاروانی شیعری نوێی کوردی- با بەشدارییەکەی بچووکیش بێت - تا لەو کاروانەدا شوێنی بۆ بکاتەوە. خۆشی زانیویەتی ئەو کارەی ئەو کردوویەتی گلەیی دێتە سەر، بۆیەش خۆی دەڵێ: «دەربارەی مەسەلەی نوێبوونەوەی شیعری کوردیی دوور نییە زۆر کەس لە ڕەخنەگران و نووسەران و شاعیران (پیرەمێرد) و (شێخ نووری شێخ ساڵح)یان بەبیردا نەیەت و لەو باوەڕە دابن کە ئەم دوو شاعیرە گەورەیە دەستێکی باڵایان هەبێت و لە مەسەلەی نوێکردنەوەکەدا ئەرکێکی زۆریان کێشا بێت». کاکەی فەللاح لەم ڕستەیەی دوایی دەری دەخات کە گومان دەکات لەوەی (پیرەمێرد) و (شێخ نووری) دەستیان لەو نوێکردنەوەیەدا هەبووبێ و ئەرکیان کێشا بێت، بۆیە کە بەڵگە بۆ ئەو ڕایەی دەهێنێتەوە ڕۆڵی هەردووکیان دەداتە دواوە، ئەگەرچی ناکرێ لە نووسینی ڕەخنەییدا ئەم دوو شاعیرە بەیەک چاو سەیری شیعرەکانیان بکرێت و بەیەک پێوانە و تەرازوو دەوریان لە تازەبوونەوەکە بکێشرێت. (پیرەمێرد) ڕێگە خۆشکەری تازە بوونەوەیە، مامۆستا (گۆران) خۆیشی ڕای وایە، تەنانەت ئەوەندە بڕوای بەچێژی (پیرەمێرد) هەبووە، تا بەپێی ئەو چێژە ڕەسەن و ڕوانینەی بۆ ئاسۆی ئەرخەوانی تازەبوونەوە شیعرەکەی بۆ لە مەحەک بدات و بزانێ ئاخۆ شیعرێکی (حەلاڵ زادە) یان (حەرام زادە)ی نووسیوە. مامۆستا (گۆران) نووسیویەتی: «لە لایەکی تریشەوە لوتکەیەکی تری بەرز هەیە کە دروشمی تازەکردنەوەی پێوە بینراوە ئەویش (پیرەمێرد)ە»[٢٩] کاکەی فەللاح دەبوایە بۆ ئەمانەتیش بێ ئیشارەت بۆ ئەو لێدوانەی گۆران بکا کە ئەو قسەیەی لێ ڕاگوێزاوە و دەڵێ: (پیرەمێرد قوتابخانەیەکی تایبەتی نەبووە)[٣٠]

ئەمە بیروڕای مامۆستا (گۆران)ـە و مەبەستیشی لە (قوتابخانە) دەنگی شیعری و کەسایەتی تایبەتییە، بۆیە دوای ئەوە دەڵێ: «بەڵام شیعرەکانی زۆر تەئسیری لە لاوان ئەکرد و جۆشی پێ ئەسەندن، ئەگەر بەراوردێک بکەین لە بەینی شیعرەکانی ئەو و قوتابخانەکەی ئێمە ئەبینین شیعری ئەو (قەومی) تر بوو، سفاتی کوردی و هەستی کوردی زیاتر پیشان ئەدا»[٣١] کەواتە هەرچۆنێ بوایە دەبوو چەند لاپەڕەیەک بۆ (پیرەمێرد)ی شاعیر تەرخان بکات، بەڵام لەبەرئەوەی کتێبەکەی مەنهەجی نییە، چەند

(٢٩) گۆڤاری بەیان، ژمارە (٢) شوبات، ساڵی ١٩٧٠ .

(٣٠) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(٣١) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

گوتارێکه بەیناوبەین لەسەر شاعیرێکی نووسیوه و لەم بەرگەدا کۆی کردووەتەوە، بۆیە فریا نەکەوتووە ئەو دوو شاعیرە بخاتە ناو ئەو کاروانەوە، ئەم بیانوو هێنانەوەیەش بۆ لەسەر نەنووسینی (پیرەمێرد) و (شێخ نووری) خوێنەر ئیقناع ناکات. هەر چۆنێ بێت ئەگەر لەبەر ڕۆشنایی قسەکەی مامۆستا گۆران ڕای وایە (پیرەمێرد قوتابخانەیەکی تایبەتی نەبووە) خۆ دەبوو هەر لەبەر ڕۆشنایی ڕایەکەی مامۆستا گۆران، کەسێکی وەک شێخ نووری کە گۆران بە(مامۆستای) دادەنێ لەم کتێبەدا جێگەی تایبەتی بۆ تەرخان بکرێت.

وەک چۆن کاکەی فەللاح بۆ پیرەمێرد چووەتە سەر ئەو ڕایەی بڵێ «ئەگەرچی لە شێوەدا بەتایبەتی لە ڕووی زمانی کوردیی پەتی و کێشی خۆماڵییەوە گیانێکی گۆڕین و نوێکردنەوەی تێدا بوو... چەشنە پێزێکیش لە خەیاڵیدا بوو...»[٣٢] نازانم بۆ شاعیرێکی وەک پیرەمێرد جگە لەو شتانەی خۆی دانی پێدا ناوە چیتری دەوێ؟ ئینجا هەر بەو پێیەش دێتە سەر شێخ نووری و دەڵێ: «وەک لە باسەکەی گۆراندا نووسیومە، دەستێکی باڵای لە نوێکردنەوەدا هەبوو، ئەویش تەنها بەپەیڕەوکردن و لاساییکردنەوەی شیعری نوێی تورکەکان»[٣٣] ئەگەر شاعیرێک دەستێکی باڵای لە نوێکردنەوەدا هەبووبێ، ناتوانین وا بەئاسانی بەوە تاوانباری بکەین کە ئەو دەستە باڵایەی تەنها (پەیڕەوکردن و لاساییکردنەوەی شیعری نوێی تورکەکان) بووە. شاعیر نییە پلە و پایەی چەند گەورەش بێ لە تەجروبەی شاعیرانی پێش خۆی ورد نەبێتەوە و تێیان ڕانەمێنێ. حەز کردن لە شێوازی شاعیرێکیش ئەوە ناگەیەنێ ئەو شاعیرەی دیکە نوسخەی کاربۆنی شاعیرەکەی پێشوو بێت و کتومت ئەو تەئسیرەی لە شیعرەکانی خۆیدا ڕەنگ ڕشتبێ. هەڵمژینی بەرهەمی شاعیرانی داهێنەری دیکەش کارێکی ئاساییە. ئەوەتا (پۆل ڤالیری) شاعیری گەورەی فەرەنسا دەڵێ «هیچ شتێ هێندەی هەڵمژینی بیروڕای خەڵک ڕەسەنایەتی نووسەر دەرناخا، شێر تەنها چەند کاوڕێکی هەزم کراوە و هیچی تر»[٣٤] هەر بۆ نموونە دوو شاعیری گەورەی عەرەب (بەدر شاکر ئەلسیاب) و (نازک ئەلمەلائیکە) کەوتبوونە ژێر تەئسیری (تی. ئێس. ئیلیەت) و (ستودیل)، ئەوەش مانای ئەوە نییە ئیدی ئەمانە

---

(٣٢) کاروانی شیعری نوێی کوردی، بەرگی یەکەم، کاکەی فەللاح، لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ل ٩ - ١٠

(٣٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١٠ .

(٣٤) ئەدەبی بەراوردکاریی - عەزیز گەردی - بەغدا ١٩٧٨ ل٣ .

بەلاساییکەرەوە دابنێین، ئەگەرچی جێ دەستی ئەم دوو شاعیرە گەورەیەی ناومان بردن لەسەر (ئەلسیاب) (ئەلمەلائیکە)دا لە لایەن (جەبرا ئیبراهیم جەبرا) و (د. عەبدولواحید لوئلوئە) و کەسانی دیکەوە دەستنیشان کراوە.

بەکارهێنانی ئەفسانە و (تێهەڵکێش - تضمین) لەلایەن ئەم شاعیرانەوە نابێتە مۆری لاساییکردنەوە و پەیڕەوی کردن، هەر لەبەرئەوەی ئەوان زووتر بەکاریان هێناوە. ئەگەر ئەو جۆرە ڕاوبۆچوونانە لە دنیای ئەدەب و ڕەخنەی ولاتاندا بکرێنە پێوەر، ئەوە ئەدەبی نەتەوایەتی تووشی زیانێکی زۆر گەورە دەبێت و دەپووکێتەوە. وابزانم هێنانەوەی ئەو ڕایە لە لایەن کاکەی فەللاح-ەوە تەنیا بۆ ئەوەیە خۆی لە ئەرکی نووسین و گەڕان بەدوای بەرهەمی ئەو شاعیرە، لە کۆڵ خۆی بکاتەوە. لە بنەڕەتیشدا ئەم ڕایە هی مامۆستا (ڕەفیق حیلمی)یە کە لە بەرگی دووەمی کتێبی (شیعر و ئەدەبیاتی کوردی)دا نووسیویەتی، بەڵام کاکەی فەللاح هەندێ شتی دیکەی پێوە ناوە تا نەناسرێتەوە، لە کاتێکدا ئەم جۆرە ڕایانە پێویستیان بە وردبوونەوە و بەراوردکاری هەیە، کە پەیڕەوکردنی ئەو بەرنامەیە لە ئەدەبی میللەتاندا بۆ خۆی پەیڕەوکردنێکی زانستییانەیە بۆ دروستکردنی ڕای زانستی و مەوزوعی، بەپێچەوانەشەوە ڕایەکە دەبێتە ڕایەکی هەڕەمەیی و ناچێتە ژێر دەواری مەوزووعیەتەوە. کە دەڵێن (شێخ نووری) پەیڕەوی (تۆفیق فیکرەت)ی کردووە پێویستە ئەوە بۆ خوێنەران ڕوون بکرێتەوە کە ڕادەی ئەو (لاساییکردنەوە)و (پەیڕەویکردن)ە چەند بووە و چۆنە؟ بەڵگە و نموونەی پراکتیکی بۆ ڕایەکانیش بهێنرێتەوە، تا بزاندرێ ئەو لاساییکردنەوەیە گەیشتووەتە ڕادەی بێن پێوە نانی تا ڕادەی خنکان؟ یان دەستنیشانی ئەوە بکرێ لە چ قۆناغێکی شیعریدا شاعیر لاسایی کردووەتەوە، چونکە لە قۆناغی سەرەتایی لاساییکردنەوە شتێکی ئاساییە! بێگومان کاکەی فەللاح تورکی زانیش نییە تا بڵێین خۆی گەیشتووەتە ئەو بیروڕایە، ئەگەر تورکی زانیش بێت، دەستی بەسەرجەمی ئەو بەرهەمانەی (شێخ نووری) و ئەدەبی ئەو سەردەمەی تورک نەگەیشتووە تا سیفەتی (لاسایی)کردنەوە بەباڵای شێخ نووری ببڕێ. ئەگەر هەر سووریشە لەسەر ڕایەکەی، ئەوە پێویستە بەبەڵگە و نموونە ڕایەکەی خۆی بچەسپێنێ.

لەوانەیە «لاساییکردنەوە»کە هەر ئەوەندە بێ کە شێخ نووری گەڕاوەتەوە سەر کێشی خۆماڵی، ئەم کارەش لە کارتێکردنی تاقیکردنەوەی گەلانی دەوروبەر بەدوور نەزانین، ئەوە ئەو کاتە دەبێ هەرچی شیعرێک بەکێشی خۆماڵی نووسرابێ، هەموویان بەلاساییکردنەوە ناو ببەین. دەمێنێتەوە سەر شێواز و شێوازی نووسین لە شیعردا، ئەوە ئەگەر قەناعەتیش

بەخۆم بکەم کە شێخ نووری ئیحای لە شیعری شاعیرە تازەکانی تورک وەرگرتبێ، ئەوە ناتوانم قەناعەت بەخۆم بهێنم کە شێوازی هیچ کەسێک وەک خۆی لاسایی بکرێتەوە، چونکە دوو خودی جیاوازن و وەک چۆن هەر کەسێک پەنجە مۆری لە کەسێکی دیکە جیایە، بەم جۆرەش ناکرێ شاعیرێکی هۆشیاری ئەو سەردەمە کەسایەتی خۆی بسڕێتەوە و لاسایی کوێرانەی شاعیرانی کورد بکاتەوە، لە کاتێکدا ئەو بەروبوومی ئەوانی خوێندووەتەوە بۆ ئەوەی کەسایەتی جیاواز و تایبەتی خۆی پێکەوە بنێ.

کە شاعیر نەیتوانی وەک خۆی لاسایی کەسێکی دیکە بکاتەوە، مانای وایە ناتوانێ تێڕوانینی خۆی بۆ ژیان و بوون بسڕێتەوە، شاعیریش کە تێڕوانینی خۆی هەبوو جۆری تێڕوانینی تایبەتی و گۆشەنیگایەکی زیندووی دەداتێ ژیانی لێوە ببینێ. ئەو گۆشەنیگایە تایبەتییە (سستمی دەربڕین - نظام التعبیر)ێکی تایبەتی بۆ دروست دەکات، کە نابێ ئەو سستمی دەربڕینە لە لای دوو شاعیری نوێخواز وەک یەک وابێ، ئەوە نالێم شاعیرەکە بکەوێتە دزی کردنێکی زەق و ئاشکرا. کاریش بگاتە ئەو ڕادەیە، ئەو کاتە ناتوانین ناوی بنێیین (دەستێکی بالای هەبوو لە نوێکردنەوەدا) بەلکو دەبێ ئەو جورئەتەمان هەبێت بلێین ئەمە (دزی کردنە)، دزی کردنیش وەک حەزرەتی (نالی) دەلێ:

ئەو گەوهەری نوکتەی لە نالی دەدزن خەلق
شەوقی نییە، وەک ئاگری بێ شەوقی دزانە

بەرهەمی بێ شەوق، بەرهەمێکی ڕەسەن نییە، خوێندەواریش زەوق و تامی لێ وەرناگرێ. کاکەی فەللاح بیانووی سەرەکی بۆ پشتگوێ خستنی شێخ نووری بۆ ئەوە دەگەڕێنێتەوە. دوای ئەوەی پێی ڕاگەیاندین کە شێخ نووری تا توانی لاسایی کردەوە، دواییش هاتەسەر ئەوەی (لەوە بەملاوە لە هەناسە و بەرهەم کەوت و بەداخەوە کشایەوە دواوە و پاش ئەوەش ئەگەر بەرهەمێکی هەبوایە لەسەر تانوپۆی عەرووزی عەرەبی و شێوەی کلاسیکی دەیچنی و چێژی لێ وەردەگرت)[٣٥] دیسان ئەو قسەیە بۆی نابێتە پردی پەڕینەوە لەوەی لەم کتێبەدا جێگەی بۆ نەکاتەوە و لە کاروان بیداتە دواوە، چونکە ئەگەر شێخ نووری پاشەکشەی کردبێ و جارێکی دیکە لەسەر تانوپۆی عەرووز شیعری نووسیبێ، ئەوە ناگەیەنێ شێخ نووری (لە هەناسە و بەرهەم کەوتبێ) وەک لەم دیوانەیدا

(٣٥) کاروانی شیعری نوێی کوردی، بەرگی یەکەم، کاکەی فەللاح، چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد ل١٠

دەردەکەوێ. بێجگە لەوەش هەمـوو شیـعـرەکانی ئەم دواییـیـەی لەسـەر تانوپۆی عـەرووز نەچنیـوە. دەبوایە بڵێ بەتـەواوەتی شیـعـری شێخ نووری-م لە بەردەسـتـدا نییـە، بۆیە لەم کتێبەمدا جێگەم بۆ نەکردووەتەوە، چونکە لە کتێبەکەیدا شاعیری میللی یان شاعیری وای تێدایە کە شێخ نووری هیـچی لەوان کـەمـتـر نییـە، ئەگـەر زیاتر نـەبێ. یان ڕادەی بەشداربوونی لەگەڵ تەوژمی تازەبوونەوەکە لەوان کـەمتر نیـیـە. لەبەر ئەوە ئەگـەر شێخ نووری چەند شیـعرێکی کەمیـشی هەبێ پاڵپشتی نوێبوونەوەی کـاروانی شیـعری نوێی کوردی کردبێ، دەبێ ئەو پانتاییـیە دەستنیشـان بکرێت و لەسـەر نەخشـەی تازەبوونەوەکە شوێنی جووڵانەوەکەی دیار بکرێت، ئەمەش ئەرکی هەموو لێتوێژەرەوەیەکی زانستپەروەر و مەوزووعیەتخوازە(*).

شێخ نووری بەسـەر خاسیـەتەکانی شیعری کلاسیکی شاعیرێکی یاخی بووە، هەوڵێکی زۆریشـی دا بۆ هەڵوەشـاندنەوەی ئەم جـۆرە شـیـعـرە. پاڵپـشـتی ئەم هەڵگەڕانەوە و یاخیـبـوونەشی ڕۆشنبیـرییـە فـراوانەکەی بوو، کە پشـتی بەمـەنتـیـقی پێشـکەوتن و تازە بوونـەوە ئەسـتـوور بوو. مـوغـامـەرەی نووسـینی یەکـەم شـیـعـری تازەی کـرد و ویسـتی کـەشـوهەوای تازەی بۆ سـاز بکات و خـۆی بەبێ سـڵـکردنەوە تەقـاندییـەوە. فـتـیلی ئەو شۆڕشە تـازەیە لەسـەر دەسـتی شێخ نووری داگیرسـاو بۆ یەکـەم جـار کـەوتە بڵاوکردنەوەی جۆرە شیعرێک کە لەگەڵ ئیقاعی شیعری دیکەی لەمەو پێشتر جیاواز بوو، لەگەڵ چێژ و ڕوانین و گـوێچکەی خـوێنەری ئەو سـەردەمـە جـیـاواز بوو، لەبەرئەوە شێخ نووری یەکـەم شاعیرە ڕووبەڕووی خوێنەر و چێژی دەق گرتوویان بوویێتـەوە تا ئاگری داهێنان هەمـیشـە بڵێسەدار بێت و بەرانبەر بە گرفتەکانی ژیانی هاوچەرخ ڕوو لە کزی نەکات. ئەگەر کاکەی فەللاح بەوەش قـایلمـان بکات کە شێخ نووری بەم دواییـیە پاشەکشێی کردبێ، پێـویست بوو سـەرەتاکـەی فـەرامـۆش نەکـات. نەک بەڕایەکی سـەرپێیی خـۆی لە باس و خـواسی تازەبوونەکـەی شێخ نووری بەدوور بگرێ و بڵێ: (جا ئاخـۆ ئەم ڕاپەڕینە شـیـعـرییـە و ئەم گۆڕین و داهێنانە لەسەر باڵی لاسایی شیعری سەردەمی تورکییە لەنگەر و دەقی دواییی گـرت و بڕایەوە؟ نەخـێر... بەرە بەرە شاعـیـرەکـانی وەک شێخ نووری و ڕەشـیـد نەجـیب و ڕەفـیـق حـیلمی و ئەوڕەحـمـان بەگی نفـوس بەرێگای گـۆڕین و داهێنانـەکـەدا بەرەو دوا سـسـتـەڕۆ بوون و وەسـتـان و بڵێسـەی سـەرگـەرمیی و خولیـا - طمـوح -کـەیان وردە وردە

---

(*) وتارێکی دوورودرێژم لەسەر کتێبی (کاروانی شیعری نوێی کوردی) نووسیوە دەربارەی (بەرنامە)ی کتێبەکە و بیروڕایەکان باری سەرنجی خۆم دەرخستووە.

ڕووی کردە کزی و کوژایەوە...)[٣٦] کاکەی فەللاح بەبێ ئەوەی حیساب بۆ ئەوە بکات کە مەسەلەی وەرگرتن و بەخشین کارێکی ڕەوایە، ئەوە پشتگوێ دەخا کە هەموو میللەتێکی زیندوو ناتوانێ لەم پرۆسەیەدا دوورەپەرێز بووەستێ، بۆیە ڕێک و ڕاست شێخ نووری بەلاسایکردنەوەی ئەدەبی تازەی تورکی تاوانبار دەکات، بەمەش دەیەوێ وا بەخوێنەر ڕابگەیەنێ گوایە تازەبوونەوەکەی شێخ نووری ڕەسەن نەبووە، تەنانەت لە خزمەتی ئەدەبی نەتەوایەتی کوردیشدا نەبووە، بەبێ ئەوەی لەم (وەرگرتنە) ئاوڕێ لە ئەدەبی بەراوردکاری بداتەوە و بزانێ کە: «دەبێ هەموو نەتەوەیەکی ڕووناکبیر شت وەربگرێ و بەخشندەش بێ، ئەمەشیان ڕاستەقینەیەکی گەوهەری ئەوتۆیە بۆ پێشکەوتنی ئەدەب کە نابێ نووسەرێ هەرگیز پشت گوێی بخا یا بەچاوێکی کەم سەیری بکا...»[٣٧] وەک دیمان کاکەی فەلاح بەوەوە نەوەستاوە ڕۆڵی شێخ نووری داوەتە دواوە و لە هەنگاوی تازەبوونەوەدا بەبچووکی نیشانی داوە، بۆ ئەوەی لە کتێبەکەیدا بەچەند لاپەڕەیەک بەسەری نەکاتەوە، بەڵکو هاتووە وەک هەر شاعیرێکی نارەسەن باسی لێوە دەکات، کە نارەسەنایەتییەکەی بەرەو کزی و کوژانەوەی بردبێ. ئەم ڕایەش هیچ کەسێکی مەوزووعی لێی وەرناگرێ.

ئەگەر قسەکەی کاکەی فەللاح ڕاست بێت شێخ نووری لەسەر باڵی لاساییکردنەوەی شیعری تورکی لەنگەر و دەقی گرتبێ، یان خەریکی پەیڕەوکردن و لاساییکردنەوەی شیعری نوێی تورکەکان بووبێ، هەر لەبەرئەوەی مامۆستا (ڕەفیق حیلمی) لە بەرگی دووەمی کتێبەکەیدا (شیعر و ئەدەبیاتی کوردی) وتوویەتی پەیڕەوی (تۆفیق فیکرەت)ی کردووە، ئەوە مانای وایە مامۆستا (گۆران)یش کە دەڵێ: «لە سەرەتاوە بەهۆی ئەدەبی ئینگلیزییەوە بەدوای نظریەی (هونەر بۆ هونەر) ئەڕۆیشتم و بەرهەمی ئەم تەرزە ئەدەبەم ئەخوێندەوە، وەک هینەکانی (جۆن کیتس) و (ئۆسکار وایڵد)»[٣٨] دیسان دەبێ (بەدوا ڕۆیشتنەکەی) مامۆستا گۆران-یش هەر بریتی بێت لە لاساییکردنەوە، لە کاتێکدا من بەکارێکی ئاسایی دادەنێم، چونکە بە لەنگەر گرتنی نازانم لەسەر باڵی ئەدەبی ئینگلیزی وەک کاکەی فەللاح لێکی دەداتەوە و باسی شێخ نووری دەکات. هەرچەندە کاکەی فەللاح لە سەرەتاوە دەڵێ: «شێخ نووری دەستێکی باڵای هەبووە لەو تازە بوونەوەیە» ، کەچی لە

(٣٦) کاروانی شیعری نوێی، کاکەی فەللاح، بەرگی یەکەم ل ٣٠.

(٣٧) ئەدەبی بەراوردکاریی، عەزیز گەردی ل٣.

(٣٨) گۆڤاری بەیان، ژمارە (٢)ی شوباتی ساڵی، ١٩٧٠.

دوای ئەو ڕستەیە بەهەموو شێوەیەک هەوڵی داوە سەروپۆتەلاکی شێخ نووری بکوتێتەوە، ئەمەشی بۆیە کردووە، تا بەحیسابی خۆی گۆڕەپانەکە بۆ مامۆستا (گۆران) تەخت بکات کە لەو بڕوایە دام مامۆستا (گۆران) لەم جۆرە کارانە بێ بەرییە. خۆشی پێویستی بەوە نییە بەو ڕێگایەوە بەخەڵک بناسرێ، ئەگەر خۆشی بمایە بەوە ڕازی نەدەبوو.

ئەمڕۆکە مامۆستا (گۆران)یش پێویستی بەهووڕا و هوتاف کێشان نەماوە و هەموو خاوەن زەوقێک بایی خۆی نرخی مامۆستا (گۆران) دەزانێ و شوێنی تایبەتی لە دڵ و دەروونی خوێنەراندا هەیە، بەڵام کاتی ئەوە هاتووە و خوێنەرانیش چاوەڕوانی ئەوە دەکەن، شارەزایان لێکۆڵینەوەی هەمەلایەن و قووڵ دەربارەی (گۆران) بنووسرێت، نەک وتارەکان وەک ئەوەی کاکەی فەللاح بریتی بێت لەو قسانەی هەموو کەسێک دەیزانێ وەک ئەوەی نووسیویەتی: «گۆرانی بلیمەت هونەرمەندی بەهرەداری لە بۆ شیعر و ئەدەب زاو» و دەیان ڕستەی وا کە (بژی) و (بڕووخێ) بەبیر خوێنەر دەهێننەوە. خوێنەری ئەمڕۆکە پێویستی بە ڕاو و بۆچوونی تازەیە، پێویستی بەڕۆشنبیرییەکی پێشڕەوانەیە، پێشەوایەتییان بکات، نەک بڕیاری حازر بەدەست و سواو کە هەموو کەس ڕای لەسەری یەک دەگرێتەوە. هەمووومان دەزانین مامۆستا (گۆران) شاعیرێکە (داهێنەر) و (بلیمەت) و (بەهرەدار) و (چەسپێنەر) و... و... بەڵام خوێنەریش بۆی هەیە بپرسێ (چۆن...)؟ هەر وشەیەک لەم وشانە پێویستی بەلێکۆڵینەوەیەکی جیاواز و تێروتەسەل هەیە، لێتوێژەرەوە پێویستە ڕوونیان بکاتەوە، ئەگینا نووسینەکە کەمتر هەستکردن بە(لێپرسینەوە) دەگرێتە خۆی، هیچ نەبێ بۆ ئەوەی نووسینەکە نەختێ لە ئاستی گەورەیی و بلیمەتی (گۆران) بێت.

دیسان کە دەڵێ: «شێخ نووری خەریکی پەیڕەوکردن و لاساییکردنەوەی شیعری نوێی تورکەکان بوو» یا «لەوە بەملاوە لە هەناسە و بەرهەم کەوت» یا «بەداخەوە کشایە دواوە» خوێندەوار پێویستی بەبەڵگە و نموونە و لێدوانی ئەم ڕایانە هەیە تا ئیقناع ببێ، چونکە بەهەموو دوعایەک ناڵێین ئامین! هیچ نەبێ وەک خۆی لە لاپەڕە (٢٧-٢٨-٢٩)ی کتێبەکەیدا باسی کردووە، بزووتنەوەی تازەبوونەوەی شیعری کوردیمان بۆ هەوڵی کۆمەڵێ شاعیر بباتەوە، کە هەر شاعیرەیان ڕۆڵێکی جیاوازی هەبووە، چونکە قۆناغێکی شیعری لەسەر شانی شاعیرێک دروست نابێت، وەک چۆن لە شیعری کلاسیکدا ناڵێین (قوتابخانەی نالی) لەگەڵ ئەوەشدا کە (نالی) شاعیرێکی پایە بەرزە، بەڵکو بە قوتابخانەی شیعری بابان ناوزەد کراوە، بەڵام (نالی) دەرکەوتووترین شاعیری داهێنەری ئەو قوتابخانەیە بووە، بەو جۆرە قەت ناتوانین بڵێین هەرچی شاعیری پاش (نالی)یە

دەرچووی قـوتابخـانەی (نالی)ین و ئەم ئیـجـازەی بوونە شـاعـیـریی پێ داون. هەر لەو قـوتابخـانەی شیـعـری بابانەدا (سـالم)و (کـوردی) هاوبەشیـی دروستکـردنیـان کـردووە و ڕاست نیـیـە بڵـێین قـوتابخـانەی شیـعـری (نالی) و ڕۆڵی ئەو دوو شـاعـیـرە بسـڕینەوە، هەرچەندە هونەری گـەورەی بۆ داهێنانـی (نالی) دەگـەڕێتـەوە. بۆ شـیـعــری تازەش (قـوتابخانەی شیـعری نوێ) بەجوانتر دەزانم لە قوتابخانەی شیعری (گۆران) کە زۆربەی شـاعـیـرانی ئەو سـەردەمـە (قـوتابی) نوێکردنەوەی شـیـعـری کـوردی ئەو دەمـە بوون و هەریەکـەیان بە پێی توانایی خۆیان بەشـداری لە چەسپـاندنیـدا کـردووە، بەڵام (گـۆران) بەدەرکەوتووترین شاعـیری بەدەسەڵاتی ئەو قوتابخانەیە دەژمێردرێ، بەبێ ئەوەی لە ڕۆڵی هیچیان کەم بکاتەوە.

عـەرەبەکـانیـش کـە دێنە سـەر باسی شیـعـری تـازەیان نالێن قـوتابخـانەی شـیـعـری (سەییاب)، ئەگەرچی (سەییاب) بەشاعیرێکی پایە بەرز و بەدەرەوەبووی ئەو بزووتنەوەیە دەژمێـرن، بەڵام لەگـەڵ نـاو هێنانی شیـعـری تازە ناوی (سـەییـاب و ئەدۆنیس و نازک و عەبدولوەهاب و حسەین مەردان و بلند حەیدەری و سەعدی یووسف) تاد... دێتە پێشەوە کـە هەریەکـەیان کـەسـایەتی خۆیـان هەیە و هەریەکـەیان بەپێی ڕادەی بەشـداربوونـیـان لە مەسەلەی تازەبوونەوە باسیـان لێوە دەکرێ، بەبێ ئەوەی تۆمار کردنی یەکـەم هەوڵدان بۆ نووسینی شیعری تازە پشتگوێ بخرێت. جارێکی دیکە کاکەی فەللاح دەنووسێ: «ئەوەی کـە بەلای منەوە بەردی بنچـینەی نوێکردنەوەی شـیـعـری کـوردیی دانـا و لە مـەڵبـەندی تێگەیشتن و قـووڵیی و خـوێندنەوە و زانینەوە کـەوتە داهێنان و بەرهەمی نوێ (گۆران)ی پێشـەوا و بلیـمـەت بوو»[٣٩] من لەگـەڵ ئەوەدام کـە مـامـۆسـتـا (گـۆران) لە ئەنجـامی تێگەیشتن و قووڵ بوونەوە و خوێندنەوەوە کەوتبێتە داهێنان و بەهرەکەشی یارمەتی ئەوەی دابێ، بەڵام لەوەدا لەگەڵ کاکـەی فەللاح یەک نـاگرمەوە کـە مـامۆسـتا (گـۆران) [بەردی بنچـینەی نـوێکردنەوەی شـیـعـری کـوردیی دانابێ] بەڵکو بەپێی بیـروڕای مـامـۆسـتـا (گۆران)یش بەردی بنچینەکە (شێخ نووری) دایناوە و لە پاشان دیواری نوێبوونەوەکە لە لایەن کـۆمـەڵێ شـاعـیـرەوە، لە سـەرووی ئەو شـاعـیـرانەوە (گـۆران) هەڵچنراوە و بەرز بووەتەوە. ئینجا دەڵێ: «سایە و سێبەری کارتێکردن و بەردەوامی لەسەر دنیـای شیعری کـوردیی هەر مـاوە و هەر هەیە»[٤٠] ئەم ڕایە زلە پێـویسـتـی بەسـەلماندن هەیە، شـیـعـری

(٣٩) کاروانی شیعری نوێی کوردی، بەرگی یەکەم ل ٩ .

(٤٠) کاروانی شیعری کوردی، بەرگی یەکەم، کاکەی فەللاح ل ١٠.

کوردیی (ئەوسا و ئەمڕۆکە) ئەگەر لە ژێر سایە و سێبەری شیعرەکانی مامۆستا (گۆران) دەرنەچووبێ- لەگەڵ هەموو گەورەیی ئەو شاعیرە - مانای وایە شیعری کوردی هەر لە قۆناغی لاساییکردنەوەدا دەژیت و هیچی بەهیچ نەکردووە و نایکا. بێگومان هیچ میللەتێکی زیندووش تاسەر پێویستی بەلاساییکردنەوە و شوێن پێ کەوتنی شاعیرێک نییە.

شیعری کوردی ئیشێکی باشی نەکردووە و نایکا ئەگەر سایە و سێبەری شیعری (گۆران) هەر بەسەریەوە بێت و بەری نەدات. گۆرانیش ئەوەی پێ خۆش نییە شیعری کوردی وابیبنێ و لە گۆڕەکەیەوە لێمان زویر دەبێ، چونکە میللەتێک هەنگاو بەرەو شارستانیەت بهاوێ پێویستی تەنیا بەکەسانی داهێنەرە، ئەوانەی لاسایی داهێنەرەکان دەکەنەوە زیادن و پێویست بەبوونیان ناکرێ. کەوابێ بەقسەی کاکەی فەللاح بێ، دەبێ ئەو شاعیرانەی ئەوسا بەهەند نەزانین، ئەوانەی ئەمڕۆش بارگە و بنەی خۆیان تێک بنێن و ئیدی لەمەولا شیعر نەڵێن، ئەگەر وا نییە (سایە و سێبەری کارتێکردنی بەردەوامی لەسەر دنیای شیعری کوردیی هەر ماوە و هەر هەیە) چۆنە و نموونەکانی کامانەن؟!! ئینجا هەندێ بیروڕای دیکە دەردەبڕێ کە وەک (تحصیل حاصل) مامۆستا (گۆران) نیشانی داوە، من لەگەڵ ئەو ڕایانەم، بەڵام دیسان عاتیفە لە هەندێ جێگەدا بەرچاوی گرتووە و دەوری شاعیرانی دیکە لە (گۆڕین) و (درێژ پێدان)و (سەرپێ گرتن) و (داهێنان) و (نەسلەمینەوە) و (بەکارهێنانی کێشی خۆماڵی) و (لە دایکبوونی ڕێباز و قوتابخانەی ڕۆمانتیکیی لە شیعری کوردیدا) بەبەشداربوونیش پێیان ڕەوا نابینێ کە لەتەک (گۆران)دا ڕەنجیان بۆ داوە[٤١]. ئەم ڕەنج و تەقەللایەش - زۆر و کەم - نابێ لە بیر بکرێ و چاومان لێیەوە نەبێ.

لە پاش دەربڕینی ئەو بیروڕایانە دەمانەوێ بیروڕایەکی دیکەی کاکەی فەللاح بەبیرتان بهێنینەوە کە دەڵێ: «ئاشکرایە تا دەوروبەری سالانی (١٩٢٥-١٩٣٠) شیعری کوردی لە ڕووی کێش و یەک قافیەیی و شێوەی دەربڕین و کەرەسەی بیر و وشەبازی و چاولێکەرییەوە، بەشێوەیەکی درشت و گشتی، لە چوارچێوەی شیعری کلاسیکیدا توند شەتەک درابوو، بەڵام لە سایەی مامۆستایان (پیرەمێرد و گۆران و شێخ نووری و ڕەفیق حیلمی و ئەوڕەحمان بەگ و ڕەشید نەجیبەوە وردە وردە ئەو سەهۆڵ بەندانی چاولێکەری و لاساییکردنەوەیە شکا و ڕێگای نوێکردنەوەی شیعر و موتوربەکردنی بە شێوە و ناوەرۆکی

(٤١) هەمان سەرچاوەی پێشوو، بڕوانە لاپەڕە (٣١-٣٢-٣٥).

نویٚ گیرایە بەر»[٤٢] من هیچ لاریم لەو قسانەی کاکەی فەللاح نییە کە لەگەڵ زۆر لە ڕایەکانی کتێبی (کاروانی شیعری نوێی کوردی) یەک ناگرێتەوە، بەتایبەتی دەربارەی شێخ نووری، بەڵام کە دەڵێ: «تا دەوروبەری ساڵانی (١٩٢٥-١٩٣٠)» ئەمەیان پێویستی بە لەسەر وەستان هەیە و بۆمان هەیە بپرسین بۆچی ساڵی (١٩٢٥)؟! یان ئەو ساڵەی لە کوێوە هێناوە و لە ئەنجامی چ قەناعەتێک ئەو ساڵەی مامۆستا (ڕەفیق حیلمی) لە کتێبی (شیعر و ئەدەبیاتی کوردی)دا نووسیوبەتی هەڵدەوەشێنێتەوە؟! لە کاتێکدا زۆر بەوردی دەستپێکردن و سەرەتای چوزەرە دەرکردنی شیعری نوێی دەستنیشان کردووە کە ساڵی (١٩٢٠)ە، ئیدی بۆچی مامۆستا کاکەی فەللاح ئەو ساڵی (١٩٢٠)ەی بەساڵی (١٩٢٥) داناوە؟ لەسەر چ بنەڕەتێک ئەو ساڵەی پشتگوێ خستووە؟ لێتوێژەرەوە پێویستە لە دەستنیشان کردنی ئەو جۆرە ساڵانە ورد بێ و درشتبینی بەسەریدا زاڵ نەبێ. ئەمەش وەنەبێ زەللەی قەڵەم بێت و ڕووی دابێ، چونکە هەمان هەڵەی لە نووسینێکی دیکەدا دووبارە کردووەتەوە ئەوەتا دەڵێ: «سەرەتای شیعر وتنی (بەختیار زێوەر) دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٢٥، واتە لە تەمەنی حەڤدە ساڵییەوە شیعری وتووە، بەم پێیە هاوچەرخی شاعیرانی ئەم سەردەمە بووە، ئەو شاعیرانەی کە لە دەستپێکردنی بزووتنەوەی شیعرییانەوە لەسەر تان و پۆی عەرووزی عەرەبی و کەرەسە و چەشنی دەربڕین و شێوەی کلاسیکی بەرهەمی شیعرییان دادەڕشت و لە ساڵی ١٩٢٠ و ١٩٢٥ بەدواوە وردە وردە کەوتنە گۆڕین و نوێکردنەوەی شێوە و ناوەرۆکی شیعری کوردی- ناوچەی سلێمانی بەرەو ئاسۆی ڕۆمانتیکیی»[٤٣] لەمەشیاندا ساڵی (١٩٢٠)ەکە دەخاتە گومان لێکردن و (١٩٢٠ و ١٩٢٥) دادەنێ، بەبێ ئەوەی هۆیەکەی بۆ خوێنەران ڕوون بکاتەوە![٤٤].

---

(٤٢) ڕۆژنامەی ژین، ژمارە (١١٢)ی ساڵی (٣)، ڕۆژی پێنجشەممە ١٩٧٣/٥/١٧ «چۆن چۆنی لە کۆن و نوێی شیعر ئەدوێین؟» کاکەی فەللاح.

(٤٣) کاروانی شیعری نوێی کوردی، بەرگی یەکەم، کاکەی فەللاح ل ٨١ .

(٤٤) کاکەی فەللاح لە چاوپێکەوتنەکەی شەوی ١٩-٢٠ / ١٠/ ١٩٨٣ کە لە بەرنامەی (گۆڤاری ئەدەب)دا لەگەڵی ساز درابوو، لە پرسیارێکدا دەربارەی ئاشنایەتی ئەو لەگەڵ (گۆران) و (شێخ نووری) بەهیچ شێوەیەک لەفزەی لە شێخ نووری نەگەڕا و بەلایدا نەچوو، باسەکەی زۆرتر بردەوە لای مامۆستایان (هەردی) و (مەدهۆش) و (ع. ح. ب) و (گۆران)، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ شێخ نووری ئاشنایەتی لەگەڵ کاکەی فەللاح-دا نەبووە، ئینجا لە کاتی دەستنیشانکردنی مێژووی ڕەخنەی =

* مامۆستا (ڕەفیق حیلمی) لە وتاری (ئینقیلاب لە شیعر کوردیدا) نووسیویەتی: «دوای چەند ساڵێک دەستم دایە (بەرگی دووەمی شیعر و ئەدەبی کوردی) زۆر بەداخەوە ئەڵێم: هێشتا بەو ئامانجە نەگەیشتووم و لە (گۆران) و تا ماوەیەکیش (نووری شێخ ساڵح) بەولاوە شاعیری وام بەدەسەوە نەبوو لە ڕیزی ئەو شاعیرانەدا بژمێررێن کە دەوری ووریابوونەوە بنوێنن»[٤٥] لە ڕاستیدا (گۆران) بەهۆی بەدواداچوونی زیاتر بۆ مەسەلەی تازەبوونەوە، ڕوانینێکی قووڵتری بۆ ئەو کێشەیە لە لا پەیدا بووبوو، ئەو تەنیا بەزمانی تورکی و عەرەبی و فارسی نەوەستا، بەڵکو خووی دایە فێربوونی زمانی ئینگلیزیش، ئەو زمانە زیندووەش ئاسۆیەکی فراوانتری بۆ داهێنان و تازەکردنەوەی شیعری کوردی لە بەردەمدا کردەوە. کە دەڵێم بەقووڵی تێگەیشتن لە مەسەلەی نوێ بوونەوە، مەبەستم گۆڕینی کێش و قافیە نییە، ئەگەرچی ئەمە بەشێکی گۆڕانەکانی شێوەی شیعری بوو، بەڵام بەشێوەیەکی سەرەکی هەوڵدان بوو بۆ گۆڕینی چەمک و مەفهوومی شیعر و قووڵترکردنی تێڕوانینی شاعیر بەرانبەر بە ژیان و تەماشاکردنی جووڵانەوەکانی ئەو ژیانە لە گۆشەنیگایەکی تایبەتییەوە، هەر ئەمەش تێڕوانینی تایبەتی لە لای شاعیر دروست دەکات و وەک داهێنەرێک دەیهێڵێتەوە. دەوری شێخ نووری وەک ڕچەشکێنێک و وەک شاعیرێکیش کە لە شیعری کلاسیکی و دابونەریتەکانی یاخی بووە، دەورێکی کەم نییە. ئەو ماوەیەش کە مامۆستا (ڕەفیق حیلمی) خۆی خستوویەتییە نێوان ساڵانی (١٩٢٠-١٩٣٠) لە ماوەی ئەو دە ساڵە شیعری شێخ نووری لە بواری نوێ کردنەوەی شیعری کوردیدا تاقە کاریگەرییەک بووە بۆ سەر ئەو شاعیرانەی کە لە پاش ئەو هاتن و هەر لەسەر شێوەی ئەو دەستیان بەشیعر نووسین کردووە.

مامۆستا (گۆران) کە شیعر دانانی ڕاستەقینەی لە دوای ساڵانی سییەوە دەست پێ

---

=کوردی، دیسان سەرەتاکەی بردەوە بۆ لای (ئەمین فەیزی) و بەهیچ جۆرێ ئاماژەی بۆ ئەو بیست و پێنج زنجیرە وتارە ڕەخنەییە نەکرد کە شێخ نووری لە کاتی خۆیدا لە ساڵەکانی (١٩٢٦-١٩٢٧) لە ڕۆژنامەی ژیان-دا بڵاوی کردووەتەوە. ناوی کتێبەکەی خۆشی برد و خستییە ڕیزی ئەو کتێبانەی لە مێژووی ڕەخنەدا ناوی بردن و وتی: زۆرتر باسی ئەو شاعیرانەیم کە لە دوای ساڵانی بیست و سی دەوریان لە نوێکردنەوەی شیعری کوردیدا هەبووە، وەک بڵێی شێخ نووری یەکێک نەبووبێ لەو شاعیرانە، کە لە کتێبەکەیدا پشتگوێی خستووە!!

(٤٥) گۆڤاری پێشکەوتن، ژمارە (١)ی ساڵی (١)، شوباتی ساڵی ١٩٥٨، (ئینقیلاب لە شیعری کوردیدا) ڕەفیق حیلمی.

دەکات، یەکێکە لەوانەی خۆی دان بەو حەقیقەتەدا دەنێ کە لە ژێر ئەو تەئسیرە شیعری نووسیوە، کە شێخ نووری پێی نووسیوە و ڕەنگی بۆ ڕشتووە. شتێ هەیە لێرەدا پێویستە بگوترێ، ئەویش ئەوەیە ماموستا (گۆران) تا خۆی مابوو، ئیشێکی باشی دەکرد کە شیعرەکانی خۆی چەپک چەپک لە چاپ دەدا. بەپێچەوانەی (شێخ نووری)یەوە کە بەهۆی سەرقاڵی و کەمتەرخەمی و پشتگوێ خستنی خۆیەوە هیچ کۆمەڵە هۆنراوەیەکی بەچاپ نەگەیاند، ئەم کارەش تەئسیری زۆری کردە سەر دەوری شێخ نووری و دەرنەخستنی بەو شێوەیەی کە پێویستە دەربخرێت، ئەوە جگە لەوەش لە چاپ نەدانی بەرهەمەکانی بووە هۆی لە کیس چوونی بەشێکی زۆری ئەو شیعرانە، بۆیە ئەگەر شێخ نووری تەئسیری بەسەر شاعیرانی دیکەشەوە هەبووبێ، ئەو تەئسیرە بەهۆی لەبەر دەست نەبوونی شیعرەکانی دەرنەکەوتووە یان لە نووسین و لێکۆڵینەوەدا بووەتە هۆی بچووک نیشاندانی دەوری شێخ نووری لە نوێکردنەوەی شیعری کوردی و دەرکردنی بڕیاری ڕەخنەیی ئەوتۆ کە نەک هەر حەقیقەتی نەپێکاوە، بەڵکو حەقیقەتیشی بەژێرەوە کردووە.

ئەوە ڕاستییەکی بەڵگەنەویستە، کاتێ شێخ نووری دەستی دایە نوێکردنەوەی شیعری کوردی، ئەم تازەبوونەوەیە لە لای ئەو شتێکی هەڕەمەیی نەبوو، بەڵکو وەک پێشتر ڕوونمان کردەوە لە ئەنجامی وردبوونەوە و تێگەیشتنەوە بۆی چووە مەیدان، وەک کەسێکی شارەزاو تێگەیشتوو لە شیعری لوتکەکانی پێش خۆی. وتارە ڕەخنەییەکانی ئەوە دەسەلمێنن کە تازەکردنەوەی شیعری کوردی لەسەر دەستی شێخ نووری (ڕێکەوت) نەبووە.

شێخ نووری سەرباری ئەوەی وەک شاعیرێک تۆوی نوێبوونەوەی چاند، زانیویەتی چۆنیش هەنگاو دەنێ. لە ماوەی ئەو دە ساڵەش تاکە کەسێک بووە لە مەیدانی تاقیکردنەوە لە شیعری نوێی کوردیدا. ئەگەر کەسانێکیش هەبووبن وەک ئەو نووسیبێتیان، ئەوە لەبەر بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی و دەرکەوتنی لەسەر ڕووی لاپەڕەکانی ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی ئەو حەلە، لە هەموویان زیاتر قورسایی تازەبوونەوەکەی کەوتبووە سەرشان، بۆیە وەک ماموستا (ڕەفیق حیلمی) دەڵێ: «تا ماوەیەکیش (نووری شێخ ساڵح) بەو لاوە شاعیری وام بەدەستەوە نەبوو»، ئەو ماوەیەش وەک باسمان کرد ماوەیەکی گرنگ و ناسکە لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا، لەبەر هیچ نا، لەبەرئەوەی وەک ماموستا خۆی لە هەمان وتاردا وتوویەتی: «ئەڵقەی بەیەکەوە نووسانی دەورەکانی کلاسیکی و وریابوونەوەیە (نەهضە: ڕەنەسانس). بەڵام کە دەڵێ: «خۆی دەورێکی تایبەتی ئەنوێنێ و دەستە قوتابییەکی ئەوتۆی شوێن نەکەوت یا پێی نەگەیاند کە

دەورێکی وا بنوێنن بشێت بخرێتە مێژووی ئەدەبی کوردەوە (نووری) و (دەوری نووری) یەکێک واتە هەر خۆی بوو...»[٤٦] بێگومان شاعیری پێشڕەو و خوڵقێنەر دەوری تایبەتی دەنوێنێ، چونکە مومارەسەی ئازادی خۆی دەکات لە کاری داهێناندا، لە دەلاقەی تازەکردنەوە و سۆراخ و پرسیارکردندا خودی خۆی دەسەلمێنێ، لەبەرئەوەی کاری داهێنان پێوەندی بەزاتی داهێنەرەکەوە هەیە. داهێنەریش بەپێی بارودۆخی مەوزووعی بەرێژەی جۆراوجۆر و جیاواز کارتێکردنی لەسەر شاعیرانی لە خۆیان نەویتر و لە ئەزموونداً بچووکتر، بەجێ دەهێڵن. لەم ڕوانگەیەوە ناتوانین بڵێین شێخ نووری لە ماوەی ئەو دە ساڵی ڕێبەرایەتی کردنی شیعری نوێی کوردی، کارتێکردنی بەسەر شاعیرانی دوای خۆی نەبووە، خوێندنەوەی ئەم دیوانە کارتێکردنی شاعیرایەتی شێخ نووری بەسەر شاعیرانی دوای خۆی ڕوون دەکاتەوە.

ئەو شاعیرانەی کە کارتێکردنی شیعری شێخ نووری-یان بەسەرەوە بووە، لە سەرەتای شیعر نووسیندا بوون، کە کەرەستەی دەربڕین و تێڕوانینی شیعریان بەباشی پێنەگەیشتبوو. لە دواییدا هەموویان هەر زوو خۆیان دۆزییەوە و توانییان جێگەی خۆیان لە شیعری کوردیدا بکەنەوە و لەو کاتەدا ئەو کارتێکردنەی باسی لێوە دەکرێت بەسەریانەوە نامێنێ.

مامۆستا (گۆران) دەڵێ: «ئەو جۆرە ئسلووبەیان تیا کراوە بەسەرمەشق کە مامۆستا (م. نووری) و هاوڕێکانی لە ئەدیبە تازەکانی تورکی عوسمانییان وەرگرت...» کارتێکردنی شێوازی شێخ نووری بەسەر مامۆستا (گۆران)ەوە ماوەیەکی کەمی خایاندووە، تا ئەو کاتەی توانی کەسایەتی شیعریی خۆی بچەسپێنێ، چونکە شاعیرێک بیەوێ بۆ خۆی دەورێکی کەمیش بێ بیبینێ، بەوە قایل نابێ هەر قوتابی بێ. ئەگەر لە سەرەتاشەوە هەوڵی لاساییکردنەوە و پەیڕەوکردنی شاعیرێکی دا، ئەوە لە دوای ئەوەی تێڕوانینی شاعیرانەی پێگەیشت، لاسایی شاعیرێک دەکاتەوە (هێشتا لە دایک نەبووە)، واتە بەزمانی داهاتوو لەگەڵ ئێستای خۆی دەدوێ. ڕاستە زۆر لە شاعیرانی قوتابخانەی شیعری تازە لە سەرەتای شیعر وتنیاندا بەشێوەیەکی گشتی لاسایی و پەیڕەوی خاسیەت و شێوازی شیعری تازەیان کردووەتەوە، بەڵام ئەو لاساییکردنەوەیەش تا سەر نەبووە، ئێستاکە بەشێکی زۆری ئەو شاعیرانە ماون و هیچیان بەوە ڕازی نابن

---

(٤٦) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

ئەمڕۆکەش بەشاگرد و قوتابی هیچ شاعیرێک دابنرێن. ئەو شاعیرانەش کە بە قوتابی مامۆستا (گۆران) دانراون، زۆربەیان لە نزیکەوە شیعری شێخ نووری-شیان خوێندووەتەوە و لە تەئسیری شیعری ئەویش بەدوور نەبوون. لەگەڵ ئەوەشدا شوێنکەوتنی ئەو شاعیرانە نەگەیشتووەتە ئەو ڕادەیەی کەسایەتی شیعرییان بسڕێتەوە. لەو بڕوایەشدا نیم هیچ شاعیرێک لەو دنیایەدا هەبێت، شاعیرێکی داهێنەر و خاوەن کەسایەتی شیعریی دروست بکا، ئەگەر خۆی هەلومەرجی بوونە شاعیری تێدا نەبێ، یان بەهرە و توانایی خۆ پێگەیاندنی نەبێ.

لەگەڵ مامۆستا (ڕەفیق حیلمی) لەوەدا یەک دەگرینەوە کە شاعیری گەورە و داهێنەر، کۆمەڵێ مورید و قوتابی لاسایی دەکەنەوە و دوای دەکەون، بەڵام ئەو شاعیرانە ڕەسەن نین و زوو کز دەبن، لە دوای خۆشیان بەرهەمەکانیان بڕ ناکات و لە شوێنی خۆیان دەکوژێنەوە. میللەتیش زیندوویتییەکەی بەندە بە داهێنەرەکانی، ئەوانەی لاسایی داهێنەرەکان دەکەنەوە پێویست بەبوونیان ناکات. ئەو شاعیرانەی لە دوای (شێخ نووری) و (گۆران)ەوە هاتن، ئەوانیش هەوڵیان دا لە ڕێگەی ئەو زمانانەی دەیانزانی لەسەر زۆر تاقیکردنەوەی شیعری نوێ بوەستن، بەتایبەتی جەماعەتی (ئەپۆلۆ) و (مەهجەرییەکان)، واتە سەرچاوەی خوێندنەوەیان تەنیا شیعری (شێخ نووری) و (گۆران) نەبوو.

کە قۆناغی شیعری تازەی کوردی دەستی پێکرد، لە سەرەتاوە لەسەر دەستی شێخ نووری ڕچەکەی شکاو بۆی چووە مەیدان، دوای ئەو مامۆستا (گۆران) پەرەی پێدا و قووڵتر لە سەرەتاکەی بۆی ڕوانی و ڕەگوڕیشەی بزووتنەوەکەی زیاتر بەخاکی شیعری کوردیدا بردە خوارێ. لە سەردەمی ئەویشدا کاتێ لە تروپکی داهێنان و بەخشش و درەوشانەوەدا بوو، خوێنەران زیاتر ئیستیجابەیان لەگەڵ شیعری تازە پەیدا کرد و بزووتنەوەی شیعری تازە لەسەر مەودایەکی فراوانتر بڵاوبووەوە. شاعیرانی وەک (هەردی) و (دیلان) و (کامەران) و (ع. ح. ب) و (دڵدار) و... تاد لە ئاستی خۆیانەوە وەک شاعیری سەر بەو قوتابخانە تازەیە بەشدار بوون لەسەرڕێ خستنی ئەو بزووتنەوەیە. مامۆستا گۆران لە ناو ئەو کۆمەڵە شاعیرەدا بەدەرکەوتووترین شاعیریان دەزانم، کە بەهۆی بەرهەم هێنانی کۆمەڵێ شیعری نەمر تەعبیری لە گیانی تازەبوونەوەکە دەکرد، کەواتە شێخ نووری ئەوەندەی پێی کرابێ لە بەشدار بوونی بۆ شیعری تازە وەک ڕچەشکێن و بەشداربوویەک درێغی نەکردووە و مامۆستا (گۆران) لە ناو ئەو کۆمەڵە شاعیرەدا بە دەرکەوتووترین شاعیریان ڕووەو ئامانج ئاڵای تازەبوونەوەی هەڵکرد، بەڵام ئەوەندە هەیە

مامۆستا (گۆران) گورجتر بەرەو پیری ئەو ئامانجە ڕۆیشتووە و پێش شێخ نووری کەوتووەتەوە، ئەمەش لە دنیای ئەدەبدا شتێکی زۆر ئاساییە و داهێنان هەمیشە هەروا بووە. واتە ئەڵقەیەکی بەیەکەوە بەستراو بووە و پێوەندی ئەمەیان بەوەکەی پێش خۆی بەهێزتر بووە و لە یەکتر دانەبڕاون. ئنجا مامۆستا (ڕەفیق حیلمی) دەڵێت: [ئەمەش وا ئەگەیەنێت کە (تەرانە)کانی نووری کە شوێن (تۆفیق فیکرەت)ی بوێژی ناوداری تورک کەوتبوو وە لاسایی ئەوی ئەکردەوە لەگەڵ چەشتنی کوردا ڕێ نەئەکەوت و لەبەر ئەوە موریدانی نەبوو، واتە نووری ئینقیلابێکی پێ نەکراو لە بیر چووەوە][47] چاکتر وابوو مامۆستا (ڕەفیق حیلمی) کە تورکی زانێکی باشی سەردەمی خۆی بوو، جۆری ئەو (لاساییکردنەوەیە)ی دەرخستبا کە بووە هۆی (لە بیرچوونەوەی)، چونکە تەنیا وشەی (لاساییکردنەوە) قەناعەت بە خوێنەری زیرەک ناهێنێ کاتێ بە باڵای شێخ نووری-ی دەبڕێ، بەڵکو ئەم ڕایە زیاتر پێویستی بە تاووتووکردن و سەلماندن هەیە. لە کاتێکدا مامۆستا (ڕەفیق حیلمی) لەو باسەیدا کە لە کتێبی شیعر و ئەدەبیاتی کوردیدا دەربارەی (شێخ نووری) نووسیویەتی و دەڵێ: [بەڵام لەم شوێن کەوتن و پەیڕەوی کردنەدا لەوانە ناچێ کە لاسایی ئەکەنەوە، بەڵکو شان بەشانی ئەوان ڕۆیشتووە][48] ئەم قسەیەشی کە دوو ساڵ پێش ئەو وتارە نووسیوە ڕای پێچەوانەی خۆیەتی کە لەم وتارەدا دەری بڕیوە. پاشان نازانم ئەو شیعرانە کامانەن کە [لەگەڵ چەشتنی - واتە زەوقی- کوردا ڕێ نەئەکەوت[49] کە لەم وتارەدا ئەم ڕایە دەردەبڕێ هەر خۆی مامۆستا (ڕەفیق حیلمی) لە شیعر و ئەدەبیاتی کوردیدا دەڵێ: [بەتایبەتی لە ئەدیبەکانی دەوری وریابوونەوەی تورک زۆر سوودمەند بووە] وابزانم سوود بینین لە تاقیکردنەوەی کەڵەشاعیرانی خۆمان و گەلانی دەرودراوسێ کارێکی زۆر سروشتییە و مافی هەموو شاعیرێکە، بگرە دیاردەیەکی شارستانیشە، ئەوەش قەت بەلاساییکردنەوە دانانێم و ئەم سوود وەرگرتنەش نابێتە هۆی ئەوەی لەگەڵ [چەشتنی کوردا ڕێ نەکەوێ]. بەشێکی زۆری شیعرەکانی شێخ نووری وا لەم دیوانەدا دەکەوێتە بەر دەستی خوێنەرانی کورد، ئەوان دەتوانن لەمەیاندا زیاتر سەرپشک بن، کە لەگەڵ زەوقیان ڕێ دەکەوێ یا نەء؟ ئەگەر لەو سەردەمەشدا ئەم تازەبوونەوەیە کە وەک مامۆستا (ڕەفیق حیلمی) دەڵێ: [تا ماوەیێک زەعیمی ئەو

(٤٧) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(٤٨) شیعر و ئەدەبیاتی کوردی، بەرگی دووەم، ڕەفیق حیلمی.

(٤٩) گۆڤاری پێشکەوتن، ژمارە (١) ساڵی (١)، ئینقیلاب لە شیعری کوردیدا، ڕەفیق حیلمی.

ئینقیلابە بووە] لەگەڵ خوێنەران ئاشنایەتی پەیدا نەکردبێ، ئەوە مانای ئەوە ناگەیەنێ لەگەڵ چێژ و زەوقیان ڕێک نەکەوتبێ، بەڵکو ئەم نوێکردنەوەیە ڕەد فیعلێکە لای خوێنەرانی شیعری ئەو سەردەمە بەرپای کردووە کە بە گوێچکە و زەوقیان ئاشنا نییە، بۆیە ئەگەر بەربەرەکانیشیان کردبێ، ئەوە ئەو بەربەرەکانی کردنە ناکرێتە پێوەری بەرزی و نزمی شیعرەکان و ڕەسەنی و ناڕەسەنییان نیشان نادات. ئەمەش بۆ خۆی یەکێکە لەو لایەنانەی وامان لێدەکات ڕێزی شێخ نووری بگرین، چونکە یەکەم کەسە ڕووبەڕووی خوێنەرانی ئەو سەردەمە بووەتەوە و لە شیعری [باو- سائد] لایداوە، ئەم لە خوێنەر دوورکەوتنەوەیەش ماوەیەکی زۆر ناخایەنێ، چونکە لە پاش ماوەیەکی دی خوێنەرانی کۆن زیاتر بەگیانی ئەو جۆرە شیعرانە ئاشنا دەبن و خوێنەری تازەش پەیدا دەبن متووی خوێندنەوەی ئەم تەرزە شیعرە دەبن.

شێخ نووری (موریدی هەبووبێ یان نەبووبێ) لەو حەقیقەتە کەم ناکاتەوە کە دەورێکی گرنگی لە بزووتنەوەی تازەی شیعری کوردیدا هەبووە، کە دەشڵێ: [نووری ئینقیلابێکی پێ نەکراو لەبیر چووەوە] ئەمە تەنیا ڕووە ئیعلامییەکە دەگرێتەوە کە شێخ نووری تا مردنیش سەرجەمی شیعرەکانی یان هیچ نەبێ نیوەی شیعرەکانی لە دووتوێی کتێبێکدا بلاونەکرایەوە، خۆشی نەختێ کەمتەرخەمی کردووە، ئنجا وەک هەموو هاوڕێ و ئاشناکانی دەزانن، شێخ نووری پیاوێکی زۆر سادە و متەوازیع بووە، زۆر حەزی لە خۆدەرخستن و ڕووناکی نەکردووە بخرێتە سەری.

وەک دەبینین مامۆستا (ڕەفیق حیلمی) لەم وتارەیدا لە زۆربەی ئەو ڕایانە پاشگەز بووەتەوە کە لە کتێبی [شیعر و ئەدەبیاتی کوردی]دا دەری بڕیوە. بیروڕایەکانی نێو کتێبەکەی لە ساڵی (١٩٥٦)دا نووسیوە، کەچی لە وتارەکەی ساڵی (١٩٥٨)دا ئینقیلابێک لە بیروڕایەکانی بەدی دەکرێ. لە کتێبەکەی (شیعر و ئەدەبیاتی کوردی)دا دەڵێ: [لە وەزن و قافیە و شێوە و ئاهەنگا، ڕێگەیێکی تازەی داناوە بۆ شیعری کوردی. لەبەر ئەمە سەردەمێک (شێخ نووری) سەرکردەی شاعیرە لاوەکانی کوردی (سلێمانی) بووە، وە زۆریان تەنانەت (گۆران)یش هەوڵی لاساییکردنەوەی (شێخ نووری)یان ئەدا]، کەچی لە وتارەکەی گۆڤاری (پێشکەوتن)دا دەڵێ: [لە ڕاستییا خۆی دەورێکی تایبەتی ئەنوێنێ، دەستە قوتابییەکی ئەوتۆی شوێن نەکەوت و یا پێی نەگەیاند] وەک ڕوونیشم کردەوە من لەگەڵ (پێگەیاندن)ی شاعیران نیم، بەڵام هەر خۆی لەوێدا دەڵێ: [سەرکردەی شاعیرە لاوەکانی کوردی سلێمانی بووە و زۆربەیان، تەنانەت (گۆران)یش هەوڵی

لاسـاییکردنەوەی (شێخ نووری)یان نەدا]. دیارە کـە هەوڵی لاسـاییکردنەوەیان دابێ و شوێنی کـەوتبێ، مـامۆسـتـا (گـۆران)یش گومـانی لەوەدا نەهێـشـتبـێـتـەوە کـە شێخ نووری ڕۆڵێکی گـــرنگی لەو تازەبوونەوەیەدا هەبووبێ، لەوەدا کـــە دەڵێ: [بڵاوکـــردنەوەی بەرهەمەکەی کە بێگومان تەئسیری دەبەخشییە سەر ئەدەبی کوردی]یان مامۆستا (گۆران) دەڵێ: [ئەو جـۆرە شـێـوازەیان تیـا کـراوە بەسـەرمـەشق کـە مـامـۆسـتـا (م. نووری) و هاوڕێکانی لە ئەدیبە تازەکانی تورکی عوسمانییان وەرگرتووە].

مامۆستا (ڕەفیق حیلمی) کە ئەو ڕایانەی لە بارەی شێخ نووری دەربڕیوە، لەو قسانەیدا وا دەردەکـەوێ ئەویش چەند شـیـعـرێکی شـێخ نووری دیبێ: [جگە لە کـوردی، بە زمـانی تورکی و فـارسـیش شـیـعـری داناوە. وابزانم (نووری) شـیـعـرەکـانی خـۆی لە دیوانێکا کۆنەکردۆتەوە لەبەر ئەوە تەنیا چەند شیعرێکی کوردی دەس ئێمە کەوت، بەڵام هەر بەم چەن شـیـعـرەدا، دەسـەڵاتی شـاعـیـریی (شـێخ نووری) و بەرزی شـێـوازی لە ئەدەبا دەرئەکەوێ]. مامۆستا (ڕەفیق حیلمی) دڵنیا نەبووە شێخ نووری دیوانی شیعری نییە، بۆیە دەڵێ (وابزانم) ئینجا دەڵێ: (چەن شیعرێکی دەس ئێمە کەوت) واتە هەر بەم چەند شیعرە گەیشتووەتە ئەو ڕایە ڕەخنەییە و نووسیویەتی: [هەر بەم شیعرەدا، دەسەڵاتی شاعیریی (شێخ نووری) و بەرزی شێوازی لە ئەدەبا دەرئەکەوێ]، ئەم شیعرەش مەبەستی (ژیانی ئادەمیزاد)ە کە لە سالانی چل نووسراوە. کەوایە چۆن ئەو چەند بەرهەمە شیعرییە کـەمـەی بینیـویەتی ئەو ڕایەیان پێ دروست کـرد؟ یان کـە ڕای وایە بۆچی لە وتارەکـەی گۆڤـاری (پێشکەوتن)دا دەڵێ: (نووری ئینقیلابێکی پێ نەکراو لەبیـر چووەوە)؟ ئەگەر شێخ نووری نەشی توانیبێ تا سەر لەگەڵ بزووتنەوەی تازەبوونەوە بڕوات، ئەو چەند شیعرە وەک وەسفی کـردوون بە (دەسـەڵاتی شـاعـیریی) و (بەرزی شێـوازی لە ئەدەبا) دەزانێ، ناکرێ وەک شاعیرێک (لە بیر بچێتەوە)!! لە کتێبەکەشیدا دەنووسێ: [بەکورتییەکەی چە لە شێوازا وە چە لە وەزن و قـافیە و ئاهەنگا تەرزێکی تازەی بۆ شیـعر داناوە، وە تا مـاوەیێک لە شـیـعـری کـوردییـا ئینقـیـلابی گـێـڕاوە] لەو وتارەی کـە لە گـۆڤـاری (پێشکەوتن)دا نووسیـویەتی دەڵێ: (نووری ئینقیلابی پێ نەکرا...]! ئەمەیان چەندی بەچەند و بۆچی ئەو (مـاوەیەشی) پێ ڕەوا نابینێ کـە پێـشـتـر دیاری کـردبوو؟! هەر لە کتێبەکەی (شیعر و ئەدەبیاتی کوردی) دەڵێ: [بەو ئینقیلابەی (نووری)و پەیڕەوەکانی گـێڕاویانە] کـە شـێخ نووری پەیڕەوکـەرانی هەبێ چۆن لە وتارەکـەیدا دەنووسێ: [دەستە قـوتابییـەکی ئەوتۆی شـوێـن نەکـەوت و یا پێی نەگەیاند کـە دەورێکی وا بنوێنێ بشێت

بخرێته مێژووی ئەدەبی کوردەوە] ئینقیلابێک (نووری) و پەیڕەوەکانی گێڕابێتیان وەک مامۆستا خۆی دەڵێ، ئەی هەر ئەو پەیڕەوانە بە قوتابی ئەو قوتابخانەیە نازانێ، کە شێخ نووری ڕچەکەی شکاندووە؟!

مامۆستا لە کتێبەکەیدا نووسیویەتی: وشە و تەعبیرەکانی وەک:

سەرنگوون و بێ ئارام
یەئس و ئەلەم
شکستە باڵ
ڕەهبەر
صورەت
تار و بیم ئاوەر
زەبوون
ئیستیهزا
ئیستیعجال
تیرە و تار

هەندێکیان فارسی و هەندێکیشیان عەرەبییە، هەموویان بەلای کوردێکی خوێندەوارەوە - بەتایبەتی کە دەم لە ئەدەبیشەوە بدا - بە بێگانە ناژمێردرێن، جگە لەمە ئەم وشانە جوانی و شیرینییان داوە بە شیعرەکان وە ئەوەندەی کە لە شێوازی ئەدەبی کۆن دووریان خستووەتەوە، ئەوەندەش لە ئەدەبی تازە چەشکەداریان کردووە، چونکە ئێمە پێش دەوری (نووری) لە شیعری کوردی (کلاسیکی)یا، لەجیاتی:

لە ناو شەپۆلی خەما
بەکێوی سەختیَ ژیانا بەپێ، بەچنگەڕنێ
هەڵمەتی سەرکەوتن
نشێوی کلۆڵی
بواری لێ ئەتەنێ
تار و پۆی لە ئاخ و لە زام
ڕێ هەڵە بووی دەشتی چۆڵ و هۆڵ

ئەم جۆرە تەعبیرە جوانانە، وەک ئەدیبێکی کورد ئەڵێ لە شیعری (کلاسیکی)دا زۆرتر

تووشی وشەکانی «شاهی سکەندەر و ئاوی بەقا و تەختی کەی و جامی جەم و تەیری عەنقا و شاری جابلقا...» ئەبووین، لەگەڵ ئەمەشا بەلای ئەدیبە تازەکانی کوردەوە ئەو وشانەی شێخ نووری و تەعبیرە جوانەکانی سەرەوەشی زۆر پەسەند نییە.] ئەمە ڕای مامۆستا (ڕەفیق حیلمی)یە و لە کتێبی (شیعر و ئەدەبیاتی کوردی)دا نووسیویەتی، کەچی لەم وتارەدا دەڵێ: [(تەرانە)کانی نووری کە شوێن (تۆفیق فیکرەت)ی بوێژی ناوداری تورک کەوتبوو وە لاسایی ئەوی ئەکردەوە لەگەڵ چەشتنی کوردا ڕێ نەئەکەوت و لەبەر ئەوە موریدانی نەبوو...] ئەم جارەشیان دەبێتە نوێنەری زەوقی گشتی لەجیاتی ئەوەی پاڵپشتی ڕایەکەی سەرەوەی بکات و داکۆکی لەو خاڵە گرنگە بکات کە هەموو شتێکی تازە لە سەرەتاوە لەگەڵ چەشتنی خوێنەراندا ناگونجێ، ئەو نەگونجان و ڕێ نەکەوتنە لەگەڵ چەشەیان، خەوشییەک نییە لە نرخی شاعیر بهێنێتە خوارەوە، شیعری (نالی) کە لە سەردەمێکدا بەگاڵتەوە دەیانخوێندەوە و بەچاوێکی نزمەوە سەیریان دەکرد، ئەمرۆکە هەر ئەو شیعرانەن کە خەڵک بەقووڵی دەیخوێننەوە، لە سەردەمی خۆشیدا لەگەڵ چێژ و زەوقی گشتی یەکی نەدەگرتەوە و نرخی شایانی خۆیان پێ نەدەدا. هەر لە کتێبی (شیعر و ئەدەبیاتی کوردی)دا قەناعەتێکی دیکەی دەربڕیوە کە تەواو لەگەڵ ئەو ڕایەی پێچەوانەیە: [(پەپوولە)ی نووری لەو شیعرە تازانەیە کە چ بە (مەوزوع) و شێواز وە چ بەوەزن و ئاهەنگ و مۆزیقەیا لە شیعری کلاسیکی دەوری کۆن ناچێ. بە وشەی کوردی پەتی و سەلیسی تەعبیری و ماناشیا، بەتەواوی شیعرێکە بەپێی چەشکەی ئەدەبی ئەم چەرخە] ئەگەر (شوێن) (تۆفیق فیکرەت)ی بوێژی ناوداری تورک کەوتبوو وە لاسایی ئەوی ئەکردەوە) مەبەستی هەر ئەوە بێ لەو (لاساییکردنەوەیە) کە لە کتێبەکەیدا (شیعر و ئەدەبیاتی کوردی) دەری بڕیوە: [لەم شیعرانەدا - واتە ژیانی ئادەمیزاد - کە لە سەرەوە نووسراوە شێخ نووری وەک وتبوومان پەیڕەوی (تۆفیق فیکرەت)ی کردووە وە ئسلووبی شیعرەکانی لە هی ئەو ئەچێ... وەک (تۆفیق فیکرەت)، ئەویش زۆری وشەی فارسی و عەرەبی بەکارهێناوە] ئەم پەیڕەوی کردنە ئەگەر هەر بەکارهێنانی وشەی فارسی و عەرەبی بێ، ئەوە نابێتە بەڵگەیەکی بەهێز بۆ (لاساییکردنەوە). ئەم جۆرە شێوازەش، شێوازێکی باوی ئەو سەردەمە بووە. شاعیر کە دەستی داوەتە تازەکردنەوە، ناتوانێ زوو خۆی لەو کارتێکردنە ڕزگار بکات و بەکوردییەکی پەتی و بژار کراو لە عەرەبی و فارسی بنووسێ.

مامۆستا (ڕەفیق حیلمی) خۆیشی ڕای وایە: [لەگەڵ ئەمەشا وشەی کوردی پەتی،

تەعبیری جوان و تازەشی خستووەتە پاڵ وشە بێگانەکان وە بەم جۆرە شێوەیەکی دڵگیر و ئاهەنگێکی مۆسیقی شیرینی لێ پەیا کردوون) هەر لەبەرئەوەی (تۆفیق فیکرەت) وشەی عەرەبی و فارسی بەکارهێناوە و شێخ نووریش وشەی فارسی و عەرەبی بەکارهێناوە، ناکرێ سیفەتی لاساییکردنەوە بدەینە پاڵ شێخ نووری، چونکە بەتەنیا (تۆفیق فیکرەت) وشەی عەرەبی و فارسی بەکارنەهێناوە، ئەمە سیمایەکی زەقی شیعری سەرجەمی شاعیرە کلاسیکییەکانە، کە لە شیعری شێخ نووری-دا بەرەو کەم بوونەوە چووە. نازانم مامۆستا (ڕەفیق حیلمی) لە ناو ئەو هەموو شاعیرە تورکە بۆچی تەنیا ناوی (تۆفیق فیکرەت)ی هێناوە، ڕەنگە لەبەرئەوە بێ (تۆفیق فیکرەت) شاعیرێکی خاوەن شیعری نیشتمانییە و بەرهەمی شیعریی زۆرتری دەست مامۆستا کەوتبێ. نووسینی شیعری نیشتمانی بەس نییە، شاعیرێکی پێ بخرێتە خانەی (لاساییکردنەوە)وە.

ئەوەی بەوردی شیعری شێخ نووری بخوێنێتەوە، دەزانێ شاعیرێکی مولتەزیم بووە بەمەسەلەی میللەتەکەی و زۆر وریایانە و بەچاوێکی کراوەوە لە دەوروپشتی خۆی ڕوانیوە و لەگەڵ ئازار و ئاواتەکانی بووە. ئەم قسەیەشم لە شیعر و ژیانی ڕۆژانەی شێخ نووری بەدی دەکرێت. یاخیبوونەکەشی لە شیعری کلاسیکی هەر لە پێناوی ئەوە بووە، شیعرەکانی خۆی بکاتە چەکی خەبات و بە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازانەی میللەتەکەیەوە بیبەستێتەوە ، تا بتوانێ «دەس لە کلکی (سیمورغ)و گوێسوانەکەی شاری جابلقا» بکاتەوە. ئەوانەی بەئینقیلابەکەی شێخ نووری و پەیڕەوەکانی دڵیان دانەمرکایەوە، ئەوانە لە ئامانجی تازەبوونەوە نەگەیشتوون، شێخ نووری پایە و شوێنێکی دیاری هەیە لەوەی توانی شیعر و خەبات لە یەکتر جیا نەکاتەوە، ڕەنگە ئەمەش بۆ خۆی هۆیەک بێ لە هۆیەکانی کزکردنی گیانی داهێنان لە لای کە بەشێکی زۆری لە شیعرەکانی بۆ (ڕاپەڕاندن و وریاکردنەوە) تەرخان کردووە، ئەگینا دەیتوانی زۆر شیعری دیکەی وەک (پەپوولە) و (ژیانی ئادەمیزاد) بنووسێ. کەواتە شێخ نووری کارێکی خراپی نەکردووە کە [چاوی بە دەوری خۆیا گێڕاوە و شیعری شاعیرە گەورەکانی تورکی دەوری ژیانەوە و ئینقیلابی (عثمانی) بەوردی خوێندووەتەوە وە باش سەرنجی داوەتە مەغز و شێوازی ئەدەبی تازە وەبێ ئەوەی ئەبڵەق و حەپەساو دامێنێ دوایان کەوتووە].

کە شێخ نووری لە سالانی (١٩٢٠-١٩٣٠)دا تازەبوونەوەی بەرپا کردبێ و بووبێ بەزەعیمی ئینقیلابی شیعری تازە، ئەوە بێگومان یان تازەکردنەوەکەی شێخ نووری لەو دە ساڵەدا پێوەندی ڕاستەوخۆی بە تازەبوونەوەی شیعری تورکییەوە نییە، یان دەبێ لە پاش

(١٩٣٠)يەوە شێخ نووری تا ماوەیەک شان بەشانی مامۆستا - گۆران - ڕۆیشتبێ، چونکە دەڵێن شیعری ڕاستەقینەی گۆران لە دوای سییەکانەوە دەستی پێکردووە، مامۆستا (گۆران)یش دەڵێ: (بەیەکەوە ئەمانڕوانییە یەک کلاوڕۆژنە). لێرەدا ئەگەر ڕوانین بۆ ئەو کلاوڕۆژنەیە [کە خوێندنەوەی ئەدەبی تورکی]یە بکرێ بە لاساییکردنەوە و وا لە قەڵەم بدرێ، ئەوە مانای وایە مامۆستا (گۆران)یش دەکەوێتە خانەی لاساییکردنەوەوە! دوا شت کە کۆتایی پێ بهێنم هەر قسەکەی مامۆستا (ڕەفیق حیلمی)یە کە لە بەرگی دووەمی کتێبەکەیدا نووسیویەتی دوای هێنانەوەی دوو بەیتە شیعری (پیرەمێرد)، کە دەڵێ: [ئەم دوو بەیتەی پیرەمێرد ئەگەر سەرنجی بدرێتێ هەموو لەو سەنعەتە وردانەی ئەدەبە، کە بەتایبەتی لە شیعری ئەوا ئەبینرێ، لە لایەکی تریشەوە گەواهێکی بەهێزە بۆ شاعیریی شێخ نووری و پلەی ئەدەبی لە چاو پیرەمێردا کە بەڕاستی یەکێک بوو لە مامۆستا بەرزەکانی شیعر و ئەدەب].

* د. کامیل حەسەن بەسیر لە سەرەنجامە گشتییەکانی نووسینەکەیدا دەگاتە ئەو ڕایە: [شێخ نووری شێخ ساڵح کە بە سەرۆکی ڕێبازی تازەکردنەوەی هۆنراوەی کوردی ناسراوە لە هیچ سەرچاوەیەکی بێگانە بەگشتی و تورکی بەتایبەتی کەرەسەی بەرپاکردنی بزووتنەوەکەی بەچنگ نەهێناوە، بەڵکو هۆشیارانە هەستی بە مۆری لاساییکردنەوە لە هۆنراوەی دێرینی کوردیدا کردووە و ئاگای لە هۆیەکانی بووە و ڕێگای تازەکردنەوەی زانیوە و مەبەستی هونەری و ناوەرۆکی لەم تازەکردنەوەیە دەستنیشان کردووە و ئەمجا بڕیاری بزووتنەوەکەی داوە](٥٠) ڕاستە وەک دکتۆر بەسیر بۆی چووە شێخ نووری (هۆشیارانە هەستی بەمۆری لاساییکردنەوە لە هۆنراوەی دێرینی کوردیدا کردووە)، بەڵام وەک کەسێکی هۆشیاری سەردەمەکەی خۆشی ئاگاداری تاقیکردنەوەی میللەتان بووە و خۆشی دانی بەو حەقیقەتەدا ناوە، ئەمەش وەنەبێ لە نرخ و بەهای کارەکەی شێخ نووری کەم کردبێتەوە لە بەرپاکردنی ئەم بزووتنەوەیەدا کە تەواو هەلومەرجەکانی بۆ هاتبووە دی و چاوەڕوانی یەکێک بوو ڕاییبگەیەنێ، تەنانەت ئەگەر بەکارتێکردنی ئەدەبی گەلانی دیکەش سەرچاوەی بزووتنەوەکەی بەچنگ هێنابێ، هەمدیسان کارێکی خراپی نەکردووە و یەکێک تۆزێ لە ئەدەبی بەراوردکاریدا شارەزایی هەبێ، ئەوە بەعەیب نازانێ. ئەوەندەی مەسەلەی

---

(٥٠) شێخ نووری شێخ ساڵح لە کۆڕی لێکۆڵینەوەی وێژەیی و ڕەخنەسازیدا، دکتۆر کامیل حەسەن عەزیز بەسیر، ١٩٨٠، لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد - دەستەی کورد - ل٨٤.

(بەخشین و وەرگرتن) تێگەیشتنێکی شارستانیی ئەم شاعیرەیە، لە تازەبوونەوەی شیعری کوردیدا!

* کاک ئیبراهیم باجەلان لە وتارێکدا کە بۆ یادی شێخ نووری تەرخان کردبوو نووسیویەتی: [عەقڵی ئادەمیزاد بە هێز و توانای خۆی دەتوانێ، بەبێ پشت بەستن بەهیچ یارمەتییەک لە هێزەکانی ئەودیو سروشتەوە، لەو سستەمە تێبگا کە گیتی لەسەر دەڕوات][51] بێگومان مامۆستای ناوبراو کارێکی چاکی کردووە، یادی ئەم شاعیرەمانی کردووەتەوە، زۆربەی ڕایەکانی لەسەری یەک دەگرینەوە کە شێخ نووری شاعیرێک بووە بڕوا و متمانەی بە پاشەڕۆژی ڕووناکی گەلەکەی هەبووە، بڕواشی بەوە بووە کە ئادەمیزاد دەتوانێ بە عەقڵی خۆی هەموو ئامانجێک بهێنێتە دی، بەڵام کە دەڵێ: [بەبێ پشت بەستن بەهێزەکانی ئەودیو سروشتەوە] ئەمەیان ڕایەکە لە ڕاستی بەدوورە، لەبەرئەوەی شێخ نووری شاعیرێکی ئیماندار بووە بە هێزەکانی ئەودیو سروشت و بە تاک و تەنیایی خوا. ئەوەتا دکتۆر مارف خەزنەداریش پاڵپشتی ئەم ڕایەم دەکات و دەڵێ: [ئەو – واتە شێخ نووری – لەو بڕوایە دابوو کە هەموو ئەو شتانەی لەو زەوییە دان لە کاری ئاسمانە][52] وەنەبێ بڕوا بوونی شێخ نووری لە نرخی شیعرەکانی کەم بکاتەوە، یان لەو خەبات و ڕۆڵەی کەم بکاتەوە کە شێخ نووری بەئەنجامی گەیاندووە، لەم مەسەلەیەشدا تەنیا مەبەستم وردی ڕا دەربڕینە و هیچی تر.

---

(٥١) جريدة العراق، العدد ٢٣٩٨ ، ٢٢ كانون الأول ١٩٨٣، (١٨) ربيع الأول ١٤٠٤هـ.
[نوري الشيخ صالح شاعراً وصحفياً] بقلم: إبراهيم باجلان.

(٥٢) الثقافة الجديدة، العدد (٩) ١٩٦٩،«الأتجاه الرومنطيقي في الادب الكردي»، د. معروف خزندار.

# شێخ نووری لە کۆڕی ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا

لە پاش سەرنەکەوتنی شۆڕشەکەی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری کە لە دژی دەوڵەتی عوسمانیی ساڵی (١٨٨١) بەرپای کرد، گەلی کوردمان بۆی بەدەرکەوت بەتەنیا خەباتی چەکدارانە ناتوانێ کورد بەمافە ڕەواکانی خۆی بگەیەنێ، بۆیە پیاوە سیاسی و هۆشیارەکانی کەوتنە خۆیان بۆ دامەزراندنی کۆمەڵێ (کۆمەڵەی نهێنی و ئاشکرا) تا بتوانن هۆشیاری نەتەوایەتی لەناویاندا بڵاو بکەنەوە، لەو پێوەندانگەوە هەستیان بەپێویستی دەرکردنی گۆڤار و ڕۆژنامە کرد، مێژوونووسان و ڕۆژهەڵاتناسەکانیش، لەوانە (م. س. لازاریف)، ماوەی نێوان (١٨٩٠ - ١٩١٠) بەماوەی تێکۆشانی پێشکەوتوو دادەنێن.

موونەوەرانی کورد لە کۆتایی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا وشەیان کردە چەکێکی بڕندە و کوشندە دژی ئەوانەی دژ بەئازادی و سەربەخۆیی ئەو میللەتە بوون. بۆ یەکەم جار ڕووناکبیران لە ئەفسەران و قوتابیان و مامۆستایان و ئەدیبان لە شاری ئەستەمبووڵ کۆبوونەوە تا بەهەموو دنیای ڕابگەیەنن کورد، میللەتێکی بەشخوراوە و مافی ڕەوای خۆیان گەرەکە، لەوێ گیروگرفتەکانی خۆیان خستە بەردەم بێگانەکان، چونکە ئەستەمبووڵ پایتەختی دەوڵەتی عوسمانی بوو، هەروەها شوێنێکی ستراتیژی بوو لە نێوان ئاسیا و ئەورووپا، هەر لەو کاتەدا قوتابخانەیەکی کوردی بەناوی (چەمبەرلی تاش) کرایەوە کە کرایە شوێنی بڵاوکردنەوەی هۆشیاری نەتەوایەتی، زۆر لە کوردەکان لە هەموو لایەکەوە ڕوویان دەکردە ئەو قوتابخانەیە و سوودیان لە بیروڕایە نەتەوەیی و نیشتمانییەکانی (خەلیل خەیالی) بەڕێوەبەری قوتابخانەکە وەردەگرت، لە دواییشدا ناوبراو بەردی بناغەی کۆمەڵی (هێڤی) دانا. پێویستە ئەوەش لە یاد نەکەین کە شاری (قاهیرە) دووەم مەڵبەندی خەبات بوو، ئەوەش لەبەرئەوەی بووبووە شوێنی دوورخراوەکان و ئەوانەی لە دەست جەور و ستەمی عوسمانییەکان ڕوویان دەکردە ئەوێ، بەتایبەتی بنەماڵەی (بەدرخان)، کە چنگ بەچنگ و ڕووبەڕووی عوسمانییەکان دەوەستان و بەوپەڕی بوێری و ئازایەتییەوە لە ڕوویان هەڵگەڕانەوە. شاری (قاهیرە) جێگای چالاکی ڕامیاری بوو، هەروەها بوارێکی فراوانی هەبوو بۆ دەربڕینی سەربەست و ئازاد، بەم شێوەیە ڕۆشنبیر و دڵسۆزەکانی کورد دەستیان کرد بەبڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی

جیابوونەوەی کورد و ڕزگارکردنی لە دەست ستەمکاران.

بێگومان مێژووی ڕۆژنامەنووسی کوردی، بەشێکی دانەبڕاوە لە مێژووی بزووتنەوەی سیاسی. هەر کاتێک هۆشیاری نیشتمانی و سیاسی ڕزگاریخواز پەرەی سەند، پێویستە ئەو هۆشیارییە لایەنی ڕۆشنبیری و فیکری ئەو میللەتەش بگرێتەوە. سەرکردە سیاسییە هۆشیارەکانیش پێویستە بەدوای ئەو هۆیانەدا بگەڕێن، کە بتوانن بەهۆیانەوە هۆشیاری بگەیەننە زۆربەی زۆری جەماوەر. سەرکردایەتی هۆشیارییەکەی چەندەکی قووڵ و گەورە و پێگەیشتوو و بەربڵاو بێ، ئەگەر جەماوەر سادە و ساویلکە بن ناتوانن ڕۆڵی خۆیان ببینن و بەچەکی هۆشیاری داکۆکی لە مافەکانی خۆیان بکەن، سەرکردەکانیش ناتوانن ئاوات و ئامانجەکانی جەماوەر بێننە دی. سەرکردەکانی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردیش، هەر زوو هەستیان بەو لایەنە کرد و لەو ڕاستییە تێگەیشتن کە ڕۆژنامە چ ڕۆڵێکی کاریگەری لە بڵاوکردنەوەی هۆشیاری و بیروباوەڕدا هەیە، بۆیە کەوتنە بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامە لە هەر شوێنێکی ڕێیان بەمە دابێ.

گەشەکردنی ڕەوتی ڕۆژنامەنووسیی کوردی، لەگەڵ پێشکەوتنی هەستی نەتەوایەتی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازانەی گەلی کورد کەوتە گەشەکردن، بۆیە هەر لە سەرەتاوە لەگەڵ بزووتنەوەی ڕزگاریخوازانەدا شان بەشانی یەکتر سنگیان بۆ پێشەوە کوتاوە و هەر ئەو کاتە خەباتی وشە و خەباتی سیاسی نەتەوەی کورد یەکیان گرتووە. هەر کاتێ بزووتنەوەی ڕزگاریخوازانەی گەلی کورد دووچاری داپلۆسین و سەرکوتانەوە بووبێ، بەهەمان شێوە باری ڕۆژنامەنووسیشی تووشی سەرکوتکردن و کزی هاتووە. واتە گەشەکردن و بووژانەوەی ڕۆژنامەنووسیی کوردی لەو سەردەمەدا پێوەندییەکی توندوتۆڵی بەهەڵکشان و داکشانی بارە سیاسییەکەی کوردەوە بووە، چونکە پێوەندییەکی کار لەیەک کراو و تێکەڵ بەیەکتری بوو.

هەر لەو کاتانەدا جاری وا ڕێککەوتووە داگیرکەران و دەستدرێژکاران باری ڕۆژنامەنووسی کوردیان بەدیوەکەی دیکەدا خستووە. پاش سەرکوتکردنی میللەتەکە، دەستیان بەسەر ڕۆژنامە داگرتووە و بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکاریان هێناوە و کردوویانەتە هۆیەک بۆ پڕوپاگەندەی نەخشە و پیلانەکانیان، ئەوەش بەڕوونی ئەوەمان بۆ دەردەخات کە ڕۆژنامەنووسی کوردی و مێژووە دژوارەکەی پێوەندییەکی بەهێزی بەسەرجەمی بزووتنەوەی نیشتمانییەوە هەیە، ئەوە بوو لە (٢٢)ی گەلاوێژی ساڵی (١٩٠٨) بەئاشکراکردنی

دەستووری عوسمانی (مەشروتیەت)، بوو بەهەلکەوت و دەرفەتێکی لەبار بۆ هاندانی ڕۆشنبیری کورد تا دەست بکەن بەبلاوکردنەوەی بیروباوەڕی جیابوونەوەی کوردستان و ڕزگارکردنی گەلی کورد. بەسەرکەوتنی شۆڕشی (١٩٠٨) و جارِدانی دەستوور، بزووتنەوەی کورد بووژایەوە و بۆ یەکەم جار چەند کۆمەڵە و دەزگایەکی ڕووناکبیری و سیاسی بەخۆیەوە بینی، ئەو ڕووداوە بووە هۆی دەرکردنی چەند ڕۆژنامە و گۆڤارێکی وەک ڕۆژنامەی (کورد) و (کوردستان) و دواتر (ڕۆژی کورد) و (یەکبوون). ئەم کۆمەڵەیە یەکەم کۆمەڵەی سیاسی کورد بوو لەو ساڵەدا لە ئەستەمبووڵ بەناوی (جەمعیەتی تەعاون و تەرەقی کوردی)یەوە پێکهێنرا. دامەزراندنی ئەم کۆمەڵەیە بۆ هیممەتی جوامێرانەی ئەم زاتانە دەگەڕێتەوە: (عەبدولقادر شەمزینی و ئەمین عالی بەدرخان و داماد ئەحمەد و ذوالکفل پاشا و جەنەڕاڵ شەریف پاشا و چەندان ئەفسەر و ڕۆشنبیر و قوتابی زانستگەکان). ئینجا کۆمەڵی (هێڤی) لە ساڵی (١٩١٢) بەشێوەیەکی ئاشکرا لە لایەن قوتابییە دڵسۆزەکانییەوە پێکهێنرا، لە دوایشدا جگە لە قوتابیان، ئەفسەر و ڕۆشنبیران و کاسبکارانیش چوونە پاڵ ئەو کۆمەڵەیەوە و گۆڤاری (ڕۆژی کورد)یان دەرکرد، پاشان ناوەکەی بوو بە(هەتاوی کورد).

شاری سلێمانیش تەنیا لە ڕووی بزووتنەوەی سیاسییەوە دڵی زیندووی کوردستان نەبووە، بەڵکو مەڵبەندی بزووتنەوەی ڕۆشنبیری و شارستانیش بوو، سەرەتای ڕۆژنامەنووسی ڕاستەقینەی بەکارتێکردنی ئەو مێژووە پڕ لە شکۆیەی بەهەوڵ و تەقەللای گەلێ ڕابەر و مامۆستای ئەو مەیدانە دروست کرا، کە ئەوانیش بریتی بوون لە پیاوی سیاسی و ڕووناکبیر و موونەوەری ئەو سەردەمە. کاتێ عێراق لە ژێر دەسەلاتی عوسمانی چووە دەرەوە و ئینگلیز لە ساڵی (١٩١٧)ەوە دەسەلاتیان بەسەریدا کێشا، لە بەغدا لە ساڵی (١٩١٨) ڕۆژنامەی (تێگەیشتنی ڕاستی)یان دەرکرد، کاتێ (مێجەر سۆن)یان ناردە سلێمانی و بوو بەحاکمی سیاسی ئەو شارە (سۆن توانی بەشێکی کاریگەر لە ڕووناکبیرانی سلێمانی لە خۆی کۆ بکاتەوە، لەوانە ئەفسەرەکانی جارانی سوپای عوسمانی، ئەمەش بەرێگای دامەزراندنیان لە هەندێ پلە و پایەی ناسکی میری و دروستکردنی کەشوهەوایەکی ڕۆشنبیری ئەوتۆ کە لەوە پێش شارەکە بەخۆیەوە نەدیبوو)، دیسانەوە "مێجەر سۆن کەشوهەوایەکی ڕۆشنبیری گورجوگۆڵی لە سلێمانی دروست کرد، لە ڕۆژانی فەرمانڕەوایی خۆی بەسەر ئەو شارەدا، بەتایبەتی بەهۆی ڕۆژنامەی (پێشکەوتن)ەوە کە بەزمانی کوردی دەری دەکرد و ژمارەیەکی بەدەرەوە بووی شاعیران و

نووسەرانی لێ کۆ کردەوە، لەوانە (نووری شێخ ساڵح) و (جەمال عیرفان) و (عەلی کەمال باپیر) و کەسانی دیکە. ئینگلیزەکان لە نیسانی (١٩٢٠)ەوە هەتا (١٩٢٢) ڕۆژنامەی (پێشکەوتن)یان لە سلێمانی دەرکرد، دوای ئەمیش لە ساڵی (١٩٢٤) ڕۆژنامەی (ژیانەوە)یان دەرکرد، کە ئەو دوو ڕۆژنامەیە، زمانی حاڵی خۆیان بوون و بەسەرپەرشتی ئەوان دەردەچوون و زۆرتر تەرخان کرابوون بۆ پروپاگەندەی نەخشە و پیلانە نەگریسەکانی خۆیان، ئەگەرچی لە پاڵ ئەوەشەوە بایەخی بەلایەنی ئەدەبی و ڕۆشنبیری دەدا و کۆمەڵێ شاعیر و ڕۆشنبیر بۆ ڕۆژنامەکەیان دەنووسی.

د. کەمال مەزهەر ئەحمەد دەربارەی ئەو ڕۆژنامەیە نووسیویەتی: "سۆن حەزی دەکرد زمانی کوردی پێشکەوێ و ببێتە زمانی نووسین، بۆ جێبەجێکردنی ئەم نیازەی پەنای بردە بەر گەلێ کاری بەئەنجام. هەر کە بووە حاکمی سیاسی سلێمانی، کوردیی کردە زمانی خوێندن و نووسین و پەیوەندی نێوان دەزگایانی میری. بەخێرایی کتێبی - ئەلفبای کوردی - چاپ کرد و خۆی بەسەر فێرگەکاندا دەگەڕا و زۆر گەرم مامۆستا و شاگردانی ئەو قوتابخانانەی بۆ بەکارهێنانی زمانی کوردی هان دەدا. جگە لەوە سۆن کەوتە هاندانی نووسەر و شاعیرانی کورد، بۆ ئەوەی زیاتر پەتیی بنووسن. بۆ ئەم مەبەستەی پێشکەوتنێکی ڕێکخست و نووسینێکی زەکیی سائیبی کردە دووەم لەگەڵ ئەوەش کە لە تاریکبینی و ورە بەردان و «گەڕان بەدوای عیزرائیل» بەولاوە هیچی تری تێدا نییە، بەڵام هەمووی لە بەرگێکی ساکاری پەتیدا پێشکەش کراوە و مێجەر سۆنیش عەوداڵ و کوژراوی ئەوە بوو. هەر لەو پێشکەوتنەدا شیعرێکی شێخ نووری شێخ ساڵحی کردۆتە یەکەم کە قەت ناچێتە ناو دەفتەری بەرهەمە بەهێزەکانی ئەو شاعیرەوە، بەڵام بۆ سۆن ئەوە زۆر بوو کە شێخ نووری بەکوردییەکی پەتی خەڵکی هان دەدا بۆ بایەخدان بەکشتوکاڵ، هەر بەو جۆرەش سۆن شێخ نووری و جەمال عیرفانی هان دەدا لەسەر لۆکە و تووتن و ئەو بابەتانە بنووسن، شێخ مەحموودی نەمریش یەکێک بوو لەو سەرکردە هۆشیارانەی زوو دەرکی بەپێویستی ڕۆژنامەیەک کردبوو، تا ڕۆڵی خۆی ببینێ و ئەرکەکانی قۆناغ ڕاپەڕێنێ، چونکە ئەویش زانیبووی خەباتی چەکدارانە بەس نییە بۆ ئەوەی کورد بەمافە ڕەوایەکانی خۆی بگات، ئەگەر هاتوو ئەو لایەنە گرنگەی خەباتی فەرامۆش کرد، بۆیە وەک هەموو سەرکردەیەکی گەلانی ژێردەستە کە لە پەیامی خۆیان تێگەیشتبن، ئەم دوو خەباتەیان لە بەرچاو گرت و لە یەک ڕووباردا یەکیان گرتووە.

لە پاش دروستبوونی (جەمعیەتی کوردستان) لە (٢١)ی تەمووزی ساڵی (١٩٢٢) و



شێخ نووری شێخ ساڵح لە سەردەمی حوکمدارێتی شێخ مەحموودی حەفید لە شاری سلێمانی

لە پاش دەنگدان بۆ هەڵبژاردنی دەستەی کارگێڕی ئەو جەمعیەتە، لە مزگەوتی (سەید حەسەنی موفتی) لە گەڕەکی سابوونکەران لە سلێمانی دەست کرا بەدەنگدان، دوای خوێندنەوەی وتارێکی پڕ لە کەفوکوڵ لە لایەن حاجی مستەفا پاشای یامولکی(*)، کە کەوتە دوای نوێژی جومعەوە، هەر لەو مزگەوتەدا بە شێوەیەکی نهێنی دەنگدان کرا بۆ هەڵبژاردنی دەستەی دامەزرێنەری ئەو جەمعیەتە، کە (حاجی مستەفای یامولکی) بەسەرۆکی ئەو جەمعیەتە هەڵبژێردرا. دوای ئەوەی دەستەی دامەزرێنەران لە ماڵی (حاجی مستەفا) کۆبوونەوە، بڕیاریان دا ڕۆژنامەیەک بەکوردی و تورکی دەربکەن و ناوی بنێن (بانگی کوردستان). مستەفا پاشا کرایە خاوەنی ئیمتیاز و بەڕێوەبەری لێپرسراوی ڕۆژنامەکە، کە ژمارەی یەکەمی لە (٢)ی ئابی (١٩٢٢)دا دەرچوو. دروشمی ڕۆژنامەکە پێشخستنی گەل و پەرەپێدانی وڵات بوو. وەک ڕۆژنامەکە نووسیویەتی (عیلمی، ئیجتیماعی، ئەدەبی، غەزەتەیەکی حوڕ و سەربەست و میللییە) بەهەفتەی جارێک دەردەچوو. (شێخ نووری) شان بەشانی (عەلی کەمال باپیر) موحەڕیری بەشە کوردی و فارسییەکەی ئەو ڕۆژنامەیە بوو.

کاتێ ئەو ڕۆژنامەیە دەردەچوو، ئینگلیزەکان بەتەواوی دەستیان بەسەر شاری سلێمانیدا گرتبوو، بۆیە لەسەر ڕۆژنامەکە نەنووسراوە ڕۆژنامەیەکی (سیاسی)یە، هەر لەو کاتەی ڕۆژنامەی (بانگی کوردستان) دەردەچوو، شێخ مەحموود لە ئاوارەیی هیندستان بوو، مێژوونووسان ڕایان وایە کە وتارەکانی ئەو ڕۆژنامەیە بووە هۆی گەڕانەوەی شێخ مەحموود لە ئاوارەیی. شێخ نووری تا دەرچوونی ژمارە (١٣) لەو ڕۆژنامەیەدا کاری کردووە، سەرەتای ساڵی ١٩٢٦ مستەفا پاشا لە بەغدا سێ ژمارەی تری لێ دەرکردووە کە ژمارە (١٤-١) و (١٤-٢) و (١٤-٣)ن، ئەوە جگە لەوەی ژمارە (١٤)ی هەر لە سلێمانی، دوای گرتنەوەی شاری سلێمانی بووە و بەهەتیوی دەرچووە، کە تیایدا زۆر باسی شێخ مەحموود و دەسەڵاتەکەی کراوە. لە شوێنی (شێخ نووری و عەلی کەمال و ڕەفیق حیلمی، (مستەفا شەوقی) کراوە بەموحەڕیر و (کەریم ڕۆستەم)یش کراوە بەبەڕێوەبەری ئیدارە. دووەم ڕۆژنامەشە لە پاش ڕۆژنامەی (پێشکەوتن) کە لە شاری سلێمانیدا دەرچووبێ. لەم

---

(*) حاجی مستەفای یامولکی: لە ساڵی (١٨٦٦) لە شاری سلێمانی لە دایک بووە. سەرەتایی لە سلێمانی تەواو کردووە. ئامادەیی عەسکەری لە بەغدا خوێندووە، ئینجا بۆ خوێندن چووەتە ئەستانە و دوای تەواوبوونی لە (١٣٠٤هـ) کراوە بەسەرۆکی ڕوکنی حەربی و لە وەزارەتی جەنگ دامەزراوە. لە (٢٥)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٣٦) لە بەغدا مردووە و تەرمەکەیان هێناوەتەوە سلێمانی.

ڕۆژنامەیەدا شێخ نووری، وتارەکانی تەرخان کردووە بۆ بەرگریکردن لە مافی میللەتەکەی. بەخەباتی وشە لە ڕاپەڕین و وریاکردنەوەی گەلەکەی بەشداری کردووە. لە لایەک هەوڵی دەدا بزووتنەوەیەکی ڕۆشنبیــری بەرپا بێ، تا لەگــەڵ بارودۆخی ئەو کــاتە بگونجێ، لە لایەکی تریشەوە بەهۆی ڕۆژنامـەوە کە ڕاستـەوخۆتر لەگەڵ جەمـاوەر پێـوەندییـان هەیە، هەندێ باس و خواسی گرنگیـان بۆ ڕوون بکاتەوە و تاووتوو بکات و بە ڕوونی و ساکاری بیخاتە بەردەستیان.

شـێخ نووری لە وتارەکـانیــدا بایەخی بەزۆر لایەنی جـۆراوجـۆر داوە وەک: (ئەدەب، سیاسەت، مێژوو، زمان، ئابووری) و هەمـوو ئەو لایەنانەی بەسەر کردووەتەوە، هەروەها لە ســەردەمی دەرچوونی ڕۆژنامــەی (پێــشکەوتن) و (ژیانەوە) و (ژیان)دا زۆر وتاری بەنرخی نووسیوە، دەتوانرێ ساتوسەواکردنی شێخ نووری لەگەڵ ئەو ڕۆژنامانە بەسەرەتای دروسـتبوونی کاری ڕۆژنامەنووسیی لە لای شێخ نووری دابنێین. لە ڕۆژنامـەی (بانگی کوردستـان)دا شێخ نووری بایەخێکی زۆری بەمەسەلەی خوێندن و بڵاوکردنەوەی زانست و زانیاری داوە، هەروەک چۆن بەهەڵبەست (نظم) ئەم لایەنەی فەرامۆش نەکردووە.

لە ژمـارە (٣)ی ڕۆژنامــەی (بانگی کـوردســتــان)، (٢١)ی ئاغــســتـۆسی ١٩٢٢، دەربارەی گرنگی چاپخانە لە پێشخستنی میللەتی کورد دواوە و دەڵێ: «ماکینەی چاپ یەکێکە لە نیشانەی تەرەقیاتی میللەت. قەومێ، میللەتێ، کە واسیتـەیەکی ئینتیشاری فـیکر و ئیلهـامی مـەرامی نەبێ، ئەو فـیکرە، ئەو غـایەیە بێ ئەوەی بکاتە گـوێیـەک یا گوێگرێک، بێ تەئسیـر و عـەقیم ئەمێنێتـەوە، بەڵام هەر مـیللەتێ ساحیـبی مەتبـەعە، مـالیکی غـەزەتەیەکی مـیللی خـۆی بێ بۆ تـەرەقی و تـەعـالی، مـیللەتەکی هەر غـایە و ئەمەلێک تەعقیب بکا ئەتوانێ بەدەنگێکی بەرز و بڵند بیگەیەنێتە گوێی ئەو کەسانەی کە گـوێگر و خـادیمی مـەعـاریف و مـیللەتن. ئینجـا دەڵێ: «مـاکـینەی چاپ بۆ هەمـوو ئامـالێکی مـیللی، ئیـجتـیمـاعی، ئیـقتـیسـادی جـاڕدەرێکی داخیـلی و خـارجییـە و بۆ تەوحـیـدی ئەفـکار و حـسـیـاتی قـەوم، عـامـیل و واسـیـتـەیەکی زۆر مـوئەسیـرە. جگە لەمانەش، ئاسار و ئەدەبیاتی ئەو قەومەی پێ لە چاپ ئەدرێ کە ئەمەش موحافیزی عیلم و ئەدەبیاتی ئەو قەومەیە..» شێخ نووری لـەم وتارەدا گرنگی ماکینەی چاپ دەردەخات و ڕۆڵی لە دروستکردنی شارستانیەت و هەروەها باسی پاراستنی ئەو پاشماوانە دەکات کە بنەمــای نەتەوەکـەن و مــایەی بوون و مــانەوەیەتی. لە پاش ئەوەی لە گــرنگی چاپ و ماکینەی چاپ دەکۆڵێتەوە، ئینجا پێشنیار دەکات و دەڵێ: «ئەمجا بۆ ئەوەی ئێمەش ئەم

ئاسـاره نەفـیسـانه و ئەم ئەدەبیـاته بەقـیـمـەتەمـان لە کـیس نەچێ و بەمـرووری زەمـان نەفـەوتێ، لازمـە لە تەرەف غـیـرەتمەندانی مـوحـتـەرەمی وەتەنەوە بۆ هێنان و کـڕینی مـاکینەیەکی چاپ قـسوور نەکرێ. لە حەمییەتمەندانی ئەهالی موحتەرەمەی کوردستان وا ئومـێد دەکـەم بەناوی مـەنفـەعـەتی مـیللەتەوە هیـمـەت بۆ هێنانی ئەم مـاکینەیە بکرێ؟. ئەمـەش تەکلیفـێکی ئەوەندە گران نییە کە لە هەمـوو کەس هەڵنەستێ. بەندە بۆ ئەم ئیشـە خـێـره دەلالەت و تەشـەبووس ئەکـەم هەر کـەس بەقـەدەر ئیـقـتـیـدار و هیـمـمـەتی خـۆی مـوعـاوەنەت بفەرموون بەناوی مـیللییـەت و کـوردییەتەوە ئیسـتـیرحام ئەکـەم». هەر لەو ڕۆژنامـەیەدا دەربارەی «هەڵوێست» ڕای خـۆی دەربڕیوە کـە لە ژمـاره (٨)ی (٢٩)ی ئەیلوول ١٩٢٢دا بڵاوکـراوەتەوە و نووسـیـویەتی: (هەرچەند ورد ئەبمەوە و تێ ئەفکرم، گوێ ئەگرم، نە ئەبینم، نە ئەبیـەم شەخسێ چ جاهل و چ عـالم بەحسـیـیـاتێکی مـەتینی مـیللی متـەحەسس بێ. فـەرەزەن بشـبێ سەبەبی بووەی کـە ئەم حسـیـیـاتە ئەساسـێکی مـەحکەم، ڕسـووخـێکی مـەتینی نییـە، بەجـوزئێ ئینقـلابێکی مـووەقـەتی مـەعکووسـەن مـووبەدەل ئەبێ. (تەبەقـەی عـەوام) مەعلوومـە کە ئەم تەبەقـەیە هەمـوو وەقـت و زەمـانێ تابیـعی جـەرەیانێکی تەبیـعین، یەعنی حکوومـەتێکی بەشـیـددەت بووبێ، بۆ ئەوەی کـە ئەشـقـیـا و دز و جـەردە زەربەی لە کـەسـایەتیـان نەدا لە سـوڕەت دائیـمـەن دوعـای مـووەفـەقـییـەتی ئەو حکوومـەتەی کراوە. لە عـەینی سـاڵدا ئەگـەر ئەو حکوومـەتە تەورێ مـوقـابیل بەخـاریج نفـووزی تەنزیل کـردبێ، ئەو وەقـتـە غـەیبـەتی حکوومـەت و دوعـای مووەفەقییەتی ئەو کەسە کراوە کە کاروانی تا سەلاحیە ڕەوانە کردووە، ئەمانە حەقیانە.

(تەبەقـەی مـوونەوەر) بۆ ئەم تەبەقـەیە زۆر تەعـەجوب ئەکـەم کـە هەر یەکێ بەنسـبـەت خۆیەوە و کەم و زۆر لە پێنج ساڵەوە هەتا دە دوانزە ساڵە لە عیلمیە، حەربیە، لە حقووق، تەحسیلیان دیوە لە تەشکیلاتی حکوومەت باخەبەر و بەحسییـاتی میللییە موتەحەسس و دەمـاغـێکی مـوسـاعـیـد و تەربیـە دیدەیان بۆ مـوحـاکـەمـاتی سیـاسی، ئیـقـتـیسـادی و وەزعـییـەتی عـەسکەری هەر حکوومـەتێ هەیە، لەگەڵ ئەمـەشا فیکرێ کە ئەمڕۆ بۆ خۆیان قـەرار ئەدەن، سبـحـەینێ لە بیریان ئەچێتـەوە، هاوفـیـکرێکی دوێنێ یان بۆ قـسـەکردن کە ئەچێتە تەنیشتییەوە، کە تەمـاشا ئەکا فیکرەکەی دوێنێ نەماوە – گەزی چی و جاوی چی – . فـیکری ئەمـڕۆی لەگـەڵ هینی دوێنێـدا (ئاسـمـان و ڕێسـمـانە) کـوڕە تۆ کـابراکـەی دوێنێیت، نەوەڵڵا و بیللا ئەو نیـم، ئەم قوڕ بەسەرەش هەڵدەستێ و ئەڕوا، ئەڵێت قـەیناکا با من درۆزن بم. زۆر پیـاوی وام دیوە کە جاهو جەلالی حورمـەت و عـیزەتی بەحکوومـەتی

ئینگلیزەوە بووە و هیچی تر. ئەمڕۆ لە عەلەیهی ئەو لە هی یەکێکی ترە و شەخسی واشم دیوە موتەمادی دوشمنی حکوومەتی تورک بووە، کەچی ئەمڕۆ برای هاوپشتێتی. ئینسانی وایشم چاو پێکەوتووە کە خادیمی میللەت بوو بۆ تەرەقی و تەعالی قەومەکەی خۆی سەعی کردووە و ویستوویەتی کە قەومەکەی ببێ بەپیاو لە تەئریخی عالەمدا مەوجوودییەتی ئیسپات بکا، ئەویش ناشوکری نالێم ئەمڕۆ نەوعێکی ترە. بێجگە لەمانە قسمێ بێ تەرەفیش لە سایی خواوە زۆرە. ئەمە زۆر عەیبە. میللەت کە ئێمە بیستوومانە موتەمادی، بۆ تەرەقی و تەعالی خۆی هەر سەعی کردووە، حەزی لە مەحکوومی نەکردووە. موحاکەماتی سیاسی تەئریخ، ئەمانە زۆر چاک ئیسپات ئەکا. (اللهم اصلح أحوالنا) شێخ نووری نەخۆشییەکی دەستنیشان کردووە، ئەمڕۆکەش وەک دیاردەیەک هەیە و بگرە زیاتر لە جاران تەشەنەی کردووە، ئەوەش مەسەلەی (هەڵوێستە)، کێشەکەش دووفاقی و ئیزدیواجیەتی موونەوەرە لە هەڵوێستەکانیدا، ئەم وتارەش ئەوەندە زیندووە دەڵێی بۆ ئەمڕۆکە نووسراوە.

هەر لە ژمارە (١١)ی ئەو ڕۆژنامەیەدا وتارێکی بەزمانی فارسیی نووسیوە، کە ئەو کاتە زمانی ڕۆشنبیر و خوێندەوارەکان بووە، کە لە حوجرەدا فێری دەبوون. دیارە لەم وتارەیدا ڕووی قسەی تەنیا لەوانەیە کە دەستەی ڕۆشنبیری ئەو ڕۆژگارە بوون و بۆ وروژاندنی حەمیەتیان نووسیویەتی. وەک نووسەری بەشە فارسییەکەش ویستوویەتی توانایی خۆی لەو بوارەدا بسەلمێنێ. دەشێ شێخ نووری وەک لێپرسراوی دووەم لە ڕۆژنامەکەدا ئەو تەعلیقاتە سیاسی و کۆمەلایەتییانەی بەناوی (بانگی کوردستان) نووسراوە ،بەشێکی لە نووسینی ئەو بێت، کە ئەو یەکێکە لەوانەی بایەخی بەو باس و بابەتانە دەدا و لەسەر ڕووداوەکانی ڕۆژ دەوەستا و نەیهێشتووە بەسەریدا تێپەڕن، بەبێ ئەوەی بەتەعلیقێک - بچووکیش بێت - بەسەریان نەکاتەوە. لە یەکێک لە دەفتەرە شیعرییەکانی خۆی کە ڕەشنووسی کۆمەڵێ شیعری ئەون، شێخ نووری کۆمەڵێ ڕووداوی گرنگی جیهانی و ناوخۆیی تۆمار کردووە، لەوانە:

(٢ی مایس ١٩٤١، ٦ی ربیع الثاني ١٣٦٠، ئەوەل ڕۆژی حەربی عیراق لەگەڵ حکوومەتی بەریتانیا. ١٩٤١/٦/٢٢ ئەڵمان هجومی کردە سەر ڕووس، ١٩٤١/١٢/٧ ژاپۆن حەربی لەگەڵ ئەمریکا و ئینگلیزدا کرد. لە کانوونی ئەوەل و کانوونی ثانی ١٩٤٢ زۆر جەزیرەی لە موحیتی هادیا گرت، ڕۆژی ١٩٤٢/٢/١٠ سەنغافوورە سقوتی کرد، ڕۆژی ١٩٤٢/٣/٩ جاوە سقووتی کرد، ڕۆژی ١٩٤٢/٣/١٠

(رانگون) لەبەرەما گیرا، ڕۆژی ١٩٤٢/١/١٤ عەسکەری بەپەرەشووت خستە جەزیرەی سۆمەترەوە. ڕۆژی ١٩٤٥/٥/٨، ئەڵمان سقووتی کرد).

نووسینەوەی ئەم ڕووداوانە و تۆمارکردنی ڕۆژەکانی لەسەر ئەو دەفتەرە ئەوە دەردەخات، شێخ نووری زۆر بەوردی شوێن پێی ڕووداوەکانی جیهانی هەڵگرتووە، بێجگە لە ڕووداوە سیاسییەکانی لای خۆمان، گەسێکی خەریکی ڕووداوە سیاسییەکانیش بووبێ بێگومان دەبێ لە مەسەلەی (مێژوودا) شارەزا و وریا بێت، شێخ نووری وەک ڕۆشنبیرێکی سەردەم لەم لایەنە بێ بەش نەبووە و پشتی تێ نەکردووە. ئەو لە کاتێکدا ئەو ڕووداوانەی لەو دەفتەرەدا تۆمار کردووە، کە پێوەندی بەکاروباری ڕۆژنامەنووسییەوە نەماوە، کە دەبێ لە کاتی ئیشکردنی لە بواری ڕۆژنامەنووسیدا زۆر لەوە زیاتر خۆی بۆ ئەو لایەنە تەرخان کردبێ و نەیهێشتبێ هیچیانی لە دەست دەرچێ و بەرەو پیری هەواڵ و ڕووداوە ناوخۆیی و جیهانییەکانەوە بچێ. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ بایەخی بەخەباتی گەلان دابێ و هەمووی بەیەک خەباتی نەپساوە دانابێ، دژی داگیرکەران و چاوچنۆکان.

وەک وتمان ئەو نووسینانە بە گوێرەی ئەو شتێکی تازە بابەت نەبووە، چونکە شێخ نووری پێشتر دەربارەی (تووتن) بە سێ ژمارە لە ڕۆژنامەی (پێشکەوتن) و دەربارەی زمان و لایەنی دیکە بیروڕای لەو جۆرەی دەربڕیوە، بەکورتییەکەی شێخ نووری ویستوویەتی لەو سەرەتایەدا پاڵپشتی بزووتنەوەی (تەنویر) بکات و لە ڕووی ڕۆشنبیرییەوە کاریگەری و جێ پەنجەی خۆی هەبێ و بتوانێ لە شڵەقاندنی گۆمی ڕۆشنبیری تەقلیدی و باو بەشدار بێ. ئەو بزووتنەوە (تەنویری)یە ڕەنگدانەوەی بارودۆخ و ژیانی تورک بوو بەسەر ڕووناکبیرە ڕابەرەکانی کورد، لە بەرپاکردنی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازانەی شۆڕشگێڕدا. کە (لە بواری مێژووییدا ناوی دەنێین ئاوەژووبوونەوەی ژیانی تورکایەتی کە لەو سەردەمەدا لە لای ڕۆشنبیران و ڕابەرانی کورد، لە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازانەی شۆڕشگێڕدا، شۆڕشی بۆرژوای ئەورووپا هێنایە پێشەوە، بزووتنەوەی کوردیش بۆ خۆی بەشێوەیەکی جیاواز لەوان لەگەڵ واقیعی چەوسانەوەی نەتەوەیی تێکەڵ بوو، بۆ کارکردن لە پێناوی هێنانە کایەوەی ئەو جۆرە بیرانە لە کوردستاندا، پێش پێگەیشتن و نەشونماکردنی بنکەی ئابووری ئەو بیرانە). لەو کاتەدا کە شێخ نووری دەستی دایە کارکردن لە بواری ڕۆژنامەنووسیی کوردی، عێراق بەگشتی و کوردستان بەتایبەتی، بەهۆی شالاوی نارەزایی میللەت و ڕاپەڕینەکانی دژی ئینگلیز توانیبووی تا ڕادەیەکی چاک ئازادی بۆ خۆی بەدەست بهێنێ، بەمەش توانییان بەسەربەستیی زیاترەوە

تەعبیر لە خواست و ئاوات و بیروباوەڕی خۆیان بکەن، تووڕەبوونی جەماوەر بەرانبەر بەداگیرکەرانی وڵات و ڕاپەڕینە جەماوەرییەکان سەریان پێ شۆڕ کردن و شێخ مەحموودیان لە ئاوارەیی گەڕاندەوە، تا توانیان حکوومەتێکی سەربەخۆی تەمەن کورت بۆ خۆیان بەسەرۆکایەتی (شێخ مەحموودی نەمر) دابمەزرێنن و ئەوانیش لە ئاستی مافە ڕەواکانی میللەتی کورد زیاتر سەرشۆڕ بکەن، بەمەش دەرفەت هاتە پێشەوە و توانیان بەکامی دڵی خۆیان لە گرفتەکانی ژیانی ئەو سەردەمەی گەلی کورد بکۆڵنەوە یان وەک جەبار جەباری دەڵێ: (بۆ یەکەم جار لە مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردی، ڕۆژنامەکانمان توانیان بەوپەڕی دەسەلات و سەربەستییەوە دوور لە چاوی ڕەقیب و دەستی دوژمنان لە واقیعی ڕاستەقینەی نەتەوەکە بکۆڵنەوە) بەو شێوەیە لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا، ڕۆژنامە بوو بەچاوساغی قۆناغێکی ناسک لە ژیانی میللەتی کورد و وەک شایەد بەسەر ڕووداو و ڕووداوە مێژووییەکانی ئەو کاتە ماوەتەوە، کە بێگومان ئەو لاپەڕانەش دەکرێ ببنە کەرەسەیەکی دەوڵەمەند بۆ ئەو مێژوونووسانەی قەڵەم لەو قۆناغە دەخەنە کار و ناتوانن بەهیچ شێوەیەک پشت لەو ڕۆژنامانە بکەن کە خاڵی نین لە زانیاریی گرنگی سیاسی و مێژوویی و کۆمەلایەتی و ڕۆشنبیری بۆ ئەو سەردەمە.

وەک لای هەمووان ئاشکرایە، لە چارەکی یەکەمی ئەم سەدەیەدا شێخ نووری بەیەکێک لە پێشەنگەکانی بزووتنەوەی ڕۆشنبیری دەژمێردرێ، ئەو ڕۆشنبیرییە سەردەمیانەیەی ئەو هەیبوو، کارێکی وای کرد هەر زوو لە پەیامی خۆی تێبگا و هۆشیارانە دەست بداتە خەباتی وشەو وەک ڕووناکبیر و موونەوەر و نیشتمانپەروەرێک چالاکی ڕۆشنبیری و نیشتمانی بنوێنێ. وەک پێشتریش باسمان کرد یەکێک لە بوارەکانی چالاکی شێخ نووری، بواری ڕۆژنامەنووسیی کوردی بوو، کە وەک ڕۆشنبیرێکی لێپرسراو و پەیامدار خۆی لەو بوارە تاقی کردەوە و توانی وەک هۆیەکی ڕاگەیاندنی ڕاستەوخۆ بەجەماوەرەوە بەکاری بهێنێ. کاتێ شێخ مەحموودی نەمر لە ئاوارەییەکەی (هیندستان) گەڕایەوە، شێخ نووری وەک یەکێک لە ڕابەرانی ڕۆژنامەنووسیی کوردی، توانایی خۆی سەلماندبوو. دەبێ ئەوەش لە بیر نەکەین شێخ نووری هەرچەندە لەو سەردەمەدا بەیەکێک لە پێشەنگەکانی بواری ڕۆژنامەنووسی دادەنرێ، لە هەمان کاتیشدا یەکێکە لەوانەی وەک هاوەڵە ڕۆژنامەنووسەکانی دیکەی بۆ دابینکردنی نانی خۆی و منداڵەکانی، بەکاروباری وەزیفەوە سەرقاڵ بووە، کەچی گوێی نەداوەتێ و دەربەست نەبووە و زۆر بێ پەروایانە ئیشی کردووە و وەک سەربازێکی نەناسراوی ئەم بوارە لە بیستەکاندا بەهەوڵ و تەقەللای

خۆی و بێ پاداشت و خەڵات، بەشەونخوونی بۆ ڕۆژنامەنووسی کوردی هەوڵی بێ پایانی داوە و وەک کەسێکی بەجەرگ و دڵسۆز ئەوەی لە دەستی هاتبێ بۆ خێر و خۆشی میللەتەکەی دریغی نەکردووە و ڕۆژی داوەتە دەم شەو، واتە لە پاڵ وەزیفەکەی خۆی ئەم ئیشانەی ڕاپەڕاندووە.

ڕۆڵی کاریگەری شێخ نووری لە ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا، زیاتر لە سەردەمی ڕاپەڕینەکانی شێخ مەحموودی حەفیددا دەردەکەوێ، شێخی نەمر زۆر شێخ نووری خۆشدەویست و ڕێزی لێ دەنا و بڕوا و متمانەی پێ هەبوو، چونکە یەکێک بوو لەو ڕۆشنبیرانەی دڵسۆزی میللەتەکەی بوو، ئەوە سەرەڕای ئەوەش شێخ نووری وەک ڕۆشنبیرێکی سەردەم لە نزیکەوە ئاگاداری باری سیاسی و ڕۆشنبیری و هەموو پێوەندییەکانی دیکە بوو. لە بەرپاکردنی ئەو خەباتە سیاسییەش گەیشتبوو، کە میللەتی کورد لەو کاتەدا دەستی پێ کردبوو، بەمەش، هەردوو لایەنی لە خۆی کۆ کردبووەوە، وەک ڕۆشنبیرێکی شۆڕش کە شیعریشی کردبووە ئاوێنەی ئەو شۆڕشە و بەشێک لە خەباتەکەی کە زۆرتر بەو لکە ئەدەبییە ناسرابوو، لە ڕووی سیاسی و فیکریشەوە مرۆڤێکی هۆشیار و وریا و لێوەشاوە بوو. ئەم دوو هەلومەرجەش بەس بوون بۆ کەسێکی وەک شێخ مەحموود، تا بیکاتە هەڵسوڕێنەر و لێپرسراوی یەکەمی ڕۆژنامەی (ڕۆژی کوردستان) کە زمانحاڵی حوکمدارییەتەکەی بوو، شوێنی ڕۆژنامەی (بانگی کوردستان)یشی گرتەوە. ئەو ڕۆژنامەیەش لەو سەردەمەدا جێگای هیوا و بڕوای میللەتی کورد بوو، بۆیە ناکرێ کەسێکی وا بەرپرسیاریەتی بدرێتێ کە ئەهلی ئیشەکە نەبێ و زەفەری پێ نەبات. هەرواش بوو، شێخ نووری توانی بەهەوڵ و تەقەللای خۆی و هاوەڵە ڕۆژنامەنووسەکانی دیکەی، ئەو ڕۆژنامەیە بکاتە ڕۆژنامەیەکی سیاسی و نەتەوەیی و ئەدەبی، کە ئەدەبەکەشی هەر لە پێناوی ئەو ڕێڕەوەدا خستبووە کار. دەتوانین بڵێین (ڕۆژی کوردستان) لە دوای ڕۆژنامەی (کوردستان) لە سەرەتای بڵاوکردنەوەی بیر و هەستی نەتەوایەتی بەشێوەیەکی سەربەست و سەربەخۆ شوێنێکی تایبەتی داگیر دەکات، لەگەڵ دەستکورتی و نەبوونی کادیر و سەرەتایی بوونی چاپخانەکە، دەکرێ لە مێژووی ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا بەنیشانەیەکی پرشنگداری دابنێین.

شێخ مەحموود کاتێ ئەرکی بەڕێوەبردنی ئەو ڕۆژنامەیەی بەشێخ نووری سپارد، لە ژمارە (١)ی (١٥)ی تشرینی دووەمی ١٩٢٢دا شێخ نووری نووسیویەتی: (ساحێب ئیمتیازی غەزەتەی بانگی کوردستان جەنابی حاجی مستەفا پاشا لەبەر مەشغەلەتی

وەزیفەی ڕەسمییە ئیستیعفای کرد. ئینتیشاری ئەم غەزەتەیە لە واقیعا بۆ کوردستان، فاڵێکی خێر بوو، یەعنی (بانگی کوردستان) نەتیجەی ڕۆژ بوو. لەبەر ئیستیعفای موما ئیلەیهی ئیمتیاز و ئیدارەی غەزەتەی (ڕۆژی کوردستان) بەئیرادەی حەزرەتی جەلالەت حوکمداری کوردستان دامە شەوکەتەهو، بەم ناوەوە تەودیعی بەندە کرا. بەڵێ نەتیجەی بانگێ کە بۆ تلووعی فەجرێکی ئیستیقبال ئەدرێ، ڕۆژە. ئەو بانگە، بانگێ بوو کە بۆ سوبحێکی سەعادەت ئەدرا. ئەم ڕۆژە ڕۆژێکە کە ئەلحەمد و قەومی نەجیبی کورد لە سایەی هیممەت و ئیقداماتی پەسندانەی ملوکانەوە، نایلی سەعادەت و ئیستقلالییەتی خۆی بوو. خودا ئەم ڕۆژ و ڕۆژی کوردستان لە هەموو میللەتی کورد موبارەک بکا).

بەم شێوەیە دەبینین ئیمتیازی ڕۆژنامەی (ڕۆژی کوردستان) دراوەتە (شێخ نووری) و لەو ساڵانەی ئەرک و لێپرسراوێتی ئەو ڕۆژنامەیەی پێ سپێردراوە، بەشیعر و بەنووسین، ڕۆشنبیری وەک تیشکی ڕۆژ بەسەر هەموو لایەکی کوردستاندا بڵاو دەکردەوە و هانی خەڵکی کوردستانی دەدا بۆ فێربوون و زانست و ڕووکردنە خوێندەواری. یەکەم ژمارەی ڕۆژی کوردستان لە (١٥/١١/١٩٢٢)دا دەرچوو و بوو بەزمان حاڵی حوکمداریەتی (شێخ مەحموود)ی نەمر. دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد دەڵێ: (باری سیاسی، کارێکی وای کردووە مێژووی ڕۆژنامەی کوردی پڕ بێ لە سەربازی نەناسراو) شێخ نووری یەکێکە لەو سەربازە نەناسراوانەی کورد، کە ڕۆڵی لە بواری ڕۆژنامەنووسیی پشتگوێ خراوە و لە یادی ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا مافی خۆی نەدراوەتێ، ئەگەرچی وەک دیارە شان بەشانی گەلێ ڕابەر و مامۆستای دیکەی وەک (میقداد مەدحەت و عەبدولڕەحمان و ئەمین عالی و جەلادەت بەدرخان و پیرەمێرد و حوسێن حوزنی) و دەیان کەسی دیکە ڕەنجیان داوە، ڕەنجی فەرهادانە بۆ پێشخستنی ڕۆژنامەنووسی کوردیمان.

شێخ نووری وەک یەکێک لە ڕۆژنامەنووسە ڕابەرەکانمان بەهۆی ڕۆژنامەی (ڕۆژی کوردستان)ەوە توانی لە بارودۆخێکی ناسکدا کە کوردستانی پێدا دەڕۆیشت، ڕۆڵێکی گرنگ بگێڕێ. ئەمەش بەبەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاری سیاسی و نەتەوایەتی و مێژوویی میللەتەکەی، بۆ تێگەیشتن لە دەوروپشتیش بایەخی دەدا بەو باسوخواس و دەنگوباسانەی پێوەندی دوور و نزیکیان بەبارودۆخی لای خۆمانەوە هەیە. شێخ نووری لەو ئەرک و پەیامەی خۆی چاک تێگەیشتبوو، کە وەک ڕووناکبیرێک ناتوانێ بەهۆی شیعرەوە، ڕاستەوخۆ کار بکاتە سەر گۆڕینی جەماوەر، بۆیە بەهۆی ڕۆژنامەوە کە هۆیەکی ڕاگەیاندنی ناسکە، ئەو پەیامەی خۆی گەیاندووە، ئەو لاپەڕانەش چەند لاپەڕەیەکی گەشن

له مێژووی ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا و پێویستە بەچەلەنگییەوە لە لاپەڕە پرشنگدارەکانی (ڕۆژنامەنووسی نیشتمانی - الصحافة الوطنية)دا تۆمار بکرێن و ئەویش بخرێتە پاڵ ناوی ئەو ڕۆژنامەنووسانەی تا ئێستا لە یادی ڕۆژنامەنووسیدا یادیان دەکرێتەوە.

لەم ڕۆژنامەیەدا شێخ نووری لە وتارەکانیدا داکۆکی لە مەسەلەی نەتەوەکەی کردووە و لە ڕێگای بەشداربوونی ویژدانیی لەگەڵ بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی میللەتەکەی بەشداری چوست و چالاکانەی خۆی لەگەڵ ڕۆژنامەنووسە پێشەنگەکانی بزووتنەوەی ڕۆژنامەنووسی کوردیدا نواندووە. وا دیارە هەوڵ و تەقەللای خۆی یەکخست و سەرکەوتووانە لەو پەیامەی لە ئەستۆی گرتبوو، توانی بیهێنێتە دی، لێتوێژەرەوەش ناتوانێ لە کاتی باسکردنی هەر یەکێک لەو ڕۆژنامەنووسە ڕابەرانەمان، تێکۆشانەکەیان لە سەرجەمی بزووتنەوەی نیشتمانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوزانەی گەلی کورد داببڕێت.

پێگەیشتنی هۆشیاری شێخ نووری کردی بەیەکێک لە ڕۆژنامەنووسە پێشەنگەکانی بزووتنەوەی ڕۆژنامەگەری کوردی. وا دیارە شێخ نووری ئاگاداری باری ڕۆژنامەنووسی تورکی بووە و سوودی لە بەهرەی ڕۆژنامەنووسی ئەوان وەرگرتووە و بەتایبەتی لە (سەروەتی فنون) و زۆر لە ڕۆژنامەکانی ئەو حەلە، کە ئەوان ئەزموونی ڕۆژنامەنووسییان لە ئێمە دەوڵەمەندتر بووە، بەڵام ئەوە تەنیا لایەنە هونەرییەکانی ڕۆژنامەنووسیی بووە. ئەو وتارانەی شێخ نووری لەو ڕۆژەدا نووسیونی، بەڵگەی ئەوە بەدەستەوە دەدەن کە شێخ نووری لە واقیعی کورد و بارە سیاسییەکەی ئەو ڕۆژە بەباشی تێگەیشتووە.

د. کەمال مەزهەر ئەحمەد دەڵێ: (وا دیارە پەیدابوونی ڕۆژنامەنووسیی کوردیی و خەبات و هونەری ڕۆژنامەنووسانی کورد بەلای هەندێک نووسەری ڕۆژئاواییەوە ئەنجامی ئاڵوگۆڕی ناوخۆ نییە. بەوێنە دڵسۆزی و لانەدانی شێخ نووری شێخ ساڵح وەک سەرنووسەری «ڕۆژی کوردستان» بەلای ئەدمۆندسەوە، بەرهەمی ئەوە بوو کە بە«خزمایەتی دەگەیشتە ژنی دووەمی شێخ مەحموود») ڕاستە شێخ مەحموود بەهۆی ژنی دووەمییەوە بەخزمایەتی دەگەیشتە شێخ نووری، بەڵام بڕوا ناکەم لە هەر شتێکدا خزمایەتی و دۆستایەتی دەوری خۆی بگێڕێ، لە مەسەلەی (فیکر و ڕۆشنبیری)دا ئەو دەورەی نییە و بۆ کەس ناچێتە سەر، بەتایبەتی ئەگەر پلە و پایەیەکی ناسکی وەک سەرنووسەری ڕۆژنامەیەک بێت و بەو کەسە بسپێردرێت. ئەو پێ سپاردنەش لە بارودۆخێکی ناسکدا بێ و ئەو (خزمایەتی)یە هەموو هەلومەرجەکانی دیکە بسڕێتەوە.

شێخ نووری دوای ئەوەی بەهرە و توانایی ڕۆژنامەنووسی خۆی لە ڕۆژنامەی (بانگی کوردستان)دا سەلماند و وەک دڵسۆزێکی میللەت و ڕۆشنبیرێکی ئەو سەردەمە کە لە زۆر بواردا جێ پەنجەی دیاربوو و شوێنی خۆی کردبووەوە. لە لایەکی دیکەشەوە ڕەوشت و خوی بەرز، هەروەها بێ فیزی و ساکاری و هێمنی و ڕێزگرتنی خەڵک، کەسێکیش بوو بەردەوام بەدوای زانست و فێربوون و خۆپێگەیاندندا گەڕاوە، وەک تەمەنیش لە هەرەتی گەنجێتیدا بووە کە ئەمەش یارمەتی داوە بۆ ئیشکردن و تەقەللادانی بێ وچان، بەبێ ئەوەی بزانێ هیلاکی چییە. سەرباری ئەوەش شاعیرێکی هەست ناسک و لێهاتوو و داهێنەر بوو، باری سەرنجی باشی لە لای زۆربەی ئەوانەی ناسیویانە، بەجێ هێشتووە و لە بیر و زەینیاندا جێگایەکی بەرز و خۆشەویستی هەبووە، بەمەش گرەوی لایەنە کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییەکەی بردووەتەوە. شێخ مەحموودی نەمریش ئەو دڵسۆزی و ئیش ڕاپەڕاندنەی لێ ڕەچاو کردووە تا وەک لاوێکی چاپووک ئەو کارەی پێ بسپێرێ، ئینجا تەکلیفی لێ کرد ببێ بەسەرنووسەری ڕۆژنامەکەی. ئەویش ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەئیش و کۆششی خۆی سەلماندی لایق و شایستەی ئەو شوێنەیە و سەرکەوتووانە بەڕێوەی بردووە و بۆ هەموو لایەکی دووپات کردووەتەوە کە جێگەی بڕوا و متمانە پێ کردنە، کەواتە بەحەقیانەت شێخ نووری پیاوێکی ڕۆشنبیر و دڵسۆزی خاک و نەتەوەکەی بووە، خاوەنی پلە و پایەیەکی ڕۆشبیری و کۆمەڵایەتی بەرز بووە، پێوەندی دۆستانەی لەگەڵ زۆربەی نیشتمانپەروەرە کوردەکان و موونەوەرەکانی ئەو سەردەمەدا هەبووە، ئەوانیش چەندی لە دەستیان هاتبێ هاوکارییان کردووە و بەرهەمیان بۆی ناردووە. بێجگە لەوەش شێخ نووری خاوەنی ڕابردوویەکی پاک بوو، جێگەی ڕێزی ئەو کەسانەش بوو کە لە نزیکەوە دەیانناسی.

ئینجا دکتۆر کەمال مەزهەر نووسیویەتی: (ئەدمۆندس دان بەوەدا دەنێ کە شێخ نووری زۆربەی وتارە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی «ڕۆژی کوردستان»ی دەنووسی، بەڵام دەشڵێ بەشی زۆری ئەو بەرهەمانە «لە کتێبە تورکییە کۆنەکان»ی وەردەگرت، وەک بەڵگەش ئەدمۆندس بەدەستکارییەوە ناوی ژمارەیەک لە وتارەکانی شێخ نووری هێناوەتەوە کە ئێمە وا لێرەدا وەک دەقی کوردییەکەی پێشکەشیان دەکەیَن (بانگی کوردستان - ڕۆژی کوردستان)، (مەتانەت و سەباتی قەومی کورد)، (فەنی و ئیجتیماعی - میللەت)، (موجادەلەی حەیات)، (ویلایەتی مووسڵ لە لۆزاندا)، (لە فەلاکەت عیبرەت)، دکتۆر کەمال مەزهەر بۆ وەرامی ئەدمۆندس نووسیویەتی: (دیارە پێویست بەلێکۆڵینەوە و

دەمەتەقێ ناکا بۆ ساغکردنەوەی ئەوە کە ئیلهامی بیری شاعیرێکی خاوەن بەهرە بۆ ئەم جۆرە باسانە دەبێ باری نالەباری کورد بووبێ، کە ئەدمۆندس بۆ خۆی یەکێک بوو لەوانەی دەستیان لە دروستکردنیدا هەبوو)، بۆ مەسەلەی وەرگرتنی ئەم وتارانەی شێخ نووری لە (کتێبە تورکییە کۆنەکان) ئەوە ڕایەکە من لەگەڵیدا نیم، دەبوایە (ئەدمۆندس) پەنجە بۆ ئەوە ڕابکێشێ ئەو وتارانە کامانەن کە لە (کتێبە تورکییە کۆنەکان) وەرگیراون. تەنانەت (مستەر ئەدمۆندس) ئەوەشی بردووەتەوە لای (کتێبە تورکییە کۆنەکان)، کاتێ شێخ نووری کراوە بەسەرنووسەری ڕۆژنامەی (ڕۆژی کوردستان) وتارێکی ڕوونکردنەوەی نووسیوە بەناوی (بانگی کوردستان - ڕۆژی کوردستان) و ئەوەی تێدا ڕوون کردووەتەوە کە چۆن کاری ئەو ڕۆژنامەیەی پێ سپێرراوە. یان لە وتاری (قسەی ناحەق ڕەد ئەکرێتەوە) کە وتارێکە وەرامی تورکچێتی غەزەتەی نەجمەی تێدا داوەتەوە و هەندێ لە بیروڕایەکانی تێدا موناقەشە کردووە. جگە لەوە وتارەکانی دیکەشی وەک دکتۆر کەمال مەزهەر پەنجەی بۆ ڕاکێشاوە (ئیلهامی بیری شاعیرێکی خاوەن بەهرە بۆ ئەم جۆرە باسانە دەبێ لە باری نالەباری کورد بووبێ کە ئەدمۆندس بۆ خۆی یەکێک بوو لەوانەی دەستیان لە دروستکردنیدا هەبوو)، ئیدی نازانم ئەم وتارانە چ پێوەندییان بە کتێبە تورکییە کۆنەکانەوە هەیە؟ یان ئەگەر پێوەندی هەیە ئەم بە(وەرگرتن) ناویان دەبات، بۆچی نموونە و بەڵگە بۆ ئەو قسەیەی ناهێنێتەوە؟

شێخ نووری وتارەکانی خۆی بەوپەڕی لێپرسینەوە و ڕاستگۆییەوە وەک کوردێکی بەش خوراو و خەمخۆری میللەتەکەی نووسیوە، هەموو ڕۆشنبیرییە ئەدەبییەکەشی تەرخان کردبوو بۆ جێبەجێکردنی پێویستییەکانی ئەو قۆناغە، نووسینەکانی بۆ بەرژەوەندی گەلەکەی نووسیوە، بەشێوازێکی ئەوتۆ نووسیویەتی کە خوێنەری ئەو کاتە سوودی لێ وەربگرێ و لە دەوروپشتەکەی و ڕووداوەکانی ئاگادار بێ، بەبیروباوەڕی نوێ و ڕووناک گۆشی دەکردن. ئەو سەروتارانەی شێخ نووری بۆ زۆربەی ژمارەکانی ئەو ڕۆژنامەیەی نووسی، لەگەڵ بەشێکی زۆر لە ڕوونکردنەوە و وتاری کورتیلە و وردە هەواڵ بە ئیمزای (ڕۆژی کوردستان) بڵاوکراونەتەوە، دەشێ ئەوانە بخرێنە خانەی سەروتاری سیاسی سەرکەتوو. بێجگە لەمەش ئەم سەروتارانەی بۆ دەرخستنی حەقیقەت نووسیوە، کە تەواو لەو وتارانەدا خۆی لە ڕیاکاری و خۆبردنە پێشەوە بە دوور گرتووە. بۆ ڕوونکردنەوەی ڕاستی و ڕەواندنەوەی ئەو تەمومژەی دەیانویست لە دەوروپشتی ڕووداوەکاندا دروستی بکەن، ئەو یەک، دوو شیعرەی شێخ نووری لەو ڕۆژنامەیەدا بڵاوی کردوونەتەوە، کە

ئەوانەش شیعری نیشتمانی و نەتەوەیین و زیاتر هەستی نەتەوایەتی ڕۆڵەکانی گەلی کورد بەرز دەکەنەوە لە دژی ئەوانەی یارییان بەچارەنووسی میللەتەکەی دەکرد و مافە ڕەواکانیان پێشێل دەکرد، تا زیاتر بەرانبەر بەوانە ڕژد و ڕق ئەستوور بن.

شێخ نووری خاوەنی شێوازی خۆیەتی لە نووسین و چۆنیەتی چارەسازکردنی ئەو باسانەی لەسەریانی دەنووسی. کە دەڵێین شێوازی شێخ نووری، مەبەستمان ئەوەیە کە شێخ نووری وەک ئەوانەی بەئاڵۆزی دەنووسن، ئەم بەپێچەوانەوە هەوڵی داوە ئەوپەڕی سادەیی و ساکاری لە خستنە ڕووی بابەتەکانی بەکار بهێنێ، تا خوێنەران بتوانن شارەزایی لە بابەتەکە بەدەست بهێنن، بەچڕوپڕی و بەکەمترین وشە مەبەست و ئامانجی خۆی پێکاوە. خۆی بەهێنان و بردن و پێشەکی و کۆتایی ڕازانەوە نەبەستووەتەوە کە ئەمە شێوەیەکی تەقلیدی نووسینە، کەچی ئەم وتارانە هونەری و چڕ و کورتن، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە شێخ نووری وەک ڕۆشنبیرێکی شارستانیی خوێنەری سەردەمی خۆی لە بیر نەکردووە، بەو شێوەیە نووسیویەتی سەرنجی خوێنەر بۆ لای نووسینەکانی ڕابکێشێ. لەگەڵ ئەوەی شێخ نووری خوێندنی حوجرەی تەواو کردووە و مەلاشووی بەشیعری کلاسیکی هەڵدرابووەوە، بەڵام لە وتارەکانیشدا نەکەوتبووە بەر کاریگەری و سیحری ڕەوانبێژی، کە سەری بابەتەکەی تێدا ببێ بەقۆچی قوربانی.

خوێندنی حوجرە و ئەو ڕۆشنبیرییەی لەوێ فێری بووبوو نەیتوانی خۆی لەبەر تەوژمی بیری تازەی شێخ نووری بگرێ و زەفەری پێ ببەن، تا کارێکی وا بکەن پەیڕەوی ئەو شێوازە بکات و بەزەخرەفە و (ڕەوانبێژی) چاوبەستەکی لە خوێنەران بکات. ئەو شێوازەی ئەو لەسەری دەڕۆیشت زیاتر خزمەتی بەخوێنەرانی ئەو قۆناغە دەگەیاند، چونکە ڕووداوە گرنگەکانی ئەو سەردەمەی لە ناو لێشاوی وشە و تەعبیری کەڵەکە کراو بەسەریەکدا نقوم نەدەکرد. بابەتەکانی پێوەندی ڕاستەوخۆیان بەژیانی میللەتەکە و ڕووداوەکانییەوە هەبوو. زیاتر لەسەر ئەو باسانە دەوەستا کە ئازاری ویژدانیان دەدا. خوێنەر کە بەرهەمەکانی ئەو ڕۆژنامەیە و ڕۆژنامەکانی دیکە دەخوێنێتەوە هەست بەوە دەکات بەرهەمی کەسێکە پڕ بەدڵ و بەگیان حەزی لە ژیانە و باوەشی بۆ دەگرێتەوە، بەو چاوە سەیری ژیانی دەکرد و بۆی چووبووە مەیدانی خەباتەوە و بەهیچ شێوەیەک لە سەردەمەکەی خۆی و ئەرکەکانی خۆی نەدزیوەتەوە.

لەم سەرەتایەدا شێخ نووری لەو بارودۆخە ناسکەی گەلی کوردی پێدا دەڕۆیشت،

هەوڵێکی بێ پایانی داوە بۆ پێشخستنی ڕۆژنامەنووسی کوردی پەیامدار تێبکۆشێ، سەرەتایەکەش لە عێراق و کوردستاندا لەگەڵ سەرەتای ڕاپەڕینەکانی شێخ مەحموودی نەمر دژی دوژمنان و داگیرکەران دەستی پێ کرد. ڕۆژنامەی ڕۆژی کوردستان لەو دەور و زەمانەدا بەڕۆژنامەیەکی گرنگ دەژمێردرێ، کە توانی ببێتە زمانحاڵێکی ئەمین و ڕاستگۆی ئەو سەردەمە و شان بەشانی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی بڕوا و ببێتە ڕۆژنامەی ئامانج و ئاواتەکانی کورد. ناوەڕۆکەکەشی لەمسەر هەتا ئەوسەر ئەو ئاواتانە بگرێتە خۆی کە میللەتی کورد لەو سەردەم و قۆناغەدا خەباتی بۆ دەکرد. شێخ مەحموودی نەمریش لە نزیکەوە لە بەهرە و لێهاتوویی شێخ نووری گەیشتبوو، بۆیە کردی بەجێی بڕوای خۆی و ئەو ڕۆژنامەیەی پێ سپارد. ئەویش لەو سەردەمەدا بایەخی ڕۆژنامەی زانیەوە بۆ وریابوونەوە. ئەو ڕۆژنامەیە تا ڕۆژی داخستنی (١٦) ژمارەی لێ دەرچوو، دوای ئەوە شێخ مەحموود ڕووی کردە شاخ و دەستی کردەوە بەخەباتی چەکدارانە، پاش ئەوەی ئینگلیز لە مارتی ١٩٢٣دا مەبەست و نیازی گڵاوی خستە ڕوو و شالاوی هێنا، ئەم جارە چاپخانەکەی بەپشتی وڵاغ برد و لە ئەشکەوتی (جاسەنە) دایمەزراند و کەوتە دەرکردنی ڕۆژنامەی (بانگی حەق) کە ئەم ڕۆژنامەیەش زمانی حاڵی بزووتنەوەی نیشتمانی دژ بەئینگلیز و کۆنەپەرستانی ئەو ڕۆژە بوو، دوای ئەوەی سێ ژمارەیان پێ دەرکرد وەستا. دکتۆر کەمال مەزهەر دەربارەی ئەم ڕۆژنامەیە دەڵێ: (ئەمە بۆ خۆی گەورەترین بەڵگەی بەرزبوونەوەی بایەخی ڕۆژنامەنووسییە لە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی ئەو قۆناغەی گەلی کورددا، ناوی ڕۆژنامەکەش بەئاشکرا باسی ئەو حەقە دەکا کە ئینگلیز کردیانە قۆچی قوربانی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیان). دوای ئەمە ئەم چاپخانەی (حکوومەت - بلدیة)یە کەوتەوە دەست ئینگلیزەکان و هێنایانەوە شاری سلێمانی، هێندەی پێ نەچوو ڕۆژنامەی (ژیانەوە)یان پێ دەرکرد کە زمانی حاڵی هێزی داگیرکەرە ئینگلیزەکان بوو.

کاتێ لە (ئەیلوولی ١٩٢٣)دا، شێخ مەحموود ویستی (ئومێدی ئیستیقلال) بکاتە ئۆرگانی بزووتنەوە تازەکەی، هیوای بەشێخ نووری زۆر بوو ئەو ڕۆژنامەیەی بۆ بەڕێوە ببا. مامۆستا (ئەحمەد خواجە)ش هەر ڕای وایە کە: (شێخ مەحموود زۆر حەزی دەکرد شێخ نووری ئەو ڕۆژنامەیەی بۆ بەڕێوە بەرێ، بەڵام ئەو ڕۆژنامەکەی وەرنەگرت، ئینجا من ژمارە (١)ی ڕۆژنامەکەم بەسەرنووسەری خۆم دەرکرد، لە دوای ژمارە (١)ەوە کاروباری ڕۆژنامەکە بە(ڕەفیق حیلمی) سپێررا و من کەوتمەوە ناو کاروباری شۆڕشەکەوە) وەک بۆم

دەرکەوت شێخ نووری لەبەر بارودۆخی تایبەتی خۆی نەیتوانیبوو شان بداتە بەر ئەو ئەرکە و لە ئاستی ڕاپەڕاندنی نەبێت، بۆیە نەچووبووە ژێرییەوە. ئەوەبوو ژمارە (١)ی مامۆستا (ئەحمەد خواجە) و تا ژمارە (١٤) مامۆستا (ڕەفیق حیلمی) دەری کرد، ئینجا تا ژمارە (٢٥) مامۆستا (حوسێن نازم) ڕۆژنامەکەی بەڕێوەبرد.

لە ڕاستیدا شێخ نووری لەو کاتانەی کە لە ڕۆژنامەوە نزیک بووە و دەوری لە هەڵسووڕاندنی هەبووە، چالاکی زۆرتر نیشان داوە و بەرهەمی زیاتری بڵاوکراوەتەوە. دوورکەوتنەوەشی لە ڕۆژنامە، کارێکی زۆری لەسەر کزبوونی بەروبوومی ئەو هەبووە. جموجووڵی شێخ نووری لەو کاتەی لە ڕۆژنامەدا ئیشی کردووە، یان لێی دوور کەوتووەتەوە بەڕوونی دیارە. ڕۆژنامەکانی ئەو سەردەمە دەکرێ ببن بەسەرچاوەیەکی ڕەسەن و بنچینەیەکی ڕاست و دروست بۆ پێشخستنی باری ڕۆشنبیری و ژیانی گەلی کورد و هۆشیارکردنەوەیان. هەر لە ڕۆژنامەی (پێشکەوتن)یش بوو شێخ نووری سەرەتای تازەبوونەوەی شیعری کوردی ڕاگەیاند.

شێخ نووری لە زۆربەی زۆری ئەو نووسینانەی بۆ ڕۆژنامەنووسی کوردی تەرخان کراون، ناوی نەبراوە و پشتگوێ خراوە و ڕۆڵی لەو بوارەدا زۆر کەم باس کراوە و تا ئێستا چەند لاپەڕەیەکی بۆ تەرخان نەکراوە، لە کاتێکدا ئەوە دەڵێم، دان بەوەشدا دەنێم کە منیش نەمتوانیوە و دەرفەتم هەر ئەوەندە بۆ هەڵکەوتووە لێرەدا ئەوەندە جێگەی بۆ بکەمەوە، هیوامان وایە لە پاشەڕۆژدا بەلێکۆڵینەوەیەکی لەوە تێروتەسەلتر دەربارەی بەهرەی ڕۆژنامەنووسی ئەم ڕۆژنامەنووسە بنووسرێت و ڕۆژنامەنووسەکانی ئەمڕۆکەشمان زیاتر سوود لە بەهرەی ئەم ڕۆژنامەنووسە پێشەنگ و ڕابەرە وەربگرن.

**ژێدەر و سەرچاوەکان:**


(١) تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسی کوردیدا، د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کوردی، بەغدا ١٩٧٨- ل١٠، ل٩٣، ل ١٠٦.

(٢) مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردی، جەبار محەمەد جەباری، سلێمانی، چاپخانەی ژین. ١٣٩٠ ک - ١٩٧٠ز.

(٣) حول الصحافة الكردية، الدكتور عزالدين مصطفى رسول، بغداد ١٩٧٣، ص ٣٤.

(٤) دور الشعب الكردي في ثورة العشرين العراقية، الدكتور كمال مظهر أحمد، مطبعة الحوادث، بغداد، ١٩٧٨، ص ١٤٠.

(٥) ڕۆژی کوردستان ١٩٢٢-١٩٢٣ کۆکردنەوە و لەسەر نووسینی: جەمال خەزنەدار، بەغدا، ١٩٧٣، سەرجەمی ژمارەکانی ڕۆژی کوردستان کە بە ئۆفسێت لە چاپ دراوەتەوە - بەڕێوەبەرێتی ڕۆشنبیری کوردی.

(٦) بانگی کوردستان ١٩٢٢-١٩٢٦ کۆکردنەوە و لەسەر نووسینی: جەمال خەزنەدار، ١٩٧٤ بەڕێوەبەرێتی ڕۆشنبیری کوردی، سەرجەمی ژمارەکانی ڕۆژنامەی بانگی کوردستان بەئۆفسێت لە چاپ دراوەتەوە.

(٧) گۆڤاری ڕزگاری ژمارە (١)ی ساڵی (١) (٢)ی نیسان ١٩٦٩ (تۆمار).

(٨) جريدة العراق. مصطفى پاشا ياملكي... صحفيا وسياسيا. العدد ٢٤١٣ (٩) كانون الثاني ١٩٨٤ - إبراهيم باجلان.

(٩) جريدة العراق - العدد ٢٣٩٨، ٢٢ كانون الأول، ١٩٨٣، (١٨) ربيع الأول، ١٤٠٤هـ (نوري الشيخ صالح شاعرا وصحفيا)، إبراهيم باجلان.

(١٠) هەندێ ژمارەی بانگی کوردستان و ڕۆژی کوردستان کە لە شوێنی خۆیدا ئاماژەیان پێ دراوە.

(١١) جريدة العراق يوم ١٩٨٣/١١/٧ لمناسبة مرور إحدى وستين عاما على صدورها ٩٢٢-٩٢٣ ڕۆژی کوردستان و دورها التاريخي.

# پایەی شێخ نووری لە لای شاعیران و نووسەرانی کورد

ئەم چەپکە بیروڕا و سەرنج و شیعرانەی لێرەدا دەیانخەینە بەردەست بەڵگە و شایەتی زیندوون بۆ دیارکردنی پلە و پایەی شاعیرێکی وەک شێخ نووری شێخ سالح. بێگومان باسکردنی شێخ نووری لە لایەن ئەم شاعیر و ڕۆشنبیرانەوە زادەی قەناعەتێکی ڕاستگۆیانەیە. وەک لە لای هەمووشمان ئاشکرایە ئەوانە خاوەنی پلە و پایەی خۆیانن لە ژیانی فیکری و ڕۆشنبیری و داهێنانی میللەتەکەماندا. مەبەست لە هێنانەوەی ئەو بیروڕایانە ئەوەیە شێخ نووری وەک شاعیر و وەک ئینسان لە لای وەچەی ئەمڕۆکەمان زیاتر بناسرێ، لە لایەکی تریشەوە بۆ ئەوەی ئەو قسە و ڕەخنانە بڕەوێنەوە کە دەیانەوێ بەدەستی ئەنقەست لە پایە و نرخی ئەم شاعیرە کەم بکەنەوە.

ئەم ڕایانەش بۆ خۆیان پاڵپشتی هەموو بیروڕایەکانی منن کە دەتوانم لەوە زیاتر پشتم پێیان ئەستوور بێت، بەرامبەر بەو کەسانەی - لەبەر هەر هۆیەک بێت - دەیانەوێ مافی شێخ نووری بخەنە ژێر لچ و لێوەوە، تا لە پاڵ ئەم چەپکە شیعرەی شاعیر ببنە دوو هۆی سەرەکی بۆ ناسینی پتری پایەی شاعیر، بگرە ببنە کەرەستەیەک بۆ ئەوانەی تا ئێستا لە خۆڕا قسەیان دەربارەی (شێخ نووری ) دەکرد، هیچ نەبێ چاوێ بە بیروڕای پێشوویاندا بخشێنن و نەختێ - هەر نەختێ - مەوزووعیانەتر بێنە مەیدانی لێکۆڵینەوەکردنی شیعرەکانی.

***

مامۆستا (گۆران)ی نوێخواز دەربارەی شێخ نووری لە پێشەکی (بەهەشت و یادگار)دا نووسیویەتی: (بەهەشت و یادگار) کۆمەڵە شیعرێکە لە دیوانەکەم سەرانسەر لەگەڵ بابەتەکانی جوانی و دڵداری خەریکە. هەڵبەستی وای تیایە بیست و پێنج ساڵ، بەڵکو زیاتر، لەمەوپێش دانراوە، هەروەکو هی چەند مانگێک لەمەوبەریشی تیایە. بەشی زۆری کۆنەکان بەوەزنی عەرووض وە کوردییەکی کۆنی تێکەڵاو بەزمانی بێگانە نووسراون. ئوسلووبیشیان کۆنە: یان وەک هی «سالم» و «نالی» لەسەر پێ و شوێنی غەزەل هەڵبەستراون، یان ئەو جۆرە ئوسلووبەیان تیا کراوە بەسەرمەشق کە مامۆستا (م. نووری)و هاوڕێکانی لە ئەدیبە تازەکانی تورکی عوسمانییان وەرگرتووە، لە سەردەمێکی

سنووردارا (١٩٢٠-١٩٣٠) شیعری کوردی ناوچەی سلێمانییان پێ تازە کردەوە[1].

بۆ جارێکی دی مامۆستا (گۆران) دەربارەی ڕۆڵی شێخ نووری لە تازەکردنەوەی شیعری کوردیدا دەڵێ: نووسەر و شاعیرانی ئەوسا، بەتایبەتی شێخ نووری و ڕەشید نەجیب و من، کە پێکەوە بەئەدەبی تورکی موتەئەسیر بووین و پێکەوە ئەمان نووسی. بەڵام تەنها شێخ نووری شیعرەکانی بڵاوئەکردەوە من بڵاوم نەئەکردەوە ئەو لەو بارەیەوە نیشاطی دەردەکەوت وە ئەدەبی تورکی قوتابخانەی شیعری تازەی تیا پەیدا بووبوو کە پێیان ئەوترا (ادبای فجری ئاتی) لەوانە (تۆفیق فیکرەت) و (جەلال ساهر) بوون وە ئەدیبێکی تری تورک کە (عەبدولحەق حامید)ە، ئەگەرچی لەم کۆمەڵە نەبوو، بەڵام دیسان هەر پێی موتەئەسیر بووین. کەوابێ هەمووومان بەیەکەوە ئەمان ڕوانییە یەک کلاورۆژنە، بەڵام ئەتوانرێ بەشێخ نووری شێخ ساڵح بووترێ سەرۆک بەهۆی:

یەکەم: زۆری بەرهەمی

دووەم: بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکەی کە بێگومان تەئسیری ئەبەخشییە سەر ئەدەبی کوردی[2] بەم جۆرە دەبینین مامۆستا (گۆران) زۆر مەوزووعیانە دەستنیشانی کارتێکردنی شاعیرایەتی (شێخ نووری) دەکات بۆ سەر ئەدەبی کوردی ئەو سەردەمە، بەهۆی داهێنانی ئەو ئوسلووبە تازەیەی لە ناو شیعری کوردیدا بەرپای کرد.

* مامۆستا (ڕەفیق حیلمی)یش وەک ڕۆشنبیرێکی سەردەم کە زمانی تورکی باش زانیوە و بەهۆیەوە شوێن پێی ڕۆشنبیری تورکی هەڵگرتووە، دەربارەی ڕابەرایەتی کردنی بزووتنەوەی شیعری تازە لە لایەن - شێخ نووری شێخ ساڵح-ەوە دەڵێت: (لە وەزن و قافیە و شێوە و ئاهەنگا، ڕێگەیێکی تازەی داناوە بۆ شیعری کوردی). لەبەر ئەمە سەردەمێک (شێخ نووری) سەرکردەی شاعیرە لاوەکانی کوردی (سلێمانی)بووە. وە زۆریان تەنانەت (گۆران)یش هەوڵی لاساییکردنەوەی (شێخ نووری)یان ئەدا[3]. هەر لە هەمان نووسیندا مامۆستا (ڕەفیق حیلمی)، (شێخ نووری) هەڵدەسەنگێنێ و دەربارەی

(١) بڕوانە (بەهەشت و یادگار)، گۆران، چاپخانەی مەعاریف، بەغدا، ١٩٥٠-١٢٦٩ لەسەر ئەرکی (عەلائەددین سەجادی) لە چاپ دراوە، سەرەتا ل(ج) هەمان بیروڕا لە ڕۆژنامەی (ژین)ی ژمارە (١٧٠٤)ی سالی (٣٧)، ١٩٦٢/١١/٢٩دا بڵاوکراوەتەوە.

(٢) گۆڤاری بەیان، ژمارە (٢)، شوباتی سالی (١٩٧٠)، دانیشتنێک لەگەڵ مامۆستا گۆران، نووسینی عەبدولڕەزاق بیمار.

(٣) شیعر و ئەدەبیاتی کوردی، نووسەری: ڕەفیق حیلمی، بەرگی دووەم، چاپخانەی (الشباب) بەغدا ١٩٦٥ ل١٩٩.

هەنگاوی تازە بوونەوەکەی دەڵێ: (نووری شاعیرێکە تەجەدودپەروەر)، ئەڵقەیەکە ئەمسەر و ئەوسەری چەمەری شاعیرەکانی چەرخی پێشووی لەگەڵ شاعیرەکانی ئەم چەرخەدا هانیوەتە یەک. لە شیعری (کلاسیکی) بەشێکی زوبدەی وەرگرتووە وە لە سەلیقەی ئەدەبی تۆزێک فیتری (فطری)و تۆزێکیش ئیرسی (ارثي)ی خۆی خستۆتە سەر، ئنجا چاوی بەدەوری خۆیا گێڕاوە و شیعری شاعیرە گەورەکانی تورکی دەوری ژیانەوە و ئینقلابی (عثمانی) بەوردی خوێندووەتەوە وە باش سەرنجی داوەتە مەغز و ئسلووبی ئەدەبی تازە وە بەبێ ئەوەی ئەبلەق و حەپەساو دامێنێ دوایان کەوتووە، بەڵام لەم شوێنکەوتن و پەیڕەوی کردنەدا لەوانە ناچێ کە لاسایی ئەکەنەوە. بەڵکو شان بەشانی ئەوان ڕۆیشتووە وە بۆ دەورێکی کورت بووە زەعیمی ئینقلابی شیعری کوردی لە ناوچەی «سلێمانی». ئەوانەی کە ئەمڕۆکە خۆیان بەدامەزرێنەری شیعری کوردی تازە ئەژمێرن، ئەبێ بزانن یەکەم بەردی بناغەی قوتابخانەکەیان لە لایەن نووری شێخ ساڵح-ەوە دامەزرا)(٤).

* مامۆستا (عەلی کەمال باپیر ئاغا)ی شاعیر و دۆستی شێخ نووری دەربارەی وتوویەتی: (شێخ نووری کوڕی شێخ ساڵحی شێخ غەنییە لە سلێمانی بووە و ئێستاش لە سلێمانی لە دائیرەی خەزێنە کاتبە، شاعیرێکی زۆر بەفیکر و زەمزەمەیە. دەنگ و سەداییکی خۆشیشی هەیە. بەڵام ڕەقەمی ئەعداد، کە ئەعدای فیکر و شیعرە، پەکی خستووە، شیعریشی زۆرە ئاخ حەیف بۆ نووری)(٥).

* گۆشەی (شیعر و شاعیرەکانمان) لە ڕۆژنامەی ژین، کە دیارە مامۆستا (نەجمەددین مەلا) بەڕێوەی دەبرد، دەربارەی (شێخ نووری) نووسیویەتی: (شێخ نووری کوڕی شێخ ساڵح بێجگە لەوەی کە ئەمڕۆکە لە هونەری هەڵبەستدا پایە بڵندە، هەروەها کە ئێستا پیر بووە و لە بەهاری لاوی خۆیدا دەنگ خۆشێکی بێ وێنە بوو، شیعرەکانی خۆی بەبەستەوە وە شیعری (مەولەوی) بەقەتار لە ئێوارانی بەهار لە دەمی زەردەپەڕدا لە گوێ ئاو و سەرچاوەکانی کەنار شار، ڕوو بەڕووی سەوزە زار، هەر لە خۆی ئەهات، بەبلبلی

---

(٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٠٦

(٥) بڕوانە: گوڵدەستەی شوعەرای هاوعەسرم، بەقەڵەمی عەلی کەمال باپیر ئاغا، چاپی یەکەم، لە چاپخانەی (ژیان)ی پیرەمێرد لە سلێمانی چاپ کراوە ١٣٥٨هـ - ١٩٣٩م. لاپەڕە (٤٣) هەمان بیروڕا بەقرتێنراوی لە لاپەڕە (٣٦)، لە (گوڵدەستەی شوعەرای هاوعەسرم) ساڵی ١٩٦٩ لە چاپخانەی ڕاپەرین لە سلێمانی بڵاوکراوەتەوە.

کوردستان ناوبانگی دەرکرد بوو، بەڵام ئێستاکە کە گوڵشەن پەشێوە، کەڵکی بلبلی نەماوە پێوە. هەرچەندە ئێمە بیرمان دابووە شیعری ئەو شاعیرانەی کە نەماون زیندوو بکەینەوە، بەڵام ئەترسین نووسەری ئەم بەشە بەم زووانە بمرێ و کەسێکی تر وەک ئەو نەبێ کە پارچە شیعرێکی «شێخ نووری»مان بێ هەڵە بۆ بنووسێ. لەبەر ئەوە ئەو هەڵبەستەیان نووسی)[٦].

* هەر مامۆستا نەجمەددین مەلا سەبارەت بەشێخ نووری دەڵێ: محەمەد نووری ئەفەندی کوڕی شێخ ساڵحی حاجی شێخ غەنییە و خەڵکی سلێمانییە. مەنەوەرێکی نرخدار و شاعیرێکی عەسری زۆر بەرزە، ساڵی ١٩٢٢م سەرنووسەری ڕۆژنامەی (ڕۆژی کوردستان) بوو کە حکوومەتی کوردستان ئیدارەی ئەکرد. محەمەد نووری ئەفەندی بەکوردی و فارسی و تورکی شیعری وتووە، دیوانی ئەشعاری چاپ نەکراوە، بێجگە لەوەی کە لە ڕۆژنامەکانی کوردستاندا پەراگەندە چاپ کراوە[٧].

* دیسان مامۆستا (نەجمەددین مەلا) یادی شێخ نووری کردووەتەوە و لە نووسینێکی دیکەیدا دەڵێ: (لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا کە شاعیرێک، یان زانایەک، یان پێشەوایەکیان بمرێ، لە دوای خۆی بەهەزاران جار دیوانی شیعر و نووسراو و مێژووی ژیانی بەوێنەی ڕەنگین چاپ ئەکرێ وە پەیکەری بۆ ئەکرێ وە لە پاش بەجێماوەکانی لە (مۆزە- ئەنتیکە خانە)دائەنرێ... وە هەموو ساڵێک لەو ڕۆژەدا کە مردووە کۆبوونەوەیەک ئەکرێ بەناوی یادییەوە، کەچی شاعیر و زاناکانی ئێمە کە مردن وەک بەفری ساڵی پار ئەتوێنەوە و ناوونیشانیان کوێر ئەبێتەوە. سا مەگەر دێوانەیەکی وەک من لەم حوجرە تەنگەدا کە ئەڵێی گۆڕە، جار جارە بەدەم دەردەوە شیعر و سەرگوزشتەیان بنووسێتەوە. لەم دواییەدا «شێخ نووری» لە هونەری شیعر و نیشتمانپەروەریدا گرەوی لە «نامیق کەمال» وە «تۆفیق فیکرەت»ی تورک بردەوە. هەروەها لە ڕۆژی (٢٠)ی کانوونی یەکەمی ١٩٥٨م کۆچی دوایی کرد. نووسەرێک لە لاپەڕەی گۆڤار و ڕۆژنامەیەکدا یادێکی نەکردەوە، پارچە شیعرێکی نەنووسی. ئەمجا لەبەر ئەمە بەپێوستم زانی وێنەکەی لەگەڵ

(٦) ڕۆژنامەی (ژین)ی ژمارە(١٣٨٤)ی ساڵی (٣٣)، پێنجشەممە ١٩٥٨/٣/٦، گۆشەی شیعر و شاعیرەکانمان. (نەجمەددین مەلا)، لەگەڵ بڵاوکردنەوەی شیعری بۆ (یانەی سەرکەوتن). وا دیارە بۆ زانیارییەکانی تریش مامۆستا (نەجمەددین مەلا) پشتی بەهاوڕێیەتی خۆی لەگەڵ شێخ نووری بەستووە.

(٧) دەستنووسی سۆزی نیشتمان، ژمارە ١١٤٥، ساڵی ١٩٤٥ نووسراوەتەوە.

ئەم پارچە شیعرەی بخەمە بەرچاوی خوێنەوارانی خۆشەویست)[8].

* بۆ جارێکی دیکە مامۆستا (نەجمەددین مەلا) دەربارەی( شێخ نووری ) نووسیوە و دەڵێ: (شاعیری شیرین زمان، وە بلبلی چیمەنی نیشتمان، وە سەرنووسەری ڕۆژنامەی (ڕۆژی کوردستان) شێخ نووری شێخ ساڵح کە لە ڕۆژی ١٩٥٨/١٢/٢٠م دوا ڕۆژی خەزان - پایز کۆچی دوایی کرد بەم هۆیەوە بەڕاستی پایەیەکی لە ئەدەبی کوردی وێران کرد و ڕمان. بەس شێخ نووری لە تافی خۆیدا مرۆڤێکی ئەنجوومەن ئارا و ڕووخۆش و هێمن بوو، هەمیشە لایەنگری ئاشتی و برایەتی و ڕێکخستن و بەخۆوە ژیوی و خۆیبوونی ناوخۆیی بوو. وە بە وتار و شیعرە بەسۆزەکانی بۆ مافی گەلی کورد سکاڵای ئەکرد. تەنانەت لە (١٩٢٣/٦/٣)دا جاری سێیەم کە ئینگلیزەکان سلێمانیان داگیر کرد، لە نیشتمانپەروەرەکانی کورد یەکەم کەس شێخ نووری خستە بەندیخانەوە و تووشی چەرمەسەری کرد. شێخ نووری بێجگە لە کوردی، بەتورکی و فارسیش شیعری وتووە. شیعرە دڵدارییەکانیشی هەمووی بەسۆزی نیشتمانەوەیە)[9].

* هاوار لە گۆشەی شیعر و شاعیرەکانمان نووسیویەتی: (لە سەرەتای شەڕی یەکەمی جیهاندا کە وشەی سەربەستی و ئازادی لە ناو گەنج و خوێندەوارەکانی ئەستەمبووڵدا بڵاو ئەبێتەوە و ئەستەمبووڵی ئەوساش سەرچاوەی کردنەوەی خوێندەواری و ڕۆشنبیری بووە بەنسبەت وڵاتی کوردەوارییەوە، هەندێ لە خوێندەوارەکانی ئێمەش بەهۆی بوونیانەوە لە تورکیادا یا لەو ڕۆژنامە و گۆڤار و هەڵبەستانەی کە تاکە تاکە ئەگەیشتنە کوردستان هەستی نەتەوایەتیی جووڵەی تێئەکەوێت و قەڵەم بەدەستی ئەوسا ئەکەونە سەودای کێش و وەزن و جۆرە بابەتێکی نوێ لە شیعر و نووسیندا وەکو لە شیعرەکانی پیرەمێرد و لە هەندێکی زێوەردا دەرئەکەوت، لە پاش ئەمیش عەبدولواحید نووری و نووری شێخ ساڵح کە ئەمانەی دوایی لەوانی پێشوو تازەتر و مێشک و بیروباوەڕ فەریکتر بوون، تەوژمی هەڵبەستەکانیان شۆڕشگێڕتر بوون[10].

* مامۆستا (عەلائەددین سەجادی) لە کتێبی (مێژووی ئەدەبی کوردی)دا دەڵێ: (شێخ

---

(٨) ڕۆژنامەی (ژین)ی ژمارە (١٥١٦)، ساڵی (٣٥)، (١٩٦٠/٣/١٠) وتارێک بەناوونیشانی (یادی شاعیری ئەمر: شێخ نووری شێخ ساڵح) نووسینی مامۆستا (نەجمەددین مەلا). شیعری (شەو) لەو نووسینەدا بڵاوکراوەتەوە.

(٩) بڕوانە ڕۆژنامەی (ژین)، ژمارە (١٥٧٩)، ساڵی (٣٥) ١٩٦٠/١٢/٢٦ وتارێک بەناوونیشانی (یادی شێخ نووری شێخ ساڵح)، نووسینی (نەجمەددین مەلا).

((١٠) ڕۆژنامەی برایی، ژمارە (٣٢٢)ی شەممە ١٩٦٧/٧/٢٧ (شیعر و شاعیرەکانمان) نووسینی هاوار.

نووری ١٨٩٦-١٩٥٨ کوڕی شێخ ساڵح لە سلێمانی هاتۆتە دنیاوە و هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە. یەکێک بووە لە شاعیرە بەرزەکانی شاری سلێمانی و بەیەکێکی هەرە بەدەسەڵات دائەنرێ لە داهێنانی ڕێچکەی تازە لە شیعردا)[11].

* ڕەفیق چالاک لە بارەی شێخ نووری شێخ ساڵح دەڵێ: وا لێرەشدا شێخ نووری شێخ ساڵح-م هاتەوە یاد و بەپێویستی ئەزانم کە بڵێم شێخ نووری نەمر تەنیا هۆنەرێکی باڵا نەبوو، بەڵکو لە ڕیزی یەکەمین هۆنەرە تازەکار و باوەڕ پێشکەوتووەکانی کورد بوو، پێش مامۆستا (گۆران) بوو لەو ڕێڕەوەدا، یەکەمین هۆنەرە کە ئۆپەرێتی داناوە بەهۆنراوە و ئاوازەوە، یەکەمین ئاواز دانەرە بۆ زۆربەی هۆنراوەکانی خۆی. هۆنراوەی مەلاحم لەمەوە دەستی پێ کردووە، پێش ئەحمەد بەگی ساحێبقڕانی نەمر لە سەردەمی تازەدا، دەنگ و ئاوازێک کە بەشێخ نووری-یەوە بوو بەردی ئەکرد بەئاو... دڵدارییە ناکامەکەی ناسۆرە لە جەرگی منا و کە بۆی گێڕامەوە لە شەوێکی دوورودرێژی زستانا و دوو بەدوو لە یانەی فەرمانبەرانی سلێمانی و گۆرانییەکەی (عەزیز)ی برای بۆ وتم، خۆم پێ نەگیرا و منیش گریام و قوڕم پێوا:

لەوێ دیجلە وەکیلی دیدەکەی من بوو
بەلێڵی و سوور
سکووتی خەستەخانەت بوو بەشینی
عائیلەی ڕەنجوور
ئەمە داخێکە جەرگم کون ئەکا تا ڕۆژی
نەفخی صوور
عەزیزم ڕۆ، عەزیزم ڕۆ، عەزیزی ئەونیهالم ڕۆ[12]

* پیرەمێردی نەمر بەم چوارینەیە پایەی (شێخ نووری) دەردەخات و دەڵێ:

شوکری خوا ئەکەم کە لە(نووری) کوژاوەوە
پڕشنگی جوانی شیعر و ئەدەب کەوتە ناوەوە

---

(١١) بڕوانە کتێبی (مێژووی ئەدەبی کوردی)، عەلائەددین سەجادی، چاپی دووەم، چاپخانەی مەعاریف، بەغدا ساڵی ١٩٧١، باخی شاعیران لاپەڕە (٦٠).

(١٢) ڕۆژنامەی برایی، ژمارە (١٢)ی ڕۆژی ١٩٧٢/٨/٢٤، ڕەفیق چالاک: (ئەوەی ئەیزانم لە بارەی هونەرەوە).

نووری! بەنووری ئێوەوە زوڵمەت لەناو ئەچێ
(یارەب)ی! ئەم (ضیا)یە نەبێ قەت بەچاوەوە[13]

* ڕەشید نەجیب-ی هاوڕێی شێخ نووری و یەکێک لە نوێخوازانی شیعری کوردی سەبارەت بەشێخ نووری دەڵێ:

ئەی کێوی بڵند پایە، ئەیا شاخی موعەللا
هەر گاھ کە ئەکەی جەزبی نەزەرگاھی حەزینم
بەم بەرزی یو بەم سەتوەتە ئەی کەژی واڵا
سروە و شنەکەت دەفعی ئەکا ئاھو ئەنینم[14]

ل ٢١

* (شێرکۆ بێکەس)ی شاعیر لە دوای خوێندنەوەی دەستنووسی (گەڵاڕێزان) باری سەرنجی خۆی دەربارەی شیعرەکان و (شێخ نووری) لە شیعری کوردیدا دەربڕیوە:

لەناو سامالی هونەری جوانا
مرواری شیعرت، ئەدرەوشێتەوە
لە کانی بیر و قووڵایی گیانا
زەنگی نەمرییت، ئەزرنگێتەوە[15]

* مامۆستا (شێخ محەمەدی خاڵ) دەربارەی (شێخ نووری) ڕای وایە کە (گۆران و سەلام و قانیع و شێخ نووری، وەک گەنمی قەندەهاری وان، بەهەموو شت ئەبن وە هەرچی بڵێن جوانە)[16].

---

(١٣) ئەم چوارینەیە بەشێوەیەکی تریش هەیە، وا لێرەدا وەک خۆی دەینووسینەوە:

خوا ئەو خودایەیە کە لە نووری کۆژاوەوە
پشکۆی بەسۆزی شیعر و ئەدەب کەوتە ناوەوە
نووری! بە نووری ئێوەوە تاریکی لادەچێ
ئەورۆزی ئێوە، تازەیی دێنێتە ناوەوە

(١٤) ڕەشید نەجیب ١٩٠٦ - ١٩٦٨ ژیان و بەرهەمەکانی، ئامادەکردنی: ئومێد ئاشنا، چاپکردنی دەزگای ئاراس، ل ٢١، ٢٠٠١.

(١٥) ئەم چوارینە لە (١٣/١٢/١٩٦٢)دا نووسراوە و بەدەستنووس دەستم کەوتووە.

(١٦) ڕۆژنامەی (ژین)، ژمارە (٣٤)پێنجشەممە، ڕێکەوتی ١٩٧١/٨/٣ (چاوپێکەوتنێکی ئەدەبی لەگەڵ مامۆستا (شێخ محەمەدی خاڵ)).

* ( حەسیب قەرەداخی) شاعیر دەربارەی بزووتنەوەی نوێخوازی لەسەر دەستی(گۆران) و (شێخ نووری) دەڵێ: (نکوڵی لەوەدا نییە دوای حەزرەتی نالی و هاوڕێکانی بۆ ماوەیەکی درێژ شیعری کوردی بەجێما لە کاروانی ڕێگرتوو، ئەویش بەهۆی ئەو دەرفەتە ناهەموارانەوە بوو کە گەلی کوردی پێدا ڕۆیشت، بەڵام دوای دەرکەوتنی شێخ نووری شێخ ساڵح و هەڵکەوتنی گۆرانی نەمر، شیعری کوردی ڕێگەی نوێی گرتەبەر. لەم بوارەشدا گەلێ شاعیری تر بەشداری پێشخستنی کاروانی شیعری کوردییان کردووە)(١٧).

* ڕۆژنامەی(بیری نوێ) لە کورتە وتارێکدا بەناوی (بیرەوەری شێخ نووری شێخ ساڵح) دەڵێ: (شێخ نووری شێخ ساڵح دەنگێکی نوێ و شاعیرێکی پێشکەوتنخوازی گەلی کوردە و خاوەنی دەورێکی دیارە لە پەیڕەوکردنی نوێخوازی لە ئەدەبی کوردا. ئەو شاعیرەیە کە عەبدوڵڵا گۆرانی نەمر بەماموستا و ڕێچکەشکێنی دادەنێ لە جووڵانەوەی شیعر و نوێکردنەوەی شیعری کوردیدا)(١٨)

* ڕۆژنامەی بڕوا لە کورتە نووسینێکیدا بەم جۆرە ڕێز و خۆشەویستی خۆی بەرامبەر بەشێخ نووری دەربڕیوە: (لە ڕۆژی ١٩٥٨/١٢/٢٠دا شاعیری ڕێچکەشکێنی شیعری نوێی کوردی ماموستا شێخ نووری شێخ ساڵح لە گردەکەی (سەیوان) بوو بە میوانی (مستەفا پاشا) و (بێکەس) بەرامبەر پیرەمێرد یەک بەدوای یەک شاعیران و گەورە پیاوان و زانا و دانا بەئاواتی تاساوەوە سەر ئەنێنەوە و داخ و زووخاو پاش مردن و دوای مردن سەر ئەکا.)(١٩)

* ئەژی گۆران دەڵێ: (ئەدەبی تازەی کوردی لەسەر دەستی شێخ نووری نەمردا، یەکەم هەنگاوی ئەوە بوو، کێشە عەرووزیەکانی ڕەت کردەوە و هیجای لە فۆلکلۆری کوردییەوە هێنایە کایە، ئەمە لە لایەکەوە ڕەسەنایەتییە و لە لایەکەیشەوە خاڵی نییە لە تاقیکردنەوەی دەوروبەر)(٢٠).

---

(١٧) بڕوانە: گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (٤)ی کانوونی دووەم ١٩٨٣ ل ٨١ چاوپێکەوتنێ لەگەڵ (حەسیب قەرەداخی).

(١٨) ڕۆژنامەی بیری نوێ، ژمارە (٢٢١)، ١٩٧٦/١٢/٢٥ وتارێک بەناوی : (بیرەوەری شێخ نووری شێخ ساڵح).

(١٩) ڕۆژنامەی بڕوا، ژمارە(١٧)ی ساڵی (١) ڕێکەوتی ١٩٦٠/١٢/٢٤ وتارێک بەناوی: (بژی یادی دووەم ساڵەی کۆچی شاعیری ڕێچکەشکێن شێخ نووری شێخ ساڵح ١٨٩٦ - ١٩٥٨).

(٢٠) گۆڤاری بەیان: ژمارە (١٧)ی نیسان و مایسی ١٩٨١ وتارێک بەناوی (شێخ نووری شێخ ساڵح و چەند بیروڕا و سەرنجێکی ڕەخنەگرانە)، ئەژی گۆران.

ئەڑی گۆران ل٧٧ دیسان دەربارەی (شێخ نووری) و (گۆران) ڕایەکی دی دەردەبڕێ و دەڵێ: (خۆم لە میانی شیعری کوردیدا، لە بەرامبەر دەیان لوتکەی وەک خانی - مەولەوی - حاجی قادر - نالی - سالم - شێخ ڕەزا - حەمدی - ئەحمەد موختار - پیرەمێرد - شێخ نووری - گۆران - بێ کەس و دڵدارا ئەبینم. مەیانیش لەم بنارەدا ئەوەندە فراوانە کە دەیان لوتکەی تازەی پێیا هەڵچێ، بۆیە دەڵێم: (شێخ نووری) و (گۆران) دوو لوتکەن لە زنجیرە شاخێکدا ڕوخساری تایبەتی و کەسییەکانیان، بەهێمای تایبەتی و کەسی خوێنەر جیا دەکرێنەوە، بەپێی ماوەی مێژوویی...)[٢١].

* (کاکەی فەللاح) دەربارەی تازەکردنەوەی شیعری کوردی دەنووسێ و چەند شتێک دەستنیشان دەکات بەلای منەوە لە دەستنیشان کردنەکەیدا نیشانی پێکاوە و تا ڕادەیەکی زۆر قسەکەی جێی خۆی دەکاتەوە، لە بۆچوونەکەیدا دەڵێ: (پێش ئەم جموجووڵە ئەدەبییە ( واتە جموجووڵی ئەدەبی تازە) شیعری کوردی لە بۆتەی شیعری کلاسیکیدا قاڵ بوو بوو، کێشی عەرووز و قاڵبی غەزەل و قەسیدە و ڕوباعیات و تاک و موعەمما و لاواندنەوە و پیاهەڵدان و داشۆرین و بابەتی ئاینیی و تەرجیع بەند (خەیاڵبازی و وشەکاریی)[٢٢]

---

(٢١) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٧٣

(٢٢) ڕاستە وەک کاکەی فەللاح بۆی چووە (کێشی عەرووز و پیاهەڵدان و داشۆرین و بابەتی ئایینی و تەرجیع بەند) سیمای شیعری کلاسیکی بوون، بەڵام لە مەسەلەی (خەیاڵبازی) و (وشەکاری)یەکەدا لەگەڵیدا نیم، چونکە مەسەلەی (خەیاڵ) ڕەگەزێکی سەرەکی هەموو داهێنان و خوڵقاندنێکە. جگە لەوەش (خەیاڵ) لە بزووتنەوەی شیعری تازە بەلاوە نەنراوە و سیمایەک نییە بەهۆیەوە شیعری کلاسیکی پێ بناسرێتەوە، بەڵکو لە شیعری تازەشدا (خەیاڵ) دەورێکی باڵای هەبووە لە تێکەڵ کردنی بەواقیع و دەوڵەمەند کردنی واقیعەکە بەهۆیەوە. ڕەنگە مەبەستی (موبالەغە = پێ لێ هەڵبڕین) بێ کە ئەمە سیفەتێکە زیاتر لە شیعری کلاسیکیدا بەدی دەکرێ نەک (خەیاڵبازی). (وشەکاری)یش سیفەتێک نییە تەنیا بەسەر شیعری کلاسیکیدا بڕا بێ، چونکە وەک چۆن لە لای شاعیرێکی گەورە و زمانزانی وەک (نالی) وشەکاری دەبینین، هەر بەم جۆرە لە لای شاعیرێکی ئەمڕۆکەش وشەکاری هەیە. حەز ناکەم خوێنەر وا تێبگا (وشەکاری) سیفەتێکی خراپە لە شیعردا، چونکە وشەکاری سەواکردنە لەگەڵ گیانی وشە و تۆڕ هەڵدانە بۆ گرتنی سێبەری وشە و نهێنییەکانی. وشەکاری لەلای (نالی) زەخرەفە نەبووە، کە زوبدەی شیعری کلاسیکی کوردییە. لە شیعری تازەشدا وشەکاری ئەرکی هەموو شاعیرێکی داهێنەرە. پێویستە بەبینینێکی تازەوە بەدوای ئەو وشەیەدا بگەڕێ و تەعبیر لە دیدگای ئەو بکات، کە (خەیاڵ) لێواولێوە لە تێڕوانین - ڕۆیة، بۆیە بەدوای ئەو وشەیەدا دەگەڕێ کە پڕ بەپڕی هەست و هەڵچوون و ئیقاعی ناوەوە و دەرەوە و =

هەر بەیتێ واتایەک و جوونەوەی یەک جۆر دەربڕین و کەرەستەی تێکڕا چوون یەک و زۆرتر بەقەد و باڵای یاراو تێگەیشتنی گران و بەکارهێنانی لق و پەلەکانی بەلاغەو هتد... سیمای یەککگرتووی شیعری کلاسیکی بوون... بێگومان پێشەوایانی وەک (نالی ١٧٩٧ - ١٨٥٥) و (سالم ١٨٠٠ - ١٨٦٦) و (مەحوی ١٨٣٠ - ١٩٠٤) و (کوردی ١٨٠٩ - ١٨٤٩) مامۆستایانی دیار و لێهاتووی ئەو قوتابخانە کلاسیکییەی دەوری بابان بوون و ئەرکی خۆیان بەجێ گەیاند و بنچینەی نووسینی شیعر بەو لەهجەیەیان بەرزکردەوە. ئەدەبیش کە شیعر لەو دەمەدا بەرزترین لقی دیار و بەدەرەوەی بوو، وەک هەر ڕواڵەتێکی تری ژیان، هەمیشە لە پێشکەوتن و جووڵە و گۆڕان دایە، جا بەو پێیەش کە ئەدەب و سەرجەم ژیانی ڕۆشنبیریی هەر نەتەوە و میللەتێک، ڕەنگدانەوەی باری ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسییە و ئەمانەش هەمیشە لە پێشکەوتن و گۆڕاندان. ئەو سەردەمە لافاوی شەڕی یەکەمی جیهان تازە نیشتبووەوە، دەنگی چەند دەوڵەتێکی گەورە کپ کرا بوو، زۆر پەیوەندی نێوان دەوڵەتان گۆڕا بوو. لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیشدا ڕاپەڕینی تازەی نەتەوایەتیی تورکەکان و باری ئەدەبی سەردەمیان لە ژێر زەبری ڕۆژئاوادا لە شەپۆلدانا بوو، باری سیاسی و کۆمەڵایەتی ئەم سەردەمەی کوردیش، لە سایەی ڕاپەڕینەکانی شێخ مەحموود و ناکۆکییەکانی نێوان ئینگلیزەکان و تورکەکان و سیاسەتی بەناو بۆ ئازادی و سەربەخۆیی و بەناوەڕۆک بۆ دەست بەسەرداگرتن و چەوساندنەوە لەلایەن داگیرکەرە ئینگلیزەکانەوە. بەڵێ لە گەرمەی ئەو دارو بارە تازانەدا ڕۆشنبیرە هونەرمەندەکانی ئەو سەردەمەی کورد لە کوردستانی عێراقدا، کە هەر یەکەیان لە ڕاست خۆیەوە خاوەن سەرمایەیەکی ئەدەبی پتەو بوو، تاسە و تامەزرۆی بەهرە و سەلیقە و چێژی هونەرییان بەو چەشنە شیعرە کلاسیکیانە نەدەشکا و بەدڵ تێنووی شێوە و ناوەڕۆکێکی سەردەم بوون، تا ئەوە بوو وەک حەوتەوانەیەک چەند شاعیرێکی بەهرەدار لەسەر ئەو ڕێبازی سەردەمە یەک کەوتن لە ڕێگای:

=تێڕوانینەکانی بێت. وشەیەک بێ پڕ بێ لە (ئیما) و ئاهەنگ و سەرلەنوێ بیتەقێنیتەوە بەرووی وشە دراوسێکانی خۆی. یەکێک لە ئەرکەکانی داهێنەر چ سەر بەڕێبازی کلاسیکی بێت، چ سەر بەڕێبازێکی تر بێت، تازەکردنەوەی زمانی نەتەوەیە، تەنیا شاعیری زمانزان و بەتوانست و دەسەڵات دەتوانێ یاری بە وشە بکات. شاعیری کۆڵەوار و داماوی دەستی وشە ناتوانێ زەفەر بەوشە ببات بۆ تێڕوانینەکانی خۆی وشەی گونجاو هەڵبژێرێ. ئەوانەش کە بەزۆر خۆیان بەسەر شیعردا ساغ کردووەتەوە سەوا لەگەڵ توێکڵی وشە دەکەن، بۆیە شیعرەکانیان زوو دەمرن و ناتوانن خۆیان بەپێوە ڕابگرن.

١- زانین و هەزم کردنی تەواوی بەرهەمی کلاسیکی پێش خۆیان.
٢- زانینی زمانی فارسی و بەتایبەتی بۆ ئەو هەنگاوە گەورەیە زمانی تورکی، کەوتنە سەر ئەو خولیایەی کە بێن بنێن بەسەرچاوەی ئەدەبی سەردەمی تورکەکانەوە، ئینجا هەر شاعیرێ، بەپێی بەهرە و توانا و باری ژیانی خۆی و پلەی ڕۆشنبیری و ئامادەبوونی کەوتە بەرهەم داهێنان. لەو سەردەمەدا (هەنگاوی یەکەم لەو بارەیەوە لاسایی کردنەوەی شیعری نوێی تورکی بوو)[٢٣] شێخ نووری کوڕی شێخ سالح-یش، لەبەرئەوەی بەتەمەن لە (گۆران) گەورەتر و لەگەڵ باری ژیانی ڕۆژنامەگەری ئەو ڕۆژگارەی کوردیشدا پەیوەندی ڕاستەوخۆ و لەباری بەڕۆژنامەوە هەبوو، بەرهەمەکانی زۆرتر بڵاو کردەوە و ئاووهەوا ئەدەبییەکەیشی سازگارتر بوو، بۆیە لەو سەردەمەدا هەنگاوی یەکەمی گۆڕین و بەرەو پێشەوە چوون بەرەو شیعری تورکەکان زیاتر بەکنە و تەقەلای ئەدەبی شێخ نووری دەدرێتەوە قەڵەم و ئەو دەرکەوتووتر دەبینرا لە حەوتەوانەکە.

هەر چۆنێک بێت، ئەو دەستە لاوە بەهرەدارە توانییان لە ژێر زەبری شیعری نوێی تورکیدا چەند گوژمێک خوێنی تازەکردنەوە لە ڕووی کێش و دەربڕین و واتا و هەست و بیر و وشەی کوردییەوە بەدەمارە ساردوسڕەکانی شیعری کوردیی ببەخشن و گەرمایی جووڵە و داهێنان و گۆڕان و پێشکەوتنی بدەنێ.)[٢٤].

* مامۆستا (محەمەد ڕەسووڵ هاوار) لە کتێبی (پیرەمێردی نەمر)دا دەربارەی (شێخ نووری شێخ سالح) ڕای خۆی بەم جۆرە دەربڕیوە و دەڵێ: (شێخ نووری شێخ سالح بەیەکێک لە پێشەوای بوێژەکانی ڕۆمانتیکی کورد ئەژمێردرێ کە بەهۆی هەڵبەستەکانیەوە چ لە ناوەرۆک و چ لە شێوەدا شۆڕشێکی ناوەتەوە و دەرگایەکی تایبەتی کردۆتەوە بۆ بوێژانی ئەو سەردەمە.)[٢٥]

* لە کتێبی (باخچەی شاعیران) دەربارەی شێخ نووری نووسیویانە: (شێخ نووری بەیەکێک لە بوێژە پێشکەوتووە تازەکەرەوەکان (مجدد) لە ئەدەبی کوردیدا ئەژمێردرێ و خاوەنی قوتابخانەی هەڵبەستی نوێیەو ئەو ڕێگەیەی ئەم شکاندی، تەنانەت گۆران و

---

(٢٣) ئەم ڕایە، ڕای مامۆستا (ڕەفیق حیلمی)یەو لە شوێنی خۆیدا موناقەشەم کردووە.

(٢٤) بڕوانە کتێبی: کاروانی شیعری نوێی کوردی، کاکەی فەللاح، بەرگی یەکەم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا ١٩٧٨، ل٢٧-٢٨-٢٩

(٢٥) پیرەمێردی نەمر: نووسینی محەمەد ڕەسووڵ (هاوار)، چاپخانەی (العاني)، بەغدا، ١٩٧٠ ل٤١ پەراوێزەکەی.

هەمــوو بوێژە لاوەکـانی تر لەسـەری ئەڕۆن...)[٢٦] ئینجـا لە شـوێنێکی دیکەدا دەڵێن: (گۆران بەشوێن پێنووسی شێخ نووریدا ڕۆیشـتوو ئەو قـوتابخـانەی هەڵبـەستی نوێی لە وێژەی کـوردیدا دامـەزراند، هەڵبـەسـتی تازەی کردە بـاو. ئەم پەرەی پێ دا و گـەشـەی پێ کـرد. لە هەمـوو ڕوویێکەوە قـاپی هەڵبـەستی نوێی لە وێژەی کـوردی کردەوە و هـانی بوێژە لاوەکـانی دا کـە پەیڕەوی بکەن. کـەواتە ئەتوانین بڵـێین کـە وێژەی کـوردی بۆ یەکـەم جـار قــەرزاری شــێخ نووری و دوای ئەو هی گــۆرانە کــە شــێــوەی هەڵبــەســتی نوێی پێ بەخشی)[٢٧].

* مامۆستا ڕەمزی مەلامارف دەربارەی شێخ نووری دەڵێ:

ئەی خۆشەویستی قەومی جەفاکێشی دەس بەسەر
وەی نووری چاوی کــوردی ســیــاڕۆژی دەربەدەر
ئەی بولبـولی بە شـەوکـەتی باخی سـوخـەن وەری
وەی گــوڵبــونی بەزینەتی گــوڵزاری زیب و فــەڕ
ئەی شـاعـیـری بەقـودرەتی مـەیدانی نەزم و نەسـر
وەی کــاتبی بە هەیبــەتی ســەرکــورسی هونەر[٢٨]

* مـامۆسـتـا (عـەلائەددین سـەجـادی) دیسانەوە دەربارەی (شـێخ نووری) دەڵێ: (شـێخ نووری کـوڕی شـێخ سـاڵحی کـوڕی شـێخ غـەنی-یە، لە شـاری سلێـمـانی هاتۆتە دنیـاوە، ئەتوانرێ بوترێ، ئەو ڕێبازی تازەی هێنایە ناو ئەدەبی زمانی کوردی-یەوە، فیکری بەرز و ورد بوو، زەینێکی قـووڵی بووە، ئێـمـە کـارمـان بەوەوە نییـە کـە چەوسـانەوەی ڕۆژگـار نەیهێشتـووە لەسەر هۆنەری - وەکو هۆنەرەکانی تر - بڕوا. مەبەستەکەی ئێمە ئەوەیە کە بەرهەمی شێخ نووری لەناو دەقی ئەدەبی هۆنراوەی کوردیدا شوێنێک لەم سەردەمە بۆ خۆی تەرخان ئەکا) دیسانەوە دەڵێ: (لەم سەردەمەی دواییەدا لەناو هۆنەرانی کورددا ڕێبازێکی تازەی پەیدا کـردبوو کـە ڕێبـازێکی نوێ بوو، نوێ بـوو لە بیـر و ئەندێشــەدا، لە کـێش و سەروادا، ئەمـانە بوون بەقوتابی قـوتابخـانەیەک کە ئەم قوتابخـانەیە شۆڕشێکی خستە ناو

---

(٢٦) باخچەی شاعـیران، عـەبدولعـەزیم مـاوەتی، عـەبدولقـادر سـاڵح، چاپخانەی ژین، سلێمانی سـاڵی ١٩٧٠ ل١٠١.

(٢٧) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٠٤

(٢٨) ڕۆژنامـەی (ژین)ی ژمـارە (٥٦)ی سـاڵی (١٥)، (١٧)ی کـانوونی یەکـەم ١٩٤١، بۆ هاوار و حەسەب حاڵی شێخ نووری، محەمەد ڕەمزی.

گیتیی ئەدەبی کوردییەوە، یەکێک لەو قوتابییە زیرەکانە شێخ نووری خاوەنی پارچەی خوێنراو بوو،[29] بەڵکو پێشەنگی ئەو کاروانە بوو) پاشان لەسەر قسەکانی بەردەوام دەبێ و دەڵێ: (جا ئەم گۆڕانە کە شێخ نووری هێنایە ناوەوە، ئایا هەر لە بۆتەی دڵی خۆیا قاڵی کردبێتەوە؟ یا بۆنی هەناسەی «نامق کمال» و «تۆفیق فیکرەت»ی[30] کردبێ؟ ئەو توانی ڕێبازێکی نوێ لەناو ئەدەبی کوردیدا دیاری بکات).

* (د. مارف خەزنەدار)یش دەربارەی شێخ نووری بەو جۆرە ڕای خۆی دەربڕیوە: (لە پلەی دووەمدا نەوەکو تەنیا ناوەڕۆک، بەڵکو ڕوخساریش گۆڕانی بەسەردا هاتووە، بەتایبەتی زمانی شیعر. شیعرەکانی نەوەی لاوی ئەم ماوەیە گۆران و بێکەس و دڵدار و شێخ نووری شێخ ساڵح و هی تر نموونەی شیعری ئەم سەردەمەن لەگۆڕانی ئەدەبی کوردی)[31].

لە بارەی ماوەی ڕۆمانتیکیش ڕای وایە: (ڕێڕەوی ڕۆمانتیکی لە پاش جەنگی جیهانی یەکەم لەژێر تەئسیری ڕۆمانتیکی ئەوروپا و لە ڕێی ڕۆمانتیکەکانی تورکەوە لە ئەدەبی کوردیدا پەیدا بوو، لە ناوەڕاستی چلەکان تا سەرەتای شەستەکان توانی لە قاڵبدا تا ڕادەیەک بمەیێ و خۆی بگرێ. دامەزرێنەرانی ئەم ڕێڕەوە شاعیرە ناودارەکانی وەکو پیرەمێرد و بێکەس و گۆران و سەلام و نووری شێخ ساڵح و دڵدار و هی تربوون. بەڵام لە بەرهەمی ئەمانە ڕۆمانتیزم وەکو مەبەستێک بوو لە مەبەستەکانی شیعریان و هەموو بەرهەمیانی داگیر نەکردبوو[32]).

* مامۆستا (کامەران موکری) دەربارەی نوێکردنەوەکەی شێخ نووری نووسیویە: (بەلای منەوە مامۆستا شێخ نووری شێخ ساڵح مامۆستای ماوەی گوێزانەوەیە (فترة الأنتقال) لە هۆنراوەی کوردیدا، لە کۆنەوە بۆ نوێ... وە کە ئەڵێم نوێ، یان کات و سەرەتای دەرکەوتنی هۆنراوەی (نوێ) مەرامم دەوروبەری کۆتایی شەڕی جیهانگیری یەکەمە. لە کاتێکدا کە هۆنراوەی کوردی لە کۆتی (شێوە و هەستی کۆنا) بوو، ئەو و مامۆستا گۆران شۆڕشێکی قووڵیان لە هۆنراوەی کوردیدا بەرپا کرد. ئەگەرچی زۆر کەسیش ئەم شۆڕشەی بەلاوە

---

(٢٩) مەبەستی ئەو شیعرەیە کە بۆ کۆچی دوایی شێخ مەحموودی نەمری وتووە.

(٣٠) بڕوانە دەقەکانی ئەدەبی کوردی، عەلائەددین سەجادی، لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، ١٩٧٨، بەغدا ل١٠٥-١٠٦-١٠٧-١٠٨

(٣١) بڕوانە: د. مارف خەزنەدار، لە بابەت مێژووی ئەدەبی کوردی تازەوە، مۆسکۆ، ١٩٦٧ (بەزمانی ڕووسی). خۆی بۆی کردم بەکوردی. ل٩٦

(٣٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٤٧

(یاخیبوونێکی نارەوا بوو) دەربارەی هۆنراوەی کوردی، بەڵام لە ئەنجاما بەتایبەتی لەم ساڵانەی دواییدا دەرکەوت کە شۆڕشێک بوو پڕ بەپڕی (واقع و پێویستی) لەگەڵ هەموو کەموکوڕیەکیشا.)[٣٣] پاشان دەڵێ: (بەڵێ ماموٚستا شێخ نووری شۆڕشێکی گەورەی بەرپا کرد یان بەوردی بڵێین سەرکردەیەتی شۆڕشێکی ئەدەبی کرد لەگەڵ ماموٚستا گۆران و نووسەر و شاعیرە نوێ کەرەوەکانی ترا...)[٣٤].

* ماموٚستا (أ. ب. هەوری) دەربارەی شێخ نووری دەڵێ: (جارێ لە پێش هەموو شتێکدا ڕەوشت و خوو هەڵسان و ڕابواردنی لە ژیاندا بەقەد بەرزی شیعرەکانی جوان و بەرز و بێ لەکە و پەڵە بووە. هەرگیز خۆی بەهۆنراوەکانیەوە هەڵ نەکێشاوە و بۆ سوودی تایبەتی خۆی و ناوبانگ بڵاوبوونەوە بەکاری نەهێناون. ڕیا و دوو ڕوویی لێ نەبینراوە، بۆ پارە و دەسکەوت فرمانی نارەوای نەکردووە و گوفتار و هۆنراوەی نەوتووە، ئەو هەر لەبەر شیعر شیعری وتووە. لەسەر هێڵێکی ڕاست لە خۆشی و ناخۆشی و بوون و نەبوون و هات و نەهاتدا و، لە تەنگانە و فەرەحیدا، لە تاریکی و ڕووناکیدا هەر لەگەڵ میللەتی کوردا بووە، بەگریانیان گریاوە و بەخۆشیان پێکەنیوە و، هەوێنی مەیینی شیعری شێخ نووری بەرژەوەندی نەتەوەی کورد بووە، بۆیە هەموو هۆنراوەکانی لە هەر بابەتێکەوە بێت بەرامبەر بەکورد لە سۆزێکی دڵسۆزانە بەدوور نییەو خۆی وا نیشان ئەدات کە غەمخواری نەتەوەکەی خۆیەتی. شێخ نووری یەکێکە لەو هۆنەرانەی کە بەردی بنچینەی گۆڕانی هۆنراوەی کوردییان داناوە بەرەو پێش پاڵیان پێوە ناوە، بەهۆنراوە لە دەروازەی هەموو گۆشەیەکی ژیانی داوە، بەرامبەر بەئازادی ئافرەت بیروڕای سەربەستانەی زۆر بەرز و باش نیشان داوە، هەرچەندە هۆنراوەکانی شێخ نووری چاپ نەکراوە لەگەڵ ئەوەشدا، چونکە بەڕاستی شیعرن و خۆشی پیاوێکی ڕەوشت و خوو بەرز بووە، بەڕەنگێک بڵاوبوونەتەوە مەگەر بەدەگمەن ئەگینا خوێندەوار نییە شیعری ئەوی لەبەر نەبێت، کە ئەمەش جوانترین و گرنگترین بەڵگەیە بۆ ئەمانەی لە پێشەوە وتمان لە بابەت شێخ نووری-یەوە)[٣٥].

(٣٣) بڕوانە: هۆنراوەی نووری شێخ ساڵح، چاپخانەی کامەران، ١٩٥٨، سلێمانی، پێشەکییەکەی لە نووسینی کامەران موکری ل ٣.

(٣٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٤

(٣٥) بڕوانە: ڕۆژنامەی (ژین)ی ژمارە (٣)ی ساڵی(١). ڕۆژی پێنج شەممە، ڕێکەوتی ٢٨/١٢/١٩٧٠، أ. ب. هەوری.

(*) تێبینی: زۆر نووسینی تر هەن دەربارەی شێخ نووری نووسراون، بەڵام یان زانیاری نوێیان تێدا نەبوو، یان تەنیا ئاماژەن بۆیە پشتگوێم خستن، ئێمەش دیارترینی ئەو نووسینانەمان وەرگرتووە.

## مەقبەر[1]

شیعری: عەبدولحەق حامید[2]

هاوار من چیبکەم، نە جێ ما، نە یار
هەر دڵ مـــــایەوە، پڕ دەرد و ئـازار
ئێـسـتـا لێـرە بوو، لە دەسـتم بەربوو
لـە ئـەزەلـەوە، هـات بـۆ ئـەبـەد چـوو
ڕۆیشـتم ئەوم، جێ هێـشت لە خـاکـا
لە گۆڕی تاریک، تەنگ و غـەمناکـا
لەو ئـەنیـسـەی دڵ، ئاسـاری نەمـا
لە (بەیرووت) غەیری، مەزاری نەما
کـــــوێی بۆ بگـەڕێم، ئەو دڵڕوبـایە
لـە کێ بـپـــــــرسم، ئەو بـێ نەوایـە
ئاخـــۆ ڕۆحی وا، بە کــــام هەردەوە
وا منی خــســـتــە، ئێش و دەردەوە
ئـەڵـێـن واز بـێـنـە، لـەو ئـاشـنـایـە[3]
ڕۆیشت و جــێگای داری بەقـــایە

---

(١) (مەقـبەر)ی مەشهـووری شاعـیری تورکی بەناوبانگ (عەبدولحەق حامـید) کە بە (٣٦) زوبان تەرجەمە کراوە، منیش بەعـزێکم دەست کەوت کـە (عـەرەب فـەهمی) بەعـەرەبی بە نەثر تەرجـەمەی کردووە و بەکوردی و بەنەزم تەرجەمەم کرد - شێخ نووری شێخ ساڵح -.

(٢) عـەبدولحـەق حـامـیـد: (١٨٥٣-١٩٣٧) لە ئەسـتـەمـبـووڵ لە دایک بووە و هەر لەوێش کـۆچی دوایکردووە. شاعیر و نووسەر و سیاسیی تورکی ناودارە، لە بنەماڵەیەکی ناوداری زانست و ئەدەبە. شیعرەکانی ڕۆمانتیکیانە و شێوەی تازەی وەرگرتووە. یەکێکە لەو شاعیرانەی کە بەشدارییان لە تازە کردنەوەی ئەدەبی تورکیدا کردووە. بەناوبانگترین شیعری ئەو ماتەمنامە ڕۆمانتیکیانەیە کە بەناوی «مـەقـبـەر» بۆ فـاتمەی خـێزانی وتووە. ئەم بەرهەمـە لە مـاتـەمنامـە گـرنگەکـانی ئـەدەبی جیـهـانیی دەژمێردرێ. بەرهەمی «مەقبەر = مقبر» لەلایەن فەهمی عـەرەب ئاغـاوە لە تورکییەوە گۆڕیویەتییە سەر عەرەبی و لە بەغدا لە ساڵی ١٩٥٣ دا بڵاوکراوەتەوە.

(٣) پێویستە لەکاتی خوێندنەوەدا دان بە (ئاشنا)دا بنرێ، ئەگینا لەنگ دەبێ.

ئەمە ڕاستییەکە، لە خەیاڵ جیایە
چاو چۆن ببینێ، ئەم ماجەرایە
لەپڕ وا گۆڕا، وەزع و ئەحواڵم
تەحەممول ناکا، فکر و خەیاڵم
شتێک ئەبینم، لە مەزار ئەچێ
کە ورد ئەڕوانم، هەر لەیار ئەچێ
شەوانم ئەڕوا، بەئازار و غەم
ڕۆژان زیاد ئەکا، سەرمایەی ماتەم
لە زوربەی خەفەت، زۆری مەلالم
وا دیارە زوو بێ، ڕۆژی زەوالم

***

فاتمە! لە مەزار، سەرێ دەربێنە
ڕەنگی جارانت، تۆزێ بنوێنە
لێم مەشارەوە، گەوهەری ڕازت
ڕۆح چاوەڕوانە، بۆ غەمزە و نازت
وەک غونچەی بەهار، وەرە پێکەنین
تیمار کە ئێش و ئازاری برین
پێکەنین تێکەڵ، نیو نیگای چاو کە
ئاخری ژیانم، بەوە تەواو کە
یاران! ئەم جێیە، ناشێ مەقبەر بێ
ناشێ ئەم چاڵە، یانەی دولبەر بێ
یا بۆ تەجرەبە، یا بۆ حیلەیە
نەخێر بۆ مەرگی من وەسیلەیە
بڕوانن کە چۆن، بە بایەکی سەرد
ئەو ڕوومەتەی بوو، بە کارەبای زەرد
لە بەختی ڕەشم، هەزار لەعنەت بێ
پیشەم تا مەحشەر، ئاهو حەسرەت بێ

***

خودا موعجیزەت، بۆ من عەیان کە
بەگەورەیی خۆت، من ئیمتیحان کە
ببینم هەڵبێ، ئەو مانگە لە خاک
لەخاک سەر دەرکا، شوعلەی نووری پاک
مەبەس لە ژیان، چییە بەیان کە
دوارۆژی ئینسان بۆ من عەیان کە
یا فکرم بۆ لای ڕۆحی بنێرە
یا ڕۆحی منیش، بەخاک بسپێرە
خەم دڵی گرتم، لە دەس چوو چارە
لە وەتەن دوور و زار و ئاوارە
لەم غوربەتەدا، بەئالامەوە
بە ئامالی ئەو، هەروا مامەوە
لە ئوفقم ئەو مەه، ڕوخسارە ڕۆیی
ڕووەو تاریکی و، ئاوارە ڕۆیی
ڕوویم دی بەڵام، وەک زولمەت پارە
مەتڵەعی فەجری، بوو بە ستارە
ڕوویم دی لەناو، مەوجەی تورابا
گەڕام زۆر گەڕام، لەناو کیتابا
وەکو خەو هاتە، بەرچاوم لە دوور
ناتوانم بڵێم، گۆڕی پڕ لە نوور
ئەم سفرە چییە، لە حیسابایە
ئەرقام بۆی لەناو، ئینقیلابایە
هیچە و خاوەنی، وجوودە یا خۆ
قەبرێکە لەناو (اضطراب)ایە

***

هەر بیدیایە، سپی یا سیاه
جوان و ناشیرین، لێی نەکرد ئیکراه

مـەیلی سـەیران و سـەحـرای نەمـا بوو
ئارەزووی دەشت و چیـــای نـەمـــا بـوو
ڕێبـــواری ڕێگای، شـــاری عـــەدەم بـوو
خـولیـــای نەمـــانی، لا خـــاتر جـەم بوو
هیـــلاک بـوو لەناو، پەنجـــەی وەرەمـــدا
لە لای من دایم، خـــەندەی لە دەمـــدا
ســـاتێکی دووریم، لە ســوحـبـــەتی ئەو
زوخـــاوی دڵ بوو، لە حــــەســـرەتی ئەو
فـــــیـــــــراقی ئەوم، نـەبوو تـەئەممول
کـــەچی تا ئەبەد، کــــردم تەحـــەممول
مــــایەوە گــــیـــــانم، بە عــــیـللەتەوە
زەبوون و زامـــــــار، بە حـــــەســــرەتەوە
ئەیزانی چۆنە، عـــــــەزابی قـــــەبرم
بیــــــدیایە حـــــاڵم، لە جـــــەننەتەوە
یـاریّ بوو بـەبێ، دوژمـن و ڕەقـــــــیب
بـۆ ئـازاری دڵ، دەرمــــــــان و تـەبیب
هەرچەند نەمـــاوە، عــــیـــلاجم لای ئەو
بەڵام تا ئەمــرم، ئـیـــحــــتــیـــاجم بەو
بۆچ وا ئەنێـــژرێ، لێـــرە غــــەریبـــان؟
غــەریبــان ئەبێ، وا بێ نەســیـبــیــان؟
کـــاشکی پێش ئەو بوومـــایە بە خـــاک
نەمـــدیایە بنوێ، لە خـــاکـــا غـــەمناک
تا ئەهات ڕەنگی، زەرد وەک کــــارەبا
ئەدرەوشـــایەوە، وەک ڕۆژ لە ســـەمـــا
بە دایم ژیـانـی پڕ لـە خـــــــەتـەر بـوو
شـــەو و ڕۆژ، دڵـی پڕ لە کــــەدەر بوو
ئـازاری دڵـەی، زار و زامــــــــــاری

لێ ئەشــاردمــەوە، بە خــەندەی زاری
لە ڕووی عــالـەمـا، دایم شــادان بوو
وەکی تر چاوی، کــەیلی گــریان بوو
نـەک بۆ مـن ببێ، بەدەردی کـــاری
سکاڵام نەبیـــست، لە دەست ئازاری
بەم حاڵەی دڵم، مات و مەحزوون بوو
بەم وەزعـەی ڕۆحم، زار و مەفتوون بوو
مـەقـبـەر دوا ڕۆژی، هەمـوو ئینسـانە
ئەمـــەش ئەســـراری، زاتـی یەزدانە
بیــەوێ مـەیلی، خـەو کـا نووری پاک
ئەیبا ئەیخاتە، دووتوێی نەختێ خاک
ئەمـە ڕاستـیـیـەکی، خۆش و حـەزینە
شـتـــێکی ڕاســتی پڕ لە یەقـــینە
بەدبەخت و مـەسـعـوود، کـە دانراوە
ئــەوەیـــە بــە تـــۆ، ڕەوا بـــیـــنـــراوە
ئەو نەختـە خـۆڵەی، سـەر ئەو مـەزارە
لەگـەڵ بێـدەنگی، شـەوگـار کـە یارە
بێـــتـــو تێـــپـــەڕ بم، بە لایا جـــارێ
فـرمـێـسکی خـوێنم، لەچاو ئەبارێ
بۆ تەسـەللای دڵ، لە دەرد و هیـجـران
چارەیە نیـــیـــە بە غـــەیری گـــریان
کـە لەو سـەر قـەبرەی، ئەگـەڕێمـەوە
لام وایە لەگـــەڵ، ئەوا دێمـــەوە
هەر گـەیە مـاڵێ، کـتـێب دائەنێم
هەیوان و ژووری، لە دوا ئـەگـــەڕێم
لە تاو مــەرگی ئەو، بیــر و خــەیاڵم
ئەگـری و نامـێنێ، عـەقڵ و کـەماڵم

جـــيـــهـــانم لەبەر، چاو ویران ئەبێ
گـــۆڕســـتـــان لە لام، ئاوەدان ئەبێ
خـــــودا بـکوژی، لـە دوای ئـەو یـارە
زیندەگـــیـم لەلا ، وەک ژەهری مـــارە
دات بەسـەر شانما ، کـەوڵی مـوسـیـبـەت
لێت کردمە دوژمن، خۆشی و مەسەڕڕەت
تۆ مـەخلوقی خـۆت، دیارە خـۆش ناوێ
ئەگـــینا دونـیـــا ، چیـــیـــە بۆ تاوێ
وێڵ و ســـەرگـــەردان، بەشـــارانەوە
زار و نـــاتـــەوان، بـــە هـــەردانـــەوە
وەک مـەجنوون چۆڵ و چیـام گـرتەبەر
بەڵام نایبـینم، تا ڕۆژی مـەحـشـەر
دیارە ئەمـانە ، بێ ئیـسـحـتـیـمـالە
دڵەی پڕ زوخـــاو ، دوور لە مـــەجـــالە
مـوسـتـەقبـەل هەرچەند، مـەجهـوولە ئەمما
ویجـدان بۆ بەقـا ، هەر ئیـمـا ئەکـا
نەمـاوە هەرچەند، وەک جـاران حـاڵی
بەڵام ئەزانم، نـیـــــیـــــە زەوالی
دونیـــا تا ئاخـر، بۆ کـەس نەمـاوە
هێـشـتـا شـتی واش، قـەت ڕووی نەداوە
بـڕوانە گـــــــەردوون، ڕۆحـی ڕەوانم
نـایـەڵـێ بـژیم، دەردی گــــــــــرانم
مـــەپرسن چیـــیـــە ، ئەم دەرد و ئاهە
بپـــرسن کـــێـــیـــە ، ئەو بێگوناهە
هەتیـــویی نسـیـب، کــردبوو یەزدان
مـەحـرووم لە باوک و دایکی بێ تاوان

عومری له دەوری، بیست و شەشا بوو
منالی مەرگی، له باوەشا بوو
ڕۆیی و هەتیوی، جێ هێشت بە سەرما
بەرگی ماتەمی، زوو کرد بە بەرما
ئەگەڕێم له دووی، بێ تین، بێ هیوا
وەک سێبەری دوای، ڕۆژ کە بێ ئاوا
مەجهوول ئەمێنێ، نەتیجەیی کار
یا خەوە یا خود، خەیاڵی بێدار
له تاریکیدا، بێ یار و هەمدەم
یاریش بەئەغیار، ئەمداتە قەڵەم
بۆ بەم بارەوە، خۆم گران سەر کەم؟
بەم حەقیقەتە، بۆچی باوەڕ کەم؟
کە من بزانم، ئەمە مەحاڵە
بۆچی من بگریم، لە دەس ئەم حاڵە؟
بەدەرد و خەفەت، هەتا قیامەت
نەمرم بەئازار، ئەکەم قەناعەت
بێتو تا مەحشەر، شیوەن بێ کارم
نایە بەدڵما، ئێش و ئازارم
پرسیم له سرڕی، (لاهووت) و (ناسووت)(*)
جوابێکم نەبیست، بە غەیری سکووت
ئەبێ سڕێ بێ، لە جوملەی ئەسرار
مەعنا نامێنێ گەر بکرێ تەکرار
یاڕەب چییە ئەم، تەخت و تابووتە
وا عەقڵ تیایا، مات و مەبهووتە

(*) له شوێنێکی دیکەی ئەم کتێبەدا باسی (لاهووت) و (ناسووت)م کردووە، بەپێویستم نەزانی دووبارەی بکەمەوە.

لای کــێ ڕەوایــە لــەشــی وا نــازدار
(ژنێ) کــفنی کــا و بینێــتــە مــەزار
مــردن چیــیــە؟ کێ بۆم تەعــبــیــری کــا
مەگەر هەر مەرگی، یار تەفــســیــری کــا
ئێــسک و پروسکی، لەشی تێک هاڕی
زەهری دووپشکە و دەرد ئەکــا کــاری
ئەمــە لە ڕۆحم، چۆن تەئــســیــر ناکــا؟
ئەمە ئیعــتــیــقــاد، چۆن تەغــیــیــر ناکا؟
ئەگــەر لەمــانە، ســەرســوڕ نەمــایە
ئــینــســـــان ئەبوایە، چی بکردایە؟
(فــاتمە) بۆ لە من، مــاڵئــاوایی کــرد
مــنی وا تووشی، بێ نەوایی کــــرد
بە مــردن، بە ژین، یان بەگــیــان کــێشــان
ڕازی بووم نەوەک، بەدەردی هیــجــران
تۆ گــوڵی من بووی، بەبێ دڕک و خــار
ژینێــکی خـــــۆشم، هەبوو بێ ئازار
لام وابوو دونــیــا، هەر دڕک و خـــارە
تەنیــــا هەر بۆ من وەک چەمــــەنزارە
یارەبی ئەمــرت، لای من شــیــریــنە
نەتبــیــست ئەو هەمــوو، ئاهو ئەنینە؟
چ بوو ئەو ساردی، پێ و لەش و دەستی؟
چ بوو ڕووخـــاندی، تەلاری هەســـتی
ئەی مــــردن تۆ بۆ، ئەم داوەت دانا
وازت بێنایە، چیت لێ ئەقــــەومــا؟
ئەی مەرگ ئەم خەستەی، بەبێ شیفایە
نە ئەمــــرد گــــەر تۆ، وازت بێنایە

ئەو ئەستێرەیەت، بەڕەنگێ کشان
نابینرێتەوە، تا ئاخر زەمان
لەناو ئەستێران، کز و کوژاوە
نادرەوشێتەوە، نووری نەماوە
ئەگەر ئاسمان بێ و بیبڕووخێنم
نایەتە خوارێ، نەختێ بیبینم
بەچاو بیبینم، ئەزانم خەوە
دەس لە ملی کەم، خەیاڵی ئەوە
ڕۆژی تەبعی من، بۆ ئاوا نەبێ؟
بۆ نوور لە ماڵم، تەوەللا نەبێ؟
لە هیجرانایە، چارە و نەجاتم
یارەبی هەمووی، خەم بێ حەیاتم
بنچینەی خۆشیم، کەوا وێران بێ
هیچ نەبێ خەمیش، با بێ پایان بێ
لە خەم خواردنا، بدەی سەباتم
پیشەم ناڵین بێ، تاڕۆی(٤) مەماتم
برینی جەرگم، هەر بکولێتەوە
هەموو ڕۆژ زامی، تازە بێتەوە
ناڵەم بێ بەدەس، ئێش و نێشەوە
نەسرەوم ساتێ، بەدەم ئێشەوە
لەگەڵما ژیانی، وەها بردە سەر
دەرد و ئازاری، دونیای گرتە بەر
جەننەتی ئەدی، بە هەردوو چاوان
چونکە هیچ نەیبوو، گوناهو تاوان

(٤) (ڕۆ) واتا (ڕۆژ). ئەمەش لە هەندێ لەهجەی زمانی کوردیدا هەیە، لەلای خۆشماندا هەر ڕۆیشتووە، ئەمڕۆ، نیوەڕۆ.

لە (پیـری) زادەی، گـەورە مـاڵە بوو
خـانەدانێکی، پێنج سـەد سـاڵە بوو
پاشـماوەی هەزار، فـەسڵی خـەزان بوو
لە سروەی بەهار، دیارییەکی جوان بوو
نموونـەیەکی، بەرزی و ئەسـالـەت
موشـفیق بوو هەتا، ئەولای نیـهـایەت
ئاوێنەی ڕازی، نیـهـان بوو چاوی
چاوەڕێی ڕێگەی، جـینان بوو چاوی
هەر لە لای ئەو بوو، شـێوە نەزاکـەت
هەیکەلێ بوو بۆ، زەکـا و دیرایەت
نموونەی جـوانی و ئەخـلاقی بەرز بوو
لە قـیـافـەتا، نازکـتـر تەرز بوو
شـیـعـرێکی مـوبهـەم، بەڵام مـوئەثر
بتـزانیـیـایە، ئەبوویتـە شـاعـر
(سەحرا)و(ئەشبەر)و،(بەزەر)[٥]هی ئەوە
من وەسـیلە بووم، ئەثەر هی ئەوە
سـەرت سـوڕ ئەمـا، کـە ئەبوو ظاهر
تیـایا مـەوجـوودە، بە هەزاران سـڕ
ڕووی لە مـەقـبـەرا، دیارە و ظاهر
سـەد (سـوبحـانەڵلا)، بۆ (حی قـادر)
مـن ڕەنـگی زەردیم، ئەدی بە دوو چـاو
ئەو بوو ڕەنگی دا، بە شـعـری شـێـواو
ئەم خـەیالاتە، هەرگـیـز نانووسـرێ
بە نووکی قـەڵەم چیـا ناسـمـرێ
دیار نەبوو گەرمی و ساردی لە لەشیـا
پەنهـان بوو عـیللەت، لە ڕوویی گەشیـا

(٥) (سەحرا) و (ئەشبەر) و (بەزەر) سێ تەئلیفی (عەبدولحەق حامید)ن. شێخ نووری.

هەر کەس بیدیایە، حاڵەتی دەردی
دڵی ئەسووتا، بەڕەنگی زەردی
دەرچوونی نەبوو، لە زاوییەی من
زوو تێ ئەگەیی، لە ناحییەی من
زوو نەیدەنووسی، ئەمە غەریبە
ئەتووت ئیلهامی، فیکری ئەدیبە
گفتوگۆی خۆش و دەنگی دڵفریب
دڵی ئەکردم، لە خەم بێ نسیب
بۆ فکر و مێشکم، بوو بوو بە یاوەر
بۆ بیری ون بووم، بووبوو بە ڕەهبەر
ئەهات ئەینووسی، حیسابی شیعرم
ئەمزانی بۆتە، کیتابی شیعرم
چیبکەم لە شیعر و لەفزی مەعنیدار
خوایە ئەمەوێ، بیبەم بۆ مەزار
ڕۆیی لەبەر چاو، ڕۆیی لەگەڵ ئاه
ڕۆیی بێ مەرام، ڕۆیی بێ گوناه
(فەرد) لە دونیادا، یەکێکە ئەما
هیچ فەردێ وەکو ئەم نەبوو حاشا
تاقە مانگێ بوو،ماڵئاوایی کرد
زۆر زوو لە لامان، کۆچی دوایی کرد
لە تاریکییدا، ببینم جێگای
ڕووناکیی دڵم، زوو ئەچوو بۆ لای
گۆیکەی چنارێ ئەگەر بوەرێ
گۆیکەیەکی تر، جێگایی[٦] ئەگرێ

(٦) لە دەستنووسەکەی شاعیردا (گۆیکەیەکی تر، جێگای ئەگرێ) نووسرابوو کە بەبێ (ی)ی دووەم لەنگ دەبێ.

ئەم جێ نشـــــینە[۷] بێ شک نازدارە
ڕەنـگـی ئـەگـــــۆڕێ، بـەڵام هەر یـارە
غـــروب نـســیــبی، مـــیــهــری ئەنوەرە
تەکـــرار تلـــووعی، ئەو مـــوقـــەڕەڕە
بەڵامَ ئەو غـــونچـەی، ناکـــرێتـــەوە[۸]
ئەم ئەســـتــێـــرەیە، هەر ئەکـــوژێتـــەوە
لە ســــەد ڕێـوە من بۆ تـۆ ئەگـــــەڕام
لەناو ڕێـگادا، مـــا عـــەقـــڵی کـــۆتام
برووسکەیەکـــــە، ســـــەدای دەرناچێ
نـــوورێــکــە ئـــەڕواو زیـــای دەرنـــاچـــێ
ئەبیـــــەم یا ئەڵـڵا و ئەڵـێم یا ئـەڵـڵا
فـــەریاد و حـــیـــرەت، بووە بەهەمـــڕاه

قلیجە: ۱۹٥٤/۱۱/۷

---

(۷) شاعیر لە هەمان دەستنووسدا (ئەم جێ نوشینە)ی نووسیبوو.
(۸) دەبێ دان بە(کاف)ەکەدا بنرێ، ئەگینا لەنگ دەبێ.

لە عەرەبییەوە

## لە (ئیلیا ئەبوو ماضی)یەوە وەرگیراوە(*)

لە کوێوە بۆ چ ئامانجێکە نازانم، کەچی هاتم
کە چاوم کردەوە ڕێم گرتەبەر، چەشنی خەیالاتم
ئەبینم ڕێ و ئەڕۆم بۆ خۆم ئەگەر دڵخۆش، ئەگەر ماتم
لە کوێوە هاتم و ئەم ڕێگەیە بۆ کوێیە، تێناگەم
چ ڕێیەکە، درێژ و دوورە، یا نێزیک و ئاسانە
ڕووەو هەورازە ڕێ، یاخۆ نشێوە، یا بیابانە
منم ڕێبواری ڕێ؟ یا ڕێگە ئەڕوا گورج و ئازانە
وەیاخود هەردوو وەستاوین، جیهان ئەڕوات و تێناگەم
سەرم سوڕماوە، تازەم یا (قدیم العهد)ە بونیادم

(*) ئیلیا ئەبوو ماضی: لە (المحیدثة) لە ساڵی (١٨٨٩)دا لە دایک بووە. دوایی لە ساڵی (١٩٠٠) ڕووی کردووەتە میسر و لەوێ بەکاروباری بازرگانییەوە خەریک بووە. یەکەم کۆمەڵە هۆنراوەی بەنێوی «یادی ڕابردوو» لە ساڵی (١٩١١)دا دەرکردووە. هەر لەو ساڵەشدا بۆ ئەمریکا چووە، لە شاری (سنسنانی)دا جێگیر بووە و دەستی کردووەتەوە بەبازرگانی کردن. لە ساڵی (١٩١٦)دا چووە بۆ (نیویۆرک)و چووەتە پاڵ کۆمەڵە ئەدیبێکی «مەهجەر»ی و لە دواییدا لەگەڵ ئەواندا «رابطة»یەکی ئەدەبییان پێکەوە ناوە. ئیتر هەر لەو کاتەوە بەتەواوی خۆی بۆ ئەدەب و ڕۆژنامەگەری تەرخان کرد. لە ساڵی (١٩١٩)دا کۆمەڵە هۆنراوەی دووەمی کە (جەبران) پێشەکی بۆ نووسیوە کەوتە بازارەوە. لە ساڵی (١٩٢٥)دا کۆمەڵە هۆنراوەی سێیەمی بەناوی (جۆگەلەکان) بەپێشەکی (میخائیل نەعیمە) دەرکرد. دوای ئەو کۆمەڵە هۆنراوەیەش، شیعری تری لە ڕۆژنامە و گۆڤارە عەرەبییەکانی وڵات و دەرەوەی وڵات بلاودەکردەوە.
ئەم شیعرەش لە دیوانی (الجداول)دا لە لاپەڕە (١٣٩ - ١٤١) بەناوی (الطلاسم)ـەوە بڵاوکراوەتەوە کە بەشێکە لە قەسیدەیەکی درێژ. هەر کەسێ بیەوێ وەک وەرگێڕ باسی (شێخ نووری) بکات، ئەوە دەتوانێ بگەڕێتەوە سەر دەقی شیعرەکە و ڕادەی دەسەڵات و توانایی لە وەرگێڕانەکەدا دیار بکات. بەکورتی لە کتێبی (الشعر العربي في المهجر- أمريكا الشمالية) تاليف الدكتور إحسان عباس والدكتور محمد يوسف نجم ل ١٣٣، بيروت، ١٩٦٧.

ئەسـیـری بەند و زنجـیـرم وەیا سـەربەست و ئازادم
بەسەر ئەم نەفسەما من ئامرم، یا عەبد و مونقادم
بەدڵ ئاواتەخـوازم تێبگەم، بێ سـوودە، تێناگـەم
ڕەفیقان خۆزگە ئەمزانی لە پاش ڕۆیشتن و ون بوون
بەخۆم ئاخۆ ئەزانم وام لە ژێر مشتێ گڵا مەدفوون
وەیا جارێکی تر ئەمداتەوە ڕۆح ئیزەدی بێچوون
وەیاخود ئەمری خوا وایە نەزانم، بۆیە تێناگەم
بە من ناڵێن وجوودی من چ بوو پێش شکڵی ئینسانی
لە بنیاتا وجوودم هەر بووە، یا بێ لەش و فانی
مەتەڵ زانێ ئەزانێ؟ یا ئەمێنێ هەر(*) بە پەنهانی
لەمە تێناگەم و نازانم، ئایا بۆچی تێناگەم

(*) (هەر)ی بۆ زیاد کراوە تا لەنگ نەبێ.

لە عەرەبییەوە

## شیعری: ئەی، ئێل، بارباولد[1]

## ڕۆح[2]

ئەی ڕۆح! بەڕاستی تۆ کێی نازانم
هێندەم لێ عایەن بووە کە ڕۆژێ

---

(١) یەکێکە لە شیعرەکانی کچە شاعیری ئینگلیز (ئەی. ئێل. بارباولد) کە لە ساڵی (١٧٤٣)دا لە دایک بووە و لە ساڵی (١٨٢٥)دا کۆچی دوایی کردووە.

(٢) ئەم شیعرە لە لاپەڕە (١٠٩ - ١١٠)ی دەستنووسی «گەڵاڕێزان»ی شاعیر وەرگیراوە. ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام ئەوەیە: شاعیر لە کاتی وەرگێڕانی ئەم شیعرەدا، ئاماژەی بۆ ئەوە نەکردووە کە ئەمە شیعرێکی وەرگێڕاو بێت. منیش هەر ئەو تاقە دەستنووسەم لەلا بوو، چونکە لەوانەیە لە دەستنووسی تردا ئاماژەی بۆ ئەم حەقیقەتە کردبێت. لەکاتی هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی ڕۆژنامەی (ژین)، لە ژمارە (١٣١٧)ی ساڵی (٣١) ١٨/ ٩٥٦/١٠ ناوونیشانی شیعرێکی وەرگێڕاو سەرنجی ڕاکێشام کە (مستەفا ساڵح کەریم) لەو ژمارەیەدا بەناوی (ئەی گیان)ەوە وەری گێڕاوە. کە شیعرەکەم خوێندەوە هەستم کرد ئەو شیعرەم لە ناو شیعرەکانی «شێخ نووری شێخ ساڵح»یش بەرچاو کەوتووە، بۆیە هەر یەکسەر گەڕامەوە سەر دەستنووسەکە و شیعرەکەم لەگەڵ دەستنووسەکە بەراورد کرد و بۆم دەرکەوت ئەم شیعرەی (شێخ نووری) شیعرێکی وەرگێڕدراوە و لەم دەستنووسەدا ئاماژەی بۆ نەکردووە. بۆ نموونە هەندێکی ئەم شیعرە وەرگێڕاوە دەخەینە بەرچاوی خوێنەرانی خۆشەویست و ئەگەر مەبەستیشیان بوو، ئەوە دەتوانن بگەڕێنەوە سەر ڕۆژنامەکە و شیعرەکە بەتەواوی بخوێننەوە.

ئەی گیان! نازانم تۆ چیت؟
من نازانم کە ئەبێ لێک جیا بینەوە
بەڵام لە یادم نییە کەی پێک گەیشتین.
کەی و لە کوێ؟

***

ئەی گیان!
کاتێکی چاک ژیاین پێکەوە
بەشمان ئەکرد خۆشی و ناخۆشی
ئاخ چەند ناخۆشە لێک جیابوونەوە
چونکە دڵداران خۆشەویستن

من و تۆ لە یەک جیا ئەبینەوە
بەڵام کەی، لە کوێ یەک ئەگرینەوە
نازانم. ئەمە مەتەڵە و ئەسرار

***

ئەی ڕۆح! ناخۆشی و خۆشی زەمانە
لەگەڵ یەک وەک یەک چێشتمان ئازانە
جیا بوونەوەی تۆم زۆر لا گرانە
لە دوای خۆت ئاهو فرمێسک و حەسرەت
بەجێ هێشتنی لای تۆ هەرزانە

***

ئەی ڕۆح کە ویستت جیا ببیتەوە
ئینزارم مەکە لە پێش ڕۆیینتا
لە لای خۆت توخوا بۆ جیابوونەوەت
ڕۆژێ دابنێ بیناسیتەوە

***

توخوا[٣] شەو نەبێ، تاریک و لێڵە
بە ڕۆژی ڕووناک بەجێم مەهێڵە

---

= وە چەندیش ئاخو هەناسە بە
دوا یارا ئەکێشی... ئەی فرمێسک

لە دواییشدا بۆم دەرکەوت کە ئەو شیعرە لە گۆڤاری (پەیام)ی ژمارە (١٩٩)ی (٢٠)ی تەمووزی (١٩٥٣) لە بەرگی پێنجەمدا بڵاوکراوەتەوە و ئەم جارە بەناوی (ژیان) لە جیاتی (ڕۆح)، بۆ جارێکی تریش بەناوی (ژیان) لە گۆڤاری (پێشکەوتن) ژمارە (١١)ی (١٧)ی مایسی ساڵی (١٩٥٨)دا بڵاوکراوەتەوە. وەکو ئەم دوو وەرگێڕانەی دواییشم لەگەڵ یەکتر بەراورد کرد، هیچ جیاوازییەکم لە نێوانیان بەدی نەکرد، ئینجا نازانم وەرگێڕانی یەکەم کە ناوی بەسەرەوە نییە، هەر (کەمال ڕەشید عارف - دەباغ)ـە، یان لەبەر وەرگێڕانی یەکەم نووسراوەتەوە؟!

(٣) لە هەندێ دەستنووسی شاعیردا (توخدا)ش هەبوو.

(*) ئەم شیعرە وەرگێڕدراوە کاریگەری بەسەر شیعرێکی مامۆستا گۆران-یشەوە بەجێ هێشتووە کە بەناوی (ئەی گیان)ەوە لە دیوانەکەیدا هەیە.

لە تورکییەوە

## تەفەکور

شیعری: ڕەجایی زادە ئەکرەم بەگ

تەفـەکـورم کـە ئەویَ مـەحـرەمی مـەلالی منە
ئەوە کـە دیەوە فکری لە حـالی مـیـحنەتما
حـەریی ڕۆژ و شـەوی تاری بیّ زەوالی منە
ئەوا لە دووم ئەگـەڕیّ شەو لە وەختی زیللەتما
نەدیمی ڕۆحی ئەنیـسم تەفـەکـوراتی منە
دەمی تەفـەکـوری من، خۆشی دەمی حەیاتی منە

***

دەمیّ کـە شـامی غـەریبانە ڕووپەڕەی ئافـاق
ئەسیری زولـمەت و مەنزوری چەشمی ڕیققەت ئەکا
دەمیّ کـە بادی سـەبا، غـونچـەی گـولّ و ئەوراق
بەئاهی حوزنەوە مەئلوفی دەردی حەسرەت ئەکا
فـەلەک کـە نەجمی درەخشـانی پرتەو ئەفشـانە
تەفـەکـوراتم ئەویّ مـوتەسـلّی خـرۆشـانە[1]

***

مـوقـارنی ئادابی سـانیحـاتی[2] شـیـعرییەم
ئەوە مـورەبییـەی زادەی تەبیـعـەتی من
ئەوە مـەداری قـیـامی حـەیاتی شـیـعـرییـەم
ئەوە مـوعـەلیـمـەی مـەکـتـەبی بەلاغـەتی من
خـەزێنەداری ئەوە، حـسی پڕ تەئسـیـری من
سـروود و زەمـزەمـەی عـوشـرەتە تەفـەکـوری من

***

(١) لە شوێنێ تر (خەم و شانە) نووسرابوو.

(٢) لە ڕۆژنامەی (پێشکەوتن)دا (سا نەجاتی) نووسرابوو.

ئەوە کە باعیسی ئیفنای جیسمی (ناسووتە)[٣]
ئەوە کە باعیسی ئیبقای بەسط و ویجدانە
موغەنی چەمەنی خولدزار و (لاهووتە)[٤]
مودەقیقی سەفەری کار، گاهێ ئیمکانە
نەدیمی ڕۆحی ئەنیسم تەفەکوراتی منە
دەمی تەفەکوری من، خۆشی دەمی حەیاتی منە
دەمێکە مەوجەی خرۆشانی عونسری ئەکوان
ئەبێتە واعیزی ئەدواری بێ نیهایەتی کان
دەمێکە لەمعەی ناسووتی عالەمی ئیمکان
لە سەرمەدییەتەوە نوور ئەدا بەرۆح و جان
ئەکەومە فکرەوە بۆ قودرەتی خوای وەدوود
بە فرطی عیجزەوە، طیفلانە گریە دێتە وجوود

***

(٣) و (٤) لاهووت و ناسووت: مەسیح دوانزە قوتابی هەبوو، پێیان دەوترا (الحواریون) لەوانە: (پۆلس، حەنا، لۆقا، یۆحەنا... تاد) ئەمانە هەر لە ناوچەی (ناسیرەوە) دەرچوون بۆ بلاوکردنەوەی دروودەکانی مەسیح. ئیتر هەریەکەیان چوونە قوژبنێکی جیهان، بەلام کاتێ ئەو پیاوەی کە لە شێوەی مەسیح-دا بوو لە خاچ درا، زۆرکەس لەو بڕوایەدا بوون کە ئەوە مەسیحە. پاش ئەوەی خستیانە گۆڕەوە بۆ بەیانی زوو کە چوونە سەر گۆڕەکەی دەبینن گۆڕەکە هەلدراوەتەوە و تەنها کفنەکەی دیارە کە لەسەر گۆڕەکە دانرابوو. هەندێک لەو بڕوایەدا بوون کەوا مەسیح خوا بووە و بۆ چاککردنی خەلکی لە شێوەی مرۆڤ خۆی نواندووە، ئیتر گەڕاوەتەوە بۆ شوێنی خۆی، ئەمانە پێیان دەوترا (لاهووتییەکان)، بەرامبەر بەمانەش هەندێکی تر وایان بڕوا کرد، کە مەسیح کوڕی خوا بووە، بەلام ئادەمیزاد بووە و پاش تەواو بوونی تەمەنی خوا گێڕاویتییەوە لای خۆی، ئەمانەش پێیان دەوترا (ناسووتییەکان).

لە عەرەبییەوە

## ژیان(١)

ڕابردوو ڕۆیی و ناگەڕێتەوە
گریان و خەفەت نایهێنێتەوە
ئەو ساتەت خۆش کە، کە تیایا ئەژیت
تێکۆشە کە جوان، بڕازێتەوە
مەترسە لەوەی ویستووتەو نەبووە
تا ئەبەد ئەمەل ناکوژێتەوە
دڵێکی لە هیچ نەترساوت بێ
لە ژیان ترساو، ناحەوێتەوە

---

(١) ئەم شیعرە لە لاپەڕە (١١١)ی دەستنووسی(گەڵاڕێزان)دا بەدەستخەتی شاعیر نووسراوەتەوە و لە دوای مردنی شاعیر لە گۆڤاری (نەوڕۆز)ی ژمارە (١) سالی ١٩٥٩دا بڵاوکراوەتەوە، بەڵام بەبێ ئەوەی گۆڤارەکە ئاماژەی بۆ ئەوە کردبێ کە شیعرێکی وەرگێڕدراوە. لە دانیشتنێکی دۆستانەدا لەگەڵ کاک (س. ع. شادمان) ئەوەی بۆ دەستنیشان کردم کە ئەم شیعرەی شێخ نووری، شیعرێکی وەرگێڕدراوە. منیش کە داوای سەرچاوەکەم لێ کرد و پێکم بەراورد کردن، ڕاستی قسەکەم بۆ سەلما کە ئەمە دەقی شیعرەکەیە:

مامضى فات ليس يرجع ماض
او يفيد البكاء والأحزان
ولك الساعة التي أنت فيها
فأغتنم ان يزينها الأحسان
لاتخف إنما المؤمل غيب
ومن الغيب مغنم و أمان
وادخر للحياة قلبا جسورا
لاينال المنى ضعيف جبان

بڕوانە گۆڤاری (الهلال) جوزئی چوارەم و جلدی (٦٤)ی ساڵی (١٩٥٦) کە لە ژێر ناوی (لاتخف)، (طاهر الطناحي) لە ئینگلیزییەوە وەریگێڕاوە و دەقە ئینگلیزییەکەشی نووسیوەتەوە. لەپاشاندا بۆم دەرکەوت ئەم شیعرە دوو چوارینی خەییامن و لە ئینگلیزییەوە کراون بە عەرەبی.

لە عەرەبییەوە

## ژیان(١)

ڕابردوو ڕۆیی و ناگەڕێتەوە
گریان و خەفەت نایهێنێتەوە
ئەو ساتەت خۆش کە، کە تیایا ئەژیت
تێکۆشە کە جوان، بڕازێتەوە
مەترسە لەوەی ویستووتەو نەبووە
تا ئەبەد ئەمەل ناکوژێتەوە
دڵێکی لە هیچ نەترساوت بێ
لە ژیان ترساو، ناحەوێتەوە

---

(١) ئەم شیعرە لە لاپەڕە (١١١)ی دەستنووسی(گەڵاڕێزان)دا بەدەستخەتی شاعیر نووسراوەتەوە و لە دوای مردنی شاعیر لە گۆڤاری (نەورۆز)ی ژمارە (١) ساڵی ١٩٥٩دا بڵاوکراوەتەوە، بەڵام بەبێ ئەوەی گۆڤارەکە ئاماژەی بۆ ئەوە کردبێ کە شیعرێکی وەرگێڕدراوە. لە دانیشتنێکی دۆستانەدا لەگەڵ کاک (س. ع. شادمان) ئەوەی بۆ دەستنیشان کردم کە ئەم شیعرەی شێخ نووری، شیعرێکی وەرگێڕدراوە. منیش کە داوای سەرچاوەکەم لێ کرد و پێکم بەراورد کردن، ڕاستی قسەکەم بۆ سەلما کە ئەمە دەقی شیعرەکەیە:

مامضی فات لیس یرجع ماض
او یفید البکاء والأحزان
ولك الساعة التي أنت فیها
فأغتنم ان یزینها الأحسان
لاتخف إنما المؤمل غیب
ومن الغیب مغنم و أمان
وادخر للحیاة قلبا جسورا
لاینال المنى ضعیف جبان

بڕوانە گۆڤاری (الهلال) جوزئی چوارەم و جلدی (٦٤)ی ساڵی (١٩٥٦) کە لە ژێر ناوی (لاتخف)، (طاهر الطناحي) لە ئینگلیزییەوە وەریگێڕاوە و دەقە ئینگلیزییەکەشی نووسیوەتەوە. لەپاشاندا بۆم دەرکەوت ئەم شیعرە دوو چوارینی خەییامن و لە ئینگلیزییەوە کراون بە عەرەبی.

لە عەرەبییەوە

## ژیان(1)

ڕابردوو ڕۆیی و ناگەڕێتەوە
گریان و خەفەت نایهێنێتەوە
ئەو ساتەت خۆش کە، کە تیایا ئەژیت
تێکۆشە کە جوان، بڕازێتەوە
مەترسە لەوەی ویستووتەو نەبووە
تا ئەبەد ئەمەل ناکوژێتەوە
دڵێکی لە هیچ نەترساوت بێ
لە ژیان ترساو، ناحەوێتەوە

(1) ئەم شیعرە لە لاپەڕە (111)ی دەستنووسی(گەلاڕێزان)دا بەدەستخەتی شاعیر نووسراوەتەوە و لە دوای مردنی شاعیر لە گۆڤاری (نەورۆز)ی ژمارە (1) ساڵی 1959دا بلاوکراوەتەوە، بەلام بەبێ ئەوەی گۆڤارەکە ئاماژەی بۆ ئەوە کردبێ کە شیعرێکی وەرگێڕدراوە. لە دانیشتنێکی دۆستانەدا لەگەڵ کاک (س. ع. شادمان) ئەوەی بۆ دەستنیشان کردم کە ئەم شیعرەی شێخ نووری، شیعرێکی وەرگێڕدراوە. منیش کە داوای سەرچاوەکەم لێ کرد و پێکم بەراورد کردن، ڕاستی قسەکەم بۆ سەلما کە ئەمە دەقی شیعرەکەیە:

مامضى فات ليس يرجع ماض
او يفيد البكاء والأحزان
ولك الساعة التي أنت فيها
فأغتنم ان يزينها الأحسان
لاتخف إنما المؤمل غيب
ومن الغيب مغنم و أمان
وادخر للحياة قلبا جسورا
لاينال المنى ضعيف جبان

بڕوانە گۆڤاری (الهلال) جوزئی چوارەم و جلدی (64)ی ساڵی (1956) کە لە ژێر ناوی (لاتخف)، (طاهر الطناحي) لە ئینگلیزییەوە وەریگێڕاوە و دەقە ئینگلیزییەکەشی نووسیوەتەوە. لەپاشاندا بۆم دەرکەوت ئەم شیعرە دوو چوارینی خەییامن و لە ئینگلیزییەوە کراون بە عەرەبی.

لە تورکییەوە

## لە کوردستاندا گرانی[1]

سەیری ئەم مەنزەرەی جەننەتە، ئەم گوڵزارە
چۆن بوو ئەوسا و کەچی ئێستەکە چەند غەمبارە
ئەوە باغاتی هەتا مەددی نەزەر، سووتاوە
ئەوە شارانی هەتا چاو بڕ ئەکا، ڕووخاوە

(١) لە ڕۆژنامەی (ژیان)ی ژمارە (٤)،(١١)ی شوباتی (١٩٢٦)ی زایینی ئەم شیعرە بڵاوکراوەتەوە و ئەم پەراوێزەی لای خوارەوەش لەلایەن دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەکە نووسرابوو: (ئەم شیعرانە بە قەڵەمی زاتێکی موحتەرەمی کورد بەتورکی نووسراوەتەوە. ئەم زاتە لە منداڵییەوە لە ئەستەمبوڵ و ئەترافی ئەستەمبوڵ گەورە بووە، لەبەر ئەوە - مع الأسف - بەتەواوی هێشتا زمانی ئەسڵی خۆی کە کوردییە فێر نەبووە و ناتوانێ بەو زبانە حسییاتی دەروونی خۆی بەتەواوی بخاتە سەر قاقەز. خۆی ئێستا لە کەرکووکە، لەوێ لە دائیرەی مەعاریف دایە. ئەم چەند شیعرەی لەم ڕۆژانە ناردبوو بۆ مەتبەعە، چونکە مەتبەعەکەمان بە تورکی هیچ نانووسێ ئەو شیعرانە لە تەرەف بلبلی خۆشخوان و شاعیری شیرین زبان جەنابی (شێخ نووری) ئەفەندییەوە و لە پاش ئەو لە تەرەف ئوستادی شیعر و ئەدیبێکی ترەوە کە (لە ناوبردنی مەعزوورین) عەینەن تەرجومە کراوە. ئێمەش لەم نوسخەیەو لە نوسخەی ئاتیدا هەردووکیان ئەخەینە پێش چاو قارئینی کیرام و تەقدیری حسییاتی هەرسێکیان ئەکەین). ئەمە لێرەدا بەڵگەی ئەوەیە کە ئەم شیعرە، شیعرێکی وەرگێڕدراوە لە زمانی تورکییەوە. هەمان شیعریش لە لایەن کەسێکی ترەوە وەرگێڕدراوە کە ناوی نەهێناوە، کەچی مامۆستا (نەجمەددین مەلا) لە دەستنووسەکەیدا، وەرگێڕانەکەی (شێخ نووری)و دوا بەدوای ئەو وەرگێڕانەکەی وەرگێڕە نادیارەکەشی کە لە ژمارەکەی دوای ئەو بڵاوکراوەتەوە، نووسیوەتەوە بەبێ ئەوەی دەستنیشانی کردبێ کە ئەمە شیعرێکی وەرگێڕدراوە و سەرنجی خوێنەری دەستنووسەکە بۆ ئەو تێبینییە ڕابکێشێ. ئینجا کە (شێخ نووری) بۆ جارێکی تر بەسەر ئەو دەستنووسەدا چووەتەوە و هەندێ وشەی دەستکاری کردووە و چەند دانە شیعرێکی تریشی بەدەستخەتی خۆی بۆ زیاد کردووە، ئەویش نەینووسیوە ئەمە وەرگێڕانە، دیارە پشتی هەر بەو تێبینییەی ڕۆژنامەکە بەستووە، بەڵام کاتێ ئەم شیعرەی بۆ مامۆستا - گیوی موکریانی - ناردووە، بەمەرەکەبی سەوز نووسیویەتی: (ئەم غەزەلە ئاتییە لام وایە بۆ دەرج شایستە بێ) دیسان بەمەرەکەبی سەوز دەری خستووە کە ئەو وەرگێڕە - نادیارە - مامۆستا (زێوەر)ی شاعیرە کە کاتی خۆی ڕۆژنامەکە لەناو هێنانی (مەعزور بوو) کە دەڵێ: (ئەمەش عەینی مەوزوع هی شاعیری شەهیر زێوەر)ە و ئینجا شیعرە وەرگێڕدراوەکەی مامۆستا (زێوەر)ی لەوەکەی خۆی جیا کردووەتەوە.

کەوتووە لاشەی خوێناوی سەد بێچارە
خانە وێران و پەرێشان وەتەن و ئاوارە
تێکەڵی خوێنە هەزاران سەری ساحێب غیرەت
نەعشی سەد شێری وەتەنپەروەری، موڵک و میللەت
عائیلەی ئەو شوهەدایانە کە تۆ ئەیزانی
ماڵی خۆیان بووەتە قەبر و مەزارستانی
برسی و دەربەدەر، ئەولادی سەفیلی کوردان
خەوی لێکەوتووە لەم مەزبەلە و لەو کۆلان
کەوتووە زومرەی ئینسان، وەکو لاشەی حەیوان
ئەمە بوو مەرحەمەت و توحفەیی قەومی تورکان
ئەی لە بۆ خاکی وەتەن، مونسی خاک، ئەی شوهەدا
وا مەزانە کە مەساعیت هەموو ڕۆیی بە هەبا
لای تۆ مەفهوومی وەتەن یەک بوو، دیاری ئیسلام
چ حیجاز و چ عیراق و چ فەلەستین و چ شام
یادی خوسرانی هەمووتان دڵی کردم بوریان
ئەمەوێ مەقسەدی تۆ تێبگەیەنم بە جیهان
ڕشتنی خوێنی جگەر، دولبەری مەجلووبت بوو
بۆ نەجاتی وەتەن و میللەتی مەحبووبت بوو
وا بەئیمانەوە ڕووت کردە کەژی غیرەت و چۆڵ
بوو بە گوڵزاری مەزارت، هەموو خاکی ئەنادۆڵ
خەبەری کوشتنی تۆ عالەمی وا کرد حەیران
ئەو دەمە بۆتە دەمی تەعزیبەی کوردوستان
وا مەزانە کە فەرامۆش ئەکرێ، عالەمی تۆ
تاکو باقی بێ هەموو کورد[2] ئەگرێ ماتەمی تۆ
بۆ چ مەقسوودێ بوو، ئەو عەزمە زەمان ئەیهێنێ
ئینتیقامی ئەزەلی، ڕۆحی زوڵم دەردێنێ
بۆ سەر ئەو کەسە تێکۆشێ، لە بۆ ئیستیقبال
بەخش ئەکا تاجی ظەفەر، دەستی شەهی ئیستیقلال

---

(٢) لە ڕۆژنامەکەدا (شەرق) نووسرابوو، (شێخ نووری) لە دەستنووسەکەی نەجمەددین مەلادا بەقەڵەمی خۆی و بەمەرەکەبی سەوز کردوویەتی بە(کورد).

لە فارسییەوە

## شەوێک(1)

شـەوێ بازێ بە بازێکی وت: ئەی یار
هەتا کەی مەسکەنت بێ دەشت و کۆسار

(١) ئەم شیعرەش یەکێک بوو لەو شیعرانەی کە بەقەڵەمی شێخ نووری بەمەرەکەبی سەوز لە لاپەڕە (٥٠)ی ئەو دەستنووسەدا نووسرابووەوە کە مامۆستا (نەجمەددین مەلا) لە کاتی خۆیدا لەسەر داوای شاعیر، شیعرە بڵاوکراوەکانی بۆ نووسیبووەوە و هەر ئەو دەفتەرەیشە کە لە کاتی خۆیدا پێشکەش بە مامۆستا - گیوی موکریانی - کراوە، بەڵام بەداخەوە لەسەر ئەم شیعرەش نەنووسرا بوو شیعرێکی وەرگێڕدراوە و ناوی شاعیرەکەش هەر نەنووسرابوو، لە دواییدا کە لەگەڵ کاک (شێخ جەنابی) کوڕی شاعیر باسی ئەو شیعرەم کرد، کە شیعرێکە بە من ئاشنایە، وتی: لە کاتی خۆیدا لە فارسییەوە وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی. من بەوە دڵم ئاوی نەخواردەوە، بگرە لە ئەنجامی سۆراخ و پشکنینی زیاترەوە، گەیشتمە ئەوەی دەقی شیعرەکەم دەست بکەوێ کە مامۆستا (محەمەد سەعید سەلیم جاف) لە ڕۆژنامەی (ژیان)ی ساڵی (١٩٣٦)دا ئەویش هەر هەمان شیعری وەرگێڕاوە. وا لە خوارەوە دەقی شیعرە فارسییەکە دەنووسین:

شبی بازی ببازی گفت در دشت
که تاکی کوه و صحرارا توان گشت
بیا تاسوی شهر آریم پرواز
با شهزادگان باشیم دمساز
به شبها شمع کا نوری گدازیم
به روزان با شهان نخچیر سازیم
جوابش داد آن باز نیکورای
که ای ناپاک دون همت سراپای
تمام عمر اگر در کوهساران
جفا بینینم و جوری برف و باران
ازان بهتر که در کافور رندود
دمی محکوم حکم دیگران(2) بود

(٢) دیگران: واتە خەڵکی دی، نەک بێگانان.

وەرە با ڕوو بکەینە کـــووچەیی شـــار
بە سی بێ هەڵفـــڕین ئەم دار و ئەو دار
ببـــینە هەمـدەم و هەمـــڕازی ئینســـان
ببـــینە هەمنشـــینی بەزمی شـــاهان
بەشـەو هەمـدەم لەگـەڵ شـەمع و چرا بین
بەڕۆژ سـەییـادی دەسـتی پادشـا بین
جـــوابی دایەوە بازی ســـوخـــەندان
وتی: گـوێ بگرە ئەی حـەیوانی نادان
ئەگـەر سەد ساڵ مـەکانت بێ بیـابان
بناڵێنی لە جـــەوری بەفـــر و باران
ئەوەت مـەعقوولترە، نەک تۆ وەزیر بی
دەمێ بۆ حوکـمی بیگانان ئەسـیـر بی



شێخ نووری شێخ ساڵح

لە ساڵانی بیستەکاندا

١

وا بۆته لەعل بەمـەی هەمـوو گـەوهەری من
هاتۆته فـوغـان له دەسـتی من سـاغـەری من
هێنده مەی ئەخۆم پیاڵه لەسەر پیاڵه مودام
من چوومەته ناو سەری مەی و مەی سەری من

٢

بێگانه ئەگـەر وەفـای ببێ خـوێشی منه
خـزمێ کـه جـەفـای ببێ بەدئەندێشی منه
زەهرێ کـه مـوافـیق بێ، لەلام دەرمـانه
نۆشێ، کـه موخالیف بێ، هەمووی نێشی منه

٣

پیـاوێ کـه دڵی، مـایەی تەجـریدی کـەمـه
بێـچـاره هەمـوو عـومـری نەدیی نەدەمـه
غـەیری دڵی فـارغ کـه نیـشـاطێکی هەیه
هەرچی هەیه باقی هەمـوو ئەسبـابی غـەمـه

٤

دەسـتێ وەکـو دەسـتی من کـه سـاغـر بگرێ
حـەیفـه له شـەرابی ناب کـەمـتـر بگرێ
تۆ سـۆفی وشکی و منیش فـاسـقی تەڕ
نەمـبـیـسـتـووه داری تەڕ کـه ئاگـر بگرێ

٥

یەک پیـاڵه هەزار پیـاوی بێ دین دێنێ
چۆڕێ له شـەراب، کـیـشـوەرەکـەی چین دێنێ
له جـیـهـان چی بێ له مـەی خـۆشـتـر بێ
تاڵێکه هەزار ڕۆحی شـیـرین دێنێ

٦

ئەسراری ئەزەل، بادە پەرست ئەیزانێ
قەدری مەی و جام، تەنگ دەست ئەیزانێ
گەر چاوت لە حاڵی من بێ ئەیزانی چییە
بێ شوبهە کە حاڵی مەست، مەست ئەیزانێ

٧

مەیلم لە شەرابی ناب ئەبێ تا مەحشەر
گوێم هەر لە نەی و روباب ئەبێ تا مەحشەر
بێ و بیکەنە گۆزە خۆڵەکەم گۆزەکەران
ئەو گۆزەیە پڕ شەراب ئەبێ تا مەحشەر

٨

بەم هاتنی نەوبەهارە، بەم ڕۆیینی دەی
ئەوراقی وجوودی ئێمەیە و ئەیکا طەی
مەی نۆش کە، خەفەت مەخۆ حەکیمێ فەرمووی:
ئازاری زەمانە زەهرە، تریاکی مەی

٩

گەر ڕووی زەمین بە جارێ تۆ بونیاد کەی
ناگاتە ئەوە دڵی زەبوونێ شاد کەی
گەر شەخسێ بە مەرحەمەت بکەیتە بەندە
چاترە لەوە، کە بەندەیە ئازاد کەی

١٠

ساقی مەیی کۆنە، یاری دێرینی منە
کەی بێ کچی ڕەز، مەسەرڕەت ئایینی منە
بیستوومە ئەڵێن بادەخۆر دینی نییە
من بادە ئەخۆم و خواردنەوەی دینی منە

١١

ساقی به بەهەشت ئەوەندە بۆ موشتاقی؟
جەننەت مەی و ساقییەو بەتاڵە باقی
لێرە مەی و ساقییە، لە وێش هەر ئەوەیە
چی چاترە ئیتر لە شەراب و ساقی؟

٢١

تۆ فەرموو حیسابی کە ئەگەر باخەبەری
هاتووی شتت پێ نەبووە، کە چووی هیچ نەبەری
فەرمووتە کە ناخۆمەوە مەی من ئەمرم
بیخۆیەوە ئەمریت و نەخۆی هەر ئەمری

١٣

دەنگی کەڵەباب و بانگی وەختی سەحەری
زانیوتە لەبەر چییە ئەکا نەوحەگەری
یەعنی کە لە ئاوێنەی سوبحا دیومە
ڕۆیی لە عومر، شەوێک و تۆ بێ خەبەری

١٤

گیانم بەفیدای ئەو کەسە بێ وا ئەهلە
سەر گەر بخەمە ژێر بەری پێی لام سەهلە
گەر تۆ ئەتەوێ بزانی مەعنای دۆزەخ
دۆزەخ لە جیهان رەفاقەتی نا ئەهلە

١٥

ئەی موفتی لە تۆ گەلێ عەقڵدارترین
بەم مەستییەوە لە ئێوە هۆشیارترین

تۆ خوێنی کەسان[1] ئەخۆیت و من خوێنی ڕەزان
کـــامان لەوی ترمـــان بەد و خـــوێنخـــوارترین

١٦

ئیـــمـــرۆ کـــه ئەڵێن جـومـعـەیه بۆ ئیـسـلامـە
مـەی نۆش کـە بە قـەڕابە، چ وەخـتـی جـامـە
جـــاران قــــەدەحێ مــــووچەیی ڕۆژانەت بوو
ئیــــمــــرۆ دووە، چونکی (ســـیـــد الایام)ــە

١٧

ســـــانع کــــە گــــڵی وجــــوودی ئارایش دا
زانی چ ئەبێ لە فــــعلی ئێـــــمــــە پەیدا
بێ ئەمری نیـیـە هەرچی گـوناهێ کـە ئەکـەین
ســــووتانی جــــەهەننەمی لەبەرچی دانا؟

١٨

لازم نیــــیـــــە بۆ گــــوناهی زۆرت مـــــاتەم
غـەمـخـواری چ فـائیـدەی نیـیـە زۆر و کـەم
بۆ بێ گـــوناهان بەبێ لزوومــــە بەخــــشین
بەخــشــایشی خـوا، بۆ گـوناهە، نەتبێ خـەم

١٩

ئەبڕێتــەوە ئەم عــومــرە چ شــیـــرین و چ تاڵ
ڕۆح هاتە سەری لێوت، چ شا بی و چ حەماڵ
مەی نۆش کە، ساڵ و مانگ گەلێ پاش من و تۆ
مـــانـگ ئەوەڵی دێ و ئەگـــاتەوە ئاخـــر ســـاڵ

---

(١) شێخ نووری نووسیویەتی (جیهان) بەڵام کە گەڕامەوە سەر فارسییەکە نووسرابوو: (ما خون رزان خوریم و تو خون کسان)، بۆیە کەسان ڕاستترە.

٢٠

ئەی دڵ خەفەتی جیهان ئەکا غەمناکت
خۆ هەر دەرئەچێ لە لەشی ڕەوانی پاکت
دانیشە لەسەر سەبزە بژی چەند ڕۆژێ
تا دەرنەچووە سەبزە لە خۆڵ و خاکت

٢١

دام ناوە سەرم ئێستا بە فەرمانی شەراب
ڕۆحم بەفیدایی لەعلی خەندانی شەراب
هەم ساقی ملی سوراحیی وا لە دەسا
هەم گەیوەتە سەر لێوی قەدەح، جانی شەراب

٢٢

سەرکردەیی ڕەندانی خەراباتت منم
نێزیک لە گوناه، دوور لە تاعاتت منم
ئەو شەخسە بەتولی شەو هەتا وەختی سەحەر
خوێنی جگەری کرد بە موناجاتت منم

٢٣

دەستێ بە کەلامی خواوە دەستێ ملی جام
گەه یاری حەلاڵین و گەهێ دۆستی حەرام
ئێمەین کە لە ژێر گومەزی شینی چەرخا
نە[٢] کافری موتڵەقو نە موسڵمانی تەمام

٢٤

ئەو کافری بەرماڵ پەرستانە کەرن
چونکی لە ئیتاعەتی خودا بێ خەبەرن
بڕوانە لەژێر پەردەی ڕۆژ و نوێژا
ئیسلام فرۆشێکی لە کافر بەتەرن

---

(٢) لە دەستنووسەکەی شاعیر (نی) نووسرابوو.

٢٥

وا چاکە بەجامی بادە دڵمان شاد کەین
بەس هاتن و ڕۆیینی ئەم و ئەو یاد کەین
ئەم گیانە گورفتارە لە زیندانی غەما
با نەختێ لە بەندی خیرەدی ئازاد کەین

٢٦

سەبزە کە لەسەر کەناری ئاوێ ڕواوە
وا دیارە لە لێوی تازە لاوێ ڕواوە
مەیشێلە بە پێ، مەڕۆ بەسەریا بەغروور
بێ شوبهە لە ڕووی دڵڕوبایێ ڕواوە

٢٧

تینووم و دەستم بەجامێ نەگەیی
پێی سستی تەمەنناش بەمەقامێ نەگەیی
هێند مایەوە دڵ بەحەسرەت و ناکامی
تا (عاقبة الأمر) بە کامێ نەگەیی

٢٨

جۆرێکی وەها بڕۆ کە بۆت نەکرێ سەلام
وا بە لەگەڵ ئەم خەڵقە کە بۆت نەکرێ قیام
بۆ مەسجد ئەگەر بچی، فەقیرانە بچۆ
بانگت نەکەنە پێشەوە، بتکەن بە ئیمام

## بانگ کوردستان[1]

* استقبال و خوش آمدی بانگ کوردستان

ای غنچه ء شکفته ء بستان خوش آمدی
ای بلبل انیس گلستان خوش آمدی
صبح سعادت ازلی را خبر دهی
ای مبتدای جمله ء عرفان خوش آمدی
صد چشم تیره از قدمت یافت روشنی
بوی قمیص یوسف کنعان خوش آمدی
ای بانگ کرد و ناشر افکار عالمی
وی باعث تعالی کردان خوش آمدی
لب تشنه[2] در سراب جهالت بمرد کرد
ای قطره‌های رحمت باران خوش آمدی
ای ترجمان غایه و ناشر امل
وی مایه ء ترقی و عمران خوش آمدی
ای حسیات ملت واقوام را خطیب
وی ناصح سعادت و عرفان خوش آمدی

(١) له ڕۆژنامەی (بانگی کوردستان)ی ژمارە (٣)ی سالی (١)، (٢٧)ی ذی الحجة (١٣٤٠) (٢١)ی ئاغستۆسی (١٩٢٢)دا بلاوکراوەتەوە. لەو کاتەدا کە لەگەڵ (عەلی کەمال باپیر ئاغا)ی شاعیر (موحەریر)ی بەشە کوردی و فارسییەکەی بووە.

(٢) لە دەستنووسێکی مامۆستا (نەجمەددین مەلا) نووسرابوو: (لب نشنه...)

## ای شاه دستگیر

ای شـاه دسـتگیـر تو دست مـرا بگیـر
بنگر بەحال (نووری) بیـچـارەی فـقـیر
بی بَال و پرفـتـاده، پریشـان ز دردوغم
پا بسـته همـچو بلبلی اندر قـفس اسیـر
چون مرغ سر بریده تپـیده بەخون خویش
گـریان زتاب مـحنت و نـالان به زخم تیـر
اورده رو بـه درگـــــه والای ایـن وزیـر
می گـوید این ترانەی دلسـوز و دلپـذیر
ای شـاه دسـتگیـر تو دست مـرا بگیـر
دست مـرا بگیـر که هسـتی تو دسـتگیـر(١)

٩٥٨/١/٢٥

(١) شێخ نووری ئەم چەند شیعرە فارسییەی هەر بۆ سەلماندنی توانایی خۆی لەو زمانەدا نووسیوەو هیچی تر.

# وقت ارشاد است

وقت ارشـاد است ای عـالی همم اعـیـان مـا
فـرصت است امـروز ای صـاحب هنر شـبـان مـا
این همـا فـریاد و سـعی و همی غلیـان مـا
بهـر اسـتـقـلال کـردان است این افـغـان مـا

***

مـوسم سـعی است نام و شـهـرتی پیـدا کنیم
فکر ملیت حکمـرانی کـرد احـیـا کنیم
خـاک در پشم حـریص غـیـره و اعـدا کنیم
انگهی بین الملل[1] نافـذ شـود فـرمـان مـا

***

ای دعـای قـوم کرد این خـواب غـفلت تابکـی
اخـتـیـار مـسکنت اظهـار ذلـت تابکـی
ای جـهـان مـعـرفت ای اهـل منعت تابکـی
بـاد در قـیـد اسـارت مللـک کردسـتـان مـا

***

سر زخـاک سفلیت بردار عـلویت خـوش اسـت
نعـمت ازادگـی سـودای مـلیت خـوش اسـت
ادعـای حـاکـمیت ذوق حـریـت خـوش اسـت
چیست این حـال اسف انـگلیز بـی سامان مـا

***

ارمن و گـرج و عـرب، افـغـان و فـرس و پهلوی
نـائـل امـال خـود گـشـتـنـد حـتـی مـوسـوی
ای مـلـل مـجـلـس اقـوام تـاکـی نشـنـوی
بانـگ ایـن قـوم نجـیـب و شـکـوه‌ی کـردان مـا

---

(١) له ڕۆژنامه‌که‌دا (المال) نووسرابوو.

ای سر افرازان ملت بگذرید از این نفاق
واصل مقصود گشتن حاصل است از اتفاق
نیست کمتر از (صلاح الدین) اگر باشد وثاق
سرور والا[۲] نسب محمود عالیشان ما

***

حسن نیت، قابلیت، فکر آتی، اتحاد
انتظام عسکری، نشر معارف، اقتصاد
از حکومت عدل و از افراد ملت اعتیاد
لازم است اموز تا مشبت شود عرفان ما

***

ای نگهبان وطن بیدار و صاحب حزم[۳] باش
از سیاست واقف و دل سخت و صاحب عزم باش
در خضر پیویسته کار آرای وقت رزم باش
تا شود محفوظ خاک پاک کردستان ما

***

ما مخالف نیستم، میل احبا میکنیم
خدمت همسایگان و پیر و برنا میکنیم
ماحق مشروع و ملک خویش دعوا میکنیم
مجلس اقوام باید کرد استحسان ما[٤]

---

(۲) له دەستنووسەکەی مامۆستا (نەجمەددین مەلا) (عالی) نووسرابوو.
(۳) دیسان له دەستنووسەکەی (نەجمەددین مەلا)(عزم) نووسرابوو.
(٤) لەبەرئەوەی نووسینەوەی ئەم شیعرە فارسییانە بەرێنووسی کوردی نابێتە هۆیەک بۆ تێگەیشتنیان، بۆیە بڕیارم دا هەر بە رێنووسی فارسی بیاننووسمەوە.
* ئەم شیعرەی دەرهەق بە(عصبة الأمم) وتووە.

# عەسكەر[1]

سەف سەف كە دێن و تێئەپەڕن چست و باويقار
مـازی لە سـیـدقی ئێـوە، ئەبینم ئەكـا فـیـرار
سوبحێكی پاک و بێ غـەش ئەبینم وەكـو بەهار
موستەقبەلێكی بێ لەكە، پڕ كەیف و نەشئەدار
بێ تۆز و بێ غوبار
ئەی قەهرەمانی عەساكری كورد، لەشكری ویقار
ئەی دافیعی وەتەن، لە مەزەللەت، لە ئینكسار
ئەی نەورەسـیـدەی وەتەنی مـات و غـەمگوسار
ئەی مـایەی تەرەقی مـیللەت بە ئیـفـتـیـخـار
ئەی كوردی نامدار
ئێـوە مـەداری غـیـرەتی مـاددیی مـیللەتن
ئێـوە مـودافـیـعی وەتەنی پاک تینەتن
ئەولادی پاكی مـیللەتی كـوردی بە هیـمـەتن
لای مـیللەت ئێـوە، تاكـو بفەرموون بەقـیـمـەتن
ساحێب غیرەتن
ئەی عـەسكەر، ئەی منالی جگەرگۆشەی وەتەن
ئێـوە بەجـان و دڵ كە حـیـمـایەی وەتەن ئەكـەن
ئێوەن بەدڵ كە سەرفی ئەكەن غـیـرەت و بەدەن
ئێـوە وەتەن لە زیللەت و مـیـحەن نەجات ئەدەن
ئامادە بۆ كەفەن
ئەمـڕۆ زەمـانی سـەعـیـیـە، عـەتالەت بڕایەوە
سـەرچاوەی ئومـێـدی وەتەن وا ژیایەوە

(1) ئەم شیعرە لە ساڵی (1922)دا بۆ سەربازە لاوەكانی (شێخ مەحموود)ی ئەمری وتووە، كە بەڕووی داگیركەرە ئینگلیزەكاندا وەستاون.

غونچەی ئەمەل، شکۆفەی[2] مەقسەد گەشایەوە
نووری حکوومەتی وەتەنی شەوقی دایەوە
دەرگا کرایەوە
عەسری تەکامولە، ئەمە عەسری ئوخووەتە
عەسری حیمایەی حەقی ئەقوام و میللەتە
قەومێ کە حیسە بەر نەبێ لەم وەقتی فرسەتە
ئەو قەومە جێی سەحایفی تەئریخی لەعنەتە
مەحکوومی زیللەتە
تا حەشر ئەبێ بنالێ لە ژێر باری زیللەتا
باری گرانی زەیقەت و[3] دەردی نەسارەتا
عومری سەرف بکا لە مەرارەت، لە میحنەتا
بێ حەق ئەبێ بژی لە حەیاتێکی وەحشەتا
قەهر و مەزەللەتا
ئیتر وەرن کە بۆ وەتەن، وەتەنی پاک و میهرەبان
دەس دەینە دەستی یەکتری یەک دڵ، بەیەک زبان
ئێمەش بمانەوێ وەکو خەڵقی حەقی ژیان
ئەم فرسەتە غەنیمەتە، نەڕوا لە دەستمان
تا ماوە ڕۆح و گیان

---

(٢) هەرچەندە پشتم بەڕۆژنامەی ڕۆژی کوردستان بەستووە لە نووسینەوەی ئەم شیعرە، کە ئەوساکە «شێخ نووری» خۆشی نیشی تێدا کردووە، بەڵام لە دوو دەستنووسی تری مامۆستا (نەجمەددین مەلا)دا نووسرابوو (شکۆفەی مەقسەد) منیش هەر وشەی (مەقسەد)م پێ ڕاستترە وەک لە (شکۆفەی میللەت).

(٣) هەر لەو دوو دەستنووسەدا (زەیقەت) نووسرابوو. منیش هەر ئەوەم بەلاوە ڕاستترە، چونکە ناشێ دووجار و لە دوو دێرە شیعری یەک بەدوای یەکدا ئەم وشەی (زیللەت)ـە دووبارە ببێتەوە.

## نامەیەکی شیعری

له «شێخ نووری»ەوه بۆ «زێوەر»[1]

ئەی بادی سـەبا! پەیکی خـەیالاتی ئەدیبـان
ئەی مـیـروەحـەیی فـێنکی زامی دڵـی سـووتاو
ئەی بادی خەرامان
وەخـتێ کـە ئەدەی شـەو لە لق و پۆپی درەختـان
سـەد دەنگی نەی و ناڵـەیی عـوودت بەفـیـدابێ
ئەی موتریبی ناڵان
گەر تۆ نەئەبووی، ئەی ئەسەری قودرەتی لاهووت
چۆن پێئـەکـەنی خونچە دەمی سوبحی بەهاران؟
ئەی نەیزەنی بوستان
چۆن ناڵەیی مەحزوونی کەوی مەدانی[2] کێوان
تەئسـیـری ئەکـردە جگەری لەت لەت و برژاو؟
ئەی مونسی مورغان
ئەی بادی سەبا! هەستە مـەوەستە وەکو ئینسـان
رووبە بکەرە مـەسکەنی جـارانی سـولەیمان
مەدفوونە لە سەیوان
ئەو شـارە کـە مـەشـهـووره بە کـاشـانەیی بابان
یەنبووعی ئەدەب، کانی گوهەر، مەنبەعی عیرفان
هەم لانەیی شێران
سـەیرێ بکە بنوارە بە شـار و بەکـەنارا
دەورێ بدە نەخـتێ لە دەمی سـوبحی بەهارا
ئەی بادی دلارا

---

(١) لەو کـاتەی وەزیفەکەی «شێخ نووری»یان گوێزایەوە بۆ هەولێر، ئەم نامە شیـعرییەی بۆ (زێوەر) ناردووە.

(٢) کەوی مەدانی کێوان: کەوی دامەنی کێوان (بڕوانە فەرهەنگۆکی ئەم دیوانە).

ئەم نامــەیە جـوان بگرە بەدەســتــێکی بلوورین
ڕازاوەتەوە، چونکە بەمــیــهــر و مــەه و ئەخــتــەر
عەینەن وەکو ئەفسەر
بەو شــەرتە لە تەقـدیمی ئەوا واســیــتــە بۆ(ژین)[٣]
بیـخەیتە سەری شاهی ئەدەب، حەزرەتی (زێوەر)
ئەی بادی پەیەمبەر
زاتێکی ئەدیبــە، بەئەدەب بچـــووە حـــزووری
عـــەرزی بکە، چاکــە بەدڵی ئێـــوەیە (نووری)
هەر ماتە لە دووری
عـەرزی بکە، ئەی هەیکەلی شـیـعـر و ئەدەبیـات!
بۆ دەنـگی بەســە گـیــانە لە ئوتێلی «شـەریفـا»[٤][٥]
ئوسـتـادی ئەدەب، شـاعـیری پڕ فـیکر و خەیاڵات
نابۆ بەزەییت بۆ بەغــــەریبــێکی زەعــیـــفـــا
مەزلووم و نەحیفا
ئاخـــۆ ئەســـەرێ مـــاوە لە ســـەیرانگەهی (یارە)
چوارشـــەممە ئەڕازانەوە، ئەورەســـتـــە نیــهـــالان
وەک توولی ئەمامان

---

(٣) ئیشارەتە بۆ ڕۆژنامەی ژین.

(٤) لە ڕۆژنامـەکـەدا (شەریف) نووسرابوو، من بۆ ئەوەی لەنگ نەبێ لەگەڵ (زەعـیـفـا) و (نەحـیـفـا) بسازێ، ئەلفێکم بۆ زیاد کرد.

(٥) ئوتێلی شـەریف: دەڵێن ئوتێل و چایخـانەیەکە لەو سـەردەمـەدا کـەوتبـووە بەرانبـەر مـاڵی «شـێخ مەحـموود»ی نەمرەوە. ئەم چایخـانەیە جێی کۆبوونەوە و یەکـتر بینینی مونەوەر و ئەدیبـەکـانی ئەو سەردەمە بووە. بەنـاوی خاوەنەکەیەوە (وەسـتا شـەریف) ناوی دەرکردووە کە وەسـتـایەکی زۆر تووڕە و تەنگاو و چیکڵدانە بچووک بـووە. ئەوانەی لەو چایخانەیەدا دادەنیشتن بەزۆری کوڕەکـانی ئەشرافی شار بوون. ئیتر ئەو چایخانەیە کراوەتە مەڵبەندی شیعر خوێندنەوە و موناقەشەکردن. هەندێ جاریش دەســتــیـان دەدایە تووڕەکـردنی وەسـتـا (شـەریف)، ئەویـش کـە تووڕە دەبوو دەکـەوتە قـۆری و پیـاڵە شکاندن. دوایی دانیشتوان پارەیان بۆ کۆدەکردەوە و کەلوپەلی تازەیان بۆ دەکڕییەوە.

لاگـیـره بەسـەریانەوە، وەک ڕۆژی درەخـشـان
گـەردانە لە ملدا ئەبووە مـاهو سـتـاره
بەم فەسڵی بەهاره
چوارشـەممە کـە دێ، ناڵە ئەکـا دڵ لە قـەفـەسـدا
وەک مورغی ستەمدیدەیی مەحبووس و موکەدەر
وەک کـۆتری پابەسـتـە، لە ئەسنایی هەوەسـدا
مـەبهـووت و سـەراسیمـە، مـوکـەدەر لە مـوقـەدەر
بێ تاب لە نەفەسدا
دایم دڵەکـەم ئێسـتـە لەلای (قـۆرییـە شکاو)ـە(٦)
ئەو جێـیە کە مـەشهـووره بە مـەڵبەندی نیگاران
جێی سوحبەت و سەیران
چۆنە ئەسـەری مـاوە؟ وەیا بۆتە کـەلاوە؟
کـیـسـرایی سـولەیمانیـیـە، ئاسـاری نەمـاوە!
هەر بوومی لەناوە!(٧)

(٦) قـۆرییە شکاو: لە خـوار قوتابخانەی سناعەی ئەمڕۆ بوو، بریتی بووە لە دەشـتـێکی چۆڵ و هۆڵ، چوارشـەممـوان، ژنان دەچوونە ئەو ناوە بۆ سـەیران و کوڕە لاوەکـانی سلێـمـانیش ئێـواران بەپیاسـەکردن ڕوویان دەکردە ئەوێ.

(٧) پیاو کە ئەم شیعرە دەخوێنێتەوە، چامە شیعرییە بەرزەکەی (نالی) بیر دەکەوێتەوە کە بۆ (سالم)ی ناردووە.

## بەموناسەبەتی تەبدیلی ناوی ڕۆژنامەی
## (ژیانەوە) بۆ (ژیان) تەقدیمە

دەوری تەجەدودت وەکو ماهێ لە ئاسمان
هەڵهات و بوو بەدافیعی زوڵمەت لە ئینس و جان
نوورت ڕژانە مەجلیسی ئەفکاری عاقڵان
بوویتە ژیانی دوشمنی بەدخواهی کوردەکان
ئەی ناشری مەعاریف و ئەی خەسمی جاهیلان
ئەی موحتەرەم ژیان
ئەی نەورەسیدە، لالەیی باغی تەفەکورات
ئەی نەودەمیدە، غونچەی پەژمردەی حەیات
ئەی باعیسی تەظاهوری ئەفکار و حسیات
ئەی سەفحەی وەقایعی مەظبوطی کائینات
ئەی خادیمی مەعاریف و مەجمووعی خاطرات
ئەی ڕەونەقی حەیات
ناوت لە پێشەوە کە نرابوو (ژیانەوە)
بۆ وەسڵی غونچەیە بوو لە خار و خەسا نیهان
ئێستا لە سایەی عەدل و هەوای زەمانەوە
هەر کوێرە کانییەکی ئەمەل بوو ژیانەوە
غونچەی ئەمەل، شکۆفەی مەقسەد گەشانەوە[1]
یەعنی (ژیانەوە) کە ئەمەل بوو. بووە ژیان
ژیانێکی جاویدان
ئەمجا لە بۆ سەعادەتی ئەم قەومە فرسەتە[2]
ئەوەل سەعادەتی غیرەتە، موستەقبەلێکی پاک

---

(١) ئەم دێرە لە شیعری (عەسکەر)دا و لە کۆپلەی (٥)و دێری (٣)دا دووبارە بووەتەوە.
(٢) ئەم کۆپلەیەش تارمایی و سێبەری دوا کۆپلەی شیعری (عەسکەر)ی پێوە دیارە.

ڕووناک و بێ پەڵە وەکو سوبحێکی نەوبەهار
هەر ئینتیزاری غیرەتی ئەفرادی میللەتە
هاوار ئەکا بەحوزنەوە، ئەی قەومی نامدار
ئیحرازی مەعریفەت بکە، بۆ ئاتییەکی چاک
ڕووناک و خۆش و پاک
ئەو بارە بەردە قورسە، ئەنسالی مازییە
جێی هێشتووە بە زیادەوە تەحمیلی ئێمەیە
با زیاتری نەکەینەوە بۆ نەسلی ئاتییە
ئەسبابی لەعنەتی بەد و تەجهیلی ئێمەیە
ئیحرازی سەد وەدیعەی ساحێب سەمەر بکەین
تەودیعی بەطنی ئاتی و عەرزی هونەر بکەین
لەوسەر حەزەر بکەین

## من و گەلاوێژ[1]

گـەلاوێژی فـەلەک پەیما! ئەیا خـورشـیـدی بێـداران
ئەیا هەمدەردی غەمخواران
لە وادی حیرەت و سەرسامییا ڕەنجوور و سەرگەردان
بەنووری گـریە ئالوودت بەسـەر تاریکیی شـەودا
ئەرێژی ئەشک و عـالەم وا لەناو بیروشـەی[2] خەودا
کەچی تۆش والەو و شەیدا
زەبوونی هات و چۆی دایم، بە جـۆرێکی حـەزینانە
بەدایم هەر خـەریکی لابەری تاریکیی شـەوگـار
بەنووری تیشکی پرتەودار
لە دەشـتی چۆڵ و هۆڵـی ئاسـمـانا تۆش بەوێنەی من
خـەفـەت بارانە، نەسـرەوتوو، جگەربریان و بێ ئارام
شپرزەی میحنەت و ئالام
وەکو من تۆش بەشەوگاران خەو ئەسپێری بەڕۆژی پاک
وەنەوزێ ناکـەوێتـە چاوەکـانت، ئەی پەری ڕەفـتـار
لەگەڵ چاوێکی پرشنگدار
ئەڵێی ئیلهامی هەڵسانی خەوی، ئەی نەجمی بێ پەروا
بەفـرمـێـسکی ئەلەم رێزانەوە، لەو دوورەوە ئایە توخـوا[3]
لە چی حاڵی ئەبی. ئەمما
وەها دیارە مـن و تۆ... مـن لە ئەرزا، تۆ لە گـەردوونا
لە سـەرگـەردانیـا وەک یەک، لە دەریای بێ بنی بـوونا

---

(١) مەبەستی ئەستێرەی گەلاوێژە.

(٢) بیروشەی خەو: خەوی قووڵ

(٣) ئەم دێرەی تەواو نەکردووە. ویستوویەتی دوو وشە بنووسێ و لە دواییدا کوژاندوویەتییەوە، بەڵام بەئایە توخوا دەخوێنرێتەوە.

تەکوتارمانە[٤] هەردوو، من لە شوێن ئامال و تۆ ئالام
بەڵام وەک مـوبتـەدای بێ خـەبەر، ئاغـازی بێ ئەنجـام

(٤) لە دەستنووسی شاعیر نووسرابوو (تەقەڵلاتە) کە دیارە هەڵەی نووسینە و (تەقەڵلامانە)یە، بەڵام ڕەشی کردبوویەوە و لە شوێنی ئەوە (تەکوتارمان)ی نووسیبوو، لە داوێنی شیعرەکەشدا مانای (تەکوتار)ی بەڕاکردن لێکداوەتەوە.

ئەخلاقی

## ڕوتبەی عەزەمەت

ڕوتبـەی عـەزەمـەت، لائیـقی زاتێکە بزانێ
وەک خـــۆشی دەزانێ و بزانێ کـــە دەزانێ
نەک لائیـقی شـەخسـێکە، نەزانێ و نەزانێ
نازانێ ئەوە خـۆشـە بەلای خـەڵقی جـیـهـانێ
بێ سوود و زیانێ[1]

***

نابی بەمـونەوەر بەگـوڵی یەخـەیی چاکـەت
عـومـانی سـەراب، بوونی بەدەریاچە مـەحـاڵە[2]
زەرد ڕووکـەشی زیویشی ببێ، نایەتە قـیـمـەت
ئیـعـلانی عـەوارض، وەکـو ئیـسنادی خـەیاڵە
تابع بەزەواڵە
وەک شەوقی تەپاڵە
تۆ چیـــهــرە بەپۆدرە مـــەبەرە دەورەیی عـــالی
ناگـاتە گـوڵێ، باری کزەی وەرسـەیی خـاشـاک
وەک تەیری مـوقـەبا، کـە لە کـاغـەز پەڕ و باڵی
بۆ بکرێ ئەفـــڕێ، وەها دێتـــەوە ســەر خـــاک
غولیا زەدە غەمناک
(لاوانتە)[3] دووسـەد شـووشە بـەخۆتا بـڕژێنی
وەک غـونـچـە بەسـەر دڕکـەزییـەکـا، بـچـەقـێنی

(١) لە ڕۆژنامـەی (ژین)ی ژمارە (١٣٦٥)ی سـاڵـی ١٩٥٧ کە ئەو شیـعرە بڵاوکراوەتەوە دوو دێری کۆپلێتی یەکەم و سەرجەمی کۆپلێتی دووەم نەنووسرابوو.

(٢) دەتوانین ئەم دێرە بەم جۆرەش بخوێنینەوە (عومانی سەراب، بوونی بەدەریا، چ مەحاڵە).

(٣) لاوانتە: جۆرە گولاوێکی بەناوبانگی ئەو سەردەمە بووە.

بێ نەشئەیە چۆن مردوو بەزیندوو ئەدوێنی
مەر[٤] بلبلی ئەو گوڵشەنە هەر خۆت بی بخوێنی
بۆ کەس نییە بێنی

***

(بی) تاڵە ئەگەر شەککەر و شەهدی بەسەراکەی
نەشئەی نییە، هەر سواڵەتە سەد پڕ بێ لە بادە
چیلکە چییە؟ باکورتەکی سەوزی بە بەرا کەی
گەر عاقڵی لەم ژینە بێ قیمەتە لادە
ئەم کیبرە بەبادە[٥]

(٤) مەر: واتە مەگەر.

(٥) بۆ نووسینەوەی ئەم شیعرە پشتم بەدەستنووسێکی مامۆستا (نەجمەددین مەلا) بەستووە کە شێخ نووری خۆیشی چاوی پێدا خشاندووەتەوە و ئینجا ناردوویەتی بۆ مامۆستا (گیوی موکریانی).

## بۆ یانەی سەرکەوتن[١]

دوێ شەو لە خەوا سیروەی بادی سەحەر ئەنگووت
وەک سوبحی بەهاران
شەو عاقیبەتی هات و دڕی سوبحی گریبان
ڕۆژ بووەوە لە کوردان
غونچەی فەرەح و نەشئە، دەمی دایەوە پشکووت
وەک چهرەیی یاقووت

---

(١) جەنابی (مەعرووف جیاوک) ئەو بیرەی هێنایە پێشەوە و لە (٩)ی شوباتی ١٩٣٠دا بۆ دامەزراندنی کۆمەڵەیەکی زانستی، داوایەکیان دا بەوەزارەتی ناوخۆیی. هەرچەندە زۆر کەس خۆیان لەو داوایە کێشایە دواوە، بەڵام خوالێخۆشبوو (ئەحمەد موختار بەگی زەهاوی) کە لە قوتابخانەی حەربییەدا بەئەفسەر دەرچوو بوو، هەروەها حقووقیشی تەواو کردبوو، لەگەڵ یوزباشی (محەمەد عەلی بەگی عەبدولعەزیز) و (عارف بەگی پشدەری) پارێزەر ئەم پێش نیهادەیان بەشەوق و هەوەسەوە مۆر کرد. پاش ئەوەی داوایان دایە وەزارەتی ناوخۆیی و دوای گێرەو کێشە و ماندووبوونێکی زۆر، بە ژمارەی (٦٤٩٥)ی مێژووی ١٩-٢٠ /ی مایسی ١٩٣٠ ڕەزامەندی کردنەوەی یانەی سەرکەوتنیان داین. جەنابی مەعرووف جیاوک هەر زوو لە ڕۆژی (٣٠)ی مایسی ئەو ساڵەدا لە سینەمای ڕۆیاڵ بەئاهەنگ و بەزمێکی زۆر جوان و قشتیلە (یانەی سەرکەوتن)یان کردەوە. دوای دوو ساڵ یانە لە ئیش و کاری خۆی کەوت. تا لەڕۆژی (١)ی نیسانی ١٩٤٣ لە لایەن جیاوکەوە بووژایەوە و دەستەیەکی تازەیان بۆ هەڵبژارد، تا بەڕێوەی ببەن. یانە ئەم جارەش کەوتە ئیش کردن. ئامانجی دامەزراندنی ئەم یانەیە بڵاوکردنەوەی زانست و زانیاری بوو لە پاڵ بایەخدان بەپیشەسازی و بازرگانی و کشتوکاڵ تا بەشێوەیەکی هونەری بەرهەم زۆرکەن. هەروەها بەخێوکردنی لاوانی کورد بەپێی پەروەردەی نوێ. ئەوەبوو یانە هەوڵی دا قوتابیان بۆ تەواوکردنی خوێندن لە بەغدا بیانهێنن لە یانەکەدا جێگەیان بۆ بکەنەوە و لە ژێر چاودێری خۆیان خوێندنیان پێ تەواو بکەن. ئامانجێکی دیکەی یانە دروستکردنی چەند لیژنەیەک بوو بەپێی شارەزایی و پسپۆڕی بۆ کتێب دانان و وەرگێڕان، بۆ نووسینەوەی فەرهەنگ و دەستووری زمانی کوردی، تا بتوانێ هەموو کوردێک بەئاسانی لە کورد زوبانێکی دیکە بگات. مانگی جارێکیش ئاهەنگی یەکترناسین و خۆشەویستییان ساز دەکرد (بۆ ئەوەی خەڵقی بمانناسن و تێمان بگەن کە ئێمەش وەکو ئەوان ئینسانین و مافی ژیانمان هەیە) بۆ سوودی زیاتر بنۆڕنە کتێبی (باربوو) کاری یانەی سەرکەوتن: نادي الأرتقاء ژمارە: ١ پەیامی تبرعات ١٩٤٣ - ١٩٤٤، چاپخانەی النجاح، بەغداد

ئافاقی ئەمەل بوو بە چەمەنزار و[2] گوڵستان
وەک ڕەوزەیی ڕیزوان
ئاونگی مەسەڕڕەت لە گوڵستانی ژیانا
وەک دوڕ لە بەیانا
پەخشانە لەسەر پەرچەمی گوڵ، کاکۆڵی ڕەیحان
وەک لەعلی درەخشان
نێرگز قەدەحی کەیلە، لە بادە شەوی شەبنم
پڕ زەوق و تەرەننوم
جامی زەڕی داناوە لەسەر پەنجەیی ئیحسان
وەک ساقی بێ ڕەقسان
شەوبۆ کە بەشەو بۆی هەبوو بۆ بەزمی تەماشا
کردی لەوە حاشا
بەم نەشئەیە سەد شووشە گوڵاوی گوڵی پڕژان
وەک شاهیدی بوستان
مینا لە زەفافایە، بە سەر سەرییەوە تارا
وەک گوڵ لە بەهارا
ڕەقسیانە لەگەڵ یاسەمەن و عەرعەری بوستان
پڕ نەشئەو و خەندان
فەریادی مەسەڕڕەت لە کەژ و کێو و نزارا
ئیعلانە لە شارا
قاسپەی کەو و هاژەی چەم و بەفراوی چیاکان
خۆش لەهجەو و ئەلحان
من هەر موتەحەییر[3]، ئەمە یاڕەب چ ئەسەر بێ
بۆچی و چ خەبەر بێ؟

(٢) لە ڕۆژنامەی ژین-دا کە بۆ جارێکی تر بڵاوکراوەتەوە نووسیویە: (چراخان و گوڵستان)
(٣) لە ڕۆژنامەی ژیندا: (مەبن موتەحەییر) نووسرابوو.

ئەم کەیفە چییە پڕ لە نەباتات و لە ئینسان
بۆ چین هەموو شادان
تاکە سەنەمێ، لەب شەکەرێ، غونچە دەمانێ
شمشادی میبانێ
شیرین سوخەنی تازەی تەڕ، مادەری کوردان
وەک یووسفی کەنعان
گورج هاتە تەکەللوم وتی: ئەم عەیش و سرووره
ئەم شایی و سووڕه
بۆ (یانەی سەرکەوتن)ـــە ئەم عالەمە شادان
هاتوونەتە جەولان

## لە بارەی ئەم شیعرانەوە

شێخ نووری وەک ئادەمیزادێکی بەوەفا و بەئەمەک، بە سەرکەوتنی دۆست و ئاشنایەکانی بەختەوەر و شادمان بووەو بەنووچدان و کەوتنیان نیگەران و خەفەتبار بووە. کاتێ دەستی ڕەشی مردنیش ئالای تەمەنی هێناونەتە خوارەوە، ئەم بەپاکترین و ڕاستگۆترین شیعر، شیوەنی بۆ نووسیون، وەک دەبینین لەناو ئەم دۆستە خۆشەویستانەی -شێخ مەحموود-ی نەمری لە هەموویان زیاتر بەسەر کردووەتەوە و بەتەواوی ویستوویەتی تەعبیر لە کەفوکوڵ و جۆش و خرۆشی دڵی پڕ لە خۆشەویستی و ڕاستگۆیی دەروونی خۆی بۆ دەربخات. بێگومان لاوانەوەی خۆشەویستان و ئازیزانیش ڕاستگۆترین شیعرە، چونکە ئەو فرمێسکانە کێش و قافیە بەسەریدا نەسەپاندوون. ئەوەندەی قووڵی برین و چۆڕاوگەی خوێنی دڵ و هەناسەی پڕ لە کەسەر و فرمێسک و ئاخ و ئۆف سەپاندوویەتی. نەخوازەڵڵا ئەو لاوانەوەیەی کە بۆ پارەو دەسکەوت و بەرژەوەندی تایبەتی نەگوترابێ، چونکە تەقینەوەی کانی خەمێکی ڕەسەن و ڕاست و دوور لە درۆ و دەلەسەیە، ئەم جۆرە شیعرەش جۆرە قەرزدانەوەیەکە. ئەوەی بڕوای بە(لاوانەوە) نەبێ، هەرگیز بڕوای بە (وەفا) نابێ!

## شیوەنی شێخ عەزیزی[1] برای

له فـوارەی دڵ لەبەرچی خـوێنی گـەش نەڕژێتـه سـەرچاوم
لەبەرچی سـوور نەبێ داوێنی بەدبەخـتـیی به خـوێناوم
کـه من زانیَم ئیـتـر مـەرهەم نییـه بۆ جـەرگی سـووتاوم
ئەناڵێـنم له دووری تۆ، ئەڵێم شـەرته[2] هەتا مـاوم
ئەسـیـری خـاکی گـۆڕ و نەوجـەوانی پڕ مـەلالم ڕۆ
عـەزیزم ڕۆ، عـەزیزم ڕۆ، عـەزیزی نەونیـهـالم ڕۆ
بەئومـێـدی ئەوەی بێـمـه سـەرینت هەروەکـو مـەجنوون
له دووجـەیلی نەهاتیـدا ئەناڵێنێ دڵەی مـەفـتـوون
بەفرمێسکی پەژارەم چۆڵی(قـفره)م[3] ئاو ئەدا مەحزوون
کـەچی ئەمـڕۆ بیـابانێ بەخـوێنی دڵ ئەکـەم گـوڵگوون
ئەسـیـری خـاکی گـۆڕ و نەوجـەوانی پڕ مـەلالم ڕۆ
عـەزیزم ڕۆ، عـەزیزم ڕۆ، عـەزیزی نەونیـهـالم ڕۆ

***

(١) شێخ عـەزیز کوڕی شێخ سالـح: له ساڵی (١٩٠٧)دا له شاری سلێمـانی له دایک بووه. تا پۆلی پێنجەمی سەرەتایی خوێندووه. بەپێی نووسراوی ژمـاره (٤٥)ی سـاڵی (١٩٢٧/٧/٢٣) بۆ یەکەم جار له قەرەداغ بووه به(قۆڵچی مـالییـه). له (٢٣)ی تەمموزی (١٩٢٧) له وەزیفەکەی موباشەرەی کردووه. دوا بەدوای ئەم وەزیفەیه کۆمـەڵێ وەزیفەی تری بینیـوه وەک قـۆڵچی مـالییـەی (ناحیـه)ی سەرچنار و ناحیـەی مەرکـەز، ئینجـا (کاتب مـوفرەداتی مـالیـیـه) له مـەرکەزی سلێمـانی، تا بووه به(معاون مەئموور ئیستیهلاک) له سلێمانی و دواییش بووه به (مەئموور) نیستـیهلاک له تەوێڵە. زمـانی کـوردی و عـەرەبی و فـارسیـشی باش زانیوه. له ١٩٣٦/٥/٩ یەک مـانگ مۆڵەتی نەخۆشی وەرگـرتووه، دوای ئەو مانگه چووه بۆ بەغـدا بۆ چارەسەرکردنی (ئاوبەند) و (الأجفان الجیبیة)، بەلام لەوێ له (١٩٣٦/٦/٢٠) کۆچی دوایی کـردووەو تەرمەکـەیان هێناوەتەوه بۆ سلێـمـانی و دوو کچ و کـوڕێکی له پاش بەجێ مـاوه. (سـوودم له دۆسیـەکـەی وەرگـرتووه، جگـه له سـەر و سـۆراخ کـردنی تایبەتی خۆم له بارەیەوه).

(٢) له ڕۆژنامەی بڕوا نووسرابوو: (ئەڵێم ئەم شیعره تا ماوم).

(٣) چۆڵی قفره: مەبەستی چۆڵی قوڵفەیه، ئەویش وشەیەکی عەرەبییه له (قفراء)ەوه هاتووه.

لەوێ دیجلە وەکیلی دیدەکەی من بوو بە لێڵی و سوور
سکووتی خەستەخانەت[٤]،بوو بەشینی عائیلەی ڕەنجوور
لەکاتی گیانەڵای مەرگا بەبێکەس مای، لە خوێشان دوور[٥]
ئەمە تیرێکە جەرگم کون ئەکا تا ڕۆژی نەفخی صوور
برایی جەرگ و دڵ سووتاوی کوردی پڕ مەلالم ڕۆ
عەزیزم ڕۆ، عەزیزم ڕۆ، عەزیزی نەونیهالم ڕۆ[٦]

(٤) لە ڕۆژنامەی بڕوادا بە(سکوتی خستە خانەت) نووسراوە.
(٥) (لە تینی گیانەڵاو مردنا بێکەس، لە خوێشان دوور)یش هەیە.
(٦) پشتم بەدەستنووسی شاعیر خۆی بەستووە و ئەوانی تر ئەگەر جیاوازی بووبێ لەگەڵ دەستنووسەکە لە پەڕاوێزدا پەنجەم بۆ ڕاکێشاون.

## شیوەنی مەلا مەحموودی بێخود[1]

خــەمم نەدیوە کــە دڵ هەڵدڕێ وەکــو نەشـتــەر
خــەمم نەدیوە وەکــو تیــر بدا لە بەندی جگەر
خــەمم نەدیوە کــە ڕووناکی و فــەڕەح لە دڵا
وەها نەهێڵێ، لە جێگەی نەمێنێ شوێن و ئەسەر
خــەمم نەدیوە لەســەر تەخـتــەنەردی دنیــادا
وەها ببەستێ لە خۆشی و لە پێکەنین شەشدەر
خــەمم نەدیوە بەری خـــوێنی دڵ وەها بەردا
لە فــوارەیی دڵەوە هەڵقــوڵێـتــە دیدە و ســەر
مــەگــەر خــەمێ کــە لەناکــاو ڕژایە لادێ و شــار
بەکـــارەســـاتی وەفـــاتی ئەدیبی دانشـــوەر
حەفــیـدی حەزرەتی عـەللامـە، مـوفـتی چاومـار[2]
فەقـیـدی مـیللەتی کـورد، جـێنشـینی جەد و پدەر
جەنابی (بێــخــود) ئەفــەندی ئەدیبی بەرزی وڵات
یەکـەم مـوسـەوری دنیـای سروور و حـوزن و کـەدەر

(١) لە ڕۆژی (٣/١٠/١٩٥٥)دا بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی سلێمانی، کە ئەوسا (عەزیز محەمەد قادر) بەڕێوەبەری بوو، بەبۆنەی تێپەڕبوونی چل ڕۆژ بەسەر کۆچی دوایی مامۆستا (مەلا مەحموودی بێخود ١٨٧٨-١٩٥٥) لە قوتابخانەی سانەوی کوڕانی سلێمانی و بەچاودێری متەسەڕیفی ئەوسا (عومەر عەلی) کۆڕێکی ماتەمیان بۆ گێڕا، دانیشتوانی شاری سلێمانی و پیاوماقوولان و ڕۆشنبیرەکانی بۆ ئەم چلەیە بانگ کرابوون. لەو چلەی ماتەمە (عەبدولڕەحمان بەگی نفووس، ڕەمزی مەلا مارف، شێخ محەمەدی خاڵ، ڕەوشەن بەدرخان، شێخ نووری شێخ ساڵح، عەلائەددین سەجادی، ڕەشید نەجیب، عەلی کەمال باپیر، ئەحمەد هەردی) وتار و شیعریان تێدا خوێندووەتەوە. (شێخ نووری شێخ ساڵح)یش ئەم شیعرە شیوەنەی لەم کۆڕەدا خوێندرایەوە، لەبەرئەوەی مردنی (مەلا مەحموود)ی خاڵی شێخ نووری کارێکی زۆری تێکردبوو، خۆی بەقورگی پڕ لە گریانەوە نەیتوانیبوو شیعرەکە بخوێنێتەوە، بۆیە دابوویان بە مامۆستا - ئەحمەد هەردی - لە جیاتی ئەو بیخوێنێتەوە.

(٢) موفتی چاومار: ئیشارەتە بۆ ئەوە کە (بێخود) کوڕەزای زانای گەورە و بەناوبانگ (مەلا ئەحمەدی چاومار)ە کە ئەم بنەماڵەیە لەم وڵاتەدا سەد ساڵ لەسەریەک خزمەتی خوێندن و ئاین و ڕەوشت و خووی جوانیان کردووە.

له ئاسـمـانی ئەدەبدا، بەباڵی تیـژی زەکـا
فـڕی هەتا گـەییـیـە بەرزیی کـەمـاڵ و هونەر
ئەدەب لە ڕۆحی ئەوا چەشنی خوێن ئەهات و ئەچوو
وەکـو فـوارە هەڵئـەڕژایە سـەر پەڕەی دەفـتـەر
لە مـوبتـەداوە وەها تێـپـەڕی بەیەک هەنگاو
گەیشتە تەوقە سەری کێوی سەخت و بەرزی خەبەر
لە بەحـری بێ بنی عـیلمـا، هەتا بلـێیی مـەلەوان
لە ئەرزی بێ حەددی شیعرا، سەرۆکی سەیر و سەفەر
چ شـاعـیـرێ لە کـون و قـوژبنی خـەیاڵاتا
جـیـهـانی شـیـعـری وەکـو زەڕەیە ئەهاتە نەزەر
بەشـەو لەناو چەمـەنی نەزمی بلبلی ئیلهـام
تەرانە گـۆیی خـەیاڵاتی ئەو بوو، تا بەسـەحـەر
بەڕۆژ لە مەدرەسە، مەشغـولی عـیلم و تەفسـیری
کـەلام و سـورەو ئایاتی ئێـزەدی ئەکـبـەر
هەمـیـشـە مـەسـتی مـەی (لا اله الا الله)
قـەسیـدەخـوانی سەنای جەمـالی پێـغـەمـبـەر
خـەم و پەژارەیی کـۆچی حـەزین و دڵسـۆزی
بەجـارێ خـۆشی و شـادی جیـهـانی کـردە کـەدەر
حـەقی بەدەسـتـە کـە دڵ تا ئەبەد بناڵێنێ
مـیـسـالی دەنگی برینداری نایێ ناڵە لەبەر
حـەقـە کـەلام و بەدیع ڕەش لەبەرکـەن و ئاداب
لە قـوڕ بنیـشێ لە پێ وە هەتاکـو تەوقی سـەر
بەهەوری مـاتەمی، ڕۆژی دڵم وەها گـیـرا
بەحـاڵ تروسکە ئەدا، چەشنی چاوی تانە لەسـەر
سـەرێ نییـە کـە نەبێ گـێـژ و دەردەداری خـەفـەت
دڵێ نییـە، کـە نەبێ غـەمگوساری ئێش و کـەدەر

نەمـــردووە و هەر ئەژی ناوی بەرز و ئاســـاری
هەتا بمێنێ جیـهـان و سـەمـا و مـەه و ئەخـتـەر
ژیان و بەرزیی ناوی وەکـــو شـــوعـــاعـــێکە
هەتاکـــو لامـــوتەناهی وجـــوودی دێتـــە نەزەر
خـودا لە شیـعـر و لە ئینتـاجی عـیلم و ئەفکاری
دروســتی کــردووە بۆی هەیکەلێکی بەرزی زەفــەر
نەسب کــراوە لە ســاحــەی خلوود و ســەرمــەدیا
بەهەیبـەت و عـەزەمـەت، باقـیـە هەتا مـەحشـەر
بەنووکی خـامـەی برژانگ، لە خـوێنی دڵ (نووری)
بنووسـە سـاڵی وەفـاتی (فـەقـیـدی فـەزڵ و هونەر)[۳]



(۳) (لە دەستنووسەکەی خۆی (فقـیدی فضل و هنر)ی نووسیبوو کە بەحیسابی ئەبجەد دەکاتە (١٣٧٥هـ).

## شیوەنی شێخ برایمی برای[1]

بەشـــیـــوەن بۆ پڕا، بۆچی زبانـی لاڵ و گـــیـــراوم؟
بەفـرمـێـسکی جـەفـا هەڵهـاتووە برژانگەکـەی چاوم؟
ئەبێ بۆ هەر بەشی من نالە و گـــریان و مـــاتەم بێ؟
لەبەرچی دائیمـا هەر مـەستی غـەم، سەرخـۆشی زوخاوم؟
براله کـۆچی ناکـامـیت و جـێگای بێ سـەرو شـوێنت
بەجـــارێ تـانەیی لێـــلایی، وا هێنایە ســـەرچاوم
ئەمامی عەیشەکەم نێژرا، خەفەت گۆیکە و چرۆی دەرکرد
ڕەگ و تەرزی کـــەدەر ئالایە گـــیـــانی هەڵکرووزاوم
خـەفـەت دەستی لەمل کـردووم، دەمی غـەم وا لەناو دەما
مـــویەدەل بوو بەتالی، عـــەیش و نۆش و شـــایی و ڕاوم
بەدەم (با) و گـێـژەلووکـەی نەگـبـەتی و ئاسـیـبی دنیـاوە
بـەبـنـجـی دەردەوە، وەک پـووشـی بـا بـردوویـە ئـالاوم
بڵـێـسـەی ئاگـری مـەرگت بەنەوعێ دڵمی هەڵقـرچان
گـەیشـتـە عـەرشی ئەعـلا بۆ چرووکی جـەرگی سـووتاوم
مـەگـەر هەر دەسـتـەو ئەژنۆ دانیـشم بۆ حـالی خـۆم بگریم
مـەگـەر هەر قـوڕ بەسـەر خـۆمـا بکەم بۆ حـالی شـێـواوم
ئەڵێی سـەرچاوەکـەی دڵ بۆتە بەحـری خـوێنی ئاڵ و سـوور
لە خـوێناوی گـەشی فـرمـێـسکمـا بەم ڕەنگە گـەوزاوم
مـــەزانە بێکەس و تەنیـــا لە دوای تۆ من بەجێ مـــاوم
ســـەری خـۆی دائەنێ قـــەومی خـەفـەت، دایم لە پێناوم
لەســـەر لێـــوم ئەبێ ئەم ئاخ و داخ و ئۆفـــە تا مـــردن
لەســـەر چاوم ئەبێ فـرمـێـسکی خـوێناویی هەتا مـاوم

(١) شێخ برایم: لە ساڵی (١٨٩٧)دا لە شاری سلێمانی لە دایک بووە. بەکاروباری بازرگانی (تووتن کـڕین و فـرۆشتن)ەوە خـەریک بووە. ژنی هێنا بوو کـە بەنەخـۆشی (ئاوبەند) لە (٢٩)ی ئابی (١٩٥٠)دا کۆچی دوایی کردووە.

تەوژمی ئاهو لافاوی سروشک ئەمبا بەڕێگاوە
چڵ و چێوم[٢] بەبنجی داری بەدبەختییەوە گیرساوم
ببوورن ئەی ڕەفیقان زامەکەی وێرانە دڵ حەقییە
بەخوڕ ئەیدا بەدیدە جۆگەلەی فرمێسکی خوێناوم
لە ساڵی مەرگی تۆی پرسی یەکێ پێم وت: بەمووی برژانگ
ئەنووسم «شێخ برایم ڕۆ»[٣] بەخوێناوی گەشی چاوم

١٣٦٩هـ



(١) شێخ مارفی شێخ محەمەد غەریب
(٢) شێخ ڕەئووفی حەفید
(٣) شێخ ڕەئووفی شێخ ساڵح برای شێخ نووری

---

(٢) لە دەستنووسی شاعیر نووسرابوو: چل و چووم.
(٣) بەپیتی ئەبجەد دەکاتە ساڵی کۆچی دوایی شێخ برایمی برای.

## شیوەنی مەحموود جەودەت(1)

نەبووە قـەت نەمـدیوە تا ئێسـتـا لە پایزدا بەهار
بۆچییـەو بۆچی جلی شـینی لەبەر کرد کـائینات؟!
بۆچی وا وشک و برنگە، مـەوسـمی زسـتـانەکـەی؟!
بۆ ئەناڵێنێ بەهاوین، ڕەعدی بێ وەعدەی نەهات؟!
بۆ بەهاری خسـتـە پایز، بۆچی هاوین بوو بە دەی؟!
بۆچی زسـتـان بوو بەگڕ، بەربوو لە خەرمانی وڵات؟!
بۆچی (نووری) کـەوتە تەندووری فـیـراقی یارەوە؟!
بۆچی وا ئاوارەیە بلبل لەگـــوڵزاری حـــەیات؟!
ئەم ســـوئالانەم لە نەوزادی عـــەقڵ پرسی، وتی:
من جـوابێکم هەیە، تێـفکرە چەند مـەعـقـوولە لات
ســاڵەکــەی عــەکـســە ئەوی یارە ئەبێ ئاوارە بێ
گــەردنی ئەهلی کـەمـالیش بۆ پەت و سـێـدارە بێ(2)

938 - 1346هـ

(1) ناوی (محەمەدی کوڕی ئەحمەد جەودەتە کوڕی مەحموود ئاغای بچکۆلەیە) لە ساڵی (1889) لە سلێمـانی لە دایک بووە و لە تەمـەنی (5) سـاڵیـدا خراوەتە بەرخـوێندن. پاش دوو ساڵ چووەتە خوێندنگای ڕوشدییەی عـەسکەری لە سلێمـانی. دوای تەواوکـردنی لە سـاڵی (1907)دا چووە بۆ ئەستەمبووڵ. لە ساڵی (1911) کراوە بەئەفسەری دوو ئەستێرە و لەگەڵ ئینگلیز شێرانە جەنگاوە. لە ساڵی (1919) هاتووەتە سلێمانی و لە سوپای کوردستاندا لە کاتی شێخ مەحموودا دامەزراوە و لە ساڵی (1924)دا چووەتە سوپای عێراقەوە و گەیشتووەتە پایەی سەرۆکی یەکەم (رئیس أول). دوای ئەوە لە لەشکری عیراق جیابۆوە لە ساڵی(1930)دا بوو بەهاوکاری شۆڕشی (شێخ مەحموود) لە پیران و بازیان و زۆر مـەردانە ئازایەتی نواندووە. (ئەحمـەد حەمـدی ساحێبقـڕان و پیرەمێرد و گۆران) شیعریان بۆ وتووە و باسی ئازایەتی و جوامێری ئەویان کردووە. لەگەڵ ئەوەشدا کە خەباتگێڕ بووە، ئەم قـارەمـانە سـوارچاکی مـەیدانی نوسـین و وەرگـێـڕان و شـیـعـر و دانانی سـروودە، زۆرتر لە زمانی فەرەنسایی وەری گێڕاوە، لە دوای کوژانەوەی شەڕەکانی شێخ مەحموود بەدیل گیراو ناردیانە کـەرکـووک، پاش دەرچوونی بـوو بەئەندازیار. لە سـاڵی (1937) ڕۆژی دووشـەممە مـانگی تشـرینی یەکەم خنکێنرا. گۆڤاری ڕۆژی نوێ، ژمار(5)ی ساڵی(2)، (2)ی ئابی-1961، عومەر دەوڵەت.

(2) لەهەمان دەستنووس و لەدیوەکەی تری نووسرابوو: (گەردنی مەحموود جەودەت بۆ سەری سێدارە بێ).

# کۆچی مەلا ئەفەندی هەولێر[1]

دووبارە ئاســمــانی فــەرەج هەوری گــرتە بەر
یەعنی لیــبــاسی مــاتەمی پۆشی بەنی بەشــەر

(١) مـەلافـەندی: ناوی ئەبووبەکـر ئەفـەندی کـوڕی حـاجی مـەلا عـومـەرە، کـە بە(مـەلای بچـووک) بەناوبانگە. لە هەولێـر لەدایک بووەو هەر لەوێش پەروەردە بووە. بەزانست پەروەری و پیـاوەتی ناوبانگی دەرکـردووە. لە کـاتی خۆیدا (ئەبووبەکـر)ی باپیـرە گـەورەی نازناوی «مـەلای گـچکە»ی وەرگرتووە. لەبەرئەوەی لە تەمەنێکی کەمتر لە تەمەنی ئیجازە پێدراوەکانی سەردەمی خۆی بەچەند سـاڵێک مـۆڵەتی زانسـتی (مـەلایەتی) وەرگـرتووە، بۆیە ناویان ناوە (مـەلای بچـووک) هەر بۆ ڕێزلێنانی بنەمـاڵەکەیـان (مەلافـەندی) نازناوی (مـەلای گچکە)ی وەرگرتووە. (ئەمین زەکی بەگ) دەربارەی (مەلافەندی) وتوویەتی: (کۆمەڵێ بەرهەمی زانسـتی دەربارەی فەلەکناسی لە دوای خۆی بەجێ هشـتـووە. پیـاوێـک بـوو شوێن و پایەیەکی بەرزی هەبوو. لە مزگـەوتی قـەڵای هەولێر دەرسی دەوتەوە و ئیـجـازەی بەزیـاتر لە سـەد قـوتابی خـۆی داوە. کـە لە کـوردسـتـاندا بڵاوبوونەتەوە و دەرس دەڵێنەوە، بەڵام ئەمین زەکی بەگ لە کتێبەکەیدا (مشاهیر الکرد وکردستان في الدور الاسلامي) جزمی یەکەمی چاپە عەرەبییەکەی لە لاپەڕە (٨٣)دا مێژووی کۆچکردنی بە (٣٠) کانوونی دووەمی (١٩٤٣) داناوە. لە کاتێکدا (مەلافەندی) خۆی لە(١٩٤٢/٢/٢١)دا لە تەمەنی هەشتا ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە. (عەباس عەزاوی)یش لە کتێبەکەیدا (تاریخ علم الفلك في العراق)دا دەڵێ: (کتێبێکی دەربارەی زانسـتی فەلەکناسی لە تورکییەوە کردووە بە عەرەبی. ئەم دەستنووسە لە لای زانا ئاییـنییەکانی کوردستان دەست دەکەوێ). لە کاتی بزووتنەوەی (مایس)ی ڕەشید عالی گەیلانی مەلیک فەیسەڵی دووەم کاتێ منداڵ بوو لەگەڵ (عالیە)ی دایکی ڕووی کردە ماڵەکەی مەلافەندی، هەروەها مەلیک فەیسەڵی یەکەم لەو کاتەی هاتووەتە هەولێر و دوای ئەوەی لەسەر عەرشی عێراق دانیشت، لە ماڵەوە سەری لێ داوە. ئەمەش ئەوە دەردەخا کە پایەیەکی بەرزی لە لای حکوومەتەکانی عێراق هەبووە. شێـخی شیعری هەجوو (شێخ ڕەزای تاڵەبانی) لە شیعرێکی تورکی ستایشی (مەلای گچکە)ی باپیری کردووەو دەڵێ:

سنک تک بر بویوک عالم جهانده وامیدر؟ کلا
سکا سوء نظردن حفظ ایچون دیرلر کوچک ملا

بڕوانە ل٢٨٩ دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی

(مێجەر های) حاکمی سیاسی هەولێر لە کتێبەکەیدا (سنتان في کردستان ١٩١٨-١٩٢٠)دا جزمی یەکەم لاپەڕە (٢١٢)دا دەڵێ: (لە هەمـوویان زیاتر جێی مەترسی بوو) یان دەڵێ (لەناو ئەندامـانی چینەکانی خۆیدا پیاوێکی پێشکەوتنخواز بوو، ئەو بڵاوکراوانەی کە لە میسر و تورکیا بۆی دەهات دەیانی خوێندەوە. قسەکانی زیرەکانە بوو، باسی بابەتی زانستی و سیاسی دەکرد).

دووباره دڵ له مـــه‌جلیـــسی پڕ ســـۆزی ســـینه‌دا
ســـووتا به‌ناری حـادیســه، وه‌ک مـۆمی ناو فـه‌نه‌ر
ڕیشـــه‌ی دڵی پســـاوه له هه‌ولێـــره‌وه کـــشـــا
نـاوی نـراوه تـه‌ل، بـه‌ولاتـا ئـه‌کــــــا گــــــوزه‌ر
لووله‌ی شکاوی ئێسک و پرووسکی هه‌موو له‌شێک
هاتـۆته نـاڵه وه‌ک نـه‌یی دڵ پڕ له خــــوێنی ته‌ڕ
دونیـــا هه‌مـــوو به‌چاوی ته‌ڕ و لێـــوی وشکه‌وه
ئه‌مـــڕۆ ئه‌ڵێی له ڕۆژی قـــیـــامــه‌ت ئه‌دا خـــه‌به‌ر
ئه‌م ئاهو ناڵه‌یه به زمـــانی فـــه‌ســـیح ئه‌ڵێ :
چی کـرد به‌کوردی لیـتـه به‌سه‌ر، چه‌رخی کـینه‌وه‌ر
نێـژرا سـروور و خـه‌م سـه‌ری هێنایه ده‌ر له خـاک
خه‌و که‌وته چاوی خۆشی و هه‌ڵسا له خه‌و که‌ده‌ر[٢]
ئه‌گـری ته‌ڕه‌ب، خـه‌فـه‌ت ده‌سی کـردۆته پێکه‌نین
شـایی له شـیـوه‌نایه، که‌ده‌ر کـه‌یفی کـه‌وته سـه‌ر
مـــه‌نتـــیق زوبانی لاڵه، به‌لاغــه‌ت شـــپـــرزه‌یه
با مـوخـتـه‌سـه‌ر بڵـێم، له مـوته‌وه‌ل نه‌مـا ئه‌سـه‌ر
کێ وای ئه‌زانی ئه‌مـــڕۆ له شـــوومـــیی وڵاته وا
به‌م نه‌وبه‌هاره فـه‌سڵی خـه‌زان سـه‌ر ئه‌کـاته ده‌ر
باره له حـــه‌یات و غـــوباره له‌ســـه‌ر نه‌شـــات
کـــۆچی مـــه‌لا به‌ڕاســـتی بۆ کـــوردی قـــوڕ به‌ســـه‌ر
عـــومـــرێکه باخـــه‌وانی دڵ ئه‌تلێ به‌داخـــه‌وه
به‌ینێکه هه‌ر نه‌مـــامی ئه‌مـــه‌ل خـه‌م ئه‌دا ســـه‌مـــه‌ر
ڕۆیی پده‌ر، ئه‌وا گـه‌ییـیـه قـه‌سـری خـۆی به‌ڵام
یاڕه‌ب به‌عـــیـــزی دین و ســـه‌عـــاده‌ت بژی پســـه‌ر

(٢) یان: (خۆشی چاوی خه‌وی لێکناوه و خه‌فه‌ت له خه‌و هه‌ڵساوه) له ده‌ستنووسێکی تر هه‌یه که به‌هێزتره.

بۆ ســـالّی ڕحلەتی بەدەبیـــری خـــیـــرد بلّێ:
(مـغـفـور لە)[3] جـوابیـە، پرسی یەکێ ئەگـەر[4]

١٩٢٤/٢/٢٢

---

(٣) مغفور لە: (٤٠+١٠٠٠+٨٠ + ٦+٢٠٠+٣٠+٥ =١٣٦١ه).

(٤) شێخ نووری ئەم شیعرە شیوەنەی بەهۆی مامۆستا (گیوی موکریانی)یەوە بۆ (عزەددین)ی کوڕی مەلافەندی ناردووە. پشتم بەو نوسخەیە بەستووە کە بەدەسخەتی شاعیر نووسرابوو. لەگەڵ ئەوەی بۆ مامۆستا (گیوی) ناردووە تۆزە جیاوازییەکیان هەیە.

## بۆ کێلی قەبرەکەی شێخ مەحموود(*)

ئەمــــە ئەو شـــاهەیە ئـاواتی کـــوردی پێـــوە ئالا بـوو
کـە خـاکی مـەرقـەدی کـاک ئەحـمـەدی شێـخی بەمـەئوا بوو[1]
لە کـــاتی ئەوجـــەوانێـــوە هەتا مـــردن بەگـــیـــان و دڵ
بەشـــوێن ئـامـــاڵی پڕ ئاڵامی کـــوردا وێڵ و شـــەیدا بـوو
بنووسە تۆش لە خوێنی دیدە ساڵی مەرگی شێخ مەحـموود
(کـە ڕۆژێ بووی لە ئاسـۆی کـورد و کـوردسـتـان ئاوا بوو)

١٣٧٦هـ

(*) لەسەر تەکلیفی (شێخ باباعەلی) ئەم سێ شیعرەم بۆ کێلی مەرقەدی شێخ مەحموود نووسیوە - شێخ نووری شێخ ساڵح

(١) تەرمەکەی شێخ مەحموودی نەمر لە مەرقەدی کاک ئەحمەدی شێخی باپیرە گەورەی نێژراوە. ئەم بە (مەئوا)یە ئیشارەتە بۆ ئەوە.

## بۆ تەئریخی وەفاتی قادر ئاغا(١)

کۆچی قادر بۆ جیهانێ ماتەم و ڕەنجوورییە
پڕ لە ئێش و سوێی برین و شیوەنی مەجوورییە
لەفز و مَاعنای شیعرەکانم شین و ئازاری دڵە
ساڵی مەرگی بۆیە (شیعری ناتەواناى نوورییە)(*)

***

ئەمەش هەر بۆ وەفاتی (قادر ئاغای حاجی محیەددین)(**) وتراوە.

بەتەئسیری پەژارەی مەرگی قادر بوو سولەیمانی
وەکو بولبول لە دووی گوڵ کەوتنە سەر شیوەن و زاری

(١) ئەم دوو چوارینەیەی بۆ کۆچی دوایی (قادر ئاغای حاجی مەلا محیەددین) وتووە. کە لە ساڵی (١٩١٣)دا لە شاری سلێمانی لە دایک بووە. لە ساڵی (١٩٤٠)دا لە زانستگەی بەغدا بەشی حقوق - یاسا دەرچووە. دوای تەواوکردنی خزمەتی سەربازی (ئەفسەری یەدەگ) یەکسەر لە سلێمانیدا کراوە بەسەرۆکی شارەوانی. پاشان کراوە بەقایمقامی (چەمچەماڵ) و ئینجا کراوە بەقایمقامی (کۆیە). لەوێوە نێردراوە بۆ قایمقامیەتی مەرکەزی کەرکووک، دووبارە بەوەزیفەی پێشووی هاتووەتەوە شاری سلێمانی، ئینجا کراوە بەقایمقامی (دوز) و لە ساڵی (١٩٥٦)دا بەنەخۆشی دڵ هەر لە (دوز) کۆچی دوای کردووە. پیاوێکی تا بڵێی دڵسۆز و پاک و ڕەوشت بەرز بووە، پێوەندی دۆستایەتی و تێکەڵاوی لەگەڵ (شێخ نووری)دا هەبووە. خەڵک زۆریان خۆشویستووە. کە مردووە شاری سلێمانی بۆی خرۆشاوە. لەو کاتەشدا کە سەرۆکی شارەوانی شاری سلێمانی بووە ئەم شارە پێشکەوتنێکی زۆری لە بواری ئاوەدانییەوە بەخۆیەوە دیوە. (قادر ئاغا) لە بنەماڵەیەکی بەدەرەوە بووی سلێمانییە، لە هەموو ئەو کاروبارانەی پێی سپێردرابوون توانایی خۆی سەلماندووە و جێگەی ڕەزامەندی هەموو لایەک بووە. بڕوانە کتێبی: العراق الشمالي - مطبوعات النهار، تأليف: محمد هادي الدفتر - عبدالله حسن، الجزء الأول، مطبعة شفيق، بغداد، ت. بلا.
هەروەها ناجیە خانی کچی ئاوڕەحماناغای هاوسەری سوودی لێ وەرگیراوە.

(*) هەندێ کەس لەوانە کاکەی فەللاح پێیان وایە ئەم چوارینەیە بۆ (قاڵەی ئایشە خان) نووسرا بێ کە زۆربەی شاعیرە گەورەکان لەو سەردەمەدا شیعریان بۆ وتووە.

(**) ئەم دێرە خۆی لە دەستنووسەکەیدا نووسیویەتی کە بۆ ئەوی نووسیوە، ئەم وشەی (هەر)ـە تەئکیدە لەسەر ئەوەی شیعرەکەی پێشووشی بۆ (قادراغای حاجی محیەددین) نووسیبێ.

ئەگــــەر پرسی یەکێ تەئریخی (قـــادر)ی ناکـــام
بلێ (شێخ نووری) ناوی نا بە (ئەندوه و خەفـەت باری)[***]



قادراغای حاجی محیەددین کە لە تەنیشت شێخ مەحموودی نەمرەوە دانیشتووە، ئەوەی لە ژوورسـەری شێخ مـەحـموودی حەفید وەستـاوە (ڕەشـۆڵ)ی هونەرمـەندە، وێنەکەم لە ناجیە خانی کچی ئاوڕەحمان ئاغای هاوسەری وەرگرتووە و بۆ یەکەم جار لە لایەن ئێمەوە بلاو کراوەتەوە.

(***) أندوه = ٦٦ و = ٦ خـە = ٦٠٥ فـەت = ٤٨٥ باری = ٢١٣ = ١٣٧٥هـ کـە سالی کـۆچی دوایی قادراغایە.

## شیوەنی ئاوڕەحمانی خاڵۆزای[1]

چییــــە؟ ئەمــڕۆ قــەڵەم دووبارە هاتۆتە زوبان ئەگــری
بەتاو چاو و بەکــوڵ دڵ، ئەم بەگــوڕ دێ ئەو ڕەوان ئەگــری
لە سـەرچاوەی دڵەی سـووتاوەوە[2] لافـاوی خـوێنی گـەش
بەتاڤگەی دیدەمـا ئەمـڕۆ بەخـوڕ دێ و بێ ئەمـان ئەگـری
قــومـــاشی شــیـــوەن و دیبـــای واوەیلا چ هەرزانە
لەبێ بازاڕیی نرخی مــــەتاعـــا کـــاروان ئەگـــری
کــوڵی گـریان و نێـشی زام و کــسپـەی دڵ تەمـاشـاکـە
پلووسکی وشک و لوولەی تێکشکاوی ئیستیخوان ئەگری
تومـــەس باڵای ئاوڕەحــمـــانی دی دیدەم لەژێر خـــاکـــا
لەگـەڵ هەوری بەهارا وا ئەڵێی بۆ ئیمـتـیـحـان ئەگـری[3]
لە باغـا گـوڵ کـە چاوی کـردەوە، تۆ چاوی خـۆت لێکنا
مــەگــەر بۆ چاوی لێکناوت بەچاوی چاوەڕوان ئەگـــری
بەســـەر پەڕەی گـــوڵی زوو هەڵوەریوی نەوجـەوانیـــتـــا
چەمەن ئەگری، گوڵ ئەگری، بلبل ئەگری، باغـەبان ئەگری
بەباڵای تۆوە ســـەد هێـــلانەی دڵ بەند و پێـــوەند بوو
جـــیـــهـــانی بلبلی ئاوارەیە و بۆ گـــوڵســـتـــان ئەگـــری
پەشــێـــواو و شـــپـــرزە و والەو شــەیدا بەشــوێن تۆدا
ویقــار و حـوسنی خـولق و شـەرم و شـیـرینی زبان ئەگـری
لە تۆ مـــاڵێ کـــە خـــاڵی مـــایەوە بۆ شین و گـــریانە
سکووتی چۆڵیی هێــلانە، بۆ مــورغی جـەوان ئەگـــری

---

(١) ئاوڕەحمانی خاڵۆزای : ناوی (میرزا عەبدولڕەحمان حاجی فەتاح قادر)ــە لە ساڵی (١٩٠٥)دا لە شـاری سلێـمـانی لەدایک بووە. لە ڕۆژی (١٩٤١/٤/١٢)دا هەر لە سلێـمـانی بەنەخـۆشی (ئەفلەوەنزا) کۆچی دوایی کردووە.

(٢) لە دەستنووسێکی تری شاعیردا نووسرابوو: لەسەرچاوەی دڵەی زامارەوە...

(٣) لە ڕۆژنامەکەدا نووسرابوو: (لەگەڵ هەوری بەهار، هەر چاوە بێ وچان ئەگری). ئاماژەیە بەوەی کە لە وەرزی بەهاردا کۆچی دوایی کردووە.

پەڵەی زوو ڕۆیینت بوو، بۆ دیدەنی غـیلمـان و حـۆری بوو
بەسـەد چاوی مـوحیـبـەت چاوەڕێی تۆیەو جـینان ئەگـری
لەدووری ئێـــوە (نووری) خــۆی ئەناڵێنێ هەتا مـــاوە
لە دوای خۆی ڕۆحی غەمدیدەی بە شـیعری ناتەوان ئەگری
وتم ئەی دڵ بنووسە سـاڵی مـاتەم، دەسـبەجێ فـەرمـووی:
بەشـــوێن تۆدا، هەزار یێک بلبلی بێ ئاشـــیـان ئەگــری(٤)

١٣٦٠هـ - ١٩٤١
١٩٤١/٤/٢٠

(٤) لە دەستنووسێکی تری شاعیر نووسراوبوو: (بەدووی تۆدا هەزاران بلبلی بێ ئاشیان ئەگری). دوو دەستنووسی شاعیرم لەبەر دەستدا بوو، پشتم بەو دەستنووسە بەست کە درەنگتر نووسیویەتییەوە، هەروەها ئەم دێرەی دوایی کە بەحیسابی ئەبجەد ئەکاتە (١٣٦٠هـ) نووسرابوو: (بەشوێن تۆدا هەزار یێک بلبلی بێ ئاشیان ئەگری)، ئەگینا حیسابەکە تێکدەچێ.

## شیوەنی شێخ مەحموودی[1] سەرۆک

چ نووکی خەنجەرێ بوو وا بڕی ڕیشەی دڵ و گیانم؟!
چ تینی ئاگرێ بوو وا بەجارێ جەرگی سووتانم؟!
لە سەرچاوەی تەقیوی دڵمەوە خوێناوی ئاڵ و گەش
بەناو شەریانەکانا دێتە سەرچاوەی دوو چاوانم
لەگەڵ دوودی هەناسەم تێکەڵاوی یەک ئەبێ ئەوسا
ئەبێتە دانەیی فرمێسکی خوێن، ئەڕژێتە دامانم
تومەز تیری خەفەت بەندی جگەرمی وا کوناو دەر کرد
گەیاندوویە بە یەکتر (تانجەڕۆ) و (زەڵمی) دوو ئاوانم
ئەپاڵێوێ پەڕەی دڵ نم نمە خوێناوی لێڵ و وێڵ
ئەڕێژێنێ مووژەی چاو قەترە قەترە ئەشکی گریانم
وەرن سەیری تەبیعەت کەن، لە هەوری ئاه و خوێنی دڵ
کە چۆن تاوێکی هێنا و بارییە سەر مەزرەعەی ژیانم
پەژارە و خەم سەری هێنایە دەر بەم تاوە بارانە
وەری گوێکەی چناری عەیش و نۆشی سەرچنارانم

(١) شێخ مەحموودی کوڕی شێخ سەعیدی کوڕی شێخ محەممەدی کوڕی کاک ئەحمەدی شێخە، لە ساڵی (١٢٩٨هـ) لە سولەیمانی دا هاتووەتە دنیاوە. کە فامی کردووەتەوە مامۆستای تایبەتی بۆ گیراوە. خوێندنی سەرەتایی تەواو کردووە و دوایی لەلای زانا گەورەکان خوێندنی دەستووری زمانی عەرەبی و تەفسیر و شەرعیشی تەواو کردووە. لەبەرئەوەی هەر لە منداڵییەوە بە دیندار و ڕەوشت جوان و بەخشندەیی و ئازایەتی و جوان مەردی ناوبانگی دەرکردبوو، بۆیە هەموو سەرەک ئێڵەکانی کوردستان هۆگری بوون و لە فرمانی دەرنەدەچوون. بەم هۆیەوە دەوڵەتی عوسمانی لێی نزیک بۆوەو لە ساڵی ١٣١٧ی ڕۆمی سوڵتان (عەبدولحەمید)ی دووەم شێخ مەحموود و شێخ سەعیدی باوکی بانگ کردووەتە ئەستەمبوڵ و لە (کۆشکی یلدز)، (واتە ئەستێرە)، میوانداریيەکی گەورەی کردن و هەریەکەیان بەدەستێ جلی نایابی شاهانە کە بەنیشانەی نرخدار ڕازابۆوە لەگەڵ شیرێکی کالان زێڕین خەلات کران و پایەی (موشیری - مارشال)یان پێ درا. لە (٩)ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٥٦ لە بەغداو لە نەخۆشخانەی (حەیدەری) دوای خەباتێکی دووردرێژ و زنجیرەیەک ڕاپەڕین دژی داگیرکەرانی ولات گیانی پاکی سپارد.

ئەمەل نێژرا لەناو خاکا، ئەلەم گۆیکە و چرۆی دەرکرد
بەجـــارێ هەڵکرووزا ســـەبزەزاری نەوبەهارانم
بەکۆچی تۆوە بوو مەحبووبی حەق، مەحموودی ڕەبانی !
وەکو (غەزنە)[٢]، بەچۆڵی مایەوە شاری «سلەیمانی»
لە دوای تۆ شار و لادێ بوو بە کولبەی ماتەم و ئەحزان
وەتەن دانیشتووە بۆ تەعزییە و بۆ فاتیحا خوانی
بەکۆچی تۆ قەڵای ئامالی کورد بنچینەکەی ڕووخا[٣]
بەلافاوی خەفەت شاری ئەمەل ڕووی کردە وێرانی
بەجارێ میللەتی کوردی هەژارت بۆ سیاپۆشە
سلەیمانی بووەتە یەک نموونەی گردی سەیوانی
لە هیچ لایەکەوە دەنگی کەمان و عوود و نەی نایە
بەجـــارێ داخـــرا ڕادیۆ، نەمـــاوە دەنگی گـــۆرانی
لە مـــاڵان شـــیوەنە و زاری، لە بازاڕا خـــەفـــەت باری
نەمـــاوە پێکەنین ئیللا بەدەگـــمـــەن یا بەپەنهـــانی
هەزاران ڕۆحی جۆشانی وەتەن خواهانی کوردستان
لەسەر تابووتەکەی وەستاوە بۆ تەشیعی جوثمانی
بەسـەر سـەیارەوە بەیداخی ڕەش ئەشنێـتـەوە دایم
جلی ڕەش بۆتە مـۆدە بۆ هەمـوو خـەڵقی سلەیمانی
حـەرامـە کـردنەوەی ڕادیۆ لە چایخـانە و لە مـاڵانا
بەغـەیری گـوێ لە ئەخبـار گـرتن و ئایاتی قـورئانی

---

(٢) (غەزنە) پایتەختی دەوڵەتی (غەزنەوی) بووە، دەکەوێتە ئەفغانستانی ئێستاوە، (مەحموود غەزنەوی) یەکێک بووە لە پاشایەکانی. لە سەردەمی سەدەی چوارەم و پێنجەمی کۆچیدا زۆر بەناوبانگ بووە.

(٣) منیش دەنگم دەخەمە پاڵ دەنگی مامۆستا - کامەران موکری - لەوەی ئەگەرچی: (هیچ گومانی تێدا نییە کۆچی دوایی شێخ مەحموودی نەمر، زامێکی قووڵی کردە دڵی میللەتی کورد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەلای منەوە، ئەو بەیتە پێویست بوو بەجۆرێکی ترو لەمانایەکی تردا بووترێت، چونکە بەکۆچ کردنی قارەمانێک قەڵای (ئامالی) میللەت ناڕووخێت.)

هەتا ڕۆژی چلەی بەم ڕەنگە بوو ئەحــواڵی ئەم شــارە
لە پاش ڕۆژی چلەش ئیــتــر نەمــا ئەوزاعــی جــارانی[٤]

١٩٥٦/١٠/٩

(٤) پشتم بەدەستنووسێکی شاعیر خۆی بەست. لە دەستنووسەکەدا دوو دێری تیایە دانی پێدا نەناوە بۆیە نەمنووسی کە ئەمەیە:

فـەلەک ئەبوایە ئەو نەوعـەی لە دەوری ئەو بگێـڕایە
کـە نێـژراوە لەبەدکـرداریا ، پێش وەخـتی، نێـژرانی

# تالعی کوردی بەدبەخت[1]

شیعرێکی تەرکیب بەندە

بەندی یەکەم:

دیسان لە ئێمە قاپییەکەی غەم کرایەوە
دەرگای تەرەب، لەعالەمی دڵ داخرایەوە
دیسان جگەر کرا بەقەنارەی موشەقەتا
یەعنی دوکانی چەرخی جگەرچی کرایەوە
دیسان برینی کۆنی غەمی ئێمە هاتە سوێ
جامی فەرەح بە بەردی حەوادیس شکایەوە
دیسان دووچاوی سووری وەتەن بوو بەگۆمی خوێن
فرمێسکی وەک فوارە، لە دڵ هەڵقولایەوە
دیسان لیوایی عەزا، لە لیواو ناحیەو قەزا
بۆ کوردی قوڕ بەسەر، بە مەسەل هەڵکرایەوە
ئەستێرەیەکی بورجی حقووقی هەبوو وەتەن
ئەمشەو لەپڕ کشاو بەجارێ کوژایەوە
داخ و غەمی فیراقی کە دانا لەسەر جگەر
زامی هەزار ساڵەیی دڵ وا کولایەوە
گریا وەتەن، وتی جگەری من بڕایەوە
نووری چرایی مەجلیسی غیرەت کوژایەوە

بەندی دووەم:

ئەی چەرخی بەد موعامەلە، تاکەی خەتا ئەکەی!
ئەم کوردە بێ کەسانە بە غەم ئاشنا ئەکەی[2]

---

(١) لاوانەوەی (عەبدولکەریم بەگی حاجی عەبدوڵلای کەرکووکلی زادە)یە کە حاکمی مونفەرید بوو لە سلێمانی و لە (١٨)ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٢٦ کۆچی دوایی کردووە و هاوڕێ و دۆستی نزیکی شێخ نووری بووە.

(٢) لە دەستنووسەکاندا لە هەندێ شوێن (ئە)و لە هەندێ شوێن (دە) بەکارهێنرابوو من یەکم خستێ.

دەغـڵی وجـوودی ئێـمـە هەتاکـەی ئەکـەی بە ئارد
خەرمـانی عـومری ئێـمە هەتاکەی بە [با] ئەکەی!
جـەڕڕاحی و کـەچی ئەکـوژی عـاڵەمێ بەغـەدر
گـــۆیا برینی کـــۆنە و نوێـمـــان دەوا ئەکــــەی
مەعـشـووَق ئەکەی بەدوژمن و عـاشق وەکـو ڕەقیب
باوک لە کـــوڕ ئەکــــەیت و برا بێ برا ئەکــــەی
کـــوردی فـــەقـــیـــر ئەبێ چ گـــوناهێکی کـــردبێ
هەر لەحـزەیێ بە سـەد ئەلەمی مـوبتـەلا ئەکـەی[۳]
(عەبدولکەریم) کە دوێنێ لەسەر تەختی (ئینفراد)
حـاکم بوو، ئەمـڕۆ مـەسنەدی داری فـەنا ئەکـەی
ئەم دایکی کوردی قوڕ بەسەرەت خستۆتە تەعزییە
ئەولادەکــــانی چونکە ئەســـیـــری بەڵا ئەکـــەی
ئـەگـــــری و ئـەڵێ وەتـەن: جگـەری مـن بڕایـەوە
نـووری چرایی بەزمی حـــەمـــیــــەت کـــوژایەوە

بەندی سێیەم:

ئەی خــاکی تیـرەدڵ، هەیە گـەر زەڕڕەیێ حـەیات
ڕۆحت ئەکـەیتـە خـادیمی سـەرچاوەکـەی حـەیات
زوڵـمـەت نەدیدە، چونکە گـەیشـتی بەئاوی خـضـر
تۆ نامریت و عـالەم ئەکا یەک بەیەک کش و مـات
ئەو حـاکـمـە کـە مـەرکـەزی قـانوون بوو سنگی ئەو
راجـیع بەتۆیە، قـوڕ بەسـەر ئەهلی مـوراجـەعـات
ئەو حاکـمە کـە عـەینی وەفـا بوو حقـووقی مەحض
تەرکی سـەریری مــەعـــدەلەتی کـــرد و هاتە لات

---

(۳) لە دەستنووسێکی مامۆستا نەجمەددین مەلا و دیوانی بێخوددا: (بەسەد ئەلەمی ئاشنا ئەکەی) نووسرابوو.

تۆش توخوا وەرە، وەکو تێگەییوەکانی کورد
تەفسیر مەکە لە خزمەتی، ئەی ڕۆحەکەم فیدات
چەند ئەهلی غەدر و زاڵمی بێ دینی کرد ئەسیر
چەند بێگوناهی دا لە حەپسخانەدا نەجات
زاتێکی وا لە ماتەمی ئەودابێ ئەهلی فەزڵ
چونکە لە زایعاتی وەتەن بوو لە زایعات
ئەگری و ئەڵێ وەتەن، جگەری من بڕایەوە
نووری چرای مەجلیسی عیرفان کوژایەوە

بەندی چوارەم:

ئەی بلبلی وەتەن وەرە[٤]، ئەی باخەوانی کورد
ئەی باعیسی نەمانی درەختی ژیانی کورد
ئەی واعیزی تەرەقیی میللەت بە ڕۆح و ماڵ
سەر دەفتەری جەمیعی فیداکارەکانی کورد
زەحمەت کە خۆشی بێتەوە تا ڕۆژی ڕەستخێز
داغی غەمت لەسەر جگەری سەروەرانی کورد
بۆ غەیری تۆ وەفاو و حقووقت لە حاکمان
گەورە و بچووکی میللەت و پیر و جوانی کورد
ئەوراقی سەبری ئێمە بەجارێ وەری درێغ
ڕۆیشت بەهاری عەیش و پەیا بوو خەزانی کورد
تا موڵکی ئاوەدانی بەقسا بوو بە مەنزڵت
وێرانەکەی عەدەم بووەتە جێ و مەکانی کورد

---

(٤) بۆ ئەم شیعرە پشتم بە سێ دەستنووسی مامۆستا (نەجمەددین مەلا) بەست کە دووانیان لە لای مامۆستا (گیوی موکریانی) پارێزرا بوون، ئەوەکەی تریشیان بەهۆی مامۆستا (عەبدولڕەقیب یووسف)ـەوە دەستم کەوت. شێخ نووری خۆی دوو دەستنووسی لەوانە بۆ مامۆستا (گیوی موکریانی) ناردووە و بەمەرەکەبی سەوز هەندێ شوێنی ڕاست کردووەتەوە. هەر لەو دەستنووسەدا وشەی (وەرە)ی دانابوو.

نەعشی رەفیعی تۆی وەتەنی قوڕ بەسەر کە دی
پشتی شکا، کە عیزەت و ناوونیشانی کورد
گریا وەتەن، وتی: جگەری من بڕایەوە
نووری ئەلەکتریکی شەوی من کوژایەوە[٥]

(٥) ئەم شیعرە لە دیوانی مامۆستا (بێخود)دا لەلاپەڕە (٩٦ - ١٠٠)ی گرتووەو لەگەڵ ئەو شیعرەی ئێستا دەیخوێننەوە، ئەگەر بەراورد بکرێن، جیاوازی زۆر دەبینین.

* تەرکیب بەند: ئەگەر لەدوای هەر پارچەیەکدا، چەند بەیتێک دووبارە ببێتەوە کە قافیەیان یەک بێ و لە قافیەی پارچەکانی تر جیاواز بێ، بەم جۆرە شیعرە دەڵێن - تەرکیب بەند-، بەمەرجێ هەردوو جۆرەکە لەسەر یەک وەزن بێت لە هەموو بەیتەکاندا.

## ئەو کارەساتەی لە هێنانەوەی جەنازەکەی (شێخ مەحموود)دا ڕووی دا

شـەو بوو جـەنازەکـەی گـەیشـتـە کـەناری شـار[1]
گـیـرایە ناو ژمـارەیەکی زۆری بێ شـومـار
بردیانە بەندیخـانە کـە بیـبـینێ (شـێخ لەتیف)
دەسـتێ بکاتە گـەردنی باوکی هەژارەوە[2]
کـوژرا ژنی (ڕەشـۆڵ) بەیەکـەم گـولله، بێگوناه
داخـێکی نا بە جـەرگی گـوڵ و لالەزارەوە
وەک(ئەختەری)ی[3] (ڕەشۆڵ)ی[4]بەسەرزمان لە ئاسمان
چۆن زوو کـوژایەوە، بـەڕوخی تـابدارەوە
زۆر نەوجـەوانی تر وەکـو ئەو کـوشـتـەو جـەریح
شـارانەوە هەمـوو بە لەشی زامـدارەوە

---

(١) پێوستە ئەم بەیتەش بیێتە (شارەوە = شومارەوە) تا لەگەڵ قافیەی (هەژارەوە... لالەزارەوە، تابدارەوە) بگونجێ، بەلام کێشەکەی لەگەڵ کێشی سەرجەمی شیعرەکە بڕوات.

(٢) پێش ئەم بەیتە لە دەستنووسێکی پێشتری شاعیر ئەم بەیتە نووسرابوو کە خۆی دانی پێدا نەناوە.

ئاگـر کـرا بەشـیلگی بارانی گـولله وەک
تاوێکی تەزرە چۆن لە هەوا دێتە خـوارەوە

(٣) ئەختەر: ژنی ڕەشۆڵە کچی (ساڵح)ی کوڕی (محمود)ـە کە بە (ساڵحی خوولە) بەنێوبانگە لە شاری سلێمانیدا لە دایک بووە لە ٩/ ١٠/ ٩٥٦ لەبەر دەرگای سەرا چڵکاوخۆرەکانی ئەو سەردەمە دەستڕێژیان لێ کرد لە کاتی خۆپیشاندانەکەی، لە هێنانەوەی تەرمی (شێخ مەحموودی نەمر) ڕووی دا، ئەمیش یەکێک بوو لە قوربانییەکانی ئەو دەستڕێژە کە وەک ئافرەتێکی ئازا و بەجەرگ سنگی خۆی دابووە بەر گولله.

(٤) ڕەشۆڵ: لە پاڵ دەنگ خۆشییەکەی، مرۆڤێکی قسە خۆش و نیشتیمان پەروەر بوو. لەگەڵ مەلاکەریم گۆرانییان لەسەر قەوان تۆمار کردووە. لە پاش ساڵانی (١٩٤٠)ەوە چەند گۆرانییەکی بۆ ئێستگە تۆمارکردووە وەک (قەتار و خاوکەر و دەشت). ناوی (ڕەشید میرزا عەبدوڵڵا حاجی ئەمین)ـە لە ١٩١٢ لە سلێمانی لە دایک بووەو لە ٤/٧/ ٩٧٤ مردووەو لە دەربەندی ڕایات نێژراوە. بۆ ئەم زانیارییانە سوودم لە مامۆستا غەفوور ئەمینی برازای وەرگرت.

زانرا نەتیجەکەی کە شتێکی فەلاکەتە
عالەم لە ترسی گوللە کشانە کەنارەوە
سبحەینێ وەزعی مەملەکەتم زۆر شپرزە دی
هەر (شورتە)یەو خولەی دێ بە دونکی و بەدارەوە
وەک رووێ نەدابێ حادیسەیەک ئەمر ئەدەن، ئەڵێن
عالەم ئەبێ خەریک بێ، بەسەر ئیش و کارەوە
تیجوال مەنع کرا لە دەمی عەسرەوە هەتا
ڕۆژ هەڵئەهات و شەوقی ئەخستە دیارەوە
بۆ مەنعی ئەو کەسانە ئەهاتن لە دوورەوە
حازر کرابوو شورتە، بە پیادە و بە سوارەوە
بێجگە لەمەش ئەمر بە نەواحی و قەزا درا
نابێ بە ناوی پرسەوە کەس بێتە شارەوە
سێ ڕۆژی ماتەمی، کە (دی)یان بەم حەقارەتە[٥]
بڕیار درا بەجارێ بە لادێ و بە شارەوە
غەمبار بن و جلی ڕەشی ماتەم لەبەر بکەن
پیرو جوان، هەموو بەدڵی غەمگوسارەوە
وەختێ ئیدارە فەرقی بە عەزمی ئەمانە کرد
قانوونی هێزی (شورتە)یی لێ خستنە کارەوە
پۆلیسێ جل ڕەشێکی بکەوتایە بەر نەزەر
ئەیبردە گۆشەیەکی پەنا و نادیارەوە
ئەوەل نەسیحەت و هەڕەشەی دەستی پێ ئەکرد
ئەیووت بەمانە خۆت مەخەرە گیر و دارەوە
پێتان ئەڵێم بەڕەسمی: جلی ڕەش لەبەر مەکەن
یاساغە کەس ببینرێ بە لێوی بە بارەوە
پشتێنی ڕەش جەریمەیە بیگۆڕە تا زووە

(٥) لەیەکەم دەستنووسی ئەم شیعرە ئەم بەیتە بەم جۆرە بوو: زانرا ئیدارە ئەمڕۆ بەعەمدەن وەها ئەکات.

تاکـــو فــڕێی ئەدەی بچــۆ زوو خـــۆت بشـــارەوە
هەر چایچـــیـیـــە و بەدەم شـــەقی پۆلیـــســەوە زەلیل
هـەر ســـــایقـــــە ئـەنالێ بـەدەم لـیـس و دارەوە
ڕادیۆ بـەزۆری شـــــەق ئەبێ بکرێتـــــەوە لە هەر
دوکـــان و چایخــــانە، بەنەغــــمـــــەی قـــەتارەوە
هەر جل ڕەشی هەژار بـوو، ئەیان برد بەزۆری لـیـس
ئەخـــــرایە ژێر ســــوئالی، گــــــەلێ نالـەبارەوە
قـــۆڵیـــان ئەگـــرت بەدووکـــەس و ئەبرایە بەردەمی
قـــۆمـــیـــســـــەری، بەفـــیـــز و کـــڵاوێکی لارەوە
ئەیوت: بەمن بڵـێن چییـــە کـەوتوونەتە ســـەری؟!
خـــۆت تووش مـــەکـــە، بەکـــۆڵێ منالی هەژارەوە
کێ مـردووە؟ سـەبەب چییـــە ئەم حـوزن و مـاتەمـە؟
خـــۆ ئاســـمـــان بەجـــارێ نەکـــەوتۆتە خـــوارەوە
لێی هاتە جواب، شـپـرزەیی شـەق، سـەر شکاوی دار
ڕووی کـــردە قـــۆمـــیـــســـــەر، بە دڵی زامـــدارەوە
من ســـەروەری وڵاتم و ســـەرداری قـــەومـــەکـــەم
بمرێ بەئێـــشی دەردی دڵ و ئـیـــحـــتـــیـــقـــارەوە!
مـن بـێـم لـەبـەر ڕەزای دڵـی تـۆ یـا یـەکـــــێکی تـر
نامـــووسی کـــوردەواری بنێـــمـــە کـــەنارەوە؟!
تۆ و ئەو کـەســـەش کـە وای وتووە باشی تێـبگەن
کـــورد نایەوێ بژی بە لەکـــەی، عـــەیب و عـــارەوە

## مووی سپی و پشتی خەمیدەم...

مووی سپی و پشتی خەمیدەم وتی بەسیە گڕوگاڵ
پیرم و ئێستە هەموو شەو کچی ڕەز ناخوازم
سەربەرەو خوارەیە ڕێم، باوی قولم زۆر خۆشە
تێپەڕی، قووەتی هەنگاوی سەرەو هەورازم
نییە کەس باری نیازم بگرێتە سەر شان
هەر مەگەر یاری ئەجەل بێتو بکێشێ نازم
تەعنەیی بەدخواه و قسەی پووچی ئەم و ئەو بوو کەوا
کونجی بەدبەختی و ماتەم، بووەتە دەمسازم
تانەی تێنەگەیشتوو جگەری وا لەت کردم
خوێن ئەپاڵێوێ لە سەد لاوە دڵەی غەمسازم
هەرچی کردوومە لەمەوبەر، دەمی نادانی بوو
نادیم ڕەببی لەتۆ لوتف و کەرەم ئەخوازم

١٩٤١/١٠/٢٨

## ویژدان

نییە نیشانەیی حیسیٚ، کە پێی ئەڵێن ویجدان
وەیا شعووریٚ کەوا ناوی لیٚ نراوە زەمیر
لەلای ئەوانە کە ناپاک و خائینی وەتەنن
گرو تەزووی بەزەیی، ناکەوێتە سەر لەشیان
لەلای ئەمانە جیهان دوو شتە بەبیٚ کەم و زیاد
یەکێکی مەنفەعەتی زاتییە، بەبیٚ شەرعیش
دەسی کەویٚ زۆر دڵنیاو شادانە
بەتەنگەوە نییە، هەرگیز لە هێرشی تانە
ئەمە شتێکە وجوودی زەرورییە لایان
ئەوی تری شتێکە لە نەزەردا بیٚ بوونیان
بەتەنگەوە نییە بەرێتە ڕووی زەمین
وەیا بەشەر هەموو بڕوا بە هایدرۆجین
بە ئیشی نەوعیٚ بەشەر شادمان و مەسروورن
ئەگەرچی مەنفەعەتی خۆشی تیا نەبیٚ یەقین
خودا نەکردە، مەنافع ببیٚ (معاذ اللە)
بەڵام ئەوەندە خودا ڕەحمی کردووە زۆر نین
ئەگەر لەمانە کەمیٚ زیاد بوایە مقداری(*)
دەمیٚ بوو ڕووی زەمین، هیچ نەمابوو ئاساری

(*) لە دەستنووسێکی شاعیردا بەدەسخەتی خۆی نووسراوە (مقداریان).

## ئامۆژگاری

گــوێ لە نووری بگرە جــانا، با نەبی تووشی زیان
ئیعتیمادت قەت نەبێ، هەرگیز بە ئەوزاعی جیهان
تاکــــو تۆ مــــاوی لە ئازاری ئەم و ئەو دوور ئەبی
گـەر نەکـەی تۆ مـەیلی ئازار و عـەزابی ئین و ئان
یاری کـۆن هەروەک شـەڕابی کـۆنە، تابێ چاک ئەبێ
قـەت نەکـەی هەرگـیـز بەیاری تازەوە خـۆت سـەرگـران
سـوحـبـەت و مـەیلی مـوحـیـبـانت ئەگـەر لا مـەتڵـەبە
تێپەڕبوی ئیمتیحان، هەرگیز نەکەی تۆ ئیمتیحان
ئەو ئومـێـدەت قـەت نەبێ ڕازی دڵت شـاراوە بێ
تۆ کـە خـۆت فـاشی بکەی، بۆ عـالەمێ ڕازی نیـهـان
لات موحەقەق بێ، بەجارێ گووم ئەکەی ئاساری خۆت
خۆت نەکەی گەر تۆ بە خوڵقی چاکە لای کۆمەڵ عەیان
قـەت غـەمی ئەم دەهرە نانیـشـێـتـە سـەر پەڕەی دڵت
گـوێ ئەگـەر نەگـری لەڕێکی یا لە ناڕێکی زەمـان
ژینی باشت بۆ پەیابوو گــەر لەســەر ڕوویی زەمین
باڵی مـەغـرووری مـەجـووڵێنە بەرەو ڕوویی ئاسـمـان
دوژمنت گـەر دی زەعـیف و ناتەوان، مـەسرور مـەبە
ژینی دنیــا بۆ کــەسێ نامــێنێ تا ئاخـر زەمـان[1]
بەسـیـیـە (نووری) ئەم قـسـانەت وا ئەزانم ئاخـری
وەک چرا بۆ سـووتنی خـۆت، گـڕ ئەخـەیتـە سـەر زبان

زێبار ١٩٥١/٢/٢١

(١) لە شوێنێکی تردا: (ژینی دنیا چاوەکەم، بۆ کەس نەماوە جاویدان) نووسرابوو.

## له دونیادا ئەگەر لای تۆ ببێ ئیدراک و تێفکرین

له دونیـــادا ئەگـــەر لای تۆ ببێ ئیـــدراک و تێـــفکرین
گەمارۆت گەر بدەن عالەم، هەموو دڵ پڕ له بوغز و کین
بەنافـامیٚ هەمـوو بێن و زەمی عـەقڵ و دیرایەت کـەن
گرۆهی ئادەمیـزاد، موحـتـەرز بن لێت و نەفـرەت کـەن
بەئیـــمـــانێکی نالەرزیدەوه، بێ باک و بێ پەروا
بەنەفسی خۆت، ئەگەر باوەڕ بکەی، ئاسوودە و بێ باک

***

ئەگـــەر بێ گـــوێ نەدەیتـــه تانەیی نابوودی بەدخـــواهان
له گـــێـــژاوی بەســـامی ئینتـــیـــزارا، مـــەرد و شـــاکـــر بی
فـــریویشت بدەن، تەبعت نەکـــا مـــەیلی فـــریوی کـــەس
لەکەس دڵ پڕ نەبی و نەڕوانییه کەس، تۆ بەچاوی سووک
بەســـەر هێـــز و هەوای نەفس و غـــروورا بێـــتـــو قـــادر بی
به قین و لوتفی دونیـــا، تۆ نەغـــەمگین بیـــتـــو نەشـــادان

***

تەخـەییـول کـەی، بەشـەرتێ ملکەچی خولیـا نەبی زینهـار
تەفەکور کەی، بەڵام هەرگیز نەکەی، ئەندێشـه عادەت کەی
سـەعـادەت، یا فـەلاکـەت، دوو شتن بێ ئەسڵ و بێ ئاسـار
لەبەر چاوی حەقـیـقەت بینی تۆ، ئەم دووانه یەکـسـان بێ
قـــســـەی ڕاســـتت بەتیـــری تانەیی بەدخـــوا له ســـەد لاوه
ئەگەر بێ ئەنجن ئەنجن، لەت لەت و کەرت و پەرێشـان بێ

***

وەکـــو زنجـــیـــری پێی دێوانه، ورد و خـــاش و تـارومـــار
ببی و مـــەحـــســـوڵی ئامـــاڵت بدەن وەک (کـــا) بەدەم باوه
تەحـەممول کـەی ئەمـانه، یەک بەیەک تۆ سـاکت و بێ باک
بەئێش و نێـــشـــی، ئەم ئازاره زۆرانه نەبی غـــەمناک

ئەگــەر بێ هۆی ژیانت ئاگــری تێــبــەر ببێ ئاگـــاه(*)
ببــێــتــە تاقــە تۆزێ خــۆڵەمــێــشی ورد و (با) بیــبــا

***

بەڕەغــمی ئەم زیانە، هەوڵ و تێکۆشین ئەگــەر زیادکــەی
بە عــەزمــێکی ســوبک ڕۆحــانەوە، ئامــادەیی پەیکار
ببـــیت و ڕووکـــەیە ژینێکی ئینســـانانە بێ پەروا
بەڕێکەوتیی ئەگــەر ڕێت کــەوتە بەزمی هەرزەکـــارانی
لە ئەرکـانی فـەزیلەت لانەدەی تۆ، یاخــود بەحــسی کـەی
بەپاکی دوور لە خـــودبینی، وەکــو فــەرمــوودەیی یەزدان

***

مــووســاوی بێ لە لای تۆ، عــەینی یەک، داناو و نادانی
ئەگەر بیپەرچنێ دڵ، تووڕەیی و ڕق، وەختی قین هەڵسان
ئەگـــەر بگری کـــەمێ تۆ لایەنی ئارام و جـــدییـــەت
لە بۆ تەسکینی حیددەت، بێتو تۆ نەختێ بکەی غیرەت
بەکـامی تۆیە ئەی ڕۆحی ڕەوان، دونیــا، وەمــافــیــهــا
مـــــــوبارەک بێ لەتۆ ناوی بڵـنـدی ئادەمی زانـا

---

(*) لە دەستنووسێکی شاعیردا بەدەسخەتی خۆی (ناگا) نووسرابوو.

## سەعادەتی ڕاستی

سەعادەت گەر بەڕاستی تۆ دەپرسی، عیزەتی نەفسە
ئەگەر بەدناویی شارت ئەویّ، نەفست بەڕەڵلاکە
ئەگەر بەرزی مەسیحت بۆ نەبیّ، تەقلیدی یووسف کە
ئەگەییە ئاسمان، هەوڵیّ بدە زیندانیّ پەیدا کە
لە پانایی زەمینا جیّت نەبیّ، شاخ و چیا زۆرە
ئەگەر قەسرت نەبوو، عاجز مەبە، غاریّ بە مەئوا کە
لەناو شاری عەدەمدا، بیّ خەمی و ئاسوودەگی زۆرە
ئەگەر ژینی زەریفت دەست نەکەوت، مردن تەمەنناکە
جیهان بیّ ئێمە زۆر تیپەڕ بووە و تێپەڕ ئەبیّ زینهار
بە کردەی چاکە، ناوێکی نەمر بۆ خۆت موهەییا کە
لە هەوراز و نشێوی ڕێی ژیانا قەت مەناڵێنە
ئەمەل مەبڕە، تەحەممول بکرە، بیّ عەزمی تەوەللاکە[1]

(١) ئەم شیعرە لە دەستنووسی (گەڵاڕێزان)دا لەلاپەڕە (٧٤) نووسرابووەوە، بەڵام لەبەرئەوەی تا لاپەڕە (٧٩)ی ئەو دەستنووسە لیّ کرابووەوە، بۆیە ئەم شیعرە ناتەواوە و دوو بەیتی بەر ئەو دڕانە کەوتووە.

# ئیستیقبال بۆ تازە پێگەیشتووەکان

سـبـحـەینێ ئەم تەجـەدودە بۆ تۆیە ئەی شـەباب
بۆ تۆیە ئەی ئومـێـدی وەتەن، خـادیمی حـەیات
ئەی ئافـتـابی فـەجـری ئەمـەل، مـایەیی نەجـات
سوبحی سەعـادەتێکی عـەجەب پاک و بێ سەحاب
هەر چاوەڕوانی تۆیە، دەسـا فـرسـەتە شـەتاب

***

ئەی فـەجـری بێ غـوبار و کـەدەر، عـالەمی ئەمـەل
چاوی لەتۆیە، تۆ کـە ئومـێـدی هەمـوو کـەسی
ئەلحـەق عـیـلاجی دەردی دەوایەکی نەورەسی
هێند چاوەڕێ بوو چاوی، هەتا پێی گـەیی سـەبەل
فـەرمـوو درەنگە، وەختی تلـوعـێکە بێ حیـجـاب

***

بەڵکو کـە سـەرفی مـازیی تاریک و هەولناک
بکرێتـەوە، خـەتی لە پەڕەی دڵ بچـێـتـەوە
سونحـەتی[1] بەهاری عـەیشی وەتەن وەختی بێتەوە
شـایەد خـەزانی عـومـری بکا سـینە چاک چاک
بگرێتـەوە فـەهمی مـاضی پڕ عـەزاب

***

ئەی نەورەسـیـدەکـانی وەتەن، وەخـتی غـیـرەتە
تەحـسیلی عـیلم و مـەعـریفـەتە، مـایەی شەرەف
تێکۆشـە بۆ سـبـەینێ، نەوەک بتکەنە هەدەف
سـبـحـەینێ خـاکی ئەم وەتەنە، لاتێ ئەمـانەتە
حورمەتی وەتەن، شەرەفی هەمـوو بۆ تۆیە ئەی شەباب

***

---

(١) لە ڕۆژنامەکەدا: (نەختێ) نووسرابوو، شێخ نووری بەمەرەکەبی سەوز کردوویەتی بە (سونحەتی).

ئەی موحتەرەم، موعەلیمی وشیار و باویقار
ئەی دوژمنی جەهالەت و ئەی خادیمی بەشەر
ئەی خەسمی یەئسی دائیمی، ئەی مایەی زەفەر
ئەی مەحزەری سەعادەتی میللەت بە ئیفتیخار
لادەن لەڕووی ماهی وەتەن، زیللەتی نیقاب

***

ئێوەن بە نووری عیلم منەوەر ئەکەن ولات
ئێوەن کە خزمەتی وەتەنی میهرەبان ئەکەن
تەنویری فیکری عالەم و تەعلیمی شان ئەکەن
ئیحضاری مەعریفەت ئەکەن و فرسەتی نەجات
پڕ نوور ئەکەن ولاتێ[2]، وەکو شەوقی ماهتاب
مەحبووبەی جوانی وەتەن، شۆخ و ماه ڕوو
ئارایش بەخشڵی عیلم دەن، مەکەن قسوور
تەنویری کەن بە شوعلەو تەجهیزی کەن بە نوور
قەد بێ جیاوازی ئەم کچە هەرگیز[3] مەدەن بە شوو
بەڵکو ببێ وەتەن، لەسەعی ئێوە فەیضباب
ئیتر ئەکەم بەیانی خلووس و تەشەکورات
تەقدیمی ئیحتیرامی خسووسی بەدڵ و جان
بۆ خزمەتی جەنابی مودیر و معەلیمان
ئەم بەرگە سەبزە، با بکەمە دیاری و خەڵات
هەرچەندە زەڕە، هیچ نییە شەوقی ئافتاب[4]

---

(٢) لە دەستنووسەکەی مامۆستا (نەجمەددین مەلا)دا (ولات) نووسرابوو، بێگومان ئەوەش شیعرەکە لەنگ دەکات.

(٣) هەر لەو دەستنووسەدا کە (شێخ نووری) چاوی پێدا گێڕاوەتەوە وشەی (هەرگیز)ی داناوە، ئەگینا لەنگ دەبوو.

(٤) ئەم شیعرە کارتێکردنێکی زۆری شیعری (دواڕۆژ)ی تۆفیق فیکرەت-ی بەسەرەوەیە، هەر ئەم شیعرەش کاریگەریی بەسەر نووسینی شیعرەکەی (دڵدار) بەناوی (ئەرێ ئەی لاو...)ەوە داناوە.

## دلی من

نەزیرە لەسەر قەسیدەیەکی مامۆستا بێخود

١

لەو ڕۆژەوە تۆی دیوە پەرێشانە دڵی من
سەودا زەدە و بێ سەر و سامانە دڵی من
پیشەی خەفەت و شیوەن و گریانە دڵی من[١]
گا وێڵی کەژ و کێو و بیابانە دڵی من
گا دەربەدەری کووچەیی شارانە دڵی من
سەرسامی پەڵ و بەردی مناڵانە دڵی من[٢]

٢

هەرچەندە بەدوویا ئەگەڕێم شار و وڵاتان
دەشت و کەژ و سەحرا و چیا، چۆڵ و بیابان
نایدۆزمەوە بێ سەروشوێن ڕۆییوە دیسان
شێتانە ئەبێ ڕووی لە چ لا کردبێ یاران
وەک بلبلەکەی وێڵی گوڵستان بە بەهاران
ئاخۆ لە چ گوڵزارێ، غەزەلخوانە دڵی من

٣

گاهێ وەکو لافاوی چیا، ڕوو لە بیابان
وەک هەوری تەڕی[٣] فەسڵی بەهاران لە نزاران
وەک بلبلی ئاوارە لە گوڵزار و گوڵستان
مەستانە ئەسووڕێتەوە، هێلانە پەرێشان

(١) لە گۆڤاری پەیام: (سەرگەشتە ئەسووڕێتەوە بێ لانە دڵی من) نووسرابوو.
(٢) هەر لەو گۆڤارەدا: (کفتی کوتەک و بەردی مناڵانە دڵی من) نووسرابوو.
(٣) هەوری تەڕ: ئەو هەورەیە کە شێیەکی هەست پێکراوی ئاشکرای لە بەهاران و زستاناندا هەیە.

شمشاڵی گەرووی پڕ لە چریکەی غەم و هیجران[٤]
هەر ساتە بەدەردێکەوە، ناڵانە دڵی من

٤

ساتێ بەهەوا و مەیلی پەرستش بە گوڵی ڕووت
جێی مەسجیدە بۆ سوجدەیی میحرابی دوو ئەبرووت[٥]
بەینێ بەخەیاڵاتی گرێ و پێچی سەری موت
پابەندی کلێسایە بە زنناری دوو گێسووت
حەیرانە لەبەر[٦] ڕووت و پەرێشانە لەبەر موت
گەه کافر و گەه شێخ و موسڵمانە دڵی من

٥

ساتێ نەبوو، دنیا بگەڕێ، تۆزێ بە کامی
ڕۆژێ نەبوو، سەد دەفعە کە نەکولێتەوە زامی
زۆرم پەلە کرد[٧]، دڵ نەبێ گیرۆدەیی دامی
بێهوودە بوو خۆی تووشی بەڵا کرد بە نەفامی
ڕۆحی بەفیدا کرد و کەچی هەر نەبوو ڕامی
ئێستا بەشەو و ڕۆژ، بەشی گریانە دڵی من

٦

نەمدیوە دڵی وا بەد و ئاخر شەڕ و نەگبەت
ڕێ لێ هەڵەبووی، چۆڵ و بیابانی موحیبەت
لاسار و سەهەندە و سەرەڕۆ و سەر بە موسیبەت
وەک بایە لەلای سەرزەنش و پەند و نەسیحەت

(٤) هەر لەو گۆڤارەدا: (... لە چریکەی غەمی هیجران) نووسرابوو.
(٥) هەر لەو گۆڤارەدا: (جێی مەسجیدە بێ میحرابی دوو ئەبرووت) نووسرابوو کە دیارە بەم شێوەیە لەنگە.
(٦) لە گۆڤارەکەدا نووسراوە: (حەیرانە لە دەس ڕووت و...).
(٧) هەر لەو گۆڤارەدا: (زۆرم تەقەلادا) نووسرابوو

گوێ ناگرێ لە جوێن و هەڕەشە و تەعن و مەلامەت
یـاڕەبـی چ بـێ هـۆش و چ نـادانـە دڵـی مـن

٧

سەد خۆزگە بێ بەو ڕۆژە کە نەمبیستبوو ناوت[٨]
نەمچێشتبوو[٩] تامی مەیی، مەیخانەیی چاوت
نەیدیبوو دەس و پێی دڵەکەم[١٠]، هەڵقەیی داوت
ئازادبوو لە پێچ و غەمی ئەگریجەیی خاوت
وا ئێستە[١١] لە تاو ئاگری هیجرانی بە تاوت
فرمێسکی ئەڵێی تەرزەو و بارانە دڵی من

٨

خۆ کفری نەکرد تێپەڕی کرد ڕۆژێ بە لاتا
زوو هۆگرت بوو وا کە ئەگریا بەدوواتا
سووتا وەکو پەروانە لەناو شەوقی چراتا
ئەتلێتەوە بێچارە لەناو دەرد و بەلاتا
خوێنی بەهەدەر ڕۆیی، لە پێناوی هەواتا[١٢]
خۆڕایی نییە، مەیلی لە تۆرانە دڵی من

٩

ئیتر بەسە هێندە مەدە ئازار و عەزابی
با نەشکێ پیاڵەی پڕ و بڕژێ مەیی نابی

---

(٨) لە گۆڤارەکەدا: (نەی بیستبوو ناوت) نووسرابوو.
(٩) هەر لە هەمان گۆڤاردا: (نەی چێشتبوو) نووسرابوو
(١٠) هەر لەو گۆڤارەدا: (نەیدیبوو دەس و پێی گرەهو...) نووسرابوو.
(١١) هەر لەو گۆڤارەدا: (ئێستاکە...) نووسرابوو.
(١٢) هەر لەوێدا نووسرا بوو: (خوێنی بەهەدەر ڕۆیی، لە پێناوی هیواتا).

با نەدڕێ سەحیفەی ئەدەب و دەرس و کیتابی
خۆت نەختێ بپارێزە لە دوعا و لە عیتابی[13]
جوابت چ ئەبێ، ڕۆژی جەزا وەختی حیسابی
جێی زیکری خودا و[14] مەرکەزی ئیمانە دڵی من

١٠

شەرت بێ دڵەکەم بگرم و وا بیدەمە بەر دار
زنجیر و کەلەپچەی کەم هەتا دێتەوە بەر بار
بیهێنمەوە ناو قەفەسی سینە وەکو پار
بیدەم بە نیگارێکی وەفادار و خریدار
گوێ بگرێ لە ناڵین و لە گریان و لە هاوار
با بەس بگەڕێ ئەم کەژ و کێوانە دڵی من

١١

ئەوسا بگەڕێ، یارێ بدۆزێتەوە بۆ خۆی
تێر سوجدە بەرێتە بەری میحرابی دوو ئەبرۆی
ئیتر نەگەڕێ شار و دەر و دەشت و چیا بۆی
ئۆباڵی هەتا هێندە نەچێتە مل و ئەستۆی
بەڵکو ئەمە خوایە، کە کەمێ بێتەوە سەر خۆی
با هێندە نەسوورێتەوە شێتانە دڵی من

١٢

بڕوا سەری خۆی هەڵگرێ، ڕووکاتە دیارێ
یارێ بگرێ خەندە بەلەب، شوهرەیی شارێ
دەم پڕ لە شەکەر خەندە، مەلەک چیهرە، نیگارێ
بارانی غەزەب، هێندە لە ڕوانینی نەبارێ

---

(١٣) هەر لەو گۆڤارەدا: (لەدوعایی موجابی) نووسرابوو.

(١٤) هەر لەو گۆڤارەدا: (جێی زیکری حەق و...) نووسرابوو.

بێنێتـــە سـەمـــا، ڕۆحی ڕەوانم بە وتارێ
نەشکێنێ هەمـــوو ڕۆژێ بە ســـەد تانە دڵی من

١٣

یارێکی وەها ترسی خــــــوداوەندی لەلا بێ
ڕەحـــمی بەقـــەدەر زەڕەیی[١٥] مـــوویە لە دڵا بێ
ترســـێکی لە پرســـینەوەیی ڕۆژی جـــەزا بێ
دەرحـەق بە موحیبـانی، بەعـەهد و بە وەفـا بێ[١٦]
زوڵمێکی کە بوو، مەرحەمەتیشی لەگەڵا بێ[١٧]
دەس هەڵگرێ، لەو شین و گـــریانە دڵی من

١٤

ئەم ئاهو ئەنینی دڵە گــــیـــانە بەشکایەت[١٨]
هەر بەردی سـەری ڕێتـە هەتا ڕۆژی قیـامەت[١٩]
تۆ تێ مـەگـە، ئەفسـانەیە کـردوویە بە عـادەت
هەر خاکی بەری پێتە[٢٠] بەشەوق و بە شـەتارەت
بیـبەخشـە کـە خنکاوە بەلافـاوی نەدامەت
هەرچەندە کــە لاســارە، بەســەزمـانە دڵی من

١٥

وادیارە کـە ئاگـات لەدەمی خـۆت نییـە (نووری)
تۆ شـاعـیری لای خـۆت و ئەڵێن ئەهلی شعووری

---

(١٥) لە دەستنووسێکی تردا: (ڕەحمی بەقەدەر دیەنی موویە لە دڵا بێ) نووسرابوو.
(١٦) هەر لەو دەستنووسەدا: (بەڕەحم و بەوەفا بێ) نووسرابوو.
(١٧) هەر لەو دەستنووسەدا: (سەد زوڵمی کە بوو، مەرحەمەتێکی لەگەڵا بێ) نووسرابوو.
(١٨) لەدەستنووسێکی تردا: (ئەم ئاهو ئەنینی دڵە هەرگیز بەشکایەت) نووسرابوو.
(١٩) لە دەستنووسێکی تردا ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتەکەی دوای خۆی شوێنیان ئاڵوگۆڕ بووە.
(٢٠) هەر لەو دەستنووسەدا: (دڵ خاکی بەری پێتە...) نووسرابوو.

ببـــــرێتـــــەوە ئەم ڕاز و سكالآیە لە دووری
ئەی ســــــایەیی ڕووناكی دوو دیدەیی نووری
گـوێ مەگرە لە نالّە و لە عـیتـاب و لە شـرووری
بێـهـۆشِ و سـەراسیـمـەیە، مـەڕوانە قـصـووری
تۆ هەر چ بكەی، بەندەیی فــەرمــانە دڵی من
سەنگاو: ١٩٥١/١٢/٢١

## ئەی دولبەری جانی

ئەی دولبەری جانی بەخودا جانی جیهانی
ئارامی تەن و راحەتی دڵ، ڕۆحی ڕەوانی
نووری بەسەر و شەمعی شەبستانە جەماڵت
مەحبووبی دڵ و مەحرەمی سەد ڕازی نیهانی[1]
یاقووتی لەبت، قووتی منی رووتە بەقوربان
ڕووت دەرخە کە بڕوا شەو و بێ وەختی بەیانی
موژگان و برۆت سەف وەکو عەسکەر کە دەبەستن
باکت چییە تۆ ساحبی شمشێر و سینانی
خوێنی منت بەو گەردنە بێ ڕۆژی قیامەت
ئەم عالەمە شاهیدمە کە تۆم قاتیلی جانی
ئەی عەبدی خودا، شەرمێ لە دیوانی خودا کە
ڕەحمت ببێ دنیایەکە بێ قیمەت و فانی
ببڕێتەوە ئەم دەعیەیە، بەم حوسنە مەنازە
وەک عومری منی خستە (سریع الجریانی)

(١) لە ڕۆژنامەی (پێشکەوتن)ی ژمارە (٩٩)دا (ڕازی جیهانی) نووسرابوو، کە لە دێری یەکەمی شیعرەکەدا ئەم قافییەیە هەیە.

## شێوەی زیوەر

ئەزانم بینووسم بۆ هەرکەسێ من، عەرزی حاڵ ئەمڕۆ
لە عەرزی حاڵی خۆم داماوم و ساحب مەلال ئەمڕۆ
شکایەت کەم لە ئەبرۆی دڵکەشی، یا چاوی خوێنخواری
بڵێم چی من، لە تەئسیراتی زوڵف و خەت و خاڵ ئەمڕۆ
ئەڵێن فەوتاوە باسی بولبول و گوڵ، شەمع و پەروانە
کەچی شەمعی گوڵی ڕۆحی بتێکی بێ میسال ئەمڕۆ
چراغی بەزمی عوششاقی، گوڵ و گوڵزاری ئافاقی
بەناچار ئەبە بولبول، ئەبە پەروانەی جەمال ئەمڕۆ
ئەگەر تەنقید ئەکەن، تەقدیر ئەکەن، ئەم ڕێگە، ڕێگامە
کە بچمە سەیری لە نجەی دولبەری قەد ئیعتیدال ئەمڕۆ
کە منهەجمان لەسەر دینە، نەوەک دەینە بڵێن موفتی
ئیتر لادە لە فتوای فاسد و قەولی بەتاڵ ئەمڕۆ
بەحوسنێکی خودا دادی وەکو (نووری) دووچاوانە
مەکەن مەنعم بەقوربانی بکەم عەقڵ و کەمال ئەمڕۆ[1]
لەو وەختەوە تۆ چوویتە سەفەر، کوێرە[2] بینایيم
سا ڕەحمێ بە یەعقووبت کە، ئەی یووسفی ثانی
بەم جیلوەیە، بەم عیشوەیەوە، وەختە نیگاهت
بێ، عەینی دەڵێی حوری وو غلیمانی جینانی
مەنعم مەکە وا عاجز و بیمار و نەخۆشم
بڕوانەرە ئاوێنە[3]، لە ئەحوالم ئەزانی

---

(١) ئەم شیعرەم لە بەرگی سێیەمی کەشکۆڵی (مینای شکستە)ی مامۆستا (نەجمەددین مەلا) وەرگرتووە کە لە ساڵی (١٩٤٠)دا نووسراوەتەوە، لاپەڕە (٢٦٠). هەروەها لە ڕۆژنامەی (ژین)ی ژمارە (٥٧٢)، (٢٩)ی حوزەیرانی ١٩٣٩ بەناوی (شێوەی زیوەر) بڵاوکراوەتەوە.

(٢) لە ڕۆژنامەکەدا: (کۆرە بینایيم) نووسرابوو.

(٣) لەدەستنووسێکی تری مامۆستا (نەجمەددین مەلا)دا(بڕوانە ئاوێنە) نووسرابوو، کە بەم جۆرە لەنگ دەبێت.

(نووری) کـه قـسـەی هەروەکـو گـەوهەر دەفـرۆشن[٤]
بۆ مـەدحی تەمـاشـایەکی تۆ، لاڵە زمـانی

سلێمانی

(٤) هەر لەو دەستنووسەدا: (هەروەکو گەوهەر دەفرۆشێ) نووسرابوو.

## تەلمیح لەسەر غەزەلی سەعدی[1]

چ خۆشە مەی مەزەی بێ ڕووی حەبیبان
بەبوی صبح بانگ عندلیبان
وەرە ڕەحمێ بە نالینی دڵم کە
کە ساکن گردد آشوب رقیبان
جەزایی دوژمنان بەسیە، ببینێ
حبیبان روی در روی حبیبان
نەسیبی ژینت کەسبی نەقدی وەقتە
مباش ای هوشمند از بی نصیبان
کە زانیت بۆت پەیا نابێ سەگ و شوان
رهاکن گوسفندان را بەذیبان
لە لای من هاودەمی ڕەندان بی باشە
خلاف پارسایان و خطیبان
مەفەوز بێ لەحەق من چی ئەزانن
بگویند آشنایان و غریبان
لە دونیا[2] هەر لەبی شیرین لەبانە
کە غارت میکند هوش لبیبان

(١) سەعدی: (سەعدی شیرازی)یە، ناوی (موسلیحەددین)ی کوڕی شێخ (کەمالوددین)ـە. باوکی لە دێی (پاوە) لەدایک بووە و نازناوی (شیرازی)یە، لە ساڵی (٥٧١)ی کۆچی لە دایک بووە. کتێبی (گوڵستانی)ی لە ساڵی (٦٥٦)دا داناوە. لە ساڵی (٦٥٥)دا کتێبی (بۆستانی) داناوە. لە - شیراز - سەرەتایی تەواوکرد.
لە پاشان (ئەبووبەکر ئەتابوک) فرمانداری کرمانشان، (موسلیحەددین)ی نارد بۆ خوێندن، کە لەو سەردەمەدا بەغدا (دارولعلم)بوو. لە قوتابخانەی سەربازیدا خوێندنی تەواو کرد. لە ساڵی (٦٩١)دا کۆچی دوایی کردووە. وشەی (خاص) بەحیسابی ئەبجەد، ساڵی مردنیەتی. بڕوانە ڕۆژنامەی ژین، ژمارە (١٣٤٥)ی ساڵی (٣٥)/١٢/٧/١٩٦٠.
(٢) لە دەستنووسێکی خۆیدا (لە دونیادا...) نووسرا بوو.

شـــەوێ بوومـــە ڕەفـــیـــقی نالەباران
بشـــــتم[*] هر چه خـوانـدم بر ادیبـــان
نییـه (سەعدی) بزانێ دەردی (نووری)
کـــە رنجـــورند از علت طبـــیـــبـــان

(*) لە دێری سێیەمی دەستنووسێکی تری شاعیردا ئەم بەیتە هەبوو، بەڵام لەم دەستنووسەی من پشتم پێ بەستووە ئەو دانی پێدا نەناوە.

لە توێکڵـێکا وەکـو دوو دەنکی بادام
برا ورده دوســـر از یک گـــریبـــان

## دڵ

جەولانگەهی نیگارە[1]، شەوی ماهتابە دڵ
ئۆخەی شوکر لە مەرحەمەتت کامیابە دڵ
لەو ساوە خاڵی دیوە لەسەر سەفحەی روخت
دایم خەریکی دەرس و موتالای کیتابە دڵ
تەختی شەهی، موحیبەتی تۆیە لە سینەما
جێیەکی زۆر موقەددەس و عالی جەنابە دڵ
یارەبی هەوری میحنەتی لێ دوور بخەیتەوە
جێگەی تلووعی مەرحەمەتی ئافتابە دڵ
وریابە بۆ دڵیی، دڵی ساحێب دڵان نەکەی
ئاهی ئەگاتە عەرش، دوعای موستەجابە دڵ
عاجز مەبە، مەڕەنجە خەتایێ ئەگەر بکا
جێی ڕەحمە، موستەحەقی وەفاو و سەوابە دڵ
بەس بەردی پیا بماڵە نەوەک پارە پارە بێ
وەک شووشەیەکی نازکی، پڕ ئینقیلابە دڵ
وەک دیدەیی نەخۆشێ، نەخۆشە لەخۆشییا
وەک پەرچەمی موشەوەشی پڕ پێچ و تابە دڵ
هەرچەن نەسیحەتی ئەکەم و پێی ئەڵێم بەسە
باکی نییە، موسیبەتە، پیاوی خەرابە دڵ
چیبکەم، قەباحەتی منی مەزڵووم ئەبێ چ بێ؟
بێ عار و هیچ لەگوێ نەگر و بێ حیجابە دڵ

---

(١) لە دەستنووسێکی تردا: (جەولانگەهی عیبادە) نووسرابوو.

## گاڵتەیان پێ دێ، بەئاوی چاوی پڕ گریانەکەم

گــاڵتــەیان پێ دێ، بەئاوی چاوی پڕ گــریانەکــەم
ئێستە لێم ڕوونە کە کەس نەیدیوە ڕووی جانانەکەم
بۆ گــوڵی باغی جـەمـالت، ڕۆحی شـیـرین بولبــولە
بۆ چرای ڕوخـسـارەکـەت، سووتا دڵەی پەروانەکـەم
مەمکەرە ڕیسوایی عـالەم، ئەی بلێسەی ئاهی گەرم
بەس مونەوەر کە هەموو شەو، کولبەیی ئەحزانەکەم
دڵ لە زوخـاوی غـــەمت دارمـــاڵە هیــتــر ناگــرێ
بەسیـە با نەڕژێ لە لێـوی کـەیلی خـوێن، پەیمانەکـەم
لەزەتی مـــردن بە ســـەد ســـاڵی ژیان ناگـــۆڕمـــەوە
گـەر بزانم تۆ لەگـەڵما دێیـتــە ســەر قـەبرانەکـەم
پێی بڵێن دکتۆر کەمال[1] ئیتر عەزیەتی خۆی نەدا
پەنسلین بێـــهـــوودەیە، بۆ دەردی بێ دەرمـــانەکـــەم

---

(١) دکـتـۆر کەمال: مەبەست لە (دکـتـۆر کەمال عەبدوڵلا ناجی)یە، لە سلێمانی لە سالی ١٩٢٣دا لە دایک بووە. لە ســالی ١٩٤٩دا لە کـۆلێـژی پزیشـکی دەرچووە و،بۆ یەکـەم جـار لە (جـەلەولا) بەپزیشکی سەربازی دامەزراوە، ئینجا دبلۆمی پسپۆڕی لە تەندروستی گشتی لە ئەسکەندەرییە لە میسر لە سالی ١٩٦٤دا هێناوە. لە ١٧ی ئابی سالی ١٩٧٧دا لە هایولبۆرک لە ئەڵمانیا کاتژمێر (٨,٣٠)ی بەیانی کـۆچی دوایی کـردووە. جگە لەوەی مـرۆڤـێکی چاکـەخـواز بووە، لە بزووتنەوەی نیشتمانی و کوردایەتیشدا بەشداری کردووە.

# غەمی زەمانە

غــەمی زەمــانە وەکــو پەردە، وا دڵی پۆشـــیم
بەغەیری غـوسسە و گریان و غـەم، نەمـا خۆشیم
لە ئـیـبـتـیـدای منالّیـمـەوە، هەتا ئێـسـتـا
فـیـراقی زەهری زەمـانە، قـەڵەم قـەڵەم نۆشـیم
بەسـەرچوو عـومـرم، نەفـعم نەدی لە هۆشـیـاری
لەبەر مـەراقـە، خـەریکی حـەیاتی بێـهـۆشـیم
لەمـیش خـراپە نەبێ، چاکە تووشی نەبوو سی ساڵ
وەکـو مـەڕ و بزنی دۆ[1]، سـەفـاهەت ئەیدۆشـیم
تەمـامـە ئێـسـتـەکـە، کـونجی قـەناعـەتێ بگرم
لە شاهیی سەرفی نەزەر بێ، خەریکی دەروێشیم
خەیاڵم ئێستەکە، سەر چاوی مەستی شۆخێکە
لەبەر مـەراقی، بەخـوێنی جگەرمـە سـەرخۆشـیم
لە دەس زەمـانە قـوڕی کـوێ بکەم بەسـەر خـۆمـا
بەمـەقـسـەدێ نەگـەیشـتـم لە هەرچی تێکۆشـیم

(١) لە کوردەواری بەمەڕ و بزنی شیردار دەڵێن مەڕ و بزنی دۆ.

## دەردی دڵی خۆم

دەردی دڵی خـۆم جـوملەیەکی بێنمـە تەقـریر
ئنس و مـــەلەک و جن و پەری دێنمـــە گــریان
بێ شک مــوتەحـەیر دەبێ، دێوانە لە زنجـــیـر
سـەد عـاقڵ و هۆشـیـار ئەخـەمـە کـێـو و بیـابان

***

لەو ڕۆژەوە هاتوومــەتە ناو زومــرەیی ئینســان
نەمدیوە لە دەس گەردشی ئەم چەرخە مەسەڕڕەت
سـەودا زەدەی شـیــفـتــە و بێ سـەر و سـامـان
وەک لالە[1] لەسەر پەڕەی دڵ نوقتەیی حەسرەت

***

یەک سـانیـیـە بێ غـوسسـە نەبوو، باری دڵی من
ساتێ غەمی خۆم، ساتێ غەمی گەردشی[2] دنیا
یــارەبــی بــەچــی ئــاوی درا، داری دڵــی مــن
وا کـەیلە لەبالەب لە غـەمــا هەروەکـو مــینا

***

بێ شـوبهـە سـروشـتی دڵی من قـەترەیی خوێنە
خوێنی دڵی حەسرەت زەدەیەکی دەسی گەردوون
ئاهێکی سـتـەمـدیدەیی، مـەزڵـوومـیی هەوێنە
وا مــایلی سـەحــرایە بەدایم وەکــو مـەجنوون

***

ئەی چەرخ، لەگەڵ ناکـەس ئەبینم کـە ڕەفـیـقی
بۆ تیـری جـەفـا، سـەد کـەست کـردۆتە نیـشـانە

---

(١) لالە: گوڵێکی سوورە. خاڵێکی ڕەش لەناویایەتی.
(٢) لە دەسـتنووسـەکـەی مامۆسـتـا (نەجمـەددین مەلا) شـاعیـر بەقەڵەمی خۆی (مـیـحنەتی) کردووە بە (گەردشی).

بۆ بەعزێ ستەم پەروەر و بۆ بەعزێ شەفیقی
ببڕێتەوە، لەم عالەمە بەس بگرە بەهانە

***

بەینێکە بەدەس تۆوە گرفتاری عەزابم
دەرد و غەمەت هێند زۆرە دڵم خوێن ئەتکێنێ
دایم بەگڕی ئاگری تۆ، سینە کەبابم
چاوم لە غەم و میحنەتت، فرمێسک ئەڕژێنێ

***

## ئەی فەلەک

ئەی فــەلەک دیســـان لەدەس تۆ، شین و واوەیلا ئەکــەم
ژەهری قــەهری تۆ لەگــەڵ دەردی دڵم، ئیــفــشــا ئەکــەم
وەخـتـە یەکـجاری لەدەس ئاشـووبی فـیـتنەت شـەق بەرم
من قــســەی ڕاست و ڕەوان و خـۆش و بێ پەروا ئەکــەم
هێند خــراپەم دی لە دەس ئەهلی زەمــانە، عــاقــیــبــەت
لەم وەزیفــەی هاتنە دنیــایە، ئیــســتــیــعــفــا ئەکــەم
نابەمــە بەر دەسـتی هەر نامــەردێ، عــەرزی ئیـحـتـیــاج
من لە دنیــا و لە مــافــیــهــاشی، ئیــســتــیــغنا ئەکــەم
مــورغی فــەهمی هەرکــەسێ، ناگــاتە عــەرشی فــیکرەتم
من بە چەرخی ئاســمــانی سـفـلـە، ئیــســتــیـهـزا ئەکـەم
تەبعی عـــالی وادەبێ، ســـەیری بە کــۆڵێ فــەقــرەوە
گــاڵتــە و ســوحـبــەت، بەتاج و تەخـتی شــاهنشــا ئەکــەم
ئەو کەسە ڕوو سوورە (نووری)، دوورە لێی نەوعێ بەشەر
من لەمــەولا ڕوو لە دەشـتی وەحـشـەتی ســەحـرا ئەکــەم

## چاوم کە دوو مفتاحی کوتبخانەیی سەرمە

چاوم کـە دوو مـفـتـاحی[1] کـوتبـخـانەیی سـەرمـە
قـوربانی دوو چاوت بێ[2]، کـە ئالوودەیی شـەرمـە
تەفـسـیـرێی حەواشی خەتی نەورسـتـەیی کـوڵمت
مـوحـتـاجی مـوتاڵا نـیـیـە، یەکـدەفـعـە لەبەرمـە
ئەو ئاڵـیـیـــە دیم دوێـنێ بە سـەر پەنجـەیی تۆوە
ناسـیــمـــەوە ئەمـــڕۆ، ئەوە خــوێناوی جگەرمـە
بۆ کـــوێ بچم ئەی دیدە لەدەس تانەیی بەدکــــار
لێم ناگەڕێ بەدبەخـتـە، ئەڵێی خـوێنی لەسـەرمـە
خاڵی ڕەش و ئەبرۆی کەچ و حەلقەیی گێسـووت
شــاهیــدی گـــرفـــتــاریی و ئازار و کـــەدەرمـــە
گـــریانی منە، باعـــیــســی مـــەیلت بەڕەقـــیــبـــان
خـــۆشم گلەییم زۆر لە هەناســـە و لە ئەســـەرمـــە
نیـــمـــە زەڕ و زیو، بیـکـەمـــە شــاباشی قـــدوومت
هەر شیـعـرە کـە دانەی دوڕ و ئەڵمـاس و گوهەرمـە[3]

---

(١) لە دەستنووسێکی تردا: (دیدەم کە دوو میسراعی...) نووسرابوو.

(٢) هەر لەو دەستنووسەدا: (قوربانی دووچاوی بێ...) نووسرابوو

(٣) ئەم شیعرە لە کاتی خۆی بەدەستنووسی شاعیر کە ناردوویەتی بۆ (گیوی موکریانی)، چوار بەیت بووە.

## پەشێوی پەرچەمی شۆخێکم(*)

پەشـێـوی پەرچەمی شـۆخـێـکی بێ پەرواو و بێ باکم
مـوحـەقـەقـمـە کـە مـردم بێ گـوناه، لایوسـئـەل و پاکم
سـەرم وەک تۆپی فـوتبـۆڵ، وا لەمـەیدانی شـەقـا ئەمـڕۆ
ئەسـیری دەسـتـوبردی قـەڵعـەچییـەکی(١) چست و چالاکم
بزانم ڕۆحی شـیـرینم بەقـوربانت ئەکـەم، ئەمـرم
لە سـاڵێکا(٢) ئەگـەر بۆ فـاتیـحایەک دێیـتـە سەر خـاکم(٣)
کـە مـیـحـرابی برۆی تۆم دی، ئیـتـر لەو وەختـەوە دایم
خـەریکی ئامـشـۆی مـزگـەوت و وێرد و نوێژ و سـیـواکم(٤)
قسە و تەعنەی ڕەقیبی سەگ سیفەت مەگرەرە گوێی خۆت
بە لـێـدان و جنێـویشت ڕەزام من، بەندەیی چاکم(٥)
لە هاتوچۆی ڕێی تۆ(٦)، ئەگـەر دەس هەڵگرم کـوێر بم
لەبەر پێـتـا، ئەمین بە، تا قـیـامـەت خـاک و خـاشـاکم
دڵ و دینم نەثاری خـاکی بەر پێی تۆ ئەکـەم بەخـوا(٧)
تەنەزول گـەر بفـەرمووی بێـیـتـە لام و بکەیە حـاکم

---

(١) لە گوڵدەستەی شوعەرای هاوعەسرمدا: (قەلعەداری چست و چالاکم) نووسرابوو.

(٢) هەر لەو سەرچاوەیەدا: (لە ساڵێکدا...) نووسرابوو.

(٣) ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتەکەی پێش خۆی شوێنیان ئاڵوگۆڕ بووە.

(٤) هەر لەو سەرچاوەیەدا: (... مزگەوت و نوێژ و وردە سیواکم) نووسرابوو.

(٥) هەر لەو سەرچاوەیەدا: (عەبدێکی وا چاکم) نووسرابوو.

(٦) لە دەستنووسێکی تردا: (لە ئاموشۆ و ڕەفتی کوێی تۆ ...) نووسرابوو.

(٧) لە دەستنووسێکی تردا: (بالله) نووسرابوو.

(*) مامۆستا کاکەی فەللاح لە ژمارە (٨٩)ی گۆڤاری کاروان-دا گومانی هەیە لەوەی ئەم شیعرە هی شێخ نووری بێ و دەڵێ: (بەسەرو سیما بەشیعری عەلی کەمال باپیر ئاغا دەچێ)، منیش دەپرسم: ئەگەر ئەم شیعرە کە لە چەند دەستنووسێکی شاعیر و مامۆستا نەجمەددین مەلادا هەیە، ئەی بۆچی عەلی کەمال باپیراغا خۆی لە کتێبەکەیدا (گوڵدەستەی شوعەرای هاوعەسرم) ئەم شیعرەی بەناوی م. نووری بڵاو کردووەتەوە؟.

## هەر مورغێ فڕی

هەر مـورغێ فـڕی بۆ چەمـەنسـتـانی خـەیاڵی
ناگـاتە نەوێ، تێک ئەشکێ شـاپەڕی باڵی
ئەحــــوالـی دڵـی زەڕە، بـەدەس ڕۆژەوە دیارە
ئەی بێ خـەبەران، ئێـوە نەزەرکـەن لە جـەمـالی
هەر سـاعـەتێ ڕەنگێکە قەد و جلیـوەیی باڵای
میرئاتی تەفـەکور نیـیـە، بۆ عـەرزی میـسـالی
ئەحـوالی دڵـی عـاشـقی بێـچـارە مـەپرسن
جیـلوەی قەدی یار کـافـیـیە بۆ پرسشی حـاڵی
هەرچی یەتە بەر دیدە هەموو یا ڕەمـە، یا غـەم
عـالەم هەموو دەشتێکە کە من بوومە غـەزالی
بێـچـارە تەنەفـوس نیـیـەتی، تاقـەتی پەرواز
تەئسـیری چ زوڵمێ بوو، کە سووتا پەڕوباڵی
وەک لالە چلۆن نایلی مـەقسـەد ئەبێ (نووری)
تا داغی خــەیاڵێکی نەبێ، زینەتی حـــاڵی

## بولبول فیداتم

بولبـــــول فـــــیـــــداتم
حـــەیرانی ســـۆز و دەنگ و ســـەداتم
قـــوربانی ورشـــەی باڵـی خـــێـــراتم
فـــیدای زانیـــاری و مـــێـشکی وریاتم
لەو تۆزە مـــێـشکەی خـوا بە تۆی داوە
زانیـــاران هەمـــوو ســـەریان ســـوڕمـــاوە
دەمـــێکە مـــەیلی لای یاران ئەکـــەم
تاســـــەی دیدەنی، نازداران ئەکـــــەم
بدە لە شـــەقـــەی باڵـی نەرم و ســـووک
بڕۆ تا چەمی خاسەی[١] ناو کەرکووک
لە وێوە باخـــچـــەی، خـــانەقـــا دیارە
مـــێـــرغـــوزارێکی، تەڕ و ئاودارە
بنیـــشـــــەرەوە، ســـــەر لقی چڵێ
دەس کـــەرە ناڵە، هەردەم[٢] بۆ گـــوڵێ
شـــمشاڵی گەرووت[٣] دێنێـتـە خرۆش
دڵـی دڵداران دەهێـنێـــتـــــە جـــۆش
ڕاسـپـــێـــریم هەیە، گـــوێ بگرە بەزەین
بچۆرە خزمەت شێخ (کاکە حوسەین)[٤]

---

(١) چەمی خاسە: (بە خاسە سوو) بەناوبانگە، بەناوەڕاستی شاری کەرکووکدا تێدەپەڕێ و شارەکە دەکاتە دوو بەشەوە، خانەقای سەید ئەحمەد دەکەوێتە سەر ئەم ڕووبارە کە بەزۆری لە هاویندا وشکە. ئێستاکە مەگەر بەشوێنەوار بناسرێتەوە.

(٢) لە دەستنووسەکەی شاعیر (هەردە) نووسرابوو. کە ڕاستەکەی (هەردەم)ـە وادیارە هەڵەی کاتی نووسینە.

(٣) هەر لەو دەستنووسەدا: (شوشماڵی گەرووت...) نووسرابوو

(٤) شێخ کاکە حوسەین: مەبەستی کوڕی سەیید ئەحمەدی خانەقایە. کاک حوسێن خانەقا تەحسیلی =

بڵێ: ئەی نووری دوو دیدەی (نووری)
نووری خەریکە، بڕێ لە دووری
عەقڵ و شعووری وا نزوول ئەکا
مەیلی هاتنت بۆ قەیتوول ئەکا
زۆرم پێ خۆشە، وەک خونچەی بەهار
بگەشێیتەوە لە دەم جۆیبار
ئاواتەخوازم، ڕۆژێ هەزار جار
چۆن شەماڵ ئەدا لە چیا و نزار
بەسروە دڵم فێنک کاتەوە
خەمی کۆن و نوێم لە بیر باتەوە
پێکەوە لە گوێ ئاوێ دانیشین
ئەو بەپێکەنین، من بەگریە و شین
بێنمەوە بیری، بەزمی ئەو شەوە
ئێستاش نازانم، خەیاڵە، خەوە
ئەو شەوە ماری ئەگریجەی ماری
لە هەستم ئالا، بەلەنجە و لاری
گێسووی وەک ماری، ماری لە ئەستۆم
نەوعێ ئالابوو، پێم نەبوو بڕۆم
وای بێهۆش کردم، بەبادەی چاوی
عەقڵ و شعوورم، نایە پێناوی

= لە حوجرە و مزگەوت و ئیبتیدائی بووە. فارسی و تورکی و عەرەبی دەزانێ. لە کاروباری میری ئیشی نەکردووە. خۆیان زەوی و زاریان هەبووە، لە دەسکەوت و بەروبوومی زەوی و زاری خۆیان خواردوویەتی. کوردێکی ڕاست و پاکە، پیاوێکی مونەوەر و باخەبەرە. ئێستا لە تەمەنی شەستساڵیدایە و لە بەغدا دادەنیشێ.

## ساقیا نەوبەهارە ڕۆیی دەی

ســــاقـــیـــا نەوبەهارە ڕۆیی دەی
فــرســەتە و هاتووە لەدەســتی نەدەی
نەوبەتی عـەیش و نۆشـە، دەی سادەی
بێنە گـەردووش پیـاڵە پڕ کـە لە مـەی
چونکە من بیستوومە من لە ناڵەی نەی
(و مـــن المـــاء کـــل شــــیء حـــي)[1]

***

ســاقـیـا بولبـولان لەسـەر لقی گـوڵ
ناڵەیان دێتـە گـوێم بە سـۆز و بە کـوڵ
تۆش وەرە هەڵسـه بۆ فـەراغـەتی دڵ
بێنە گەردووش، پیـاڵە پڕ کە لە مەی
چونکە بیسـتـوومـە من لە ناڵەی مەی
(ومـــن المـــاء کـــل شـــئ حـــي)

***

ســاقــیــا ئـیـمـڕۆ جـەژنی نەورۆزە
چـەژنەیـەکی قــــەدیم و پـیـــرۆزە
چـەژنـەیـەکی مـــــوبـارەکی هۆزە
وەرە گـەردووش پیـاڵە پڕ کـە لە مـەی
چونکە بیسـتـوومـە من لە نـاڵەی نەی
(ومـــن المـــاء کـــل شـــیء حـــي)

***

بـووکی مــــینـا بـەڕەنـگی تـاراوە
لەلـق و پـۆپی ســـەوســـەن ئالاوە

---

(١) ئاماژەیە بۆ ئایەتی (٢٩) لە سورەتی (الانبیاء) کە دەڵێ: (أو لم یر الذین کفروا ان السماوات والأرض، کانتا رتقا ففتقناهما وجعلنا من الماء کل شيء حي أفلا یؤمنون).

مـــــــــژده بـێ نـەوبـەهـاری هـێـنـاوە
تۆش وەرە زوو پـیـاڵـە پڕ کـە لە مـەی
چونکە بیـســتـوومـە من لە ناڵەی نەی
(ومـــن المـــاء کـــل شـــیء حـــي)

## سلێمانی(١)

سلێــمــانی چ خــۆشــه نەوبەهاران
بەلەنجــە و لارەوە دێن گــوڵعــوزاران
بەچاوێکی لە شــەرمــا کــەم هەڵاتوو
ئەپچــــڕێـنن هەنـاوی دڵ فــــیگاران

(١) گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە (٥)، ساڵی حەوتەم (١٩٤٦)، ئەم شیعرەی بەم شێوەیەی لای خوارەوە بڵاوکردووەتەوە کە وەک دەیبینین جیاوازییەکی ئێجگار زۆریان لە نێواندا هەیە.

چ خـۆشـە شـارەزوور وەخـتی بەهاران
بەکـۆمـەڵ دابنیـشـن تیـپی یاران
وەکـــو پۆلێ پەپوولە، داپــۆشن
لێ و پۆپی گــوڵاڵەی جـــوێبــاران
بریقـەی پوولەکـەی دەسـمـاڵی لامل
وەکـو ئەنجـوم لە دەوری مـاهی تابان
لەڕوو ڕووپۆشی لادات و بەخـــەندە
بڵاوێـنێ هـیــوایی هەرزەکـــاران
بەعـیـشـوە و نازەوە خـۆت پێ بناسی
بزانی دولبــەرە و هاتۆتە ســەیران
بەچاوێکی لە شـەرمـا کـەم هەڵاتوو
بپــچـــڕێنێ هەناوی دڵ فـــیگاران
چەمەن کەوتۆتە خەندە و من بەگریان
ئەناڵێنم وەکـــو هەوری بەهاران
جـــوانانی چەمـــەن هاتوونە لەنجـــە
بە ئاوازی جگەرســــــۆزی هوزاران

هەر ئەم شیعرە لە دەستنووسێکی تری شاعیردا، بەم شێوەیە بوو کە وەک دەبینین پاش و پێش کردن و جیاوازی زۆری تێدایە.

چ خـــۆشــە گــردی یارە نەوبەهاران
کە تیـپی گوڵعـوزاران، ئەچنە سەیران
وەکـــو پۆلێ پەپوولە داپــــۆشن
لێ و پۆپی گــوڵاڵەی جــوێبـــاران =

چەمەن کەوتۆتە خەندە و من بەگریان
ئەنالێنم وەکو هەوری بەهاران
جەوانانی چەمەن هاتوونە لەنجە
بەئاوازی جگەرسۆزی هوزاران
درەخشانە، برووسکەی شەو لە شەوقا
وەکو ئاهی دڵی شەو زندەداران
بەسرووەی بای سەحەر ئارایشی دا
عوزاری گوڵ، وەکو ڕووی گوڵعوزاران
گوڵاڵە بانگ کرا، بۆ سوور و شایی
بەتارای سوورەوە، ڕەقسان و ڕەخشان
بریقەی پوولەکەی، دەسماڵی لامل
وەکو ئەنجوم، لەدەوری ماهی تابان
شنەی بای سوبحدەم ئارایشی دا
عوزاری گوڵ وەکو ڕووی گوڵعوزاران
درەخشانە برووسکەی هەوری ئەمڕۆ
وەکو ئاهی دڵی شەو زندەداران

---

=

بریقەی پوولەکەی دەسماڵی لامل
کزە وەک نەجمی دەوری ماهی تابان
لەڕوو ڕووپۆشی لادا یار بە خەندە
بلاوێنێ هیوای دڵ فیگاران
بەعیشوە و نازەوە خۆت پێ بناسی
بزانی دلبەرە و هاتۆتە سەیران
بەچاوێکی لەشەرما کەم هەڵاتوو
بپچڕێنێ هەناوی غەمگوساران
چەمەن هاتۆتە خەندەو من بەگریان
ئەنالێنم وەکو هەوری بەهاران
جەوانانی چەمەن هاتوونە لەنجە
بەئاوازی جگەرسۆزی هوزاران

بەبەردی ئەم بەهارە زۆر ئەترسم
کە بشکێ جامی تۆبەی تۆبەکاران
ڕشـــێنەی ڕۆح، ئەپرژێنێ بە دڵدا
قـــریوە و پێکەنینی، پۆپلەداران
بەتەرزەی ئەم بەهارە زۆر ئەترسم
کە بشکێ جامی تۆبەی تۆبەکاران
مەڵێن (نووری) لە ئێش و سوێی برینی
لە بیـــری چۆتەوە، ئاهەنگی جـــاران

## نیسان(1)

گـــوڵێ بەکـــردنەوە نەوســـروشـــتـــە، مـــەخلووقێ
قـــەڵەم بەدەســـتـــەوە، ئامـــادە، بەندەیی فـــرمـــان
مـــســـەورێ کـــە لە دارولفنوونی قـــودرەتی حـــەق
بە فـرطی عـیلمەوە مـەئذوونە بۆ تەزیینی جـیـهـان
سەحائفی هەمـەڕەنگی جیـهـانی بەدەستەوە، وا
خەریکی ڕەسمە، فەقەت ڕەسمی عالەمی ئیمکان
ئەگـەر سـەحـایفی تەسـویرەکـەی، تەمـاشـاکـەی
پڕە لە حـــیکمـــەتی ئەحکامی سنعـــەتی یەزدان

---

(1) هەمـان شـیـعـر کـە لە ڕۆژنامـەی (ژیان)ی ژمـارە (٤٧٥)ی سـاڵی (١١)، شەممە (١٨)ی نیـسـان ١٩٣٦ بەم شێوەیە بڵاوکراوەتەوە.

یەخـەی گـوڵێکی سـپی پێـوە، تازە مـەخلووقێ
قـەڵەم بەدەسـتـەوە، ئامـادە، چاوەڕێی فـرمـان
مـسـەورێ کـە لە دارولفنونی قـودرەتی حـەق
بووە بەرەهبـەری ئارایشی جـەمـالی جـیـهـان
سەحائیفی هەمەڕەنگی جیهانی گرتووەتە دەست
خەریکی ڕەسمە، فەقەت ڕەسمی عالەمی ئیمکان
بەدانە لوئلوئی بارانی ڕۆح بەخـــشی ئەوە
چنار و یاسـەمـەن و سـەروو و عـەرعـەری بوسـتـان
بەئیـهـتـیـزازی نەسـیـمێ، بەنەشـئـە دێن و ئەچن
مـیـسـالی ڕۆحێ مـوجـەسـەم لە جلوەدا ڕەقـسـان
بەپێکەنینەوە پێـمـان ئەڵێ، کـە بووکی بەهار
لە پەردە دایە بەکـەیف و فـەرەح، ئەمـەش نیـسـان

***

دەمـــێکە باوەشی نەیدیوە زادەی فـــیکرم
دەبا بچـێـتـەوە ئاغـووش (پیـرەمـێـردی ژیان)

ئەم دوا بەیتە، لە شیعرێکی تریدا بەکاری هێناوە.

له دوڕ و لوئلوئی بارانی ڕۆح بەخــــشی ئەوا
چنار و یاسەمەن و سەروو، عەرعەری بوستان
بەهات و چۆیی نەسیمی، بە نەشئە دێن و ئەچن
میسالی ڕۆحی موجەسەم، لە خۆشیا ڕەقسان
حەقیقەتەن ئەمە هەنگامەی تەجەددوده وا
کە تەیر و تووری سەما، جوملە شاد و خەندەفشان
بەپێکەنینەوە تەبشیر ئەکەن، کە ڕۆحی بەهار
لە نەشئەدایە، ئەوا هات بە مەقدەمی نیسان

## بەهار

ساقیا مەی بێنە تێکەڵ بەزمە بادی نەوبەهار
لالەو و ڕەیحان، گوڵ و نەسرین لەگەڵ یەک بوونە یار
وا شەبستانی چەمەن پڕ بوو لەبەر بووکی سەبا
بووکی تازەی گوڵ ئەڕازێنێتەوە بێ ئیختیار[1]
حەقیەتی ئیتر کە موشتاقانە سەرووی نەوجەوان
نەونیهالانی چەمەن، با پەردە بگرێتە کەنار
مەوسمێتی، سێو و گوڵ بێنن[2] متوربەی کەن لەیەک
لەم چەمەنزارانە، وەک وەسڵی دوو یاری غەمگوسار
دەست لەمل یەک عاشق و مەعشووقە وا دێن و دەچن[3]
وەک بەدەم بادی سەباوە، بەرگ و باری شاخسار
قەترەیێ باران لە دڵ ئەشواتەوە، تۆزی کەدەر
لا دەبا بایە، لە ڕوخساری قەدەح نۆشان غوبار
ڕەشبەڵەک بوو، هەڵپەڕین، ئالانە سەر سەرچاوەکە
بۆیە سەرچاوەی دڵم، ڕووناکە عەینی سەرچنار
ئالاو والا پێکەوەن، وەک گوڵ لەگەڵ ڕەیحانەدا
دەستە بەستراوە، وەیا دەستە خەریکی گیرودار

***

(١) لە دەستنووسێکی تری شاعیردا: (ئەڕازێنێتەوە نەغمەی هوزار) نووسرابوو.

(٢) هەر لەو دەستنووسەدا: (وەختیە دەی، سێو و بەی بێنن) نووسرابوو.

(٣) هەر لەو دەستنووسەدا: (دەس لەگەردن تیپی نازداران، وەها دێن و دەچن) نووسرابوو.

## بەهار

بەهارە دڵ هەوەسی گـەردشی[1] گـوڵسـتـانە
چەمەن سروور و فەرەح بەخشی بەزمی مەستانە
پـیـــالـە ڕەنـگـی نـەدارایـی[2] بـە ئـاوادا
سروور و بەزمی چەمەن، نەقدی تەنگ دەستانە
بیسـاطی دەشت[3]، مـەقـامی سـروورخـواهانە
هەوای باغ، مـــورادی هـەوا پەرســـتـــانـە
لە سـوبحی تازە بەهارا، چەمـەن ئـەوەی خۆشـە[4]
کـە ئاخری نەفـەسی، عـومـری پیـری زسـتـانە

(١) لە دەستنووسێکی تردا: (بەهارە دڵ بەتەمای گەردشی...) نووسرابوو.

(٢) هەر لەو دەستنووسەدا: (... ڕەنگی نەدارایی) نووسرابوو، لەو دەستنووسەی کە پشتم پێ بەستبوو (نەداریی) نووسرابوو کە لەنگ دەبێت

(٣) هەر لەو دەستنووسەدا: (بیساطی سەبزە ...) نووسرابوو.

(٤) هەر لەو دەستنووسەدا: (جگە لە سوبحدەمی نەوبەهار نەوەی خۆشە) نووسرابوو.

## بەهار

وا بەهار هات و هەوا غـالـیـیـە، سـایی چەمـەنە
نەفـەسی بادی سـەبا، نافـەگـوشـایی چەمـەنە
هـاتـەوە بـەر بـەدەنـی سـەبزە حـەیاتی تازە
شـاهیـدی لالە، ئەوا چیـهـرە نومـایی چەمـەنە
دوڕ و ئەڵـمـاسی لە ئاونگی هەوا هۆنیـیـەوە
نێـرگس ئەلحـەق یەکـە بووکی بەوەفـای چەمـەنە
خـەنەیی گـرتە دەس و پێی گـوڵاڵـە و گـوڵە سـوور
لالە تارای سـەروو، سـەوزە کـەوایی چەمـەنە
غونـچە پشکووت و دەمی دایەوە وەک لێوی نیگار
بولبـولی والە بەدڵ نەغـمـەسـورایی چەمـەنە
نێرگس و یاسەمەن و نەستەرەن و سەروو و چنار
هاتوچۆیانە، سـەباخـوانی نەوایی چەمـەنە
مـەسـتی جلوەی تەڕەبن، تازە عـرووسـانی بەهار
فـەیزی ئەنفـاسی سەبا، نەشـئەگـوشایی چەمـەنە
دزو جـەردەی هەمـوو گـیـراوە، شەهەشـاهی شـیـتـا
ئەم هەمـوو ئومنیـیـەتە، عـەدل و هەوایی چەمـەنە
بەدەسی قـودرەتی حـەق، چیـهـرەیی ڕازاوەتەوە
ڕۆحی شاعیر، هەمـوو ڕەقـسان و فیدایی چەمـەنە[1]

سلێمانی مارتی ١٩٤٢

(١) ئەم شیعرە لە بەرگی سێیەمی (میناى شکستە)ی مامۆستا (نەجمەددین مەلا) وەرگیراوە، لاپەڕە ٥٤٣.

## بەهار

بەهارە، ئەمڕۆ لەباغا وەنەوشە مەستی ئەکا
سەبا لە پەڕەی گوڵدا، دراز دەستی ئەکا
لەمن فیدایی تری لێرەدا نییە ئەمڕۆ
بەغەیری غونچە کە ڕەفعی حیجابی هەستی ئەکا
لەخاکپای گوڵا وا بەگریە کەوت بلبل
دەڵێی (برەهمەند)[1] مەستانە بت پەرستی ئەکا
ئەدەب لەسەرووی سەهی وەرگرە ئەگەر ژیری
لەگەڵ بڵندی خۆیا، هەوای پەستی ئەکا
ئەگەر چ مەی نییە لەم بەزمەدا بەتەنگەوە نیم
بەبێ پیاڵە لە باغا، وەنەوشە مەستی ئەکا

(١) برەهمەن: یان (براهما) ئەو خواوەندە خولقێنەرەیە کە ژیان دەبەخشێ. ئەو هێزە کاریگەر و دەسەڵاتدارەیە لە گەردووندا کە هەموو شتەکان لەوەوە کەوتنەوە و ڕۆح لەبەرەکانیش لێی دەپاڕێنەوە و داوای بەزەیی و لوتفی لێ دەکەن. خۆریش دەدەنە پاڵ ئەو خواوەندە کە بەهۆی ئەوەوە و بەپێی قسەکانی خۆیان جەستەکان دەبووژێنەوە و ژیان لە ئاژەڵ و ڕووەکدا دەگەڕێنێ.
(براهما) یەکێکە لە خواوەندەکان، کە لەهیند برەهمییەکان پەرستوویانە، ئەوانە بەقسەی خۆیان هێزە کاریگەر و دەسەڵاتدارەکانی ناو گەردوون و گۆڕانکاییەکانی ناو گەردوونیان پەرستووە. هێندەی پێ نەچوو ئەو هێزانەیان بەرجەستە کرد بەوەی باوەڕیان وا بوو کە لەناو هەندێ لەشدا خۆی نواندووە، بۆیە کەوتنە بت پەرستی، چونکە گوایە لەو لاشانەدا خۆی نواندووە. بەم جۆرە ژمارەی خواوەندەکانیان زۆر بوو، تا گەیشتنە سی و سێ خواوەند، بەرەبەرە بیروباوەڕیان گۆڕانی بەسەرداهات، تا خواوەندیان لە سێ ناوچەدا بەند کرد لەبەرئەوەی وا چووبووە کەللەیانەوە و تووشی واهیمە ببوون کە جیهان سێ خواوەندی هەیە کە ئەمانەن:
١- براهما (خواوەندی خالیق، کە ژیان دەبەخشێ).
٢- سیڤا یان سیوا (ئەو خواوەندە وێرانکار و لەناوبەرەیە کە گەڵا سەوزەکانی پێ زەرد دەبێ و دوای گەنجێتی پیرێتی دەهێنێ).
٣- ویشنوا یان یشن ئەو خواوەندەیە کە چووەتە ناو گیانلەبەران تا جیهان لە لەناوچوون ڕزگار بکات. بڕوانە: مقارنات الأديان (الديانات القديمة) الامام محمد أبو زهرة، ١٩٦٥ص ٢٧-٢٨

## فەریاد

ئومـــێـــدی زەمـــانە ئەمـــەلێکە بەد و بێ ســـوود
مـازیت هەمـوو هەر دەرد و فـیـراقی ئەلەم ئەفـزوود
حـالّیـــشت وەکـو ڕاحـەتی ڕابردوو غـــەم ئالـوود
موستـەقـبـەل و ئاخر نەفـەست مەقـبـەری مەسـدوود
لەم خلقـەتە، مەقـسوودی چییە حەزرەتی مـەعبـوود
(فـــــریـاد أزیـن نـوع وجـــــود عـــــدم آلـود)

***

بۆ سـەیرێ، مـووەقـەت، لە نـەبوو دێتـە دەر ئینسـان
کوا حشمەت و[1] کوا سەڵتەنەت و تەختی سولەیمان
نەیدیوە کـەسێ خـۆشی لەدەس گـەردووشی دەوران
گـەه خـوڕەم و خـەندان و گـەهێ مـاتەم و گـریان
بوونیـش وەکـو ئیـزهاری[2] عـەدەم، بۆ نەبوو نـابوود
(فـــــریـاد أزیـن نـوع وجـــــود عـــــدم آلـود)

***

فـــریاد ئەمـــەیە تەرجـــومـــەیی حـــاڵی زمـــانە
هەر لەحـــزەیە دنیـــا، ئەلەم و ئاهو فـــیـــغـــانە[3]
ڕۆیشـــتنی ئەم عـــالەمـــە، وەک ســـەیلی ڕەوانە
ئەبڕێتـــــەوە هـەر پێنـج و دوو ڕۆژێکە زەمـــانە
بۆ مـــردن و کـــفن و دفنە، عـــالەمی مـــەوجـــوود
(فـــــریـاد أزیـن نـوع وجـــــود عـــــدم آلـود)

***

(١) لە ڕۆژنامەی (پێشکەوتن)ی ژمارە (٤١)، (کوا سەتوەت و...) نووسرابوو.
(٢) لە دەستنووسێکی شاعیردا: (بوونیش وەکو دونیای عەدەم...) نووسرابوو.
(٣) لە دەستنووسێکی شاعیردا: (هەر سانییەکی ئەلەم و دەردی گرانە) نووسرابوو.

دنیـــا چیـــیـــه ســـاتێ فـــەرەح و ســـاتێ مکەددەر[٤]
مـــاهیـــیـــەتی مـــەعلوومـــە لەلای پیـــاوی منەوەر[٥]
عـــەجـز و ئەلەم و گـــریەو و ئەفـــغـــانە ســـەراســـەر
گـــەه عـــوشـــرەت و شـــادیی و گـــەهێ مـــەرگی برادەر[٦]
لەم مـیـحنەت و لەم ژین و نەمـانە چیـیـە مـەقسـوود
(فـــــریـاد أزیـن نـوع وجـــــود عـــــدم آلـود)[٧]

***

نووری بەســـــە، ببــــڕێتــــەوە ئەم چوون و چرایە
گـــەر هاتنە، گـــەر ڕۆیینە[٨]، گـــەر دەرد و بەڵایە
ببـڕێتـەوە لەم ئیـشـــە[٩] مـــەدوو، ئیـشـی خـودایە
گـەر زیللەتە، گـەر ڕفـعـەتە، گـەر سـەوقی قـەزایە[١٠]
هەرگـیـز مـەڵێ ناشـوکریە لای خـالیـقی مـەسـجـوود
(فـــــریـاد أزیـن نـوع وجـــــود عـــــدم آلـود)[١١]

---

(٤) هەر لەو دەستنووسەدا: (بەینێ مکەددەر) نووسرابوو.
(٥) هەر لەو دەستنووسەدا ئەم دێرە بەم شێوەیە بوو: (ئەسحابی زەکا، دەربەدەر و زار و موحەقەر).
(٦) هەر لەو دستنووسەدا: (گەه ڕۆیینی یاران و...) نووسرابوو.
(٧) ئەم سێ بەیتە لەگەڵ سێ بەیتەکەی سەرەوە هەر لەو دەستنووسەدا شوێنیان ئاڵوگۆڕ کراوە.
(٨) هەر لەو دەستنووسەدا: (گەه مردنە...) نووسرابوو.
(٩) هەر لەو دەستنووسەدا: (لەم کارە...) نووسرابوو
(١٠) ئەم دوو دێرە لەو دەستنووسەدا شوێنیان ئاڵوگۆڕ کراوە.
(١١) ئەم شیعرە، موسەدەسە لەسەر نیوە شیعرێکی (سوڵتان سەلیم). پاش لێکۆڵینەوە بۆم دەرکەوت، کە سێ سوڵتانی عوسمانلی بەم ناوەوە هەبووە، سوڵتان سەلیمی یەکەم، سوڵتان سەلیمی دووەم، سوڵتان سەلیمی سێیەم. سوڵتان سەلیمی یەکەم: نۆیەمین سوڵتانی عوسمانلییە. لە ساڵی (١٤٦٧)ی زایینی لە دایک بووەو لە ساڵی (١٥٢٠)ی زایینی کۆچی دوایی کردووە. لە ساڵی (١٥١٢) لەسەر تەختی شاهی دانیشتووە. سوڵتان سەلیمی یەکەم کوڕی بایەزید «یاووز سەلیم» بوو، سوڵتانێکی زۆردار و بەهێز و دەسەڵات بووە. زوڵم و زۆری گەیشتبووە پلەیەک هەموو وەزیرێکی لە پاش مانگێک لەناو دەبرد. لە ساڵی (١٥١٦) سوڵتانی مەمالیکی بەزاندو سووریە و میسری داگیر کرد. بایەخێکی زۆری بە زانست و ئەدەب دەدا. خۆشی شاعیرێکی بەهرەدار بووە. لە شیعرەکانیدا باس لە سوارچاکی و جەنگ و شەڕوشۆڕ و جوانی و دڵداری دەکا. زۆربەی شیعری =

## کوا شیعرەکانم

سەفەر کەوتە خەیالی هەمدەمی ئەیامی هیجرانم
بیناغەی سەربەسەر ڕووخا، هەموو ئامالی عیمرانم
لە ئوفقی ئاسمانی دیدە، گووم بوو میهری ڕووی بۆیە
سیەه بەختانە وەک شەو، تیرەگی ئەڕژێتە دامانم
لە گولزاری خەیالی ورد و خواشتا، دڵ وەکو بلبل
خەریکی بەستنی هێلانەیە بوو، بۆ گولی جوانم
لە پڕ گەردوونی بێ ڕەحم و وەفا، بێ سووچ و بێ تاوان
دەستێکی نایە بینی بلبلی زاری غەزەلخوانم
زوبانی شیعری گرتم، شێوەیی ئادابی شێواندم
فەساحەت کەوتە نالین و بەلاغەت کەوتە گریانم

---

=بەزمانی فارسییە، دیوانێکی گەورەی هەیە. بەعەرەبیش شیعری وتووە، هەندێ دەڵێن سولتان سەلیم بەتورکی شیعری نەوتووە، بەڵام ئەمە ڕاست نییە، ئێستاکە خەریکن دیوانی شیعری تورکی کۆدەکەنەوە. ئەوەی پێویستە بووترێ ئەوەیە کە شیعری بەزمانی تورکی (جەغەتایی) وتووە، واتە بەزمانی (ئۆزبەگی) ئێستا، کە (عەلی شێرنەوایی) (١٤٤١ - ١٥٠١ز) شاعیری کۆنی ئۆزبەگ شیعری پێ وتووە. نازناوی شیعری «سەلیمی» بووە.

# گریەی خوسران

بگری! ئەی شاعیری ناتەوان بگری
مـــرد لەڕۆحی منا هەمـــوو ئامـــاڵ
(بیـــخـــودانە کـــفن بدوش مـــلال)[1]
ئەگـــەڕێ ســـەرســـەری پەری خـــەیاڵ

***

بگری ! ئەی ڕۆحی غەمنیشان بگری
کـە بەکـوللی نەمـا لە شـیـعـری منا
زەڕڕەیە لەفـــزی ڕێـک و پڕ مـــەعنا
وەکـو ئەفـسـوردە ئاگـری سـەر سڕی(*)

***

بگری ! ئەی چیـهـرەی خـەزان بگری
گـــریەی دڵ بەکـــوڵ بکا هەیەجـــان
بتـەوێ گـریە کـەی بە وەقـفی خـەزان
گـــریەیەکی غـــەریب و بێ ســـامـــان

***

بـگری ئەی ناڵە و فـــوغـــان بگری
گـــریەیەکی وەها بەجـــۆش و خـــرۆش
کە نەمـێنێ نەعەقڵ و فەهم و نەهۆش
خـــەرقـــەیی مـــاتەمی و ناڵە بەدۆش

***

(١) واتە بێ ئیختیارانە کفن بەشانەوە.

(*) لە ڕۆژنامـەکـەدا، هەروەها لە چەند دەسـتنووسـێکی مـامـۆسـتـا (نەجـمـەددین مـەلا)دا نـووسـرابوو (ئەگـەڕێ سـەرمـا)، منیش گـومانم لەو تەعـبیـرە هەبوو کە ڕاست بێ، بۆیە ئەوەی سـەرەوەم بەڕاست زانی و شوێنی ئەوی گرتەوە.

بگری ! ئەی ئەبری بێ ئەمــان بگری
تۆی چاوانی من بکەی تەمـــسـیـل
گــریەی چاوی تۆ ئەکــەم بە دەلیـل
وەکو تۆ خوێنی دڵ ئەکەم بە سەبیل

***

بگری! ئەی شـیـعـری ناتەوان بگری
بگری! ئەی ڕۆحی غەمنیشـان بگری
بگری! ئەی چیـهـرەی خـەزان بگری
بگری! ئەی ناڵە و فـوغـــان بگری
بگری! ئەی ئەبری بێ ئەمـــان بگری

***

## هەڵکەنن خزمینە بۆم قەبرێ

هەڵـکەنن خـزمـینە بۆم قـەبرێ لە دووری شـارەوە
بمخـەنە ناوی بەکـوڵێ زەحـمـەت و زینهـارەوە
خۆشـە تاریکی قـەبر، بۆ ڕاحـەتی قـەلبی زەبوون
نامـەوێ ڕووناکی دنیـا، من[1] بەدەم ئازارەوە
دەس لەمل بەردێکی ئەلحەد کەم لەلای من چاترە
لەو دەسی پڕ زێڕە بینێـمـە دەسی ئەغـیـارەوە
من لەدایکی خـاکم و هەر باوەشی ئەو جـێگەمـە
خۆشە لایلایەی بەبێ دەنگی، بە ئیسـتـیغفارەوە
ڕێ کەوێ بۆت ژینی دنیا خۆشە بێ زووخاوی دڵ
ناخورێ هەنگوینی شیـرین قـەت بەزەهری مارەوە
خـۆشـە مـردن با نەبینم ئیـشی لار و نالەبار
باری خـۆم قـورسـە، نەناڵێنم بەدەس سـەربارەوە

(١) ئەگەر (من) نەبێ کە لە دەستنووسەکەی شاعیردا نییە، لاسەنگ دەبێ.

## هەمواره غەریبی کوچەیی شاری بێ[1]

هەمواره غەریبی کوچەیی شاری بی
ماتەم زەده، زوخاوی جگەر خواری بی
شەو تا بەسەحەر، بەدەردەوه ناڵەت بێ
چاتر لەوەیە کە یاری ئەغیاری بی

***

برسی و ڕەش و ڕووت، بەعاجزی و غەمگینی
ڕابوێری بەبێ نەوایی و بێ تینی
لەو دەشتە لەبەر هەتاوی سوور، گوڵ چنی
مەعقوولترە، نەک ڕووی ڕەقیبێ بینی

***

پشتت لە مەرارەتا، لە ژێر بارا بێ
ڕۆحت لە ڕەزالەتا، لە ئازارا بێ
جێی نووستن و ڕاحەتت لەناو نارا بێ
نەک پادشەهیت، لەگەڵ تی ئەغیارا بێ

***

ئاواره و زار و دەربەدەر، ڕیسوابی
بۆ قەترەیە ئاو، لەتینووا خنکاوی
بۆ لوقمەیە نانی جۆ و دۆ داماوی
زۆر خۆشە، نەڵێن لەبەر ڕەقیب هەستاوی

***

(١) حەزدەکەم خوێنەری بەڕێز لەوە ئاگادار بکەمەوە، کە لەسەرەتاوە ئەو شیعرە بەشی یەکەم و دووەم و سێیەمی لەپاڵ چەند چوارینێکی تردا لە دەستنووسی (گەلاڕێزان) لاپەڕە (١٥١-١٥٣) کەوتبووە ژێر ناوونیشانی (روباعیاتی نووری)، بەڵام لەدواییدا بەشی چوارەم و پێنجەمی بۆ ئەم سێ بەشە زیاد کردووەو دەستکاری سێ کۆپلەکەی تریشی کردووەو کردوونی بە شیعرێکی سەربەخۆی خاوەن پێوەندی و یەکێتی بابەت.

بەڕوو پووش و پەڵاش و زی[٢] بماڵی
بەشەو تا وەقتی سبحەینێ بناڵی
بنۆشی دەم بەدەم، زووخاو و تاڵی
نەوەک بێگانە بێ و ڕووکەیتە ماڵی

هەولێر ١٩٣٨/١٢/١٩

(٢) زی: دڕکەزی مەبەستە.

## مەلی ئامال

لە شاخساری ژیان هەڵفڕی مەلی ئامال
لە خۆیەوە نەفڕی، بەردی دەستی نافامێ
لە ئاشیانەیەکی گەرم و گوڕ لەسەر هێلکە
هەڵیفڕاند و تەرەی کرد و دایە شەقەی باڵ
فڕی، نیشتەوە، ڕووی کردە چۆڵ و هەردە و یاڵ
هەموو جیهانی لە لا بوو بە ڕاوکەری خوێن تاڵ
هێلانە واز و پەرێشان، زەبوون و بێ دەرەتان
کەژ و چیا ئەگەڕێ، ناتەوان و سەرگەردان
هێلانەکەی هەموو ڕووخا بەگەردەلوولی خەزان
مەجالی هێندە نەدا، هێلکەیەکی هەڵبێنێ
بەنووکی جوانی دەنووک، ئاوودانی بۆ بێنێ
بکەونە باڵەفڕێ و سەرچڵی لە خەم ڕەخسان
ئەوانە وا ئەبنە هۆی فڕینی ئامالی
یەکێکی بێ دەرەتان و زەبوون و بێدەسەڵات
جەزای ئەمانە حەواڵەی زەمیری ئێوە ئەکەم
کە حوکمی بۆ بدەن[1]، ئەی خوێندەوارانی بەرزی وڵات

١٩٥٨/١/٣١

(١) دەبێ (بدەن) بێ، چونکە خوێندەواران حاڵەتی «کۆ»یە نەک «تاک»، بۆیە (بدەی)م کرد بە(بدەن).

## هاوزوبانم، زوبانی لاڵی منه

هـاوزوبـانم، زوبـانـی لاڵـی مـنـه
بێ زوبـانیی، زوبانی حـاڵی منه
ئێستـه پیری شەڕابی کۆنی خەیاڵ
خۆشـەویسـتی شەوی ویساڵی منه
له فـەزای ئاسـمـانی ئەشـعـارا[١]
فـکری ورد، ڕۆژی بێ زەوالـی منه
بیـری ورد و مـەعـانیی تازه[٢]
له سەمـای شیـعرمـا، هیلالی منه[٣]
ڕوو به ڕووناکی تەفـەکـور[٤] ئەڕۆم
لەفـزی ئەشـعـاری من، زیلالی منه
با حـەرامیـشی تێـبگەن (نووری)
شـیـعـرەکـانم هەمـوو، حەڵاڵی منه

(١) له دەستنووسێکی تردا: (له سەمای جیهانی شیعرمدا) نووسرابوو. له دەستنووسێکی تر: (له سەمای جیهانی ئەشعارا) نووسرابوو.

(٢) لەو دەستنووسەدا: (فیکری تازه و مەعانیی ورده) نووسرابوو.

(٣) پێش ئەم بەیته لەو دەستنووسەی سەرەوەدا که بۆ (گیـوی موکریانی) ناردووه ئەم دوو بەیته نووسرابوو:

هەمـدەمی مـانگ، له ئەوجی مـەعنادا
سـورعـەتی بەرقی ئینتـیـقـالی منه
دەرەجـاتی کـەواکـبی مـەعنا
پڕ ڕەسـەدخـانەیی خـەیاڵی منه

(٤) له دەستنووسێکی تردا: (ڕوو بەڕووناکی تەجەدود ئەڕۆم) نووسرابوو.

## ئیلهامێک لە (حسێن دانش)ەوە[1] وەرگیراوە

لە کـاتێکا سـەفـینەی بیـروباوەڕ غـەرقی شـۆڕش بـوو
تەمی ئەفسـانەی بووتـخـانە، دونیـای عـەقـڵی پۆشـیبـوو
شەپۆلی تیـژی دەریای فـیـتنە، گـەرمـەی هێـز و جۆشی بوو
ژیـانی ئـادەمـــــیــــــزاد، تێـکـەڵاوی بیـم و لەرزش بـوو
گـــڕێکی ئاگــــری هەڵکرد و ناوی نا پـەرســـتـــشگاه
بڵێسەی بوو بە نوور و مەشخەڵی[2] ڕێی غـافڵ و گومـراه

***

لە پڕشنگی برووسکە مـەشـخـەڵی ئاتەشکەدەی وەرگـرت
بەجـــاریێ ئاگـــری بەردایە پووشی وشکی نافـــامی
شـــەوی جـــەهل و نەزانینی بە پرتەو کـــردە نوورانی
بت و بووتـخــــانە هاتە لەرزەو ڕووی کـــــردە وێرانـی
بەجـــاریێ دای بەدەم باوە، بینـاغـــەی پووچی بەدنـامی
گـــڕی بەر دایە ژینی بووتکەدە، یەک بارە ســــووتانی

***

مـــەهو خـــورشـــیـــد، ئەدا پڕشنگی ڕووناکی بەئایینت
بەسـەر ئافـاقی (مـادا) پرتەو ئەفـشـان، نووری ئیـمـانت
جـیـــهـانی سـەربەسـەر پڕ کـرد لە ئەنواری خـودا بینت
شـیـعـاری باوەڕی گـۆڕی، بەجـاریێ عـیلم و عـیـرفـانت

---

(١) حوسێن دانش: میرزا حوسێن خان، یەکێکە لە زانایانی ئێران کە لە تورکیا زیندەگانیی کردووە و تەمەنی بردووەتە سەر. نووسین و کتێبی بەزمانی تورکی هەیە. یەکێکە لە نووسەرە چاکەکان. مێژووی ژیانی کۆمەڵێک لە شاعیرانی فارسی نووسیوەتەوە لە (ڕوودەکی)یەوە تا (حافظ)، گۆڕینی چوارینەکانی خەیام لەگەڵ مێژووی ژیانی، یەکێکە لە کارە هەرە چاکەکانی. لە ساڵی ١٣٦٢ھ/١٩٤٣ز لە تەمەنی حەفتا ساڵی لە ئەنقەرە کۆچی دوایی کردووە.

(٢) لە دەستنووسەکەی شاعیردا (مەخشەڵی) نووسیبوو، دیارە هەڵەی کاتی نووسینە.

نەوا پەردازە بولبول، بۆ دەمی غونچەی گولستانت
درەخشانە وەکو ڕۆژ لاپەڕەی مێژوویی تابانت

***

بە سێ شت دانرا، بنچینەیی ئایین و تەعلیمت
بە (فکر) و(قەول) و (کردارە)[3]، هەموو ئەرکانی ئایینت
سەراپا بوو بەساحەی عەدل و داد، مەڵبەند و ئیقلیمت
هەموو ئاساری کۆنی فورس و ئێران، زادەیی دینت
سزاوارە لەسەر سەر دانرێ نووسراوی (ئاوێستا)کەت
کە ئەو بوو هۆی نەجات و موجیدی عومرانی دونیاکەت

ئابی ١٩٢٥

(٣) سێ بنچینەکەی ئاینی زەردەشتییە.

## شەو[1]

خـــۆت بپـــارێزە لە ئـاهی دڵ بریندارانـی شــــەو
نەک خــودا ناکــەردە گـیــرابێ، دوعــای ناڵانی شــەو
یاوەر و یار و ئەنیـــسم، ئاهو ئەشکی حــەســـرەتە
ئافـــەرین ئەی بارەکــەڵڵا، دیدەیی گـــریانی شــــەو
ئەشکی حەسرەت، لازمی جەمعی سیەه بەختانە هەر
شــەونمی ســوبحــە، دەلیلی قــەترەیی مــوژگـانی شــەو
هەرکـە ڕووی تۆی دی، ئیـرادەی بەیعەتی کرد ئافتـاب
تورەیی مــوشکینی تازەی کــردەوە ئیــمــانی شــەو
خــەت ئەگــەرچی هێــرشی هێناوەتە ســەر ڕوومــەتت
حــازرە ئەم ڕۆژە دەرچێ، بۆ شکســتی شــانی شــەو
دڵ ئەبێــتــە قــەترەیێ خــوێن و لە دیدەم ســەر ئەکـا
هەرکــە ڕابووریێ بەدڵما ســوحــبــەتی جـارانی شــەو
مـونتـەهای ئەم زوڵمـەتی هیـجرانە، ڕۆژی وەسڵ ئەبێ[2]
ئاخـری نووری شــەفــەق ئەڕژێ لە هەر دامــانی شــەو
(نووری) لەم پێچ و خــەمی زوڵفــە نەجـاتت ڕەحـمــەتە
لای سەختی تەبعان مەحاڵە، ڕوخسەتی میوانی شەو[3]

(١) مامۆستا ئەحمەد هەردی، لەلاپەڕە (٥٢)ی (ڕازی تەنیایی)یەکەی تەنیا پێنج دێڕی ئەم شیعرەی کردووە بەپێنج خشتەکی.

(٢) لە دەستنووسی تری شاعیر: (وەسڵتە) یاخود (ویسڵەتە)ش هەیە.

(٣) لەم شیعرەدا پشتم بەڕۆژنامەی (پێشکەوتن)ی ژمارە (٩٩) بەست، هەروەها دوو دەستنووسی تری شاعیر کە بریتی بوون لە پێنج بەیت، هەندێ لەو بەیتانە شوێنیان ئاڵوگۆڕ بووە، جگە لەوەی ئەم سەرچاوەیە سێ بەیتی لەوان زیاتر بوو. لە ڕووی جیاوازیشەوە، جیاوازی ئەوتۆیان لە نێواندا نەبوو پەنجەیان بۆ ڕابکێشرێ، جگە لە چەند شتێکی بچووک وەک: (خودا) بووە (خوا) یان (شەونم) بووە (شەبنم)، (ئەی) بووە بە (هەی)، (سیە) بووە بە(سیا). (ناکەردە) بووە بە (ناکردە).

## ژیانی ئادەمیزاد(١)

لەناو شەپۆلی خەما، سەرنگوون و بێ ئارام(*)
بەکێوی سەختی ژیانا، بەپێ و چنگەڕنێ
خەریکی هەڵمەتی سەرکەوتنە بگاتە مەرام
لەپڕ نشێوی کڵۆلیی، بواری لێ ئەتەنێ
بەداوی جەور و خەفەت، تاروپۆی لە ئێش و لە زام

***

زەبوون و ڕێ هەڵە بووی دەشتی چۆڵ و هۆڵی بەلا
شکستە باڵ و شپرزەی پەلاری دەستی قەدەر

(١) لە دەستنووسێکی تردا ئەم شیعرە ناوونیشانەکەی (ئادەمیزاد)ە.

* شێخ جەناب کوڕی گەورەی شاعیر بۆی گێڕامەوە: وەک لە بیرمە لە ساڵی ١٩٤٦ لە وەرزی پایز کاتێ ماڵمان لە (گەلاڵە) بوو، مامۆستا (گۆران) ئەو کاتە موحاسیبی ئیشغالی هەولێر بوو. لەگەڵ (عەزیزی ئەحمەد ئاغا) و کوڕێکی ئەندازیار هاتبوونە ئەو ناوە، مووچەی مانگانەی کرێکارەکانیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو، بۆ شەو هاتنە ماڵی ئێمە میوان بوون، ئەو کاتە باوکم مدیر ناحیە بوو [وادیارە مدیر ناحیەی باڵەک بووە و ماڵی لە گەلاڵە بووە لەبەر خوێندنی منالەکانی، هەر ئەو کاتەش بووە مامۆستا (گۆران) دوای ماوەیەک چووەتە ئێزگەکەی «یافا - ئازاد»]. کۆڕێکی ئەدەبییان ساز دا، منیش وەکو گوێگرێک کە لە تەمەنی (١٧-١٨) ساڵیدا بووم باسی شیعری تازەیان کرد و مامۆستا (گۆران) زۆر ستایشی ئەو هەنگاوەی باوکمی کرد کە بۆ تازە کردنەوەی شیعری کوردی نابووی، بگرە بەمامۆستای ئەو قوتابخانە تازەیەشی داناو وتی «کەس ناتوانێ ئینکاری ئەمە بکات و تۆ مامۆستای ئەو نەوە تازەیەیت» باوکیشم بەتەوازوعەوە وەڵامی دایەوە و کەوتە مەدح کردنی مامۆستا گۆران، مامۆستا (گۆران)یش پێی وت «شیعرەکانت ئیسپاتە بۆ هەردوو هۆیەکە». واتە بۆ سەرکردایەتی کردنی ئەم نەوەیەو دامەزراندنی ئەو قوتابخانە تازەیە لە ئەدەبی کوردیدا.
لەوەوە کەوتنە شیعر خوێندنەوە. مامۆستا گۆران چەند شیعرێکی تازەی بۆ باوکم خوێندەوە، باوکیشم شیعری (پەپوولە)و یەک، دوو شیعری تری بۆ مامۆستا- گۆران- خوێندەوە، لەدواییشدا مامۆستا (گۆران) ئەو شیعرانەی بەخەتی خۆی نووسییەوە و لە ئێزگەکەی- یافا- شیعرەکانی خوێندەوە. پاشان لەوێوە نامەیەکی بۆ باوکم ناردو داوای بەردەوامی و سەرکەوتنی لەو جۆرە شیعرانە بۆ کردبوو، هەروەها داوای بەرهەمی تازەی لێ کردبوو. ئەمیش شیعری - ژیانی ئادەمیزاد -ی بۆ نارد، دوای ئەوەی شیعرەکەی لە ئێزگەکە خوێنرایەوە، کەوتبووە دەست (ڕەفیق چالاک)و ئەویش ئاوازی بۆ دانابوو. بەداخەوە نازانم ئەو نامەیە چی لێ بەسەر هات؟.

نەدەست گـــیـــرێ لـەلاوە دەسی بداتە پەلی
نەهاودەمێ خـــەفـــەتی خـــۆی لەلا بدا بە هەوا
بەلایەکـــا نەیەوێ تێـــپـــەڕێ، نیـــیـــە ڕەهبـــەر

***

لەبەر دەمـــیـــشـــیـــەوە تاریکە سێبـــەرێکی وەها
هەتاکـــو چاو بڕ ئەکـــا، توند و تاڵ و بیم ئاوەر
ئەدا بەلایەوە، ئەخنێـــتـــەوە بەئیـــســـتـــیـــهـــزا
هەوڵ ئەدا کـــە بچێ بیگرێ، بەڵام ســـێـــبـــەر
چلۆن ئەگـــیـــرێ، بەهێـــزی شـەلێکی بێ ســـەر و پا

***

ئەمـــانە ئەم کـەژ و ئەم سێـبـەر و شـەپۆلە، یەکی
نموونـەیە لـە هیـــــوایە و لـە ڕێـگـەیـایە بەبار
کە چاوی پێ ئەکەوێ، بۆی ئەچێ بەئیـستـیـعـجال
بەڵام هیـلاکـیـیـە، یەعنی ژیانی نەوعێ بەشـەر
بەتەنگەوە نیـــیـــە، ڕاهاتووە لەگـەڵ ئیـــهـــمـــال
هەتاکـــو ئەو دەمـــە، ئەینێنە قـــەبری تیـــرەو تار[٢]

---

(٢) ئەم دەستنووسەی من پشتم پێ بەست، جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەوەی مامۆستا (ڕەفیق حیلمی) کە لە بەرگی دووەمی (شیـعرو ئەدەبیـاتی کوردی)دا بڵاوی کردووەتەوە، هەروەها جیـاوازیشی هەبوو لەگەڵ ئەو دەسـتنووسەی خۆی کە دەتوانم بڵێم ڕەشنووسی ئەم دەستنووسانەیە کە من پشـتم پێیان بەستووە.

سەرنج: ئەم شیـعرە کە بەیەکێک لە شیـعرە جوانەکانی شێخ نووری دادەنرێ، کاریگەری و سێبەری چووەتە سەر زۆر شیعری شاعیرانی دوای خۆی. بۆ نموونە تەعبیری وەک (دەشتی چۆڵ و هۆڵی بەڵا) و ئەو تەعبیرەی مامۆستا هەردی (ئەپێوم چۆڵی سەرسامی) و... تاد.

## کاروانی ژیان[1]

بەرەو شـاری ژیان، شـوێن کـاروانی خـەڵقی دێ کـەوتم
کـە ڕێ کـەوتم، ملی ڕێم گـرت و نازانە بەڕێ کـەوتم
بەرم دەشـتێ بوو، تا چاو بڕ ئەکـا دەریاچەیی قـووم بوو
کـــە پێم لێ دابنایە، دائەچوو قـــاچم هەتا ئەژنۆم
هەمـــوو دانانی هەنگاوێ، سـەعـــاتی پێ ئەخـــایاندم
لە تۆ وایە لە ڕۆیـیندام، بەڵام بســـــتێ لە ڕێ ناڕۆم
چ ڕێگایە، نەبوو شـوێن پێی شتێ، شـوێنی کەوم بۆ خـۆم
نە ئاسـارێ، نەشـوێن پێـیـە ئەبینم من لەسـەر ڕێمـا
نەدەنگی زەنگی کـاروانێ نەهات بیـدات بەلای گـوێمـا
بەهیچ پێـیـە لەسـەر ئەم ڕێیـە، نەخشـی پێ نەنووسـرابوو
هەمـــوو خـــاکی بەجـــارێ هەر قـــووم و لمێکی بێ ئاوە
نە خـشـپـەی مـار و مـێـرووله، نە ورشـەی باڵی باڵدارێ
نەگـیـزەی مـێش و مـێـشـووله، نەگـیـانداری، نەڕێبـوارێ
جـــریوەی چۆلەکـــەش نایە لە هیچ لایە، مـــەگـــەر بایە
کـە جار جـارە ئەهات ئەیدا لە پووشی وشک و دڕک و داڵ
لە جـێگەی خـۆی ئەجـوولان، ئەیخـزاندە ناو نەدیوی و چاڵ
لەگـــەڵ ئەم ئێش و ئازارە، لەگـــەڵ ئەم دەرد و زووخـــاوە
ئەوەندە خـــۆم کـــوتا بۆ پێـــشـــەوە تاکـــو لە پێ کـــەوتم
بەڵام هەر بەو ئومـــێـــدەی زوو بگەم بەو مـــەنزڵی ژینە
کـە ئەم کـاروانە بۆی کـەوتۆتە ڕێ ئیـمـڕۆ سبـەینێ زوو
بەبێ تینی ملی ڕێم گـــــرت و دەســـــتم دایە ڕۆیشـتن
هەمـوو گـیـانم بەجـارێ کـەوتە سـەر ئاو و عـەرەق ڕشتن

(١) تەنیا دەستنووسێکی ئەم شیعرەم لەبەر دەست بوو کە ئەویش پاکنووس نەکرابوو.

پەل و پۆم لێ بڕا، هێــزم نەمــا، توێخی بەری پێم چوو
هەتا لەم دەشــتــە چۆڵ و هۆڵ و بێ ئاوە، نەجــاتم بوو
تەمــاشــام کــرد لە دوور تارمــایی شــینایییــە دیارە
وتم ئەم جێــیــە هیچ مــومکین نییــە شــوێنێکی ئاودارە
بڕۆم چاکــە لەســەر ئەم ئاوە مــاندوێتی لەشم دەرکــەم
لە پاشــا ڕوو کــەمــە شــاری ژیان و چارەیی ســەرکــەم
گــەیشــتــمــە پێشــەوەو پێم نایە ناو ئەو ســەوزی و ئاوە
تومــەز بەحــرێکی بێ پایانی قــوڕ، گــۆمــێکی زەلکاوە
کــە پێم دانا هەتا ئەژنۆم بەلیــتــەو ناو قــوڕاوا چوو
کــە ویســتم پێم دەرێنم، تاکــو پشــتــێنەم بەناخــا چوو
ســەرم هێنا و ســەرم برد، لەم قــوڕە ڕزگــاری من نابێ
ئیــــرادەی خــــوا وەهایە، ڕۆژی ژینم لێــــرە ئاوابێ
تەمــاشــام کــرد ئەوا شــوانێ لەگــەڵ ڕانێ بەرەو ڕووم هات
دڵم خــۆش بوو، وتم خــودا ناردی، بۆ لام ڕابەری ئاوات[٢]
هەتا تیاما بوو هۆ... هۆم کرد و بانگم کردە مامەی شوان
سڵەمیوە و تەماشای دەوری خۆی کرد، واله و حەیران
لە پڕ هەســتی بەدەنگ و شــوێنەکــەم کــرد و بەدی کــردم
بەگــورجی گــەیییــە لام و پاش ســەلام، مــاندوو نەبی کــردم
وتی تۆ شــــارەزا نیت، بۆیە وا کــــەوتوویتــــە ئەم ناوە
ئەمــە ڕێگا نیــیــە، دەریایەکی لیــتــاو و زەلکاوە
ئەوی کــەوتۆتە ئەم شــوێنە، بەجــارێ واقی وڕمــاوە
ئەوی کــــەوتۆتە ناو ئەم بەحــــرە بێ پایانە خنکاوە
هەنام بۆ برد، وتم ئەی پیــری خــاوەن چاکــە تۆ بیــرێ
لە ئەحــواڵی منی بێ چارە کــە، دەرمــانێ، تەدبیــرێ

---

(٢) ئەم دێرە ئەگەر لە کاتی خوێندنەوەدا پێی لێ هەڵنەگیرێ، لەنگ دەبێ، یان وشەی (خودا) بە (خوا) بخوێنرێتەوە.

دەسم بگرەو لە ڕێی خـــوادا دەرم بێنە ئەوا ئەمـــرم
وتی: باشــە، بوەســتــە تا بەرایی ڕانەکــەم ئەگــرم
بەرایی ڕانەکــەی گــرت و وەکــو پیــاو، هاتەوە بۆ لام
بەهەنکە هەنک و ڕاکــردن. بەگــورجی کــەوتەوە فــریام
گــەیشــتــە لامــەوە، پشــتــێنەکــەی هەڵدایە بەردەســتم
لەپشــتی خــۆم گــرێم دا و قــایم کــرد و زەریف بەســتم
تەکانی دایە خۆی، پشتێنەکەی توند گرت و ڕایکێشام
تەقــــەللایەکی زۆری دا لەگـــەڵـمـــا تا دەری هێنام
سوپاسم کرد و ئەو ڕۆیی، منیش پاش ئەو لەسەر خۆم چووم
کە شەنگ و ناتەوان چاوم کە لێکناوە، تومەز نووستووم
کــە چاوم هەڵبــڕی ڕوانیم گــزنگی خــۆری پڕشنگدار
لەنووری خۆی ئەوا ئەینێتە سەر شاخ و چیا ئەفسەر
ســبــەینێ زوو لە ڕوو چۆن پەرچەمی خــۆی لائەدا دڵدار
لەڕووی گــەردوون دەسی خۆریش خەریکە لابەرێ شەوگار
تەمــاشــام کــرد لە ئوفــقی ئەم بیــابانە، تەمێ دیارە
کــە ڕوانیم تەم نیـــیـــە، شــاخ و نزارە، باغ و گــوڵزارە
بەبێ هێــــزی ملی ڕێم گــــرت و داوێنم بەلادا کـــــرد
بەرەو ڕووی ئەو نزارە، پێ و پلم[٣] هێــزێکی پەیدا کــرد
گــەیشــتــمــە دامــەنی ئەو شــاخــە بەرز و جوانە تێفکریم
لەســەر ئەو لووتکە بەرز و جــوانە، ئامــانجی هیــوا دیارە
گــوڵســتــانێکە کــانی و ئاوەکــانی، چەشــمــەیی کــەوســەر
هەتا چاو بڕ ئەکـــا هەر لالەزارە، هەر چەمـــــەنزارە
وتم: ئەم جـــێگــەیە بەم خــــۆشی و دڵگیریـــە یاران
ئەبێ ئەو شــارە بێ وا دوێنێ بۆی کــەوتۆتە ڕێ کــاروان

(٣) شاعیر لەو دەستنووسەیدا: (پێی و پلم)ی نووسیبوو.

بەڵێ بێ شک، ئەمە ئەو شوێنەیە کاروانەکەی بۆ هات
ئەمە ئەو شارەیە ناوی نراوە، شارەکەی ئاوات
بە ئومێدی ئەوەی ڕۆژێ بگەم بەو ژینە بێ ژانەی
بەبێ ئاژاوە هەندێ گەیوەتە ئەیوان و کاشانەی
دەسم دایە بەرەو ژووری چیا تا ناوەڕاستی چووم
نەگەیە سەرچیا هێزم نەما، نیتر لەپێ کەوتم
سەفەر بۆ شاری ژین گەرچی غەم و دەردە بەناچاری
هەموو کەس بۆی ئەچێ، ئەما، یەکێ ئەیگاتێ بێ ئازار
یەکێ وەک سێبەری خۆی وایە هەر ئەڕوات و نایگاتێ
هەتا ئەو ڕۆژە شوومە، دای ئەهێڵنە گۆڕی تیرەو تار[٤]

سلێمانی ١٩٥٨/١/٢٩

(٤) ئەم بەیتە دوا بەیتی شیعری (ئادەمیزاد)ـە و لێرەدا دووبارەی کردۆتەوە. ڕەنگە لە دەستنووسی تری ئەم شیعرە کە جارێ چنگ من نەکەوتووە، خۆی درکی پێ کردبێ. مافی ئەوەشمان نییە گلەیی لێ بکەین. چونکە وەک وتمان شیعرەکە ڕەشنووسە.

## له خەوما

ئیمشەو لە وەختی نیوەشەوا سەر لەسەر سەرین
ئەتلامەوە بەکردەوەیی ڕۆژگارەوە
ڕۆییم لەگەڵ بەریدی خەیاڵا حەزین حەزین
کەوتمە خەیاڵی کردەوەیی نالەبارەوە
هەردە و چیا و کۆسپ و کون و قوژبنی جیهان
سووڕامەوە بەدەوری هەموویا بەبێ وچان
گەیمە کەناری جۆگەلە ئاوێکی ساف و ڕوون
بەردێکی تەختی گەورەیی لێ[1] دانرابوو جوان
چووم ڕاکشام لەوێ بەئومێدی حەسانەوە
کەوتمە خەیاڵی پەرت و پەشێوی زەمانەوە
گوێم لێ بوو چۆن یەکێ کە بەدەم زامی سەختەوە
ئەتلێتەوە، ئەناڵێ بەئازاری خەستەوە
دەم پڕ شکاتی کردەوەیی چەرخی نالەبار
دڵ پڕ لە خوێنی داخ و خەمی زۆری ڕۆژگار
ناڵەی حەزینی کاری ئەکردە دڵ و جگەر
وەک نووکی تیری دەرد و بەلا تیژ و کاریگەر
چی بێ خودایە ناڵەیی کام ئافەریدە بێ
هاواری سەختی کام جگەرێکی بوریدە بێ؟
هەرچەندە چوومە پێشەوە هیچم نەدی بەچاو
دەنگێکە دێتە گوێم وەکو شتێکی پەت پساو
چۆن ڕائەکات و هەرچی ئەڵێ بێ شعوورییە
لووت هەڵ ئەکات و مەیلی لە چۆڵیی و لە دوورییە[2]

(١) لە نامیلکە چاپکراوەکەیدا (هۆنراوەی نووری شێخ ساڵح) ١٩٥٨، هەروەها لە دەستنووسێکی تردا: (تەختی گەورە لەوێ...) نووسرابوو.

(٢) لەنامیلکە چاپکراوەکەو دەستنووسی تری شاعیر: (لووت هەڵئەکا لە عالەم و مەیلی لەدوورییە) نووسرابوو.

زۆر ورد ئەبوومــــەوە، کــەچی هەر نەم ئەدی بەڕوو
هاوار و ناڵەکـــەی لە کـــوڕوزەی بەشـــەر ئەچوو
ڕووم کردە عاستی دەنگی بەبێ ڕەنگ و بێ نیشان
چیم زانی بۆ نەوازشی هێنامـــــە ســـەر زوبان
پێم وت ئەگـــــەرچی دیمەنی تۆ نادیارە لێم
مەردی خودا بە، ناوونیشانت بفەرموو پێم
زۆر ئارەزوو ئەکـــەم، کـــە بزانم لە حـاڵی تۆ
ئەم جێیە چۆن بووە بە هەوارگە و مەحاڵی تۆ
تۆ کێیت و چی ئەزانی لە ئەسراری کائینات
ڕەنگێ کە خۆی نەبینرێ، ئەبێ دەنگی چۆن بگات
هاتە وەڵام و[3] دەنگی هەنسک و هەناسەکەی
دیاربوو پڕە لە جەور و جەفا دەنگ و باسەکەی
فەرمووی کە من یەکێکی نەبینراو بەچاوی تۆم
بەینێکە من پەرۆشی دەمی داخـــــراوی تۆم
وا دیارە حەز لە بیستنی فەریادی من ئەکەی
بەم هۆیەوە ئەگەر نەبێ، چۆن یادی من ئەکەی
گوێ ڕاگری ئەگەر لە نەوای کارەساتی من
سەرسام ئەبی لە بیستنی هەوڵ و خەباتی من
پێش ئەم دەمە منیش وەکو ئێوە بەرەو هیوا
ئەفڕیم بە باڵ کە زوو بگەمە[4] جاهو کیبریا
ئەمما فڕینی من لە جیهانا بەڕاستی
بۆ ئەو مەرامە بوو بگەمە ئەوجی ئاشتی
هەوڵم ئەدا کە بەرز بمەوە نەک بە بەندەگی
ئازاد و[5] دڵنیا نەبی، بێ نرخە زیندەگی

(٣) لە نامیلکەکە و دەستنووسێکی تری شاعیر: (هاتە جەواب و ...) نووسرابوو.
(٤) لە نامیلکەکە و ئەم دەستنووسەی شاعیردا: (ئەفڕیم کە زوو بەزوو...) نووسرابوو.
(٥) لە نامیلکەکە و ئەم دەستنووسەی شاعیردا (سەربەست و...) نووسرابوو.

پاڵ کەوتبووم لە جێگەما غەمزەدە و حەزین
سەرسامی کردەوەی چەپی چەپگەردی سوفلە بین
بیرم ئەکردەوە کە بەملیۆنەها بەشەر
بۆچی ببێتە ملکەچی پیاوێکی بێ هونەر؟[٦]
بۆ خێر و بێری ئەم وەتەنە، بەم وڵاتەدا
دابەش نەبێ و شەعب بکەوێتە ڕوفاهەوە؟
چاک و خراپی ئەم وەتەنە پاکە توخودا
بەسرابێ بۆ بە خواهشی عەبدولئیلاهەوە؟
نیش نادرێ بەشیرکەتێ یاخود موقاویلێ
(حیسەی ئەسەد) بەشی نەڕەشێری تیا نەبێ[٧]
هیچ مەعمەلێ نییە لە عیراقا بەڕاستی
ئیشی بەڕێوەچێ، کە بەشی ئەو لەوا نەبێ
تەییارە هەر بەڕێوەیە بیباتە ئەورووپا
یا بێتەوە لە گەردوشی شارانی ئەمریکا
تەییارە بۆ سیاحەتی دوور و سەفاهەتە
سەییارە بۆ گەڕانی شەوانی دەنائەتە[٨]
بۆ چاوی عالەمێ بەتەم و تانە کوێر بووە:
نابینێ زوڵمی زۆر و فەسادی لە حەد بەدەر
بۆ گوێی شەعب بەجارێ کپ و کەڕە لە عاستی زۆر؟
نابیسێ شینی دایکی خەفەتباری قوڕ بەسەر
لاوانەوەی حەزینی لەبۆ مەرگی ڕۆڵەکەی
بۆ ڕۆڵە خێر و خۆشی نەدیوە کوڵۆڵەکەی؟

(٦) لە نامیلکەکەدا: (بۆ بۆتە عەبد و ملکەچی شەخسێکی بێ هونەر؟) نووسرابوو.
(٧) لە نامیلکەکە و دەستنووسێکی شاعیردا: (حیسەی ئەسەد) ئەگەر بەشی شێری تێدا نەبێ، نووسرابوو.
(٨) لە نامیلکەکە و دەستنووسێکی شاعیردا: (... شەوان و دەنائەتە) نووسرابوو.

بۆ ئەم چەکە کەوا بەدەسی جەیشەوە هەمووی
گاڵوکی شوانە؟ یا سوپەری هێرشی عەدوو؟
شوانن ئەمانە یاخۆ بەناو تیپی ئەفسەرن؟
ڕانن ئەمانە یا هەموو سەرباز و عەسکەرن؟
بۆچی عەدوو لە (نووری سەعید)و لە کۆمەڵی
زیاتر گومان ئەکەن[9] کە ببێ لەم جیهانەدا؟!
باوەڕ ئەکەی کە خوێنمژ و بێ باک و ئابڕووی
وەک ئەو ببێ لەڕووی زەمین و زەمانەدا؟
هەروا لەبیرمە بە (سەلاح سالمی) کە وت
ئیسرائیلێکی تر هەیە لای ئێمە (کوردەکان)
ئێران و تورک و ئێمە ئەبێ یەک گرین بە حیلف
هەوڵێکی وا بدەین کە نەمێنێ شیعاریان
ئێران و تورک و ئێمە وەک یەک بەمانەوە
گیرۆدە بووین ئەگەر نەکرێ زوو عیلاجیان
خوێناوی کوردەکانی حەلاڵ کرد بەتورکەکان
ئەو تورکەی[10] خوێنی کوردی شیمالی هەموو ڕژان
ئەم حیلفەیان بەغەیری ئەمە، هیچی تر نەبوو
بڕوانە ماددەکانی ئەم کە باش بۆت ئەکا عەیان[11]
هیچ کەس بەلامەوە نەبوو غەیری خەیاڵەکەم
خۆم و خەیاڵی کوێرەوەری ژینە تاڵەکەم
من وام ئەزانی هەر کە زوبان گیرولاڵ ئەکەن
نەمزانی دەرکی ڕازی دەروون و خەیاڵ ئەکەن

(٩) لە نامیلکەکە و دەستنووسەکەدا: (زیاتر گومان ئەکەی...) نووسرابوو.
(١٠) لە نامیلکەکەدا: (ئەو تورکە...) نووسرابوو.
(١١) لە نامیلکەکە و دەستنووسێکی تری شاعیردا: (بڕوانە ماددەکانی کە خۆی بۆت ئەکا عەیان) نووسرابوو.

ئەتلامــــەوە بە ئێـــشـــەوە بۆ خـــۆم بە پاڵەوە[12]
گـــینگڵـــەم ئەدا بەوێنەی مـــار بەم خـــەیاڵەوە
دیارە یەکێ کـــە باوەڕ و بیـــــری ئەمــــانە بێ
جـــاســـووس ئەبێ لەدووی شـــەو و ڕۆژی لەلا ئەبێ
دیم کـۆمـەڵێ لە شـورتە، عـیـبـارەت لە سی نەفـەر
دەوریان وەها تەنیـوە، کـە مـێـشێ نەکـا گـوزەر
بێ گـفـتـوگـۆ بەبێ ئەوە من تێ بگەم چییــە
لێـو هەڵبـڕم بڵـێـم لە منا هیچ خـەتا نیـیـە
گـیـرام و دەست و پێم لە کـەلەپچـە و کـەمـەند درا
هێنامـیـانە مـەحکەمـەی، بۆ حـاکـمی جـەزا
هاوێشتـمـیـانە ناو قـەفـەسی ئیـتـیـهـامـەوە
وەسـتـانمیـان بە ملکەچی و ئیـحـتـیـرامـەوە
پێـوست نەبوو بەگـرتنی ئەوراقی ئیـدیعـام
وەرگـرتنی ئیـفـادە و تەوجـیـهی ئیـتـیـهـام
ئیـزبارەکـەم هەمـوو پەڕە شـانسی دڕاومـە
ئەوراقی ئیـتـیـهـامـەکـەشم خـۆم و ناوومـە
شـاهیـد لەمن تەڵەب نەکـرا بۆ دیفـاعی نەفس
زانیم ئیـشـەکـەم خـەتەرە، حـوکم ئەدا بەحـەپس
ئەو شـاهیـدەی ئەیانەوێ مـەوجـوودە لای ئەوان
پێـوست نیـیـە بە هاتن و زەبتی ئیـفـادەیان
شـاهیـد ئەمـانی شـەعـشـەعـەیی دڵفـریبـمـە
سـەودایی شـاعـیـرانە، ئەدای غـەریبـمـە
شـاهد زەوالی دەبدەبەیی پایە مـاڵـمـە
شـاهیـد لە دەس زەمـانە، پەشـێـوی خـەیاڵـمـە
شـاهیـد نیـیـە شـتـێکی لە من دیبێ گـەر ببێ
نووکی قـەڵەم، بە بەردی حـەوادیس شکاومـە

(۱۲) لە نامیلکەکە و دەستنووسێکی تردا: (... لە پاڵەوە) نووسرابوو.

ئەم وەزع و حـــالە[13]، شـــورتە بەتاوانی دابنێ
لازم نیـــیـــە بەهاتنی کـــەس شـــایەتی بدا
بەڵگەش لەمــــــانە زیاتر و چاتر ئەبێ چ بێ
ڕاپۆرتی شـــورتە کـافــیـــە بۆ مـەحکەمـەی جـەزا
حـوکـمم درا، لە ژووری حـەپسـخـانە توند کـرام
حـــوکــمـــێکی وا گـــران لەبەنی ئادەمی خـــرام
ژوورێـکی تـەنـگ و تـیــــرە و تـاریـک و نـالـەبـار
تاریکتـرە[14] لە نیـوەشـەوی گـیـارەشی بەهار
ژوورێکە ســواغ بەبۆیەیی قـــەترانی ڕەش کـــراو
کـوون بڕ کـراو و بێ کـوون و بێ پەنجـەرە و هەتاو
فـەرقی نەبوو[15] بەلامـەوە، ڕۆژی لەگـەڵ شـەودا
ئـیـللا بەکـــاتی هاتـنی بێـــداری و خـــەوا
وەک نان و ئاو، عـەزاب و شکەنجەش (علی الدوام)
دووجـار بەڕۆژ و جـارێ هەبوو شـەو بە ئینتـیـزام
ویسـتم کـە ئیسـتنافی بکەم حـوکـمـەکـەم، بەلام
بیـرم کـــە کـــردەوە خـــەتەرە، پووچە ئیـدیعـــام
چونکی لەپێش قـــەزیـــەی مندا عـــەدالەتیش
حـوکـمـێکی وا درابوو، کـە ناوی لە ڕووی زەمین
بکوژێتـــــەوە وجــــوودی نەبینرێ بەزەرەبین
ناوی نەمـــێنێ[16] دوژمنە بۆ زوڵم و خـوێنمـژین
بڕیار درا لە خـــاکی عـــیـــراق دەربەدەر کـــرێ
ببـرێتـــە چۆڵ و هۆڵێ، لەوێ دەسـبـەسـەر کـرێ

(١٣) لە نامیلکەکە و دەستنووسێکی تردا: (ئەم حاڵەتانە...) نووسراوە.
(١٤) لە دەستنووسێکی تردا: (تاریکتر...) نووسرابوو.
(١٥) لە نامیلکەکە و دەستنووسێکی شاعیردا: (فەرقی نییە...) نووسراوە.
(١٦) لە نامیلکەکە و دەستنووسێکی شاعیردا: (بازوو لەناوچێ...) نووسرابوو.

ئەو حەق پەرستە دەربەدەرە، ئەو عەدالەتە
حوكمی بەجەبری، ئێستە لە خاریج ئیقامەتە
شاهیدی زوور كراوە بەمەئمووری سجنی ئەو
وەردیانەكانی زۆری دزە، جەردەیە بەشەو
كۆتە لەپێ، كەلەبچە لە دەست، مات و قوڕ بەسەر
تێ هەڵدراو و بێ دەرەتان، حەپس و شار بەدەر
ویجدان و ڕاستیش بەدڵی داغدارەوە
زوو دەرپەڕین و كەوتنە وادی فیرارەوە
زانیم كە ئیش وەهایە بەبێ بوڵە، بێ خوتە
تەسلیمی دەستی دەرد و بەڵا بووم بەبێ وتە
بێ ئیستیناف و ناردنی دەعواكە بۆ تەمیز
كێشام عەزابی لەش بەسزا یەك بەیەك بەڕیز
تا هات ئەچوو بەناخی زەمینا تەفەكورات
تا هات ئەچوو بەچاڵی نەمانا تەخەیولات
عەقڵم خەریكە ماهیەتی خۆی نیهان ئەكا
حیسم خەریكە، ڕوو لە نشێوی نەمان ئەكا
بەم حاڵەوە لە كەشمەكەشا مامەوە بەساڵ
تا ما لەگەڵ هەناسەكەما نووزەیە بەحاڵ
ئەمزانی تیری تیژی نزای وەك منی كوڵۆڵ
ئەیدا لە ناوەڕاستی هەدەف زوو بەگورج و گۆڵ
ڕووم كردە ئاسمان بەدڵێكی حەزینەوە
پاڕامەوە بەئێشی دڵی پڕ برینەوە
دڵ پڕ لە خوێن و ناڵە لەسەر دەم، زەبوون و زار
لالامەوە لە بارەگەهی بەرزی كردگار
پاڕامەوە وتم: بەسە ئەی خالقی بەشەر
ئیتر بەسە ژیانی وەها پڕ لە دەردی سەر

پاش ئەم دوعایە، کەوتمە حالاتی ئیحتیزار
ڕۆحم فڕی گەیشتە فەزای ئافەریدەکار
ناوم کوژایەوە لە جیهانی دەنائەتا
ڕۆحێکی سابتم[17]، لە فەزای بێ نیهایەتا
دوورم لە شۆڕش و شەڕی دونیای پڕ بەشەر
بێ دەخل و بێ عەلاقە، لەگەڵ خاکی پڕ لە شەڕ
ڕۆحێکم ئێستە خاوەنی حیس و تەفەکورات
دیارە شعوورمە بووەتە هۆی موخاتەبات
ڕۆحێکی سابتم، لە فەزایەکی بێ کەنار
هۆشیار و هۆشمەند و بەبێ لەیل و بێ نەهار
بێدەنگییە شیعاری هەموو ڕۆحی باشعوور
لەم کارەساتی کەونە، لە نێزیک بێ یا لە دوور[18]
ئەم نالەیی حەزینە، کە ئێستا ئەگاتە تۆ
داخی جیهانە وا منی هێنایە گفتوگۆ
لەم کەونەدا یەکێ نییە[19] بۆ نیشتیمانی خۆی
ڕاستێکی بێ درۆ بێ لەگەڵ هاوزوبانی خۆی
حیرسێکی مەنفەعەت لە جیهانا کە جارییە
بۆ دارزینی جیسمی بەشەر دەردی کارییە
لێدان و هەتکی عەرز و شەرەف، کوشتن و بڕین
پاداشێ دانراوە[20]، بەتەرفیع و ئافەرین
زیرەی ژنانی سک پڕی پێ کۆتە، لێدراو
وەختی فەلاقە ناو دڵی بەردی ئەکرد بەئاو

---

(١٧) لە نامیلکەکە و لە دەستنووسێکی تری شاعیر: (ڕۆحێکم وام لە فەزای...) نووسرابوو.
(١٨) لە نامیلکەکە و لە دەستنووسێکی تری شاعیردا: (لە نیزیک و یا لە دوور) نووسرابوو.
(١٩) لە نامیکەکە و لە دەستنووسێکی تری شاعیردا: (... نییە یەکێ) نووسرابوو.
(٢٠) لە نامیلکەکە و لە دەستنووسێکی تری شاعیردا (پاداشێ دانراو، بەتەرفیع...) نووسرابوو.

ئەركـان و كـاربەدەسـتى حكوومـەت، هەمـوو چەتەن
مـــەشـــغـــولى گـــرتنى كـــەلەپوورى ولاتەكـــەن[21]
زاهـيـــــــــــــر وەزيـره، ڕێـگـره ئـەمما لـه ژێـرەوه
هاوبەش لەگـەڵ دز و چەتە، هاوڕێ لەگـەڵ قـەتار
هەر هەوڵ ئەدا ڕەسـيـدى حيـسـابى لە مـەسرەفـا
ئەوەڵ پلەى كـــه زوو بگەيەنێ بە ســـەد هەزار
ئەمـــــجـــــا لەبەر ئەوەى يەكێ دەم نەكـــاتەوە
ئەسـرارى ئەم مـونامـەرەيە[22]، دەنگ نەداتەوە
قـانوون دروست كـرا، كـه شـيـووعـى لە عـالەمـا
ناويشى نابێ، تێـــپـــەڕێ بەســـەر دەمـــا
ئەنسـارى ناشـتى ئەوى داواى ســـەلام ئەكـــا
كـوشتن حـەلاڵ و زيندەگى بۆ خـۆى حـەرام ئەكـا
شـورتە بڵێ شـيـووعـيـيـە، كـوشتن جـەزايەتى
يا حـەپسـيـيـه هەتاوەكـو ڕۆژى نيـهـايەتى
لـەم زوڵـم و زۆر و جـــــەورە، ئەوى دەم بـكـاتـەوە
ئاگـر ئەنێ بەخـــەرمـــەنى پووشى[23] حـەياتەوە
واى بۆ ئەوانە دەركى شـــتى نالـەبار ئەكــــەن
يا حـەز لە ئاشـتى و لە ڕوفـاهى هەژار ئەكـەن
يا حــــەپســـه پێ كـــۆتەدراو و زەبوون و زار
يا نەفـيـيـه بۆ ولاتێ كـه دوور بن لە خـوێندەوار
زانا و خـەريجى جـامـيـعـه، دڵ لەت لەت و حـەزين
زۆريان بەداخـــەوە، لە حـــەپســـخـــانەدا ڕزين

---

٢١) له ناميلكەدا: (ولاتەكەمان)ى نووسيوه كه هەڵەيه.
٢٢) له نامـيلكەكـه و له دەسـتنووسـێكى ترى شـاعـيـردا: (ئەسـرارى هيچ مـونامـەرەيە دەنگ...) نووسرابوو.
٢٣) له ناميلكەكه و له دەستنووسێكى ترى شاعيردا: (خەرمەنى وشكى حەياتەوە) نووسرابوو.

خۆ باسی حیلفی نەگبەتی بەغدا بکا یەکێ
پشکۆیی سووری ئاگرە ئەینێتە سەر زوبان
هەر دەسبەجێ کراوە بە ئەنساری ئاشتی
حوکمی دراوە، جادە ئەماڵێ بە پێی پەتی
وای بۆ ئەوەی موخالیفی ئەم ئیتیحادەیە
یا دوژمنی ئیدارەی ئەو بەدنیهادەیە[٢٤]
تاکو شەهادە بەرز بێ بە تینە شکەنجەکەی
دەرهاتنە لە بن، هەموو نینۆکی پەنجەکەی
ئەخرایە کیسی ڕەمل و گلۆریان ئەکردەوە
ڕۆژی دە جار، ئەهاتەوە هۆش و ئەمردەوە
بەم کارەساتە هەر دڵی خاوێنە پیس ئەبێ
هەر نەوشکۆفەیی گوڵی ئاماڵە سیس ئەبێ
مەئمووری گەورە، ئیشی بەشەو هەر سەفاهەتە
ڕۆژیش خەریکی خواردنەوەی خویناوی میللەتە[٢٥]
مەسروور ئەبێ بەکوشتنی جینسی بەنی بەشەر[٢٦]
بۆ خۆی مەنافیعی ببێ، با بۆ جیهان زەرەر[٢٧]
ماڵی هەتیو و بێوەژن و بێکەس و هەژار
هەروەک گەزۆ حەڵاڵە، لە لای پیاوی زۆردار
خوێنی برا ڕژاندنی سەهلە لە لای برا
بەو شەرتە تیا ببێ بەشی باخەڵ بەئاشکرا

(٢٤) لە نامیلەکەکە و لە دەستنووسەکەدا ئەم بەیتە خراوەتە پێش دوو بەیتی ئەم دەستنووسەی من پشتم پێ بەست.
(٢٥) لە نامیلکەکە و دەستنووسەکەدا: (ڕۆژیش خەریکی خواردنەوەیی خوێنی میللەتە) نووسرابوو.
(٢٦) لە نامیکەکەدا: (نەوعێ بەنی بەشەر) نووسرابوو.
(٢٧) لە نامیلکەکە و لە دەستنووسێکی تردا: (بۆ خۆی مەنافیعی ئەوێ، بۆ عالەمێ زەرەر) نووسرابوو.

مـــێــــزەر بەســــەر، وەزیفـــەیی باشی درایە دەس[٢٨]
جاسووسی پیاوی گەورە بێ، دەخلی نەبێ لە کەس
چونکێ نیـــیـــە بڵـێ کـــە لە ئیـــشی ئەوان ئەچێ
بۆ وەعـــــز و بۆ مـــــوبارەکی، بۆ دیوەخــــان ئەچێ[٢٩]
چۆن لای دڕندەکـانی کـەژوکـێـوی ڕووی جـیـهـان
کـوشـتنی زەعـیف حـەڵاڵە، بەقـانوونی کـێـوییـان
لای کـۆمـەڵی حکوومـەتە خـوێنخـوارەکـەی عـیـراق
خــوێن ڕشتن و مــژینی، حــەڵاڵە بە ئیـتـیـفـاق
تۆ بیگرە لە شــێخ و لە ئاغــا، لە جــوان و پیــر
سۆفی و مەلا لە مەدرەسە[٣٠]، فەڕڕاش هەتا وەزیر
ئیـــشـــیـــان بەجـــارێ کـــردەوەیی نالەبارییـــە
هاوڕێ بخـاتە[٣١] چاڵەوە، لای بەخـــتـیـــارییـــە
لافـــاوی خـــوێن و ئاگـــرە، بەربۆتە ســـەر زەمین
ناکـــوژێتـــەوە مـــەگـــەر بەخـــوداوەندی عـــالەمین
مـومکین نیـیـە کـە بێـتـەوە سـەر ڕێ بەشـەر مـەگـەر
ســــەرلەنوێ دارژێـتـــــەوە بنچـــــینـەیی بەشـــــەر

***

بەم ترســـەوە کـە وەخـــتێ خـــەبەر بوومـــەوە لە خـــەو
نزیک بوو ڕۆژ ببــێـــتـــەوە، زۆری نەمـــابوو شـــەو
چاوم گـــلـــۆفت و کـــەوتمە بیـــر و خـــەیاڵەوە
هەرچیم کـــە دیبـــوو هاتەوە بیـــرم بە پاڵەوە
ڕوانیم کـــە ئاســـمـــان بەری وا ڕوون ئەبێـــتـــەوە
ڕەنگی ڕەشی، لەدامـــەنی گـــەردوون ئەچێـــتـــەوە

(٢٨) لە نامیلکەکە و لە دەستنووسێکی تردا: (مێزەر بەسەر هەندێک وەزیفەی باشی درایە دەس) نووسرابوو.
(٢٩) لە نامیلکەکە و لە دەستنووسێکی تردا: (بۆ وەعز و موبارەکییە، دیوەخان ئەچێ) نووسرابوو.
(٣٠) لە نامیلکەکە و لە دەستنووسێکی شاعیردا: (سوفە و مەلا لە مەدرەسە...) نووسرابوو.
(٣١) لە نامیلکەکە و لە دەستنووسێکی تری شاعیردا: (هاوڕێ بنێتە...) نووسرابوو.

رووم کــرده بارەگــاهی[٣٢] خــوداوەندی(ذو الجـلال)
پـاڕامــــــــەوە وتم: بـەســـــــە ئـەی زاتـی لایـەزاڵ
مــــردین هەمــوو لە ژووری حــــەپســــخــــانەدا ڕزین
بۆ ئەم فــەســاد و زوڵــمــە، هەتا کــەی نیــیــە زەواڵ[٣٣]

***

دیســـــــان لە غـــــەیبــــەوە یەکێ لێم هاتە زوبان
فەرمووی ئەوی کە دیت لەخەوا، ڕاستـە بێ گـومان[٣٤]
چونکی خەوێکی خێرە[٣٥] لە بۆ خاکی نیشتیمان
تەفـسـیـری ئەم خـەوەت، ئەمـەیە بۆت ئەکـەم بەیان
شـــەو چەند درێژ بێ، ئـاخـــری هەر ڕۆژ ئەبێــتـــەوە
کــاســە کــە پڕ بێ زۆر، ئەلەقێ و قــڵـپ ئەبێــتــەوە
قــــەولی خـــودایە: (إن مع العـــســـــر یســـــرا)
دوای زوڵم و زۆر و زەحــمــەتە، ڕەحــمــەت ئەدا خــودا
هێـشــتــا خـەوت ئەدی، خـەوەکـەی تۆ کـە هاتە دی
گـــوێ بگرە تۆپ کــە جـــەرگی ڕەحـــابی چلۆن دڕی[٣٦]

١٩٥٨/٨/٨

(٣٢) لە نامیلکەکەدا: (... بارەگای...) نووسرابوو.
(٣٣) لە نامیلکەکەدا: (هەتاکەی نەبێ زەوال) نووسرابوو.
(٣٤) لە نامیلکەکە و لە دەستنووسەکەی شاعیردا: (فەرمووی ئەوی کە دیت لە خەودا ڕاستە بێگومان) نووسرابوو.
(٣٥) لە نامیلکەکە و لە دەستنووسەکەی شاعیردا: (فەرمووی خەوێکی خێرە...) نووسرابوو.
(٣٦) بۆ نووسینەوەی ئەم شیعرە چوار دەستنووسی شاعیرم لابوو، من پشتم بەدوا دەستنووس بەست و ئەوانی ترم لە پەراوێزدا بەراورد کردووە.

## بۆ مێژوو

(کارەساتی کاربەدەستان کە بەسەر سولەیمانیا هاتووە و ناردنی (عومەر عەلی) و ڕاسپاردنی بۆ ئەو موعامەلانەی کە بەتایبەتی ئەیکرد و لە ژێر پەردەی عەدالەتا دونیای ڕووتانەوە) شێخ نووری شێخ سالح

کـــڵـــۆڵی جـــێگایە بگرێ
مـێروولەی باڵ ئەگـرێ، ئەفـڕێ
شـــێـــری ئەبێ بە مـــام ڕێوی
توولە ئەوەڕێ بە خـــێـــوی
پەســـمـــایە بەرز ئەکـــاتەوە
دوێنێی خـــۆی بیـــر ئەباتەوە
فـــــرۆمـــــایەی بۆش و بەتاڵ
تازە پیـــاکـــەوتووی کـــرچوکـــاڵ
ئەکـــەوێتـــە بیـــر و خـــەیاڵ
چۆن بگاتە ئەوجی کـــەمـــاڵ
ســـەری برد و ســـەری هێنا
دەســـتـــوورێکی بۆ خـــۆی دانا
ئەم دەســـتـــوورە بگرێتـــە بەر
ئەگـــاتە قـــۆناغی زەفـــەر
لەم وڵاتە لە خـــــۆی زیاتر
گـــــەلێ هەیە لەو زاناتر
بەجـــــێگە و ناو، بەدارایی
بەخـــــوێندەواری و ئازایی
گـــەلێ هەیە خـــوێندەوارتر
زۆر هـــەیـــە بـــەرز و زانـــاتـــر
لەو گـــــەورەتر بەهەزاران
هەیە لە ناوچەی کـــوردوســـتـــان

کەوابوو گەورە و خوێندەوار
لە لادێدا یا لەناو شار
زانا و گەورەی هەرچی تیابێ
بەگ بێ، شێخ بێ، یا ئاغابێ
واچاکە ڕەگیان دەرهێنین
ناو و ناوبانگیان بشکێنین
تۆوی ئەمانەم کە بڕی
ئەوسا ئاواتم دێتە دی

***

جوان بۆی چووە، هەتا ناودار
ناویان بمێنێ لەسەر زار
ئەو بەم ئاواتە قەت ناگا
بەم دەسەڵاتە قەت ناگا
لە شەترەنجا، هەتا پیادە
ئەبێ بە سوار (شا) مات نابێ
هەتا زووە خۆی ئامادە
بکا زۆر چاک موهەیا بێ
پێویستە کارێ بنوێنێ
پیلانی وا دامەزرێنێ
سەری سەردار، بنەوێنێ
ناویان لەناوا نەمێنێ
ناودار ئەگەر هەموو نەمرێ
خۆی چۆن جێگای ئەوان ئەگرێ
خۆی ئەناسێ کە بێ هەستە
فرومایە و نەوی و پەستە
بەم جۆرەیە بەئاسانی
ببێتە شای سولەیمانی

***

پیلان بەم ڕەنگە ڕێکخرا
(دستور العمل) دامەزرا
کە خوێندەوار و ناوداران
نیشتمانپەروەر و لاوان
هەرکەسێ خۆی بەپیاو زانی
بۆ نەمانی، بۆ فەوتانی
هەوڵ بدا، تا ئەتوانی
هەندێ بکرێن تیرە باران
هەندێ بخرێنە ناو زیندان
بە لێدان و بە تێهەڵدان
بەنینۆکی دەس دەرکێشان
هێندەی بەردەن، بیگرنەوە
ناوی خۆی لەبیر بەرنەوە
ئەمە شێخە، یا مەلایە
ئەمە بەگە، یا ئاغایە
گوێ مەدەرە، ناوونیشان
بیدەنە بەر شەق و لێدان
بۆ پەنگ بڕۆیان بتاشن
خۆیان بە خۆیان بناسن

***

ئەوی پیاو بێت و ناسراو بێ
ئەوی خاوەن نان و ئاو بێ
هەریەک بەجۆرێ بەهانە
بیانخەنە، بەندیخانە
زەبر و زەنگی خۆت بنوێنە
لێدە، بگرە، بخنکێنە

تەڕ و وشک، بسووتێنە
سستی لە ئیشا مەنوێنە
ئەوی ناودار و بەڕێزە
دایان پاچە، مەپارێزە
بەم ڕەنگە چاویان ئەشکێنین
ئەوسا ڕیشەیان دەردێنین
بۆ دامەزرانی ئەم ئاشە
بۆ دانانی ئەم بەرداشە
بۆ هاڕینی ئەم باراشە
حەقت ئەوێ، یەکێ باشە
کە ناموسی لا بەلاشە
دڕندە بێ، وەکو واشە

***

گەرا دونیا سووڕایەوە
کوون و قوژبن خوولایەوە
بۆ ئەم کارە ناهەموارە
(عومەر عەلی)[1] دۆزرایەوە

---

(١) عومەر عەلی: لە ساڵی (١٩١٠)دا لە شاری کەرکووک لە دایک بووە، دەرچووی کۆلیژی سەربازی و ئەرکان بووە، بەر لەوەی بکرێتە متەسەڕیفی لیوای سولەیمانی (زەعیم ڕوکن) بووە. بەپێی نووسراوی وەزارەتی ناوخۆی ژمارە (١٣٣٣٥)ی ڕۆژی ١٩٥٤/٩/٢٢ کرا بەوەکیلی متەسەڕیفی لیوای سولەیمانی، متەسەڕیفی پێشوو لە وەزارەتی ناوخۆ دەکەن بەموفەتیشی ئیداری و (عومەر عەلی)یش لە ١٩٥٤/٩/١٨ وەکالەتەکە وەردەگرێ. بەپێی نووسراوی ژمارە (١٣٥٥٠)ی ڕۆژی ١٩٥٤/٩/٢٧, لە ١٩٥٤/٩/١٩ موباشەرەتی بۆ نووسراوە، ئیتر بەم جۆرە (عومەر عەلی) مایەوە تا ١٩٥٧/٥/١٦ لە وەکالەتی متەسەڕیفی بەپێی نووسراوی ژمارە(٨٠١٢)ی ڕۆژی ١٩٥٧/٥/٢٠ ئینفیکاکی کردووە و گەڕاوەتەوە بارەگای وەزارەتی بەرگری و دوای ئەو (عەبدولموتەلیب ئەلئەمین) لە شوێنی دادەنێن. ئەو دەورەی درایە (عومەر عەلی) ببینێ لە زۆر لاوە حیسابیان بۆ گرتبووەوە، لە کاتێکدا ناکرێ وەزیفەیەکی مەدەنی شاغیر بدرێتە دەست قومیسەرێکی سەربازی، تەنانەت بەپێی یاسای خیدمەی مەدەنی ژمارە (٦٤)ی ساڵی (١٩٣٩) وەزیری دارایی =

هیچی بەگەورە خۆ دانەر
ئەوی نووسیبوویە دەفتەر
دایە دەستی (عومەر عەلی)
پێی وت بڕۆ لایوسئەلی
بڕۆ بۆ سەر سولەیمانی
ئەمەش پڕۆژەی نیهانی

***

دوژمنی گەورەی نیشتمان
(عومەر عەلی) وا نارد بۆمان
خۆی دوژمنی کوردەواری
دوژمنێکی شیرەخواری
ئەبێ ئەمە بۆ ئەو هەل بێ
نەخوازەڵا لایوسئەل بێ
سەیرکەن ئاڵا چۆن هەڵئەکا
دۆ و دۆشاو چۆن تێکەڵ ئەکا
وەختێ گەییە سولەیمانی
سولەیمانی نەیئەزانی
بەتایبەتی کە نێرراوە
زۆر ئیشی پێ سپێرراوە
هات و لەبەر دەرکی سەرا
نەخشی تەرازووی لێ کێشا

---

= ئەو سەردەمە (ضیاء جعفر) موخەسەساتی وەکالەتیی بۆ سەرف نەکردووە، بۆیە ئەوەی شێخ نووری لە (عومەر عەلی) دەگێڕێتەوە و تابلۆی بۆ کێشاوە زۆر کەمترە لەوەی باسی لێوە دەکەن، لە کاروباری سەربازیدا جەربەزە بووە. سوودم لە دۆسیەکەی (عومەر عەلی) وەرگرتووە. بڕوانە العراق الشمالي: مطبوعات النهار تأليف: محمد هادي الدفتر- عبداللة حسن - الجزء الأول - مطبعة شفيق، بغداد ص ٣٢٥.

(ان العــــدل أســـاس الملك)
بەخـەتێکی جـوان لێی نووسـرا
یەعنی هەمـوو کـەسێ لەلای
وەکـو یەک ئەخـرێتـە ناو تای
تای تەرازووەکـە سـەرناکـا
لەکـێـشـانا مـوو دەرناکـا
ئیـتـر نەمـا ، زۆرداری و شـەق
حەق ئەدرێتە ، دەس خاوەن حەق
سـنـدووق بـۆ شـکـات دانـرا
بەناو شـارا ئیـعـلان کـرا
ئـەوی زۆری لـێ کـــراوە
بەناحـــەق مـــاڵی خـــوراوە
هیـچ نـەوەسـتـێ و داوا بکـا
زۆر زوو بەحـەقی خـۆی ئەگـا
بەم کلە جـوان چاوی ڕشـتین
بەم پشـتـێنە ، پشـتی بەستین
وای نیشان دا،ئیش بێ غەش کا
بەتەرازوو جـوان حـەق بەش کـا
کـەچی نرخی، حـەق گـران بوو
ناحـەقی ئێـجگار هەرزان بوو
زۆر زوو فـێـر بوو لە حـیلەکـەی
دەس بنێـتـە سـەر مـیلەکـەی
دەست و تـەرازووت خـــواتەوە
خـوا زوو بۆ خـۆی بتـبـاتەوە

## گەراجی ناوشار

گـــەراجـــەکـــانی ناو شـــاری
دەرگـــای داخـــست بەزۆرداری
ئەمری دەرکرد لە سەر تا خوار
گـەراج ببـرێتـە، قـەراخ شـار
پاش دوو سێ ڕۆژ داخـــرانی
خـــاوەن گـــەراج نەیئـــەزانی
ڕووبکاتە کـــوێ بۆ ئەم کـــارە
ئەم دەردە چۆن ئـەکـــرێ چارە
خـــێـــر خـــواهێ چووە لایان
پێی وتـن گـــەلی برادەران
ئیـــشـــێکە تازە ڕووی داوە
هەر لەئێـــوە نەقـــەومـــاوە
لەم نەوعـــە هەر ڕۆژی جـــارێ
وەک بەخـــتـــەباران ئەبارێ
ئیش پێک نایە بە دۆژدامـــان
تەدبیـر پێـویسـتـە بۆ فـرمـان
هەڵسن بچن بۆ لای خـــانم
ئیـــشی گـــران، لا ئاســـانم
کـام ئیش زۆر قـورس و گـرانە
لای خـــانم زۆر زۆر ئاســـانە
کـام ئیش گـرانتـر فـرمـانە
مـوحـتـاجی یەک سەرقـەبلانە
فکرتان هیچ مـوغـبـەر نەبێ
ئیش نیـیـە لای مـەیسـەر نەبێ
هەڵسـان چوونە لای خـانم گیـان
سەری خۆیان جوان جوان قەبلان

دەرگــــای گـــەراج کـــرایەوە
گـــەراج لە جـێـی خـۆی مـایەوە
دەست و تـەرازووت خـــــواتەوە
خـــوا زوو بۆ خـۆی بـتـبـاتەوە

## میوانداری و چەرەسی خانم

خـــانم دەلاڵـی خـــۆی هـەبوو
هـەمــــــوو ڕۆژێ بـەیـانـی زوو
ئەی نارد بۆ ناو شـــار بپـرسێ
کێ شـــتـــێکی لێ هەڵدەسێ
دەلاڵ ئـەچـوو ئـەخـــــولایـەوە
مــــــالێـکـی بۆ ئـەنـایـەوە
خـــەبەری ئەنارد بۆ مـــالیـــان
کـــە بۆ پرســـینی ئەحـــوالیـــان
خـــانم ئـیـــمـــڕۆ، پاش نیـــوەڕۆ
تەشـــــریف ئەهێنێ بۆ لای تۆ
مـــیـــوانداریـیــەکـــەت بەجێ بێ
حـــەز ناکـــا بێگانەی لێ بێ
ژن ئـەکـــــــەوتـە شین و زاری
پیـاو نیشـتە دەریای غـەمـباری
هـەردوو ئـەگـــریـان ئـەیـان وت
بەلا بـەســــــەرمـــــانا باری
چونـکی زۆر بـاش ئـەیـانزانـی
جـــێـــیـــە بچێ بە مـــیـــوانی
ئەو مــــالە باش وێران ئـەبوو
قـــەرزاری ســـەد دووکـــان ئەبوو
وتیـــان مـالمـــان بەقـــوڕ گـــیـــرا
چارەش نـیـــــــە (إنا لله)

دیدەنی ئەم وەک کەس نییە
پیپسی کۆلاو چەرەس نییە
میوە، چکلێت، شەکەرلەمە
بۆ میوانی نرخ کەمە
چەرەسی ئەم شاهانەیە
سەرپەرچەم و گەردانەیە
یا بازن، یا پاوانەیە
دەستێ جلی کوردانەیە
حێل و مێخەک، لاگیرەیە
پشتێنی پێچکە لیرەیە
تەعلیماتی بۆ دەر ئەکرا
بەپێی وەزیفە دائەنرا
هەیە پشتێنێ هەڵئەگرێ
هەیە بەبازنێ ئەمرێ
ریعایەتی ئەمەی ئەکرد
بەویجدان بوو خوا هەڵناگرێ
چەرەس بەپێی دەس کەوتن بوو
لە زۆر زۆر، کەم کەم ویستن بوو
لەمانەی بۆ دانەنرایە
بەکەیفی خۆی هەڵنەستایە
وای بەحاڵی کابرای فەقیر
هەردوو پێی ئەکەوتە زنجیر
ئیشی تەواو ئاڵۆزا بوو
پتی لەکەند، رووی لە (با) بوو
دەست و تەرازووت خواتەوە
خوا زوو، بۆ خۆی بتباتەوە

***

## قەسابەکان و گران کردنی گۆشت

قـەسـاب لە سەد و شەسـتەوە
گۆشتیان کرد بە سەد و هەشتا
پاشا لە کردەوەی قـەسـاب
وەک عەلیشیش ڕقی هەستا
پۆلیسی نارد بەدەستو برد
قـەسابەکانیان جەلەب کرد
هەموویان بەجارێ گیران
پاچ و بێڵ درایە دەسیان
ناردنی بۆ کرێکاری
بۆ قورگرتنەوە و بەردکێشان
قـەسـاب زۆر باش ئەیانزانی
ئیش سەرناگرێ بەئاسانی
ناردیانە خزمەت خانم خاس
بۆ عەرزی شوکرانە و سوپاس
پێی وت، هەرچی بڵێ خانم
ئەیخەمە سەر ڕۆح و گیانم
بفەرموو قەسابەکان بەربن
مەهێڵە تووشی زەرەر بن
ڕێکەوتن و سەری قەبلان
مژدەی هێنایەوە بۆیان
خانم تەلەفۆنی هەڵگرت
پاشای هێنایە جرت و فرت
پێی چۆنت وت ڕێکەوتن
خۆت چەندت ویست لێم وەرگرتن
قەسابیان بردەوە سەرا
چوونە ژوورێ بۆ لای پاشا

ڕووی تێ کــــردن، وەکـــــو برا
وتی نیــشــتــان تەحــقــیق کــرا
ڕاســـتـــە حـــەیوان، زۆر گـــرانە
ئەم زیاد کـــردنە حـــەقـــتـــانە
هەرا بۆ ســـەد و هەشـــتـــا بوو
بەدوو ســـــەد بەر بەرەڵلا بـــوو
لە باتی بیــست، چلی چووە سەر
ســـواری پاشــا بوون وەکـــو کـەر
قـــەســـاب ئەیانووت بەجـــارێ
ئەم زەمـــانە خـــێـــر ئەبارێ
کێ بیـــســـتـــوویە کـــرێکارێ
پـاچێ لـێـــــدا بـە دیـنـارێ
دەست و تەرازووت خـــــواتەوە
خـــوا زوو بۆ خـــۆی بتـــبـــاتەوە

## شاعیر و خوێندەوار

لە نـزیـک بـێ، یا لـە دوور بـێ
شـــاعـــیـــر ئەبێ، با شـــعـــوور بێ
بەناخـــــۆشی گـــــریـانی بـێ
بەخـــۆشی شـــاد و مـــەســروور بێ
بەڵام گـــریانی ئەم شـــیـــعـــرە
کـــــورووزانەوەی بە فــــیـــکرە
بـــە ئـــاشـــکـــرا یـــا بـــە دزی
چاک و خـــــراپی هەرچی دی
وەک کــامـــێـــرا ئەیگرێ زوو
چاپی ئەکـــا و ئەیخـــاتە ڕوو
تاڵ و شـــیـــرین هەرچی نۆشی
خـــۆشی بینی، یا ناخـــۆشی

ئەبێ بێـــتـــە ســـەر زوبانی
بیـــخـــاتە چوارچێـوەی جـوانی
بە شـیـعـری خـۆش و ڕەوانی
کـــامـــەرانی، پەرێشـــانی
حـــاڵ و وەزعی نیـشـتـمـانی
هەتا هەتا، هـەتـا مــــانی
بڵـێ و بیکا بە شـیـعـری جـوان
بێ مـــاندوو بوون، بەبێ وچان
ئەم شـیـعـرانە لە چاپ ئەدرێ
لە چاپ نەدرێ، لەبەر ئەکـــرێ
یـەعـنـی نـامـــــــــــرێ
بەدیمەنی خـــۆش و ناخـــۆش
پێکەنین و گـــریانیـــان بێ
ئەم گــــــریان و پێکەنـینە
ئەم شــاییـــیـــە، یا ئەم شــینە
بە هەڵبـــەســتی ڕێک و ڕەوان
بیـــخـــەنە بەرچاوی جـیـهـــان
ئەمـە حـــاڵی شـــاعـــیران بێ
کــــردەوەی خــــوێندەواران بێ
عــومــەر عـەلیش وا نێـــرابێ
لایوســـــئـــــەل و بەرەڵلابێ
هـەرچی بـکـا پـرسـی نـەبێ
لە هیچ کـــەسێ، ترسی نەبێ
ئەبێ بەشـــمـــان هەر زیندان بێ
دەرکـــردن و تێـــهــــەڵدان بێ

***

کــــردەوەی ئەنـســـاری ســـەلام
مـەعلوومـە لای خـاس و عـەوام
ئەیانەوێ نیـــشـــتـــمـــانیـــان
بپـــــــارێـزن لە خــــوێـن ڕژان
نەوەک تەنیـا نیـشـتـمـانیـان
بەڵکو گەلی سەر ڕووی جیـهان
لە برســـێـــتی و مـــاڵ وێرانی
لە بێ ئیـشی و ســەرگـەردانی
لە قـــــونبـــــەلەی زەڕەو تـینی
لە بۆمـــبـــای هایدرۆجـــینی
لە فــــڕۆکــــەی پەلامـــاردەر
لە ســـاروخی مـــاڵ وێرانکەر
لە تێکچـوونی ئەخـلاقی چاک
لە شـــێـــوانی ڕەوشـــتی پاک
دوور بن هەمـــوو شـــار و وڵات
بۆ ئەمــــەیە هەوڵ و خـــەبات
کـــەچی بەقـــانوونی شـــەیتـــان
شـــەیتـــان پەرستی بێ ئیـــمـــان
تاجـــرانی مـــەرگ و مـــردن
شـــەریکەی گـــیـــان لەناو بردن
ئەنســــــاری ئاشـــــتی لایان
تـــاوانـــە، ئـــەوپـــەڕی تـــاوان
سـەلام کـرا بەشـەڕ، نەک خـێـر
ئەنســـاریشی بە شـــۆڕشگـێـــڕ
ئاشـتـیـــخـــوازی وەتەن پەروەر
مـــامـــۆســـتـــای کـــوردی هونەروەر

بلیـــمـــەتێکی دانشـــوەر
(گـــۆران)ی دەم پڕ لە گـــەوهەر
کـــردیان بە ئەنســـاری ســـەلام
یەعنی مـوســتـەحـەقی ئیـعـدام
گـــرتی نایە بەنـدیخـــانـە
وتـی جـــێـگای تۆ زیـنـدانـە
بە قـــانوونی ئێـــمـــە وایـە
زیندان جـێـی ئاشـتـی خـوایە
دەست و تـەرازووت خــــواتەوە
خـوا بۆ خـۆی زوو بتـبـاتەوە



جەماعەتی ئەنسارولسەلام کە لە ناویاندا مامۆستا گۆران لە ڕیزی سێیەمدا دیارە - ١٩٥٨

## شێخ لەتیف شێخ مەحموود

پایەی بەرزی کۆشکی شێخان
لە بن و بنچینە دەرهێنان
ئاشکرابوو، وەک ئەم ڕۆژە
ئەوەل بەند بوو لە پڕۆژە
وەک لە پڕۆژە نووسرابوو
بەدەمیش ڕاسپێررابوو
وەکو جووی نابووت لە پڕا
پاشا بەدەفتەرا گەڕا
حەمە بچکۆلی بەرچاو کەوت
شەو تاکو سبحەینێ نەخەوت
حەمە بچکۆلی پشدەری
(عومەر عەلی) ناردیە سەری
وتی بێت بۆ سولەیمانی
بۆ ئیشێکی زۆر پەنهانی
هێنایانە خزمەت پاشا
کڕنۆشی بەندەگی کێشا
بۆ تەفرە، لەبەری هەستا
ئەمجا ڕووی کردە (حەمە ئاغا)
وتی بیستوومە تۆ پیاوی
پیاوێکی ئازاو بەناوی
ئەڵێن دە ساڵ بەر لە ئێستا
(شێخ لەتیف) قینی لێت هەستا
لەشکری ناردۆتە سەرتان
بۆ تالان و بۆ کوشتنتان
ساف لە ساف تالانی کردوون
سەروەت و سامانی بردوون

چەند فەلاح و پیاوی کوشتوون
خۆتان بەهەزار حاڵ دەرچوون
بڕۆ دەعوایە، بەڕیا کە
حەقی خۆت ئێستە داواکە
من ئەم حەقەت بۆ ئەسێنم
ریشەی لەبن دەرئەهێنم
حەمە بچکۆل، وتی پاشا
خوا گەورەییت بەردەوام کا
زۆر دەمێکە ئەمە بووە
ساڵەهای بەسەرا چووە
هەرچەند لەیەک ڕاست بووینەوە
بەلام دوایی ئاشت بووینەوە
تازەکردنەوەی ئەم کارە
بۆ عەشیرەت عەیب و عارە
پاشا وەک لێی بدەی کوتەک
وەک ژێ و کەوان هاتەوە یەک
وتی ئینگلیز ئەمری داوە
وەزیر خەتی وا کێشاوە
ئەبێ ئەم کارە هەر بکرێ
نابێ دەقیقە دوا بخرێ
ئەم شێخانە نابێ ببن
ڕەگیان ئەبێ دەربێ لە بن
بە هەڕەشە و بەترساندن
بە تەماعی حەق بۆ ساندن
(حەمە ئاغا)(*) هاتە سەرباری
کە خوێن لە دڵی ببارێ

---

(*) دەبێ حەماغا بخوێنرێتەوە، دەنا لەنگ دەبێ.

شــاهێــدی زوور لەم لاو لەولا
بەزۆری شـــەق پەیدا کـــــرا
بەقـــانوونی عـــەشـــایەری
لـەعـنـەت لـە بـابـی دانـەری
مـەحکەمـەی بۆ تەشکیل کـرا
مـودەعی و شـایەت بانگ کـرا
مـــادەی یەکـــەم لەم قـــانوونە
وەک ئاوێنە ســـــاف و ڕوونە
ئەڵێ حـــوکـــمی لەبنەڕەت
نابێ بۆ ئەهلی مـــەملەکـــەت
قـــانوونێکە عـــەشـــایەری
دانـراوە بـۆ کـــــــــۆچـەری
حـوکـمی هەر بۆ کـۆچەریانە
بە پێی عـــورف و عـــادەتیـــانە
هەمـوو حـوکـمی ئەم یاسـایە
بۆ ئەهلی دەشت و چیـــــایە
پاشـــا گـــوێی نەدایە قـــانوون
حوکمی خۆی دا بێ چەند و چوون
کۆچەری و دانیشـتووی ناو شار
کردنی بەیەک بۆ ئیسـتیعـمار
لە نەوەی قـــوتبی ڕەببـــانی
کـاک ئەحـمـەدی سـولەیمانی
شـــێخ لەتیـــفی ئازا و نەبەرد
وەتەن پەروەر، نەترس و مـــەرد
یەکـەمین لاوی کـــوردســـتـــان
دڵســۆزی پاکی نیـشــتـمــان

قــەرەقــۆشی ڕاســـپــێـــرراو
حــاکـمی نەخـشـە بۆکـێـشـراو
بەخــــــۆڕایــی بەبــێ تــاوان
خـــۆی و هەندێ، ئازادخـــواهان
یەکی بەچوار ســاڵ حـوکـمی دان
نــاردنــی بــۆ نــاخــی زیــنــدان
مــەبەســتی گــەورە هەر ئەم بوو
لەســەر چاویان، تانە و تەم بوو
دەست و تـەرازووت خــــواتەوە
خــوا زوو بۆ خــۆی بتــبــاتەوە
تۆش بخــۆ حــاڵت زۆر خـۆشـە
ئەو شەربەتەی ئەمان چێشتیان
تۆش مــــاوەیە لێی بنۆشـــە
بـا تــێ بــگـەی تـامـی زیـنـدان
پیـــــرۆزتـان بێ بەندیخـــانە
هی خـــۆتانە، بۆ خـــۆتانە

***

(کارەساتی خوولە پیزە، کوشتنی و شکاندنی پەیمانی حکوومەت کە درابوو بە برا و خزمەکانی و بەکوشتدانیان لە لایەن هاورێکانی خۆیانەوە) شێخ نووری.

خوولە پیزەی[1]چەتەی مەشهوور
جووتیارێ بوو لە شەڕ بەدوور
زوڵم و زۆری (بانی شاری)
دەری پەڕاند بە زۆرداری

---

(١) خوولە پیزە: ناوی (مەحموود محەمەد)ە. دایکی ناوی (پیرۆز)ە لەبەر نەمانی باوکی بەناوی دایکییەوە بە (خوولە پیزە) نێوبانگی دەرکردووە. لە ساڵی (١٩٢٦)دا لە دێی (چەمی یاڵە)ی سەر بەقەزای چوارتا لە دایک بووە. (حەمەمینی بانی شاری ) کە خەڵکی دێی (بانی شار) بوو، ئامیر مەخفەری (ولیاوا) دەبێ. لە (١٩٤٧/٩/١٨)دا بەخۆی و مەفرەزەیەک پۆلیس چوون بۆ سەر (خوولە پیزە)، چەمی یاڵەیان ئابڵوقە دا تا بیگرن و بیبەنە مەخفەری چوارتا، بەتاوانی ماددەی (٢٦٠) لە مەوزووعی ژمارە ١٩٤٢/٤٣. کە لە هۆی تاوانبارکردنەکەیم تۆژییەوە، دەرکەوت سەربازی ڕاکردوو بووە، بەلام لە نامیلکەی (الكتاب الأسود)دا دەڵێ: لە ساڵی ١٩٤٢ خوولە و مامی (عیزەتی مینەڕەش و حەمەغەریب و ڕەشید و شەریف ڕەحیم) بەتفەنگ و بەخەنجەر ڕێیان لە (فەرەج قادر) گرتووە کە خەڵکی دێی (کورە دێ) بوو لە قەزای چوارتا کە خەریکی جووتیاری بووە، گوایە ئەمان ڕووتیان کردووەتەوە. کە دێ بۆ گرتنی چەند هەوڵی لەگەڵ دەدەن (حەمەمین بانی شاری) واز ناهێنێ، خوولەپیزە دەیکوژێ و لەگەڵ مەحموود حەمە نادر و تالیب پیزەی برای دەدەنە شاخ. کوشتنی ئامیری مەخفەرەکەش تۆڵە سەندنەوەی کوشتنی ئامۆزایەکی بوو کە ناوی (ڕەشە دۆڵ) بوو. لە ١٩٤٧/١٢/٢٨ میری (شێخ سەعیدی شێخ ئەحمەدی دۆڵپەمووییی) کە ئەمەش هەر پۆلیس بوو ناردییە سەر ژنەکەی و دەستی بەسەر مەڕ و ماڵاتەکەی داگرت بۆ ئەوەی بیانهێنێتە (چوارتا). خوولە لەدوای بگرەو بەردە لە نزیک گۆڕستانی (پیرئالک) دەیکوژێ و ژن و منداڵەکانی لە چنگی ڕزگار دەکات. ژمارەی ئەو کەسانەی کە لەگەڵی بوون هەرگیز لە هەژدە کەس تێنەدەپەڕین. هەندێ کەس لەو بڕوایە دایە کە دوای بەزاندنی هەمەوەندەکان لەدەمەو ئێوارەیەکدا (خوولە) لەسەر گاشە بەردێک دادەنیشێ و جەماعەتەکەی دەکەونە کۆکردنەوەی ئازووقەو تفەنگەکانیان (شێخ موحسینی دۆڵپەموویی) کە برای (شێخ سەعید)ە لە پشتەوە نیشانی لێ دەگرێ و دەیکوژێ.

سوودم لە کتێبی (الكتاب الأسود) تحقيق محمد شكري العزاوي - مطبعة المعارف - بغداد ١٩٥٥ وەرگرت. هەروەها سوودم لە مامۆستا (عومەر عەبدولڕەحیم) و ژمارەی (١٢٥١) و (١٢٥٢) و (١٢٥٣)ی ساڵی ١٩٥٥ ڕۆژنامەی ژین وەرگرت، لەگەڵ زۆر سەر و سۆراخی دیکەی خۆم.

بانی شـاری کـوشت و دەرچوو
لە داخی شـــورتە یاخی بوو
بەفـــیـــراری زۆر مـــایەوە
ئـــاژاوەی زۆری نـــایـــەوە
لە شـــەڕێکا خـــوولە کـــوژرا
تەرمی لەو چیـــایە نێـــژرا
پاش بەینێ مـیـری پێی زانی
خـــولەیان لەگـــۆڕ دەرهانی
بۆ ئەوەی عـــالەم بیـــبـــینێ
هێـنـایانە ســـــولەیمانی
(سـالح کـۆیی) ڕەفـیـقی بوو
ڕەفـیـقـێکی شـەفـیـقی بوو
لە پاش ئەوەی خـولە کـــوژرا
لەگـــەڵ براکـــەی وەک برا
لەم کـۆسـپـــەوە بۆ ئەم هەردە
لـــەم دارەوە بـــۆ ئـەو بـــەردە
لەناو چیـــای فـــیـــراریا
لـــەنـــاو دەوەنـــد و داریـــا
ئەگـــەڕان و ئەخـــولانەوە
بەم چیـــا و بەم کـــێـــوانەوە
هەمـوو وەک یەک تاواندار بوون
لەدەس حکوومـەت فـیـراربوون
لە دوای خـــوولە، براکـــانی
ئیـــشی خـــۆیان وا چاک زانی
لەپیـــاو خـــەراپی واز بێنن
خـــۆیان بەچاکـــە ڕابێنن

بـڕیـاریـان دا تـا بمـێـنن
دڵی کـەس دانەچڵـەکـێنن
ناردیانە لای مـەردی دلێـر
قـائیـمـقـامـەکـەی شـارباژێڕ
وائەزانم (بایز ئاغـا) بـوو
نـەوەی دزەیـی ئـازا بـوو
ئیـشی زۆرباش، بۆ ڕێخـستن
بەڕەحـەتی لێی دانیـشتن
مـانگانەی بۆ ناونووس کـردن
کـە دانیـشن هەتا مـردن
دەسـتیـان دایە حـەیوانداری
فـەلاحـەت کـردن، جـووتیـاری
(سـاڵح کـۆیی)و هاوڕێکانی
ئەوانیـش هەر وازیـان هانی
دانیشتبوون بێدەنگ، بێ سەنگ
بێ بەزم و ڕەزم و بێ ئاهەنگ
بەینێ بوو خـوولە کـوژرابوو
براکـانی دامـەزرابوو
بەڕەحـەتی دانیـشتـبوون
لە ئارادا هیـچ نەمـابوو
پاشـا کـە تەشـریفی هێنا
بۆ گـرتنیـان بڕیاری دا
بەڵێنەکـەی مـیری شکان
خـۆی و شـورتە چوونە سـەریان
بەسـەد فـێڵ و فـڕ و پیـلان
سـەرنەکـەوتن بۆی نەگـیران

براکـــانی خـــووله دیســـان
کـەوتنەوە ناو شـاخ و کـێـوان
(سـالح کـۆیی)و هاوڕێکانی
لەگـەڵیـانا گـیـانی گـیـانی
پشـتی یەکـتـریان گـرتبـوو
دووربـوون لـە دێ و ئـاوەدانـی
بیـــری زۆر کـــردەوە پاشــا
هیچ نـەمـــا هەوڵی بۆ نـەدا
بۆ ئـەوەی یـا بـیــــانـگـرێ
یـا بـەکـــوشـتن لـەناویـان بـا
ســـەری برد و ســـەری هێنا
ئـاخـــــری وا بـڕیـاری دا
وەک ئێـــران چۆن بێ ئـازایی
(سمکۆ)یان[٢] کوشت بەخۆڕایی
ئەمـــیش هەروا نامـــەردانە
بیـــانکوژێ بە حـــیـــزانە
لووت بەرزی ڕوتبە و جێگا بوو
لایوســـئـــەلو بـەڕەڵلا بـوو
بیـگرتایـە، بیکوشـــتـــایە
بە لـێـــدان ســـەد بمردایە
هـەرچـی بـکـردایـە ئـەچـوو
پرســـینەوەی هەرگـــیـــز نەبوو

---

(٢) سمکۆ: کوڕی محەمەد پاشا، کوڕی عەلی خان کوڕی ئیسماعیل خان، سەرۆکی بەشی عەشیرەتی شوکاکی ئێرانەو لە نێوان خوی و ورمێ دادەنیشن، بەشەکەی دیکەی دەکەوێتە تورکیا و لە ویلایەتی وان و هەکاریدایە. ماوەی زیاتر لە دە ساڵ لە کوردستانی ئێراندا سەرۆکایەتی بزووتنەوەیەکی گەورەی کرد تا لە ناوەڕاستی تەموزی ساڵی ١٩٣٠ لە لایەن کۆنەپەرستانی ئێران و لە سەردەمی ڕەزا شادا بەنامەردی کوشتیان.

ئەندامی حــــیــــزبی تۆران بوو
دوژمنی گـــەورەی کـــوردان بوو
خـــوێن ڕشـــتنی کـــوردی لە لا
زۆر بێ نرخ و زۆر ئاســـــان بوو
بۆ کـــوشـــتنیـــان قـــەراری دا
پیـــــــلانی بەم ڕەنگە دانا
(ســـالّح کـــۆیی)و هاوڕێکانی
لاســـــیـــــان بدا بەپەنهـــانی
جێگەیان زۆر سەخت و شوومە
تەعــقــیــبــیــان بێ بەروبوومە
خـــــوێنی پۆلیس بۆ بڕێژین
خـــۆیان بەخـــــۆیان بکوژین
کاربەدەستی ئەمنی بانگ کرد
پەردە ئـەســــــــراری بـۆ لابرد
هەڵیـــان بژارد لە ژن لە پیـــاو
جـــــاســــووسی باوەڕپێکراو
یەکـــێکیــــان ناردو زوو ڕۆیی
بە پەنهـــانی (ســـالّح کـــۆیی)
دی و دەسی خۆی باش لێوەشاند
ســـەلامی پاشـــای پێگەیاند
پاشـــــا ئەڵێت، هەتا مــــاوم
ئیـــشی ئەنێـــمـــە ســـەر چاوم
خۆی و هاوڕێی عـەفـوو ئەکـەم
ئیشی باشـیـان بۆ ڕێک ئەخـەم
ئەوەی لە دونیــــا دەس کـــەوێ
ئەو بیـــــەوێ، مـن نامـــــەوێ

هەتا بڕکا قسەو هێزم

لە شەڕ و شۆڕ ئەیپارێزم

هەموو هاوڕێی لەکارا بێ

خۆشی ڕەئیس عورەفا بێ

سالّح کە گوێی لەمانە بوو

دینی بەشەیتان دا بە شوو

دوعا خوازی لە ئیمان کرد

خوا حافیزی لە ویجدان کرد

نایە ئەولاوە عەیب و عار

نامووسی خۆی دا بەدینار

نەنووستن تاکو بەیانی

تا فرسەتیانی لێ هانی

وەنەوزیان نەدا و نەنووستن

لە خەودا هەموویان کوشتن

دەست و تەرازووت خواتەوە

خوا بۆ خۆی زوو بتباتەوە

***

(عومەر عەلی) کە نێرراوە

لەوێ نەخشەی بۆ کێشراوە

دوژمنی کورد هەرچی بکا

نابێ کوردێ باسی بکا

بۆ سالّح کۆیییە لۆمە

ئەم سێ شیعرە لەگەلّ تۆمە

ئەوەتی دونیا دونیایە

ئادەمیزادی وا تیایە

لەو کـــەســـانەی کـــوردیان ناوە
شـــــــــتی وەها ڕووی نەداوە
ئەوەنـدە تۆ بێ ویجـــــدان بی
نابێ لە توخــــمی کـــوردان بی

***

## شیعرێکی ناتەواو

دەوری بۆگەن و پیسی ڕابوردوو/ هۆشی تالآن کرد
زەمانی شەعب لەعنەت لێ کردوو/ دونیای وێران کرد
ئینسانیان بەزۆر کەڕوکوێر ئەکرد/ شت بەدی نەکا
بەزلله ناوی دەمی سوێر ئەکرد/ ناوی کەس نەبا
تەماشاکردن، گوێ گرتن، وتن/ حەرام کرابوو
یەکێ لەمانە بەس بوو بۆ گرتن/ بەقانوون وابوو
گوێ کەڕیی، کوێریی، زوبان بەسراوی/ بەزۆر بەلآوە
بوو بەنەخۆشی لە هەزار لاوە/ کەوتە ناو دونیا
بەهۆی میکرۆبی بیری چەوتەوە/ ساری بوو، خەڵقی زۆر لێ کەوتەوە
ژیانی نایە تەفر و توناوە/ بەشەق تێهەڵدان
ئەبینی عالەم کز و داماوە/ بەزەبری لێدان
چاو ئیشی چییە؟/ تەماشاکردن/ تاریک و ڕووناک
کەڵکی گوێ چییە؟/ دەنگ و باس بیستن/ هی خراپ و چاک
جاسووس وەک تاعوون کەوتە دونیاوە/ لە هەر چوار لاوە
خەرمانی ژیانی دا بەدەم باوە/ بە دان و کاوە
زوبان بۆ چییە؟ بۆ قسەکردن، بۆ ئیشی چاکە
کەچی ئەمانە هۆ بوون بۆ مردن/ لەوانەی پاکە
تاوانی وتن ئێجگار گران بوو لەژێر دەرچوونی
جەزای ئاسانی ناخی زیندان بوو
ئەو نەخۆشییە چل ساڵ مایەوە/ لەناو وڵاتا
هەتاکو نەهات ئەتەنایەوە/ وەک گرانەتا
سێ ئەندام ئەیگرت لە لەشی ئینسان/ یەکەم چاو ئەیگرت، دوو گوێ، سێ زوبان
چاو نەیئەبینی هێندە نووقابوو/ بەدەم دارەوە
گلێنە و پێڵووی ئاوی تێزا بوو/ بەئازارەوە
سەرێ دێ، چاوی سوور هەڵگەڕابێ/ ڕوو بەبوونییەوە

ئەچوو هەروەکو قیامەت هەڵسابێ/ بۆی ئەهۆنییەوە
ئەیووت فلان کەس جەرگی سووتاوە
بیستوویێتی فلان ئیمڕۆ گیراوە
لە بەغدا دوێنێ فیسار خنکاوە/ مات و خامۆشە
سەیری چاوم کرد، دیار بوو گریاوە/ زۆر بەپەرۆشەوە
بەفرمێسک پێڵووی چاوی سووتاوە/ هێندە گریاوە
بەجارێ بەندی جگەری بڕاوە/ هۆشی نەماوە
ئەیان بردیت و حەپسیان ئەکردی/ بەزۆری لێدان
لەسەر پشتی خۆت شەقیان ئەکردن/ بەنینۆک کێشان
زۆر لەم ئیشانە مەبەست دینار بوو/ کۆبکرێتەوە
قازانجی ڕۆژی گەلی هەژار بوو/ تیا بتلێتەوە
خەڵق تا ئێوارە ئەچرووسایەوە/ هەتا دوو حەفتە
وردە بە دینار ئەگۆڕایەوە/ ئەکرا بەسەفتە
ئەیبرد بۆ خانم زەهری ماری کا/ لەشەق تێهەڵدان
سەد دەوڵەمەندی لات و فەقیر کرد/ لە شارستانا
هەزاران لاوی بەهێزی پیر کرد/ لەناو زیندانا
ئەم نەخۆشییە چل ساڵ مایەوە/ هەروەک سەرەتان
هەتاکو ئەهات ئەتەنایەوە/ بێ داوو دەرمان
کام دکتۆری چاو، دکتۆری چابوو/ بچوویتایە لای
ئێشی چاوت لە لای، تەراخۆما بوو/ وای تەفرە ئەدای
قەترەی ئەدایتێ بۆ تەراخۆما/ لە قەترەی بەرلین
تەراخۆمای چی، بەدەس نووقابوو/ دەستی ئاسنین
بۆ گوێچکەت ئەیووت، هەر چیلکە و پیسیی/ بەجۆرێکی وا
بەری گرتووە، تۆ هیچ نابیستی/ بشۆرێ ئەڕوا
گوێچکە کپ نەبوو، بەزۆر گیرابوو/ بە زللە و بە شەق
لۆکەی کەڕ بوونی تێ ئاخنرا بوو/ وەک دەوای ڕەینەق
ڕوانین و بیستن، نووسین و وتن/ وەکو نەبووبن

بەجۆرێکی وا یاساغ کرابوو/ لەپیاو، لە ژن
لەسەر هەر یەکێ لەم تاوانانە/ بەئەمری ناحەز
سەد پێستی لەسەر دەباغ کرابوو/ بەبێ ترس و لەرز
ئەمزانی بەرگەی لێدان ناگرم/ بەتۆزێ ئازار
بەدارکارییەکی نیوەشەو ئەمرم/ وەک بەفرەکەی پار
زاتەن بەینێ بوو فەسڵ کرابووم/ لەناو برابووم
بۆ بەندیخانە زوو دانرا بووم/ ناونووس کرابووم
خێرەومەندێکی حەقناسی دڵسۆز/ نەختێ لە ساڵا
پیاوێکی چاکی، دڵپاکی پیرۆز/ کردی بەماڵا
لەخەو هەڵسابووم بەری بەیانی/ بەمیوانداری
هات و بەگوێما، نەختێ چرپاندی/ بۆ ئامۆژگاری
وتی: شەو تەنیا مەڕۆ بەرێدا/ پۆلیس ئەگەڕێ
سەگەلی خوێڕی زۆرن لە دێدا/ بەخەڵق ئەوەڕێ
لەگەڵ ئینسانا سەگەل ناحەزن/ ئەمە مەعلوومە
بۆ بەخۆڕایی لاقت بگەزن/ بەم وەختە شوومە
ئامۆژگارییەکی رێکی وا بەڕێ و بەجێ/ بەبێ گفتوگۆ
کردم بەگوارە، نامە پەڕەی گوێ/ نەمدا بەفیڕۆ
ئیتر من لە ماڵ نەهاتمە دەرێ/ هەر لە ماڵەوە
دانیشتم، پۆلیس بۆ ئابڕووم بەرێ؟/ بەدەم پاڵەوە
ئەم نەخۆشییانە ئاوا ساری بێ/ بێ دەوا و دەرمان
هەر کەسێ گرتی دەردی کاری بێ/ تا ئەسپێرێ گیان
ئەمجا تۆ بی خوا چۆن من بوێرم/ کە دەستوبرد کەم
لە لووتکەی وا بەرز بێم خۆم هەڵدێرم/ ملی خۆم ورد کەم
بە کوێرەوەری، بەهەناسەی سارد/ داماو و غەمگین
لەگەڵ ئەم دەورە بەم جۆرە ڕامبوارد/ بێ هێز و بێ تین
تا خودا عەبدولکەریمی ڕەخسان/ وەک شێری مەیدان
تەلیسمی قەڵای دێوەکەی شکان/ بنچینەی ڕووخان
هێلانەی شوومی بوومی هەڵوەشان/ بەداڕووخاوی

گیانی کوندەبوو هەمووی هەڵفڕان/ بەباڵ شکاوی
بەسەر دونیاوە ناسووڕێتەوە/ تا شەعب مابێ
ببڕای ببڕای قەت ناگەڕێتەوە/ هەتا هەتایێ
ئێستا زوبانم تەڕ و پاراوە/ بەسراوی نەما
وەک جاران کپی گوێچکەم نەماوە/ گیراوی نەما
بەتەما نەبووم، ڕۆژێ بێتەوە/ هەتاکو مردن
بیری جارانم بگەڕێتەوە/ بۆ شیعر وتن
(هەرەس و لافاو) بنووسرێتەوە/ بێ ترس و بێ لەرز
بەئاواتی بەرز بخوێنرێتەوە/ بێ گوێ لە ناحەز
دەنگێکی وا بێ بلەرێتەوە/ وەک دەنگی هوزار
کە چۆن لە گوێدا ئەزرنگێتەوە/ لە خۆشی بەهار
ئەی عەبدولکەریم ڕۆڵەی نیشتیمان/ سەرۆکی ئەمین
هەروەک تەلیسمی قەڵاکەت شکان/ بەهێز و بەتین
دەی بۆ پێشەوە، هەنگاو دابنێ/ ئێمە هاوڕێتین
هەر سەرەو تۆ پێی بەسەر دابنێ/ سەر لەژێر پێتین
دەی بۆ پێشەوە، کورد هەتا هەتا/ هەروا لەگەڵتا
بۆ بەرزبوونەوەی وەتەن هەوڵ ئەدا/ سەر لە ژێر پێتا
منیش ژیانم، هەستم، هەڵبەستم/ هەرچی کە هەمە
هەمووی بنێمە سەر بەری دەستم/ هێشتا لام کەمە
ئەیکەم بەفیدای ڕۆژی ئازادی/ سەربەست و دڵشاد
بۆ ئەوەی بژی گەلم بە شادی/ بێ ترس و ئازاد(*)

---

(*) وەک لە شوێنێکی دیکەشدا وتوومە، ئەم شیعرەی (شێخ نووری) شیعرێکی ناتەواوە، بە ڕەشنووسی و پەڕاگەندەیی لەناو دەستنووسەکانی کۆڕی زانیاری عێراق «دەستەی کورد» دۆزیەوە کە لە کاتی خۆیدا پێشکەش کراوە بەوان. من هەرچۆنێ لێکم دایەوە؛ بڵاوکردنەوەی ئەم نوسخە ڕەشنووسە، لە نەنووسینم بەباشتر زانی، لەوانەیە لە پاشەڕۆژدا نوسخەیەکی پاکنووس کراوی ئەم شیعرە بدۆزرێتەوە. تا ئەو ڕۆژە دێ، جارێ با ئەم شیعرە نەفەوتێ.

سەرنج: هەندێ لەو دەربڕین و دێرە شیعرانە لەو شیعرەدا دووبارەن، چونکە لە شیعرەکەی بۆ شێخ لەتیفی نووسیوە کاتێ لە (بەسرا) گیراوە، هەن و وەک یەکن.

# بەمن بڵێ چ میللەتێ

به من بڵێ چ میللەتێ لە مەقبەری مەماتەوە
لە مەحوو ئینکیسارەوە، لە دەورەیی نەهاتەوە
نەچۆتە ناو موجادەلەی حەیاتەوە
گەلی براو لاوی کورد، لە یاری دوور وڵاتەوە
شەوێ نییە بەهۆی (ئەثیر) لە غەربی ئاسیاتەوە
نەویدی خۆشی لە ئێسکە دەنگ نەداتەوە
دەمێ بەقەلبی زارەوە، بەچاوی ئەشکبارەوە
گەهێ بەعوود و تارەوە، بەهەیبەت و ویقارەوە
هیوا نەخاتە ناو دڵی وڵاتەوە
ئەڵێ کە ڕۆژی کورد ئەوا بەرێوەیە لەدەم کەلا
لە ئوفقی نیشتیمانەوە، خەریکە وا شەبەق ئەدا
بەعالەما بەجارێ شەوق ئەداتەوە
مەوەستە رووکەرە هیوا، مەپرسە دەشتە یانە کێو
مەترسە تۆ لە سەغڵەتی فراز و زەحمەتی نشێو
کە هەوڵە هەر گەرەو لە دەهر ئەباتەوە
بەسە زەمانی غیرەتە، چ وەختی خوابی غەفڵەتە
زەمانی هەوڵ و هەڵمەتە، هەڵێکی زۆر بەقیمەتە
ئەوەک فەلەک لەدەستی تۆی بکاتەوە
لە کۆسپی ڕێگە سڵ مەکە، بڕۆ بەرەو شەقامی ژین
لەگەڵ سەباتی کوردەواری پێچەوانەیە بەزین
خوداش لەو[1] هەوڵە ئاوڕێ ئەداتەوە

(١) لە دەستنووسی شاعیرا (و)ی (لەو) نەنووسراوبوو.

## نەورۆز

ئاگری نەورۆز بە شاپلیتە و پەرۆ ناکرێتەوە
زوو ببێتە خۆڵەمێش و تینی دامرێتەوە
ئاگری نەورۆز، بە گیان و دڵ ئەبێ وا خۆش کرێ
گەر بەخوڕ دیجلە و فوراتی بێتە سەر نەکوژێتەوە
هاتوو گەر شێتانە مەنعی جەژنی نەورۆزت کرا
لازمە گیانت بەمەردی بیخەیە ژێر پێتەوە
دەست و پێ، ئێسکی شکاو، چیلکەو چەوێلی چاوگە بێ
لاشە هەروەک داری «زەنگەقلیشە» کۆبکرێتەوە
خوێنی لاوان نەوت و بەنزین بێت و بڕژێتە سەری
گڵپەیەکی وا بسێنێ شەوقی دانەمرێتەوە
پیاو بزیرێنێ وەکو شێری ژیان هەڵمەت بەرێ
ژن بەدەوری ئاگرا بگری و بلاوینێتەوە(*)
خۆش ئەبێ ئەوسا بلێسەی ئاگری نەورۆزەکەت
ئەو حەلە سەیری گوڵی کە، چۆن دەمی ئەکرێتەوە
دەس ئەکاتە پێکەنین بۆ بلبلی باخی وەتەن
هەریەیەک سروەی بەیان ئەشنێتەوە و ئەخنێتەوە
چەند بەخۆشی بولبولی خۆشخوان ئەخوێنێ بۆ گوڵان
چۆن چریکەی سەر چڵی، عەرشی عەزیم ئەگرێتەوە
بەو زوبانی حاڵە خۆشە ئەم نزایەت بۆ ئەکا
ڕەبی ئەم ڕۆژە هەموو ساڵێ بەخۆشی بێتەوە

١٩٥٨/٣/٢١

(*) دەبوایە ئەم دێرە بەجۆرێکی دیکە بوترێ، چونکە دەوری ژن هەر ئەوە نییە بەدەوری ئاگرا بگری و بلاوێنێتەوە.

# هاواری وەتەن[1]

دوێ شەو لەخەوا دیم کە ژنێ موشفیق و مەعسووم
هاواری ئەکــــرد، من وتەنم مـــادەری ئێـــوەم
ئەیفەرموو بەحوزنێکەوە زۆر عاجز و مەغمووم
هەم داری سەمەردارم و هەم لەزەتی میـــوەم

***

گەر ئاو بدرێم و بە شەفیقانە بکێلرێم
پشکووتنی گوێکەی ئەمەلم حازری ئانە
ئەو خەلفەنەمامەی، لق و پۆپ ئاسک پیریم
بێ ئاوییە ئەسبابی بەهارم کە خەزانە

***

بێ لوتفی و بێ خزمەتی ئێوە سەراسەر
ئەوراقی ئەمەل، غونچەی ئومێدی وەرانم
گەر بێتو بکەن ئێوە موبالات بە ژیانم
ماندوو ئەحەسێنێتەوە، هەم سێبەر و هەم بەر

***

ئەی رۆڵە، جگەر گۆشەی ئافاقی ئەمەلمن
ئەمرۆیە کە موحتاجی وەفاو خزمەتی ئێوەم
رووناکی چاوانم، دەرمانی سپڵمن
سبحەینێ منیش باعسی حورییەتی ئێوەم

***

ئاودانی من و خزمەتی من، عیلم و فنوونە
تەحسیلی مەعاریف، سەمەر و[2] قیمەتی ژیانە
قەومێ کە لە عیرفان و ئەدەب زەڕڕەیە دوونە
هەر مۆزمەحیلە ئاخری موحتاجی دونانە

---

(۱) ئەم شیعرە بۆ یەکەم جار لە رۆژنامەی (ژیانەوە)دا لە سالی (۱۹۲۵) بلاوکراوەتەوە. بۆ جارێکی دی لە گۆڤاری (پەیژە)ی ژمارە (۱)ی سالی (۱۹۲۷)دا بلاوکراوەتەوە.

(۲) لە گۆڤاری (پەیژە)دا نووسرابوو: (سەرمەرد و قیمەتی...).

## ئەی ڕۆحی ڕەوانم

بۆ یەکێ لە ریجالە سیاسییەکان نووسراوە

ئەی ڕۆحی ڕەوانم مەبە لەم وەزعە موکەددەر
بێهوودە مەکە خۆت بەخەیالاتەوە موغبەر
حاجەت بەنیشارەت نییە، وەک ڕۆژ ئەدرەوشێ
شوعلەی زەفەرە، عاقیبەتی جەیشی موزەفەر
نیزیکترە ئەو ڕۆژە لە قەوسەینی ئەو ئەدنا
دنیا کە ئەبێتە گوڵ و گوڵزاری موعەتەر
هەر قەومی پەرێشانە ئەناڵێ بە جەفاوە
هەر سیللەتە جەرگ و دڵی جنراوە بە خەنجەر
هەر چاوی ستەمدیدەی ئەقوامی زەعیفە
پڕ قەترەی خوێناوە مەلوولانە، موکەددەر
هەر خونچەی سیسی دڵی کوردانە دەڵێ کەی
ئەکرێتەوە ڕۆژێ بەهەوایەکی موعەتەر
ئەم عالەمە بەم ڕەنگە بپارێتەوە لای خوا
بکوڵێ دڵی ئەم خەڵقە وەکو جۆشی سەماوەر
ئامالی بەشەر بەستە بێ بەم ڕۆژەوە باللە
شوبهەم نییە ئەو نەسرە کە نووسراوە لە دەفتەر
تۆ ئەو دەم و ڕۆژەی عەلەمی نەسری نیهانی
ئەشنێتەوە وەک ڕۆحی زەفەر دیدە لەسەر سەر
بڕوانە ئەم کوردە بەچاوێکی عەدالەت
نیتر بەسە گەردن کەچی و ژینی موحەقەر

## چواردەی تەممووز[1]

چواردەی تەمموز و ڕۆژانی دوای ئەو
کەس نەیئەوێرا بیبینێ بە خەو
هەناسەی سارد و هەنسکی گیراو
لەگەڵ هاواری بێدەنگ تێکەڵاو
زوبانی لاڵی پشکۆ پیا چزاو
گەرووی وشک بووی، نووزە لێ بڕاو
بەبیری کێدا ڕائەبوورد دوێنێ
گیروگرفتی هیچ تیا نەمێنێ
زوبان بەم ڕەنگە تەڕ و پاراو بێ
ڕقی لە دەنگی کپ و نووساو بێ
لەشی بێ تاوان بەدەم دارەوە
لەت لەت بوو ڕزی کەوتە خوارەوە
خاڵ و خوشکەزاش[2] بە تەلارەوە
بەدەنگی نای و عوود و تارەوە
بەویسکی و کچی چاو خومارەوە
شەوان ڕابوێرن بە قومارەوە
بەبیری کێدا ڕائەبوورد یاران
تەلار ببێتە گۆڕ و گۆڕستان

***

باسی ئازاری نینۆک دەرکێشراو
لەش هەلاهەلای دەست و پێ شکاو

---

(١) پشتم بەدوا دەستنووسی شاعیر بەستووە و لەگەڵ نامیلکە چاپکراوەکەی شاعیر کە لە ساڵی ١٩٥٨دا بەپێشەکی (کامەران) لە چاپ دراوە، هەروەها لەگەڵ دەستنووسێکی تری شاعیر نەختێ جیاوازی هەیە.

(٢) مەبەستی مەلیک فەیسەڵ و عەبدولئیلای خاڵیەتی.

دایکی توند کراو له بەندیخانە
ڕۆڵە جێماوی خانەوێرانە
ڕۆڵەی باب خنکاو،دایک حەپس و دیل
کوڕووزانەوەی، هەتیوی زەلیل
بەبیری کێدا ڕانەبوورد دوێنێ
وا شەعب لە خەو زوو ڕاپەڕێنێ

***

پریاسکەی شیعری توند گرێ دراو
لە ترسی گەڕان لە کوون ئاخنراو
بیری ئازادی، وتاری نووسراو
لە کونە مشکی قوولا هەڵگیراو
وتاری جوانی تێکەڵاو بە خۆڵ
شیعری شاراوەی لە چیا و لە چۆڵ
بێنرێتە دەرێ و بخوێنرێتەوە
باسی ڕابووردوو بگێڕێتەوە
چواردەی تەمموزە و جەژنی هەژاران
بە زێڕ بینووسن لە مێژووی جیهان
ڕۆژی ئازادی عەرەب و کوردان
جمهووریەتی تیا کرا ئیعلان

***

## (١٤)ی تەمووزی ١٩٥٨

ئیمڕۆ کە چواردەیە لە تەممز جەیشی بێ ئەمان
ئازانە هاتە کایەوە وەک کێوی پڕ لە گیان
دەسیان بەجارێ دایە دەس یەکتر هەموو
جەیش و شەعب مەرامی بەمەردانە خستە ڕوو
وەک (دجلە) جەیش بەهێزی گەلی بێ حیسابەوە
بوونە شەپۆل و چوونە سەراپای ڕەحابەوە
شێرانە جەیشی داغ لەدڵ و شەعبی قارەمان
کەوتوونە خوێن ڕژاندنی میللەت فرۆشەکان
وەختێ کە پێ ئەزانێ سەگی هاری لاشە خۆر
دێتە دەرێ لە دەمییەوە کوفر و جنێوی زۆر
وای زانی کەس نییە بە نەزەر کیبریایەوە
بۆ داچڵەکاندنی دڵی ئەو بێتە کایەوە
نەیزانی ئاخری نەفەسی زوڵم و زۆرییە
چواردەی تەممز کوژاندنەوەی تیشکی خۆرییە
چی تیابوو کۆشکی گەورە، بە شا و ئیشکوزارەوە
کوژران، لە پاش ئەوە کە خەبەر کەوتە شارەوە
عالەم ڕژایە قەسرەوە، ناو ژوور و ناو تەلار
لاشەی گەماڵە گەورەکەیان خستە ناو هەزار
هەروەک سەگێکی بۆگەنی تۆپیو لە ڕێ گوزار
کەنناسەکان کە ئەیبەنە دووری کەناری شار
وا پەت خراوەتە قولە پێی ڕائەکێشرێ
ئەمری شەعب وەهایە کە نابێ بنێژرێ
لاشەی کرا بەداری سزادا بە پێکەنین
عەبدولئیلاهی زۆڵ و وەلی عەهدی نائەمین
کوژراو پارچەپارچە کرا دەست و پێ و لەشی
خوێنخوار و بێ شەرەف ئەمەیە ئاخری بەشی

نووری سەعید بە بەرگ و عەبایی ژنانەوە
کوژراو دەست و پێ و ملی لێک جیاکرانەوە
ئەو چاڵی قووڵی حیلفە کە بۆ کوردی هەڵئەکەن
خۆی کەوتە ناوی بێ سەر و پێ، بێ لەش و بەدەن
ئیعلانی حوکمی تازە بە جمهورییەت کرا
کورد و عەرەب شەریکە بەشن هەروەکو برا
نێررایە شوێن عەدالەتی مەحکوومی دەس بەسەر
هێنرایەوە خرایە سەری، ئەفسەری زەفەر
ئەو عەدڵی دەرکراوە لە دووری وڵاتەوە
چواردەی تەمموز بەخۆشی و سەربەستی هاتەوە
ویجدان و حەقپەرستی لە مەنفا گەڕانەوە
تەسلیمی دەستی حاکمی عادیل کرانەوە
ئەو کۆمەڵەی عەدالەتی خستبووە بەندەوە
گیران و دەست و پێ بە کەلەپچە و کەمەندەوە
زیندانە قووڵەکەی گەلی تیابوو بەداخەوە
جێگەی ئەوانە ئێستە بە ئۆف و بە ئاخەوە
کوێ ئارەزوو ئەکەی بچۆ سەربەست و دڵنیا
جاسووس و ترسی گرتن و لێدان و شەق نەما
ئەمجا بنوو بەبێ خەم و بێ ترس و بێ خەیاڵ
ئیتر نەما ژیانی زەلیلانە، ژینی تاڵ
خۆش مژدە بێ منیش
تا ماوە ڕۆحەکەم لە لەشا ئەم دوعایە بۆ
(عەبدولکەریم قاسم)ی باوکی هەژار ئەکەم
ڕەبی بژی بە سوودەوە بۆ خاکی نیشتمان
بۆ تۆڵە سەندنی گەلی مەزڵووم و ناتەوان[1] ١٩٥٨/٨/٨

---

(١) لەگەڵ نامیلکە چاپکراوەکە تۆزە جیاوازییەکیان هەیە. من پشتم بە دوا دەستنووسی ئەم شیعرە بەستووە کە بەر لە مردنی بەماوەیەکی کەم نووسیویەتییەوە، تەنانەت ڕێنووسەکەشی لە نامیلکە چاپکراوەکە پێشکەوتووترە.

## لەگەڵ (عەلی کەماڵ باپیر) بەیەکەوە دایانناوە

وا مــوبەدەل بوو بەخۆشی دەوری ئیـزمـیـحلالی کـورد
خـاتیـمـەی هات و نەمـا، ئەیامی ئیـستـیـزلالی کـورد
بۆ گـەیشـتن بەم دەمــە، بەم ڕۆژە بوو، ئامــالی کـورد
حەمدی بێ حەدد بوو، خودا دیم ڕۆژی ئیستیقلالی کورد
پڕ زیا و ڕەخشندە هەڵهـات کـەوکـەبی ئیـقـبـالی کـورد
قــاپی ڕەحــمــەت گــوشــادە، دەرکی زیللەت داخــرا
چونکە مــەحــمــوودێ لەســەر تەخـتی عــەدالەت دانرا
مـوژدە بێ ئەی قـەومی کـورد، نووری سەعـادەت هەڵکرا
پەردەیی تـاریـک و دەیـجــــووری مـــــەرارەت لادرا
ڕۆژی ئازادی هەڵات، ڕووناکـە ئیـسـتـیـقـبـالی کـورد
میللەتێکی وا قـەدیم، قـەومێکی مـەشهووری جیـهـان
مــالکی خــاک و وەتەن، ســاحــیــبی تەئریخ و زبان
عــەیبــە ئیــتــر خـزمــەتی خـەڵقی، لە زیللەتدا ژیان
بەسـیـە ئەی خـزمـینە بوغـز و کـینە، با یەکـدڵ بە جـان
تێـبکۆشین بۆ تەرەقی شـەوکـەت و ئیـجـلالی کـورد
نۆبەتی سەعـیـیـە، زەمـانی عـەیش و خـۆشی و شـادییـە
جــەژنی ئیــســتــیــقــلالە، ڕۆژی خـوڕەمی و ئازادییــە
قـەومی بێ ئیـدراک و بێ حس، بێ بەش و بێ قـسـمـەتە
تێــبـفکرە مــیللەتی غــەیـیـورە، ســاحــیب عــیــزەتە
ئەمــڕۆ ڕۆژی ســەعی و تێکۆشــینە، وەقــتی غــیــرەتە
یەک نەفـەس غــافڵ مـەبن، هەڵسن براگـەل فـرسـەتە
بۆ تەعــالی جــەد و جــەهدێ کــەن، زەمــانی غــیــرەتە
ڕۆژی ســەربەستی، زەمـانی عـەیش و نۆش و عـوشـرەتە
ئەی جــــوانانی وەتەن، ڕۆژی تەرەقـی مــــیللەتە
قــەومی کـورد، ئیـتــر نەجـاتی بوو لەدەس ئەم زیللەتە

هەرچی باش و چاکە بیکەی، وەقتی سەرفی هیمەتە
هەچ کەسێ[1] کۆشش نەکا، ڕاستت ئەوێ بێ مروەتە
وەقتی تێکۆشینە، ڕۆژی ئیستیقامەت، عیفەتە[2]
مەقسەدی کورد هەر تەرەقی دینی ئیسلامیەتە
سا دەخیلتان بم، زەمانی ئیتیحاد و ئولفەتە
ئەمڕۆ ڕۆژێکی بلند و گەورە و ذی قیمەتە
یار و یاوەرمان بەبێ شک ڕۆحی پاکی حەزرەتە
ڕۆژی ئازادی هەموو کوردانە، جەژنە، شادییە
جەژنی ئیستیقلالە، ئەمجا نۆبەتی ئازادییە
مورشیدان، ئەی ئەو خەلیفانەی تەریقەت دائەدەن
ئەی مەلا ئیتر لەسەر فیکری عەتالەت دەربکەن
گەر سەوابی ڕۆژی حەشرت لازمە بێ دەردی تەن
بێتەوە پڕ عەیش و پڕ شەوق و مەسەڕەت، شۆخ و شەن
بۆ تەعالی قەومی خۆتان هیمەت و غیرەت بکەن
بەسیەتی ئەی شاعیران تەعریفی خەت، چاهی ذەقەن
بەسیەتی مەئموور، ئیتر باسی مەعاشم بۆ مەکەن
بۆ وەتەن بۆ دین و میللەت، بێن نەسیحەت دابدەن
بۆ تەرەقی میللەت، ئێوە با بکەن سەرفی بەدەن
سەد شوکر لاچوو لە ئاوێنەی دلا، ڕەنگی میحنەن
بەسیەتی دەردی نیفاق و شۆڕش و[3] بوغز و فیتەن
عەیبە با ببڕێتەوە کیبر و حەسادەت (ما)و(من)
ئێوە نازانن هەموو ئەولادی ئەم شاخ و دەرەن

---

(١) لە ڕۆژنامەکەدا (هەچ کەس) نووسرابوو، من ئەوەم بەڕاست زانی بۆ ئەوەی لەنگ نەبێ.

(٢) لە ڕۆژنامەکە نووسرابوو: (ئیستیقامەت و عیفەت) کە دیارە بەم جۆرە لەنگە.

(٣) بێگومان وشەی شۆڕش لە ڕۆژی ئەمڕۆکەماندا چەمکێکی پیرۆزی وەرگرتووە نەدەبا لەگەڵ (بوغز)و (فیتەن) بەکار بهێنرایە، لەوانەشە ئەوکات مانایەکی سەلبی هەبووبێ.

ئەی جوانان، ئەی خیرەدمەندانی ساحێب عیلم و فەن
ئەی عەزیزان، ئەی نەجیبانی جگەرگۆشەی وەتەن
ڕۆژی سەعی و غیرەتە، هەنگامی کەیف و شادییە
جەژنی ئیستیقلالە، ئەمجا نۆبەتی ئازادییە[٤]

(٤) وەک دیارە ئەم شیعرە بۆ بوون بەمەلیکی (شێخ مەحموود)ی نەمر وتراوە.

## بۆ ساڵی ١٩٢٦[١]

ئەی ساڵی جیهان دیدە، ئەیا سەحنەیی میحنەت
ئەی ساڵی گوزەشتە، سەنەیی ماتەمی ئوممەت
ئەی سەحتەیی گریان و فیغان، شیوەن و زیللەت
جەللادی جگەر ئاهنی[٢] بێ شەفقەت و ڕیقەت
ئەی نازری سەد میشکی پڕژێنراوی بەقیمەت
ئەی ساڵی گوزەشتە، جگەرت لەت لەتی غەم بێ
نەتبینمەوە، مەسکەنەکەت شاری عەدەم بێ

***

سەیری کە، کە چەند[٣] لاشەیی لاوی وەتەنت دی
خۆت ورد بەرەوە، چەند[٤]سەری جیا و چەند بەدەنت دی[٥]
چەند خانەیی وێران و دڵی پڕ میحنەتت دی
چەند ناڵەیی ژن، لاشەیی بێ کەفەنت دی
برسی و ڕەش و ڕووت، غەمزەدە، چەن شۆخ و شەنت دی

(١) لە تورکیا شۆڕشێک بەسەرکردایەتی (کەمال ئەتاتورک) بەرپا بوو، ئەم شۆڕشە لە دژی داگیرکەرانی وڵات بوو، بۆ ئەم مەبەستە تورکەکان داوای یارمەتییان لە کورد کرد، تا دەستی یارمەتییان بۆ درێژ بکەن. کوردەکانیش بەدڵ و دەروونێکی پاکەوە یارمەتییان دان، بەرامبەر بەوەی کەمالییەکان لە تورکیادا دان بەمافی کورد دابنێن، دوای خۆبەخت کردنێکی زۆری کورد و تورکەکان، کەمالییەکان بەئامانج گەیشتن، بەڵام لە وەعدەکەیان پاشگەز بوونەوە و پشتیان لە کورد کرد، بگرە لەجیاتی پاداشت دانەوەیان کەوتنە قەڵاچۆکردنیان و سیاسەتی ئاگر و ئاسنیان گرتە بەر و تەفروتوونا و دەربەدەریان کردن و هەر ئەوەیان پێیان ڕەوا بینی. لە شەوی (٢٨)ی حوزەیران ساڵی ١٩٢٥ شێخ سەعید و (٤٦) هاوڕێیان لە قەراغی شاری دیار بەکر لەسێدارە دا و بوونە سووتەمەنی ئەو ڕاپەڕینەی کە بۆ ماف و ئازادی بەرپابوو. شێخ نووری-ش ئەو کارەساتە دڵتەزێنە کاری کردووەتە سەر هەست و هەستی و ئەم شیعرەی بۆ ئەم ساڵە نووسیوە، بەڵام ڕووی دەمی کردووەتە ساڵی (١٩٢٦)!

(٢) لە ڕۆژنامەی (ژین)ی ژمارە (١٦٩٤)ی ساڵی (٢٧) ٩٦٢/٧/١٢ (ئاسنی) نووسرابوو.

(٣) و (٤) هەر لە هەمان ڕۆژنامەدا (چەن) نووسرا بوو.

(٥) د. مارف خەزنەدار (لە ٩٨)ی کتێبەکەیدا کە بەزمانی ڕووسی نووسیویە ئەم دێرەی بە(چەند سەری چیا و چەند دەوەنت دی) خوێندووەتەوە.

ئەی سـالّی گـوزەشـتـە، جگەرت لەت لەتی غـەم بێ
نەتبـینمـەوە، مـەسکەنەکـەت شـاری عـەدەم بێ

***

تێـفکرە کـە ئەم سێ سـەد و شـەست ڕۆژ و کـسـوورە
هەر سـانیـیـەیەکی غـەم و ئالام و فـتـوورە
ڕۆیشـتنەکـەت تا بەقـەدەم عـەیب و قـسـوورە
بەم خـوێنە ڕژاوانە و بەم شـوور و نشـوورە
سەفحەی هەموو تەئریخی جیـهان، مـاتەم و سوورە
ئەی سـالّی گـوزەشـتـە، جگەرت لەت لەتی غـەم بێ
نەتبـینمـەوە مـەسکەنەکـەت شـاری عـەدەم بێ

***

ئەم زولّمـە کـە دی مـیللەتی ئەم کـوردە لە تورکـان
نەیدیوە زەمـانە چ لە ئینس و چ لە شـەیتـان
دەعـوایی حەقی مـیللەتیـیەت و گـۆشـەیی زیندان؟!
پـاڕانـەوە بـۆ ژیـن و تـەنـافـی مـل و خـنـکـان؟!
هـاواری وەتەن کـردن و کـوژران و فـڕێدان؟!
ئەی سـالّی گـوزەشـتـە، جگەرت لەت لەتی غـەم بێ
نەتبـینمـەوە، مـەسکەنەکـەت شـاری عـەدەم بێ

***

ڕۆیشـتی لە دوای تۆ، جگەری پارە بەجێ مـا
ملیـۆنێ عـیـال و ژنی ئاوارە بەجێ مـا
چەند عـائیلەی بێکەس و بێ چارە بەجێ مـا
زنجـیـر و کـەلەپچـە و پەتی سـیدارە بەجێ مـا
ملیـارێ دلّی خـەسـتـەو و غـەمـخـوارە بەجێ مـا
ئەی سـالّی گـوزەشـتـە، جگەرت لەت لەتی غـەم بێ
نەتبـینمـەوە، مـەسکەنەکـەت شـاری عـەدەم بێ

***

ئەی ســـالی جـــەدید، هاتنی تۆ دوور بێ لە ئافـــات
تۆش وەک خـەلەفت، ئەو بەجـەزا، تۆ بەمـــوکـافـــات
خـــێـــر بێ قـــەدەمی تۆ بەتەلافی هەمـــوو مـــافـــات
شـــەرتم ئەمـــەیە تا دەمی مـەحـشـــەر بە مـەقـامـات
ئەم شـــیـعـــرە ئەکـــەم[٦] من بە تەمـــەننا و مـوناجـات
ئەی ســـالی گـوزەشـــتـــە، جگەرت لەت لەتی غـــەم بێ
نەتبـــینمـــەوە، مـــەسکەنەکـــەت شـــاری عـــەدەم بێ[٧]

(٦) لە دەستنووسێکی تردا نووسرابوو (بکەم).
(٧) لەلایەن مامەند کەرکووکییەوە وەلامی ئەو شیعرە دراوەتەوە. بڕوانە گۆڤاری زاری کرمانجی ژمارە (٨)ی سالی ١٩٢٧ ل ١٢.

# ئەمشەو بوو لە خەوا

ئەمـــشـــەو بوو لە خـــەوا من بەدیهی وەتەنم دی
زۆر جوان و بەشووش و فەرەح و شۆخ و شەنم دی
مـەسـروور و تەڕ و تازە وو خـونچـە و دەهەنم دی
خـۆش عـیـشـوە وەكـو ئاهووی چین و خـوتەنم دی
پرسـیم چییـە ئەم خۆشی و ئەم زەوق و سـەفـایەت
ئەم شـادی و شـەوق و تەرەبی بێ حـەد و غـایەت
فەرمووی كـە لەمەوپێش منی بێچارە ئەسیر بووم
بەینێ بوو بەدەس جەور و جەفای توركەوە پیر بووم
بێ مـایە و بێ سـەروەت و بێ حـاڵ و فەقـیـر بووم
مـەبهـووت و پەرێشـان و خـەفـەتبـار و زویـر بووم
ئێستاكە خەلاس بووم لە جەفا و وەحشەتی توركان
ئازادم و خـۆش وەقت، وەكـو خـونچـەیی خـەندان
ئەوسا كە وسائیط لە عیراقی هەموو هەر كەر بوو
«لۆكس» نەبوو ناویشی قـوتووی نەوت و فەنەر بوو
ئەم خـەڵكە هەمـوو دەربەدەر و خـەسـتـە جگەر بوو
بێ مەعریفەت و سەنعەت و بێ عیلم و هونەر بوو
ئێــســتــاكـە تەیارە هەیە جـا من لە كـەرم چی؟
من تـازە لە تـوركی قــــەبە و بێ هـونەرم چی؟
قــابیـل نیـیـــە دەرچێ لە دڵ ئەو جـــەور و ئەذایە
ئەو غــــارەت و بردنی مــــاڵ و كــــەر و گــــایە
ئەو بێ مـەزهەبی و كـافـری ئیـسـلامی نەمـایە
بێ ڕەحـمی ئەو قـەومـە كـە دەرچوو بوو لە غـایە
چۆن تازە فـەرامـۆشی ئەكـا كـوردی عـیـراقی
زوڵم و سـتـەمی تورك و جەفا و جەور و نیـفـاقی

## ئینتیباه(١)

**دلاوەران:**

ئەولادی وەتەن ئێمە کەوا میللەتی کوردین
بۆ غایەیی ئاسایشی میللەت هەموو گوردین
شێرانە ئەوا مەعرەکە ئارایی وەغا بووین
بۆ ڕشتنی خوێناوی عەدوو حازری ڕا(*) بووین
لە پێشمانەوە هەروا، بەیداخی ظەفەر ئەڕوا
ڕیشەیی عەدوو با دەربێنین، حەق بە دەستی خۆمان بستێنین
بۆ نەمانی مەزالیم، سوارانی جەنگی
تەپڵی بازیان لێدا بە شۆخ و شەنگی

**باوک:**

لەم وەزعە گەر ئەی دوشمنی کورد ئێوە ئەپرسن
ئەم هەمهەمەیە میللەتە هەڵساوە بترسن
کفن بۆ خۆتان ببڕن، هەر لە ئێستاوە بمرن
لازمە لەبەر غەم و حەسرەت، ببن ئەشک ڕێژی مەزەللەت
ئەی دلاوەرانی وەتەن، وەرنە ئیمداد
باوک بە پەرۆش لێتان ئەکا ئیستیمداد
کوردانی غەضەنفەر شکەنی مەعرەکە ئاغووش
نابێ بکەن ئەم باوکی خۆتانە فەراموش
زێرا کە دوو چاوی ئەبەدیی ئێمە لە گۆڕا
چاوی ظەفەرتانە لە حەرب و شەڕ و شۆڕا

---

(١) دەقی ئەم ئۆپەرێتە بۆ یەکەم جار لە ساڵی (١٩٢٥) لە نامیلکەی (گۆرانی کوردی)دا بلاو کراوەتەوە، من هەر ئەو دەقەم بە ئەسڵ زانی و لێرەدا نووسیمەوە.

(*) لە دەقی ئەو تێکستەدا کە لە ساڵی (٩٢٥)دا چاپ کراوە نووسراوە (ڕاھ).

باوک بە قوربانتان بێ، ڕۆحەکەی فیداتان بێ
وەختی فرسەت و ئیتیفاقە، ڕۆژی لابردنی نیفاقە
ئارەزوو ئەکەم ئێوە، وەقتی ئیحتیضار
بەشان و ظەفەرەوە، بمبەن بۆ مەزار

**دایک:**

بۆ دەفعی مەزالیم لە مەوانیع مەکە پەرهێز
سا دەس بەرە شیر و تفەنگ و خەنجەری خونرێز
بۆ ئێوە کەوا غیرەتە، یەکدەفعە ڕەگ و ئێسک
حاشا کە بە حوزنێکی زەلیلانەوە فرمێسک
لە چاوم بێت و بتکێ دڵم یەک زەڕڕە بشکێ
چونکە ئێوە جەسوور ئەبینم، نامێنێ ئازاری برینم
شیرەکەم حەڵاڵتان بێ، ڕۆژی هیمەتە
ڕۆحەکەم فیداتان بێ، وەقتی غیرەتە(٢)

**منالەکان:**

نەجمەی ئەمەلی ئێمە هەموو بەم دەس و بردە
خەڵقینە لە بۆ مەسعەدەتی میللەتی کوردە
مەوتێ کە حەیاتی وەتەنێکی لە دووا بێ
سەد ژینی زەلیلانەیی یارەب بەفیدا بێ
ئەو کەسانە جەبانن، مەعنای ژیان نازانن
مردنێ لە ڕێگای میللەتا، چاکترە لە ژین لە زیللەتا
هەرکەسێ خۆی بکا بە قوربانی میللەت
لە قەبرا هەتا مەحشەر، ناکێشێ زیللەت

**ئافرەت بەمنالەوە:**

یاران و ڕەفیقان و دلێر و یەلی کوردان
شەڕ جەژنی هەموومانە بڕۆین بۆ سەفی مەیدان

---

(٢) لە (گۆرانی کوردی و مەریوانی)دا ئەم بەشە نەنووسراوە.

وەقتێ کە بەتەوفیق و ظەفەر دێنەوە لامان
ئەوسا گوڵ ئەکەین ئێمە بە شاباشی قدوومتان
گەر لە ئێوە چەند کەس شەهید بێ،
لازمە عەزای ئێمە عید بێ
ئەم پڵنگ بەچانەی وا ئینتیقام سێنن
گەورەیان ئەکەین ئێمە، حەقتان ئەسێنن

**کچەکان:**

ئێمە کە ئەمان کردووە بۆنی چەمەنی شوو
مەجهوولی ئەزەرمانە گوڵ و ئەستەرەنی شوو
ئەم تازە جوانانە لەبەر سیرەتی ئێمە
گەر بێتو بکەن ئارەزووی شیرکەتی ئێمە
لازمە کە دەعوەت بفەرموون، بێنەوە بەڕوویەکی گوڵگوون
یەعنی چیهرە ڕەنگین بن بەشان و ظەفەر
خوێنی دوژمن بڕژێنن بەنووکی خەنجەر

**چەک بەدەستەکان:**

ئێمە کە موسەللەح لەدەر و دەشت و لە شارین
سوێن خۆری حوزووری حەق و باب و کەس و کارین
بۆ مەسعەدەتی ئەم وەتەن و میللەتی کوردە
ڕیشە و ڕەگی زاڵم ببڕین بەم دەس و بردە
تاکەی لە زەحمەتا بین، لەناو مەزەللەتا بین
لازمە بەکەیف و مەسەڕڕەت، ڕۆح بکەین بەقوربانی میللەت
زاتەن ئێمە خوڵقاوین بۆ خزمەت کردن
بۆ ئەوەی فیداکار بین تا ڕۆژی مردن

# عیلمه[1] میللەت

عـیلمـه مـیللەت نائیلی جـاهو شکۆهو شـان ئەکـا[2]
دایەیی پاکی وەتەن، پڕ نەشـئـەو و خـەندان ئەکـا
واسـیـتـەی عـیلمـه بەشـەر ئەمـڕۆکـه مـانەندی تیـوور
وا بەسـەر ئەوجی سـەمـاوه سـەیر ئەکـا و تەیران ئەکـا
واسـیـتـەی عـیلمـه کـه ئەمـڕۆ هەروەکـو مـاسی، بەشـەر
کـەشـفی قـەعـری بیکرانی، بەحـری بێ پایان ئەکـا
واسـیـتـەی عـیلمـه کـه (قـولومب)[3] ناوی دایم زیندووه
واسیتەی عیلمه که (واسقۆ)[4] کەشفی هیندستان ئەکا
واسیتەی عیلمه کە(پێنجوێنی)و[5](زەهاوی)و[6](مەولەوی)
ناوی پاک و عـالیـیـان ئیـحـیـای کـوردسـتـان ئەکـا
(أطلب العلم ولو بالصین)ە فـەرمـوودەی ڕەسـوولّ
ئەم حـەدیسـه بۆ عـیلم، تەرغـیـبی ئینس و جـان ئەکـا

لەگەڵ (عەلی کەمال) بەیەکەوە دایانناوە

---

(١) بەدەستنووسی شاعیر (عیلمت)یش هەیە.

(٢) لە گۆرانی کوردی و مەریوانی ل٥ وەرگیراوە. لەسەر وەزنی (ئەی وەتەن) دەگوترێ.

(٣) قـولومب: لە زمـانی تورکـدا بە(کـۆڵۆمـبس)یان وتووە (قـولومب) کـە (کـریسـتـۆف کـۆڵۆمـبس)ی دۆزەرەوەی ئەمریکایە و بەئەمریکاشیان وتووە (ئەمریقا).

(٤) (واسقۆ)ش مەبەستی (فاسکۆدیگاما)یە.

(٥) مەبەست لە مەلا عەبدولڕەحمانی پێنجوێنییە، قوتابی مەلا ئەحمەدی نۆدشی بووە و زانایەکی ئاینی گەورە و بەناوبانگی سەردەمی خۆیەتی. کە کوڕی مەلا محەممەدە، خەڵکی دێی (شێخ ماردینی) سەر بەقـەزای شـاربـاژێڕە، لە سـاڵی ١٢٤٤کـۆچی لە دایک بووە و هەر لەوێش خـوێندوویەتی، پاشـان لە سلێمـانی خوێندوویە، پاش تەواوکردنی خوێندن و ئیجازە وەرگرتن لە (مەلا عـەلی قزڵجی)چووەتە پێنجوێن و لەوێ نیشـتـەجێ بووە، زۆربەی کـاتی خـۆی بەدەرز وتنەوە و مـوتاڵا کـردن بەسـەر دەبرد. حاشییەی زۆری نووسیوە، لە ساڵی ١٣١٨کۆچی، کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە تاريخ السليمانية محمد أمين زكي، نقله الى العربية: الملا جميل الملا أحمد الروزبياني، سنة ١٩٥١ ل٢٦٢.

(٦) مەبەستی لە موفتی زەهاوییە.

## ئێمە کەششافەی کوردین

ئێــمــە کــەشــشــافــەی کــوردین هەمــوو[1]
خــادیمی ملک و[2] وەتەنین ڕوو بەڕوو
بۆ هەمـوو جەمعـیـیـەتی زانسـتی کورد
حــازری جــەهدین بەدڵ و دەست و برد
چونکە مــەداری شــەرەفی مــیللەتن
خــــادیمی عــــیلم و ئەدەبی ئوممەتن
ڕۆحی وەتەن موفـتـەخـیـرە و شـادمـان
ڕوو بەڕووی ئەم خزمەتە و ئەم هەوڵەتان
مــیللەتی کــورد پڕ بە ســەمــاو و زەمین
دەم بەگـــوڵی زەردەخـــەنە و پێکەنین
قــیــمــەتی ئەم خـزمـەتە، تەقـدیر ئەکـا
سـەفـحـەیی تەئریخ ئەمـە تەسـویر ئەکـا

---

(١) لە ل(٢٠)ی گۆرانی کوردی و مەریوانی وەرگیراوە و لەسەر وەزنی (یا علم الامة) دەگوترێ.
(٢) ئەم وشەیە بە (مەلیک)یش دەخوێندرێتەوە.

## لە تەوصیف چاپخانە وتراوە[1]

ئەم مــوژدە خــۆشــە، خــەو بووە، یا گــوێم زڕایەوە
یـا ڕاســـــتـــــە پەردەیی تـەڕەبە، هەڵدرایـەوە
یا نەجــمی تەرەقی کــوردە، تلــووعی کـــرد
یا نـووری مـــەعـــریفـــەت، لە وڵاتا پڕایەوە
ناگـــاه، نیـــدا لە غــەیبــەوە هات و وتی: بەڵێ
پێــشکەوتنە لە مـــەملەکـــەتا دەنگی دایەوە
پێشکەوتنی ســەعــادەتی کــورد، هاتنت بەخــێـر
غــونچــەی دڵم، بەبۆنی نەســیــمت گــەشـایەوە
لەو ســاوە من کــە هاتنی تۆم بیـســتـووە ئەڵێم
ئۆخــەی شــوکــر، چراغی جــەهالەت کــوژایەوە
تۆی باعــیـسی ســەعــادەتی کــوردە فــەقــیـرەکـان
دەرگــای مـەعـریفـەت، کـە بەدەسـتی تۆ کـرایەوە
مـیـعـادی سـەعـییـە، فرسـەتە، تا وەختی سنعـەتە
فـــیــــشـــاڵ و تڕ زلی بەســـە ئیـســتـــر بڕایەوە
با دەست بکەین، بەسنعەت و تەحسیلی مەعریفەت
با زوو بگەینە پێــشــەوە، بەشــمــان نەمــایەوە
وا تێ مـەگەن، کە مـەتبـەعـە بێ قـەدر و قـیـمـەتە
کـــارێزی عـــیلم و مـــەعـــریفـــەتی پێ ژیایەوە
شـــوکـری خــودا، کــەوتینە ژێر ســێــبــەری عــیلم
(بی)ی بێ بەری جـــەهل، لق و پۆپی شکایەوە

(١) شێخ نووری هەستی بەگرنگی بوونی چاپخانەیەک کردووە بۆ دەرکردنی ڕۆژنامە و بڵاوکردنەوەی بیر و پەخشکردنی ئامانجی میللەتێک بۆ مەبەستی (تەرەقی و تەعالی)، بۆیە بێجگە لەم شیعرەش وتارێکی تری لە ڕۆژنامەی (بانگی کوردستان)ی ژمارە (٣)ی ساڵی (١)و لاپەڕە (٣) بەناوی (ماکینەی چاپ)ەوە بڵاوکردۆتەوە و تێیدا دەڵێت: (هەر میللەتێک مالیکی غەزەتەیەکی خۆی بێ بۆ تەرەقی و تەعالی، میللەتەکی هەر غایە و ئەمەلێک تەعقیب بکا، ئەتوانێ بەدەنگێکی بەرز و بڵند بیگەیەنێتە گوێی ئەو کەسانەی کە گوێگر و خادیمی مەعاریف و میللەتن)!.

بنواڕه نووری مــهعــریفــهت و لهمــعــهی کــهمــال
بهم مــهتبهعــهی حکوومــهته[٢]، چۆن شــهوقی دایهوه

(٢) مهطبـهعـهی حکوومـهت : ئهو چاپخانهیهی مـهبهسته کـه له سهرهتاوه، واته له سـالّی ١٩٢٠ بهو ناوهوه (مێجهرسۆن) ڕۆژنامهی (پێشکهوتنی) پێ دهرکرد. دوایی درا بهشارهوانی سلێمانی و ناوی لێنرا چاپخانهی (شارهوانی - بلدیة). ههر ئهم چاپخانهیه ڕۆژنامهی (ژیانهوه) و (ژیان)ی پێ بڵاو و پهخش دهکرا و کۆمهڵێ نامیلکه و سیپارهی کوردیشی پێ له چاپ درا.

## وەرە بادی سەبا، تۆ قاسیدی من بە بە مەردانە

وەرە بادی سـەبا ، تۆ قـاسـیـدی من بە بەمـەدانە
لە پاش عـەرزی دوعـا گـوێیی، بڵێ بەم ئەهلی کـوردانە
لە بۆ ئینشـائ مەکـتـەب، سەرفی غـیـرەت لازمـە زینهـار
کە مـەکـتـەب مـایەیی ژینە، کە مـەکـتـەب ڕۆحی ئینسـانە
کە مـیللەت هیچ نەزانێ زوو بەزوو پێشکەوتنی سەعـبـە
کە قەومێ ساحیبی سنعەت نەبێ، وەک جیسمی بێ جانە
کـەسێ عـیلمی ببێ مـوسـتـەقـبـەلی ڕووناک و تەئمـینە
کـەسێ سنعـەت بزانێ، دائیـمـەن ئەو سـاحـیـبی نانە
لەسەر ئەم عـالەمـە فەرزە، ئیـعـانەی مـەکـتـەب و سنعـەت
کە ڕۆحی موڵک و میللەت، سنعەت و تەحسیلی عیرفانە
ئەوی دەرحەق بە مەکتەب[1]نوتقی نووسیبوو[2]لەمەو پێشتر
حەقـیـقـەت سـاحبی فـیکرە، حـەقـیـقـەت ئەهلی ویجدانە
وجـوودی فـەخـرە بۆ مـیللەت، کـەسێ فـیـکری مـونەوەر بێ
کـەسێ عـیلمی نەبێ وەک وەحـشـیی کـێـو و بیـابانە
قـسـەی ڕاسـتت ئەوێ وەڵلا ئەگـەر بیـشم کـوژن دەیڵـێم
نەبوونی عـیلم و سنعـاتە، کـە مـیـقـرۆبی هەمـوومـانە

(١) لە دەستنووسێکی دیکەدا (صنعەت) نووسرا بوو.

(٢) جاران بەخوتبە وتراوە (نوتق). نوتق نووسین و نوتقی نووسراو.

## بۆ معەلیمەکان

به ئینســاف و مــرووەت تەربیــەی ڕۆڵەی وڵاتت کــە
کــە ڕۆژی کــردەوە، خــاوەن زەمــیــر و با کــەرامــەت بێ
ئەوانن دائەنێن بنچــینەی ئیــخــلاس و عــەدل و حــەق
ئەوانن هەوڵ ئەدەن، ئەم قەومە ڕۆژێ سواری قودرەت بێ
مــوعلیم بێــتــوو چاوی خــۆی بپــۆشــێت و لە حــەق لادا
قــوتابی ئەو ئەبێ هەر نالەبار و بێ بەســـیــرەت بێ
مــوعــەلیم دەرس و ئیــرشــادی بەرەو ڕێگەی خــراپی بێ
ئەبێ ڕێبــــواری ئەم ڕێگایە، قــــۆناغی نەدامـــەت بێ
لەشی قــەومێ، بەتیــری جەهل ئەگــەر بێــتوو بریندار بێ
ئەبێ ئەم قەومــە جێگەی هەر مەزارســتــانی زیللەت بێ
لە دڵگیری ئەم و ئەو ترس و خۆفت قەت نەبێ (نووری)
قسەی حەق با ڕەقیش بێ خۆشە، ئەمما بۆ نەسیحەت بێ[١]

سلێمانی ٢٠/١١/١٩٥٥

(١) شێخ نووری وەک مونەوەرێکی سەردەمی خۆی ویستوویەتی بە «هۆنراوە - نظم» هەندێ بیروڕای ڕووناک لە لای خەڵک بچەسپێنێ. یەکێک لەو بوارانەی کە چەکی هۆنراوەی بۆ خستووەتە کار مەسەلەی خوێندن و خوێندەوارییە و هاندانی خەڵکە بۆ خوێندن و ڕزگار کردنیانە لە تاریکستانی جەهالەت و نەخوێندەواری. ئەمەش شتێک نەبووە وەک مژدەیەکی باو بڕوای پێ هێنا بێ، بەڵکو وەک دڵسۆزێک بۆی چووەتە مەیدان. هانی ئافرەتانی داوە بەتایبەتی خزم و کەسوکار و ناسیاوەکانی خۆی بۆ خوێندن. یەکێ لەو وێنانە هاندانی (فاتمە محیەددین)ی خزمێتی.
ئەوەتا (فاتمەخان) بەدەمی خۆی دان بەو ڕاستییەدا دەنێ و لەم ڕووەوە دەڵێت: (پەردەیەکی تری ژیانی فاتمە کە تا مردن شانازی پێوە دەکات ئەوەیە کە یەکەم ئافرەتی کوردی عێراقە بووە بەمامۆستا و(٢٥) ساڵی ڕەبەقی ژیانی بە ئەوپەڕی دڵسۆزییەوە بۆ پەروەردە کردنی صەدان کچ وەک کۆرپەی جگەرگۆشەی خۆی تەرخان کرد. بەدەست ئەو بوایە هەموو کچە کوردی فێری نووسین و خوێندنەوە دەکرد. ئەو پەردەیەی ژیانی پڕ لە بەسەرهات و سەرگوزەشتەی سەیر و پڕ مانایە، وابزانم لاپەڕەکانی یەکەمی زۆر شایانی تۆمارن. ئێستەش لەو وایە ئەمرۆیە کە خوا لێخۆشبوو شێخ نووری شێخ ساڵحی شاعیر و خزمی، خۆی کرد بەڕۆوراو لە هەموو جاران گەرمتر لەگەڵی کەوتە قسە. قەت وای =

= نەدیبوو. لەوەی دەکرد بۆ کارێک هاتووە زۆری مەبەستە. کەوتە باسی خوێندن و خوێندەواری و پیاهەڵدانی (فاتمە) کە دنیا دیدەیە و دەتوانێت ڕێگە نیشانی کەسانی تر بدات، گەلێکیش مەدح و سەنای ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگی کرد و وتی زۆر حەز بەپێشکەوتنی کورد دەکات.
دوای ئەوەی شێخی شاعیر شانامەیەکی دوورودرێژی بەقسە و لەبزی شیرینی بۆ فاتمەی ژن خوشکی دەخوێنێتەوە، دێتە سەر مەبەست: «ئەحمەد بەگ نیازییە قوتابخانەیەکی کچان لە سلێمانی بکاتەوە و لە گوزیدە خانی ژنی عەبدولعەزیز یامولکی و تۆ زیاتر کەس شک نابات پەنایان بۆ بەرێت. تەزوویەک بە لەشمدا هات و کەوتمە دەریای خەیاڵەوە... ڕاستە خوێندن شتێکی چاکە باوکم هەر زوو زوو ئەوەی بەگوێمدا دەخوێند و خۆشم لە خێر و چاکە بەولاوە هیچی ترم لە خوێندن دەسگیر نەبوو، بەڵام ئاخۆ خەڵکی شار چیمان پێ بڵێن؟! لەسەرخۆ لەگەڵ شێخ نووری کەوتمە هەڵسەنگاندنی مەسەلەکە... ڕاستییەکەی هەرچەندم دەکۆشا زاتم نەکرد بەڵێنی ڕازی بوونی بدەمێ. بەڵام ئەو کۆڵی نەدا، کەوتەوە هاندانم، دەیزانی خواپەرستم بۆیە زووزوو ئایەت و حەدیسی تێهەڵکێشی قسەکانی دەکرد. بەهەشتی بەحۆرییەوە بۆ مسۆگەر کردم. وردەوردە نەرم بووم و گفتم دا، بەو جۆرە وەک بیرم بێت، ساڵی ١٩٢٦ دەرگای قوتابخانەی کچان لە سلێمانی کرایەوە، ئەحمەد بەگ بەناوی منەوە قوتابخانەکەی ناو نا «الزهراء» کە لەناو خەڵکدا (زەهرا)یان پێ دەگوت. شوێنەکەی نزیک مزگەوتی گەورە بوو. ئێستەش قوتابخانەی گوڵاڵەی کچانی تێدایە) بڕوانە گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (٧٣)، ئاداری ١٩٧٩، د. کەمال مەزهەر ئەحمەد وتارێک بەناوونیشانی: (فاتمە محیەددین پەریی پێشڕەو و سەربازی نەناسراو). هەروەها دوو کاسێت گفتوگۆی خۆم لەگەڵ (فاتمە محیەددین) کە هەمان ئەو زانیارییانەی تێدا دووبارە کردووەتەوە.

## تەخمیس لەسەر غەزەلی عیسمەت بوخارا[1]

لەسەر تەکلیفی خۆشەویستێک

هەولێر ٢/١٠/١٩٣٨

موتەفەکر لە جیهان، گۆشەنشین، مات و خەمۆش
لە پڕا یادی نیگارێ، دڵی هێنامە خرۆش
هەروەکو پیری موغان، مەست و سەبوویی بەردووش
(سرخوش از کوی خرابات گذر کردم دوش
بەطلبکار ترسا بچە بادە فروش)

***

وردە وردە سەری ڕێم گرتبوو وەک هوشیارێ
بەتەمەننای ویسالی لەبی شەککەر بارێ
من لە فیکری ئەوەدا بووم کە بپرسم یارێ
(پیشم آمد بەسر کوچە پری روخساری
کافرانە شکن زلف چو زنار بدوش)

***

وەکو بەدرێ کە لەژێر هەوری ڕەشا بێ لە پڕا
بەسەری پەنجە لەسەر عاریزی، زوڵفی لادا
کە ئەمەم دی بەتەئەنی و بەبێ ترس و ڕیا
(گفتم این کوی چەکویست تراخانە کجا
ای مە نوخم ابروی ترا حلقە بە گوش)

***

(١) (عیسمەت بوخارا) ئەوەی کە (مێژووی ئەدەبیاتی ئێران) جلدی سێیەم چاپی دووەم ساڵی ١٩٦٠ لە لاپەڕە (٤٧٠) دەربارەی ئەم شاعیرە نووسیبێتی تەنیا ئەوەندەیە: (مامۆستای بیساطی و خەیاڵی بووەو هاوچەرخی ڕۆستەم حوزییانی و تاهیر ئەبیوەردی و برندق بوخارائی بووە. لە ساڵی (١٨٢٩) کۆچی دوایی کردووە).

وتی زانیــومــه به تای زوڵفی ســیــاهی پابەند
وتم ئەی دیده کــەوایه بەســه زوڵمــەت تا چەند
چیــیه بۆ ئێوه عــیــبادەت، چیــیه ئاییـنی پەسـەند
(گــفت تســبــیــح به خــاک افکن و زنار ببند
سنگ بەر شـیـشـەی تقـوی زن و پیـمـانه بنوش)

***

گــۆشــەیه بگره له ســەرچاوەیی ئاو و چەمــەنێ
دەست لەمل (مول) که، بەیادی سەنەمێ یا سەمەنێ
نەختێ هەمـدەم به لەگەڵ بلبلی شەککەر شەکـەنێ
(بعــد ازین پیش من آ، تا به تو گــویم ســخنی
راه پیــمـــــای اگــــر با ســــخنم داری هوش)

***

من گـەلێ مـامـەوه غـافڵ له حـەقـیـقـەت، دڵڕێش
ڕووی ڕەشم دایه دەسـتی ڕیشی سـپی وەک دەروێش
بۆ ئەوەی فـەرقی بکەم سـوورەتی بێگانه له خـوێش
(ترک هـوش دل و جــــان کــــرده دویدم از پیش
تا رسـیـدم به مـقـامی کـه نەدین مـاندو نه هوش)

***

له غــەمـا نەخــتێ سـەرم نایەوه بێـخـود له وجـوود
کــەوتمه بەحــری خــەیالاتی حــەیاتی بێ ســوود
کــه ســەرم هەڵـبـڕی، ڕوانیم له پڕێکا وەکــو دوود
(مــحــو گــشت از ورق کــون و مکان نقش وجــود
نەپری مــــاندو نه آدم نه طیـــور و نه وحـــوش)

***

چ بوو ئەم حــاڵه کــەوا دەرگــەهی ڕووناکی بەست
نه زەمین و نه ســەمــا مــا، نه بلەندی و نه پەست

من سەراسیمە، کە ئاخۆ ئەمە بێ ڕۆژی (الست)[٢]
(دیدم از دور گــــروهی همــــه دیوانه و مــــست
از می باده عــشق آمـــده در جــوش و خــروش)

***

چ بوو گرووهێ هەموو سەرخۆشی مەیە، دوور لە (صداع)
یەکێ مـەشـغـوولی بەخـێـر هاتنی یاران و (وداع)
یەکێ سەرمەستی مودارا، یەکێ بەدمەستی (نزاع)
(بی دف و چنگ و مـغنی همـه در رقص و سـماع
بی می و جـام و صـراحی همــه در نوشـا نوش)

***

این چـو دیدم مـن ازیـن و مـکان در رســــــتم
جـام سـر شـاری، می عـشق چنان کـرد مـسـتم
بی مــحـــابا نظر کــرده، ز جــا بر جــســتم
(چونکه ســر رشـتــەی نامــوس برفت از دسـتم
خـواسـتم تا سـخنی پرسم از و گـفت خـمـوش)

***

ئەمـە جێی ڕاستی و سدقە، نەوەک لاف و گەزاف
دڵی ئاوێنە سـیـفـاتێکی ئەوێ بێ غـەش و سـاف
بڕۆ ئەی سەر زەدە، تۆزێ بە ئەدەب بە، بە عـەفـاف
(این نه کـعـبه است کـه بی پاو سـر آیی به طواف
یانه مـسـجـد کـه در او بی ادب آیی به خـروش)

***

هان گـذر کن کـه چه سـان جـا و چه سـان یاران‌ند
چه دواخـانه، چه سـان خـســتـه و بیـمـاران‌ند

(٢) الست: ئەو ڕۆژەی کە خوا دنیای دروست کردووە لە ئەرواحی خەڵکی پرسی (ألست بربکم: قالوا بلی).

گـر ندانی کـه چه سـان جـان و چه سـان جـانانند
(این خـرابات مـغـان است در او مـسـتـانند
از دم صـبح ازل تا به قـیـامت مـدهوش).

***

(نووری) لەم مەسلەکەدا نەختێ ئەگەر یەکڕەنگی
بەسییە نافامی و بەسییە حەزەر و بێدەنگی
فائیدەی هیچ نییە گریان و خەم و دڵتەنگی
(گـر ترا هست در این شـیوه سـری همـرنگی
دین و دنیا به یکی جرعه چو (عصمت) بفروش)

## ئاوڕێک بۆ دوواوە[1]

### بۆ ساڵی ١٩٣٤

ئەی (ژیان)، ئەی ئەمەلی تائیفەی پیر و جوان!
ئەی بەبێ تۆ، شەوی دەیجووره هەموو ڕۆژی ژیان
هیچ مەوەستە لە دەسا تا دەگەیە (زەردیاوا)[2]
ئەم دوو سێ شیعره بەدیاری بەرە خزمەتی (گۆران)
بڵێ: ئەی نازری ئەو دیمەنە جوانەی قەرەداغ[3]
دوور لە دەرد و لە پەژارە، لە خەم و میحنەت و ئاخ!
باوکم ئەو وەختە ئەدیبێ بوو لە ڕیزەی ئودەبا
مەلەوانێکی بەقودرەت بوو لە دەریای ئەدەبا
ئەو دەمە شیعری دەووت، هۆش و شعوورێکی هەبوو
سەر و دڵخۆش و ڕەحەت، کەیف و سروورێکی هەبوو
ئێستە کۆماوەتەوە پشتی بەسەر جەدوەلدا
قسمەتی خۆی ئەمە بوو، هەر لە دەمی ئەوەلدا
ڕۆژ و شەو فیکری بەنووسینی حیساباتەوەیە
شەو و ڕۆژ زیکری بەتەسدیدی ئەماناتەوەیە

---

(١) ئەم شیعره لە (شێخ نووری)یەوە بۆ (گۆران) بەزمانی (جەناب)ی کوڕییەوە وتراوە، وەڵامی ئەو نووسینەیە کە مامۆستا گۆران لە ڕۆژنامەی ژیاندا ژمارە (٤١١)ی ڕۆژی ١٩٣٤/٩/١٥ بەناوی (مێشۆ)وە بڵاوی کردووەتەوە. دیسان مامۆستا (گۆران)یش بەشیعرێک وەڵامی داوەتەوە و لە ڕۆژنامەی ژیان، ژمارە (٤١٦) ساڵی (٩)، (٢٠)ی تشرینی یەکەم (١٩٣٤)دا بڵاوکراوەتەوە، هەروەها لە لاپەڕە (١٢٢)ی دیوانی گۆران - سەرجەمی شیعرەکانیدا بڵاوکراوەتەوە.

(٢) زەردیاوا: کەوتووەتە خوارووی سلێمانییەوە، لە نێوان شاخی دارمازەڵە و قۆپییە. مەڵبەندی ناحیەی قەرەداغە، دەکەوێتە ناوەڕاستی ناحیەکەوە، بەڵام ناوی قەرەداغ-ی بەسەردا سەپێنراوە و بەرە بەرە زەردیاوا پشتگوێ خراوە.

(٣) ئیشارەتە بەگەشتی قەرەداغی مامۆستا (گۆران).

شیـعری بیکری بووەتە تەسفـیـیەی تەسلیـفات
وێرد و زیکری بووە بە تەحـشـیـەی تەحـویلات
جـەدوەلی مـولحـەق و تەسـوییـەی ئاو ئازاری
بووەتە قـافـیـە و مـیـسـرەعی مـەعنیـداری

## له هەولێر بە لەتیفە

## بۆ ڕەفیقێکم نووسیوە کە لە خارج بووە[١]

دەری مەیخانە بەسراوە، دڵی پیرانی گیراوە
تەڕەب وا قوڕ بەسەر خۆیا ئەکات و جەرگی سووتاوە
لە قەلبی شووشەدا عارەق نەما، یەکدەفعە خوێناوە
سوراحی دیدەیی وا کوێر ئەبێ بۆت هێندە گریاوە
ئەوەندە چاوەڕێی تۆن کۆمەڵی مەوجوودی مەیخانە
ملی مینا شکا هێنند ئاوڕی لێ داوە بەو لاوە
دڵی پڕیە لە خەم پیری موغان، قامەت خەم و خەمبار
لە پای کوپەی خوما[٢]، بێ چارە سەرتاپای لە خوم ناوە
بەئەترافی ئەویشا زانیرانی سەحنی مەیخانە
یەکێ شەیدا و شێواوە، یەکێ مەبهووت و داماوە
لە تەپڵی سەر ئەدەن، هاوار ئەکەن بەم جەژنە ئازادە
سەمای سافی ئەم مەیخانەیە، بۆ ڕۆژی گیراوە؟
هەوێنی شیری شێرانی تەڕەب، ئەی ماکی دڵخۆشی
لە دووری تۆیە (نووری) گۆشەگیر و مات و داماوە
وەرە ئەم جەژنە تۆزێ خەم بە با دەین پێکەوە[٣] توخدا
غەریبان چی بکەن، گەر غەم نەدەن نەختێ بە دەم باوە

هەولێر/١٩٣٨

---

(١) دەڵێن گوایە ئەم شیعرەی بە لەتیفە بۆ (حەمە)ی برای (ئەحمەدی سالحە فەندی) نووسیوە کە مەعاوونی پۆلیس بووە.

(٢) مەبەستی کووپەی شەرابە.

(٣) لە دەستنووسی شاعیر (پیکە) نووسرابوو، کە دیارە هەڵەی کاتی نووسینە و ڕاستەکەی (پێکەوە)یە.

## بۆ بێکەس[1]

جــەژنی نەورۆز بوو لە گــردی یارە
کــۆ بووبوونەوە ئەهلی ئەم شــارە
لە ژن و لە پیــاو، لە شــێخ و ئاغــا[2]
لە کـاربەدەسـتی مـیری کـەس نەمـا
کـــــە نەهاتبێ بۆ ئـەم نـەورۆزە
بۆ زەمـــاوەند و جـــەژنە پیـــرۆزە
لە سـەفـارەتا[3] زانای ئیـسـتیـعـمار
مێجەر ئەدمۆنسی[4]،یەکەم موستەشار
بەتوورەکـــەی مل، پڕ لە فـــێڵـــەوە
بەدرۆ و نیــشی چەوت و چوێڵــەوە
ئەویش لە پڕ هات خـۆی کـرد بەناوا[5]
هەر چاوێکی کـــرد بەچوار لـە تاوا
من بەبیـــری خــۆم زەینم وا بۆی چوو
بـۆ نـاوەڕۆکـی نـەورۆز هـاتبــــــوو

(١) ڕۆژی ١٩٥٨/١٢/١١ لە سولەیمانی لە سینەمای (سیروان) بەهۆی تێپەڕبوونی دە ساڵ بەسەر وەفاتی شاعیری نیشتمانپەروەری کورد (بێکەس) مەهرەجانێک کرا. بۆ ئەم مەهرەجانە لە لایەن بەڕێوەبەرانی مەهرەجانەکەوە داوایان لێ کردم کە شتێکیان بۆ بنووسم. منیش جارێکیان بەڕێکەوت بەهۆی حەفلەیەکەوە کە لە گردی (یارە) بوو جەژنی نەورۆز ئەکرا، لەو زەماوەندەدا بەشدار بووم، ئەو ڕووداوەی لە بێکەسم دیبوو بەم هۆیەوە کردم بەم شیعرانەی کە لە خوارەوە نووسیومە و پێشکەشی بەڕێوەبەرەکانم کرد کە لە مەهرەجانەکە بخوێنرێتەوە. ئەمجا لێرەدا ئەو نوختەیەتان ئەخەمە بەرچاو کە ئەوەی لە شیعرەکانا نووسیومە زیاد و کەمی نییە و ئێستاش گەلێ کەس لەو زاتانە لە حەیاتان ئەگەر زیادی پێوە نرابوو، حەز ئەکەم بنووسن وا بوو وا نەبوو (شێخ نووری شێخ سالح).

(٢) لە گۆڤاری ڕۆژی نوێ-دا نووسرابوو: (لە شێخ و لە ئاغا) کە دیارە بەم شێوەیە بێ لەنگە.

(٣)مەبەستی لە سەفارەتی ئینگلیزە.

(٤) مەبەستی لە موستەشاری ئینگلیزی ئەو کاتەی سلێمانییە.

(٥) لە دەستنووسەکەی شاعیردا: (نەناوا) نووسرابوو کە دیارە هەڵەی نووسینە.

تێگا مەبەس لە نەورۆز چییە
بۆ ناوناخنە و جەژنی پەتییە
یا پڕە لە شت، ئەم هەمانەیە
ڕوو لە سەردەشتە و[٦] مەبەس بانەیە[٧]

***

## بێکەس[٨]

بێکەس ئەناسن چەند فیداکار بوو
بۆ نیشتمانی، کە چەند بەکار بوو
بۆ سەعادەتی قەومی کورد بێکەس
سەرشۆڕی و بەزین لای عەیب و عار بوو
بێکەس لە ڕێگای بەرزی میللەتا
ملی بکرایە بەدار و پەتا
لای وابوو ڕوتبەی شاهەنشاهییە
ڕێی وەتەن نەبێ، ڕێی گومراهییە

---

(٦) و (٧): دوو شارن لە ڕۆژهەلاتی کوردستان.

(٨) بێکەس: فائیقی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی کاکە حەمەیە، لە بنەماڵەی قەلاچوالانە. باوکی بێکەس کە لە ساڵی (١٩٢٩)دا کۆچی دوایی کردووە لە سوپای عوسمانلیدا میر لیوا بووە، بێکەس لە دێی (سیتەک) لە ساڵی (١٩٠٥)ی زایینیدا لە دایک بووە. لە ساڵی (١٩١٩)دا بێکەس لە پۆلی سێیەمی سەرەتایی لە سلێمانی وەرگیراوە، لەوەو پێشیش قورئانی خەتم کردبوو. مامۆستا (مەحموود شەوقی) دەڵێ: (حەمەی ڕەحمان ئاغا) گرتییە خۆی و بەخێوی کرد. بێ کەس بوو، ئەگینا زۆر پێش دەکەوت. زۆر گوێی بەژیان نەدەدا. کەس لە کوردایەتی لەو پاکتر نەبوو، لەسەر کوردایەتی شەقی نەخواردبایە پێی تەواو نەبوو. لە سلێمانی لە هاوینی (١٩٢٨)دا لە قوتابخانەی زانستی سلێمانی بە(مامۆستا) دامەزرا. لە ساڵی (١٩٣٧) لە دێیەکی ناوچەی بازیان کرایە مامۆستا و دواییش گوێزرایەوە گەلێ دێهاتی تر. لە ١٩٤٨/١٢/١٨دا کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە دیوانی بێکەس، ئامادەکردنی محەمەدی مەلا کەریم، هەروەها بینینی مەحموود شەوقی هاوڕێی نزیکی بۆ ئەم مەبەستە.

بەندیخـــانە لای کـــۆشکی وەزیر بوو
گـۆرانی و بەسـتـەی زڕەی زنجـیـر بوو
بەتەنگ ئـازار و ئێــــشـــــەوە نەبوو
لای بێکەس مـەعنای وەتەن ئەمـە بوو
سەر، بەرز بوونەوەی بۆ سێدارە و پەت
ئەو سەربەرزییە دەس کەس نە ئەکەوت
ئەمــــە ئـایینی پاکی بـێکـەس بوو
هەر بەرزی وەتەن لای ئەو مـەبەس بوو
ســـەرنجم دا دان جــیــــڕ ئەکـــاتەوە
لە داخی (ئەدمـۆنس) پیش ئەخـواتەوە
لە پڕ هـەڵســــایە ســــەرپێ ئـازانە
ڕووی کـردە (ئەدمـۆنس) وتی مـەردانە
پەنجـەی کـێـشـایە ناو هەردوو چاوی
وتـی لـە دەس تـۆ مـن بـۆ کــــوێ بڕۆم
(بیست و حەو ساڵە من ڕەنجبەری تۆم
بـەنـان و ئـاو و جل و بـەرگـی خـــــۆم
خـــزمـــەتم کـــردی لە ئـێـــران و ڕۆم
کـەچی ئێـسـتـاکـە هەر من ڕەنجـەڕۆم
گــــــونـاهـم چ بـوو، بەم دەردەت بـردم
بەناحـــەق بۆچی وا ســـووکت کـــردم)(٩)
ئەم هەڵبەستەی خۆی، جوان بۆ خوێندەوە
(ئەدمـــۆنس) هەروەها تـاس ئەیبــردەوە
ئێـسـتـەش تا مـاوم ئەم دەنگە خـۆشـە
لە پەردەی گـــوێـمـــا ئەزرنگێــتـــەوە

---

(٩) تێهەڵکێشی شیعرە بەناوبانگەکەی (بیست و حەوت ساڵەی)ی بێکەسە و شاعیر ئەم شیعرەی لەسەر هەمان کێش هۆنیوەتەوە.

## کوردیش ئەمێنێ و ئەم شیعرە جوانەی
## بەفـــاتیـــحـــاوە ئەخـــوێنێـــتـــەوە(١٠)

١٩٥٨/١٢/١١

(١٠) لە ساڵی (١٩٤٥)دا، (پیرەمێرد)ی نەمر و دەستەیەک لە لاوانی دڵسۆزی کورد، جەژنی نەورۆزیان لەبەر گردەکەی (مامە یارە)دا کرد. وەیەکێک لە میوانان (ئەدمۆنس) بوو. (بێکەس)ی نەمریش لەو ڕۆژەدا هۆنراوەیەکی نایابی گەرموگوڕی پێشکەش کرد، کە تا ئێستاش بووە بەوێردی سەر زمانی هەموو کوردپەروەرێک، کە ئەویش هۆنراوەی (٢٧) ساڵەیە. لە کاتی خوێندنەوەی هۆنراوەکە، (بێکەس)ی نەمر پەنجەی درێژ کرد بۆ (ئەدمۆنس) کە نوێنەری ئیمپریالیزمی بەریتانیا بوو، ئەمە ئازایەتییەکی گەورە بوو بۆ (بێکەس) درایە قەڵەم. کورد و دڵسۆزەکان تا ئەمرۆش ئەو ڕەفتارە پیرۆزەی (بێکەس) بەشانازییەوە باس دەکەن. لە گۆڤاری ڕۆژی نوێ - ژمارە (١١)ی ساڵی (١) نیسانی ١٩٦٠ وەرگیراوە.

ئەم شیعرەی لە ستایشی متەسەڕیفی سولەیمانی (ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ)دا[1] وتووە

شـەویٚ لە مـاڵەوە دانیـشتـبـووم بە حـەیرانی
لە چەرخ و ئەخـتـەر ئەفکریم و وەزعی یەزدانی

---

(١) ئەحـمـەد بەگی تۆفیق بەگ: لە شـاری سلێمـانی لە سـاڵی (١٨٩٩)ی زاییـنـدا لە دایک بووە، خوێندنی خۆی لە سلێمانی و مووسڵدا تەواو کردووە، (بۆیەش بەشێکی خوێندنی کەوتە مووسڵەوە، چونکە باوکی بۆ مـاوەیەک لە مـووسـڵـدا بەڕێوەبەری پۆلیس بوو و لەویٚ بە(دارەکـە بێنە) ناوی دەرکردبوو. ئەم نازناوەش لە سـزادانی ئاژاوەچی و پیاوخراپانەوە بۆی مـابووەوە. کـە داری لە ئاوی دیجلە هەڵدەکێشا و پێی لەوانی دەدا. کاتیٚ (تۆفیق بەگ) ئەمری خوا بەجیٚ دەهێنیٚ، گواستنەوەی ئەم خێزانە کەوتە ئەسـتۆی (ئەحـمـەد بەگ) کـە ئەو کـاتە تەمـەنی هەژدە سـاڵ تێـپـەڕی نەکردبوو، ناچاریش بوو ئەو خێزانەی کە بریتی بوو لە دایکێک و چوار برا و سیٚ خوشک بەختێویان بکات.
(ئەحـمـەد بەگ) کـوردێکی شـیرپاک و دڵسۆز بووە لەگەڵ (شێخ مـەحـموودی نەمر) پێـوەندییـەکی دۆسـتـانەی توندوتۆڵی هەبووە. بەیەکەوەش جارێک بەدەستی عوسـمـانییەکان گیراون نزیک دارەکەی ڕێی (تاسلوجە) بەسـتراونەتەوە، بەو تاوانەی کەوا دژی حوکمی عـوسـمـانییـەکـان وەستاون و گوایە پێوەندییان لەگەڵ ئینگلیزدا هەبووە بۆ دروستکردنی دەوڵەتێک بۆ کورد لەسەر شێوەی ئەو دەوڵەتەی بۆ عەرەبیان دروست کرد. بەڵام لە دواییدا هیچیان لەسەر نەسەلماندن، بۆیە وازیان لێیان هێنا. وەک لە باسی جەمعیەتی زانستی کوردان باسم کردووە بۆ مـاوەیەک سـەرۆکی (کۆمەڵی زانستی کوردان) بووە و بۆ مـاوەی (٢-٣) سـاڵ بەخـۆڕایی دەرسی تێـدا وتووەتەوە. لەو سـەردەمـەدا دەسـتـێکی باڵای هەبووە لە بڵاوکـردنەوە و چەسـپـاندنی زمـانی کـوردی لە شـاری هەولێـر. لە (١)ی تەممووزی سـاڵی (١٩٢٣)ەوە قـایمقـامی قەزای سولەیمانی بووە. لە (١٩٢٥/٦/٧) بەیەکەم مـتـەسـەڕیفی سولەیمانی هەڵبـژێردراوە و تا سـەرەتای سـاڵی (١٩٢٨) درێژەی کـێـشـاوە. لە پاش شـەشی ئەیلوول لە ١٩٣٠/٩/٢٨ بەپێی نووسـراوی وەزارەتی ناوخـۆی ژمـارە (١٢٦٣٢)ی ١٩٣٠/٩/٢٢ لەبەر لێوەشاوەیی و توانایی لە کاروباری ئیداری بۆ جارێکی تر بەمتەسەڕیفی سولەیمانی هەڵبژێردرا، تا ١٩٣٥/٤/٢٤ بەوەزیفەی متەسەڕیف مایەوە. لەو ماوەیەدا، واتە لە ساڵی (١٩٢٧) بۆ ماوەیەکی کەم کرا بەمتەسەڕیفی لیوای هەولێر و لە (١٩)ی نیسانی ئەو ساڵەدا گەڕایەوە بۆ سولەیمانی. ئەندام بووە لە ئەنجوومەنی (ئەعیان). زمانی تورکی و فارسی بەتەواوی زانیوە، لە پاڵ کەمیٚ ئینگلیزی و فەرەنسی. لە (١٠)ی کانوونی یەکەمی ساڵی (١٩٦٣)دا کۆچی دوایی کردووە. بۆ ئەم ژیاننامەیە سوودم لە (دۆسیەی تایبەتی ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ) وەرگرتووە کە لە خەزێنەی پارێزگای سلێمانی پارێزراوە، هەروەها بۆ زانیاری زیاتر سەردانی دکتۆر (دارا ئەحمەد تۆفیق)ی کوڕیم کردووە.

شـــەوێکی پڕ لە ســـروور و شـــەوێکی پڕ بەرەکـــەت
شـــــــەوێکی پڕ لە زیـا و شـــــــەوێکـی نـوورانـی
شـەوێ بوو، مـانگە شـەوێکی عـەجـەب تریفـە تریف
دوو ســـەد بەیان و دەمی ســـوبح ئەکـــەم بەقـــوربانی
گـــەهێ خـــەیالی ویســـالی جـــەمـــالی یارم ئەکـــرد
گـــەهێ ئومـــێـدی ئەمـــەم بوو، کـــە بێ بە مـــیـــوانی
لە پڕ نیگای وەتەن، مـــیـــسلی خـــۆر تلـــووعی کـــرد
لە پالی پەرچەمی لادا لە ســـوبحی پیـــشـــانی
بەهایی مـولکی یەمـەن، لەعلی لێـوی جـان بەخـشی
خـەرابی چین و خـووتەن، زولفی عـەنبـەر ئەفـشـانی
ســـەرێ نەبوو کـــە نەبێ پڕ خـــومـــاری ســـاغـــری ئەو
دڵێ نەبوو کـــە نەبێ مـــەســـتی چاوی فـــەتتـــانی
هەزار ڕۆســـتـــەمی داســـتـــان، زەبوونی تووڕەیی ئەو
هەزار بێـــژەن، ئەســـیـــری چەهی زەنەخـــدانی
ئەفـــەس بەناخـــەوە، خـــوێناوی تیـــغـی نازی بڕۆی
جگەر بەداخـــەوە، کـــوژراوی تیـــری مـــوژگـــانی
کە[٢] هات بەنازەوە، فەرمووی خەریکی چیت (نووری)؟
ســـەبەب چیـــیـــە کـــە لە من مـــودەتێکە پەنهـــانی؟
بەئاه و نالـەوە پێم وت: ئەوەندە ئاشـــفـــتـــەم
مـــیـــســـالی پەرچەمی ئێـــوەم لەبەر پەرێشـــانی
دووبارە هاتە قـــســـە، مـــوشـفـیـقـانە پێی فـــەرمـوم
مـــەگـــەر فـــراز و نشـــێـــبی زەمـــانە نازانی؟
گـــەهێ لە ئەســـفـــەلی ســـوفـــلا ئەبێ بەنی ئادەم
گـــەهێ لە عـــالەمی بالایە، شـــەخـــسی ئینســـانی

(٢) (کە) من بۆم داناوە ئەگینا لەنگ دەبێ.

یەکێ خومـاری مـەی و بەزمی عـیـزەت و ئیـقـبـال
یـەکێ زەبوونی غـــــەمی زیـللەتـە و پەرێشـــــانـی[3]
بەخـۆشی و غــەمی ئەم ئاسـیـابە تەفـرە مــەخــۆ
کــــــــە هـەروەهـا بـووە ئـەوزاع و چەرخ و دەورانـی
قـەڵەم بەدەسـتـەوە بگرە، بنووسـە مـەدحی کـەسێ
کـە فــەوقی گـونبــەدی کـێـوانە، سـەتحی ئەیوانی
خەجستەفەڕ، مـتـەسەڕڕیف، جەنابی (ئەحمەد بەگ)
کـە کـەحلی دیدەیی عـیـرفـانە، گـەردی دامـانی
لە فـەیزی هیـمــەتی ئەو زاتە، هێندە مـونتـەزەمـە
مــیـــســـالی لۆندەرەیە مـەرکـەزی سلێـمــانی
هەزار (کیسرا)و[4](جەم)[5]،مەستی بەزمی مەعدەلەتی
هەزار (مەعەن) و[6] (حەتەم)[7] ڕیزەخواری سەرخوانی
ئەگــەر مــەســاعــیی مــیــعــماری ئەو نەدەبوو
وڵاتی ئێـــمـــە هەمـــوو، ڕووی ئـەکـــردە وێرانی
زەمـین هـەتـاکــــو بمێـنێ قــــەرار و ئـارامـی
فــەلەک هـەتاکــو بمێنێ گــەڕان و ســووڕانی

---

(٣) نەدەبوایە دوو جار ئەم قافییەیە دووبارە بکاتەوە.

(٤) کیسرا: ئەنەوشیروان، پادشای بەدادی بنەماڵەی ساسانی (٥٣١ - ٥٧٩ی. ز).

(٥) جەم: جەمشیدی جەم.

(٦) مەعەن: واتە(معن بن زائدە الشیبانی (١٥١ ک-٧٦٨ز) میر و سەرکردەیەکی ئەمەوییەکان بووە. یەکێکە لە خوارده و بەرچاو تێرە بەناونگەکانی عـەرەب، ئازا و زمـان پاراو بووە. «مـەنسووری» عـەبباسی خەڵاتی کرد«سـجـسـتـانی»ی دایە دەست، کوژراوە، زۆر شتی دەربارە دەگێڕنەوە. بڕوانە المنجد(ل ٦٧٥).

(٧) حەتەم: واتە حاتەمی طائی (ت٦٠٥) شاعیرێکی سەردەمی جاهلییەتە. بەئازایەتی و خواردەیی و چاوتێری و جوامێری نێوبانگی دەرکردووە، کراوە بەمەسەل وەک «لە حاتەم باشترە»، «دیوەخانەی هەیە» بڕوانە المنجد (ل ٢٢٥).

له جەمعی مەیمەنەتا[٨] بێ، بەبێ خسووف و کسووف
مەهی تەجەللی و خورشیدە، شەوکەت و شانی

(٨) مەیمەنەت: ئیشارەتە بۆ (سورة الفاتحة - ئایەتی ٧)، (فأصحاب الميمنة ما أصحاب الميمنة) واتە خواناسان و ئەوانەی باوەڕ و ئیمانیان بەخوا هەیە.

## بۆ زاری کرمانجی[1]

١٩٢٦/١٠/٢٥

سەبا؟ ئەم دیارییەم بۆ خاکپای (زاری کرمانجە)[2]
لە (نووری) ڕا، لە مۆری توحفە، بۆ خزمەت سلێمانە

---

(١) لە ساڵی (١٩١٥)دا مامۆستا (حوسێن حوزنی موکریانی) بەپارەی مۆر هەڵکەندن و خۆشنووسی چاپخانەیەکی بۆ خزمەتی زمانی کوردی لە ئەڵمانیا کڕی و لە شاری (حەلەب) دایمەزراند، لە پاشان لە ساڵی(١٩٢٥)ەوە هێنایە کوردستان و لە (ڕواندز) دایناو ناوی نا چاپخانەی (زاری کرمانجی). لە ساڵی(١٩٢٦)دا لە ڕواندز بەرپەزامەندی میری گۆڤاری(زاری کرمانجی) پێ دەرکرد. لە بەر دەست کورتی و کەم دەرامەتی دوای شەش ساڵ (٢٥) ژمارەی لێ دەرچوو. ئیتر ژمارەی تری لێ دەرنەچوو. دوای ئەویش گوێزرایەوە شاری هەولێر و ناونرا چاپخانەی (کوردستان) کە مامۆستا (گیوی موکریانی)سەرپەرشتی کاروباری چاپخانەکەی دەکرد و سەردەمانێک گۆڤاری (هەتاو)ی پێ دەرکرد.

(٢) ئەم شیعرە بەناتەواوی لە گۆڤاری (زاری کرمانحی) ژمارە (٦)ی ساڵی (١)، (١٧)ی ربیع الثاني (١٣٤٥) (١٩٢٧)دا بڵاوکراوەتەوە کە دێری (پێنجەم) و (حەوتەمی) لێ قرتێنراوە. من دەستنووسە نەسڵەکەم لەگەڵ هەندێ دەستنووسی تر لە ناو دەستنووسەکانی مامۆستا (گیوی موکریانی)دا دۆزییەوە و لە کاتی بڵاوکردنەوەی شیعرەکە، دەقی نامەکەی شێخ نووری بۆ گۆڤارەکە بڵاوکراوەتەوە. وا لێرەدا دەقی نامەکە دەخەینە بەرچاوی خوێنەری بەرێز (بۆ خزمەت مدیری- ئیدارە و ڕەئیس تەحریری (زاری کرمانجی): جەریدەی موحتەرەمەی (زاری کرمانجی) کە لە (ڕواندز) ئینتیشار ئەکات، وەکو ڕۆژێکی زیابەخش، فیوضی عیلم و عیرفانی بەساحەی کوردستان بڵاوکردۆتەوە. ڕووناکی ئیستیقبالی (أظهر من الشمس)ی نیشان بەنەولادەکانی کورد داوە. ئەم ڕۆژە، تا ئێستاکە عالەمی کوردی لە زیای جیهانگیری مەحرووم بوو، بەرەش گیرا بوو. جەهل بوو دایپۆشی بوو. مەعلوومە کە بەهەزار تەقەلا لە ساجی سنگ و جامی سەردان، بەربووە، دنیای ڕووناک کردۆتەوە. کەوابێ لازمە قەدری بزانرێ و لە ڕووناکییەکەی ئیستیفادە و تەمەننا و دوعای دەوام و نەگیرانی بکرێ. زۆر موتەئەسفم کە تا ئێستە ئەم دایکە موشفیقە، ناسحە، زادەیەکی ئەفکاری ناچیزانەمی نەگرتۆتە سەحیفەی باوەش و دەستێکی بەسەر و پۆتەلاکیدا نەهێناوە، کە لە ڕووی نوازشی (لاواندنەوە)ی ئەوەوە وردە وردە باڵا بکات و ڕووی دانیشتنی مەجلیسێکی ئەدەبی ببێ. بینائەن عەلەیهی، هەر بەم فیکرە، ئەم دیارییە بێ قیمەتەم تەقدیم کرد، رجای قبووڵ کردنی ئەکەم).

شێخ نووری شێخ ساڵح

(ڕواندز) بەختــــیــــارە، قــابیلە فــەخــری وڵاتێ بێ
کە چونکە مەرکەزی نەشری فیـوضی عـیلم و عـیرفـانە
جەریدەی(زاری کرمانجی)ڕەفیقی (ژیان)ە[٣] بۆ میللەت
کــەسێ زاری[٤] نەبێ، بێ زارە، ئیــشی زار و گــریانە
لە دەسـتی خوێندەوارانا[٥]، ئەگــەرچی ئەمڕۆ بێ قەدری
سبـەینێ هەر سـتــوونێکت وەسـیـیـەت خـوانی عـومـرانە
بەئەنگوستی تەجەسوس، ڕووپەڕەی زەرد هەڵگەڕاوی تۆ
ئەپشکنرێ کــە چونکە مــەرکــەزی ئەسـراری کــوردانە
وەکـو میـرئاتی ذەی ئیدراکی، بۆ مازی و ئیسـتـیـقبـال
مــەعــانیی جـوملەکــانت کــەنزی لایوفنای عــیــرفــانە
ئەمــیـنداری خــەفــایای حــەیاتی حــازرەی ئەمــڕۆی
ســبــەینێ یەک بەیەک ئەیدەیتــەوە بەو نەوجــوانانە
بەهێـز و قـووەتی خۆت بانگ ئەدەی بۆ نوێژی سبحـەینێ
چریکەی تۆیە وا گــوێم لێــیــە دێ، لەو شــاخ و داخــانە
ئەڵێ ئیـتر شەوی غـەفڵەت نەما، ڕۆژی سەعادەت هات
کە عـومرێکە[٦] هەمـوو ئانێکی، دەرسی زلل و خوسرانە

(٣) ئیشارەتە بۆ ڕۆژنامەی (ژیان).
(٤) بەمانای (زمان = لغة) هاتووە.
(٥) لە دەستنووسی شاعیردا (خوندەوار) نووسرابوو کە زۆرتر لەناوچەی کۆیە بەکار دێت.
(٦) لە گۆڤارەکەدا: (کە عەسرێکە) نووسراوە.

# بۆ عەلی کەمال[١]

نامەکەت گەییيە دەست فەخری هەموو ئەهلی وڵات
بوو بەشانامەیی هەر مەجلیس و بەزم و حەفلات
وا ئەبێ هیمەتی مەردانە و شێوەی حەتەمی
دەک نیلاهی نەڕزێ قەت لە گڵا دەستی سەخات
ڕێک بەقەد سەرتە، کڵاوی کەرەم و ئەفسەری جوود
خشت بەقەد قامەت و باڵاتە، کەوایی حەسەنات
بەحری بەخشایشی ئێوە نییە ڕۆژێ کە نەکا
کەرەمی حاتەمی تایی، بەسورابی وەهەمات
ڕوتبە و مەنسەبە، خوا لایقی شانی دیوی
بەفەقیران حەسەنات و بەغەریبان خەدەمات

---

(١) عەلی کەمال بەگ: ناوی تەواوی (عەلی کەمال عەبدولڕەحمانی حاجی قادر)ە لە ساڵی (١٩٠٠) لە شاری سلێمانی، لە گەڕەکی (دەرگەزێن) لە دایک بووە. لە حوجرە وەکو داب و نەریتی ئەو سەردەمە لەسەر دەستی (خواجە فەندی) و (حاجی مەلا سەعیدی زلزلەیی) خوێندوویەتی. وەک (عەلی کەمال بەگ) خۆی دەفەرمووێ (شێخ نووری)یشی هەر لە لای (حاجی مەلا سەعید) ناسیوە. ئنجا ئامادەیی (ڕوشدییەی عەسکەری) تەواو کردووە و چووەتە تورکیا و لە ئەستەمبووڵ لە (كلية الشرطة)دا خوێندوویەتی، کە گەڕاوەتەوە کراوە بەیاریدەدەری پۆلیس لە شاری بەغدا، دوای ئەوە هەر بەوەزیفەی (مەعاون) کۆیە و خانەقین و عەزیزییە گەڕاوە. ئنجا لە ساڵی (١٩٣٢) بووەتە بەڕێوەبەری پۆلیس لە کەرکووک، هەروەها بەڕێوەبەری پۆلیس لە بەغدا. تا ساڵی (١٩٣٥) لە سلکی پۆلیس ماوەتەوە، تا وازی لە وەزیفە هێناوە، ئنجا بووە بەنائیبی سلێمانی و هەر لەو ساڵەدا واتە (١٩٣٥) تا ساڵی (١٩٥٦) بۆ چەند جارێک نیابەتەکەی تازە بووەتەوە. هەر لەو کاتەوە کە لە وەزیفەدا نەماوە، دەستی کردووە بەبازرگانی کردن. بەدرێژایی ئەو دە ساڵەی گۆڤاری گەلاوێژ دەرچووە بەپارە یارمەتی داوە بۆ دەرکردن و بەردەوام بوونی، لە ساڵی (١٩٣٩)ەوە هەموو ساڵێ هەندێ پارەی تەرخان کردووە بۆ قوتابییە هەژارەکانی کورد، کە دەورووبەری (٩٠-١٠٠) دینار بووە لە هەموو مانگێکدا. لە ساڵی (١٩٤٣) لە سلێمانی فەقیرخانەیەک کراوەتەوە، ناوبراو بەشداری کردنەوەکەی کردووە بۆ خزمەتکردنی هەژارەکان و لە بەغداوە پارە و کەلوپەلی بۆ ناردوون. (١٥٠) هەزار دیناریشی بۆ نەخۆشخانەی (مناڵ بوون) تەرخان کردووە لە سلێمانی. بۆ ئەم زانیارییانە لە

ئەمــــە بۆ تۆ بەســــە، بۆ بەرزی خــــولقت بەدەوام
وردی ڕۆژ و شـەوی ئەم عـالەمـەیە وەسف و سـەنات
ڕەبی مــــەحــــرورمی نەكــــا خــــوا بەدەوامی ژینت
كــــۆمــــەڵی بێ دەســــەڵاتانی وڵاتت لە بەرات[٢]

١٩٤٣/١/٢١

(٢) عەلی كەمال بەگ لە حەربی عالەمی دووەمدا، هەموو مانگێ (٣٠) دیناری تەخسیس كردبوو بۆ ئیسعافی فوقەرای شاری سلێمانی. موقابل بەم ئینسانییەتە ئەم سێ چوار بەیتەم بۆ نووسی (شێخ نووری شێخ ساڵح).
سەرنج: لەگەڵ شێخ نووری بۆرە خزمایەتییەكیان هەیە بەوەی كە خاڵۆژنی شێخ نووری خزمی (عەلی كەمال) بووە.

## گلەیی

بۆ سەعید قەزازی نووسیوە(1)

زێبار ١٩٥١/٨/٢٠

دێتە بیرت ئەو دەمەی تۆ ڕووت لە ڕووی پەیمانە بوو
من دڵ و خوێنی دڵم بۆ تۆ مەی و مەیخانە بوو
دێتە بیرت هەر بەتەنیا تۆ لە پەردەی سینەما
سینەما بووی و لەوێدا غەیری تۆ سیما نەبوو(2)
دێتە بیرت کارەبای ڕووی حوسنی خولقی تۆ لە کوێ
شوعلە ئەفزا بوایە (نووری) زوو لەوێ پەروانە بوو
دێتە بیرت کۆمەڵی جاران و شەوگارانی زوو(3)
گفتوگۆی مەجلیس، هەموو هەر ڕاستی، مەستانە بوو
دڵ لە باغی سینەدا بۆ تۆ لە ڕیشەی جەرگ و دڵ(4)
ڕۆژ و شەو هەوڵی چنین و بەستنی هێلانە بوو
شارەزای ڕێ بوو، ئەکەوتە بەردەمت دڵ دێ بە دێ
شاری بێ میهر و وەفایی، ئەو حەلە(5) وێرانە بوو(6)

---

(1) شێخ نووری ئەم شیعرەی لە کاتێکدا بۆ وتووە، کە متەسەڕیفی لیوای هەولێر بەپێی نووسراوی ژمارە (٧٥٣١) لە بەرواری ١٩٥١/٥/٢٢ و (بۆ بەرژەوەندی گشتی!!) و بوونی هۆی ئیداری دیاریکراو، بڕیاری داوە (شێخ نووری شێخ سالح) لە بەڕێوەبەری ناحیەی (سەنگاو)ەوە بکاتە بەڕێوەبەری ناحیەی (بارزان)، ئەم نووسراوەش بەئیمزای (سەعید قەزاز) نێردراوە، متەسەڕیفی لیوای سلێمانی کە ئەو کاتە (مستەفا یەعقووبی) بووە، بەپێی نووسراوی ژمارە (٤٨١١) بە مێژووی ٢٤-١٩٥١/٥/٢٦ ئەمرەکەی دەرکردووە. لە ١٩٥١/٦/٥ دەستی لە کاروباری بەڕێوەبەری (سەنگاو) بەرداوە و لە ١٩٥١/٦/١١دا لە ئیشە تازەکەیدا دەستبەکار بووە.

(2) لە دەستنووسێکی تری شاعیردا (لەوێدا زۆر و کەم سیما نەبوو) نووسرابوو.

(3) هەر لەو دەستنووسەدا (کۆمەڵی جاران و شەوگاران کەوا) نووسرابوو.

(4) هەر لەو دەستنووسەدا (جەرگ و سی) نووسراوە.

(5) هەر لەو دەستنووسەیدا (ئەو دەمە) نووسرابوو.

(6) ئەم بەیتە لەو دەستنووسەدا شوێنیان ئاڵوگۆڕ کراوە.

چی بەسەرهات ئەو زەمانەی ڕاستی و عەهد و وەفا
لای ڕەفیق و ئاشنایان، شێوەیی پیاوانە بوو[7]
چۆن موبەدەل بوو[8] بەسەفرای تاڵی ئێش و دەردی دڵ
ئەو شەرابەی شەمعی جەمعی ئاشنا و بێگانە بوو
تێگەیشتم بۆ نەماوە، شێوەیی میهر و وەفا
تاکو ڕۆژی یەک دڵیی ئاوا نەبوو، ئاوا نەبوو
بۆ شتێ چاکە (معاذ الله) بکەومە سەر زبان
ئەو خەیالاتەی کە من ئەمکرد، هەموو ئەفسانە بوو
زووم ئەزانی من کە قەت ناکەومەوە بیری یەکێ[9]
واسیتەی[10] بیرکەوتنەوەم بۆ نەقڵی ئەم بارزانە بوو
ئەو شەوەت بیرە لەبەزمی وەسڵی یارا دوو بە دوو
تا بەیانی، هەر بەیانی ڕازی دڵدارانە بوو
ئێستە تۆ بوویتە وەزیر و من مدیرێکی فەقیر
شەرتی ئینساف و مروەت، وا بزانم وا نەبوو[11]

---

(7) هەر لەو دەستنووسەدا (شێوەیی مەردانە بوو) نووسرابوو.

(8) هەر لەو دەستنووسەدا (بوو موبەدەل) نووسرابوو.

(9) هەر لەو دەستنووسەدا (بیری دۆستان) نووسرابوو.

(10) هەر لەو دەستنووسەدا (نەگبەتی ئەم بیرکەوتنەوەم...) نووسرابوو.

(11) ئەم دوو بەیتەی دوایی لەو دەستنووسەدا نەبوو.

* حەمە سەعید قەزاز: ناوی تەواوی ( سەعید عەبدولمەجید حاجی ئەحمەد قەزاز) لە ساڵی ١٩٠٤ لە شاری سلێمانیدا لە دایک بوو. لە ژێر چاودێری مامیدا کە ( تۆفیق قەزاز)ە گەورە بوو، تا ئەو وەختەی کە چووەتە وەزیفەی حکومەتەوە، لە یارمەتیدانی نەکەوتووە. ئەو سەردەمە ئەعدادییەی موڵکی هەبوو، لە سلێمانی ئەعدادییەی موڵکی تەواو کردووە. لە پاش تەواوکردنی ئامادەیی لە سلێمانی بەوەزیفەی وەرگێڕ لە ڕومادی دامەزرا، چونکە ئینگلیزی باش دەزانی، لەو سەردەمەش موفەتیشی ئیداری هەبوو لە لیواکان لەژێر دەستی موفەتیشی ئیداری لە ئینگلیزییەوە شتی وەردەگێڕا، دوای بەینێک بۆ وەزارەتی ناوخۆیی گوێزرایەوە و لەوێش خەریکی وەرگێڕان بوو. لە وەزارەت لە پاش ئەوەی قابلیەت و توانایی خۆی نیشاندا، لە وەزیفە پێشکەوت. تا کرا بە بەڕێوەبەری ناحیە. لە ساڵی ١٩٣٤ - ١٩٣٥ کرا بەقایمقام و تا ساڵی ١٩٣٦ - ١٩٣٧ لەوێ =

## بۆ دۆستێکی قەدیمی خۆی نووسیوە

یان بۆ متەسەڕیف (مستەفا قەرەداغی) نووسراوە

١٩٤١/١٢/١٠

بەرمَ بۆ کێ سکالای دڵ لە دەس تۆ
مەگەر[١] هەر بیبەمە لای دلبەری خۆم
بڵێم ئیتر بەسی بێ، بێ وەفایی
بڵێ جارێ لە کوێیە کەمتەری[٢] خۆم
فەلەک خستوومییە[٣] چاڵێکی واوە[٤]
کە دەس ناداتە دەستم ڕەهبەری خۆم[٥]
ئەڵێی دایم لە دووم هەڵهاتووە ڕۆژ
لە پێ کەوتم، نەگەیمە سێبەری خۆم

---

=مایەوە، لە پاشان جارێکی تر گوێزرایەوە وەزارەتی ناوخۆ و کرا بەبەڕێوەبەری گشتی. دوای ماوەیەک ئەم جارە کرا بەبەڕێوەبەری (موانیء) لە بەسرە. بۆ جارێکی تر لەوێوە گوێزرایانەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، دوو ساڵ لەوێ مایەوە، ئنجا بوو بەمتەسەڕیف. دیسانەوە گوێزرایەوە بۆ وەزارەتی ناوخۆ، لەوێ کردیان بەوەزیری ناوخۆ. تا بەرپابوونی شۆڕشی چواردەی تەمموز کە لەگەڵ چەند کەسانێک حەواڵەی مەحکەمەی (مەهداوی) کرا، دوای چەند مانگێک بڕیاری خنکانەکەیان بەجێ هێنا و لە گۆڕستانی (باب المعظم) نێژراوە. دانیشتن لەگەڵ عەبدولقادر قەزاز و سەروسۆراغی دیکەی خۆم لە بارەیەوە.

(١) لە دەستنووسێکی تری شاعیردا (ئەڵێم) نووسرابوو.

(٢) هەر لەو دەستووسەدا (یاوەری خۆم) نووسرابوو.

(٣) لە دوای ئەم بەیتە، لەو دەستنووسەدا بەیتێکی تر هەیە، کە شاعیر لە کاتی پاکنوس کردنیدا دانی پێدا نەناوە کە ئەمەیە:

نە کابە کەچ ئەبێ و مزگەوت ئەڕووخێ
ئەگەر عەرزی بکەم دەردی سەری خۆم

(٤) هەر لەو دەستنووسەدا (بیرێکی واوە) نووسرابوو.

(٥) دوای ئەم بەیتە، بەیتێکی تر لەو دەستنووسەدا هەیە، شاعیر دانی پێدا نەناوە کە دەڵێ:

بەتاریکی شەوی شانسی ئەزانم
کە مەحرووممم لە میهری ئەنوەری خۆم

لـەبـەر تـانـەی ئـەم و ئـەو نـادیـارم
وەکـو ئەخگەر لەبەر خـاکـسـتـەری خـۆم
نیــــازی من لە ئێـــوە یەک نیگاهە
کـە بەڵکو زوو بکەم، چارەسـەری خـۆم
لزووم ناکـا بەشـەرح و بەسطی ئەحـواڵ
کـە ڕەمـزێ کـافـیــیـە بۆ داوەری خـۆم
ئەگـەر لوتفت لە حـەق من هەروەها بێ
ئەبێ لەم شارە من دەرکەم سەری خۆم(٦)

(٦) ئەم شیعرە بۆ (مستەفا قەرەداغی) وتراوە، (مستەفا قەرەداغی) لە قەرەداغ لە دایک بووە، خوێندنی حوجرەی تا قۆناغی (جامی) و (السیوطی) خوێندووە. کابرایەکی (عیسامی) بووە و لە خۆ پێگەیاندندا زۆر پشتی بەخۆی بەستووە. بەپێچەوانەی زۆر کەسەوە کە شەرمیان پێ دێ پێیان بڵێن (فەقێ) بووینە، ئەم شانازی بەفەقێتی و ژیانی هەژاری و ڕابردووی خۆیەوە کردووە و لە کۆڕ و مەجلیساندا گێڕاویتییەوە. لە (١٩١٨)دا دوای دەرچوونی لە ئیمتیحان کراوە بەکاتبی مەحکەمەی شەرعییە. ئنجا ئوسوولی موحاکەماتی شەرعی وەرگرت، ئیتر قازیتییەکەی بەبێ ئیمتیحان بوو، لە پاڵ مەسەلەی شەرعیش قانوونی موحاکەماتی خوێندووەتەوە تا ئیمتیحانی حاکمیی داوە، دوای سەرکەوتنی لەو ئیمتیحانەدا ئنجا کراوە بە(حاکمی منفرد) و (حاكم بداءة غير محدودة - درجة أولى) و لە هەولێر موباشەرەتی کردووە، ئنجا کراوە بەسەرۆکی دادگا و لە دواییشدا کراوە بەیاریدەدەری بەڕێوەبەری گشتی ناوخۆیی لە بەغدا، پاشان بڕیار درا بەپێی نووسراوی وەزارەتی ناوخۆی ژمارە (١٠٩٨٦) لە ١٩٤١/٦/٢٦دا کە ئاراستەی متەسەڕیفییەتی لیوای سلێمانی کراوە نووسراوە: (لەبەر بەرژەوەندی گشتی و بوونی هۆی تایبەتی، ئەنجوومەنی وەزیران لە دانیشتنی ڕۆژی ١٩٤١/٦/٢٤ و لەسەر پێشنیاری ئەم وەزارەتە بڕیاری ئەمەی لای خوارەوەی دا.
١- دامەزراندنی بەڕێز مستەفا قەرەداغی یاریدەدەری بەڕێوەبەری گشتی ناوخۆیی بەمانگانەی (٤٥,٠٠٠) دینار بەمتەسەڕیفی لیوای سلێمانی.
لە ١٩٤١/٦/٢٨ی پاش نیوەڕۆ دەستبەکار بووە. دوایی مستەفا قەرەداغی لە متەسەڕیفی لیوای سلێمانی گوێزرایەوە بۆ لیوای هەولێر و لە ١٩٤٣/١٠/٢٣ی پاش نیوەڕۆ دەستی لە کار هەڵگرتووە، دوایی کراوە بەسەرۆکی بەشی (تسوية) لە بەعقووبە، لەوێوە خانەنشین کراوە و دەستی داوەتە (موحاماة). لە دەوری حەفتا ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە. سوودم لە دۆسیەی تایبەتی (مستەفا قەرەداغی) وەرگرت کە لە پارێزگای سلێمانی لە بەشی خەزێنە پارێزراوە، هەروەها دانیشتنی تایبەت لەگەڵ مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ لە سلێمانی سەبارەت بەژیان و کەسایەتی مستەفا قەرەداغی کراوە.

## دیاری ژیان[1]

له هەولێرەوە بۆ مدیری جەریدەی ژیان (پیرەمێرد) نووسراوە.

ئەم شـــەو بەیادی تۆوە نەنووســـتم هەتا بەیـان
لێم هاتە گـفـتـوگـۆ، قـەڵەمی تیـژی دوو زبان[2]
مەسـتـانە دەستی کـردە هەرا و گـریە و فـیـغـان
فـرمـێـسکی وەک ڕەهێـڵـەی باران بەنەوبەهار[3]

(١) ئەم شیعرەی لە هەولێرەوە پێشکەش بە(پیرەمێرد) کردووە و ئەمیش هەر لە ڕۆژنامەی ژیاندا بۆی بڵاوکردووەتەوە و لە پاڵیـدا بەم چوارینەی خوارەوە -کە لە دیوانی پیرەمـێرددا نییـە- وەڵامی بۆ نووسیوە:

خـوا ئەو خـودایەیە کـە لە نووری کـوژاوەوە
پشکۆی بەسۆزی شیعر و ئەدەب کەوتە ناوەوە
نووری! بەنووری ئێـــوەوە تاریکی لادەچێ
نەورۆزی ئێــوە، تازەیی دێنێــتــە ناوەوە

بەڵام ئەم چوارینەیە لە دەستنووسەکەی (شێخ نووری)دا تۆزە جیاوازییەکی لەگەڵ ئەمەدا هەیە. لەوە دەچێ (پیرەمێرد) بێجگە لەوەی کە خۆی بڵاوی کردووەتەوە، بەنامەش ئەم شیعرەی بۆ (شێخ نووری) ناردووە، بۆیە ئەم جـیـاوازییـە دەبینین. ئەمـەش ئەو چوارینەیە کـە بەدەسـتنووسی(شـێخ نووری) نووسراوە:

خـوا ئەو خـودایەیە کـە لە نووری کـوژاوەوە
پرشنگی جوانی شیعر و ئەدەب کەوتە ناوەوە
نووری بەنووری ئێوەوە زوڵـمەت لەناو ئەچێ
یارەبی ئەم زیـایە قـــەت نـەبێ بـەچاوەوە

هەروەها لە کـتـێـبی (شـیـعـر و ئەدەبیـاتی کـوردی) بەرگی دووەم (ل ٢٠٨) لە جیـاتی (خـوا ئەو خودایەیە)، (شوکری خوا ئەکەم) نووسرابوو.

(٢) لە ڕۆژنامەکەدا نووسرابوو:

ئەمـشـــەو بەیادی تۆوە بوو، ئەی پیـری نەوجـوان
دیسانەوە قـەڵـــەم لـــە پـــرا، هـاتـــەوە زبـــان

(٣) لە ڕۆژنامەکەدا بەیتی دووەم بریتی بوو لەم بەیتە کە لە دەستنووسەکەدا نەبوو:

هاوار ئەکـــا بنووســـە، تا بەکـــەی سکووت؟
تاکەی لە مـەجلیـسی ئەدەبا، خۆت ئەکەی نیـهـان؟

ئەرژایە خوارێ، چاو یەک و فرمێسک بلێ هەزار
هاوار و شیوەنی گەییــیـە، عــەرشی کـردگـار
دەستم گەیاندە ناو قەدی، هێنامە پێشەوە
پێم وت بەنەرمی و بەدڵێکی بەئێشەوە
ئەم نالە ناڵ و ئاهو ئەنینەت لەبەر چییە؟
ئەم پرمە پرمی زاری و شینەت لەبەر چییە؟
فەرمووی لەداخی تۆیە هەموو نالە نالی من
ئەم ماتییە کە ئەم دەمە کردووتە ئیختیار
خستییە پەناوە، عەقڵ و شعوور و کەمالی من
ئەتلێمەوە بەداخەوە، بێ هۆش و بێ قەرار
پێم وت، کە ئەی رەفیقی تەفەکور، ئەنیسی رۆح[٤]
هەمرازی رۆژ و مونسی شەو، مەحرەمی خەیاڵ
گەر تۆ نەبی، بەکێ ئەگەیی داستانی نووح
چۆن بەرز ئەبوو، شیعاری ئەدەب، فەلسەفە و کەمال[٥]
کێ گوێی لە نالەی دڵی زار و زەبوون ئەبوو؟
چۆن رۆڵەیی شیعر، ئەچووە باوەشی ژیان؟[٦]
کێ گوێی لە کردەوەی فەلەکی واژەگوون ئەبوو؟
گەر تۆ نەبی و نەنووسی لە چەپگەردیی زەمان[٧]
مەگری و بنووسە دەرد و سکاڵای دڵی حەزین
بیدە بەبای شەماڵ، بەپەلە، دەم بەپێکەنین[٨]

---

(٤) لە رۆژنامەکەدا: (سەمعەن و تاعەتەن، چ ئەفەرمووی ئەنیسی رۆح) نووسرابوو.

(٥) لە ژرۆنامەکەدا: (کێ فێر ئەبوو ئەشعاری ئەدەب، فەلسەفە و کەمال) نووسرابوو.

(٦) لە رۆژنامەکەدا ئەم بەیتە بەم شێوەیە بوو:

کێ گوێی لە نالەیی نەیی قەلبی زەبوون ئەبوو؟
چۆن زادەی فیکر ئەچووە باوەشی ژیان؟

(٧) لە رۆژنامەکەدا نووسرابوو: (کێ وا بەجەلدی دەستی ئەدایە یەخەی زەمان؟).

(٨) ئەم بەیتە لە رۆژنامەکەدا نەبوو.

بیـــبـا و بچـێـــتـــە باوەشی دایکی ژیانەوە
لای لایە چاک ئەزانێ، بەســــۆزی بەیانەوە[٩]
ژیرت ئەکـاتەوە، خـەوی خـێـرت لە چاو ئەخـا
ئەخنێـــتـەوە بەیانی، وەکــو گــوڵ بە نەوبەهار[١٠]
دەم پڕ لە شـیـعـری جـوانی، وەکـو دوڕی ئابدار
ئەمجا شەرم مەکە و بڵێ، ئەی پیری نەوجەوان[١١]
(شێخ نووری) ڕۆحی لاتە، مەڵێ وا لە غـوربەتا
فـریای عـەزابی کـەوتووە یادت، لە مـیـحنەتا[١٢]
هەرچەند فـەلەک نەشـیـدی بەزۆر پێ بڕیەوە
عـــەرزت ئەکـــا بەتورکی، بەیادی قـــەدیمەوە[١٣]
(أربـیـلـدە بـن سـنـی دوشـنـور یـاد أیـدرایـکـن[١٤]
قـارشـمـدە بر شـعـاری شـعـر هیکلی ادب
دورمـــقـــدە درس شـــعـــر ویرر حـــســـیــاتمە
بر انجـــذابی حس ایلە پر ذوق و افـــتـــخـــار

---

(٩) ئەم دێرە لە ڕۆژنامەکەدا بەم جۆرە بوو:
(مـەگـری بچـۆرە باوەشی دایکی ژیانەوە)
(١٠) لە ڕۆژنامەکەدا نووسرابوو:
ئەخنێتـەوە سبـەینێ وەکـو غـونچـەی بەهار
(١١) لە ڕۆژنامەکەدا (ئەوسا بڵێ و مەترسە، بنووسە بەبێ ڕیا) نووسرابوو.
(١٢) ئەم بەیتە لە ڕۆژنامەکەدا نەبوو.
(١٣) دوا دێر بەکوردی لە ڕۆژنامەکەدا نووسرا بێ ئەمە بوو:
خـاڵە بەتەنگەوە مـەبە (الخـیـر مـا وقع)
کـاتێ خـەبەر ئەزانی ئەڵێن (الکدر رفع)
(١٤) کاک ئەحمەد تاقانە واتا کوردییەکەی ئەم چەند دێرەی بەم جۆرە وەرگێڕاوە:
لە هەولێردا من کە بیرم لە تۆ دەکردەوە و یادم دەکردیتەوە
لە بەرامبەرمدا دروشمێکی شیعر، هەیکەلی ئەدەب
=

دیـکلـر سکـوت ایلـه، بنـی غـــــرقی تـفـکرات
ایلـر، ویرر سـری ابدیت حـــــیـــــاتــمـــــه)

---

= وەستا بوو، وانەی شیعری بەهەستەکانمدا دادەدایەوە
بەکێشکردنێکی هەستەوە، پڕ زەوق و شانازی
بەبێدەنگی گوێی دەگرت، منی غەرقی بیرکردنەوە
دەکرد، نهێنیی هەمیشەیی بەژیانم دەدا.

سەنج: ڕۆژنامەی (ژین) ساڵی (١٤)، (٣٠)ی مارتی ١٩٣٩ ژمارە (٥٦٠) نووسیویە: (شێخ نووری کە لە پێشدا باش کاتبی مەسرەف بوو، لە میانەی مەئموورە تەفروتونا کراوەکاندا هەڵیاندابوو بۆ هەولێر، وەک (ئامدنی لک لک) کە مژدەی بەهار دێنێ پێشڕەوی ئەوانی تری کرد، هاتەوە و ڕێی شیعری ئەویشمان بۆ نزیک بۆوە! جا نازانم پێی ماوە یان نا؟ بەخوا جاری پێشوو، شیعرێکی جوانی بوو). ئەم شایەدییەی (پیرەمێرد) بۆی بەڵگەیە کە شێخ نووری لە پاش سییەکانیش شیعری چاکی وتووە.

## بۆ متەسەڕیفی کەرکووک نووسراوە

ن. ناوی جەرگم هێند برینی پێوەیە وا سیل ئەکا
و. وا خەلاریکە خەم شعوور و عەقلەکەم تەبدیل ئەکا
ر. ڕۆح لە دەرچوونایە بۆ وەسلی زولەیخای لوتفەکەت
ی. یووسفی ئاوارەکەت وا مەیلی عیزرائیل ئەکا
ب. بەرد ئەبارێنی بەسەرما یەک لەسەر یەک چەرخی دوون
و. وەک سیاپۆشان، وجوودم ماتەمێ تەمسیل ئەکا
خ. خەم وەها خوێنی دڵی هێناوەتە سەر دیدەکەم
ز. زیللەت و ئاهو فیغانم، شیوەنێ تەشکیل ئەکا
م. مردنم لا چاترە لەم ژینە، گەردوونی دەنی
ت. تووڕەیە دایم لە جەمعی عوشرەتم تەنزیل ئەکا
ج. جەوری ئەم غەددارە ڕەببی ڕوونەکانە دوشمنم
ن. نەختە ئاوێکی لە ڕێدا، لێ بە بەحری نیل ئەکا
أ. ئانێ بێشەی شێر ئەکاتە لانەی ڕێوی غەریب
ب. بەینێ ئەیبینی کە سەرگەڕ گەڕ بەلاشەی فیل ئەکا
ت. تابەکەی تاڵاوی، ئەم زەهرەت بچێژم ڕۆژ و شەو
ا. ئێش و ئازارت، هەتاکەی کەیف و خۆشیم دیل ئەکا
ڕ. ڕوو لە کوێ کەم گێژەڵووکە و گەردەلوولی نەگبەتی
ز. زیندەگی و خۆشیم بەسەد مەرگ و خەفەت تەبدیل ئەکا
و. وس بە ئیتر بەسیە، هاوار و بەیانی دەردی دڵ
ی. یاری خۆت مەعنای سکاڵاکەت بەحەق تەئویل ئەکا
ت. تێدەفکرم، دێتە گوێم دەنگێ بەئەسپایی ئەڵێت:
ح. حامییەکی خۆت هەیە ئەو حاڵی تۆ تەعدیل ئەکا
و. واز لەم و لەو بێنە، هەر بۆ ئەو بەرە شەکوای دڵت
ی. یاری پێشووی خۆتە، لوتفی خۆی بەتۆ تەشمیل ئەکا

ل. لەم قسانە لادە، نۆبەی ئیحتراماتەو سەلام
ا. ئاشنایان با نەڵێن هەر بۆ حەجی خۆی تیل ئەکا
ک. کاکی خۆمە زۆر سەلامی لێ دەکەم، سەدیقمە
ا. ئەو مونەشیرمە ئەزانم ئیشی من تەعجیل ئەکا
ئەوەڵی حەرفی هەموو میسرەع ئەگەر کۆببنەوە
میسرەعێکە قەسد و ناوی شاعیرێ تەسجیل ئەکا
خۆت ئەزانی موخلیسە، بۆیە بەبێ پەروا ئەڵێت:
(*)..................................................................

تەق تەق – ١٩٤٨/٨/٧

---

(*) دێری دوایی بۆیە تەواو نەکردووە، چونکە بەکۆکردنەوەی حەرفی یەکەمی هەر میسرەعێک دێرەکەی تەواو کردووە کە ئەمەیە: (نووری بۆ خزمەت جەنابت ئارەزووی تەحویل ئەکا) واتە نەقڵ کردنی لە لایەن (سەعید قەزاز)ەوە کە متەسەڕیفی کەرکووک بووە، وەکو لە شوێنی تریشدا باسمان کردووە هەردووکیان هاوڕێ و ئاشنای یەکتر بوون. ئەم شیعرەش هونەرێکی تازەی تێدا بەکار هاتووە.

## بۆ ماتەمی (٦)ی ئەیلوولی[1]
## سالی (١٩٣٠) وتراوە

دووبارە دڵ لە داغی وەتەن پڕ لە میحنەتە
لەم مەنزەرەی فەلاکەتە، لەم دەرد و حەسرەتە
حەقییە فەلەک بەجارێ سەری خۆی لە خوم بنێ
بگری فەلەک بەشینەوە بۆ ئەم موسیبەتە
بەر قاپی سەرا بووەتە دەشتی کەربەلا؟
یا مەزبەحەی گرۆهی، وەتەن خواهی ئوومەتە؟
ماهی موحەڕڕەمە ئەمە، شینی حوسەینە یا
ئەیلوولە ڕۆژی شیوەنە، ماهی فەلاکەتە؟
هەر نەعشی لاوی کوردی ستەمدیدەیی غەمە
غەڵتانی خوێنە، نائیلی ڕوتبەی شەهادەتە
هەر نەونیهالی کوردە، بەخوێناوی ئاڵەوە
گەوزانی خاک و خوێنە، شەهیدی شەجاعەتە
هەر نالە نالی لاوە، بەدەم گوللەوە ئەڵێ:
یاڕەبیی کەی نیهایەتی دێ، ئەم موسیبەتە؟

---

(١) ڕاپەڕینی (٦)ی ئەیلوول، کوردی ماف خوراو و خاک وێران بووی پێ لە خواست و نیازنراو لە سالی (١٩٣٠)دا کەوتە خۆی دژی پەیمانی (١٩٣٠)ی بەریتانی - عیراقی، کە خەریکی بەستنی بوون. ئەوەبوو شاری سلێمانی کەوتە جموجوولێکی گەورە بۆ ئەم ئامانجە. بۆ سەپاندنی مافی کورد بزووتنەوە دەستی پێکرد. تا ڕۆژی (٦)ی ئەیلوولی خایاند، کوردی ئازای قارەمانیش بەبەرد و دار کەوتنە هەڵمەت بردن، لە ئەنجامدا (٥٠) کەسیان لێ کوژرا و بریندار بوون، خەڵکی سلێمانی ئەگەرچی سەریش نەکەوتن، بەڵام گەورەترین قارەمانیەتییان نواند. شێخ مەحموودی نەمر هەر کە هەواڵی کوشتارەکەی بەردەرکی سەرای بیست، پەلاماری (پێنجوێنی) دا و گرتی و ئازادی کرد. لە ئەفسەرانی سوپای عیراق (مەحموود جەودەت، حەمید جەودەت، کامیل حەسەن) خۆیان گەیاندە لەشکری شێخ مەحموود و هاوبەشیی ئەو ڕاپەڕینە پیرۆزەیان کرد. کە ئەنجامەکەی شەڕی ئاوباریک بوو.



خۆپیشاندانی ڕۆژی (٦)ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٣٠ لە شاری سلێمانی کە
بەڕۆژی (٦)ی ئەیلوولی ڕەش بەناوبانگە

ئەم باغە بۆ بەجارێ وەها[٢] بوو بەگۆمی خوێن؟
بۆ مەنزەرەی لەتافەتی بۆ بوو بەم[٣] قەساوەتە؟
ئەمووت گوڵێ نییە، کە نەسووتێ دڵی بەکورد
ڕوو زەرد نەبێ، لە مەنزەرەیی ئەم فەجاعەتە
ئەم باغە، ئەم گولانە، کەچی هەر لە نەشئە دان
ئەمزانی گوڵ کە بێ دڵ و حس و حەمییەتە
لەعنەت لە بەرگی سووری گولاڵە و دڵی ڕەشی
چۆن ماو بۆچی هەڵنەوەری[٤] بەم فەلاکەتە
قەومی نەجیبی سام[٥]، ئەمە بێ عەدلی ئەوەڵی[٦]
ئاخۆ نیهایەتی چ بێ، ئەم لوتف و ڕەحمەتە؟
ئەی (عصبة الامم) وەسیی ئەقوامی[٧] ڕووی زەمین
بێ دەنگیی لەم مەزالیمە، شێوەی مورووەتە؟
وەک داری لیژنە، مەیت و جەنازەی شەهیدی کورد
لەم باغە کەوتووە، ئەمە ڕەسمی عەدالەتە؟
لەم عەسرەدا، کە عەسرەی تەرەقی و تەکامولە
ئەم سەر بڕین و کوشتنە، شەرتی حیمایەتە؟
بۆ کەعبە کەچ ئەبێ، کە کەسێ ناوی حەق بەرێ؟
حەق گۆ لە بەرچی، قیسمەتی هەر دار و لەعنەتە؟
ئەی کۆمەڵی شەهیدی وەتەن، خوێن ڕژاوەکان
تیذکاری ناوی ئێوە، لە جێی فەرز و سوونەتە

(٢) شێخ نووری کە بەدەستنووسەکەی(نەجمەددین مەلا)دا چووەتەوە(وەها)ی بۆ زیاد کردووە تا لەنگ نەبێ.
(٣) دیسان شێخ نووری بەقەڵەمی سەوز (بەم)ی بۆ زیاد کردووە ئەگینا لەنگ دەبوو.
(٤) مامۆستا (نەجمەددین مەلا) لە دەستنووسەکەیدا (هەڵنەدڕی) نووسیبوو.
(٥) سام: کوڕی نووحە. لەوەوە گەلانی سامی کەوتنەوە- تەورات. بڕوانە المنجد ل ٣٤٦، شاعیر لێرەدا مەبەستی ئینگلیزە.
(٦) واتە پێوەندی یەکەم جار. پێشینانی کورد دەڵێن: ئەمە ساڵی مەیموونە: ئەمە ئەوەڵی... ئاخری چۆنە؟
(٧) لە دەستنووسەکەدا (قەومی) نووسرابوو، کە شیعرەکە لەنگ دەبێ و ڕاستەکەشی هەر ئەوەیە بە(کۆ) باسی قەومەکان بکا، بۆیە وام لێ کرد.

وا تێ مەگەن، کە ڕەنگی کفنتان ئەچێتەوە[٨]
ڕەنگی ڕژاوی ئێوە، بناغەی حەمیەتە
ناچێتەوە بەلێزمەی لافاوی[٩] زوڵم و زۆر
ڕەنگێکی سابیتە، ئەسەرێکی جەلادەتە
ئەشرافی کوردە، دەستی لە قفڵی کەلەپچەدا
حەپس و زەلیلە، مەزهەری زلل و حەقارەتە
ئەم ڕەنگە، خوێنی مێشکی ڕژاوی سیاوەشە[١٠]
بەرگی گوڵی بیساتی، زەمینی حەمیەتە[١١]
تابووتەکانی ئێوەیە[١٢]، بەشانی کوردەوە
ئیعلان ئەکا نەتیجە، کە بەرزی و سەعادەتە
ئەیلوول و ڕۆژی شوومی شەشی تاکو نەفخی صوور
ڕۆژی عەزا و ماتەمی ئێوەی وەسیەتە
ئەم ڕۆژە، ڕۆژی شیوەن و گریانە تا ئەبەد
ئەم ڕۆژە، ڕۆژی ماتەم و[١٣] ڕۆژی عیادەتە
ئەم ڕۆژە، ئەم مەزاڵیمە، تا ڕۆژی ڕەستخێز
سەر لەوحەی سەحایفی تەئریخی ئوومەتە
ئاهی شەهیدی وەتەن، خوێن ڕژاوەکان
تەئریخییە و ئەگاتە خوا، ئەم هەناسەتە

١٣٥٠هـ - ١٩٣٠ز

---

(٨) لە دەستنووسەکەی مامۆستا (نەجمەددین مەلا) (ئەچتەوە) نووسراوە، کە شیعرەکە لەنگ دەکات.

(٩) لێزمەی لافاو: تەعبیرێکی هەڵەیە. ڕاستەکەی (لافاوی لێزمەیە)، چونکە لێزمە لە بارانی زۆر دروست دەبێت و ئنجا لە پاشان دەبێتە لافاو.

(١٠) سیاوەش: ئیشارەتە بۆ پاڵەوانەکەی داستانی شانامە. کە کابرایەکی خێرخواز بووە و لە تۆڵەی خوێنی ئەودا زۆران شەڕیان کردووە. بووەتە مەسەل و پەند.

(١١) ئەم قافیەیە سێ جار بەکاری هێناوە. کە نەدەبوایە وابێ.

(١٢) لە دەستنووسەکەی (نەجمەددین مەلا)دا (ئێوە) نووسرابوو، کە دێرەکە لەنگ دەبێت.

(١٣) لە دەستنووسەکەی (نەجمەددین مەلا)دا (ڕۆژی شیوەن و ڕۆژی عیادەت) نووسرا بوو.

## بۆ ئاهەنگی کۆمەڵی زانستی کوردان[1]

ئەم ئیـجـتـیـمـاعـە بۆ مـەهی عیـززەت بەراعـەتە
بۆ قـەومی کـورد، نیـشـانەی سـوبحی سـەعـادەتە
بوغز و غەرەز، نیفاق و حەسەد[2]، کینە و شقاق
بوونی فــەلاکــەتێکە، نەبوونی ســەلامــەتە.

---

(١) ئەم شیـعـرە لە ئاهەنگی کـۆمـەڵی زانسـتی کـوردان لە ڕۆژی جـومـعـەی (٧)ی کـانوونی دووەمی ١٩٢٧دا لە باخچەی کۆمەڵە خوێنراوەتەوە، کە ئاهەنگی چا خواردنەوەی ساز کردووە و زیافەتێکی چای ڕێک خستووە بۆ سەعات و نیوێک کۆمەڵێ خەڵک هاتبوون. (پیرەمێرد و ئەحمەد حەمدی و شێخ نووری) شیـعـریان بەم بۆنەیەوە خوێندووەتەوە و شیـعـرەکەی شێخ نووری هەر بۆ ئەو بۆنەیە وتراوە، متەسەڕیفی لیوای سلێـمانی بە نوتقێکی ئیرتیجالی زۆر بڵند و بەلیغەوە، ئاهەنگەکەی کردووەتەوە، ئنجا (پیرەمێرد) کە سکرتێری کۆمەڵەکە بوو، دوو پارچە شیعری خوێندووەتەوە و لە پاشان (مەنزومەیەکی غەرامی شاعیری نەورەسیدەی باغی وەتەن شێخ نووری) خوێنراوەتەوە.
دەمێنێـتـەوە سەر ئەوەی بزانین کـۆمـەڵەی زانسـتی کـوردان چۆن دامەزرا؟: (بلەی ڕەفـیق ئەفـەندی مەحامی) و (فایەق بەگی مارف بەگ) و (ڕەمزی ئەفەندی فەتاح) یاداشتنامەیەکیان دایە وەزارەتی ناوخۆی عێراق و لەسەر داوای خۆیان وەزارەتی ناوبراو بەپێی نووسراوی ناوخۆی ژمارە (٢٥٧١) ڕۆژی (١٩٢٦/٢/٢٤)دا بڕیاری دامەزراندنی (کـۆمەڵەی زانسـتی کـوردان) درا، تا ڕۆژی (٦)ی ئەیلوولی ساڵی (١٩٣٠) گەلێ ئاڵوگۆڕ بەسەر دەستەی بەڕێوەبەر داهات. کە (٦)ی ئەیلوول ڕۆژی داخستنی قوتابخانەی زانستی بوو. لە ساڵی (١٩٣٢)دا کە (ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ) کرایەوە بە متەسەڕیفی سلێمانی، سەرلەنوێ هەوڵ و تەقەللایەکی زۆری دا، تا توانی قوتابخانەی زانستی پێک بهێنێتەوە. ئامانجی سەرەکی ئەم کـۆمـەڵەیە (نەهێشتنی نەخوێندەواری) بووە لەناو کـۆمـەڵگای کوردەواری. لە پاڵ ئەوەش زمانی کوردی و بیرکاری و ڕۆشنبیری گشتی تێدا وتراوەتەوە. هەروەها شاگردەکانی ئەم کۆمەڵەیە لە ساڵی (١٩٣٦) بەدواوە هان دراون بۆ یاریکردنی پیپەس و کردنەوەی پیشانگا و پەروەردەکردنی چێژی ئەدەبییان. ئیتر کۆمەڵە وردە وردە دەرامەتی هاتە کزی و پارەی لێ برا. تا لە ساڵی (١٩٣٨)دا بەتەواوی ئیجازەی زانستی لێ سەنرایەوە و قوتابخانەی زانستیش خرایە سەر قـوتابخـانەی میـری و کـۆمـەڵەی زانسـتی کـوردان بووە قـوتابخـانەی (المعرفة) کە تا ئەمڕۆکەش مۆرەکەی زانستی تێدا پارێزراوە. بڕوانە ڕۆژنامەی ژین، ژمارە (١٥٧٩)، ساڵی (٣٥) ١٩٦٠/١٢/٢٦ هەروەها ڕۆژنامەی ژیان، ژمارە (١٢) سـاڵی (١)، (١٢)ی نیـسـانی ١٩٢٦، هەروەها بۆ هەمان مەبەست سوودم لە مامۆستا (کەریم زەند)یش وەرگرتووە.

(٢) لە شوێنێکی تردا (بوغز و حەسەد، نیفاق و غەرەز) نووسرا بوو.

بۆ مـیللەتێکی مـوبتـەدی یەک بوون و ئتـیـحـاد
ئەسـبـابی ئیـعـتـیـلا و تورەقی و ئووخـووەتە
مـیللەت ئەگـەر بلاو بێ، وەکـو ئاردی ناو دڕک
ئاسـاری ئینقـراز و بەلا و مـوسـیـبـەتە
بوغـز و نیـفـاق، مـوجـدی زوڵل و تەدەنیـیـە
شۆڕ و[3] شیـقـاق، مەحـفـەری ئەنواعی زیللەتە
بۆ ئیـعـتـیـلای قـەوم و تەرەقی ولاتەکـەت
تەرکی غـەرەز، عـەلامـەی قـەدر و فـەزیلەتە
بەم ئیـتـیـفـاقـە ڕۆژی سـەعـادەت تلـووع ئەکـا
ئەم ئیـحـتـیـفـالە، جەژنی تەعـالی و فـتـووەتە
ئەم ئیـجـتـیـمـاع و کـۆمـەڵی یەک بوونە تا ئەبەد
بۆ ڕەفـعی ئیـخـتـیـلاف، ئەمـینم، نیـهـایەتە
فـەرمـوو درەنگە دەست بدەنە دەسـتی یەکـتـری
مـیللەت بەدڵ کـە یەک بوو، بیـنـاغـەی بەقـووەتە
«زانستی» ، مافی کیانی[4] بە جەوهەری عموومەوە
بەسـراوە بەم جـەمـاعـەتەوە، ڕۆژی هیـمـمـەتە

(٣) لە شوێنێکی ترا (شوور) نووسرا بوو.

(٤) ئەم وشەیە بەئیملای کۆن نووسرابوو، دەتوانێ بە(گیان)یش بخوێنرێتەوە.

# بۆ ئیسلاحی ئاوی قوله

١٩٤٣/١/١٠

سەد شوکر وا لە مەنتیقەی پشدەر[١]
هاتە ڕانیە، هومای ئەوجی زەفەر
یەعنی (سدقی)[٢] جەنابی قائیمقام
ساحبی عەدل و داد و فەزڵ و هونەر
(ڕانیە)ی کرد بە(جنة المأوا)
لایقە بیکەیە سەری ئەفسەر
ساڵی تەئریخی تۆش بنووسە، بڵێ:
(اوەکەی کرد بەچشمەی کوثر)[٣]

١٣٦٢هـ

(١) ئەم قطعەیە بۆ تەئریخی ئیسلاحی ئاوی قولە لە ڕانیە، لەسەر تەکلیفی قائیمقامی ڕانیە (ڕەشید سدقی) وتوومە. (شێخ نووری شێخ ساڵح).

(٢) سدقی: مەبەستی (ڕەشید سدقی غفوور)ە کە لە شاری سلێمانی لە (١٨٩٠)دا لە دایک بووە، لە مەکتەب و قوتابخانەکانی ئاینی خوێندوویەتی، بەڵام شەڕی یەکەمی جیهانی نەیهێشتووە خوێندن تەواو بکات کە براوەتە جەنگەوە. هەروەها چووەتە ناو بزووتنەوەکەی شێخ مەحموودی حەفید و بەهۆیەوە تووشی گرتن و بەندیخانە بووە، بۆ ماوەی دوو ساڵ کۆمەڵێ وەزیفەی بینیوە لەوانە: یاریدەدەری بەڕێوەبەری ناحیەی (ناودەشت) و مەئمووری ماڵی قەرەداغ و بەڕێوەبەری ناحیەی تانجەرۆ و قائیمقامی پشدەر و (ڕانیە) و سەرۆکی شارەوانی شاری سلێمانی و قائیمقامی کۆیە تا لەو کاتەی کە لە کۆیە بووە لە ١٩٥٤/٨/١دا خانەنشین بووە. سەرەڕای ئەمانە خولیای شیعر و نووسین و ئەدەبی هەبووە و هەندێکیشی لە ڕۆژنامەکانی ئەو سەردەمەدا بڵاوکردووەتەوە. لە ساڵی ١٩٥٦دا کۆچی دوایی کردووە.

(٣) ئەم وشانەی ناو کەوانەکە دەکرێت بەژمارە:

١+٦+٥+٢٠+٥+١٠+٢٠+٢٠٠+٢+٤+٢+٥+٣+٣٠٠+٤٠+٥+١٠+٢٠+٦+٥٠٠+٢٠٠=١٣٦٢

## بەهۆی ئەوەی کە (شێخ لەتیف)
## لە بەسرا، لە بەندیخانە بوو ئەم قەسیدەیە وتراوە[1]

هەناسـەی ساردی، شـەوی ژینی تاڵ
خـۆ تۆ تیـژتری، لە سـروەی شـەماڵ
هەڵسـە و داوێنـت، بکە بەلادا
وەک تـەتـەر بـڕۆ، بـەرێـی هـەوادا
بەئەرزا مـەڕۆ، رێگەت لێ بەسـرا
بە ئاسـمـانا، بڕۆ بۆ بەسـرا[2]
بگەڕێ بەناو، شـاری بەسـرادا
بپـرسـە سـجن، وا لە کـام لادا
تۆ نەبی هیچ کـەس، ناگـاتە ئەوێ
تۆی بەرۆژ و شـەو، سـروەت ناسـرەوێ
لە درز و کـونی قـفڵ و دەرگـاوە
بـچـۆرە ژووری بە شنەی باوە
ئەچی بەدرزا، باریـکی و زەعـیف
بکە بەژوورا، بۆ لای شـێخ لەتیف
باوەشـێنی کـە فـێنک بێـتـەوە
عـارەقی لەشی دامـرکـێـتـەوە
ئەمجا بڵێ ئەی، دوو چاوی (نووری)
وا نووری ئەمـرێ، بەدەردی دووری

---

(١) شێخ لەتیفی کوڕی شێخ مەحمود (١٩١٧-١٩٧٢) کە لە ساڵی (١٩٤٦)دا لە دامەزراندنی کۆماری مەهاباد پشتگیری کردوون و یارمەتی داون، لە ساڵی (١٩٥٦)دا لە دوای موحاکەمەیەکی رووکەش لە دەعوایەکی عەشایەری کۆنی رابردوو، (ئیدارە) چوار ساڵ حوکمی بەند کردنی دا. دوای ئەوەی (مەحکەمەی کوبرا) لە سلێمانی هەر لەسەر هەمان دەعوا بێگوناهی داناوە و (تەبرییەی) کردووە. ئەوە بوو دوای یەک دوو مانگ نێردرایە بەندیخانەی (بەسرا). لە (١٩٥٨/٧/٣٠)دا لە بەندیخانە بەر بوو.

(٢) ئەم دێرە پێویستە لە کاتی خوێندنەوەیدا دان بەوشەی (ئاسمان) بنرێ.

ئـەنـالـێ و ئـەڵـێ، بـەدەم دەردەوە
بەچاوی ســـوور و ڕەنـگـی زەردەوە
شەرت بێ هەتاکو، جێی تۆ بەسرا بێ
تا دەرگـای خـۆشـیی، لە تۆ بەسـرا بێ
تا بەندیـخـــانە، بۆ تۆ مـــەئوا بێ
خـــۆشی و پێکەنین، لام تەوەللا بێ
تا شنەی شـــەمـــاڵ، نەشنێـــتـــەوە
نەدا لە پەڕەی، نەپشکووتووی گـــوڵ
دەم نەداتەوە، غـــونچـــەی تەنگی دڵ
ساوای ناو بێشکەی دڵ نەخنێـتـەوە
ڕۆژی ڕووناکـم، با شــــەوەزەنـگ بێ
دڵەی ڕاهاتووم، بە خـەم با تـەنگ بێ
نـەیـاوە لـە تـاو، دووری تـۆ نـووری
تەرانەی خۆش و شیعری مەشهووری
ئێـســتـا بەهاری، خـۆشـیم خـەزانە
ئیـــشم لەباتی، ســـەیران گـــریانە
فـرمـێـسکی چاو و دوودی هەناسـەم
برووسکەی هەوری، تامـەزرۆ و تاسـەم
ئەدەن بەیەکـــــدا، وەک هەوری بەهار
خـوێناو بەلافـاو، لە چاو دێتـە خـوار
ئەڕژێ[(٣)] بەســـەر، بیـــر و خـــەیاڵا
بـــەزەوی و زاری، ژیـــانــــی تـــاڵا
دڕک و داڵـی خـەم، دێنێـــتـــە بەرهەم
شـــایی و ســـروورم، ئەکـــا بەمـــاتەم
گلەیی مـــەکــــە، نووری چاوانم
نەمـــاوە بیـــر و هۆشی جـــارانم

(٣) پێویستە لە کاتی خوێندنەوەدا دانی پێدا بنرێ، ئەگینا لەنگ دەبێ.

ئێستا بولبولی، خۆشخوانی فیکرم
لەگەڵ نیگاری، ڕازاوەی شیعرم
دەس لە ملانی یەک نابن وەک جاران
بەخۆشی بچن بۆ سەیر و سەیران
ئەو بەدەنگی خۆش، بڵێ گۆرانی
ئەم شیعر بڵێ، بەکامەرانی
خۆ نەخوازەڵا، دنیاش وەهابێ
بەدەوام ترسی، گرتنت لا بێ
چاوەڕێ بێ کەی، تووشی بەڵا بی
تووشی لێدان و جەور و سزا بی
شاری چی، بێ دەنگ، وەکو وێرانە
کوندەبوو بە شەو، تەرانە خوانە
شادی و پێکەنین، لای کەس نەماوە
بەسەریا خۆڵی، مردوو بێژراوە
زوبان لاڵ، گوێ کەڕ، دیدە نابینا
عالەم دێ و ئەچێ، وەکو مقەبا
کام زوبان تۆزێ، تەڕ و پاراوە
سەد پشکۆی سووری، پیا چزێنراوە
کام گوێ ببیسێ، خراپەی وەزیر
خاوەنی ئەدرێ، لە کۆتە و زنجیر
کام چاو کردەوەی، نارێکی دیوە
گلێنەی بەدار، زوو دەرپۆقیوە
لە ترسا لە ماڵ، نایەمە دەرێ
ئەگەر لافاوی، خوێن بێ و سەر بەرێ
ئەستێرەی گەشی، سەمای هۆش و بیر

له هەور و هەلای، تەمی مـاتەمـا
گـیـرۆدە و دامـاو، زەبوون و ئەسـیـر[٤]
لە دەریا هەوای، بێ بنی خـەمـا
نوقـمـە و پرشنگی، چاوی نەمـاوە
ڕەنـگـی ڕوونـاکـی، لـە ڕوو بـڕاوە
ئەپارێمـەوە، لە قـاپـی یەزدان
لەلات دانیـشم، نەختێ وەک جـاران
بەلام ئەترسم، بەئاوات نەگـەم
ئاواتی دلم، لەگـەل خـۆم ببـەم
لە قـەبریشـا دل، تۆزێ نەسـرەوێ
خـەوێکی خـۆشی، هەر لێ نەکـەوێ
بە ئازارەوە، هەر بتلێـتـەوە
ڕۆژی ڕووناکی، لێ نەبێـتـەوە
ئەی نـووری دیدە، مـن تـکـام وایـە
هەر ڕزگـار ئەبی، ئەمـە دونیـایە
کـە هاتیـتـەوە (نووری) نەمـا بوو
خـۆی و ئاواتی، هەردوو نێـژرا بوو
ڕۆژێ بە هەوەس، وەرە سـەر قـەبران
بن ئەرخـەوانێ، لە گـردی سـەیوان
بەدووکـەلی ڕەش، دلەی سـووتاوم
بەڕەنگی سـووری، خـوێناوی چاوم
کـێلی قـەبرەکـەم، سـوور هەلگەڕاوە
ڕەنگی خۆلەکـەی، ڕەش داگیـرساوە
هەر تاقـە تۆزێ، ورد ببـیـتـەوە
قـەبرەکـەی (نووری)، ئەناسیـتـەوە

---

(٤) شاعیر لە دەستنووسەکەیدا (نەسیر)ی نووسیبوو. من (ئەسیر)م بەڕاست زانی. ڕەنگە هەلەی کاتی نووسین بێ.

لەناو سەد قەبرا، قەبری من دیارە
خاک و خۆڵەکەی، مات و غەمبارە
خۆی هاوار ئەکا، من قەبری نووریم
کوژراوی ئێشی، زامی ڕەنجووریم

(٢٣)ی کانوونی ئەوەل ١٩٥٧ سلێمانی




پێشوازی دانیشتوانی شاری سلێمانی بەبۆنەی بەربوونی شێخ لەتیف شێخ مەحموود لە
بەندیخانە کە وەک لە وێنەکەدا دیارە بەسەر شانی جەماوەرەوەیە - ١٩٥٨

## دیناری مووەزەفین[1]

بەبۆنەی دەستکورتی و مانگانە کەمیی زەمانی جارانی مووچەخۆرەوە وتراوە.

هەر خار و خەسی شوومییە، گوڵزاری مووەزەف
کاوول بووە، جێی کوندەبووە شاری مووەزەف
خوێنی جگەرە بۆتە شەراب و مەیی مەئموور
دەنگی دڵە، ئاوازی نەی و تاری مووەزەف
مەئموور وەکو(شێخ هۆمەر)و[2]وەزعیش بەمەسەل مار[3]
خۆرایی نییە، ناڵەو و هاواری مووەزەف
ناکا بەشی قاوەڵتیی ڕۆژێکی من ئەمساڵ
سەد خۆزگە بەدینارێکی پێراری مووەزەف[4]

---

(١) لە حەربی عموومی دووەمدا کە دینار قیمەتی هیچ نەماو شت و ئیحتیاجاتی ژیان گران بوو و مەعاشات و مووچەش هەر وەکو خۆی مابووەوە. تەبەقەی - ڕاستەکەی فیئەیە -ئازاد- موزەفین لە حاڵێکی زۆر پەرێشانیدا زەمانی شۆڕشەکەیان ئەبردە سەر، ئەم پارچە شیعرە بەو موناسەبەتەوە وتوومە و (دیناری مووەزەفین) بەحیسابی ئەبجەد (١٣٦١) هیجری ئەگرێتەوە لە مقابل بەساڵی ١٩٤٢ی میلادییە. (شێخ نووری شێخ ساڵح).

(٢) شێخ هۆمەر و مارەکەی: ئیشارەتە بەو چیرۆکە فۆلکلۆرییەی بەکورتی دەیخەینە ڕوو. دەڵێن کابرایەک مارێکی سڕ بوو دەبینێ پەپکەی خواردووە، بەزەیی بەمارەکەدا دێتەوە و لە سەرما ڕزگاری دەکات و گەرمی دەکاتەوە، کە گەرمی دەبێتەوە مارە سپڵەکە لە ملی دەئاڵێ و دەیەوێ پێیەوە بدات، کابرا هەر چەند دەکاو دەکۆشێ لەگەڵ مارەکە سوودی نابێ و لە کەڵی شەیتان نایەتە خوارێ، لەو کاتەدا پیرەمێردێ دەبینێ و دەڵێ مادام هەر وایە با ئەم پیاوە ڕیش سپییە بکەینە دادوەر لەم مەسەلەیەدا، کابراش زیرەک و دنیادیدە دەبێ و لە مەسەلەکە تێدەگا، بۆیە داوا لە مارەکە دەکات بچێتەوە ئەو دۆخەی کە کابرا تێیدا دیویەتی، بەم شێوەیە مارەکە دێتە خوارەوە و پەپکە دەخوات و ئەوانیش بەدار دەکەونە وێزەی و دەیکوژن. هەن ئەم هەقایەتە بەجۆرێکی دی دەیگێڕنەوە.

(٣) لە دەستنووسێکی تردا: (مەئموور وەکو شێخ هۆمەر و وەزعیش وەکو مارە) نووسرا بوو.

(٤) بەر لەم دێرە لە دەستنووسێکی تردا ئەم بەیتە نووسراوە:

بەختی هەموو مەئموورێ قەرە و ڕەش بووە ئەمڕۆ
پڕ خوێنی گەشە، کووپی دڵی زاری مووەزەف

هێند عاجزی قەرزارییە، هەر گەییە سەری مانگ
کافر بێ بە جەستەی دڵی غەمباری مووەزەف
سەد درهەمە، نۆتێکی[٥] ئەم و ئەو لە ڕەواجا
پارە، یەک و پێنجیش نییە، دیناری مووەزەف
ئەستێرەی سەرشانی من و تۆ بوو وەزیفە
دوێنێ، کەچی ئەمڕۆ بووەتە باری مووەزەف
وا پایزی غەم، باخی بەهاری فەرەحی کوشت
غونچەی گڵەزەردە، گوڵی گوڵناری مووەزەف
وەزعی دڵی ئەمساڵی مەعاشم کە ئەبینم
سەد خۆزگە ئەخوازم بەدڵی پاری مووەزەف
یاڕەبی ئەوەی دوژمنە بەم میللەت و خاکە
بێ حورمەتی کەی، هەر وەکو دیناری مووەزەف[٦][٧]

(٥) پارەیەکی ئینگلیزییە.

(٦) لە ڕۆژنامەکەدا: (یاڕەبی ئەوی دوژمنی میللەتی کوردە) نووسرابوو.

(٧) لە دەستنووسێکی تردا ئەم بەیتە دوا بەیت بوو:

حەریێکە لەگەڵ کۆمەڵی مەئمووری بەسەزمان
بێ نرخە، ئەڵێی سینەکە، دیناری مووەزەف

## حەقە ئەمڕۆ[1]

١٩٤١/٢/٢٥

حـەقــە ئەمــڕۆ بدا تانە لە مــاهو مــشـــتـەری و ئەخـــتـەر
سلێـمـانی بەشـيـعـری ئێـوەوە ناوبەتە سـەر، ئەفـسـەر
تەمـاشـای لاپەڕەی ژین کـەن، نيـيـە جێ نوختـەيە خـاڵی
لەبەر ئەشعـاری تازەی شـاعـيـران، ئەم سـەر هەتا ئەو سـەر
ئەبينی شيـعـری لوجنەی فـەحسی تووتن، بێشـەمـەو بۆندار
ئەبينی مـــيــــسـرەعی وا قـــامــەتی بەرزە وەكــو عـــەرعـــەر[2]
ئەبينی شيعری (سيدقی)[3] پڕ لە نوكتەی خۆش و مەعنيدار
لەســەر مـاڵی (مـەلا) شـەڕيە لەسـەر پێـيـە وەكـو وەروەر
ئەبينی شـيــعــری وا[4] پڕيە لە قـەيسی و مـێـوژ و بادام
فـەسـاحـەت جـيـڕ و هوڕی دێ لەوێدا[5] وەک كـەلەرمی تەڕ
لە ناو ئەشـعـاری ئەم خـۆراكـە نايابانە شـيــعــری كـۆن[6]
ئەشـوبهێ هەر بەتەشـپی[7] پڕ لە ترخـێنە و لەپەی سـاوەر

(١) سەردەمێ جەريدەی ژین بەعزێ شتی ئەنووسی، ناوی نرابوو شيعر، ئەم شيعرانەش كە لە لايەن لوجنەی فەحسی تووتن كە لە پێنجوێن بوون، ئەنێرران بۆ ژین. ژین-يش يا بۆ پێكەنين وەيا بۆ ڕازی كردنی ساحێب شيعرەكان چاپی ئەكردن، منيش ئەم شيعرانەم لەو وەختەدا وتووە و بڵاوم كردەوە ١٩٤١/٢/٢٥ . (شێخ نووری شێخ ساڵح).

(٢) مەبەستی ڕەفعەت ئەفەندی درێژە كە لە نامەكەی بۆ سەجادی ناردووە ئيشارەتی بۆ كردووە.

(٣) مەبەستی (ڕەشيد سيدقی غەفوور)ە كە لە شوێنی تر باسمان كردووە.

(٤) هەر لە دەستنووسێكی تری شاعير: (ئەبينی ميصرەعەو...) نووسرا بوو.

(٥) هەر لەو دەستنووسەی شاعير: (جيڕ و هوڕی دێ لەواتا...) نووسرا بوو.

(٦) هەر لەو دەستنووسەدا: (شيعری من) نووسرا بوو.

(٧) هەر لەو دەستنووسەدا: (ئەشوبهێ هەر بەدەفری...) نووسرا بوو.

شوکر فەوتا (جیناس) و[8] قاعیدەی تەشخیس و ئیستیفهام
هەتا کـەی بۆ (تەضـادێ)[9] دابمێنم والەو مـوضطەر
هەتا کـەی من مـقـەیەد بم بەقـەیدی قـافـیـە و ئەوزان
هەتاکـو کـەی (تەجـاهول عـارفـانە)[10] بێنمـە دەفـتـەر
لەگـەڵ تەردید و قـەتعـا، بۆ نەکـەم قـەتعی عـیـلاقـەی دڵ
بەکـەڵکی چیم ئەشێ، غـەیری خـەفـەت هێنان و دەردی سـەر
دەبا بڕوا (وضـوح) و (ئیسـتـیـعـارە)[11] گۆڕی با گـووم بێ
ڕجـوع و (حـوسنی تەعلیل) و[12] نیـدای حسی بەدیع ئاوەر

(٨) جیناس: ئەوەیە کە لە بەیتێکدا یان لە دێڕێکدا دوو وشە کە لە وتن و پیت و نوقـتەدا وەک یەک بن، بەڵام هەریەکـەیان مانایەکی سەربەخۆیان هەبێ. خۆ ئەگەر هەردوو وشەکە یەکسان بن بەیەکتر پێی دەڵێن (جیناسی تام). وەکو ئەو بەیتەی (زێوەر): (دڵ بۆتە بۆتە بۆ تۆ).
(٩) تەضاد: خەیاتێکی یەک چاو ناوی (عومەر) دەبێ، کابرایەکی قسە خۆشی عەنتیکە پێی دەڵێ ئەگەر دەستێ جلی جوانم بۆ بدروویی، بەمەرجێ کەس نەزانێ (کەوایە) یان (جوبەیە) من بە بەیتێ ستایشت دەکەم، کەس نەزانێ ئەمە مەدحە یان زەمە. لە پاشان کابرای بەرگ دروو، داواکارییەکەی بەجێ دەهێنێ، ئەمیش ئەم بەیتە دەڵێ:
خاط عمر قبا
لیت عینیه سوا
ئەمەش بۆ دووبارە دەبێ و دەتوانرێ مەعنای لێ بدرێتەوە. واتە هەردوو چاوی وەکو چاوە ساغەکەی لێ بێت، یان هەردوو چاوی کوێر بێت. ئەمەش دوو مانای دژ بەیەک دەگەیەنێ. ل ٦٨-٦٩ تاریخ الأدب في إيران من فردوسي إلى سعدي للمستشرق إدوارد جرانفيل براون. نقله الى العربية إبراهيم أمين الشواربي - مطبعة السعادة - مصر ١٩٥٤ .
(١٠) تجاهل العارف: ئەوەیە کە شاعیرێک نەزانینی خۆی بەرامبەر بەڕاستییەک دەربڕێ کە لەمەدا مەبەستی ئەوەیە ئەو شتە بەموبالەغەوە وەسف بکا ل٢٢٠ الجديد في البيـان والعروض، سمير سمعان، لبنان، بيروت ١٩٦٩
(١١) مەجاز دوو جۆرە، هەر مەجازێ کە لەسەر (تشبيه) بینا بکرێ پێی دەڵێن (ئیستیعارە) و هەر مەجازێ کە لەسەر غەیری (تشبيه) بینا بکرێ پێی دەڵێن مەجازی (مرسل). سەرچاوەی پێشوو ل١٧١
(١٢) حسن التعليل: کە شاعیر حەقیقەتێکی ڕووداو و بەهۆیەکی خەیاڵی یان شیعری لێک دەداتەوە وەکو شیعری مانگی چواردە، وەرگێڕانی (عەلی کەمال باپیر). ل ٨٨ کتێبی تأريخ الأدب في إيران.

له بۆ چیم چاکـــه بەینێ دامێنم بۆ (لەف و نەشـــرێ)[١٣]
(مرەتەب)[١٤] یا (مشەوەش)[١٥] بۆ بەدڵما چێ وەکو نەشتەر
بەقـــانوونیش مـــووزەف گـــەییـــیـــە حـــەددی خـــۆی تەقـــاویتـــە[١٦]
تەمـــای چیـــمـــان هەیە، تاکـــەی بژی شـــیـــعـــری من و زێوەر[١٧]

---

(١٣) و (١٤) و (١٥) لەف و نەشر: یان (طی و نشر). لە زمـانـدا (طەی) واتە کـۆکـردنەوەی چەند شتێک لە یەکێکدا کە بیشارێتەوە. (نەشر)یش ئەوەیە کە ئەوەی شاراوەیە یەک یەک دەری خەیت یان بیخـەیتە ڕوو. (طەی و نەشر) چەند مەعنایەک لە چەند لەفزێکدا کـۆ بکەیتەوە. لە پاشان ئەو مـەعـنایانە بەدرێژی دەربخـەیت. یاخـود چەند مـەعـنایەک بەیەکـەوە بهـێنی و لە پاشـان هەریەکـەیان بەدرێژی باس بکەی. (طەی و نشر) دوو جـۆرە. ئەگەر دەرهێنانی مـەعنایەکـان بە تەرتیب بێ، ئەوە پێی دەگوترێ (مرتب) وەکو ئەم شیعرەی (نالی):

ئاسمانی حوسنی مـەحبووبم لە ئەبرۆ و زوڵف و ڕوو
دوو هیـلال و دوو شـەو و دوو مـاهی تابانی هەیە.

خۆ ئەگەر نەشرەکە بەتەرتیب نەبوو، ئەوە پێی دەڵێن (لەف و نەشری) (مشەوەش). بڕوانە جواهر البلاغة في المعاني والبيان والبديع - تأليف أحمد الهاشمي، الطبعة الثانية عشرة ل٢٤٧ .

(١٦) هەر لەو دەستنووسەی شاعیر: (گەیییە وەختی...) نووسرابوو.

(١٧) لەو دەستنووسەدا ئەم دێرە شیعرەش هەیە کە لە دەستنووسەکەی من پشتم پێ بەستووە دانی پێدا نەناوە.

لەسەر دەرکە تەصەدور (نووری) بۆ شیعرت لە دیوانا
گەدایی بێ نەوایە، چۆن ئەبیتە ساحبی کیشوەر

هەروەها لەگەڵ ڕۆژنامەی (ژین) کە بۆ یەکەم جار ئەم شیعرەی تێدا بڵاو کراوەتەوە تۆزە جیاوازییەکی هەیە.

# پەپوولە

خـــۆزگـــە ئەمـــزانی تۆ بۆ؟
وا خـــۆت ئەکـــەی ڕەنجـــەڕۆ؟
پـەپـوولـەی بـاڵ هـەڵـوەریـو!
بەتیـــــشکی گــــڕ دارزیو[1]
باڵـداری جـــوان و ڕەنـگین[2]
ئێسک سووک و باڵ نەخشین[3]
بەڕۆژ لەم گـــوڵ بۆ ئەوگـــوڵ
لـەم چڵـــــــەوە بـۆ ئـەو چـڵ
ئەفـــڕی و ئەنیـــشـــیـــتـــەوە
بۆنی خـــۆش ئەچنیـــتـــەوە
هەر تاریکیت لێ دەرکـــەوت
چاوت بەشـوعلە و گـڕ کـەوت[4]
بـاڵـت هەڵئـــــــەپرووزێـنـی
جـــەرگت هەڵئـــەقـــرچێنی
بـاڵـداری بـاڵ ڕەنـگـاوڕەنـگ
دەم پـڕ هـاواری بـێ دەنـگ
خـــۆزگـــە ئەمـــزانی تۆ بۆ؟
وا خـــۆت ئەکـــەی ڕەنجـــەڕۆ؟

***

---

(١) لە دەستنووسێکی شاعیردا شوێنی ئەم بەیتە، لەگەڵ بەیتی سێیەم ئاڵوگۆڕ بووە.
(٢) هەر لەو دەستنووسەدا (باڵداری جوان و شیرین) نووسرا بوو.
(٣) هەر لەو دەستنووسەدا (ئێسک سووکی باڵ نەخشین) نووسرا بوو.
(٤) هەر لەو دەستنووسەدا ئەم بەیتە بەم جۆرە بوو:
کـە تاریکیت لێ دەرکـەوت
چاوت بەشـەوقی گـڕ کـەوت

شــــــەبەق ئەدا بەیـانـی
لە گـوێ جـۆگـە و سـەرکـانی[٥]
ئـەگـــــەرێی تـا ئـەتـوانـی
هیچ مـــاندوویـتی نـازانی
کـام جـێگا خـۆش و بەرزە
کـــام لق ناسکە، ســـەوزە[٦]
لـە دوورەوە بـۆی ئـەفــــــڕی
جـێگای خـۆتی لێ ئەگـری
بەڕۆژ جــــێت ناو گـــولاَنە
بەشــەو ئەبیـــــە پەروانە
لە کـوێ بەشـــوعلەت زانی[٧]
خـۆت ئەکـەی بەقـــوربانی
پەپوولـەی نـاسـک و نـازدار
عــــاشــــقی دڵ بـرینـدار[٨]
خـــۆزگــــە ئەمــــزانی تۆ بـۆ؟
وا خـۆت ئەکـەی ڕەنجـەڕۆ؟

(٥) هەر لەو دەستنووسەدا (شەبەق بدا بەیانی/ لە گوێ جۆگەلە و کانی) نووسرابوو.
(٦) هەر لەو دەستنووسەدا (کام لق ناسک و تەرزە) نوسرابوو.
(٧) هەر لەو دەستنووسەدا (لە کوێ شوعلەت پێ زانی) نووسرابوو.
(٨) لەو دەستنووسەدا ئەم دێرە لەگەڵ دێری هەشتەمدا شوێنیان ئاڵوگۆڕ کراوە.

## گێژەڵووکەی بای بەتینی...

گـێـژەڵـووکـەی بـای بەتینی پێـچـەوانەی ڕۆژگـار
کـارەسـاتێکی بە من کـرد، ئێـسکی کـردم بەپوار
خستمییە تەق تەق بەناحەق دەستی پڕ زۆری قەدەر
ذاب قلبي في العـذاب، طار فكري فـي انكسـار
(زێ) بەلـێـلـی و سـووریا دایم لە چاوی من ئەچێ
ئاوی ئەو لێڵە و بەخوڕ دێ، ئەم تنۆکەو دێتە خوار
خۆم ئەزانم چیم بەسەر داهات بەدەس چەپگەردەوە
کـیـف فـر العـز مني کـیـف ضـيـعت الوقـار
ایسـتـەمم رازی درونـی خلقـە افـشـار ایلیـەیم
این سـخن ناگـفـتـە بە هرکـز مـبـادا اشکار
سینە پڕ داغـی فـیـراق و دیدە پڕ فـرمـێسکی غـەم
نـائومـێـد و قـوڕ بەسـەر، ئاوارەیی یار و دیار
غـەم وەها بێزاری کردووم خۆم بەنەفسی خۆم ئەڵێم
بویلە بر احـسوالدە پک اعـلا دکلمی انتـحـار
ان قـلبـي كـان مـثل الطـيـر في سـجن فطار
هەر کە هێنای بۆم سەبا موژدەی قدوومی نەوبەهار
مـرغی زاری دل چو از بـندی قـفس ازاد شـد
شـد غـزلخـوان آشـیـان بگرفت اندر مـرغـزار

## ناچم بۆ بەغدا

هەتا پێم بکرێ ناچم بۆ بەغـــدا
لە بەغـــدا دڵم هیچ ناکـــرێتـــەوە
بـا هـەزاران ڕۆژ پـێـکـەوە ژیـابـن
دۆسـتی خـۆت لەوێ ناتناسـێتـەوە
با خسـووس هێـڵێ گـەورەی کـردبێ
نایەوێ کـۆنی بیـر کـەویتـەوە
چاوی پێت کـەوێ، دڵی تێکەڵ دێ
لە ڕابووردووی خۆی قـێزی دێتـەوە
ئـەگـــەر بزانـێ تـۆ ئەچی بۆ لای
ئەو ڕۆژە ئەو خـۆی ئەشـارێتـەوە
ئەڵێ نەوەکـو، خـودا نەکـەردە
ئیـشـێکی ببێ و بپـارێتـەوە
یا بۆ تەعـینێ، یا بۆ تەرفـیـعێ
هـاتبێ لە من، بلالێـتـەوە
فـەقـیـرێ بچێ، بۆ لای وەزیرێ
مەعنای بۆ ئەو چاک، لێک نادرێتەوە
نـازانـن ڕۆژی، ئـاواش ئـەبـیـنـرێ
تـەئـریخ بـۆ دواوە، بـگـەڕێتـەوە

## هیمەتی پیران

ڕۆژنامەی (ژین)ی ژمارە (٨٢٢)، (١١)ی (ربیع الثاني) ١٣٦٥ ساڵی (٢٠)، بەم ناوونیشانەی سەرەوە ئەم باسەی بڵاو کردووەتەوە. (ئێمە پیرێکی ڕەوشەن زەمیرمان لە بەغدایە، ئەمەندە ساڵە بۆم ڕێ نەکەوتووە زیارەتی بکەم، چونکو گۆشەگیرە و نەیویستووە بناسرێ. لەم دواییەدا دوو شاهـ ئەسەری جیهانی و مەعانی ئەوم دی، یەکێکیان (بەهائەدین) پاشای ئەسەری حەیاتی بوو، دووەمیان ئەسەرێکی تەدریسی عیلمی (وضع)ی بوو کە لە کوللییەی (ئەعظمیە)دا بەدەرس وتوویەتەوە. پیچولەی ئەمانەیشی حەللی (لەغزێکی) بەنەزم کردووە، دەست من کەوت چونکو مەوزووع لە (وضع) و موعەمما بوو. منیش لەپێشەوە بەموعەمما هاتمە پێشەوە. ئەو زاتە شێخ نورەدین شێروانییە، کە باوکی بەهائەدین پاشای متەسەریفی پێشوومانە و موئەلفی ریسالەی عیلمی (وضع)ە. لەغزەکە کورێکی زاوایان کە لە (دۆغرەمەچی)یەکانی هەولێرە و تەخەلوسی (کانی)یە وتوویە ئەمەیە:

ئاشنای ئەسراری قەلبەی بێگومان
دەردەخا ماهییەتی سرڕی نیهان
هەرکەسێ فەیزی ئەوی بۆ ڕێ کەوێ
پادشاهێکە، بەگەردوون نانەوێ
بادەیەکی گەر بنۆشی بێگومان
پیاڵەیەک ئاو، نایەنێ ملکی جیهان
جەوهەری سێ حەرفە، یەک حەفتا تەمام
ناوەڕاستی سێسەد و دوای سەد بەنام
هەرکەسێ بیزانێ دیارە تێدەگا
بێگومان فەیزی ئەویشی پێدەگا

ئنجا نووسراوە لە تەرەف (شێخ نووری)یەوە وا حەل کرا:

ئەو موعەممایە کە سێ حەرفە بەناو
وەک موالیدە شمولی کەوتە ناو

عـشــقـه، جـهزبهی ســڕڕی یهزدانی ههیه
بۆ دهمــاخی نهشـئـهیی وهحــدهت مــهیه
عـشــقـه، شـێـرانی جیـهـان دێنێـتـه بهند
عـشـقـه، ڕۆحی پاک ئهخـاته ژێر کـهمـهند
عـشـقـه، کـهس ناتوانێ شـهرحی لێ بدا
عـشــقــه، مـایهی زهوقی ناسـینی خــودا
عـشــقـیـان دانا بهدوو نـهوع، ئههلی حـاڵ
عشقی سانع، عشقی مهسنووع دوو مهئال
عـشــقی سـانـع، شـێـوهیی ئینسـانیـیـه
عـیشقی مهسنووع، ئارهزووی حهیوانییه
ئارهزووی حــهیوانیی، دوایی جــهنـنهته
سـهفــوهتی ڕۆحــانیی، مــایهی جـهننهته
عـشـقی زوڵف و خـاڵ و ڕوومـهت فـانیـیـه
عـیـشـقی پهنهـانی لهتای سوبحـانیـیـه
ئاه ئهگـهر (نووری) لهمـه بهشـدار ئهبوو
داخلی نـاو دهفــتــهری ئهحـــرار ئهبوو

# ژن

ژنی بەد چەشنی کـــۆڵنج ژان ئەهێنێ
ئەگـەر زوو نەیتـەقـێنی، ئەت تەقـێنێ
ژنـێ ژن بێ، لـە ژانـی ژینـی دونـیـــــا
بەجـۆرێ لات ئەدا، سـەر سـوڕ ئەمـێنێ
ژنـت گـــــەر[1] ژن نەبـێ، ژانە ژیـانت
ژنێ ژن بێ، هەمـــوو دنیـــا ئەهێنێ

(١) لە دەستنووسەکەی شاعیردا (گە) نووسرا بوو، وا دیارە لە کاتی نووسیندا (ڕێ)یەکەی کەوتووە.

## بەکوردی ناوی مانگەکان

(نیسـان) بەکـوردی (شـەسـتـەباران)ە
ناوی (مـایس)یش (بەخـتـەباران)ە
(حـوزەیران) ناوی، (باران بڕان)ە

***

ناوی (تەممۆز)مـان دانا (خـەرمـانان)
(ئاغـستۆس)، (گـڕە) گەرمای فراوان
(ئەیلوول)، (گـەلاوێژ) فـێنکی بەیان

***

ناوی (تشرین ئەوەل)، (مـشـتـاخـان)
(تشرینی دوهەم)، (پەڵە) وەرد کـێلان
ناوی (کـانوونی یەک)، گـەڵاڕێزان

***

ناوی (کانوونی دووهەم)، (ڕێبەندان)ە
(شوبات)، (ڕەشەمێ) ناوێکی جوانە
مانگی (مارت)، (تارە) ئاخری زستان

***

زۆر تکا ئەکـەم لە خـوێندەواران
لە خـاوەن بیـر و تیـپی زانایان
لەم نـاوانە گـەر چاتر ئـەزانن
بیـڵێن بەشەرتێ باش بێ لای هەمووان
لە جـێگای ئەمـان، ئەو پەسـەند بکرێ
ئـەوە نـاوی بێ، تا ئـاخـر زەمـان
نەک من بەجـۆرێ، ئەوی تر جـۆرێ
نـاویان بۆ دانێین بەکـەیفی خـۆمـان

***

## (غونچە) و (شیرین) و (کاڵێ)...

(غونچە) و (شیرین) و (کاڵێ) سێ کچن ئەولادی گیو
قـــابیلـن هەر سێ وەزن بکرێن بە ئاڵتـــوون و بە زیو
غـــونچـــە وا تازە خـــەریکی پێکەنینە بۆ فنوون
عـیشـوەیی (شیـرینێ) سەد فـەرهاد ئەخاتە بێستوون
چاوی مـەست و کـالی (کـاڵێ) پڕ لە بادەی عـیسمـەتە
ڕەبی هەر سێ تاجی بەرزی بن لە بۆ ئەم مـــیللەتە
باغی بێ خـــاری حـــەســـادەت، نەوزهووری وا دەبێ
غـونچـە شیـرین بێ بە کـالی، بـاغی مـەسعـوودییـەتە[1]

(١) لەم مێژووەدا ماڵی ئێمە لە ڕواندوز هاتنەوە هەولێر. دوای نیوەڕۆ بوو لە باڵەخانەی مەحەلەکەمدا (شێخ نووری) لە لام دانیشتبوو. لە ناکاو (غونچە) و (کاڵێ) و (شیرین) هاتنە سەرێ. (شێخ نووری) ناوی پرسین و دەستبەجێ ئەو چوار شیعرەی بۆ دانان. گیوی موکریانی.

## نابینمەوە قەت لێرە یەکێ...

نابینمـــەوە قـــەت لێـــرە یەکێ یار و وەفـــادار[١]
حـەقـمـە کـە ئەبینم لە شـەوا خـەو بە مـەلاوە
هەر دەربەدەر و نەفـیـــە، ئەوی سـیـرەتی چابێ
ئـەیـقـــــۆزنـەوە کـــــردەوەی بـەد بـە هـەواوە
ئینسـانی وەکو عـەبدە، لە کۆی دەست ئەکەوێ ئاخ
نایدۆزمــــەوە هەرچەنـد بگـەڕێم بۆی بـە چراوە
ئەو شـەخسـە کەوا لامی قەڵەو لای وەکو (ڕێ)یە
پیـرێکە بەشـەو هیـمـەتی شـەوکـێڵ[٢] بەدوواوە[٣]

---

(١) ئەم شیعرەی لە هەولێرەوە ناردووە بۆ ڕۆژنامەی ژین. دەڵێن ئەو شیعرەی بۆ شێخ ئەحمەدی شێخ غەنی مامی کە نازناوی (فەوزی)یە نووسیوە.

(٢) پیری شەوکێڵ: شەخسێکە لە شاربازێڕ، ژنان لە ڕۆژانی دیاریکراودا دەچنە سەر مەزارەکەی. گوایە وا بەناوبانگە کە شەو لە گۆڕەکەی هاتووەتە دەرێ و زەوی کێڵاوە. بۆ نەزر و نیاز خواستن دەچنە سەر مەزارەکەی.

(٣) مەبەستی ئەوەیە کە شەخسی (شەوکێڵ)ی لە دوابێ بۆ ستایش کردنە، بەڵام بۆ تانووت و زەمیش دێت، چونکە کینایەیە بۆ کاری سێکس لە شەواندا. لە ڕۆژنامەی (ژیان)ی ژمارە (٤٢٥)ی ساڵی (١٠) (٥)ی کانوونی دووەمی ١٩٣٥دا لە لاپەڕە (٢) بەناوی پەندی پێشینان - کە دیارە هی پیرەمێردە - نووسراوە:

ئەوانەی لەهجەی لامیان وەک ڕێیە
ئەزانن پیری شـەوکـێڵ لە کـوێیـە
ئەوانە کـە ڕێ بەغـێن ئەخـوێنن
جلوەی فـێڵبازی دوو قەوم ئەنوێنن

## هاوار لە دەس مالییە

لە حالّم گەر ئەپرسی، ڕۆژ و شەو، مەبهووت و حەیرانم
لە بەحری واریدات و مەسرەفا، غەرق و پەرێشانم
بەڕۆژ دائیم خەریکی جەدوەل و جەمعی حیساباتم
بەشەو خەو خۆ[1] نییە، خولیا زەدەی ئیشی سبەینانم
بەمەسرەف هەر ڕەزامەندم، وەزیفەی خۆمە پێم خۆشە
حیسابی واریداتیش تازە وا هاتووەتە سەر شانم
لە تەحویلاتی خارج عاجزم، داخل بەهەر سوورەت
بەمیم، حێ، بیست و دوو ڕازیم، لە دەس جەمعی پەرێشانم[2]
لە تەوحیدی حیساباتی قەزاکان هێندە بێزارم
ئەگاتە عەرشی ئەعلا بۆچرووکی جەرگی بریانم[3]
لە ئازاری نیهائی و[4] مولحەقی هەرگیز مەپرسە لێم[5]
خودا دوور بێ، لە ئازاری هەموو خوێش و عەزیزانم[6]
گەهێ مەشغولی دوکوم، گەهـ خەریکی جەدوەلی سولفەم[7]
دەمێ داماوی سەهووی جەمع و تەنزیلاتی نیسانم[8]
لە ئاخر مەرحەلەی تەنزیمی ئەوراق و جەداولدا
چل و پێنج فەرق ئەکا، ئیجمالی شەهری، چی بێ؟ نایزانم

---

(١) لە دەستنووسێکی شاعیر (شەویش خۆ خەو نییە...) نووسرابوو.

(٢) هەر لەو دەستنووسەدا: (بەتەسدیدی پەرێشانم.) نووسرا بوو.

(٣) هەر لەو دەستنووسەدا: (ئەگاتە ئاسمان، ئاهو ئەنینی جەرگی بریانم) نووسرابوو.

(٤) ئەو سەردەمە ئەو شیعرەی تێدا نووسیوە، سالّی (مالییە) لە (٣١)ی مارتا تەواو بووە، بۆیە دەڵێ: (لە ئازاری نیهائی).

(٥) هەر لەو دەستنووسەدا: (توخدا مەپرسن لێم) نووسرابوو.

(٦) هەر لەو دەستنووسەدا: (خودا دوور بێ، لە ئازاری جەمیعی خۆشەویستانم) نووسرابوو.

(٧) لەو دەستنووسەی شاعیردا: (گەهـ خەریکی تەسوییەی سولفەم) نووسرابوو.

(٨) هەر لەو دەستنووسەدا: (جەمع و تەزییلاتی نیسانم) نووسرابوو.

دەکـــەومـــە بەحـــری بێ پایانی ئەرقـــام و تەقـــەللاوە
وەرە ئەمجا تەماشای حەلوەلای مێشکی بەسەزمانم[٩]
تومەز عەکسی ڕەقەم شانزەی بە شەست و یەک نیشان داوە
کـــەوا گـــێـــژی ترازاوی دەســـێکی ســەهوو و نســـیـــانم
ئەگەر باوەڕ نەفەرمووی شەو لە خەودا تاکو سبحەینێ[١٠]
لە ئێـــســـتـــاوە خـــەریکی ناردنی ئەوراقی نیـــســـانم[١١]
بەڕۆژی جومعە خەڵکی وان لە بەزم و عوشرەتا دائیم[١٢]
کـــەچی من هەر خـــەریکی دوکـــوم و جـــەمـــعی یەکـــونانم[١٣]
بەشەو چاو هەڵبڕم، ئیجمالی شەهری دێتە بەر چاوم[١٤]
کـــە چاویش دانەوێنم[١٥]، کـــۆمـــەڵێ ئەرقـــامـــە مـــیـــوانم
هەمـیـشـە[١٦] بلبلی تەبعم، ئەنیسی غونچە بوو ئەوسا
کـــەچی ئێـــســـتـــاکـــە جەدوەل بووەتە گـــوڵزار و گـــوڵســـتـــانم[١٧]
بەسـەد (اذن القـبض) کـۆم کـردەوە نەقـدی خـەزێنەی ژین
بەئیـذنولدەفـعێ، سـەرفم کـرد هەمـوو نەقـدی دڵ و جـانم[١٨]
لە غـەیری مـادەدا نەقـدی حـەیاتم[١٩]، ئەبتی دەفـتـەر بوو
بەتەعـدیلێ مـەگـەر دەسـتی[٢٠] قـەدەر ڕێکی بخـا ژیانم

(٩) ئەم بەیتە لە دەستنووسەکەی شاعیردا نەبوو.
(١٠) لە دەستنووسەکەی شاعیر (ئەگەر باوەڕ ئەکەی هەر شەو لە خەوما تاکو سبحەینێ) نووسرابوو.
(١١) هەر لەو دەستنووسەدا: (خەریکی بەستن و ڕێکخستنی ئەوراقی نیسانم) نووسرابوو.
(١٢) هەر لەو دەستنووسەدا: (خەڵقی هەر خەریکی کەیف و سەیرانە) نووسرا بوو.
(١٣) هەر لەو دەستنووسەدا: (هەر شپرزەی دوکوم و سەهووی یەکونانم) نووسرا بوو.
(١٤) هەر لەو دەستنووسەدا: (لە خەو چاو هەڵبڕم ئیجمالی شەهری دێتە بەر چاوم) نووسرا بوو.
(١٥) هەر لەو دەستنووسەدا: (کە چاو دانێمە سەریەک) نووسرا بوو.
(١٦) ئەم بەیتە لە دەستنووسەکەی شاعیر لەگەڵ بەیتی پێشوو شوێنیان ئاڵوگۆڕ بووە، (بەدایم بلبلی تەبعم) نووسرابوو.
(١٧) هەر لەو دەستنووسەدا: (بۆتە سەیرانی بەهارانم) نووسرا بوو.
(١٨) هەر لەو دەستنووسەدا: (بەیەک اذن الدفع ڕۆیی هەموو نەختینەیی گیانم) نووسرا بوو.
(١٩) هەر لەو دەستنووسەدا: (لە غەیری مادەدا نەقدی ژیانم...) نووسرا بوو.
(٢٠) هەر لەو دەستنووسەدا: (بەتەعدیلێ مەگەر ئەمری قەدەر...) نووسرا بوو.

له عـومـرم سـەهووی سـەرفـیـات ئەگـەر تەنزیل بکا ئێـزەد
بەسـولفـەی دابنێ و ئیـرادی بۆ بێنێ له حـیـرمـانم
له قـەیدی نائومـێـدی[21] شـەتب ئەگـەر بکرێم و تێپـەڕ بم
بەقـایای بەد نەمـێنێ بۆ بەقـیـیـەی مـوودەتی مـانم
بەجـاری ئەبمەوە ئەو بلبلەی ئەیووت له گـوڵشـەندا
چەمێ هێـلانەمـە بۆ تائیـفـەی گـوڵ من غـەزەلخـوانم[22]
ئەگـەر بێ سـاڵی مـالیـیـەی حـەیاتم تێـپـەڕێ ئەوسـا[23]
نییـە ئیـمکانی ئیـسلاحـاتی سەهووی قـەیدی عـیـرفـانم[24]
به تەعـدیلیش جـەوازی نادرێ، تەسـحـیـحی ڕابووردوو[25]
بەناچاری لەعـەینی دەفـتـەرا مـەجـبـوورییـە مـانم[26]
١٩٤١/٢/١٣

(٢١) هەر لەو دەستنووسەدا: (له سجلی نائومێدی) نووسرا بوو.
(٢٢) هەر لەو دەستنووسەدا: (چەمەن هێلانەمە و من نەغمەخوانی بەزمی یارانم) نووسرا بوو.
(٢٣) هەر لەو دەستنووسەدا: (تێپەڕێ ئیتر) نووسرا بوو.
(٢٤) هەر لەو دەستنووسەدا: (قەیدی عیلم و عیرفانم) نووسرا بوو.
(٢٥) هەر لەو دەستنووسەدا: (ئیسلاحی ڕابووردوو) نووسرا بوو.
(٢٦) ئەم شیعرە له کاتێکدا نووسراوە، کە شێخ نووری، کاتبی مەسرەفی خەزێنەی لیوای سلێمانی بووە. پاشان ڕەمزی مەلا مارف له ڕۆژنامەی (ژین)ی ژمارە (٦٥٠)ی ساڵی (١٥)، (١٧)ی کانوونی یەکەم ١٩٤١ بەشیعرێ وەڵامی داوەتەوە.

## تەربیعی غەزەلی ئەدیبی موحتەرەم جەنابی (م. نووری) ئەفەندی[1]

ڕەفیق حیلمی

لە دنیادا چ قەومێکە بکا میللەتی ئیهمال
جیهانی پڕ جیداڵە، ئێستە بۆ تەئمینی ئیستیقلال
«خودایا بەسیە ئیتر لابەری دەیجووری ئیزمیحلال
تلووعی پێ بکەی خورشیدی ڕۆژی پاکی ئیستیقبال»

***

لە ڕێی حوڕڕییەتا شەرتبێ بگاتە ئاسمان شینم
هەر ئیستیقلالە مەقسوودم هەتاکو باقییە ژینم
«لەگەڵ خاکپای هیجرەتدا، بەسەر چوو عومری شیرینم
دەسا نۆبەی ویساڵە، ئاه، ئەی ئومێدی ئیستیقلال»

***

شەوی دەیجووری نەگبەت، دوور کەوێ یارەب لە کوردوستان
سەفایی باغی جەننەت دەرکەوێ، یارەب لە کوردوستان
ئیتر سنجاقی میللەت سەرکەوێ یارەب لەکوردوستان
ئەوا نۆبەی ویساڵە، ئاه، ئەی ئومێدی ئیستیقلال

***

مەعارف ئێستە ئەطفالانی میللەتمان ئەکا تەنویر
مەلیک مەحموودی ئەوەل، خۆی بەعەزەم و هیمەت و تەدبیر
ئموری ملک و میللەت، تا نیهایەت، گەر بکا تەدویر
ئیتر نۆبەی ویساڵە، ئاه، ئەی ئومێدی ئیستیقلال

***

(١) ئەم شیعرەی مامۆستا (ڕەفیق حیلمی)م لێرەدا وەکو خۆی نووسییەوە، چونکە ئەوەندەی بەدوایدا گەڕام و ڕۆژنامە و گۆڤارەکانم هەڵگێڕ و وەرگێڕ کرد ئەم شیعرەم نەدۆزییەوە کە مامۆستا (ڕەفیق حیلمی) کردوویەتی بە (تەربیع)، بەڵام لەوە دەکا هەر ئەو شیعرە بێت کە لە کاتی خۆیدا بۆ (ئەحمەد خواجە)ی ناردووە، کە سەرۆکی تەحریری ژمارە (١)ی ئەو ڕۆژنامەیە بووەو شیعرەکەش نامەی پیرۆزبایییە لە دەرچوونی یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی ئومێدی ئیستیقلال، ڕەنگە هەر لەوێ ئەم شیعرە دەست مامۆستا ڕەفیق حیلمی کەوتبێ، چونکە لەدواییدا ئەو کرا بە لێپرسراوی ڕۆژنامەکە.

## جووت و گا

شـــارەزوور تاکـــو بلـــێی جـــێگەیەکی بەردارە
خـــــــۆڵی زیـو، ئاوی بەدێـراو ئەڕژێـنـێ پـارە
کـــــوردە تۆ بۆچی ئەڵێی: ڕووتم و بێ لانە و بان
خـــاوەنی جـــووت و مـــالات و مـــەڕ و ڕان و شـــوان
بایی تارانیـــــیـــــەکـــــە ویژەبەرە و ئاسنەکـــەت
پارە دەرهێنەرە لەو ئەرزە ڕەقـــــە گـــاسنەکـــەت
ئەوی پێـویستـــە لە جـووتێ، هەمـــوو داری بەڕووە
نیـر و[1] هەوجـار و نەقـیزە و کـەڵەمـە و دەستـەدووە
وەردی پارت هەمـــوو ئالـتـــوونە، بە هۆڕ و بە جـەواڵ
وشکە وەردت هەیە، قـەت ناتەوێ دەغـڵی تەڕەکـاڵ
تۆو ئەکـــەی بەو زەوییـــە دێمـــەوە تاوەخـــتی پەڵە
شین ئەبێ، دان ئەگـــرێ، ئەک یەکێ، بتـــبێ دە پەڵە
زەرد ئەبێ وەختی درەو دێ[2]، ئەچی بۆی ئەگری سەپان
درەو ئەکـرێت و ئەکـێشـرێت و ئەبێـتـە خـەرمـان
بڕۆ گـاگـێـرەی تێ بەسـتـە، شـەنی کـە بەشـەمـاڵ
هۆڕی لـێ داگـــــــرە، دەرکی بـدروو، بیـکـەرە چاڵ
بێینە سەر باسی مەڕ و مێگەلت، بۆت ئەکرێ لە شیر
ڕۆن و دۆ، ماست و کەرە، کەشک و فرۆ و پێستە پەنیر
بەرە و هۆڕت خـــوری، چیغ و دەوارت لە مـــــووە
چاکی لێ وردبیـــــــیـــــەوە، هیـــچی بەپارە نەبووە
هەر لە بەرگن ئەکـرێ، خورج و فـەرەنجی و لاکـێش
دێـتـە بەردەســـتت بەخـــۆڕایی، بەبێ عـــارەق و ئێش

(١) لە دەستنووسێکی تردا: (نیل و...) نووسرابوو.
(٢) هەر لەو دەستنووسەدا: (دێی...) نووسرا بوو.

کــوتە جــاوی شــڕی خــۆتە، ئەچی ئەیکەی بەکــەڵاش
لە مــەرەز بوزوو ئەڕێســیت و ئەشــیکەی بە کــەواش
ناکـــڕی شت لەم و لەو، گـــەر بتـــەوێ تا ئەمـــری
هەموو بۆت ڕێک ئەکەوێ[٣]، کۆمەڵ ئەبێ هەر لە خوری
شــۆک و دۆشـــاوی گـــەزۆت بۆ ئەگـــرێ داری بەڕوو
ئەتەوێ پارە پەیاکـــەی، بە کـــەتیـــرە و مـــازوو
ڕەزەکـــەت، گـــەر بتـــەوێ پارەی لێـــشـــاوی هەیە
مــێـوژ و باســووق و[٤] ترێ و هیــزەی دۆشــاوی هەیە
چ بڵـێم پووش و بەڵەک[٥]، چیلکە و زەڵ، لیـژنەیی دار
ئەچی ئەیهــێنی بە باری کــەر و ئەینێــرییــە شــار
هەمـــوو ئەدرێ بەشت و مــەک، بە کــەلوپەل بۆ مــاڵ
ڕائەبوێری بەدڵی خـــۆت و منالت هەمـــوو ســـاڵ
مـــــەلەوانم لەبنی گـــــۆمی زمـــــانا[٦] بەهەزار
ناوی کـــوردی دەرئەهێنم بە جـــەواڵ و بە خـــەرار[٧]

---

(٣) لە دەستنووسەکەدا: (ئەکەوێ و...) نووسرا بوو.

(٤) لە ڕۆژنامەی پێشکەوتن-ی ژمارە (٣٠) و دەستخەتێکی شاعیر: (باسق) نووسرا بوو.

(٥) لە ڕۆژنامــەی ژین ژمــارە (٦) ســاڵی (١) ١٩٧١/٤/١ کــە ئەم شــیــعــرە بۆ جــارێکی تر بڵاوکراوەتەوە. وا دیارە لە مانای وشەی (بەڵەک) نەگەیشتوون، بۆیە کردوویانە بە(پەلک).

(٦) لە دەستنووسەکەی مامۆستا (نەجمەددین مەلا): (لە بنی گۆمی زەمانا) نووسرابوو.

(٧) شــێخ نووری چاک دەرکی بەوە کــردووە کــە کــۆمــەڵی کــوردەواری، بنچــینە ئابووریــیــەکــەی لەســەر کشتوکاڵ بەندە، چونکە خۆی کۆمەڵێکی کشتوکاڵییە، بۆیە هانی خەڵکی داوە ڕوو بکەنە جووتیاری و زەوی کێلان و زۆرکردنی بەرهەم و بەروبوومی کشتوکاڵی و ئاژەڵداری.

## جووت و گا شتێکی چاکە[1]

له باسی هەر شتێ پیا ڕاگەیشتین ئێمە نووسیمان
ئیتر با بێینەوە سەر باسی جووتیاری و زەوی کێلان
له پایزدا خەریکی جووت و تۆو چاندن ئەبی تا سەر
له ماڵی خۆت ئەنوویت و بێ عەزیەت ئاوی ئەدا باران
له جەردە و دز بەدوورە، قەت مەترسە هیچی لێ نایە
له هاوینا لە پاش دروێنە، بێیتە سەر خەلە و خەرمان
وەرە تۆ پێگەیشتووی وەختی هاوینیش تەماشاکە
وەکو بامیە و تەماتە، کالەک و لۆبیا و باینجان
جگە لەو پارەیەی خاوەن زەوی ئەیخاتە گیرفانی
بەڕاستی خزمەتێکی زۆر ئەکا، بۆ هاولاتییەکان
کەلەمە و نیر و هەوجارێک و جووتێ گای لەڕ و بێ فەڕ
ئیتر دەسمایەی ناوێ، وەکو دوکانی بازرگان
بەقالی و ئەم شتانە هیچ نییە کە وەختێ نابووت بوو
له باخەلیا ئەلێ ئەسپێ گۆرانی سەوزەلێ تۆم گیان

(١) له ژمارە (٢٧)ی ڕۆژنامەی (پێشکەوتن) ساڵی (١)، (١٤)ی صفر (١٣٣٩)، (٢٨)ی ئۆکتۆبەری (١٩٢٠) ئاگادارییەک لە ژێر ناوی (بۆ زانین) بڵاوکراوەتەوە و تێیدا دەڵێ: (پێشکەوتن) «مەبەستی ڕۆژنامەی پێشکەوتنە» خۆی وەک مەلێ لەوساوە کە حەز بەژوورکەوتن و پێشکەوتنی زمانی کوردی خۆمان دەکات، نیازی وایە کە گرەوی نووسینی کوردی بکرێت و بانگی ئەوانە دەکات کە حەز لە نووسین دەکەن.

١- بەستێ ڕەنگ پارەی داناوە بۆ کرینی ئەم نووسینە کوردییە. بۆ (١) یەکەم (٥٠) ڕوپیە.
بۆ (٢) دووەم (٣٥) ڕوپیە. بۆ (٣) سێیەم (٢٥) ڕوپیە.
٢- هەتا ڕۆژی (١٠)ی نۆڤمبەر (١٩٢٠) ئەم نووسینە وەردەگیرێت.

له ڕۆژنامەی (پێشکەوتن)ی ژمارە (٣٠) ساڵی (١)، (٦)ی ربیع الأول ١٣٣٩، (١٨)ی نۆڤمبەر (١٩٢٠) ڕاگەیەنراوە کە (ئەو سێیانەی کە کران، یەکەمینیان باسی (جووت و گا)یە کە (م. نووری) وتوویەتی و (٥٠) ڕوپیە وەردەگرێت. دووەمیان (بۆ چرووکی) (زەکی سائیب)ە (٣٥) ڕوپیە وەردەگرێت و سێیەمیان (ڕۆژەوە بوونێکی) (محەمەد جەمیل)ە (٢٥) ڕوپیە وەردەگرێت. واتە لەم پێشبڕکێیەدا (شێخ نووری) پلەی یەکەمی بۆ دانراوە و خەلاتەکەی دراوەتێ.

زەوی و زار دەوڵەتیکە نامــرێت و قــەت لەناو ناچێ
فەقیر و دەست نەڕۆییو نابێ قەت، خاوەنی دەغڵ و دان
بیناغــەی دەوڵەمــەندی هەر بەجــووت و گــا ئەبێ قــایم
بەجــوت و گــا ئەڵێن، عــەرز هەڵدڕین و پارە دەرهێنان
تکاتان لێ ئەکــەم لەم ئیــشــەدا تا پێــشکەون چاکــە
بەڵام دووبارە پێــویســتــە حکوومــەت بێــتــە یاریدان
لە باسی تــووتن و کــــڕیار و لادێیـــــیش بنووسم با
کــە پارەی پێ بوێ، دێت و هەزار ڕوپیــە ئەبا زســتــان
بەهارێ ســــەد دێراو تووتن ئەکـــات و وازی لێ دێنێ
ئەمــا تووتن چ تووتن، ورد و پیس و بێ گەڵا و کــێشــان
وەچ[٢] و دارک زیــاتــر نــاوی تــووتــن بــێ بــەتــۆی نــادا
هەموو هەر دار و بەرد و زبڵ و پووش و قشپل و ئێسقان
بچــیت و پێی بڵــێی ئەو تووتنە باتمانی چەند یێــژێ:
(بە سێ لیرەی عەجەمیی کەمتری نادەم بەسەد قورحان)
لە ئەرزی وشک و ڕەق، تووتن پەیابێ و واشی بفــرۆشن
کەوابوو با هەموو دەست کەینە، جووتیاری و زەوی کێڵان

(٢) لە دەستنووسەکەی مامۆستا (نەجمەددین مەلا): (وەچە) نووسرا بوو.

# پەچە

١٩٤١/٣/١٩

گـــوێم لـە ناڵینی کـــچێ بوو، دوێنێ ئـەیلاوانەوە
وا بەئـســـیـــــر و بەســـــۆز ئـەیوت، دڵـی ئەتـوانەوە
دەنگ و ڕەنگی وا نـەبیـســتـراوە و نەبینراوە لە کـەس
کـــۆنە قـــەمـاغـــەی برینـی ناو دڵـی ئەکـــولانـەوە
ئەیووت، ئـەم ڕووپۆشـە تـەنیـا ڕووی نەپۆشـیـوین و بەس
ڕووبەڕووی خـۆمـان، حـقـووقی ناینە ناو نسـیـانەوە
قـەت نـەبوو[١] ڕۆژێ بە سـەربەسـتی حـەقێ داوا بکـەین
بۆ بەشی خـــۆمـــان بچـــینە ســاحــــە و مـــەیدانـەوە[٢]
ئەوەڵ و ئـاخـر، خـەتای ئـەم ڕووڕەشـەی ڕووپۆشـە بوو
بوو بە مـــانعـــمـــان، نە چووینە کـۆمـەڵی پیــاوانـەوە[٣]
دایگرن توخـــوا[٤] فـــڕێی دەن، بیـــخـــەنە تەندوورەوە
حـــەیفـــە ڕۆژی ڕوو، ئەنێنە نـاو شـــەوی دەیجـــوورەوە

***

زوڵمی ئەم غەدارە بوو[٥]، حوکمی موساواتی نەهێشت
جنسی ئێـمـەی خـســتـە حـاڵێکی لە پیـاو پاڕانەوە[٦]
بۆ بەشی ئێـــمــە کـــفن بوو، وا لە دنیـــا و ئاخـیــرەت؟
لێـــــرە ڕەش، لەولا ســـــپی، ببـــڕێ بەباڵامـــــانەوە

(١) لە دەستنووسێکی پێشووتری شاعیر: (نایەڵێ ڕۆژێ...) نووسرا بوو.
(٢) هەر لەو دەستنووسەدا: (... بچینە کۆمەڵ و مەیدانەوە) نووسرابوو.
(٣) هەر لەو دەستنووسەدا: (بۆ حقووق و حەقی خۆمان، بچینە...) نووسرا بوو.
(٤) هەر لەو دەستنووسەدا: (دایگرن کچ گەل فڕێی...) نووسرا بوو.
(٥) هەر لەو دەستنووودا: (جەوری ئەم...) نووسرا بوو. لە دەستنووسێکی تردا: (جەوری ئەم زۆردارە...) نووسرا بوو. لە گۆڤاری گەلاوێژ: (زوڵمی ئەم مەلعونە بوو...) نووسرا بوو.
(٦) هەر لەو دەستنووسەدا: (هۆزی نەرمی خستە ئەحواڵی لە پیاو پاڕانەوە) نووسرا بوو.

حەز ئەکەی پرسە، لە پیران و لە پێشینانی خۆت
کێ پەچەی دیوە بەرووی خاتوونی کوردستانەوە
کەی پەچە بۆتە سەبەب، بۆ عیفەتی جینسی لەتیف؟
کافری دڵ تیرە، دەخلی کوا بەسەر ئیمانەوە[٧]
دایگرن بیگرنە ناو خۆتان و دەوری لێ بَدەن
بەڵکو بیبینم بەچاوی خۆم، بەرۆح کێشانەوە
لای بەرن توخوا، فڕێی دەن بیخەنە تەندوورەوە
حەیفە ڕۆژی ڕوو[٨]، ئەنێنە ناو شەوی دەیجوورەوە

***

کۆمەڵێ بگرن لە دەوری، ئەلوەداعی لێ بکەن
ناوی با بڕواتە[٩] ناو لافاوی ئەم نیسانەوە
بیخەنە تابووتەوە، بینێن بەشانی عەزمەوە
بیخەنە قەبرێ، بەلووتکەی گردەکەی سەیوانەوە[١٠]
تۆبە بێ یارەبی، دەفنی ئەو لەوێ جائیز نییە
بیخەنە چاڵێکی قووڵی، گردەکەی گاورانەوە
مەجلیسێکی ماتەمی[١١] بۆ دابنێن و یەک بەیەک
وەرنە تەعزێکەی، بەدڵخۆشی و بەرووی خەندانەوە
ئەم سکاڵایە، بەفیکر و شیعری (نووری) تێ مەگەن
ئەو کچە دەنگ خۆشە بوو، ئەیووت بەدەم گریانەوە
دایگرن توخوا فڕێی دەن، بیخەنە تەندوورەوە
حەیفە ڕۆژی ڕوو، ئەنێنە ناو شەوی دەیجوورەوە

---

(٧) هەر لەو دەستنووسەدا: (کوا دەخلی...) نووسرابوو.
(٨) لە گۆڤاری گەلاوێژ: (حەیفە ڕۆژی پاک...)
(٩) هەر لەو دەستنووسەدا: (ناوی با بیباتە ناو لافاوی...) نووسرا بوو.
(١٠) هەر لەو دەستنووسەدا: (بیبەنە ئەو دەشتە بینێژن بەدەم سەیرانەوە) نووسرا بوو.
(١١) هەر لەو دەستنووسەدا: (کۆمەڵێکی ماتەمی...) نووسرا بوو.

برا من حــەز ل شــیــرینی جــەمــالی ئاشکرا ناکــەم
پڕوپووچە لە لام من بۆ مــەزاهیــر قــەت ڕیا ناکــەم
جەمالی نەفسە مەحبووبی حەقیقی گەر تەماشاکەی
بەغەیری ئەو، تەمەننای وەسڵی مەحبووبێ لە خوا ناکەم

***

(کردەوە چاک بێ یا بەد بێ، دێتەوە ڕێی ئادەمیزاد - شێخ نووری).

وا تێ مــەگە کە کــردەوەیی بەد ئەگــەر بکەی
گــەردوون لە داســتــانی زەمــان ئەیسـڕێتــەوە
قــەرزێکە کــارەکــانت لە ئەســتــۆی زەمــانەدا
هەر وەخــتــێ، هەر زەمــانێ ببێ، ئەدرێتــەوە

***

## ژن

ژن وەک دڵۆپی جــــیــــوەیە لەســــەر دەست
ناجــوولێ بێــتــو گــەر بەری دەســتت کــراوە بێ
ئەمما کــە بێــتــو دەســتت بقــوچێنی ڕائەکــا
با بەینی پەنجــەکــانت لەحــیــمی تواوە بێ

***

پووشی ئەمــەلی دوژمنی بۆ خــســتــمــە تەندوور
ڕۆحی فــــەرەحی نایە هەزاران دڵی ڕەنجــــوور
مــوژدەی زەفــەری پێــیــە، بەدڵ خــۆشــیــیــەوە هات
شــایــســتــەیە ئەم جــەژنە بڵــێم نووری عــەلانوور

***

نوورێکە دیدە حـــەددی بینینی نیـــــیـــە
ئـاگـــــر لە بەرابەری ئاوا تینی نیـــیـــــە
زەڕڕاتی سـیـفـــاتی زاتی پڕ کـەون و مـەکـان
نابینرێ بە دیدەیە، کـــە دووربینی نیـــیـــە[1]

***

خۆشە دەرخەن هەروەکو ئاوێنە عەیبت ڕووبەڕوو
نەک لە پشتی سەرتەوە وەک شانە دەربێنن زبان
پیاوی کامڵ دوژمنیش بێ یەک زبان و یەک دڵە
پاش ملە نەک زەهری مار و ڕووبەڕوو شیرین بەیان

***

یاڕەبی لە فـەیزی مـەعـریفـەت مـەهجـوورم
ڕێبـواری مـەجـازم، لە حـەقـیـقـەت دوورم
مـەر[2] ڕەحـمـەتی تۆ دەسـتی بداتە دەسـتم
سـاڕێـژ بـکـا زامـی دڵەی ڕەنجـــوورم
ئەی کـاتـبـی حـەرفـی لەوحی پیـشـانـی من
وەی پەردە گـوشـای ڕازی نیـهـانـی من
زانیـــوتـە لە نـادانـی خـــۆم، نـادانم
زانیـــوتـە حـــدوود و حـــەددی نادانی من

***

تۆ باعـیـسی حـاڵی حوزن و خـورسـەنەدی منی
تۆ عـوقـدەگـوشـایی هەر گـرێ و بەندی منی
ئەم عـەزمـە من بەسـمـە کـەوا بەندەیی تۆم
ئەم دەوڵەتە من بەسـمـە خـوداوەندی منی

***

(١) ئەم چوارینەیە لە (خوا) دەدوێت.
(٢) مەر: واتە مەگەر.

خـــۆزگـــەم بەوە، بێ وەجـــاخـــە ئەولادی نیـــیـــە
هەرگـــیـــز لە زەمـــانـــە داد و بێ دادی نیـــیـــە
هەر ئەو خـــەفـــەتەی هەیە وەجـــاخـی کـــوێرە
بێـــجگە لەمـــە، داخ و فـــەریادی نیـــیـــە[٣]

***

خاڵە بیستم هاتییە هەولێر و نەتپرسی لە کەس
خۆ لە باخـا هەر گـوڵە دایم ئەنیـسی خـاروخـەس
چی ئەقـەومـا گـەر بفـەرمـووی خوشکەزایەکم هەیە
بەندی بەندیخانەی هەولێرە وەک (مرغی) قەفەس[٤]

***

دڵ لە شەقـڵاوە مـەگـەر نەختێ حـەیاتی بێـتـە بەر
سەر لە عەنـکاوە مەگـەر نەختێ خەیاڵی بێتە سەر
وەرنە لەم هەولێـــرەدا ئەهلی دووەل زەوقـم ئەوێ
غەیری چەند شەخسێ نەبێ، چیبکەم خودا (أين المفر)؟[٥]

***

خـــودا مـــەمـــهـــێـــڵـــە بۆ وەخت و زەمـــانێ
لەســـەر دڵ بـبـــمـــــە بـارێکـی گـــرانێ

---

(٣) لە شوێنێکی تردا نووسیبووی: (غەیری ئەوە قەهر و داد و فەریادی نییە).

(٤) (وەختێ لە هەولێـر مـووەزەف بووم، بێـخـود یەعنی مـەلا مـەحـمـوود ئەفـەندی مـوفـتی و خـەبەرم نەزانیبـوو لەپاشـا ئەم دوو شـیـعـرەم بۆ نووسی) شێخ نووری شێخ سـاڵح. وادیارە کـە شێخ نووری لەهەولێر بووە بێـخـودی خـاڵی سـەری هەولێری داوە و چاوی بەشێخ نووری نەکـەوتووە، بۆیە شێخ نووری ئەم گلەیییەی لێ کردووە.

(٥) مامۆستا (ناسح ئەفەندی حەیدەری)یش لە ڕۆژنامەی (ژین)ی ژمارە (٤٠٩)ی ساڵی (٩)(١)ی ئەیلوولی (١٩٣٤)دا دەربارەی نووسـیـویانە: (باش کـاتبی مـەحکەمـەی بەدائەتی سلێـمـانی ناسح ئەفـەندی حـەیدەری بەمەئزونیـەتی پازدە ڕۆژ چووە هەولێر. ئەهلی سلێـمـانی لە معـامـەلەو کردەوەی ئەوەندە مەمنوونن بۆ ئەمە کە ئیش و کـاریان وە پاش نەکەوێ ئـارەزوومەندن کە ڕۆژێک زووتر بەخێر و سەلامـەتی بگەڕێتەوە سەر وەزیفە و لە چوون و هاتنەوەی موەفەقییەتی تەمەننا ئەکەن). ئەم پیاوە یەکێک بووە لەو چەند شەخسە.

دەسم بگرە بڕۆم با من نەبینم
دەسم بگرێ یەکێ بۆ پەلکە نانێ
بارزان ١٩٥١/٦/١٨

***

خودایا گەر بەدڵما تێپەڕیبێ هەر خەیاڵێ
لە عەزرەت ئێشی سەخت و کڵپەی دڵمە[٦] وا پەشێواوم
بەلوتفی خۆت مەگەر بڕوانییە کرداری ناڕێکم
لە سجلی نائومێدی بیسڕی تۆ، کردەوە و ناوم

***

خوایا بەسیە ئیتر لابەری دەیجووری ئیضمحلال
تلووعی پێ بکەی خورشیدی ڕۆژی پاکی ئیستیقلال
لەگەڵ خولیای هیجرەتدا، بەسەر چوو عومری شیرینم
دەسا نۆبەی ویساڵە، ئاه.. ئەی ئومێدی ئیستیقلال[٧]

***

(شووشە) چ بەششووشە، قەدی شووشە وەکو شمشاڵ[٨]
چاو مەست و دەهەن غونچە وو پڕ عیشوە و لێو ئاڵ

---

(٦) بۆ ئەوەی لەنگ نەبێ (وا)م بۆ داناوە.

(٧) لە لاپەڕە ١٨٨ی بەرگی سێیەمی میناى شکستەم وەرگرتووە کە مامۆستا نەجمەدین مەلا نووسیویەتییەوە، ڕەنگە هەر ئەم چوارینەیە بێت کە مامۆستا ڕەفیق حیلمی کردوویەتی بە تەربیع.

(٨) مامۆستا (حیلمی) (شێخ محەمەدی کوڕی حسەین ١٩٠٩ - ١٩٨٥/٥/١٠) لە ڕۆژنامەی هاوکاری ژمارە (٧١٠)ی ڕۆژی (١٩٨٣/١١/٣)دا لە چاوپێکەوتنێکدا دەڵێ: (برادەریشم لەگەڵ شێخ نووری شێخ ساڵح-دا هەبوو، هەرچەندە ئەچوومە سلێمانی سەرم لێ ئەدا. ڕۆژێکیان بەگەڕەکی گاوراندا تێپەڕین دوو کچی گاوری زۆر جوانمان بینی، ئەو ئەیناسین وتی حیلمی ناویان (ماری و شووشە)یە، ئینجا سەیریان کە ئەڵێی پەرین. منیش وتم ڕاستەکەی بەخوا جوانن. هەر بەدەم ڕۆیشتنەوە وتی حیلمی قەڵەمەکەت دەربهێنە و بنووسە. ئەم چوارینەیەی بۆ وتم.). پێش ئەویش هاوڕێی خۆشەویستم مامۆستا (ئەمین ئەحمەد عەلی) لە هەڵەبجە لە ڕۆژی ١٩٨٣/٩/٣)دا بۆنەی دانانی ئەم چوارینەیەی بەم جۆرە بۆ باس کردم و وتی: (لە ساڵی «١٩٢٩» شێخ نووری لەگەڵ =

(ماری)[٩] کە دوو ماری سەری زوڵفی لە ملم دا
جووڵایەوە کەوتم بەدەمسا، بێخود و بێ حاڵ

***

خەیاڵی دیدەنی تۆ وا لە سەرما
خەریک ماوم لەبەر باران و سەرما
ئەوەندەت بیر ئەکەم وەختێ ئەزانی
لە خزمەت دام کە ڕۆژێ هات بە سەرما

***

بۆیە من ئیشتیراکی ئێوە ئەکەم
حەز لە ئەخلاقی چاکی ئێوە ئەکەم
(١٠)... ... ... ... ... ... ... ...
ڕۆح فیدای خاکی پاکی ئێوە ئەکەم

=«حیلمی» شاعیر بەگەڕەکی گاوراندا تێدەپەڕن کە لە گردی سەیوان هاتوونەتەوە، بەبەردەم ماڵی «کەریمی عەلەکە»دا ڕەت دەبن، دوو ئافرەتی گاور دەبینن کە ناویان (شووشە) و (ماری) بووە لە جوانی و شۆخیدا بێ هاوتا بوون. شێخ نووری کە چاوی پێیان کەوتووە دەستبەجێ ئەم چوارینەیەی بۆ نووسیون.) ئەم زانیارییانەم بە تەفسیل لە مامۆستا (حیلمی)ی وەرگرتووە و لەسەر نەوار تۆمارم کردوون.

(٩) دەڵێن ماری کچێکی پرچ درێژ بووە.

(١٠) ئەم دێرە لە دەستنووسەکەدا کوژابووەوە و نەدەخوێنرایەوە.

## گردی سەیوان[1]

دەمی ئێــواره ڕۆژ لێــره لە حــاڵێکی حــەزینایە
وتارێکی لە مـــەعنایی نیگاهی وا پەســـینایە
شنەی با هەرَ وەکـو نەی، نەغـمـەپەردازی مـەقـامـاتە
هـەزاران نـاڵـەیـی زاری لـەنـاو ئـاهـو ئـەنـیـنـایـە

***

چ خــاکــێکە مــوقــەدەس، توربەی پاکی شـەهیـدانە
بە هەر لادا بڕۆی هەر نەعـــرەی (اللە اکـــبـــر) دێ
لەهەر سـوو تێـپەڕی ئایاتی حەق تەفسـیری قـورئانە
مەلایەک بۆ زیارەت سەف بەسەف، بێ پا و بێ سەر دێ

***

درەخـتـی سـاڵ خـوردەی ئایەتی قـەومـیـیـەتی کـوردە
مـــەزاری نادیاری ســـورەتی(إنا فـــتـــحنا)یە[2]
بەیانی شـــەرحی ڕابوردووی ژیانی مـــیللەتی کـوردە
نیـشـانەی قـەهرەمـانیی قەومی کوردی لێ هوورەیدایە

***

نیگاهی ئاگـرینی شـەو بە مـەهتـابێکی نوور ئەفـشـان
کـە دار و بەرد و کـێلی قـەبرەکـانی پێ ئەکـا تەنویر
وەکـو ڕوحێ لەبەر دەمـتـا کـفن بردووشی فـەخـروشـان
زەمـانی تێـپـەڕیو سـەرگـوزشـتی خـۆی ئەکـا تەقـریر

***

(١) گردی سەیوان: ناوی گردێکە، کەوتووەتە ڕۆژهەڵاتی شاری سلێمانییەوە. لەگەڵ بنیادنانی شار ئەو گردە کراوە بە گۆڕستـان. (سەیوان)و (کەیوان) ناوی جووتە قـارەمـانێک بوون دەڵێن دلێرانە دژی هێرشی تورکە عوسمانییەکان بۆ سەر شاری سلێمانی جەنگاون، لە گردی (سەیوان) نێژراون و گردەکە بەناوی یەکەمیانەوە ناو نراوە.

(٢) انا فتحنا ئیشارەتە بۆ سوورەتی (انا فتحنا لك فتحا مبینا).

دەڵێ ئەم جێگەیە بۆ پاشەڕۆژت، قیبلەگاهێکە
سەراپا قەهرەمان و تاجدارن لێرەدا مەدفوون
سەراسەر بەرد و قەبری، ڕەمزی تاج و تەختی شاهێکە
پەڕەی تەئریخی حوکمی حاکمانی کورد ئەکا گوڵگوون

***

بەزاهیر دار و بەرد، ئەمما هەموو ئەشعاری پڕ ئاهەنگ
سنووحاتی هەموو ئیلهامی ئەفکاری ئەدیبانە
شەپۆلی بەحری مەعنا، هەروەکو مەهتابی ڕەنگاوڕەنگ
ئەڵێی فەجری بەیانانە لەناو شەودا درەخشانە

***

لەپێش فەجرا هەموو ڕۆژێ تەمی ماتەم حەزینانە
دەپۆشێ سەر هەتا دامێنی ئەم گردە بە مەحزوونی
بەدەنگی پێچەوانەی تێ مەگە، سۆزێکی گریانە
لە بەندی جەرگی لەیلێ دێتە دەر بۆ مەرگی مەجنوونی

***

هەناسەی ساردی بێ ڕوحێ کە دێ بێ سروە شەوگاران
بەسەر کوڵمی گوڵا پەخشان ئەکا، گێسووی ڕەیحانە
ئیفادەی شیعری، ژینی تێپەڕیوی نەوجوانانە
ئەگەر ورد بیتەوە، دەرسێکی پڕ مەعنایە بۆ ئینسان

***

دەخیلە زائیرا ئاهستە پێ دانێ بەسەر خاکا
مەقامی نامداران و نموونەی عەرشی یەزدانە
بەتەعزیم و ئەدەب تێپەڕ ببی چاکە بەجێی چاکا
نیشانە و ڕەمزی کوردە، ناوی بەرزی گردی سەیوان(٣)

سلێمانی ١٤- ١٩٤٣/١/١٥

(٣) لە دەستنووسی (توحفە)دا کە لە ٩٤٢/١/٢٦ بۆ مامۆستا گیوی موکریانی ناردوویەتی ئەم شیعرەی تێدایە. دەستنووسێکی تری ئەم شیعرەم لەلابوو کە دوای ئەم دەستنووسەیان نووسیبوویەوە، لە هەندێ شوێن جیاوازییان هەبوو، بەڵام ئەمە دواقەناعەتی شاعیرە و دوای دەست پێدا هێنانەوە بەم شێوەیە هێشتوویەتییەوە.

* شاهدی عەیب و قسوورت ئەمەیە ئەی بێ هۆش
که له دووی عەیب و قسووری ئەم و ئەو عەودالّی
* ئەمینم قەت کە پێ نانێمە سەر سەییارەیەکی خۆم
بەلاّم نێزیکە سەییارەی ئەم و ئەو پێ بەسەرما نێ
* بەد کردەوە لە موجتەمەعا نرخی هەر کەمە
خۆراکی با ببێتە[1] کولیچە و شەکەرلەمە
* دلّی خۆمم بەخوێنی جەرگی خۆم ئاوداوە ڕۆژ و شەو
بەشیری خەم بەخێوم کردووە ڕۆڵەی بەلاّ بۆ خۆم
* غـــــــروورە وا پەچەی داوە بە ڕوویا
ئەگـــــینا جـــوان ئەبێ هەر ڕوو نومـــا بێ
* بەهار ڕۆیشت و هەر نەکـــــــرایەوە دلّ
خــــودا ئەم غـــونچـــەیە، بۆچی نەپشکووت
* هیوام وایە هەموو ڕۆژت ببێتە ڕۆژی نەورۆزێ
لەنەسری ئاخریدا، لێت بکەم من جەژنە پیرۆزێ
* عەرەق بەڕوومەتی تۆوە بەتینی گەرمی هەتاو
ئەڵێی گوڵە کە بەئاگر، گولاّوی لێ ئەتکێ
* وەکو قەولت لەگەلّ خوا کردووە، هەرگیز دەسێ نەگری
ئەویشت خۆ لەدەس دێ وەک سەگێ لاقی کەسێ نەگری
* بلّــێن بەو یارە وەفــادارە، کەوا چاوی لە ڕێمە
عەرزی بکەن تاکو قیامەت هەر ئەمە جێمە[2]
* بنازم وردە خــــــاڵی دەوری لێـــــــوت
ئەڵێی زەنگی بەچەی شـــەککەر فـــرۆشـــە

(۱) له دەستنووسەکەی شاعیر (بێتە) نووسرا بوو، وا دیارە هەلّەی نووسینە.
(۲) ئەلّێن گوایا ماڵە باوانی شێخ نووری خەریک بووە ژنێکی بەتەمەنی بۆ بهێنن، ئافرەتەکەش زۆر مەتلّەبی بووە مێرد بەشێخ نووری بکا، بەلاّم شێخ نووری ماوەیەک لە دەست ئەو ئافرەتە دوور دەکەوێتەوە و ئەم دێرە شیعرەی بۆ دەنێرێ.

* نیــیـــه له کـــۆهی ئەوا بێ نەواو و ڕێبـــواریێ
کــه شـــووشـــەیی دڵی وەک تۆبە، بارەها نەشکێ
* من کــجــا و جــمع این ارقــام بی مــعنا کــجــا
شـــاهم امـــا طیلســـان فـــقـــر در برکـــرده ام
* چۆن ئەبێ یەک بێ لە بازاڕی مـــرووەت مـــەندان
قــیـمـەتی یووسـفی مـیـسـری و غـولامی حـەبەشی
* سەری من وا لە گوێی قەبرا ئەلەرزێ کەی غەمی تۆمە
بەدڵ من غەم ئەخۆم بۆ ئەو کەسەی ئەمڕۆ لە دایک بێ
* هەر لە ئەوەڵ سەفـرەی مـەدرەسـە، مـامۆسـتـاکـەم
عـەقـڵی فـێـری ئەم و ئەو کـرد و منی شـەیدا کـرد
* دنیـــا بـەکـــسـی دە کـــه بگیـــرد دەســـتت
یـا پـیـش سـگی نه کـــه بـگیـــرد پاســـد
* شکرفـــشـــانی ســـعـدی ببین کـــه شـــهـری روح
نمــوده بـــر شــکـــری طـــبـــع او مـــگـــس رانـــی
* نشـــاط خـــیـــز بود بلبـــلان مـــعـنا را
به بوســـتـــان و گلســـتـــان او خـــوش الحـــانی(٣)

(٣) هەندێ لەو تاکانە بریتین لە سەرەتای دامەزراندنی شیعری تازە کە ئەم بەیتانەش دیارن و خوێنەر دەزانێ ماویانە شتی دیکەیان بەدواوە بێ.

# پاشکۆی ژماره ١

## سێ نامەی شێخ نووری

### نامەی یەکەمی بۆ مامۆستا (گیوی موکریانی) ناردووە بەبێ زیاد و کەم دەینووسینەوە

نووری چاوی نووری

لەگەڵ ڕەمزی ئەفەندی وێنەکەم و بە کابرایەکدا کاغەزێکتم وەرگرت، زۆر لە خۆشەویستی ساف و بێ تۆز و گەردتان دڵشاد بووم، ئەوا هەندێک لەو شیعرانەی کە جەنابتان نەتاندیوە بۆ ئەوەی بژاری بکەی و کامی بەچاکتان زانی نامزەدی دیوانەکەی بکەی کردم بەدیاری و ناوم نا (توحفە) و بۆم ناردی، هیوام وایە مەقبولی تەبعتان بێ. ذاتەن لە هەموو نەوعێکە. لە غەزەتە کۆنەکان بەخوا هەر ئەمە مابوو کە بۆم ناردی، منداڵان هەموویان لە ناو بردبوو. بەعزێ مەقالاتی ئەدەبییەی خۆم لە ناویاندا هەیە مەقالەیەکی سیاسی تیایە کە وەختی خۆی جوابی غەزەتەی (نەجمە) کە لە کەرکووک دەردەچوو داومەتەوە.

مەعەل ئەسەف قسمی ئەوەل لە غەزەتەیەکدایە کە نەمدۆزییەوە حەقیقی جوابێکی موهیمە. وەختی خۆی لەسەر تورکچێتی شەڕە مەقالەی زۆرم کردووە. هیچیشی پارەیەکی نەکرد.

کە هاتمەوە کاغەزێکی عەلی کەمالم وەرگرت وا تەقدیم کرد، ئەمجا نازانم جوابی خۆتی داوەتەوە؟ هیوام وایە لە خزمەت سستی نەکات. منیش دووبارە بۆی ئەنووسمەوە.

کاغەزەکەی لەتیفم هێشتا نەداوە، سبحەی شەو ئەچم بۆ ماڵەوە بۆ لای.

ئەمە دوو سێ ڕۆژە ئەگەڕێم ئەحواڵی یەکێک ئەپرسم کە بێت بۆ هەولێر دەست ناکەوێ ئەوا مەجبور بووم ئەم توحفەیەم تەقدیم کرد و غەزەتە کۆن و شڕەکانم هێشتەوە بۆ ئەوەی بەیەکێکدا بینێرم، جارێ ئەم جارە خوا حافیزتان بێت.

١٩٤٢/١/٢٦

ئیمزا

سلێمانی. م. نووری

**نامەی دووەمی بۆ مامۆستا عەلائەددین سەجادی ناردووە، ئەمەش دەقی ئەو نامەیەیە.**

سلێمانی

١٩٥٨/٥/١٤

برای بەرز و بەنرخم مامۆستا عەلائەددین.. هەموو کاتێکتان باش.

لە یەزدان ئەپاڕێمەوە بەتەندروستی و خۆشی ڕابوێرن. نامەکەتانم وەرگرت لێم عایەن بوو کە ئەدەبیاتەکەتان زۆر جوان خوێندۆتەوە، بەرامبەر بەم زەحمەتەتان سوپاسی بێ پایانتان پێشکەش ئەکەم.

قوربان! لە ئەساسا مەبەس لە نووسین و بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبە ئەوەیە ئەم شاعیرانەی کە ئێستا بەپای پیلان شیعر ئەخەنە پێش چاوی خوێندەواران وا تێگەیشتوون شیعر لەم عەسرەدا وەکو سائیر شتی تر تەتەوری کردووە و تەتەورەکەش عیبارەتە لە ڕیعایەت نەکردنی ئەوزان و قەوافی و بەکارهێنانی وشەی کوردی پەتی لە جێگای خۆیا بێ یا نەبێ، ئیتر هەرچی نەواحی ئەدەبییەی تری شیعر و ئەدەبیات هەیە ڕیعایەت کردن و نەکردنی زیادە. یەعنی شت بڵێن و بنووسن و خۆیان ناوی بنێن شیعر، ئیتر بەسە و تەواوە.

مەعلوومی عالیتانە تەئلیف بۆ ئەو خوێندەوارانەیە کە ئەیخوێننەوە و تێی ئەگەن. بۆ ئەوانە نییە کە نازانن ئەدەب و ئەدەبیات چییە. ئەمجا ئەو بەشە شاعیرانە ئەگەر لەم نەوعە تەئلیفانە خوا کردی و کەوتنە ڕەخنەگرتن ئەو تەنقیدە مەعنەن تەئییدە بۆ ئەو تەئلیفە کە ئیستیناد بە مەباحسی علمییەوە هاتبێتە وجوود. تەبعەن ئەوانە ئەبن بەڕەخنەگر، شاعیر و یا ئەدیب نین و ناشزانن کە شاعیر و ئەدیب نین (کە فەلاکەتی گەورە بۆ خۆیان) ئەمەیە مەعنای ڕاستەقینەی ئەدیب ئەوەیە کە وەلەو لە دەرجەیەکی کەمیشا بێ کەم تا بێژێ لە قەواعدی ئەدەب شارەزا بێ. بزانن تەشبیە چییە، ئیستیعارە مەعنای چییە، لەف و نەشر چۆنە و شتی وا لە قەواعدی ئەدەب بزانن.

تەقریبەن دە پانزە ساڵ لەمەو پێش تاقمێک لێرە چووبوون بۆ پێنجوێن و لوجنەی فەحسی توتن بوون، لەو سەردەمەدا یادی بەخێر ڕەشید سدقی مودیری ناحیەی پێنجوێن بوو. لەبەرئەوەی مودیر گەورەترین مووەزەفی ناحیەیە بەتەبیعەت لە ئەوقاتی فەراغا هەموو لوجنە لای ئەو کۆ ئەبوونەوە، مودیریش جەنابتان ئەیزانن کە شاعیرە، ئەکسەری وەقتیان بەشیعر خوێندنەوە لای ئەو ڕابواردووە. ئەوانەی کە گوێیان لە خوێندنەوەی

شیعریش نەبووە هەموویان بە تەئسیری شاعیری بەناوبانگ ڕەشید سدقی بووبوون بە شاعیر. لە چ جێگایەک کۆ ئەبوونەوە، چ نەوعە خواردەمەنییەکیان ئەخوارد، عشق و غەڕام لەگەڵ کێ و لە چ دەرەجەی شیدەتێکا بووبێ پەی دەر پەی ئەکرا بەغەزەل و قەسیدە و ئەنێررا بۆ خوالێخۆشبوو پیرەمێرد. یەکێ لەم شاعیرانە ڕەفعەت درێژ بوو غەزەلێکی ناردبوو بۆ ئەوەی لە ژینا چاپ بکرێ، شیعرەکان توخنی وەزن نەکەوتبوون، بەڵام هەموو ئاخری دێرێک لەگەڵ دێری دووهەمی موقەفا وەکو مریشکی سوورەوەکراو و پاقلەی کوڵاو و گۆشتی برژاو، غەزەلەکەش مەوزووعەکەی هەر خواردن بوو و مەوزووع تەطەڕوقی کردبوو بەئیشارەت لەم غەزەلەدا باسی ئەوەشی کردبوو کە ڕەشید سدقی مەیلی کچی مەلا ئەکات و ڕۆژێک لە مەجلیسەکەیاندا مەوزووع کراوەتەوە و زۆر توورە بووە. پیرەمێرد خوا لێی خۆش بێ ئەمەی لە ژینا چاپ کرد. پێنجشەممە بوو ئەو ڕۆژە جەریدە دەرچوو خۆی بۆی هێنام بۆ خەزێنە (ئەو سەردەمە لەوێ کاتبی مەسرەف بووم) نیشانی دام، عەرزم کرد خاڵە بۆ جەریدەکەی خۆت بەجوان و موناسبی نازانم ئەم جۆرە شتانەی تیا بنووسرێ. فەرمووی بۆ ئەوەی حەیایان بەرم بۆیە نووسیومە، منیش بۆ پێنجشەممەی ئایندە ئەم چەند شیعرەم دایە خزمەتی، وتم ئەمەش چاپ کە (ئەمەیە شیعرەکان) لە ١٩٤٢دا وتراوە.

حەقە ئەمڕۆ بدا تانە لە ماهو مشتەری و ئەختەر
سولەیمانی بەشیعری ئێوەوە ناویەتە سەر ئەفسەر
تەماشای لاپەڕەی ژین کەن نییە جێ نوختەیە خاڵی
لەبەر ئەشعاری تازەی شاعیران ئەم سەر هەتا ئەو سەر
ئەبینی شیعری لوجنەی فەحسی تووتن بێشەمە و بۆندار
ئەبینی میسرەعی وا قامەتی بەرزە وەکو عەرعەر
ئەبینی شیعری سدقی پڕ لە نکتەی خۆش و مەعیندار
لەسەر ماڵی مەلا شەڕییە لەسەر پێیە وەکو وەروەر
ئەبینی شیعری وا پڕییە لە قەیسی و مێوژ و بادام
فەساحەت جیڕ و هوڕی دێ لەوێدا وەک کەلەرمی تەڕ
لەناو ئەشعاری ئەم خۆراکە نایابانە شیعری کۆن
ئەشوبهێ هەر بەتەشپی پڕ لە تڕخێنە و لەپەی ساوەر
شوکر فەوتا جیناس و قاعیدەی تەشخیس و ئیستیفهام
هەتاکەی بۆ تەضادێ دابمێنم والەو موضطەر

هەتاکەی من مقەیەد بم بەقەیدی قافییە و ئەوزان
هەتاکو کەی (تجاهل عارفانە) بێنمە دەفتەر
لەگەڵ تەردید و قەتعا بۆ نەکەم قەتعی عیلاقەی دڵ
بەکەڵکی چیم ئەشێ غەیری خەفەت هێنان و دەردی سەر
دەبا بڕوا وضوح و ئیستیعارە گۆڕی با گۆم بێ
ڕجوع و حوسنی تەعلیل و نیدای حسی بەدیع ئاوەر
لە بۆ چیم چاکە بەینێ دابمێنم بۆ لەف و نەشرێ
مورەتەب یا مشەوەش بۆ بەدڵما چێ وەکو نەشتەر
بەقانوونیش مووەزەف گەییییە حەددی خۆی تەقاویتە
تەمای چیمان هەیە تاکەی بژی شیعری من و زێوەر

***

کاکە عەلائەددین ئەمجا ڕۆژێک ئەبێ ئەم شاعیرە بەنرخانە یا خۆیان تێئەگەن کە شاعیر نین و یا خێرخواهێک تێیان ئەگەیەنێ و کە لە ئەدەب و ئەدەبیات تێگەیشتن تەبعەن فێر ئەبن و کە فێر بوون ئەمجا ئەنووسن و باش ئەنووسن.

ئەمجا کە وابوو هەروەکو عەرزم کردن، موختار و مفەوەزن، ئەتوانن چ نەوعە دەس لێدانێ کە پێویست بێ دەستی لێدەن و کەلیماتی عەرەبی (حتی الامکان) بگۆڕن بە کوردی. پاش ئەوە تەرتیبی و حەجمی لاپەڕەکانی، لەگەڵ مقەدیمەیەکی خۆتا بۆم بنێریتەوە کە خۆم لێرە لەسەر ئەو تەوسییەیە تەبییزی بکەم و بۆ چاپ کردنی چی پێویستە عەرزتانی بکەم. ئیتر بەدڵ و بەگیان ژیان و بەرزیتان لە یەزدان داوا ئەکەم.

نووری شێخساڵح

سلێمانی

١٩٥٨/٥/١٤

## نامەی سێیەمی بۆ (عەبدولڕەحمان موفتی) ناردووە

نووری چاوم عەبدولڕەحمان

ئینشائەڵڵا دائیمەن مەسعوود و لە سحەتدا ئەبن، ئەلحەمدولیللا هەموو لایەک باشین.

وتار و ئەشعارەکان پاش سێ - چوار ڕۆژی حەفلەی تەئبینەکە هەموویم کۆ کردەوە و مەیدانی فەوتانی هیچیم نەدا، بە ئەمەلی ئەوەی کە ئینشائەڵڵا لە فرسەتێکدا لە چاپ بدرێ. تا ئەم بەینە کەس لێی نەپرسییەوە. لەم ڕۆژانەدا جەمال هات و داوای کرد وتی کاک ئاوڕەحمان داوای کردووە و بۆی ئەنێرم، منیش هەموویم تەسلیم کرد. بەڵام بۆ ئەوەی زایع نەبێ و بەهەر جۆر و تەقەللایەک بووە لە چاپ بدرێ ویستم ئەم کاغەزەتان بۆ بنووسم.

بێخود لە دڵی هیچ فەردێکا فەرامۆش نەکراوە. تەبیعی ئەو مەرکەز و مەکانەتەی بە لە چاپ دانی وتارەکان کە بۆ تەئبینەکەی وتراوە و بێجگە لەمەش بەچاپ کردنی ئەسەرەکانی تا دنیا ماوە ئەویش ئەمێنێ. ناشێ موتالەعەی حەیاتی گەورە و شاعیرەکانت نەکردبێ. زۆریان لە جیهانێکی موبهەمەوە دۆستێکی، موخلیسێکی، ئەسەرەکانی یا خزمێکی بەجارێ هێناوییەتەوە ناو دڵی خوێندەوارەکانی جێگەیەکی بەرزی بۆ تەئمین کردووە و تا لاموتەناهی ژیاندوویەتی. تۆ، ئێمە ئەگەر بێتوو کەمێک یەعنی هەر بەقەدەر ئیمکانی بۆ ژیاندنی ئەم ناوە گەورەیە تێبکۆشین زۆر بەئاسانی پێکی ئەهێنین و شتێکی گران نییە.

ئەوەلەن: ئەو قەبرەی کە ئەبەدیەن تیا ڕاکشاوە بۆ ئەوەی بەمرووری زەمان لەگەڵ ئەرزەکە نەبێ بەیەک تەدبیرێکی بکرێ.

ثانییەن: ئەو وتار و ئەشعارەی کە بۆ مەرحووم و تەئبینی وتراوە لە چاپ بدرێ و لە تەرەف یەکێکی شارەزاوە موقەدیمەیەکی جوانی عەلاوە بکرێ.

ثالیثەن: ئاسارەکان زۆر بەئیعتیناوە یەعنی لەسەر کاغەزێکی چاک لە چاپ بدرێ. بەفرۆشتنی ئەمانە ئەوانەی کە لە سەرەوە عەرزم کردن، کە عیبارەتە لە تەخلیدی ناو و مەرقەدی زۆر چاک پێک دێت. ئیشراف و تەنزیمی چاپ کردنی ئەمانە بخرێتە ئەستۆی مامۆستا (عەلائەددین سەجادی)یەوە، چونکە ئەو نەک هەر لەمەدا هەموو شتێکدا بەهۆش و مەعریفەتە.

ئەمجا من ئەمانەم بۆ نووسیت و هەرچی ئەزانی بەمن ئەکرێ و لە دەستم دێت ئەوە

تەودیعی من بکە، من بەڕۆح ئەیبەمە سەر. ئیتر خۆشیتان لە خوا داوا ئەکەم.

قەسیدەکەی عەبدولقەهار لای خۆتە

لێی سەندم و بـۆ خۆتـی نـاردووە.

ئیمزا

شێخ نووری

١٩٥٥/١٢/٢١

پووڕزات

## پاشکۆی ژماره ۲

### چاوپێکەوتن لەگـەڵ بەڕێزان: (عـەلائەددین سـەجـادی، ناسح عـەبدوڵڵا حەیدەری، ئەحمەد هەردی، سەعید ناکام)

بەمەبەستی ڕوونکردنەوەی زۆر لایەنی تاریک و نووتەک و کەلوقوژبنی شاراوە لە ژیانی (شـێخ نووری شـێخ سـاڵح) پەنام بردە بەر زۆربەی خـزم و ناسـیـاو و دۆست و هاوڕێ دێرینەکانی شاعیر... هەر چەندە زۆر لەوانەی چوومە لایان شتێکی تازەیان پێ نەدەگوتم و هەر ئەو شتانەیان بۆ دووبارە دەکردمەوە کە باو بوون و هەموو کەس دەیانی زانی، بەڵام هەندێ چاوپێکەوتنی دی سوودێکی ئێجگار زۆری پێگەیاندم لە ڕوونکردنەوەی زۆر لەو کەلوقوژبنانەی بەتاریکی مابوونەوە... ئەو لایەنانەش کە من مەبەستم بوون پێشتر لە هیچ سەرچاوەیەکدا بەرچاوم نەکەوتوون. زۆر لەو زانیاریانەی لە شوێنی خۆیاندا پەنجەم بۆیان ڕاکـێـشـاوە و ڕێگەیان بۆ ڕوونـاک کـردوومـەتەوە. هەندێ لەو یاداشت و بیـرەوەری و زانیاریانەی تریش، کە لە ئاشنا و دۆستەکانی خۆیم وەرگرتووە، چونکی لە شوێنی خۆیاندا سـوودم لێ وەرنەگـرتوون و نەیشم ویسـتـووە بەزۆری زۆردارەکی ئەو زانیـاریانە بئاخنمـە نووسـینەکـەمـەوە، بۆیێ بڕیارم دا لەم پاشکۆیەدا جـێـگەیان بۆ بکەمـەوە و بیـخـەمـە بەر دەستتان. لەوەش دڵنیام کە نووسینیان لە سوود بەخشین بەدوور نییە. هیوادارین ئەم کارە بۆ شاعیرانی تریشمان پەیڕەو بکرێت، نەبادا ئەو پیر و بەساڵاچووانەی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ژمارەیان ڕوو لە کەمییە، ئەوانیش بیرەوەرییەکانیان ببەنە ژێر گڵەوە.

***

ئەمەش دەقی گفتوگۆی ئەو دانیشتنەی نێوان من و مامۆستا عەلائەددین سەجادی بوو، کە سەرلەبەر تەرخانمان کرد بۆ باسی شێخ نووری شێخ ساڵح کاتێ سەر لە ئێوارەی ڕۆژی (۱۹۸۲/۱۱/۷) لەگـەڵ برایان: (جـەمـال خـەزنەدار و عـومـەر خـەزنەدار و سـەگـڤـان عـەبدولحەکیم) چووینە لای بەپێی ئەو وەعدەی کە ڕۆژی پێشتر بەتەلەفۆن بۆی دانابووم، لە ماڵەوە چاوەڕێی دەکردم.

لە سەرەتادا باسی یەکەم پێـوەندی خۆی و شـێخ نووری-م لێ پرسـیار کـرد، لە وەڵامدا گوتی:

- لە ئەواخـری سـاڵی (۱۹۳۹ - ۱۹٤۰) عـەلاقـەمـان بەست... یەکـەم جـار ئەو هاتە

بەغدا. ئیتر وەک عەلاقەی ئەدەب و دانیشتن بەموناسەبەتی دەرچوونی گۆڤاری گەلاوێژەوە دەستی پێ کرد و پەرەی سەند.

* هۆی چی بوو لە گۆڤارەکەتان (گۆڤاری گەلاوێژ) شیعری شێخ نووری بەکەمی بەرچاو دەکەوێ، تەنیا دوو شیعرتان بۆ بڵاو کردووەتەوە؟

– ڕاستییەکەی ئێمە حەزمان ئەکرد، شیعرمان بۆ بنێرێ و بۆی بڵاو بکەینەوە، بەڵام هەر خۆی کەمتر شیعری بۆ ئێمە ئەنارد.

* وا بزانم لەم ماوەیەدا خۆشی پشتی لە نووسین ساردببۆوە، وەک دەڵێن لە پاش کۆچی دوایی (شێخ عەزیز)ی برای لە ساڵی (١٩٣٦) کارێکی زۆری تێکردبوو.

– ڕەنگە ئەمە هۆیەکە بێ.

* باشە ئەم دوو شیعرەی بۆتان بڵاو کردووەتەوە، خۆ لێتان نەقرتاندووە، یان دەستکاریتان نەکردووە؟

– نەخێر... هەروەکو خۆی بۆمان بڵاو ئەکردەوە... ئێمە لە گۆڤاری گەلاوێژدا کردبوومان بەعادەت کە شیعر دەستکاری نەکەین.

* لەو یەکەم ناسینەی شێخ نووری، زۆرتر باسی چ بابەتێکتان کرد؟

– لەو جارەی کە هاتە بەغدا؟

* بەڵێ...

– ئەو جارە قسەکانی شێخ نووری دیار بوو ضدی ئەو کەسانە بوو کە لە نەزانینەوە دژی ئەوزانی کۆن دەوەستان، کە لەو سەردەمەدا تازە داکەوتبوون و بەناوی شیعری ئازاد، لە لاپەڕەکانی ڕۆژنامەی ژین، شیعریان بڵاو دەکردەوە.

* باشە مامۆستا، ئەو شیعرانەی کە لە کتێبی (ئەدەبی کوردی و لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی) و هەروەها لە کتێبی (دەقەکانی ئەدەبی کوردی) دا نموونەی شێخ نووری–ت هێناوەتەوە و لێیانت کۆڵیوەتەوە، ئەم شیعرانەت لە کوێ بەدەست کەوت؟

– هەندێک لەو شیعرانە لە خۆیم وەرگرتووە. هەندێکی تریشیان لە نامیلکە چاپکراوەکەی (مەبەستی ئەو چەند شیعرەیە کە لە ساڵی ١٩٥٨ لە لایەن کامەران موکری–یەوە پێشەکی بۆ نووسراوە و لە چاپخانەی کامەران لە چاپ دراون).

* هۆی چی بوو لەکتێبەکەتدا (مێژووی ئەدەبی کوردی) باسی شێخ نووری–ت نەکردووە؟

– بەڵێ نیازم وابوو بە تەفسیل لەسەری بنووسم، نەک هەر لەسەر شێخ نووری، بگرە

لەسەر بێخود و زێوەر و ڕەمزی مەلا مارف و چەند کەسانێکی تریش، بەڵام (مێژووی ئەدەبی کوردی) تەرخان کرابوو بۆ شاعیرە مردووەکان.

* کە تۆ دەهاتی بۆ سلێمانی، لەگەڵ شێخ نووری کۆدەبوونەوە؟

- من ئەوسا کە دەچوومە سلێمانی لە لای (پیرەمێرد) دەمامەوە، ئەو نەیدەهێشت بچمە هیچ شوێنێ. شێخ نووری ئەگەر لە سلێمانی بوایە و بیزانیایە هاتووم، دەهاتە لام. مەجلیسی «حاجی تۆفیق» خەریکی کۆڕی جۆربەجۆر بوون، هەندێ باسی شیعر و ئەدەبیان دەکرد وەک: (پیرەمێرد و جەلالی برای جەمیل سائیب و شێخ نووری و مەلا مستەفای ڕەسووڵ و شێخ محەمەدی خاڵ و براکانی و بێخود و من) هەندێ خەریکی گۆرانی و مەقام وتن بوون وەک: (حەمەی بەکر و ڕەشۆڵ و مەلا ئەحمەد دیلان)، هەندێکیشیان خەریکی سووکە یاری بوون وەک: (ڕەمزی مەلا مارف و حاجی مستەفا سەیید فەتحوڵلا و جەمیل سائیب). ئەمانە زۆریان بەهۆی منەوە ئەهاتن و لەوێ کۆئەبوونەوە. (عیزەتی تەل)یش کە خزمایەتی لەگەڵ (پیرەمێرد)دا هەبوو کە ئەیزانی من هاتووم، لە عەرەبەتەوە ئەهاتەوە، کاڵەک و ترێی لەگەڵ خۆی ئەهێنا.

* وا دیارە لەگەڵ شێخ نووری زوو زوو یەکترتان بینیوە؟

- بەعەکسەوە... بەهۆی لە یەکتر دووربوونەوە، کەمتر یەکترمان ئەبینی. ئەو ساڵە لە تەیناڵ بوو تەلەفۆنی بۆ کردم، من لە سلێمانی بووم. وتی: لە قەلەندەرخانەکەی پیرەمێرد کە گەڕایتەوە بۆ بەغدا، ئەبێ بۆ لای من لابدەی. کە چوومە لای جێگەی لەسەر کانیاوەکە پاک و پوخت کردبوو... دیسان لەوێ بەباسی شیعر و ئەدەب شەومان بەسەر برد...

* لە قسەکانیدا زیاتر باسی چ شاعیرێکی کوردی دەکرد؟

- لە قسەکانیدا ئەوە دەرئەکەوت، کە زۆر موعجەبە بە(نالی و مەولەوی و مەحوی...).

* شێخ نووری هیچ جارێک لەو دانیشتنانە شیعری بۆ جەنابت خوێندووەتەوە؟

- بەڵێ... زۆرجار...

* ئەی ئیلقای شیعر خوێندنەوەی چۆن بوو؟

- بەعەکسی پیرەمێرد، شێخ نووری ئیلقای زۆر جوان بوو...

* ئایا هیچ نامەتان لە بەینا بووە؟

- بەڵێ... ساڵی ١٩٥٨ کاغەزێکی بۆ ناردم.

* ئەو نامەیەت ماوە؟

- ماوە... ئێستا هەوڵ ئەدەم بیدۆزمەوە. (هەڵساو چوو بۆ ژووری کتێبخانەکەی. لە

پاش کەمێ نامەکەی بۆ هێنام...) دوای خوێندنەوەی نامەکە بۆم دەرکەوت لەگەڵ دەفتەرێک بۆی ناردووە کە دەربارەی عەرووز نووسیویەتی.

* وا دیارە دەفتەرێکی بۆ ناردوویت دەربارەی عەرووزی نووسیوە تا بیروڕا و تێبینی خۆتی بۆ بنووسی؟

- بەڵێ... بەڵام من دەفتەرەکەم بۆ ناردەوە سلێمانی... نازانم چی لێ بەسەر هات... کتێبێکی بەنرخ بوو...دەربارەی عەرووز و قافیە و ئەوزانی شیعری کوردی بوو، نموونەی لە شیعری: (نالی و مەولەوی و مەحوی و زێوەر و حەمدی)وکۆمەڵێ شاعیری تر هێنابووەوە.

* تەکلیفی لە تۆ کردبوو پێشەکی بۆ بنووسی یان تێبینی و سەرنجی خۆتی بۆ بنێری، ئەی تۆ چیت بۆ کرد؟!

- هیچم بۆ نەنووسی... شێخ نووری پیاوێکی متەوازیع بوو... لە تەوازووعدا ناخۆشی کردبوو، ئەگینا من بەنیسبەت ئەوەوە لە مەسەلەی عەرووز شارەزاتر نیم...

* وا دیارە بەیەکەوەش لە بابەتی عەرووز دواون، بۆیە وا گەیشتوونەتە ئەو بڕیارە؟

- بەڵێ، دەستێکی باڵای لە بابەتی عەرووزی شیعر هەبوو و ئەتوانم بڵێم عالم بوو تیایا. جارێکیان لەگەڵ شێخ ڕەئووفی خانەقا و بلە و گۆران و شێخ نووری دانیشتین. ئەو جارەش لە بابەت شیعر و ئەدەبەوە قسەی زۆرمان کرد. لەو دانیشتنەدا شێخ نووری ئەوەی سەلماند کە لە هەموومان بەبابەتەکە عالیمترە.

* هیچ پێی نەوتووی لە لای کێ فێری ئەو زانستە بووە؟

- وەک بۆی گێڕاومەتەوە و بۆی باس کردووم، لە لای (شێخ بابە عەلی شێخ عەبدوڵڵا و شێخ نووری شێخ بابە عەلی تەکیەیی) کە لە کیباری شەخسیات و عولەمای سلێمانی بوون، لە لای ئەوانە موستەعیدی خوێندووە و زۆر شت فێر بووە.

* کەواتە شێخ نووری باسی ژیانی فەقێیەتی و خوێندنی خۆی بۆ کردوویت؟

- شێخ نووری و مەجموعەیەک بوون لە سلێمانی و لە ئەترافی هەڵەبجە، دیراسەیان دیراسەی فەقێیەتی بووە. کە عیبارەت بوون لە (شێخ سەلام و شێخ نووری و بابە عەلی و مەلا حەمەمینی دێلێژەیی و مەلا ئەحمەدی حاجی مەلا ڕەسووڵ دێلێژەیی و سەییدئەحمەدی عازەبانی، ئەمانە مەجموعە فەقێیەک بوون بەیەکەوە ڕەفیق بوون. لە فەقێیەتیدا علوومی عەرەبییان تا مەرحەلەی (موستەعید) خوێندووە. کە ئەو قۆناغە دەرس بە(سوختە) ئەڵێنەوە.

* ڕەفاقەتی زیاتر لەگەڵ کێ بوو؟

- لەگەڵ زۆربەی شاعیران و ڕۆشنبیرانی سەردەمەکەی ڕەفاقەتی خۆش بوو، بەڵام زۆرتر لەگەڵ (بێخود و زێوەر و فەوزی) هەڵسوکەوتی ئەکرد.

* ئەی دەربارەی پێوەندی شێخ نووری بەباری ڕامیاری ئەو سەردەمە و بەتایبەتیش پێوەندی بە«شێخ مەحموودی نەمر»ەوە چی دەزانن؟

- داخی زۆر بوو بۆ سەردەمی شێخ مەحموود... لەگەڵ ئەوەشا کە خەڵک لۆمەی شێخیان ئەکرد... ئەم ئەیووت ئەترافەکەی باش نەبوون... زۆر جار کە بەیەکەوە دانیشتووین و باسمان کردووە بۆ تێکچوونی وەزعی کورد گریانی ئەهات.

* بەگشتی شێخ نووری وەک شاعیرێک و ڕۆشنبیرێک چۆن دەبینی؟

- شێخ نووری وەک ئینسانێک زۆر بەڕەوشت و زۆر بەئەدەب بوو... وەکو شاعیریش، لە لای من شاعیرێکی پایەبەرزە... شاعیرێک بوو مورتەبیت بوو بەقەزایای کوردایەتی... شاعیرێکی بەحەقیقەت بەرز بوو... پیاوێکی تێگەیشتوو و ڕۆشنبیر بوو... پاک بوو... لەو فەترەیەی هاتوچۆی منی ئەکرد کە لە گۆڤاری گەلاوێژ بووم و ڕەفاقەتمان هەبوو، ئەو شتانەم بۆ دەرکەوت... بەکورتی لە لای من شێخ نووری زۆر لە گۆران شاعیر تر بوو...!

***

لە ڕۆژی (١٣/٢/١٩٨١) و ڕۆژی (٢٥/١١/١٩٨١)دا جاری یەکەم لەگەڵ برای شاعیر (نەوزاد ڕەفعەت)، جاری دووەم لەگەڵ کاک (عەبدوڵڵا حەداد) چوومە لای مامۆستا (ناسح عەبدوڵڵا حەیدەری).

مامۆستا (ناسح عەبدوڵڵا حەیدەری) لە ساڵی (١٩٠٠) لە شاری هەولێر لە دایک بووە. باوکی قازی بووە... خۆی لە هەولێر و کەرکووک و سلێمانی مووەزەف بووە... پیاوێکی خۆش مەشرەبە و حەزی لە شیعر و ئەدەبیاتە (بگرە جار جارە شیعریشی داناوە) ئەدەب دۆستێکی دێرینە. هاونیشنی زۆر لە شاعیرەکانی ئەو سەردەمە بووە وەک: (بێخود و پیرەمێرد و بێکەس و گۆران).

* مامۆستا ساڵی چەند و چۆن دۆستایەتیت لەگەڵ شێخ نووری پەیدا کرد؟

- لە ساڵی (١٩٣٤)دا بەوەزیفە چوومە سلێمانی و بوومە (کاتبی عەدل) و ماوەیەکیش (ملاحظ محکمة) بووم... ئەوکاتە (شێخ نوورێ) (کاتبی مالیە) بوو، دوایی کە (خەزێنە) جیاکرایەوە، کرا بەکاتبی خەزێنە. هەر لەو ساڵەدا بەرێکەوت لە یانەی فەرمانبەرانی سلێمانی یەکترمان ناسی و ڕۆژ دوای ڕۆژ پێوەندی دۆستانەمان پتەوتر بوو و شەوەهای شەوی مەستانەمان لەگەڵ یەکتر بەسەر برد.

* ڕەنگە ئەم ڕێکەوتی یەکترناسینەتان شیعر دروستی کردبێ؟

– ئەو سەردەمە کەم کەس هەبوو، حەز لە شیعر بکات و گوێی بداتێ و ئەو ئیهتیمامەی پێ بدا. من لەگەڵ شێخ نووری دوای یەکتر ناسین کەوتینە باسی شیعر و ئەدەبیات...

* لەو ماوەیەدا بەزۆریی باسی چیتان دەکرد؟

– شێخ نووری چ لە سلێمانی چ لەو ماوەیەی هاتبووە هەولێر کە دادەنیشتین، هەر لەگەڵ پێکی یەکەم شیعرێکی بەناوبانگی (نامیق کەمال)[1] هەیە دەربارەی مەی و مەیخۆران دەستی دەکرد بەخوێندنەوەی.

* ئەو شیعرەت لە بیر ماوە؟

– وەڵلا ئەوەندەی بۆی خوێندمەوە تا منیش لەبەرم کرد.

(مامۆستا بەدەست و خەتی خۆی، بەڕێنووسی خۆی شیعرەکەی بۆم نووسییەوە، کە ئەمەش شیعرەکەیە)

بن شهیدی بادەیم، دوستلار دمم یاد ایلین
قبرمی میخانە انقاضیلە، بنیاد ایلین[2]

---

(١) ئەم شیعرە لە بنەڕەتدا هی شاعیرێکی تورکە ناوی (ڕەفعەت)ە وەک لە دوا دێری شیعرەکەدا دیارە. دەقی شیعرەکەش لەگەڵ ئەوەی مامۆستا (ناسیح حەیدەری) زۆر جیاوازییان لە نێواندا هەیە. کاک ئەحمەد تاقانە دەقی تێکستە تورکییەکەی لەبەر دەستنووسی دۆستێکی خۆی لە کەرکووک بۆ نووسیمەوە و پاشان کردی بەکوردی.

(٢) هەر بۆ زانیاری خوێنەران و ئاشناکردنیان بەشیعرەکە وا دەقی قەسیدە تورکییەکە و وەرگێڕانە کوردییەکەی دەخەینە بەردەستی خوێنەرانەوە.

بن شهید بادەیم دوستلر دمم یاد ایلەییک
قبرمی میخانە انقاضیلە بنیاد ایلەییک
گرچە غسل اولماز شهیدان حمیت ماء ایلە
ییقایک میلە بنی بر مذهب ایجاد ایلەییک
قبرمە قندیل ایچون بر کهنە ساغر وقف ایدک
شعلەء نار عرقلە روحمی شاد ایلەییک
تربەدار أولسون بکا بر رند میخوار غریب
نذر سرخوشان ایلە اول پیرە امداد ایلەییک
نیلە میلە، بر آلای محبوب ایلە هردم گلک
بزم جم آیيننی قبرمدە معتاد ایلەییک
=

نەیلە مـیلە بر آلای مـحـبـوب ایلە هردم گلن
بزم جـامی آیىن، قـبـرمـدە مـعـتـاد ایلین

---

حق حق ایلە قـبـرە ایندیرسین بنی دیوانەلر
سـز بنی بو وجـە ایلە دنیـادن آزاد ایلەییک
ویرمـەدی بر گـون بکا بو ذوق ایلە بر فـاصلە
حـالی بربر مـزارم اوزرە تعـداد ایلەییک
بادەسـز مـست ایلیـور بوی شـرابم عـالمی
بادە نوشـانی بو نو شـعـرملە ارشـاد ایلەییک
یادگـار أولسـون بو شـعـرم أولیـای سـاغـرە
بن شـهـید بادەیم (رفـعت) دمن یاد ایلەییک

لێکدانەوەی کوردی شیعرەکە:

من شەهیدی بادەم دۆستینە دەمم یاد بکەن
گۆڕم بەدار و پەردووی مەیخانە بنیاد بنێن
ئەگەرچی شەهیدانی غیرەت نابێ بشۆررێن
من، بەمەی بشۆن و ڕێبازێک دابهێنن
بۆ چرای گۆڕم جامێکی کۆن وەقف بکەن
بەکڵپەی ئاگری بادە گیانم شاد بکەن
ڕەندێکی مەیخۆرەوەی ئامۆ ببێتە پاسەوانی گڵکۆم
بەنەزری سەرخۆشان یاریدەی ئەو پیرە بدەن
بە نەی و مەیەوە، بەکۆمەڵە خۆشەویستێکەوە هەموو دەمێک وەرن
ئایینی بەزمی جەم لە گۆڕمدا بکەنە نەریت
بەحەق حەق، با دێوانەکان بمنێنە گۆڕەوە
ئێوە بەم شێوەیە لە جیهانم ئازاد بکەن
بەم زەوقەوە، ڕۆژێک بوارێکی نەدام
یەکە یەکە بارودۆخم بەسەر گۆڕەکەمدا تۆمار بکەن و بژمێرن
بۆنی شەرابم بەبێ بادە، جیهان سەرخۆش دەکا
بەم تازە شیعرەم، ڕێنمایی بادەنۆشان بکەن
ئەم شیعرەم با بۆ دۆستانی مەی ببێتە یادگار
من شەهیدی بادەم، دەمی (ڕەفعەت) یاد بکەن.

قبرمه قنديل ايچون بركهنه صاغر وقف ايدن
شـعلەی ناری عـرقله، روحـمی شـاد ايلين
تربەدار اولسـون بكا بر پيـر مـيـخـور نديم
بزم سـرخـوشـانه در اول پيـره امـداد ايلين
يادگـار اولسن بو شـعـرم اوليـابی صـاغـره
پر آچوپ او حتی كمال، اردنجه فـرياد ايلين

* مامۆستا له سلێمانی زۆرتر له كوێ كاتتان بەسەر دەبرد؟

- لەو ماوەیەی له سلێمانی بووم زۆر ئێواره بەیەكەوە دەچووینه (سەرچنار). له سالی یەكەم و دووەمی مانەوەم له سلێمانی مالم نەبردبوو بۆ ئەوێ. خانوویەكم گرتبوو، كردبووم بەجێیٚ كۆبوونەوەی ئەدیبان و هونەرمەندان. له سالی (١٩٣٦) ئنجا مال و خێزانم برده سلێمانی.

ئەوەم له بیر چوو... زۆر شەویشمان له مەجلیسەكانی (حوسێن مەزلووم) دەبرده سەر. (حوسێن مەزلووم) كاكەیی بوو، واریسی ئەو (قطبی) بوو كه دكتۆری بەیتەره بوو. شێخ نووری تەبیعـاتی وابوو بەتەكلیف گـۆرانی له بۆ كەس نەدەگـۆت، بەلان كه (حوسێن مەزلووم) دەعوای لێ كردبا له بۆی دەگۆت...

* دەلێن شێخ نووری دەنگیشی زۆر خۆش بووه... تۆ دەلێی چی؟

- شێخ دەنگی هەتا بلێی خۆش بوو... كەم جار هەبوو پێكەوە دانیشین و گۆرانی نەلێ...

* دەربارەی گۆرانی كوردیی ئەو سەردەمه رای چۆن بوو؟

- بەعام قسەی نەدەكرد... بەلان دەیگۆت رام له مەقام و گۆرانی (ئەخۆل)ی شاعیره... رای له مقام و گۆرانی (رەشۆل) نەبوو... رای له زۆری گۆرانییه فۆلكلۆرییەكان نەبوو... دەیگۆت خراپی دەلێن... مەسەلەن رای له (كەتان كەتانه) و (هەوری لار) نەبوو، بەلایەوه غەلەت بوو... دەیگۆت پێویسته خاوتر بیلێن.

* دەربارەی شاعیران بەزۆری باسی كێی دەكرد؟

- زۆر باسی مەولەوی و نالی و مەحوی دەكرد... دەیگۆت (مەولەوی) فیكری وەك تەیر دەفرێ... (نالی) بیری قووله... باسی (كەلیمی هەمەدانی) دەكرد، بەلام قەتعییەن گوێم لێ نەبووه باسی وەیان مەدحی شاعیری عەرەب بكا... زۆر رای له هەردی و شیعری هەردی بوو... ئەسەفیشی ئەوەبوو كه ئەم كوره بۆچی شیعر نالێ... كه باسیش دەهاته سەر

(عەلی کەمال باپیر ئاغا) دەیگۆت خراپ نییە... بەڵام بێ تاڵع و برسییە...

* هیچ ڕێکەوتووە تۆ لە دانیشتنێکی شێخ نووری بیت هونەرمەندێکی ترتان لەگەڵ دانیشتبێ؟

- لە هەولێر من و شێخ نووری لەگەڵ (شەهابە)ی خوالێخۆشبوو دانیشتین. گوێی لە دەنگی (شەهابە) بوو بە(ئسوولّ شوناسی) دانا... یەعنی مەقام زان... هەر چەندە (شەهابە) گۆرانی کوردی کەم دەزانی (بگرە زۆر کەیفی پێ نەدەهات) بەزۆری تورکی و فارسی و عەرەبی دەگۆت، بەڵام زیرەک بوو، شتی زوو لەبەر دەکرد...

* بەو سیفەتەی ماوەیەکی دوورودرێژتان لەگەڵ یەکتر بردووەتە سەر، ئایا دەزانن شێخ نووری چۆن شیعری دەنووسی؟

- شێخ نووری بەفیترە شاعیر بوو، لەوانە نەبوو شیعر بەگیری بینن... یان بەبیست ڕۆژ ئەوجا لە نووسینی شیعرێک ببیتەوە... هەر بەلەبەر شیعری دەنووسی، یەعنی شیعرەکە تەواو لەکنی پێدەگەیی و دەیان جار لەبەر خۆیەوە دەیگۆتەوە ئەوجا دەینووسی. کە شتەکی تازەشی دابنابایە دەهات و دەیگۆت ئەوڕۆکە ئەوەم نووسییەو بیروڕای منی وەردەگرت... زۆربەی شیعرەکانی خۆشی لەبەر بوو.

* ئیلقای شیعریی چۆن بوو؟

- شێخ نووری باشترین ئیلقای شیعریی هەبوو، بگرە مامۆستا و مەرجەع بوو. زۆرجاری وا ڕێکەوتووە کەسێ لە مەجلیسێکدا ئەگەر شیعرێکی بەغەڵەت خوێندباوە هەتا پێی ڕاست نەکردبایەوە وازی نەدەینا و هەر دەیگۆت سەرلەنوێ بیلێیەوە.

* چۆن باسی سەردەمی شێخ مەحموودی بۆ دەکردی؟

- زۆر شێخ مەحموودی خۆش دەویست... ئەوکاتە شێخ مەحموود مەنفی بوو، بەڵام دەیگۆت دەوروبەرەکەی هیچ نەبوو. کە قسە دەهاتە سەر شێخ مەحموود ئاخێکی هەڵدەکێشا... هەندە جار لە خواردنەوە دەبووە کەلاک و هەر پێکی یەکەمی خۆش بوو. کە لێمان دەپرسی هۆی ئەوە چییە؟ دەیگۆت لە ژیان زۆر موتەئەسیرم. تا حەددی ژیان و مردن دەیخواردەوە. ئەگەر مودمین نەبایە شتی زۆر گەورەتری دەکرد. لەگەڵ خواردنەوەش عەقیدەی دینی هەبوو.

* ئەو ماوەیەی تۆ دەتناسی زیاتر بەینی لەگەڵ کێ خۆش بوو؟

- بەینیان لەگەڵ (بێخود) زۆر خۆش بوو... ئاگام لێ بوو لەگەڵ (حوزنی موکریانی)یش بەینی هەر خۆش بوو.

* سالی چەند وەزیفەکەت بۆ هەولێر گوێزرایەوە؟
- سالی (١٩٣٧) وەزیفەکەم بۆ هەولێر گوێزرایەوە... بەدوای منیشدا وەزیفەکەی (شێخ نووری) بۆ خەزێنەی هەولێر گوێزرایەوە. لە هەولێر بێجگە لە من کەسی دی نەدەناسی، ئەمنیش خانییەکم لەوبەری بەستێ لە بۆی گرت. بەدرێژایی ئەو سالەی لە هەولێر ماوە، هێواران پێکەوە دەچووینە گوندی (چیمەن). ئەو وەختە بە سێ - چار درهەم دەیانبردین ئێستا بەچار دیناریش ناتبەن. لە گوندی (چیمەن) لەسەر کاریزەکەی دادەنیشتین و دەمانخواردەوە.
* بێجگە لە تۆ و شێخ نووری، کێی ترتان لەگەل دەهات؟
- چەند برادەرێکی دیکەم هەبوو دەهاتن، لەوانە: (نورەددین ئاغا و مووساغای کوڕانی ڕەشید ئاغا) و (سەلیم سەبری) موفەتیشی بەرق و بەرید، ئاوڕەحمان موفتی و هەندێ لە مووەزەفەکانی دائیرەی خەزێنەی هەولێر (ئەوانە ئێستاکە هەموویان مردینە) ئەو برادەرانەم کە ناوم هینان سەیرانەکمان کرد و چووینە گوندی (چیمەن) لەوێ بەیەکدیمان ناساندن. ئەوانیش کە (شێخ نووری)یان ناسی زیاتر حەزیان بەدانیشتنی کرد و زوو زوو لەگەلمان دەهاتن. شێخ نووری کە لە هەولێر بوو پێکەوە سەرمان لە (عەنکاوە) دەدا و هەندێ جاریش سەرمان لە (شەقلاوە) دەدا. چەند جارێکیش دەچووین وەختمان لە باخ و باخاتی (بنەسلاوە) بەسەر دەبرد. مەجلیسی مامۆستا شێخ نووری تا بلێی خۆش و بەتام بوو، بەتایبەتی دەنگ خۆشییەکەی ئەوەندە زیاتر مەجلیسی دەڕازاندەوە.
* بۆچی (وەک لە شیعرێکیدا دەردەکەوێ) دلی بەهەولێر نەکراوەتەوە؟
- ئەو کاتەی شێخ نووری هاتە هەولێر، هەولێر شارەکی زۆر دواکەوتوو بوو، خۆشی دەست کورت بوو، مەشروب خواردنەوە عەیب بوو. ئینسان نەیدەتوانی بەکەیفی خۆی بجوولێتەوە. لە (نادي الموظفين) دادەنیشتین لەگەل هاوڕێیەکانی من و خۆی. بەڕاست بەبیرم هاتەوە لە مەجلیسەکەماندا (شێخ ڕەئووف) کە بە(ڕەئووفە کوێر) ناسرابوو لەگەلمان دادەنیشت. شێخ نووری ئەو جەماعەتەی زۆر خۆش دەویست و ئەوانیش ئەویان زۆر خۆشدەویست.
* وەک بزانی هیچ پێوەندی بە(مەلا فەندی)یەوە هەبوو؟
- ئەوەندەی لە هەولێر بوو، ئاگام لێ بوو پێوەندی لەگەل نەبوو[1].

(١) بۆیێ (کە شیوەنی مەلا فەندی)ی کردووە شیعرەکەی ڕاستەوخۆ بۆ خۆیان نەناردووە، بەهۆی (گیوی موکریانی)یەوە بۆ (عزەددین)ی کوڕی ناردووە.

* ئەدی چ سیفەتێک لە شێخ نووری-دا هەبوو، ئەتوو بەدڵت بی؟

- ڕقەبەری لەگەڵ کەس نەدەکرد. خۆی بەسەر کەسدا فەرز نەدەکرد. باس و زەمی کەسی نەدەکرد. بەدرێژایی مانەوەی لە هەولێر و ناسینی لە سلێمانی ئەمن لەگەڵی دادەنیشتم، لەبزی خراپی لە کەس نەگەڕا.

* خوێندنەوە و نووسینی چۆن بوو؟

- ئاگـام لێ بوو بەشـەوان دەیخـوێندەوە و بەڕۆژ وەزیفـەی دەکـرد. بەڵان هەتا بڵـێی کابرایەکی زیرەک بوو. زۆر مودمین بوو. لەسەر مێزی وەزیفە جگەرەی نەدەکوژاندەوە.

* بەچ زمانێک زیاتر دەیخوێندەوە؟

- لە زەمانی عوسمانییەکان کە دەسەڵاتداربوون، کۆنەکان زمانی ڕەسمییان تورکی بوو. مەکتەب و خوێندن تورکی بوو، زمانی حکوومەتیش هەر تورکی بوو. (مەکاتبی علمیە) لە جیـاتی قـوتابخـانەی ئەمڕۆ باو بـوو. لە ناو حـوجـرە و فـەقـێـیـانیش (گـوڵـسـتـان) و (بۆستان) و (شانامە)یان بە فارسی دەخوێند. بێگومان شێخ نووری سەقافەتی تورکی و فارسی بوو، بۆیێ بەزۆری کتێبی تورکی و فارسی دەخوێندەوە.

* باری گوزەران و دارایی چۆن بوو؟

- دەست کورت و لات بوو.

* وەک بۆی باس کـردبیت، پێـوەندی لەگـەڵ (عـەبدولکەریم بەگی کـەرکـووکلی زادە)ی حاکمی مونفەریدی سلێمانی چۆن بووە؟

- لە بۆی باس دەکردم، دەیگۆت پیـاوێکی کوردپەرست و بەوەفا و موستەقیم بوو. زۆر لەگەڵ یەکدی هەڵسان و دانیشتنیان بووبوو.

* هیچ بەرهەمێک یان دەستنووسێکی ئەوت لە لا نەماوە؟

- وەکـو عـەرزم کردی، ئەو وەختـە کـەس گـوێی نەدەدایە ئەو شـتـانە، وەکو ئێـسـتـا نەبوو، خەڵکی وەکو نکۆ خـەریکی ئیهـتیـمام دان و جەمـع کردنی شیعری ئەو شاعیرانە بن، دەنا ئەگەر بمزانیبایە وای لێ دێ، ئەوە هەموو شیعرەکانیم دەنووسییەوە.

* کەواتە هیچ بەرهەمی شێخ نووری-ت لە لا نییە؟

- نەوەڵڵا.

* دوا شت حـەز دەکـەیـن پێـمـان بڵـێی، وەک ئینسـانێک باری سـەرنجت بەرانبەر شێخ نووری چۆن بوو؟

- شێخ نووری تا بڵێی ڕەوشتی بەرز بوو، فریشتە بوو، زۆر متەوازیع بوو. سێ ساڵ لە سلێمانی و نزیکەی دوو ساڵ لە هەولێر پێکەوە بووین، شتێکی خراپم لێ نەدیت. ئینسانێکی عالی جەناب و بەعیزەت نەفس بوو. سێ ڕۆژ نانی نەخواردبایە کەس پێی نەدەزانی. زۆر بەوەفاش بوو. بەهەموو مانایەکی ئەدیبی ئەدیب بوو. هەر چەندی لەسەر بنووسرێ هەر کەمە...!

***

لە ڕۆژی (١٩٨١/٤/٢٣) لەگەڵ شاعیری پایەبەرز مامۆستا (ئەحمەد هەردی) لە دانیشتنێکدا دەربارەی بیرەوەری خۆی و شێخ نووری شێخ سالح پرسیارم لێ کرد... لە وەڵامدا گوتی:

پێشتر دوور بەدووری شێخ نووری-م وەک دەنگ خۆش و شاعیر ئەناسی. زۆرتر شێخ ڕەئووف و شێخ برایم-م ئەبینی...

یەکەم جار کە ناسیبێتم بەهۆی تەخمیس کردنی شیعری (شەو)ەوە بوو. ئەوساکە کە تەخمیسم کرد لە هەڵەبجە بووم، بەڵام لە سلێمانی لە ساڵی (١٩٤٨ - ١٩٤٩)دا ئەو کاتە فەسڵ کرابووم و بێ ئیش بووم. ئەو ماوەیە لە دوکانی (فایق) ناوێک (کە لەم دواییە مووەزەف بوو لە عەقاری) لەگەڵ شێخ حەسیبی کوڕی شێخ ئەحمەدی شێخ غەنی و کۆمەڵێ کەسی تر لەوێ دائەنیشتین و یەکمان ئەگرتەوە. لە دوورەوە بەسەر و سیما ئەمزانی ئەوە شێخ نووری-یە، ئەویش بەهۆی باوکمەوە منی ئەناسی، باوکم دەیەها شەو لەگەڵی دانیشتبوو و خواردبوویانەوە. کە هات بۆ لای ئەو دوکانە بەیەکتریان ناساندین. کە وتیان ئەمە فلانە، دیاربوو بەناو منی ئەناسی... بیستبووی من ئەو شیعرەی ئەوم تەخمیس کردووە، داوای لێ کردم ئەو تەخمیسەی بۆ بخوێنمەوە. منیش بۆم خوێندەوە... وادیار بوو زۆری لە لا خۆش بوو، کاغەزێکی دەرهێنا و وتی حەز دەکەم بەدەستی خۆت بۆمی بنووسیتەوە[1]. ئیتر لەو جارەوە زیاتر یەکترمان ناسی و بۆماڵەوە هاتوچۆیانم ئەکرد.

جارێکی دی ئەو مودیر ناحیەی (سەنگاو) بوو، ڕۆژێ من و جەمال ئاغای حەکیم و ئەحمەدی حەمەی ئەولێ (کە ئێستاش ماوە - شێخ جەناب-یش لەوێ بوو) بەڵام (شێخ

---

(١) وا دیارە هەر ئەو تەخمیسەیە بەر لە چاپ کردنی لە دیوانی (ڕازی تەنیایی)، شێخ نووری لە دەستنووسی (گەڵاڕێزان)ی خۆیدا نووسیویتییەوە و لەوێدا دەڵێ: لە لایەن شاعیری نازک خەیاڵ مامۆستا (ئەحمەد هەردی)یەوە تەخمیس کراوە.

جـەناب)ی کـوڕی نەخـۆش بوو. بۆ دڵ کـردنەوەی (جـەناب) وتی: بۆ نایەن بـچین بۆ سـەنگاو... ئیـتـر ئێـمـەش قـبـوولـمـان کـرد. لێـرەوە چووین لە دۆڵی قـەرەداغ بە وڵاخ سەرکەوتین، (ئەحمەد و جەمال ئاغا) حەزیان لە ڕاو ئەکرد. شەوێ لە ماڵی شێخ نووری بووین، دواییش چووینە ڕاو. لەوێ چووینە ماڵی (کەریمە گوللەنەبڕ) ئەویش حەزی لە ڕاو نەکرد و چووینە ڕاو. یەک - دوو کـەروێشکمـان ڕاو کـرد و ڕۆژی دوایی چووینە (پێنج ئەمووستە) لەوێ کابرایەکی جاف تەنیا ماڵە بوو، خێوەتێکی هەڵدابوو. لەگەڵ براکانی لەسەر ئاو و ئەرز نیزاعی هەبوو، موفەوەزەکەی سەنگاو کابرایەکی کەرکووکی بوو، ئەویش لەگـەڵـمـان هات، لە پاشـان لەژێر ڕەشـمـاڵەکـەی نووسـتین. بارانیش باری. بەیانیش گەڕاینەوە سـەنگاو شێخ نووری لەوێ مـقـەید بوو، خۆی شێخ بوو، ئەوانیش (خـەڵکی سەنگاو) شێخایەتییان زۆر بوو.

لە ساڵی (١٩٥٧)دا کۆمەڵێ شیعری دا بە من (کە ئێستا لای تۆیە) تاکو بیهێنمە سەر ڕێنووسی تازە و پێشەکییان بۆ بنووسم و لە چاپیان بدەین، بەڵام هەر لام مایەوە و نەمـتـوانی، تا ئەوە بوو ئەو شـیـعـرانەی دا بە(کـامـەران مـوکـری) و لە سـاڵی ١٩٥٨ بەپێشەکییەکی ئەوەوە لە چاپی دان.

* مامۆستا لەم دواییەدا شـتێکم بیـست، گوایە شێخ نووری وەسیەتی کردووە تۆ و کاکەی فەللاح لە پاش مردنی خۆی بەرهەمەکانی چاپ بکەن و لەسەری بنووسن!؟

- من شـتی وام نەبیـسـتـووە. دوایی وەک خۆشت ئەزانی کـوا من تاقـەتی ئەو شـتـانەم هەیە. تاقەتی نووسینەوە و لە چاپدانی بەرهەمەکانی خۆمم نییە... دوای ئەوەش من بەم دواییە لێی نزیک بووم ئەگەر شتی وای بووتایە ئەمزانی...!

***

لە ڕۆژی ١٩٨٤/٢/٤ چوومە لای مامۆستا سەعید (ناکام) و لە شەقڵاوەدا میوانی بووم، ئەویش بەم جۆرە یادگاری خۆی لەگەڵ شێخ نووری گێڕایەوە:

سـاڵی ١٩٤٥ لە هەولێـر دادگـای عـورفی دانرابوو و من یەکـێک بووم لەو کـەسـانەی عورفی بەدوایاندا دەگەڕا، هاوڕێیەکانم بەرەو کۆماری کوردستـان لە مەهاباد ئاوا بووبوونە ئەودیو، زسـتـانێکی هێـجـگار سـەخت و تۆف بوو، ئەو کـاتە لە نێـوان ڕەواندز - ڕایاتدا تەنیا لۆرییەکانی عەسکەری هاتوچۆیان دەکرد.

خۆم گەیاندە ڕەواندز و مـیوانی مـاڵی خاڵە شاکـر موجریم بووم کـە لە دادگای ڕەواندز نیشی دەکرد، بەهۆی ئەوەوە بەسواری لۆرییەکی سوپایی گەیشـتمـە گەڵاڵە و چوومە ماڵی

شێخ نووری شێخ ساڵح کە مودیری ناحییە بوو. ئەو کە لە گوندێکی چەپەک و دوور لە کۆڕی هەواڵ و هاودەمان دەژیا و بەدەگمەن ناسیاوێک ڕێی دەکەوتە لای، ئەم چوونەی منی زۆر پێ خۆش بوو، لە پێشدا وای زانی تەنیا بۆ لای ئەو هاتووم و ماوەیەک دەمێنمەوە، بەڵام کە چۆنێتی کێشەکەی خۆمم تێگەیاند ناردی چەند کەسێکی کاروانی و قاچاخچی بانگ کرد تا بەڵکو بمگەیەننە ئەودیو، ئەوان کە ئیشیان بازدانی سەر سنوورەکان بوو گوتیان بەهۆی ئەستوورایی بەفری زۆرەوە بەهیچ جۆرێک زەلام دەرناچێ، ئەوان ئەوپەڕەکەی دەتوانن بمگەیەننە دەربەند، بۆیە پێویستە ڕابوەستم تا ڕێگا دەکرێتەوە، ئەم ڕێگا کرانەوەیەش لەوانەیە زیاتر لە مانگێک بخایەنێ.

شێخ نووری وای بەباش زانی کە لەوێ بمێنمەوە تا ڕێگا دەکرێتەوە، تەنانەت گوتی «پەلە مەکە با هەوا خۆش بێت، لەوانەیە منیش لەگەڵتا بێم»، بەڵام من نەمتوانی ئەوەندە چاوەڕوانی بکەم، پاش چەند ڕۆژێک ماڵاواییم لێ کرد و گەڕامەوە، لە بەهاری ١٩٤٦دا لە سلێمانییەوە چووم بۆ مەهاباد. ئەو کاتە شێخ نووری (جەناب)ی کوڕی لە لا بوو، شیعرەکانی خۆی کە ئەو چەند ڕۆژە بۆی خوێندمەوە و ئەو دەستنووسانەی چاوم پێیان کەوت، زۆر لەوانە زیاتر بوون کە تا ئێستا بڵاوکراونەتەوە. ئەو لەو ڕۆژانەدا کز و خەمبار دەهاتە بەرچاو و گلەیی لە بار و ژیانی خۆی دەکرد، کاتێ باسی بەسەرهاتەکانی خۆمم بۆ دەگێڕایەوە، پەیتا پەیتا وشەی «ئای خۆزگەم بەخۆت»ی دووپات دەکردەوە.

# پاشکۆی ژماره ٣

## شیعری «دلاوەران» هی «شێخ نووری»یە

نووسینی: ئەحمەد هەردی

ماوەیەکی دووردرێژە، مامۆستایان: (محەمەدی مەلا کەریم) و (ئازاد عەبدولواحید)، لەسەر شیعری (دلاوەران)، لەیەک ئەنووسن: کاک (محەمەد) ئەڵێ: (شیعری دلاوەران هی مامۆستا بێخود)ە و کاک (ئازاد) ئەڵێ: (نەخێر هی شێخ نووری)یە. جا لەبەرئەوەی منیش شیعری (دلاوەران)، بەهی (شێخ نووری) ئەزانم، جگە لەوەی کاک (ئازاد)یش، چەند جارێک، منی بەلایەنگری (شێخ نووری) لە قەڵەم[1] داوە، بۆیە بەپێویستی ئەزانم، بیروڕای خۆم، لەم بارەوە دەربڕم، بەڵام پێشەکی ئەبێ ئەوە بڵێم: هەرچییەک لەم وتارەدا ئەینووسم، ئەوەندەی تۆزقاڵێک لە ڕێز و خۆشەویستی من کەم ناکاتەوە، بەرامبەر ئەو زاتانەی لێرەدا ناویان ئەهێنم، بەتایبەتی یەکێکی وەکو مامۆستا (بێخود) کە شایانی هەموو ڕێز و پایەیەکی شیاوی خۆیەتی. وە لام وایە شاعیرێکی گەورەی وەک ئەو، شیعری (دلاوەران) هی ئەو بێ، یا هی یەکێکی کە بێ، هیچ شتێک لە نرخ و پایەی ئەو کەم ناکاتەوە.

دوای ئەم سەرەتایە، با بچینە ناو باسەکەوە.

مامۆستا (محەمەدی مەلا کەریم) لە لاپەڕە -٨٢-ی گۆڤاری (بەیان)دا، ئەڵێ: (لە بەهاری «١٩٧٠»ەوە کە دیوانی بێخود بڵاوبووەوە و لە پاشانیش ئەو وتارەم لە (برایەتی)دا بڵاو کردەوە و، تا کاک ئازاد کەوتە پەیجۆری دۆزینەوەی خاوەنی ڕاستەقینەی «دلاوەران» هیچ دەنگ نەبوو. کەسێک خۆی لە مەسەلەکە هەڵنەقورتاند و... یەکێک لەم ڕۆشنبیرانەی کورد کە ئێستا پاش (١٥) ساڵ لە بەردەمی کاک ئازادا شایەتی ئەدەن دلاوەران هیی شێخ نوورییە و هەریەکە حیکایەتێکیشی لەگەڵ ئەگێڕنەوە، تا ئەو نەیهێنانە دەنگ کەسیان بەزەیی بەحاڵی مێژووی ئەدەبی کوردا نەهاتەوە تا ئەگەر ڕاستییەکی لابێ بیدرکێنێ)[2].

دوای ئەوەی دەقی قسەکانی کاک (محەمەد)م، وەکو خۆی نووسی، بەپێویستی ئەزانم

لێرەدا بڵێم: من چاو لەوە ئەپۆشم کە کاک (محەمەد) شایەتەکانی کاک (ئازاد)ی وا پیشان داوە لە پەناوە نەبێ قسەیان پێ ناکرێ...! یا بەمانایەکی تر: لە پەناوە (ئازاد) تیژ ئەکەن و خۆیان زاتی ئەوەیان نییە، بێنە پێشەوە و بەئاشکرا (شایەتی بدەن)! یا بەدەم دڵسۆزییان بەشی کەس نەداوە و، وەکو تر بەزەییان بەئەدەبی کوردا نایەتەوە...!! ئەڵێم: من چاو لەم توانجانە ئەپۆشم، چونکە ئەزانم تیر و توانج هاوێشتن هیچ گرێیەک ناکەنەوە.

هەروەکو ئەشزانم هەزار قسەی ڕەق ڕاستییەکی بچووکیش ناشارنەوە. جا لەبەرئەوە دێمە سەر وەرامی قسەکانی کاک (محەمەد). بەڵام پێش ئەوەی ڕاستەوخۆ وەرامی قسەکانی بدەمەوە و بۆی دەرخەم کە لە ماوەی ئەم چەند ساڵانەدا، بەپێچەوانەی قسەکانی کاک (محەمەد)ەوە، شایەتێکی لە ئێمەمانان لە پێشتر و نزیکتر بە(شێخ نووری) شایەتی بۆ (شێخ نووری) داوە، بێ ئەوەی کاک (ئازاد) بەبیریشیا هاتبێ![*] یا کاک (محەمەد) باسی بکا! ئەڵێم: پێش ئەوەی ڕاستەوخۆ، پەنجە بۆ ئەو شایەتە ڕاکێشم، لەسەر هەمان (مەنتیقی) کاکە (حەمە) ئەڵێم: ئاشکرایە کە شیعری (دلاوەران) یەکەم جار لە ساڵی (١٩٢٥)دا لە چاپخانەی بەلەدییەی سلەیمانی، لە نامیلکەیەکدا لە چاپ دراوە و ناوی شێخ نووری لەسەر نووسراوە[٣]. هەروەها لە ساڵی (١٩٢٨)دا کەریم بەگی سەعید بەگ، کە بە(کەریم زانستی) بەناوبانگە شیعری (دلاوەران)ی بۆ جاری دووەم بەناوی (شێخ نووری)یەوە بڵاوکردۆتەوە لە نامیلکەیەکدا لەگەڵ چەند گۆرانییەکی کەدا[٤].

هەروەها بۆ جاری سێیەم (کوردی و مەریوانی) لە ساڵی (١٩٣٢)دا، شیعری (دلاوەران)یان، بەناوی شێخ نوورییەوە بڵاوکردۆتەوە لەگەڵ چەند سروود و گۆرانییەکی کەدا، وە ناوی (گۆرانی کوردی)یان، لێ ناوە[٥]، هەروەها کاکە (حەمە) خۆی ئەڵێ: لە (دیاری لاوان)دا سەرلەنوێ بەناوی (شێخ نووری)یەوە بڵاوکراوەتەوە[٦].

کە ئاشکرایە (دیاری لاوان) لە ساڵی (١٩٣٤)دا لە چاپ دراوە، کە ئەمە ئەکاتە چوار جار. ئەمە جگە لەوەی کە لە ساڵی (١٩٥٣)دا جارێکی کە، شاعیرێکی گەورە باسی کردووە، وەکو لە پاشتردا دەری ئەخەم. جا ئەگەر بەوێ پێڕەوی کاک (محەمەد) بکەم،

---

(*) چ لە وەڵامەکەی من بۆ کاک محەمەدی مەلا کەریم، یان لە وەڵامەکەی دووەم جارمدا کە لە گۆڤاری بەیان-ی ژمارە (١٣٤)ی ساڵی ١٩٨٧دا بڵاوکراوە، یان لە بیبلیۆگرافیایەکەی لەم کتێبەدا سازم کردووە، ئاماژەم بەو سێ سەرچاوەیە کردووە و زۆر چاک بەبیرمدا هاتووە و وەک بەڵگەنامەی گرنگ و زیندوو بەکارم هێناون. (ئا. ع).

لەسەر شێوازی ئەو ئەڵێم: لە ساڵی (١٩٢٥)ەوە کە شیعری (دڵاوەران) بۆ یەکەم جار بڵاوکراوەتەوە، هەتا ساڵی (١٩٥٥) کە مامۆستا (بێخود) کۆچی دوایی کردووە[٧]، ئەکاتە (٣٠) ساڵ. هەروەها لە (١٩٢٥)ەوە تا ساڵی (١٩٥٨) کە شێخ نووری بۆ یەکجاری چاوی لێک ناوە[٨]، ئەکاتە (٣٣) ساڵ. هەروەها لە ساڵی (١٩٢٥)ەوە هەتا ساڵی (١٩٧٣) کە مامۆستا (ڕەمزی) شایەتی بۆ (بێخود) داوە، ئەکاتە (٤٨) ساڵ[٩]!! ئەڵێم: بۆچی کەسێک نەبوو لە پێش ئەم چل و هەشت ساڵەدا، ئەو پێنج سەرچاوەیە ڕاست بکاتەوە و بڵێ: ئەو شیعرەی لەو پێنج سەرچاوەیەدا بەهی شێخ نووری دانراوە، هی ئەو نییە و هی (بێخود)ە؟ بۆچی بێخود خۆی هەتا لە ژیاندا بوو، ئەو (٥) سەرچاوەیەی ڕاست نەکردەوە؟ باشە شێخ نووری بۆچی لەم ڕووەوە ورتەیەکی لێوە نەهات؟ بەلای منەوە ئەم بێ دەنگییەی (شێخ نووری) بەدوو جۆر لێک ئەدرێتەوە: یان ئەوەتا بەدەستی ئەنقەست چاوی لە ڕاستیی ئەم مەسەلەیە پۆشیوە، یا ئەوەتا شیعرەکە هی (شێخ نووری) خۆیەتی، بۆیە لێی بێ دەنگ بووە، جا لەبەرئەوەی ئەمەی دواییان، لەگەڵ ئەو هەموو ڕاستییانەدا ئەگونجێ کە لەمەو دوا باسی ئەکەم، بۆیە من ئەمی دووەمیان بەڕاستتر ئەزانم.

دوای ئەم سەرنجانە، ئەگەڕێمەوە بۆ قسەکانی پێشووی کاک (محەمەد) و ئەپرسم: ئایا ڕاستە لە ساڵی (١٩٧٠)ەوە کەسێک بەئاشکرا شایەتی بۆ (شێخ نووری) نەداوە، لە بەردەمی کاک (ئازاد)دا نەبێ؟ وە ئایا ڕاستە: تاقە دەنگێک بەرزبۆتەوە (دەنگی ڕەمزی بووە) و ئەویش (دڵاوەران)ی بەهی (بێخود) داناوە؟ لە وەرامدا ئەڵێم: نەخێر. چونکە لە ساڵی (١٩٨٠)دا، دەنگێکی زوڵاڵی تر بەئاشکرا شایەتی بۆ (شێخ نووری) داوە و کاکە (حەمە) خۆی ئەو دەنگەی بەخەڵکی گەیاندووە و جێی سەرسوڕمانە کە بەهیچ شێوەیەک، ئەو دەنگەی بیر ناکەوێتەوە!!

بۆ ئەوەی خوێندەواری خۆشەویست لە سەرسامی ڕزگار کەم، ئەڵێم: ئەو دەنگە دەنگی مامۆستا (گۆران)ـە کە ساڵی (١٩٥٣) لە پێشەکی یەکێک لە شیعرەکانیدا، کە ئەوسا وەریگێڕاوە، شایەتی ئەوەی داوە کە شیعری (دڵاوەران) هی شێخ نوورییە و کاک (محەمەد) کە هەر خۆی لە ساڵی (١٩٥٣)ەوە خەریکی کۆکردنەوەی دیوانی (گۆران) بووە و[١٠] هەر خۆشی لە ساڵی (١٩٨٠)دا، دیوانەکەی بەچاپ گەیاندووە، ئەبوو ئەو لە پێش هەموو کەسێکی تردا، ئەمەی لە بیر بوایە...

جا با بزانین ئەو شیعرە کامەیە و پێشەکییەکەی چۆنە؟ شیعرەکە ناوی: (داستانی

هەیاسی و کاکە عابیدین)ـە[١١] کە لە بنەڕەتدا هی (عەشقی)یە و لە کاتی خۆیدا بەپیلانی (ڕەزا شا) کوژراوە. مامۆستا (گۆران) لە پێشەکی ئەو شیعرەدا ئەڵێ: (بەم بۆنەیەوە بێ جێ نییە بیخەینەوە بیر کە ئەو گۆرانییەی بەهاوکاریی خواڵێخۆشبوو مەحموود جەودەت و شاعیری تەڕ و پاراو (م. نووری)ی سلێمانی پێکهات:

«ئەولادی وەتەن، ئێمە کەوا میللەتی کوردین».

ئاوازەکەی لەسەر پارچەیەک لە نۆیەرای (رستاخیز شهر یاران)... دانراوە کە هیی خاوەندی تەرجومە عەشقییە. پارچەکە ئەمەیە:

دیشب کەمرا وضع وطن در نظر آمد
دیدم کەزنی باکفن از قبر در آمد)[١٢]

دیارە پێویست بەوە ناکات عەرزی کاک (محەمەد)ی بکەم کە مامۆستا (گۆران) سەردەمێک یەکێک بووە لە هاوڕێ نزیکەکانی (شێخ نووری) لە نوێکردنەوەی شیعری کوردیدا کە دیارە لە گۆترە قسەیەکی وا ناکا. خۆ ئەگەر (گۆران) ئەم شیعرەی لە هەمان ساڵدا بلاو کردبێتەوە (ساڵی/١٩٥٣)، کە داخەکەم من ئاگام لەوە نییە، مانای ئەوەیە ٣٥ ساڵ لەمەوبەر کە بێخود و شێخ نووری و ڕەمزی هێشتا لە ژیانا بوون، گۆران ئەم شایەتییەی داوە، بێ ئەوەی کەسیان دەنگیان لێوە بێ!! کە ئەمەش بەڵگەنامەیەکی کەیە، ئەچێتە سەر چوار بەڵگەنامەکەی پێشوو...

دوای ئەمە، با ئەمجا چاوێک بەشیعرەکە خۆیدا بگێڕین بۆ ئەوەی بزانین: مۆری کێی پێوەیە: (بێخود) یا (نووری)؟ بەلای منەوە دوو خاسیەت لە شیعری (دلاوەران)دا هەیە کە شیعرەکە لەسەر (شێخ نووری) تاپۆ ئەکەن.

بەڵام با لە پێشەوە وەسفێکی دلاوەران بکەین.

شیعری (دلاوەران)[١٣] لە چەند بەشێک یا چەند کۆپلەیەک پێکهاتووە کە هەریەکێکیان بەدوو (٢) بەیتی عەرووزی دەست پێ ئەکا و[١٤] بە(٣) بەیتی هیجایی دوایی[١٥] دێ کە هەر کۆپلەیەک لەسەر زمانی کەسێک یا چەند کەسێک وتراوە، بەم جۆرە: (منداڵەکان، باوک، دایک، ئافرەت بەمنداڵەوە، کچەکان، چەک بەدەستەکان)[١٦].

لەمەوە خاسییەتی یەکەمی شیعرەکەمان بۆ دەرئەکەوێ کە بریتییە لە تێکەڵکردنی کێشی (عەرووزی) و کێشی (هیجایی) لە سیستەمێکی تایبەتیدا. شیعرە عەرووزییەکانی هەر کۆپلەیەک لەسەر کێشی: (هەزەجی ئەخرەبی مەکفوفی مەقصور) یا

(مەحزوف)ن: (مَفْعولُ مَفاعيلُ مَفاعيلُ مَفاعيلْ) یا (مَفاعي) کە ئەبێ بە(فَعولن). بۆ نموونە با یەک دێرە شیعری کۆپلەی یەکەم بکێشین:

ئەولاد/وەتەن ئێمە/کەوا میللە/ت کوردین

- - ب ب -   - ب ب -   - ب ب - -

مَفْعولُ مَفاعيلُ مَفاعيلُ مَفاعيلْ

هەموو شیعرە عەرووزییەکانی ئەم سرووده، بەم جۆرە ئەکێشرێن. لەمەش گرنگتر ئەوەیە: هەمووشیان بەیەک ئاواز ئەوترێن. هەروەها شیعرە هیجاییەکانیش لە هەر کۆپلەیەکدا (سێ/٣) بەیتن، واتە: (شەش دێرە شیعرن)، کە بەیتی یەکەمیان (٧) هیجایی و بەیتی دووەمیان (٩) هیجایی و بەیتی سێیەمیان (١٢) هیجاییە[١٧]. وە ئەم سیستەمە بەرێکوپێکی لە هەموو کۆپلەکاندا، دووبارە ئەبێتەوە. بۆیە من نەبوونی (٢) بەیتی حەوت هیجایی، لە دوو کۆپلەی دیوانی (بێخود) بەهەڵە[١٨] ئەزانم بەکورتی و بەکوردی تێکەڵکردنی کێشی عەرووزی و کێشی هیجایی لە شیعری (دلاوەران)دا شتێکی تازەیە و لە پێش (شێخ نووری) و هاورێکانیدا هیچ شاعیرێک هەنگاوی وای نەناوە. نەک هەر شیعری (بێخود)، بەڵکو شیعری هەموو شاعیرانی رێبازی کلاسیکی پێش ئەو بخوێنەرەوە، شتێکی وات بەرچاو ناکەوێ.

ئەمەش شتێکی سەیر نییە چونکە هەموو شاعیرانی ئەو رێبازە کێشی هیجاییان بەکێشی سووک و ئاسان داناوە یا وەکو بڵێیت: بەماڵی پیاوی بێ دانیان زانیوە، بۆیە بەکاریان نەهێناوە (دیارە شاعیرانی لەهجەی «گۆران» لەم یاسایە بەدەرن). ئەو شاعیرانە تەنانەت لە کێشی عەرووزیدا بۆ سەلماندنی شاعیرێتی خۆیان، گەراون بەدوای کێشی قورس و گراندا. خۆ تێکەڵکردنی کێشی عەرووزی و کێشی هیجایی، ئەوە بەلایانەوە هەرگیز نەبووە. ئەوان چاویان لەو شاعیرە نەپۆشیوە کە (تەفعیلە)یەکی عەرووزیی بەهەڵە بەکار هێنابێ یا هەڵەیەکی تیا کردبێ، چ جای ئەوەی کێشەکەی تێکەڵی کێشی هیجایی بکا. راستە لەم دواییەدا هەندێ لەو شاعیرانە تاک و تەرا، کێشی دە هیجاییان بەکار هێناوە، چونکە باوی بووە، بەڵام هەرگیز لەگەڵ کێشی عەرووزیدا تێکەڵ نەکراوە. کێشی هیجایی سنووری تایبەتی خۆی بووە و نەیتوانیوە لەو سنوورە تێپەڕ کات. مامۆستا (بێخود) لە هەموو شیعرەکانیدا (موستەزاد)ێک نییە. لەگەڵ ئەوەشدا کە (موستەزاد) دووبارەکردنەوەی هەندێ لە (تەفعیلە)کانی هەمان کێشە. واتا: لە یاسای (تەفعیلە)ی

عەرووزیی لای نەداوە. هەموو لادانەکەی ئەوەیە: کە ژمارەی تەفعیلەکانی، بەقەد ژمارەی تەفعیلەی کێشە بنەڕەتییەکە نییە!! بەڵکو کەمترە، کە ئەوەندە بەس بووە بۆ (بێخود) کە بەکاری نەهێنێ!! ئنجا کەسێک ڕازی نەبووبێ (تەفعیلە)ی عەرووزی لە (موستەزاد)دا، بەکار بهێنێ، چۆن ڕازی ئەبێ بەیتێکی درێژی عەرووزی، شان بەشانی بەیتێکی کورتی هیجایی بەکار بێنێ؟.

بەهەرحاڵ با بێینەوە سەر باسی (دلاوەران).

سیستەمی دلاوەرانی (شێخ نووری) و سیستەمی (ئاواتی دووری)ی (گۆران)، تا ڕادەیەکی زۆر لەیەک ئەچن، چونکە ئەمیش وەکو (دلاوەران) بریتییە لە چەند کۆپلەیەک کە سەرەتای هەریەکێکیان بەبەیتێکی عەرووزی دەست پێ ئەکا کە لەسەر کێشی: (موزاریعی ئەخرەبی مەکفوفی مەحذوف)ە و بە(٦) دێر و شیعری بچووک دوایی دێ کە (چواریان)[١٩] لە ڕووی کێشەوە شتێکی تازەن و هیچ پێوەندییەکیان بەکێشی (موزاریع)ەوە نییە، چونکە لەسەر کێشی هیجایین. هەر یەکێکیش لە دوو دێرەکەی دوایی، لە دوو (تەفعیلە) پێکدێ کە دووبارەکردنەوەی (تەفعیلە)ی یەکەم و چوارەمی کێشە عەرووزییەکەی پێشوون. کەواتە، شیعری (ئاواتی دووری)ش وەک (دلاوەران) لە تێکەڵکردنی کێشی هیجایی و کێشی عەرووزی پێکدێ کە سیستەمێکی نوێیە لە شیعری کوردیدا و یەکێکە لە هەنگاوەکانی دەستەی (شێخ نووری) و (گۆران) و (ڕەشید نەجیب). ئەمەی لەمەوبەر لێی دوام، سیفەتی یەکەمی (دلاوەران) بوو. ئەمجا با بێینە سەر سیفەتی دووەمی.

لە پێش هەموو شتێکا ئەبێ بزانین کە (دلاوەران) سرووده. واتا: لەسەر ئاوازێک دانراوە، ئاوازی سروودیش، یا ئەوەتا ئاواز داهێنەرێک (ملحّن) شیعری شاعیرێک ئەخوێنێتەوە و کاری تێ ئەکا و لە پاشا ئاوازێکی بۆ دائەنێ، یا ئەوەتا بەپێچەوانەوە: شاعیرێک، ئاوازی مۆسیقایەک یا ئاوازی سروودێکی بەدڵ ئەبێ و ئەمجا دێت شیعرێک یا چەند وشەیەکی ڕێکوپێک لەسەر ئەو ئاوازە دائەنێ، پاش ئەوەی ئاوازەکە بەچاکی فێر ئەبێ پێویست بەوە ناکات بەبەڵگە بیسەلمێنم کە سروودی (دلاوەران)، بەپێی ڕێگەی دووەم دانراوە، چونکە وەکو (گۆران) لە پێشتردا دەریخست، ئاوازەکەی لەسەر پارچەیەک لە ئۆپەرای (رستاخیزی شهر یاران...)ی (عەشقی) دانراوە[٢١]. واتە ئەوەی ئەم سرووده‌ی داناوە لە پێشا ئەو ئاوازەی بیستووە و کاری تێ کردووە و فێری بووە ئەمجا هاتووە شیعرەکەی لەسەر ئەو ئاوازە داناوە. کەسێک شارەزای ئاوازەکەش نەبێ، بەدرێژی و

کورتی شیعرەکاندا ئەزانێ کە ئاوازەکە گەلێک گۆڕانی تیادایە، چ جای ئەوەی کە من هەر لە منداڵیمەوە، کۆپلەی یەکەمی (دلاوەران)م چەند جار بەئاوازەوە وتووە و ئێستاش هەموویم لە بیر ماوە و ئەزانم کە شیعرە عەرووزییەکانی ئەم سروودە، هەموویان لەسەر یەک ئاوازن، بەڵام دێرە هیجاییەکان گەلێک گۆڕانیان تیایە کە ئەبێ لە ئۆپەرێتەکەی (عەشقی)شدا، هەر وابێ. بۆیە ئەو قسەیەی خوالێخۆشبوو (مستەفا سائیب) کە ئەڵێ: گوایا ئەو و کاک (ئەنوەر سائیب) ئەم شیعرەیان خستۆتە سەر ئاوازی: (دیشب کە مرا وضع وطن.)[٢٢]، ئەڵێم زۆرم پێ ناخۆشە کە تەنیا بەشی دوایی ئەم قسەیە بەتەواو ئەزانم کە دەڵێ: شیعرەکە لەسەر ئاوازی (دیشب کە مرا...)یە. چونکە ئەگەر شیعرەکە لە بنەڕەتدا لەسەر ئاوازی (دیشب کە مرا...) نەبوایە، نە ئەو نە کەسی تر نەیئەتوانی بیخاتە سەر ئەو ئاوازە. نزیکترین بەڵگەش بۆ ئەم قسەیە دوو شتە، یەکەمیان ئەوەیە کە ئەو دێرە شیعرە فارسییەش لەسەر هەمان کێشی (هەزەجی ئەخرەبی مەکفوفی مەحذوف)ە، وەکو بەیتە عەرووزییەکانی (دلاوەران) بۆ ڕاستی قسەکەمان، با دێری یەکەمی بکێشین:

دیشبِ ک/مرا وضع/وطن درنَ زەرامەد

- - ب/ب - - ب/ب - - ب/ب - - ب

مفعول، مفاعیل، مفاعیل، فعولن

بەڵگەی دووەمیش ئەوەیە کە ئەم بەیتەش لەسەر هەمان ئاوازی شیعرە عەرووزییەکانی (دلاوەران) ئەگوترێ... گومانیشی تیا نییە ئەگەر دەقی شیعرەکەی (عەشقی)مان لە بەردەستا بوایە، ئەماندی کە دێرەکانی تریشی کوتومت وەک هی دلاوەرانن لە ڕووی کێشەوە. بۆچی؟ چونکە دانەری شیعرەکە ئاوازی ئەم سروودەی لە ئاوازی ئەو ئۆپەرێتەوە وەرگرتووە.

ئەمەی کە لێرەدا وتوومە تەنیا لەوەوە نەهاتووە کە ئاوازی سروودەکە ئەزانم، بەڵکو لەوەشەوە هاتووە کە کاتی خۆی چەند جارێک، شیعرم لەسەر ئاوازی هەندێک سروود و گۆرانی داناوە، بۆیە ئەتوانم بڵێم: تا ڕادەیەک ئەم ڕێیەم تاقی کردۆتەوە و ئەزانم چ زەحمەتێکی تیایە پیاو لەسەر ئاوازی سروودێک یا گۆرانییەکی تر، شیعر دانێ! چونکە لەوانەیە بڕگەیەکی سروودەکە سەدەها جار بڵێت و بڵێتەوە، هەتا چەند شیعرێکی بەدڵی خۆیی بۆ بدۆزێتەوە!! جگە لەم زەحمەتانە، ئەوی سروودی وا دائەنێ، ئەبێ دوو سیفەتی تیا بێ. یەکەمیان: ئەبێ گوێی مۆسیقای زۆر سووک بێ، بۆ ئەوەی کەمترین (گۆڕران) لە

ئاوازەکەدا هەست پێ بکا، ئاشکراشە شارەزایی (شێخ نووری)، لە زۆربەی مەقامە فارسی و کوردییەکاندا، شایەتی بۆ ئەدەن کە گوێی مۆسیقای زۆر سووک بووە. هەرچەندە گومان لەوەدا نییە کە مامۆستا (بێخود) گوێیەکی سووکی بووە لە جیاکردنەوەی کێشە عەرووزییەکاندا، بەڵام من لێرەدا، باسی گوێی (ئاوازناسین) ئەکەم کە یەکێک بووە لە سیفاتەکانی (شێخ نووری).

سیفەتی دووەمیش ئەوەیە: ئەبێ ئەو کەسە تا ڕادەیەک زاڵ بێ بەسەر قوڕگ و دەنگی خۆیدا، هیچ نەبێ ئەوەندەی ئەوەی کە بتوانێ، هەموو (گۆڕران) و (بەرز و نزمی)یەکی ئاوازەکە بەبێ هەڵە بڵێتەوە... بۆ ئەوەی ئەوانەی سروودەکەی لێوە فێر ئەبن، بتوانن هەمان (گۆڕران) و (بەرزی و نزمی) بەڕاستی دەربێنن و بیڵێنەوە.

ئاشکراشە ئەم دوو سیفەتە بەزیادەوە لە (شێخ نووری)دا هەبووە و لە مامۆستا (بێخود)دا کەمتر. بۆیە بەدڵنیاییەوە ئەڵێم: ئەم سروودی (دلاوەران)ە هی (شێخ نووری)یە. پێش ئەوەی دوایی بەم بەشە بێنم ئەبێ بڵێم: هەموو سروودێک لە ڕووی (قورسی و سووکی) و (گرانی و ئاسانی)یەوە، لە یەک پایەدا نین. بۆیە مەرج نییە ئەو وەسفەی کە کردم هەموو سروودێک بگرێتەوە. بەڵکو تەنیا ئەو سروودانەم مەبەست بوو کە تا ڕادەیەک لە ڕووی ئاوازەوە (قورس) و (گران)ن، کە (دلاوەران)یش یەکێکە لەوانە.

دوای ئەم لێکۆڵینەوەیە، ئەتوانم توخنی نامەکەی مامۆستا (ڕەمزی) نەکەوم و بڵێم: مادام ئەم شایەتییە لەگەڵ ئەو ئامانجانەدا ناگونجێ کە دوای لێکۆڵینەوەی پێشوو پێی گەیشتین، کەواتە ئەبێ بخرێتە پشتگوێ. بەڵام من بەم شێوازە دڵم ئاو ناخواتەوە. بۆیە وای بەڕاست ئەزانم چاوپێکیش بەنامەکەی مامۆستا (ڕەمزی)دا بگێڕم.

مامۆستای خوالێخۆشبوو لە کاتی خۆیدا، نامەیەکی بۆ کاک (محەمەد) نووسیوە، دەربارەی شیعری (دلاوەران). لەو نامەیەدا یەکەن دەر دوو ئەم ڕستەیە سەرنجمان ڕائەکێشێ کە دەڵێ زۆر چاک ئەزانم ئەو غەزەلی (دلاوەران)ە هی «مەلا مەحموودی خالەمە کە لە وەختی خۆیدا دای بەشێخ نووریی شێخ ساڵح کە بڵاوی بکاتەوە»[٢٣].

تکا لە خوێندەواران ئەکەم، پێم بڵێن ئەو ڕستەیەی، کە خستوومەتە ناو دوو کەوانەوە، چی ئەگەیەنێ؟ ئایا بێخود بەپێی ئەم ڕستەیە، ڕێگەی ئەوەی داوە بە(شێخ نووری) کە ئەو شیعرە بەناوی خۆیەوە بڵاو بکاتەوە؟ بێگومان نەء. چونکە ڕستەی: (لە وەختی خۆیدا دای بەشێخ نووری کە بڵاوی بکاتەوە)، تەنیا یەک شت ئەگەیەنێ، ئەویش ئەوەیە:

کە (شێخ نووری) لەو کاتەدا نزیک بووە لە ڕۆژنامەکانەوە، لەبەرئەوە (بێخود) ئەو شیعرەی داوەتێ، کە لە یەکێک لەو ڕۆژنامانەدا، بڵاوی بکاتەوە... واتە: بەناوی ئەوەوە نەک بەناوی خۆیەوە. ئەمەش وەکو ئەوە وایە بڵێیت: فلانە کەس وتارێکی دا بەکاکە (حەمە) کە بڵاوی بکاتەوە. ئایا کاکە (حەمە) بەناوی خۆیەوە وتارەکە بڵاو ئەکاتەوە، یا بەناوی فلانەوە؟

جا دیارە ئەم قسەیەش، پێچەوانەی ئەو بڕوایەیە کە دەڵێ: بێخود خۆی ڕێگەی داوە، شیعری (دلاوەران) بەناوی (نووری)یەوە بڵاو بکرێتەوە!!. ئایا جێی سەرسووڕمان نییە، مامۆستا (ڕەمزی) کە یەکێک بووە لەوانەی، بڕوای وابووە (بێخود) بەڕەزامەندی خۆی شیعری (دلاوەران)ی بەناوی (شێخ نووری)یەوە بڵاو کردۆتەوە، ئێستا وای پیشان بدا کە (شێخ نووری) بەپێچەوانەی خواستی (بێخود)، شیعرەکەی بەناوی خۆیەوە بڵاو کردۆتەوە؟ بەڵام کەسێک قسەکانی کاک (ئەوڕەحمانی موفتی) خوێندبێتەوە سەری لەم ڕستەیەی مامۆستا (ڕەمزی) سووڕ نامێنێ، چونکە ئەم ڕستەیەش کوتومت لە ڕستەیەکی کاک (ئەوڕەحمان) ئەچێ کە لەسەر زمانی (مستەفا سائیب) کردبووی!!.

جا بۆ ئەوەی خوێندەوارانیش ئاگاداری باسەکە بن، بەپێویستی ئەزانم بەکورتی بۆیانی بگێڕمەوە.

ئەوانەی ئاگاداری ئەم باسەن، ڕەنگە ئەوە بزانن کە کاک (محەمەد) لەسەر زمانی (ئەوڕەحمانی موفتی) باسی ئەو نامەیەی کردووە کە بەڕێز (مستەفا سائیب)، بۆ کاک (ئەوڕەحمان)ی ناردووە و لەو نامەیەدا کاک (مستەفا) وتوویەتی، کە قوتابی بووە لە (کەرکووک) داوای لە مامۆستا (بێخود) کردووە - کە ئەویش لەو کاتەدا لە کەرکووک بووە - سروودێکی بۆ دانێ، ئەویش (واتە بێخود) سروودی (دلاوەران)ی بۆ داناوە و... هتد. لە پاشا بێخود «نوسخەیەکی (ئەو سروودەی) ناردووە بۆ سلێمانی بۆ شێخ نووری کە لە ڕۆژنامەکانا بڵاوی بکاتەوە»[٢٤]. ئنجا تکا لە خوێندەواران ئەکەم بەوردی سەیرێکی ئەو ڕستەیەی دوایی بکەن کە ئەڵێ: (بێخودیش نوسخەیەکی نارد بۆ سلێمانی بۆ شێخ نووری کە لە ڕۆژنامەکانا بڵاوی بکاتەوە». ئایا ئەم ڕستەیەش کوتومت لە ڕستەکەی مامۆستا (ڕەمزی) ناچێ چ لە ڕووی دارشتن و چ لە ڕووی ماناوە؟

فەرموون ئەمجارە هەردوو ڕستەکە، یەک لە دوای یەک، بخوێننەوە:

مامۆستا (ڕەمزی) ئەڵێ: «دلاوەران هی بێخودە کە لە وەختی خۆیدا دای بەشێخ نووری کە بڵاوی بکاتەوە».

کاک (ئەوڕەحمان)یش لەسەر زمانی کاک (مستەفا سائیب) ئەڵێ «بێخودیش نوسخەیەکی نارد بۆ سلێمانی بۆ شێخ نووری کە لە ڕۆژنامەکانا بڵاوی بکاتەوە».

تکام وایە پێم بڵێن: چ جیاوازییەکی بنەڕەتی لە نێوان ئەم دوو ڕستەیەدا هەیە؟ بێگومان، ئەگەر جیاوازییەک ببێ، ئەوەیە کە کاک (ئەوڕەحمان) لەسەر زمانی کاک (مستەفا) ئەڵێ: بێخود ئەو شیعرەی لە کەرکووکەوە ناردووە بۆ شێخ نووری!! کە ئەمەش جیاوازییەکی سەرەکی نییە. جگە لەوەی کە (مستەفا سائیب) خۆی، دوای ئەو قسانەی (ئەوڕەحمانی موفتی) بە سێ ساڵ، لە چاوپێکەوتنێکدا بەکاکە (حەمە)ی وتووە: کە (بێخود) شیعرێکی کەی داوەتێ[٢٥] نەک (دلاوەران)!! لەم چاوپێکەوتنەی دوایی (مستەفا سائیب)دا بۆمان دەرئەکەوێ، ئەگەر بێخود شیعرێکی لە کەرکووکەوە ناردبێ بۆ شێخ نووری، شیعری (دلاوەران) نەبووە. بەڵام کاک (ئەوڕەحمان) وای پیشان داوە کە ئەو شیعرە (دلاوەران) بووە!

بەکورتی هەرکەسێک چاوپێکەوتنەکەی کاکە (حەمە) و کاک (مستەفا)ی دیبێ، بۆی دەرئەکەوێ، ئەو قسانەی کاک (ئەوڕەحمان) بەزمانی (مستەفا سائیب)ەوە کردوویەتی، هیچیان قسەی ئەو نین، بەڵکو قسەی کاک (ئەوڕەحمان)ن!! کە ویستوویەتی شیعرەکە بکا بەهی (بێخود)ی مامی!! جا کە کاک (محەمەد) دەستی خستۆتە ڕوو، زانیویەتی قسەکەی بۆ نەچۆتە سەر و کاک (مستەفا) ئەو ئاواتەی نەهێناوەتە دی، ئنجا ڕووی کردۆتە مامۆستا (ڕەمزی)ی پوورزای خۆی کە پیاوێکی دڵناسکی خزم دۆستی بێ پێچ و پەنا بووە. بۆیە بەئاسانی توانیویێتی کاری تێ بکا و تای لاسەنگی شایەتییەکەی خۆیی پێ ڕاست بکاتەوە.

بەهەرحاڵ من بڕوام وایە، ئەگەر کاک (ئەوڕەحمان)، بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ، دەستی لە نامەکەی مامۆستا (ڕەمزی)دا نەبێ، بێگومان بەشێوەیەکی لابەلا ئاگای لێیەتی. لەیەکچوونی دوو ڕستەکەی پێشووش، گەورەترین بەڵگەیە. بۆیە لەوە زیاتر لە نامەکەی مامۆستا (ڕەمزی) نادوێم. بەڵام ئەگەر لێرەدا بیبڕمەوە، وا هەست ئەکەم کە زوڵمم لە مامۆستا (ڕەمزی) کردووە، چونکە من بڕوام وایە، پیاوێکی وەکو (ڕەمزی)، ئەگەر لە کاتی خۆیدا، شتێکی شک نەبردایە... هەزار (ئەوڕەحمان) و خزمایەتی، وایان لێ نەئەکرد، شایەتییەکی وا بدا. یان بەواتایەکی کە: ئەبێ لە کاتی خۆیدا مامۆستا (ڕەمزی) ئاگای لەوە بووبێ کە (بێخود) شیعرێک یا دوو شیعری بەناوی (نووری)یەوە بڵاو کردبێتەوە، ئەگینا (ڕەمزی) لە خۆیەوە شایەتییەکی وای نەئەدا... بۆیە بەدووری نازانم،

کاتێ کە (شێخ نووری) منداڵ بووە، مامۆستا (بێخود) شیعرێک یا دوو شیعری بەناوی ئەوەوە دانابێ و (ڕەمزی)ش، کە لە (نووری) خوارتر بووە، ئاگای لەوە بووبێ(*). کاکە (حەمە)ش لە وتارەکەی (بەیان)دا، شتێکی وای بەبیرا(٢٦) هاتووە.

جا ئەگەر ئەم بۆچوونە بەڕاست بزانین و ئاگاشمان لەوە بێ کە (شێخ نووری) لە ساڵی (١٨٩٦)دا هاتۆتە دنیاوە(٢٧)، ئەبێ هیچ نەبێ (بێخود) لە نێوان ساڵانی (١٩٠٧ - ١٩١٢)دا - یا کەمێک ژوورتر - ئەو یەک دوو شیعرەی بەناوی (نووری)یەوە دانابێ. واتە کە (نووری) عومری لە نێوان (١١ - ١٦) ساڵان دابووە و (ڕەمزی)ش لە عومری (٩ - ١٤) ساڵاندا بووە(٢٨). بەڵام (ڕەمزی) لەباتی ئەوەی لە کاتی خۆیدا، ئەم ڕاستییە دەرخا، یا هیچ نەبێ لە سەرەتای لاوییدا بیری بکەوێتەوە، کەچی لە ساڵی (١٩٧٣)دا ئەو شایەتییەی بۆ کاک (محەمەد) نووسیوە، لە نامەکەیدا. واتە دوای نزیکەی (٦١) ساڵ!! بۆیە بەدووری نازانم، لەم ماوە دوورودرێژەدا، خەیاڵی مامۆستا (ڕەمزی)، ئەو یەک دوو شیعرەی، لەگەڵ شیعری (دلاوەران)دا تێکەڵ کردبێ. ئەمەش شتێکی سەیر نییە، چونکە ئەوانەی لە ژیانی، یا مێژووی ژیانی پیاوانی (حدیث) و (ئەدەب) و (مێژوو) ئەکۆڵنەوە، گەلێک جار پیاوانی وایان بەرچاو کەوتووە، کە دوو ڕووداو، دوو قسەی لەیەکچوویان تێکەڵ کردووە، یا (خەیاڵیان بۆ شتێک چووە و مەبەستیان شتێکی کە بووە) کە لە عەرەبیدا پێی ئەڵێن: (وەهم)(٢٩).

ئەمەیە بەکورتی سەرنجی من دەربارەی شایەتییەکەی مامۆستا (ڕەمزی). گەلێکیشم پێ ناخۆشە کە ناچار بووم دژی مامۆستایەکی وا بوەستم. چونکە جگە لە خۆیشایەتی و تێکەڵاوی نێوانمان، جێگایەکی دیاری هەبووە و هەیە، لە دڵ و دەروونما، خوا لێی خۆشبێ بەبۆنەی شایەتییەکەی مامۆستا (ڕەمزی)یەوە، ئەمەوێ لە کۆتایی ئەم وتارەدا کەمێک لە شایەتییەکەی کاکە (حەمە) بدوێم. کاکە (حەمە) خۆی لە من چاتری ئەزانێ کە لە شایەتیدا تەنیا ڕاستگۆیی هەموو شتێک نییە، (وەکو لە شایەتییەکەی مامۆستا ڕەمزیدا دەرکەوت) بەڵکو گەلێک پشت و مەرجی کەی ئەوێ، کە گرنگترینی ئەو مەرجانە ئەوەیە: ئەبێ ئەو شایەتە، لە پاڵ ڕاستگۆییدا، بیرەوەرییەکی تیژی هەبێ. ئەگینا لەوانەیە

(*) من کە لاپەڕەکانی ڕۆژنامە و گۆڤارێک ئەماوە هەڵم ئەدابێتەوە و بەپێی ئەو بیبلیۆگرافیایەش کە لە کۆتایی ئەم کتێبەدا سازم کردووە، شێخ نووری لە ساڵی (١٩٢٠) بەدواوە شیعری بلاو کراوەتەوە، پێش ئەو مێژووە شیعری لە هیچ شوێنێکی تردا بلاو نەبووەتەوە. ئەو کاتەش تەمەنی (٢٤) ساڵ بووە. (ئا. ع).

نزیکترین و گرنگترین ڕووداوی لە بیر نەبێ. بۆ ئەمەش کاکە (حەمە) خۆی ئەکەم بەغوونە، من هەرگیز لەو باوەڕەدا نیم کە کاکە (حەمە) بەدەستی ئەنقەست، شایەتییەکەی (گۆران)ی کردبێ بەژێر لێوەوە، بەڵکو بڕوام وایە ئەگەر قسەکانی ئەوی لە بیر بوایە، ئەو وتارەی بەجۆرێکی کە ئەنووسی. لەگەڵ ئەوەشدا کە دڵنیام لەوەی کاکە (حەمە) هەر لە ساڵی (١٩٥٣)ەوە خەریکی کۆکردنەوەی دیوانی (گۆران) بووە و هەر خۆشی لە ساڵی (١٩٨٠)دا بەچاپی گەیاندووە. دڵنیاشم کە چەند جارێک بەقەڵەمی خۆی پێشەکی ئەو هەڵبەستەی نووسیوە کە باسی شیعری (دلاوەران)ی تیا کراوە و لەوانەشە چەند جارێک هەڵە و چەوتی ڕەشنووسەکەی دەسکاری کردبێ بۆ چاپ، کەچی لە گەرمەی مشتومڕی دۆزینەوەی خاوەنی (دلاوەران)دا، ئەو شایەتییەی (گۆران)ی بیر نەکەوتۆتەوە!! ئەم ڕووداوە چاکترین بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە تەنیا ڕاستگۆیی هەموو شتێک نییە، بەڵکو ئەبێ بیرەوەرییەکی تیژی لە پاڵدا بێ. جا لە کاتێکدا کاک (محەممەد) قسەیەکی نووسراوی وا نزیکی لە بیر چووبێ کە چەند جارێک بەقەڵەمی خۆی نووسیوێتی! بەچیا بزانین مامۆستا (ڕەمزی)، قسەیەکی لە پاش (٤٨) ساڵ - بەپێی بۆچوونی دوایی دوای (٦٠) ساڵ - لە بیر ماوە کە هەر قسەیەکی ڕووت بووە و هیچی ترا!.

هەر چۆنێ بێ، ئەگەر لای کاکە (حەمە) شتێکی سەیر بێ یەکێکی وەکو من پاش (١٥ - ٢٠) ساڵ، شایەتی بۆ (شێخ نووری) بدەم کە لە پێش مندا هی وەکو: (گۆران) و (کەریم بەگی سەعید بەگ) و (کوردی و مەریوانی) و کێ و کێ... شایەتییان بۆ داوە، لەمە سەیرتر ئەوەیە مامۆستا (ڕەمزی) دوای (٤٨ - ٥٠) ساڵ، شایەتی بۆ (بێخود) بدا و ئەو هەموو شایەتانە بێن و بڕۆن، ئەو قسە لە قسەیاندا نەکا!!

زۆرم حەز ئەکرد کەمێکیش لە کتێبەکەی (شێخ نووری)ی کاک (ئازاد) بدوێم و سەرێکیش لە لاواندنەوەکەی (کەریم بەگی حاجی عەبدوڵڵای کەرکووکلی زادە) خوار بکەمەوە، بەڵام داخەکەم پێم نەکرا، بۆیە داوای لێبووردن ئەکەم و سڵاو و ڕێزم بۆ کاکە (حەمە) و کاک (ئازاد) دووبارە ئەکەمەوە.

**پەراوێزەکان:**

١) بڕوانە: (دیوانی شێخ نووری شێخ ساڵح - بەکۆششی، ئازاد عەبدولواحید - بەرگی یەکەم - بەشی یەکەم - چاپخانەی دار الجاحظ - بغداد - ١٤٠٥هـ - ١٩٨٥م - ل/٧٣)، هەروەها: (گۆڤاری بەیان - ژمارە/١٣٤ - ئابی/١٩٨٧ - وتاری: وەڵامێک ڕێگەی نیازی پاکی گرتووە - ئازاد عەبدولواحید - ل/٤٠).

٢) گـۆڤـاری: (بەیان - ژمـارە - ١٢٢ - ئابی/١٩٨٦ - وتاری/دیسـانەوە لە پێناوی دۆزینەوەی خاوەنی ڕاستەقینەی پارچە شیعری (دلاوەران)دا - ل/٧٨ - ٨٧).
٣) (دیوانی شێخ نووری - ل/٥٩).
٤) گۆڤاری (بەیان - ژمارە/١٣٤ - هەمان وتاری کاک ئازاد - ل/٣٩).
٥) (هـ - س) هەمان (ل).
٦) گۆڤاری (برایەتی - ژمارە - ١ - ساڵی - ١ - خولی دووەم/ ١٩٧٠ - ل/١٨).
٧) (پێشەکی: دیوانی بێخود - بەکۆششی محەمەدی مەلا کەریم - چاپی/سلمان الأعظمی - ١٩٧٠ - ل/و).
٨) (دیوانی/شێخ نووری هەمان سەرچاوەی پێشووتر - ل/١٢٣).
٩) (بیـری نوێ - ژمـارە/٦٦ سـاڵی/١٩٧٣ - وتـاری/دیسـان لە بارەی شـیـعـری (دلاوەران)ەوە - محەمەدی مەلا کەریم) هەروا: (دیوانی/شێخ نووری - ل/٧٣).
١٠) (دیوانی گۆران - پێشەکی - بەرگی یەکەم - چاپخانەی کۆڕی زانیاری عیراق - بەغدا - ١٩٨٠ - ل/هـ - بەکۆششی/محەمەدی مەلا کەریم).
١١) (هـ - س - ل/٤٧٤ - ٤٧٨).
١٢) (هـ - س - ل/٤٧٤).
١٣) (دیوانی بێخود - ل/١٣٦ - ١٤٠).
١٤) لە (دیوانی بێـخودا کۆپلەی/باوک - لاپەڕە/١٣٧ - یەکەم جار بەبەیتێکی عـەرووزی دەست پێ ئەکـا و لە پاش (٣) بەیتـە هیـجـاییـیـەکـان دووبارە دوو بەیتی عـەرووزی و سـیـانی هیـجـایی، بێ پشوودان ئەڵێتەوە جا لەم حاڵەتەدا ئەتوانین وەکو دوو کۆپلە حسابی لەگەڵ بکەین.
١٥) لە (دیوانی بێـخـودا - ل/١٣٩ - کـۆپلەی/ئافـرەت بەمناڵەوە). بەیتی یەکـەمی شـیـعـرە هیجاییەکان کە ئەبێ حەوت هیجایی بێ، نییە. هەروا لە کۆپلەی (کچانیش)دا (هەمان لاپەڕە) ئەو بەیتە حەوت هیجاییە، دیار نییە!.
١٦) لە کـۆپلەی/چەک بەدەسـتـەکـان-دا - ل/١٤٠ - دێری/٩ - ١٠ واتا ئێـمـە خـولـقـاوین بۆ خزمەتکردن - یەک دێرە شیعرە، بەڵام کراوە بەدوو دێر - کە هەڵەیە، هەروەها (دێری/١١ - ١٢)ش هەردووکیـان یەک دێرە شیعری دوانزە هیجایین - بەڵام لە دیوانەکەدا کراون بەدوو دێر هەڵەیە. ڕەنگە ئەو لەنگییەی لە (پەراوێزی-٧)ی هەمان لاپەڕەدا باسی لێ کراوە، هی ئەوە بێ.
١٧) دێرە هیـجـاییـیـەکـان بەتایبـەتی (کـۆپلەی مناڵان - ل/١٣٦) هەندێ هەڵەیان تیـایە. بۆ نموونە (ڕیشەی عەدو) هەڵەیە و ڕاستییەکەی (ڕیشەیی عەدوو)ـە. هەروا: (حەق بەدەس خۆمان) هەڵەیە و (حەق بەدەستی خۆمان) ڕاسترە... هتد.
١٨) بڕوانە: (پەراوێزی - ١٥)ی ئەم وتارە.
١٩) بڕوانە: (گۆڤاری/کاروان - ژمارە - ٥٢ - ساڵی/١٩٨٧ - وتاری: بنەڕەتی کێشێکی عەرووزی و... نووسینی خاوەنی ئەم وتارە/ل/١٣).

لە وتاری ناوبراودا وشەی (چواریان) نییە. لەوە ئەچێ لە کاتی گواستنەوەی وتارەکەدا، ئەو وشەیەم لە بیر چووبێ. داوای لێبووردن ئەکەم.

٢٠) بڕوانە: (ڕۆشنبیری نوێ - ژ - ١١٣ - ساڵی/١٩٨٧ - وتارە نایابەکەی مامۆستا (بیمار): (عەرووز لە هەڵبەستی کوردیدا - ل/١٥٨ ستوونی/٢).

٢١) بڕوانە: (پەراوێزی - ١٢)ی ئەم وتارە.

٢٢) (دیوانی/شێخ نووری - ل/٧٠) کە ئەویش لە (بیری نوێ - ژمارە/٦٦)ی ساڵی - ١٩٧٣ - ەوە، وەرگرتووە.

٢٣) گۆڤاری (بەیان - ژ - ٢٢ - ل/٨٢ ستوونی/٢).

٢٤) (دیوانی بێخود - ل/١٣٦ - پەراوێزی/١).

٢٥) بڕوانە: (پەراوێزی - ٢٣)ی ئەم وتارە - هەمان شوێن.

٢٦) (بەیانی - ژمارە - ١٢٢ - ل/٨٤ ستوونی/١).

٢٧) (دیوانی شێخ نووری - ل/٩٥ - پەراوێزی - ٢).

٢٨) ڕەمزی لە ساڵی (١٩٠٢)دا لە دایک بووە بەپێی قسەی (ڕەفیق حیلمی) بڕوانە: (شیعر و ئەدەبیاتی کوردی - بەرگی دووەم) بەڵام مامۆستا (فەوزی)ی کوڕی ئەڵێ بەپێی شیعرێکی فارسی کە باپیری لە بەرگی کتێبێکدا نووسیوێتی ئەبێ لە ساڵی (١٨٩٨)دا هاتبێتە دنیاوە.

٢٩) بڕوانە: (المنجد - الطبعة السابعة عشرة/١٩٦٦ - بیروت - ص/٩٢١).

(*) لە ڕۆژنامەی هاوکاری، ژمارە ٩٩٣ لە ١٩٨٨/٧/٢١ وەرگیراوە.

# مێژووی گۆرانی ئینتیباه

نووسینی: شاکر فەتاح – ١٩٨٧

## پێشەکی

لە ناوەند ساڵەکانی (١٩٢٠) و (١٩٣٠)دا ڕاپەڕینێکی گەرموگوڕ و پاک و پیرۆز، لە مەیدانی ڕۆشنبیری و هونەر و هۆنراوە و پەخشاندا، لە کۆڕی نیشتمانپەروەریی و کوردایەتی و مرۆڤ دۆستیدا لە سلێمانیدا ڕووی دا. کۆمەڵەیەکی گەورە هۆنراوەی نیشتمانی و ڕۆشنبیری لەلایەن بوێژ و وێژەوانەکانمانەوە دانرا کە زۆربەیان کران بەگۆرانی و، لە خوێندنگاکانی کوردستانی عێراقدا، بەئاوازێکی خۆش و بەجۆشەوە، لە لایەن شاگردەکانەوە دەخوێندرانەوە. مامۆستایان (زێوەر و ڕەفیق حیلمی و فائق بێکەس و عەبدلواحید نووری و شێخ نووری شێخ سالح) لەو جۆرە بوێژ و وێژەوانانە بوون. ئەگەر بەپێی ژمارە بێ، (زێوەر) لە هەموویان زۆرتری دانابوو. بەڵام ئەگەر بەپێی نرخ و بایەخ و گرنگیی و کاریگەریی بێ، گۆرانییەکەی (شێخ نووری شێخ سالح)، کە ناوی (إنتباه) بوو لە هەموو ئەو گۆرانییانە پایەی بڵندتر بوو. ئەمەیش سەبارەت بەوە بوو کە ئەو گۆرانییە هەر هەستی نەتەوایەتیی (شێخ نووری)ی پێشان نەدابوو، هەست و تەزوو و تاسە و بیروباوەڕی دڵ و دەروون و هۆشی کوردەواریی ئەو سەردەمەیشی دەربڕیبوو، کە دامابوون لەسەر (دادپەروەری) و (بەزەیی هاتنەوە)ی کاربەدەستانی جیهان و ئەوانەی پەیوەندییان بەکوردستانەوە هەبوو. هەروەها کە دژی ستەم و زۆرداریی ناوخۆ و ئەو فەرمانڕەواییانە وەستابوون، کە بووبوونە هۆی سەرگەردانی و پاشکەوتوویی کوردەواریی و کاوولبوونی کوردستان.

لە ڕاستیدا گۆرانی (إنتباه) هی (م. نووری) نەبوو. هی بوێژێکی ئافرەتی فەرەنسەیی بوو، کە ناوی (ماری ژۆزەف شەنی) بوو. ئەم ژنە بەبۆنەی یەکێک لە شۆڕشە گەورەکانی فەرەنسەوە ئەو کۆمەڵە هۆنراوەیەی دانابوو. کە هۆنراوەکە کرا بەگۆرانی و لە شێوەی (لاساییکردنەوەیەکی بەگۆرانی)[1]دا، پێشانی نەتەوەی فەرەنسە درا، لە هەموو لایەکەوە

(١) واتە: ئۆپەرێت یان ئۆپێرا.

خۆشەویستیی و ڕێزیان بەرامبەر گۆرانییەکە و خاوەنەکەی پێشان دا کە بەهۆی ئەوەوە ناوبانگێکی گەورەیشیان دەستکەوت.

جا لێرەدا هونەر بۆ (مەحموود جەودەت)ە، کە لە ڕووی نیشتمانپەروەریی و ئازایەتی و مەردایەتییەکەیەوە، ویژەوانێتییەکەی خۆی خستە کار و ئەم گۆرانییەی لە ساڵی ١٩٢٥دا لە فەرەنسزییەوە گۆڕییە سەر زمانی کوردی. لە بوێژەکانیشمانی داواکرد، کە یەکێکیان ئەم پەخشانەی ئەو بخاتە شێوەی هۆنراوەوە و ئاوازێکیشی بۆ بدۆزێتەوە، تا لەلایەن شاگردانی خوێندنگاکانی کوردستانەوە، بەگۆرانییەوە بخوێندرێتەوە.

لێرەیشدا هونەری (شێخ نووری) دەردەکەوێت، کە لە پێش هەموو بوێژێکدا، ئەو پەخشانەی (مەحموود جەودەت)ی بەهۆنراوە خستە شێوەیەکی جوان و ڕەنگین و ئاهەنگ دارەوە و، ئاوازێکی جوانیشی بۆ دۆزییەوە و وەک گۆرانییەکی نیشتمانیی زۆر خۆش و بەجۆش و گەورە و گرنگیش لە ناو خوێندنگاکانی کوردستاندا بلاوی کردەوە(*).

---

(*) خوالێخۆشبوو (مەحموود جەودەت) ئەو ئۆپەرێتەی لە فەرەنسییەوە بەناوی (ئینتیباه)ەوە بەشێوەی (پەخشان) کردۆتە کوردی و لە (ژیانەوە)ی ژمارە (٢١)ی ١٩ مارت ١٩٢٥دا لە لاپەڕە چواردا بەشێکی بلاوکردووەتەوە، بەشی دووەمی لە ژمارە (٢٢)ی ٢٦ مارت ١٩٢٥دا بلاوبووەتەوە.

جا لەبەر گرنگی باسەکە و ئەو لک و پۆپانەی لە دواییدا لێی دەبنەوە، وای بەباش دەزانم کە دەقی وەرگێرانەکە (بەپەخشان) وەک ئەوەی لە ژیانەوە دایە بخەینە بەرچاوی خوێنەر و بەشێوەی ڕێنووسی ئێستا پێشکەشی کەین:

**ئینتیباه**

دوێنێ شەو لە سکونەتی عەمیقەی نیوەشەوا لەناو ژوورەکەما کە بەرۆشنایی مانگ نیوە ڕووناک ببووەوە، بەنیەتی نووستن ڕاکشابووم و چونکە زۆر هیلاک و ماندووبووم ئەمویست زوو خەوم لێ بکەوێ، فەقەت هەرچەندم ئەکرد و ئەکۆشام بەهیچ کلۆجێک خەو نەئەکەوتە چاوم. چونکە خەیاڵ و وەزعیەتی وەتەن و ئارەزووی تەنسیسی ئەمن و ئاسایش تیایدا موخەییەلەی بەسورەتێک ئیستیلا کردبوو لە پاش موددەتێکی زۆر کەم ئەوەی کە فکرم لێ ئەکردەوە عادەتا بەچاو دەمبینی.

لەم خەیالاتەدا وا ئەهاتە پێش چاوم کە لە (دەشتی وەیس)(١)دا:

ڕیش سپی، منداڵ، پیاوی قەیرە، ژن، کوڕ، کچ، حاسڵ گەورە و بچووک عەشاماتێکی ئەوەندە=

---

*(١) دەشتی وەیس: کەوتبووە ڕۆژئاوای شارەوە بەپاڵ کارگەی جگەرەی ئێستاوە، شەخسێکی لێیە، خەلکی بۆ نیاز و موبارەکی زیارەتیان دەکرد، بەگۆرانیەوە دەوترا: هابچینە سەر (وەیس) وەیسی خۆمانە لە وەیس دەپرسین خەتای کامانە.*

لەوەدا دەرەکەوێ کە ئەم گۆرانیی (إنتباه)یان لەگەڵ چیرۆکی (نیرۆن) و چیرۆکی (سکالانووس)دا، لەسەر شانۆی خوێندنگاکەیان، بە(تیپی ساز و ئاواز و گۆرانی و لاساییکردنەوە)، لاساییکردەوە کە بەسایەی دەستکەوتی ئەو ئاهەنگانەوە، کە سێ شەوی

---

= کۆبووبووەوە کە تەشبیهکردنی ئەم قەلەبالغە بەشارەمێروولەیەک جائیز بوو، ئەم خەڵقەش بەنیعتیباری ئەکسەریەتەوە پڕ چەک و سیلاح بوون، لەم دەشتەدا کە لەبەر ئینسان وەک بەحرێکی موتەلاتیم وابوو بەدەرەجەیەک سکوت و سکوونەت حوکم فرمابوو کە ئینسان عادەتا گوێی لە وزەی باڵە مێشسوولە دەبوو. منیش لە کن (گردەکەی شێخ محێدین)[٢]ەوە لەناو ئەم عالەمەدا خۆم دەبینی. ناگەهان دەنگ و ئاهەنگ و گۆرانییەکی زۆر موئەسیرم هاتە بەر گوێ.[٣] گۆرانییەکە مەوزون و گفتەکەش موهەیج بوو، چاوم هەڵبڕی کە تەماشام کرد ئەم گۆرانییە چەند سیلاح بەدەستێک لەسەر گردەکەوەن، ئەیانوت و نەقەراتی ئەم گۆرانییە بەیەک ئاهەنگ لە تەرەف عمووممەوە تیکرار ئەکرایەوە و لە تەنیشت ئەم سیلاح بەدەستانەوە چەند دایکێک کە هەر یەکە دەستی منداڵێک بەدەستەوە، چەند منداڵێکی دە دوانزە ساڵ، چەند ژنێکی مێردار، چەند کچێکی چواردە ساڵ لەسەر خەتێک بەتەرتیب ڕێک ڕاوەستابوون و بەسورەتێکی حوزن ئەنگیز، جەسارەت بەخش دەستە دەستە بەڕیزە لەسەر ئەم گۆرانییە کە نەقەراتەکەیی لە تەرەف عمووممەوە تیکرار ئەکرایەوە دەوامیان ئەکرد. گۆرانییەکەم عەینەن[٤] لەبیر نەما، فەقەت خولاسەیی مەئالەکەی[٥] ئەمەبوو کەوا عەرزی دەکەم.

دەستەیی لاوەکان

ئێمە دلاوەرانی کوردان بۆ تەئمینی سەعادەتی میللەت ئەوا هەوڵ هەنگاومان هاوێشت. ئالای زەفەر بەمەسروریەت لە پێشمانەوە ڕەفعی مەوانیعی ئامالمان ئەکات. بۆ ئیمحای زوڵم و تەعەسسوب لە هەموو کوردستاندا. تەپڵبازی سوارانی جەنگاوەر دەستی کرد بەلێدان، ئەی دوشمنانی کوردستان، ئەی زاڵمان و خوێنخۆران بلەرزن ئەمە میللەتە کە هەڵساوە، ئەی غەدداران هەر لە ئێستاوە کفن بۆ خۆتان حازر بکەن.

«نقرات»

مادەری وەتەنمان، کوردستان، ئیستیمدادمان لێ دەکا. ئێمە کە ئەولادی ئەوین هاتین =

---

*(٢) گردی شێخ محێدین: خوار دەشتی وەیسە، ئەو گردەی نێوان کارگەی جگەرە و کارگەی سەهۆڵەکەی گەرەبێت، ئێستا (گەڕەکی شێخ محێدین)ە.*

*(٣) تا ئێرە لە ژیانەوەی ژمارە (٢١) دایە.*

*(٤) عەینەن: وەک خۆی. کتومت.*

*(٥) مەئال: پوختەکەی، ماناکەی. لە (ما آل إلیه) عەرەبییەوەیە.*

خـایاند، گـەلێک ئامـێـری سـاز و ئاواز و، کـەلوپەلی وەرزش و دیدەوانیـیـان بۆ خوێندنگاکەیان کڕی، بێجگە لەوەیش دەستگیرۆیی گەلێک شاگردی هەژاریشیان پێ کرد

---

=بەئیمدادیەوە و عەزممان کرد کە نجاتی بدەین و لە ڕێگای نەجاتی ئەودا بمرین. ئێمە هەر بۆ خزمەتی ئەو ئەژین لە ڕێی ژیانی ئەودا مردن بەژیان ئەزانین.

### سێ چوار دایک

ئەی دلاوەرانی وەتەن قـەتعیـەن زەن مـەکـەن کـە لە دیدەیی مـادەرانەیی ئێمە بەحوزنێکی زەلیلانەوە فرمێسک بێتە خوارێ، چونکە ئێمە ئەزانین کە ئێوە دەستتان دایە تفەنگ تۆفیق ڕەفیقتانە و زەفەر یار و یاوەرتانە، لەبەر ئەمـە لازمـە هەر لە ئێسـتـاوە زالـمـان و دوشـمـنانی کـوردسـتـان ئەشکرێژی مـەزەللەت بن. ئەی جەنگاوەران ئێـمە ئێوەمـان هێنایە دنیاوە لەبەر ئەمە حەیاتتـان هی ئێوە نییە. عائید بەوەتەنە. چونکە لە پێش ئێمەدا مادەر ئەوە.

«نقرات»

### سێ چوار باوک

ئەی (غظنفران) ئێوە کە قەلبتان بەڕابیتەیی ئەبەویەتەوە زەرەبات دەکا لە ساحەیی جەنگ و جیدالدا ئێمەتان لەبیر نەچێتەوە، بۆ ئەوەی ڕۆحی ئێمە بەموفەقیەتی ئێوەوە دائیمەن شەعشەعانبێ، لە هیچ شتێک سڵ مەکەن و بەبرینداری و شان و شەرەفەوە وەرنەوە سەربالینی ئێحتیزاری ئێمە و بەدەستی خۆتان دیدەیی نوکرانی ئێمە لێک بنێن.

«نقرات»

### چەند منداڵێک

نەتیجەی زەفەر کە تەئمینی سەعـادەت و مەسەڕەتی دلاوەرانی وەتەن پەروەر دەکا، نەتیـجەی ئامالی ئێمەیە؛ مردنێک کە تەئمینی ژیانی ئەبەدی دڵی میللەتێک بکا بگاتە غایەی موقەددەسی ئێمەیە. ئەو ترسنۆکـانە لەژێر باری حەیاتدا دەناڵێن، لە ژیان نەگەیشـتوون، ئەوانە کە لە ڕێی سەعـادەت و ڕەفاهی میللەتی خۆیاندا ئیفنای حەیاتیان کردووە هەر ئەوان ژیاون و ئەژین. هەوەڵ دەرسی ئێمە لە ئاغووشی[1] مادەردا، لەسەر ڕیحلەی مەکتەب ئەمەبوو.

«نقرات»

### سێ چوار ژنی مێرددار

بڕۆن ئەی ڕەفیقان دلاوەران، شەڕ جەژنی ئێوەیە، بڕۆن ئەی جەنگاوەران، بڕۆن هەتا بەموزەففەریەت=

---

(١) ئاغووش: ئامێز، باوەش.

بۆ کڕینی جلوبەرگی وەرزش و دیدەوانی. تا ئێستاکەیش یادی ئەو کارگێڕ و مامۆستایانە لەبیری نەتەوەکەماندا ماون و، بەڕێز و خۆشەویستییەوە ناویان دەهێنن. (سالح قەفتان،

= ئەگەڕێنەوە. بۆ گوڵبارانی ئێوە و تەزیینی تاقی زەفەرتان ئێمەش گوڵ ئەچنینەوە.

ئەگەر دەستی زوڵمی زەمانە چەند وجودێکی عەزیزی ئێوە ئەبەدییەن لە ئێمە جوێ بکاتەوە، ئێمەش بەزەفەر و غالبیەتی ئێوەوە ئەبەدییەن ئەلاوێنینەوە و فیکری ئینتیقامی ئێوە بەسوورەتێک تەلقینی ئەو شێر بەچانەی،[۲] کە لە باوەش و سکماندان، دەکەین کە هەر قەترەیەکی خوێنی ئێوە ببێتە دەریایەک کە سەد هەزار زاڵمان غەرق بکات!

«نقرات»

## چەند کچێک

ئێمە کە خوشکانی قەهرەمانین و هێشتا ڕابیتەی موقەددەسەی ئیزدیواج لامان مەجهولە، ئەگەر لەگەڵ حەیاتی ئێمەدا نەوجەوانانی وەتەن ئارەزووی ئیشتیراک بکەن لازمە بەچەهرەیەکی ئارایش و ڕایەی زەفەرەوە عەودەت بکەنەوە و بۆ ئیستیحساڵی ئەم غایە موقەددەسە لەم شەڕە موبارەکەدا خوێنی خۆیان ڕژاندبێ.

«نقرات»

## تاقمی جەنگاوەران

لە ژێر ئەم چەک و سیلاحەدا، لە حزور خوای عالەمیان و ئەم عەشاماتە و دایک و باوک و خوشک و برا و ماڵ و منداڵماندا سوێند دەخۆین کە ڕیشەیی زوڵم و زاڵمان بکێشینەوە و ئەمن و ئاسایش لەم کوردستانەدا تەئسیس و تەئمین بکەین.

***

بەندە بەچامەیەکی (زرین فرۆشتەنییەوە؟) کە بەئەمانەت لامبێ ئەوی خودنمایی بکەم. بینائەن عەلەیهی دەرهەق ئەم گۆرانییە کە ناوی (گۆرانی عەزیەت)ە، ئەختێ عەرزی مەعلومات بەلازم ئەزانم.

ئەم گۆرانییە لە تەرەف ژنە فرانسزیەکەوە کە ناوی (ماری ژۆزەف شەنی)یە وتراوە، لەناو فرەنسزەکاندا بووە بەگۆرانییەکی زۆر مەرغوب و مەشهوری میللی.

بەندە کە خوێندمەوە ئەم مەوزوعەم وەک فەوەرانی حیسیاتێکی عموم کە لەم موحیتەدا بەرامبەر زوڵم و ئیعتیسامی شێخ مەحموود و تەبەعەی و لە کوردستانی شیمالیدا بەرامبەر ئیستیبداد و وەحشیەتی تورک حاسڵ بووبێ، وا هاتە پێش چاوم. وە فیکری مونەزەمەکەی کە ئەساس تەشکیل=

---

(۲) شێربەچە: بێچووە شێر.

زێوەر، سەعید کابان، عەلی ئاگا، فوئاد ڕەشید) لەو جۆرە مامۆستایانەن. هەروەها

---

= دەکا بەنەزەر ئەحوالی ڕوحیە و تەمایلاتی خۆمانەوە نەختێ هەڵمگێڕایەوە و بەموقەددیەیەکەوە عەرزم کرد. لە تەرجومەکردنی عەرزی ئەسڵیشم، ئەگەر یەکێ لە شاعیرەکانمان مەوزوعەکەی لا چا بوو (چاکبوو. ا. ب) بەزمانی خۆمان نەزمی بفەرموێ تاکو لە تەرەف منداڵەکانی مەکتەبەوە بەگۆرانی ببێژرێ، لام وایە ئەم هیممەتە هەموو هاوخوێن و هاوزمانمان خۆشحاڵ دەکا.

مەحموود جەودەت[1]

---

(١) وابزانم ئەسڵی بابەتەکەی لای خوێنەر ئاشکرایە، هەروا سەرچاوە ئەسڵییەکە، هەندێ وشە لە کاتی گواستنەوەدا، بەداخەوە، لە ڕۆژنامەکەدا باش دەرنەچوو بوو. (ژین - ژ ٢١، ١٩٢٥/٣/١٩ و دواتر). دەمێنێتەوە سەرنجەکەی کۆتایی مەحموود جەودەتی وەرگێڕی ئەم پارچەیە کە لە کارەکەیدا (نەختێ) دەستکاری وای کردووە تا خوێنەر وا نیزیکخاتەوە لە دەوروبەری ئەو ڕۆژەی سلێمانی بچێ یا کوردستانی شیمالی!! لەو ڕۆژەشدا (مارتی ١٩٢٥) شێخ مەحموود تەنگ بەشۆڕشەکەی هەڵچنرابوو و لە ناوچەی پێنجوین بوو، کەمالیە تورکەکانیش تەنگیان بەشۆڕشەکەی شێخ سەعیدی پیران هەڵچنیبوو و ئیعلانی کورد قڕانیان کردبوو. لێرەدا جەودەت ئەم دوو دیاردەیەی باکوور و باشوور دەخاتە یەک تای تەرازووەوە؛ ڕابەری نەتەوەیەک لە ١٩١٨ وە دژی داگیرکەری تورک و ئینگلیز جەنگاوە و دەربەدەر، لەگەڵ جەللادێکی کورد کوژ. (زوڵم و ئیعتیسامی شێخ مەحموود و تەبەعەی = ئیستیبداد و وەحشیەتی تورک لە شیمال)... ئەمە ئەگەر (سوئی فەهم) و (جەهالەتی) ئەو ڕۆژە نەبێ یا کینە و بێگانە پەرستی نەبێ دەبێ چی ناونرێ. (ژیانەوە) ئۆرگانی ئینگلیز و حوکمە عەرەبیەکەی بەغدابوو لە سلێمانی، تەسخیر کرابوو بۆ (ڕاگەیاندنێکی دژ بەکورد و شۆڕشەکەی)، بۆ مێشک ئاودانی خەڵکی و تێگەیاندنیان بە بێ هودەیی (شۆڕش و یاخی بوون و جەردەیی)! بەسوود و قازانجی مام ئینگلیز و عەدالەت و مەرحەمەتی حوکمەتەکەی بەغدا، ژیانەوە ببووە (وردبینێ) و بەدووی زەڕەیە لە هەڵە و نالەباری حوکمی سەردەمی شێخدا دەگەڕا و نەشری دەکرد. (بڕواننە ژمارەکانی). بەداخەوە لەو هەوڵ و کارەشدا داگیرکەران دەسەپاچەنەبوون، داماونەبوون، هەر قەڵەمی لەم بابەتە زۆر بوو کە (في سبيل الله) ئەوەی خۆیان نەیاندەزانی و پێیان نەدەکرا ئەمان بەخۆبەخشانە بۆیان دەکردن. بەڵام کە دوایی، دوای سێ چوار ساڵ ژیان لەژێر سایەی ئەو (بەیاخی عێراق و بەریتانیای موعەززەمەیەدا)، ڕەش و سپیان بۆ ئاشکرابوو، بۆیان دەرکەوت کە داگیرکەر هەر ئەوەیە کە بوو و دەبێ... ئەوساکە، د. کەمال مەزهەر وتەنی: (زۆری نەبرد کاتێک ئەوانەی لە -ژیانەوە-دا دەیاننووسی لەوەگەیشتن... بۆیە بەشێکیان دەستیان لە نووسین هەڵگرت و لە کاری سیاسی دوورکەوتنەوە و بەشێکیشیان دایانەوە پاڵ شێخ مەحموود).
بۆ پەندی زەمان، مەحموود جەودەت یەکێک بوو لە تاقمی دووەم کە دایەوە پاڵ شێخ و شۆڕشەکەی، (لە دوای ٦ی ئەیلوولی ١٩٣٠). بێینەوە سەر بابەتەکەی خۆمان. کە وەرگێڕ داوای لە شاعیرانی کورد کرد ئەو پارچە شیعرە فەرەنسیەی بەپەخشان کردوویە بەکوردی، یەکێک بیکاتە شیعر تا لەلایەن منداڵانی قوتابخانەوە وەک سرودێ بوترێ... شێخ نووری شێخ سالح ١٨٩٦ - ١٩٥٨/١٢/٢٠ ئەم کارەی بەجوانی ئەنجامدا. جا گرێی باسەکەی مامۆستا شاکیر فەتاح ئا لێرەدایە؛ مامۆستا محەممەدی مەلا کەریم ڕای وایە بێخوودی شاعیر ئەو کارەی کردووە، کاک ئازاد عەبدولواحید و مامۆستا هەردی و کۆمەڵێک لەگەڵ ئەوەدان کە، کردن بەشیعرەکە، لەلایەن شێخ نووریەوە بێ. ئەم باسەی مامۆستا بەدەوری ئەو تەوەرەیەدا دەخولێتەوە.

(عەبدولواحید نووری، کەریم سەعید، مستەفا سائیب)یش لە لاوانی ئەو سەردەمەبوون و لە لاساییکردنەوەکەدا یارمەتییان دا. جا ئەوانە هەموویان شایانی ڕێز و سوپاسن، چونکە بەکاری نەتەوەکەمان هاتن.

کاروبار بەم ڕەنگە بوو، تا ڕوودانی کارەساتی شەشی مشتاخان (ئەیلوول) و ساڵی ١٩٣٠. ئیتر لەوە بەدواوە بەربەستی ئەو گۆرانییانە کرا. بەرەبەرە گۆرانییەکان لەبیر چوونەوە. تەنانەت گۆرانیی (إنتباهـ)یش بەخاوەنەکەیەوە کە (شێخ نووری شێخ ساڵح) بوو تا ماوەیەکی دوور و درێژیش لەبیر چووەوە... کەواتە ئێمە ڕێز و سوپاس و پیرۆزباییمان لەسەرە کە پێشکەشی سێ نووسەری تریشمان بکەین، واتا (دکتۆر کامیل حەسەن عەزیز بەسیر) و (موسلێح مستەفا جەلالی) و کاک (ئازاد عەبدولواحید)، چونکە هەریەکەیان لە ناوەند ساڵەکانی ١٩٨٠ و ١٩٨٥دا، نووسراوێکی لەسەر (شێخ نووری شێخ ساڵح) و بەرهەمەکانی نووسی و هەرسێکیشیان پایەی گەورەیان لەناو نووسەران و بوێژانی سەردەمی خۆیدا، کە شایستەیەتی بۆ ئامادە کرد. هەروەها ئەوەیشیان چەسپاندە دڵی کوردپەروەرانەوە کە گۆرانیی (إنتباه) ئەو دایناوە؛ واتا ئەو لە پەخشانەکەی (مەحموود جەودەت)ەوە کردوویە بەهۆنراوە و ئاوازێکی نایابیشی بۆ دۆزیوەتەوە و فێری شاگردەکانی خوێندنگای کوڕانی سەرەتایی یەکەمی سلێمانیشی کردووە و لەوێیشەوە بڵاوبۆتەوە بەناو خوێندنگاکانی تری کوردستاندا.

هەروەها لە لاپەڕەکانی ئەم نووسراوەدا پیشان دراوە، نووسەری ئەم نووسراوە لە گەلێک دەرفەتدا هەوڵی داوە کە ئەم گۆرانیی (إنتباه)ە و گۆرانییەکانی تریش، لەلایەن کاربەدەستانی (خوێندەواری) و (ڕۆشنبیری)یەوە، هەروەها لەلایەن تیپەکانی (لاساییکردنەوە) و (ساز و ئاواز و گۆرانییەوە) سەرلەنوێ تازە بکرێنەوە و زیندوو بکرێنەوە و بخرێنەوە ناو خوێندنگاکان، چونکە پڕن لە ساز و ئاوازی خۆش و بەجۆش و وشەی بەنرخی نیشتمانیی و مرۆڤایەتی. ئێستاکەیش دیسانەوە تکا دەکەمەوە لەو کاربەدەستانە و لەو تیپانە کە ئەم کەلەپووری نەتەوایەتییەمان زیندوو بکەنەوە و نەهێڵن لەناوبچێ.

شاکر فەتاح

«خاوەنی پرۆژەی خوێندەواری کورد»

(سلێمانی): (١٩٨٧/١٢/١٧)

# مێژووی گۆڕانیی (إنتباه)

جێگای دڵخۆشی و سوپاسی خودایە، کە لە ماوەی شەش ساڵدا، (١٩٨٠ - ١٩٨٥)، سێ نووسراو لە بابەت (شێخ نووری شێخ ساڵح) و بەرهەمەکانییەوە، لە لایەن سێ نووسەری کوردی بەڕێزەوە چاپ کرا:

١- شێخ نووری شێخ ساڵح لە کۆڕی لێکۆڵینەوەی وێژەیی و ڕەخنەسازیدا - د. کامیل بەسیر، ساڵی ١٩٨٠.

٢- شێخ نووری - دەنگی ڕەسەنی شیعر - موسلیح مستەفا جەلالی، ساڵی ١٩٨٤.(١)

٣- دیوانی شێخ نووری شێخ ساڵح - ئازاد عەبدولواحید، ساڵی ١٩٨٥.

هەرچەندە ئەم سێ نووسراوە ناوازە و نایابانە، لە بابەت ژمارەی لاپەڕە و شێوەی نووسین و داڕشتن و بیروباوەڕەوە، هەندێک جیاوازن لە یەکتری، بەڵام نووسەرەکانیان، هەموویان، لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە (شێخ نووری شێخ ساڵح) سەردەستەی بوێژ و وێژەوانانی سەردەمی خۆی بووە، لە پایەبڵندیدا، لە تازەکردنەوەی وێژە و هۆنراوەی کوردیدا، لە ڕۆژنامەنووسیدا، لە بەکارهێنانی دەستووری زانستیی لە ڕەخنەسازی و نرخ دانانی وێژەییدا، لە خەباتی نیشتمانیدا، لە بەرزکردنەوەی سەری کوردەواریدا. بەرهەمە

---

(١) ئەوەی پێویستە لێرەدا بخرێتە بەرچاو، دەربارەی ئەو کتێبەی خوالێخۆشبوو (موسلح جەلالی) ئەوەیە کە ئەو کاتە ناوبراو بەڕێوەبەری گشتی دەزگەی ڕۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی بوو لە بەغدا، هیچ سەر و ساختییەکی لەگەڵ شیعر و ئەدەبیاتدا نەبوو؛ کاک عەبدولقادر عەلی مەردان کە کارمەندێکی هونەری بووە لەو دەزگایە لە ڕۆژی یەکشەممەی ٢٠٠٢/٩/١ لە ماڵی لەتیف هەڵمەتی شاعیر بۆی باس کردم کە: ئەو کتێبەی لەسەر شێخ نووری، خوالێخۆشبوو (م. ن)ی شاعیر بۆی نووسی و ئامادەی کرد و بەناوی (موسلح)ەوە بلاوکرایەوە، لەوەشدا سوودێکی زۆر لە کتێبەکەی کاک (ئازاد عەبدولواحید) وەرگیرا... نەک هەر ئەمە بەڵکو کتێبی (شوراتەکان)یش کە دیسان (م. ن) ئامادەیکرد و بەناوی ئەوەوە بلاوکرایەوە. بڕوانە: (موسلح جەلالی - شوراتەکان، دەزگای ڕۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی - دار الحرية للطباعة، بغداد ١٩٨٧ زنجیرەی ژمارە - ١٥٦-). جا لێرەدا هیچ ناوترێ جگە لەوەی زۆر جێی داخ و مەخابنە کە لە سەردەمەکاندا خاوەن قەڵەمی وا پەیدا دەبێ، بەکرێ، کار بۆ کەسانی خاوەن پایە و دەسەلات دەکەن لە بەرامبەر سوود و دەسکەوتێکی کاتیی کەم خایەن و خۆیان دەکەنە (أقلام تحت الطلب) و (أقلام مأجورة)... نەک هەر ئەمە بەڵکو نموونەی لەم بابەتە زۆرن، ئەوساکە و ئێستاش، کەچی لە بەدبەختی و چارەڕەشییان، کارە ناپەسەندەکانیان هەر ئاشکرا دەبێ.

ناوازە و نایابەکانیشی بەڵگەن بۆ ڕاستیی قسەکانی ئەو سێ نووسەرە. هەروەها لەسەر ئەوەیش یەک بیروباوەڕن کە (گۆرانی إنتباهـ)، بەرهەمێکی پەرچڤەکراو و پاک و پوختە و نەژادی (شێخ نووری)یە، نەک هی (مەلا مەحموودی بێخود).

لە ڕاستیدا (شێخ نووری شێخ ساڵح)، خودای گەورە، سێ بەهرەی گەورەی پێ بەخشیبوو: سەروسیمایەکی جوان و پڕشنگداری هەبوو، کە دڵپاکی و دەروون ئازادی و سەربەستیی بیروباوەڕت لەدەم و چاویدا دەخوێندەوە، لەگەڵ ڕووخۆشی و زمان شیرینی و نەرم و نیانیدا. دەنگێکی نەرم و خۆشیشی هەبوو، لە کاتی گۆرانی گوتندا، دڵی پیاو کێش دەکرد و کاری تێدەکرد. بلیمەتی و هەڵکەوتوویی و لێ هاتوویيشی هەبوو، کە بەرهەمەکانیدا دەردەکەون، لەگەڵ کردەوە و ڕەوشت و خەباتە نیشتمانییەکانیدا. جا ئەم سێ بەهرەیە بوون، کە (شێخ نووری)یان گەیاندە پۆپەی ناوبانگی بوێژێتی و پێشەوانی خەباتی نیشتمانی و ڕۆژنامەنووسیی، لە کوردستانی عێراقدا، بەتایبەتی لە سلێمانیدا، لە ساڵەکانی (١٩٢٠ - ١٩٣٠)دا.

لە ساڵی ١٩٢٥دا، (مەحموود جەودەت)، کە ئەفسەرێکی کورد و نووسەرێکی دەروون ئازاد و نەبەرد و هونەرمەندێکی ڕەندبوو لە وێنەکێشاندا، کۆمەڵە هۆنراوەیەکی لە زمانی فەرەنسزییەوە گۆڕییە سەر زمانی کوردی، ناوی نابوو: (إنتباهـ)(*).

خاوەنی ئەم کۆمەڵە هۆنراوەیە[1] ناوی (ماری ژۆزەف شەنی)یە کە ژنێکی فەرەنسزی

(*) تەماشای ڕۆژنامەی (ژیانەوە) بکە، کە لە شاری (سلێمانی)دا دەردەچوو، ژمارە (٢١)ی ڕۆژی ١٩٢٥/٣/١٩ و، ژمارە (٢٢)ی ڕۆژی ١٩٢٥/٣/٢٦. (ش. ف)

(١) بەڵکو: (ئەم هۆنراوەیە) کە لە ئەسڵەکەدا چامەیەکە و مەحموود جەودەت بەشێوەی پەخشان گۆڕیویە بۆ کوردی. مەحموود جەودەت لە ١٩٣٠دا دیسان (مەنزومەیەک)ی تری لە فەرەنسییەوە بەم جۆرە کردە پەخشان: (تەرجومەی پارچە مەنظومی - سولی پرۆدۆم- کە یەکێکە لە ئەدیب و وەتەنپەروەرانی فرانسزە - گوڵی خوێنین-. ژیان: ژ ٢٤٣ لە ٥ حوزەیران ١٩٣٠). ئەحمەد موختار جافی شاعیر (١٨٩٨ - ١٩٣٥/٢/٦) بەزوویی ئەو پەخشانەی کردە پارچە شیعرێکی بەسۆز و هەر لە (ژیان، ژ ٢٤٧ی ٢٦ حوزەیران ١٩٣٠)دا بڵاوکرایەوە، دوا دێڕی:

موقابیلی ئەم دەرد و بەڵایە
ئازاد نەپشکون گوڵانی وطن
چەند بێ ویجدانن، ئێوە ئەبوایە
بۆ مردووەکانمان هەر بکەن شیوەن
=

بووە. وا دیارە ئەو ئافرەتە بەبۆنەی یەکێک لە شۆڕشە گەورەکانی فەرەنسەوە. ئەو کۆمەڵە هۆنراوەیەی هەڵبەستووە. (مەحموود جەودەت)یش داوای کردبوو لە بوێژەکانمان یەکێک لەم هۆنراوەیە، کە (بریتییە لە گۆرانییەکی نیشتمانیش) بکات بەهۆنراوە و ساز و ئاوازێکیشی بۆ بدۆزێتەوە، تا لەلایەن شاگردەکانی خوێندنگا کوردییەکانەوە بەگۆرانییەوە بخوێندرێتەوە.

(مەحموود جەودەت)یش، هەروەک پیاوێکی دڵناسک بوو و، بەزەیی بەنەتەوەکەی خۆیدا دەهاتەوە، کە ئەو سەردەمە لە هەموو لایەکەوە ئازار دەدرا و زیانی لێ دەدرا و دەچەوسێنرایەوە، پیاوێکی زیرەکیش بوو. بۆیەکا لەو ڕۆژانەدا ئەو کۆمەڵە هۆنراوەیەی، بەپەخشان، کردبوو بەکوردی و داوای کردبوو بیکەن بەهۆنراوە و بەگۆرانی، کە ئاگاداربوو لە خەباتی نیشتمانیی کە لە هەموو لایەکی کوردستاندا لە ئارادابوو، چ بەجەنگ و چ بەپێنووس و خەباتی بێ خوێن، بۆ دەستکەوتنەوەی مافی نەتەوایەتی بۆ کوردەواری.

(شێخ نووری شێخ ساڵح)یش کە ئەو سەردەمە لە هەرەتی خەباتیدا بوو، لە پێش هەموو کەسێکدا ئەو خواستەی (مەحموود جەودەت)ی جێبەجێ کرد. هێنای (إنتباه)ەکەی (مەحموود جەودەت)ی، لە شێوەیەکی جوان و ڕازاوە و شۆخ و شەنگدا، بەجلوبەرگێکی کوردییەوە و بەبیروباوەڕ و گیانێکی کوردایەتییەوە، کرد بەهۆنراوە و ئاوازێکی یەجگار پڕ ئاهەنگ و خۆشیشی بۆ دۆزییەوە کە لەسەر کێشی ئاوازی گۆرانییەکی فارسی بوو، کە ناوی (دیشب کی مەرا وضعی وطن در نظر ئامەد) بوو. ئەمەیش هەر لە ساڵی ١٩٢٥دا پێکهات.(١)

---

= هەروا هەر ئەو تەرجەمەیەی بەناوی (أزهاری خوێنین) لە گۆڤاری زاری کرمانجیدا لە گۆشەی (شیعر منسور)دا بڵاو کردۆتەوە. بڕوانە: زاری کرمانجی. ژ ٢٣ ساڵی (٥) ٤ حوزەیرانی ١٩٣٠ ڕەواندز ل: ٩ - م. ج: ترجمەی پارچەیەکی منظومی سوللی پرۆدۆم...

سۆلی برۆدۆم Sully - Prudhomme (١٨٣٩ - ١٩٠٧) شاعیرێکی فەرەنسی بەتوانابوو، بایەخی زۆری بەلایەنی فەلسەفی لە مرۆڤدا دەدا، لە بەرهەمەکانی: تەنیاییەکان، چارەنووسەکان. لە ١٩٠١ پاداشتی نۆبڵی لە ئەدەبدا پێ بەخشرا.

(١) لەکاتی خۆیدا باس و نووسین لەسەر ئەم بەرهەمە و کردن بەشیعرەی زۆر نووسرا؛ ئاخۆ لەلایەن بێخوودەوە بووە یان شێخ نووری؟، بەلام وابزانم وتارە بەپێزە پڕ لە بەڵگە و ڕاستییەکەی مامۆستا ئەحمەد هەردی شاعیر کۆتایی بەهەموو ئەو گومان و ئەگەرانە هێنا و مەسەلەکەی یەکلایی کردەوە و خاوەنێتی شیعرەکەی دایە پاڵ شێخ نووری. جا لە باسی ئاوازی شیعرەکەشدا، مامۆستا هەردی=

له ساڵی ١٩٢٥دا، دیسانەوە، ئەم کۆمەڵە هۆنراوەیە لەگەڵ چەند گۆرانییەکی تری کوردیدا کە بەهەمووییان ژمارەیان دەگەیشتە (٢٠) بیست گۆرانیی کوردی، لەژێر ناوی (گۆرانی کوردی)دا، لەلایەن شارەوانی (سلێمانی)یەوە و لە چاپخانەکەی خۆیدا، وەک نووسراوێکی بچووک چاپ کرا. لە پشتەکەی نووسرابوو: «لەسەر امری عالیی متصرف و مفتشی إداری چاپ کراوە». ئەوەی شایانی باسە، ئەوەیە کە گۆرانیی (إنتباه) بەناوی (م. نووری)، واتا (شێخ نووری شێخ ساڵح)ەوە لە چاپ درابوو. هەروەها ئەم گۆرانییەم لە چەند نووسراوێکی تریشدا دیوە کە بەناوی (شێخ نووری شێخ ساڵح)ەوە چاپ کراوە، وەک نووسراوەکانی: (کەریم سەعید)[١] و (موسڵح مستەفا)[٢] و (کوردی و مەریوانی)[٣] و (ئازاد عەبدولواحید)[٤]. کەچی لە ساڵی ١٩٧٠دا لەلایەن کاک (محەمەدی مەلا کەریم)ەوە، ئەم گۆرانییە کرابوو بەبەرهەمی (بێخود) و لە نووسراوی (دیوانی بێخود)دا بەناوی بێخودەوە چاپ کرابوو.

---

= دەڵێ: «مامۆستا گۆران لە پێشەکی شیعری - داستانی هەیاسی و کاکە عابیدین-دا دەڵێ: ... ئەو گۆرانییەی بەهاوکاریی خوالێخۆشبوو مەحموود جەودەت و شاعیری تەڕ و پاراو م. نووری پێکهات، ئاوازەکەی لەسەر پارچەیەک لە ئۆپەرای - رستاخیز شهر یاران...- دانراوە کە هی (عەشقی) شاعیری فارسییە، پارچەکە ئەمەیە:

دیشب کەمرا وضع وطن درنظر آمد

دیم کە زنی باکفن أز قبر درآمد

... ئەبێ بزانین کە -دلاوەران- سروودە... واتا ئەوەی ئەو سروودەی داناوە لە پێشا ئەو ئاوازەی بیستووە و کاری تێ کردووە و فێری بووە و ئەمجا هاتووە شیعرەکەی لەسەر ئەو ئاوازە داناوە... بۆیە ئەو قسەیەی خوالێخۆشبوو مستەفا سائیب کە ئەڵێ: گوایە ئەو و کاک ئەنوەر سائیب ئەم شیعرەیان خستۆتە سەر ئاوازی: دیشب کە مرا...- زۆرم پێ ناخۆشە. تەنیا بەشی دوایی ئەم قسەیە بەتەواو ئەزانم کە دەڵێ شیعرەکە لەسەر ئاوازی - دیشب کەمرا...-یە). بەدوای ئەمەدا ئیتر مامۆستا هەردی کۆمەڵێ بەڵگەی هونەریی لە ئاوازداناندا بۆ شیعر یا بەپێچەوانەوە، دێنێ کە جێی باوەڕن. بۆ زیاتر بڕوانە: (هاوکاری - ڕۆژنامە: ژ ٩٩٣، ١٩٨٨/٧/٢١ ل: ٨- ئەحمەد هەردی: شیعری دلاوەران هی شێخ نوورییە).

(١) گۆرانی: کەریم سەعید، ساڵی ١٩٢٨.

(٢) شێخ نووری، دەنگی ڕەسەنی شیعر: موسڵح مستەفا جەلالی، ١٩٨٤.

(٣) گۆرانی کوردی: کوردی و مەریوانی، ساڵی: ١٩٣٧.

(٤) دیوانی شێخ نووری شێخ ساڵح: ئازاد عەبدولواحید، ١٩٨٥. (ش.ف)

جا هونەری کاک (ئازاد عەبدولواحید) لەوە دایە، وەک لە نووسراوەکەیدا (دیوانی شێخ نووری شێخ سالح) و لە گۆڤاری (بەیان)، ژمارە (١٣٤)ی ئابی ١٩٨٧دا پیشانی داوە، بەتەواوەتی بۆ هەموو لایەکی خستۆتە ڕوو کە ئەم گۆرانی (إنتباه)ە، بەهەڵە کراوە بەهی بێخود، چونکە لە ڕاستیدا هی (شێخ نووری شێخ سالح)ە، نەک هی بێخود.

(کاک ئازاد عەبدولواحید)، بێجگە لە گەلێک کەسی تر، وەک (کاک نووری کاکە حەمە) و کاک (ئەحمەد خواجە) و (مامۆستا فوئاد ڕەشید) کە خزم و دۆست و ئاسنای (شێخ نووری شێخ سالح) بوون و چووبووە دیدەنییان، هاتە لای منیش لە بابەت (شێخ نووری) و بەرهەمەکانییەوە، بەتایبەتی لە بابەت گۆرانیی (إنتباهـ)ەوە پرسیاری لێ کردم. منیش هەرچییەکم لە لا بوو، لە بەڵگە و بەرهەم و زانیاری پێشکەشم کرد و بۆم چەسپاند کە گۆرانییەکە هی (شێخ نووری)یە نەک هی (بێخود). ئەو کەسانەی لەسەرەوەیش ناوم بردوون، هەروەها لەسەر ئەوە سووربوون کە گۆرانی (إنتباهـ) هی (شێخ نووری)یە، نەک (بێخود).

لە ساڵی ١٩٢٧دا (شێخ نووری شێخ سالح) چەند ڕۆژێک هاتە خوێندنگای سەرەتایی یەکەمی سلێمانی، بەدەنگە خۆشەکەی خۆی ئەم گۆرانیی (إنتباه)ە کە خۆی دایناوبو[٥]، فێری کۆمەڵێکی گەورەی شاگردانی خوێندنگاکەی کرد. من خۆیشم یەکێک بووم لەو شاگردانە. ئەوساکە تەمەنم لە چواردە ساڵیدا بوو کە یەکەمی شاگردانی پۆلی شەشەم بووم. ئەمە لە بەهاری ئەو ساڵەدا ڕووی دا.

بەڵام لە هاوینی ساڵی ١٩٢٧دا، ئەم گۆرانییە، لە شێوەیەکی شەنگ و شۆخدا و بەجلوبەرگ و چەک و ڕوخسارێکی کوردانەوە، لەسەر شانۆی خوێندنگاکەمان، لەگەڵ چەند چیرۆکێکی تری لاسایی کردنەوەدا، بەگۆرانییەوە لاسایی کرایەوە.[٦]

مامۆستا (فوئاد ڕەشید) و کاک (کەریم سەعید) لەو لاساییکردنەوانەدا بەشداربوون. گۆرانی (إنتباه)ەکە لەلایەن جەماوەرانەوە زۆر پەسەند کرا. من خۆیشم یەکێک بووم لەو شاگردانەی کە دەستەی منداڵانیان پێک هاتبوو. وەک دێتەوە بیرم فەرانبەرە گەورەکان و پیاوە ناودارەکانی شاریش بۆ ئەو ئاهەنگە هاتبوون. لاساییکردنەوەکانیش تا سێ شەو دووبارە کرانەوە. بەپارەی ئاهەنگەکان گەلێک ئامێری فوویی و ساز و ئاواز و کەلوپەلی

---

(٥) بەڵکو ڕاستتر: گۆڕیبوویە سەر ئۆپەرێتێکی شیعری.

(٦) بەشێوەی ئۆپەرێت پێشکەش کرا.

دیدەوانی و وەرزشی پێ کرا، لەگەڵ دەستگیرۆیی کردنی شاگردە هەژارەکان لە دروستکردنی جلوبەرگی دیدەوانی و وەرزشدا. ئەو ئاهەنگانە لە ژێر سەرپەرشتیی مامۆستا (ساڵح قەفتان) و مامۆستا (زێوەر) و (مەلا سەعید کابان) و (عەلی ئاگا) و (فوئاد ڕەشید)دا پێک هێنران.

کاک (مستەفا سائیب) و کاک (عەبدولواحید مەجید)یش لەو لاوانە بوون کە لە بەغدادەوە هاتبوونەوە و لە هەڵسووڕاندنی کاروباری ئاهەنگەکاندا یارمەتییان دەدان. ئاهەنگەکان بەلای دانیشتووانی شاری سلێمانییەوە ناوازەبوون، دڵی هەموو کوردپەروەرێکیان خۆش دەکرد.

ئەوساکە خوێندنگاکەمان لەماڵی (بەهێ خان)دا بوو کە هاوسەری (شێخ مەحموودی مەزن) بوو یەکێک لەو چیرۆکانەی لاسایی کرانەوە، چیرۆکی زۆرداریی (نیرۆن) بوو، کە بریتی بوو لە شاهەنشاهێکی ڕۆمایی. چیرۆکی (سکالانووس)یشی تێدابوو کە هەموو لایەکی هێنایە پێکەنین. شایانی باسە مامۆستا (فوئاد ڕەشید) و کاک (کەریم سەعید)، لەناو لاسایی کەرەوەکاندا، هونەرمەندیی و شارەزاییان زۆر پیشان دا. هەر مەپرسە کە (شێخ نووری)یش ئەو شەوە چەند دڵخۆش و کامەران بوو بەتەماشاکردنی لاسایی کردنەوەی گۆرانیی (إنتباه)ەکە کە خۆی ڕەنجێکی زۆری تێدا دابوو تا هاتبووە ئەو شێوەیەوە.

خێزانی ماڵی باوکم و خێزانی ماڵی باوکی (شێخ نووری) ئاشنایەتی و هاتوچۆیان هەبوو، چونکە هەردوولایان لە گەڕەکێکدا بوون و ماڵیان لەیەکەوە زۆر نزیک بوو. خۆیشم کە لە ساڵی ١٩٢٧دا بەتایبەتی وێنەگرێکم کڕی، هەر بۆ ئەمەی وێنەی بوێژان و وێژەوانان و ڕۆشنبیرانی کوردی پێ بگرم و بینێرم بۆ حوزنی موکریانی، بەناوی ڕێزگرتن و خۆشەویستی پیشاندانەوە.

یەکەم جار چوومە سەرا، وێنەی (شێخ نووری شێخ ساڵح) و (میرزا مارف)م گرت. ساختمانی سەرا کە شوێنێکی مێژوویی بوو، لە سەردەمی تورکەکاندا بەپیتاکی دانیشتووانی شاری سلێمانی دروست کرابوو، بۆ ئەمەی بیکەن بەخوێندنگاه.

لە سەردەمی ئینگلیزەکاندا کرا بەسەرا و ئەوساکە هەروا مابووەوە. لە ساڵی (١٩٤٤) دا چەند مانگێک من و (شێخ نووری) لە ناوچەی ڕانیەدا پێکەوە فەرمانبەر بووین. ئەو کارگێڕی لادێی (ناودەشت) بوو، منیش جێ نوشین (قائیمقام)ی ناوچەی (ڕانیە) بووم.

گەلێک جار لە ماڵی یەکتریدا خەریکی گفتوگۆی وێژەیی دەبووین. ئەمەم نەبیست لێی هیچ جارێک بڵێ گۆرانی (إنتباه) هی (بێخود)ە.

بێجگە لەوە (مەلا مەحموودی بێخود)یش، دوور بوو لەوەوە کە بتوانێ هۆنراوەی وا بەجۆش و خرۆش و شۆڕشگێڕانە و بیروباوەڕی فەرەنسەییانە، بەدەمیدا یاخود بەپێنووسیدا بێ. (شێخ نووری)یش گەلێک لەوە بڵندتر بوو، کە بەرهەمی بوێژێکی وەک (بێخود) بکات بەهی خۆی، بەتایبەتی ئەو جۆرە وێژەیە کە هەر لە خۆی دەوەشایەوە و لە (بێخود) نەدەوەشایەوە. ئیتر نازانم ئەم ئاژاوەیە بۆ چ نرایەوە، کە چل ساڵ پتر ئەم گۆرانییە (إنتباه)ە، بەناوی (شێخ نووری)یەوە ناوبانگی دەرکردبوو، نە (بێخود) نە کەسێکی تر، قسەی نەکردبوو و بەرپەرچی نەدابووەوە، کەچی لە ساڵی ١٩٧٠دا (کاکە حەمەی مەلا کەریم) کردی بەهی بێخود؟![1] من ئەم گۆرانییەم زۆر بەدڵدا چووبوو.

هەرچەندە مافی ئەوەیشم نەبوو، ناوەکەی بگۆڕم، بەڵام گەلێک جار لە دڵی خۆمدا دەمگوت: کاشکی (مەحموود جەودەت) و (شێخ نووری) ناویان بنایە (پڕشنگی ئازادی)، چونکە لە ڕاستیدا هەر کەسێ گوێی لەو گۆرانییە بێت و ناوەڕۆکەکەی تێبگات، (ئازادی) پڕشنگ دەدات بەناو هەموو دڵ و دەروون و لەش و هۆشیدا و ئاراستەیشی دەکات بۆ خەبات کردن لە پێناو دەستخستنی ئازادی گشتیدا. گۆرانییەکە یەکێتیی نەتەوە پیشان دەدات بەهەموو چین و دەستە و کۆمەڵێکییەوە، بەهەموو

---

(١) هەر لەم ڕووەوە مامۆستا هەردی دەڵێ: ئاشکرایە شیعری دلاوەران -مامۆستا شاکر هەر بەئینتیباه ناوی دەبا. أ. ب - یەکەم جار لە ساڵی ١٩٢٥دا لە چاپخانەی بەلەدیەی سلێمانی لە نامیلکەیەکدا لە چاپ دراوە ناوی شێخ نووری لەسەر نووسراوە. لە ١٩٢٨دا کەریم بەگی سەعید بەگ بۆ جاری دووەم بەناوی شێخ نوورییەوە لەگەڵ چەند گۆرانییەکی تردا بڵاوی کردۆتەوە، بۆ جاری سێیەم - کوردی و مەریوانی- لە ١٩٣٢دا بەناو شێخ نوورییەوە لەگەڵ چەند سروود و گۆرانییەکی کەدا ناوی - گۆرانی کوردی-یان لێ ناوە، بڵاویکردەوە. لە -دیاری لاوان-دا لە ١٩٣٤ سەرلەنوێ بەناوی شێخ نوورییەوە بڵاوکراوەتەوە، ئەمە ئەکاتە چوار جار، جگە لەوەی لە ١٩٥٣دا گۆرانی شاعیر باسی کردووە لە پێشەکی شیعری - داستانی هەیاسی و کاکە عابیدین-دا... ئەڵێم بۆچی کەسێک نەبوو لە پێش ئەم چل و هەشت ساڵەدا ئەو پێنج سەرچاوەیە ڕاست بکاتەوە و بڵێ ئەو شیعرەی لەو پێنج سەرچاوەیەدا بەهی شێخ نووری دانراوە، هی ئەو نییە و هی (بێخود)ە، بۆچی بێخود خۆی هەتا لە ژیاندا بوو -لە ١٩٥٥ کۆچی دوایی کردووە. أ. ب- ئەو پێنج سەرچاوەیەی ڕاست نەکردەوە؟ بڕوانە: (هاوکاری - ڕۆژنامە: ژ ٩٩٣ی ١٩٨٨/٧/٢١ بەغدا. ئەحمەد هەردی- شیعری دلاوەران هی شێخ نوورییە. ل٨).

خەباتێکیـیـەوە دژی زۆرداری و سـتـەمکاری دەوەسـتێ و بۆ دەسـتکەوتنەوەی مـاف و ئاسایش و ئازادی گشتیی هانە دەدات.

ئەم گۆرانییە و (١٩) گۆرانییەکەی تریش کە لەناو نووسراوە خنجیلانەکەدا، لەلایەن شارەوانیی سلێمـانییەوە چاپ کرابوون، بەتاسـوقەوە لەناو خـوێندنگاکـانی کـوردسـتـانی عێراقدا، لەلایەن شاگردەکانەوە دەگوتران. لە ناوەند ساڵەکانی (١٩٢٠) و (١٩٣٠)دا، کەس شاگردەکانی بەربەست نەدەکرد، لە خوێندنەوەیان، بەڵام کارەساتی شۆڕشی (٦)ی مشتاخان (ئەیلوول)ی ساڵی ١٩٣٠، بوو بەهۆی بەربەستکردن لە خوێندنەوەیان لە هەموو خوێندنگا کـوردییـەکـانی کـوردسـتـانی عـێراقـدا. ئینگلیـزەکـان کـە لەم بەربەسـتکردنەدا لەژێرەوە، دەستیـان هەبوو، گرێیەکی کوێریان خسـتـە ناو دڵی نەتەوەکەمانەوە، کە بەهۆی ئەوەوە توانییـان ناکۆکییەک بخەنە نێوان (کوردەواری) و (فەرمانڕەوایی عێراق)ی ئەو سەردەمەوە.(١)

لە سـاڵی ١٩٥٤دا کـە لە شـەقـلاوەدا جێ نوشین بووم، لەسـەر دەسـتی (دەسـتـەی لاساییکردنەوە و ساز و ئاوازی یانەی شەقلاوە)دا، گۆرانیی (إنتباه)م زیندوو کردەوە و لەگەڵ چیرۆکێکی تردا کە ناوی: (دادگاهی سەرچنار) بوو و خۆم دامنابوو، لەسەر شانۆی یانەکـە، بەئاهەنگ و بەزمـێکی پڕشنگدارەوە، لە بەردەم دانیشـتووانی شاری شـەقلاوەدا لاسایی کرایەوە. گۆرانییەکە و لاساییکردنەوەی بایەخی زۆر پێ درابوو، تەماشاکەرانی ئەو شەوە زۆر پێی گەشکەداربوون.

لە سـاڵی ١٩٧١دا لە سلێـمـانی ئەم گـۆرانیی (إنتـبـاه)ە و (١٦) گـۆرانی ترم لە

---

(١) ڕەنگە خوێنەر لێرەدا وا تێ بگات کە ئەو فەرمانڕەواییەی عێراق گەلێ نیازپاک و دڵسۆزی کورد بووە، بەڵام ئینگلیز ناکۆکی خسـتـە نێـوانیـانەوە. ئەوەی نابێ لێی بەگومـان بین کـە ئینگلیـز وەک داگیـرکەری عـێراق و باشووری کوردسـتـان پێکەوە، بۆ زیاتر کۆنتـڕۆڵکردن و جێ قایمکردن هەمیشـە تۆوی دووبەرەکی نەک لە نێوان نەتەوە جیاجیاکاندا، بەڵکو لە ناو ڕۆڵەکانی یەک نەتەوەشدا دەچاند و هەر بۆی بکرایە بەگژیەکـیـدا دەدان، بەڵام خۆ وەنەبێ حوکـمـەکەی بەغداش لەو باشـتربووبێ لە مامەڵەکردنیدا لەگەڵ کورد، ئەی ئەو دروستکراوی ئینگلیز نەبوو؟ جا بۆیە ناکۆکییەکە خۆی هەر هەبوو، بەڵام بەداخـەوە لەو حـەلەدا زۆر کـەس بەتایبـەت ڕووناکـبـیـر و خـوێنەوارەکـان بەهەڵـە لە هەڵوێسـتـەکـانی بەغـدا دەگـەیشتن. وەک هەمـوو سـەردەمێ، کـۆمـەڵێ لەوانە، دەبوونە ئامـرازی جێبەجێکردنی نیاز و مەبەستە پیسەکانی ئەو حوکمەتە و ئەوانی دی کە بەدویدا دەهاتن.

نووسراوه بچکۆلەکه، خسته سەر کەلافەیەکی تۆمارکار، بەدەنگی خۆم، لەگەڵ وتارێکدا کە لە بابەت مێژووی ئەم گۆرانییانەوە تۆمارم کردبوو، لەبەردەم کۆڕێکی گەورەی نووسەرانی کورد و هونەرمەندانی ساز و ئاواز و گۆرانی و لاساییکردنەوە و ڕۆشنبیران خوێندەوە و تکام لێکردن کە بەهەموویان هەوڵ بدەن ئەم گۆرانییە نیشتمانییە نازدار و بەکەڵکانە بۆ سوودی شاگردەکانمان زیندوو بکەنەوە.

لە ساڵی ١٩٧٤دا لە بەردەم کۆڕێکی وێژەیی جیهانیدا، کە ڕۆشنبیرانی کوردی خۆیشمان تێیدا بەشداربوون، لە شاری (بەیرووت)دا، لە ئاهەنگی دوا کۆبوونەوەماندا، لەسەر تۆمارکارێک، ئەو وتارەم و ئەو (١٧) گۆرانییەم کە بەدەنگی خۆم تۆمار کرابوون، دا بەگوێیاندا، لەگەڵ هەندێک قسەی ڕۆشنکردنەوە کە لەو بابەتەوە بەزمانی ئینگلیزی کردم. گوێگرەکان کە زۆربەیان بێگانەیش بوون، بەکوردەکانی عێراق و تورکیا و ئێرانەوە، زۆربەیان پەسەندیان کرد.[٢]

لە ١٩٧٧/٣/٢٠دا نامەیەکی دوورودرێژم بەزمانی عەرەبی بۆ کارگێڕی (ڕادیۆی کوردی) لە بەغدا نووسی. لەگەڵ کەلافەیەک کە ئەو وتارەی خۆم و هەر (١٧) گۆرانییەکەی تێدا تۆمار کرابوو، بەدەنگی خۆم. بۆ ئەمەی بەسایەی دەستەی ساز و ئاواز و گۆرانی و لاساییکردنەوە و سەرلەنوێ زیندووی بکاتەوە و بڵاویشی بکاتەوە. هەر بەو چەشنە لە ١٩٨٠/١/٢٧یشدا نامەیەکم نارد بۆ (ئەمینداری گشتیی ڕۆشنبیری و لاوان) لە شاری (هەولێر) بەزمانی عەرەبی، لەگەڵ کەلافەیەک کە ئەو وتارەی خۆم و هەر (١٧) گۆرانییەکەی تێدا تۆمار کرابوو، بەدەنگی خۆم، بۆ ئەمەی بەسایەی دەستەی ساز و ئاواز و گۆرانی و لاسایی کردنەوەوە لە (ئێستگەی ڕادیۆی هەولێر)دا سەرلەنوێ زیندووی بکەنەوە و بڵاوی بکەنەوە. جا هەروەک لەسەرەوە پیشانم داوە، لە هەموو دەرفەتێکدا، خەباتم کردووە گۆرانی (إنتباه)ەکەی (شێخ نووری) و گۆرانییە نیشتمانییەکانی تریشمان، لەلایەن تیپەکانی ساز و ئاواز و گۆرانی و لاساییکردنەوە، زیندوو بکرێنەوە، تا بەرچاو و دڵی هەمووان بکەوێ ئاواتی کوردپەروەرانیش هەر ئەمەتا کە ڕۆژێک لە

(٢) مامۆستا مەبەستی لە (کۆنگرەی پەرچڤەکردن)ەیە کە لە ١٩٧٤/٣دا لە بێروت گیراوە، بەئامادەبوونی هەندێ ڕووناکبیری کورد و جیهان وە لە لایەن (جمعية الكتاب المقدس و کۆڕی زانیاری ئەڵمانیای ڕۆژئاواوە) ڕێکخرابوو... بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: یادداشتەکانی شاکیر فەتاح - کتێبی یەکەم - هەر لەم پڕۆژەیەی دەزگای ئاراس. ئاوێنەی ژینم ل ٦٠١-٦٠٢.

ڕۆژان لەلایەن ئەو دەسگایانەوە و ئەو تیپانەوە کە لەمەوپێش ناوم بردن، ئەم گۆرانییانە سەرلەنوێ زیندوو بکرێنەوە و بلاویش بکرێنەوە و لەناو ڕادیۆ و لەسەر پەردەی تەلەفزیۆندا پیشانی گوێگران و تەماشاکەرانی کوردەواری بدرێن. پێش ئەمەی وتارەکەم تەواو بکەم، حەز دەکەم سوپاس و ستایش و ڕێزی خۆم پێشکەشی ئەو سێ نووسەرە بکەم، کە نووسراویان لەسەر (شێخ نووری شێخ سالح) داناوە. لە ڕاستیدا هەرسێکیان شایستەی ئافەرین و پەسندکاری و سوپاسی هەموو کوردپەروەرێکن، چونکە بەنووسراوەکانیان سەری کوردیان بەرزکردۆتەوە.

ئەوەندەی پەیوەندی بەنووسراوەکانی (دکتۆر کامل حەسەن عەزیز بەسیر) و (مامۆستا موسلح مستەفا جەلالی)یەوە هەیە، سوپاس بۆ خودا لە کاتی چاپ کردنیاندا تووشی تەنگوچەڵەمە و گیروگرفت و کەندوکۆسپ نەبووبوون. چونکە دەسگاکانی (کۆڕی زانیاریی عێراق/دەستەی کوردی) و، (ڕۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی) لەسەر ئەرکی خۆیان بۆیان چاپ کردبوون.

بەلام نووسراوەکەی کاک (ئازا عەبدولواحید)، چونکە زۆر گەورەتر بووە لەهی ئەوان و لەسەر ئەرکی خۆی چاپکراوە و یارمەتیی (دەسگای ڕۆشنبیری و لاوان)یش ئەوەندە نەبووە کە بەشی بکات بۆ چاپ کردن، تووشی گەلێک تەنگوچەڵەمە و گیروگرفت و کەندوکۆسپ و، دەردی سەری و ناحەزی و وام (قرض) وەرگرتن بووە. تەنانەت هەندێک لە دڵ ڕەشانیش بەدزییەوە هەوڵیان داوە تەگەرە لە خەباتی بدەن و نەهێڵن چاپکردنی نووسراوەکەی سەربگرێ، یاخود هاش و هووشیان کردووە لەژێرەوە کە نەفرۆشرێ و هانەی وامدارەکانیشیان داوە کە زوو پارەکانی لێ بسێننەوە و لە بەڵێنەکانی خۆیشیان پەشیمان ببنەوە! لە سەروو ئەمانەشەوە، کزی بازاڕی نووسراو. جا دەبینین،... لەگەڵ ئەم هەموو بارە ناهەموارانەدا، ئافەرین بۆ (ئازاد) کە کۆڵی نەدا و ورەی بەرنەدا و تا نەگەیشت بەکامی خۆی و نووسراوە نایابەکەی خۆی بەتەواوی لە چاپخانە چاپ نەکرد وازی نەهێنا...

(ئازاد) هەرچەندە ئەرک و ئازاری زۆر چێشت، بەلام بەهۆی ئارام و بەرگە گرتنەکەیەوە توانی بەسەر هەموو گیروگرفت و تەنگوچەڵەمەکانیدا زاڵ ببێ... نووسراوێکی نایاب و ناوازە و لێکۆڵینەوەیەکی گەورە و فراوانی لەسەر (شێخ نووری شێخ سالح) و بەرهەمەکانی پێشکەش بەخوێندەوارانی کورد کردووە، سەری نەتەوەکەی خۆیشی پێ

بەرزکردۆتەوە... ئەمەیش کارێکی پەسەندە کە پێویستە هەموومان پیرۆزبایی لێ بکەین.(*)

## هۆنراوەکەی (شێخ نووری)

### (إنتباه)

(لەسەر وەزنی: دێشب کە مەرا وضع...)

ئولادی وطن ئێمە کەوا میللەتی کوردین
بۆ غایەی ئاسایشی میللەت هەموو گوردین
شێرانە ئەوا معرکە ئارای وغا بووین
بۆ ڕشتنی خوێناوی عدو حاضری ڕاه بووین
لە پێشمانەوە هەروا، بەیداخی ظفر دەڕوا
ڕیشەی عدو بادەرێنین، حق بەدەستی خۆمان بسێنین
بۆ ئەمانی مظالم سوارانی جەنگیی
تەپڵی بازییان لێدا بەشۆخ و شەنگی

باوک:

لەم وضعە گەر ئەی دوشمنی کورد ئێوە دەپرسن
ئەم هەمهەمەیە میللەتە هەڵساوە بترسن
کفن بۆ خۆتان ببڕن. هەر لە ئێستاوە بمرن

---

(*) کاک ئازاد عەبدولواحید لە چوارشەممەی ٢٠٠٢/٨/٢٨ لە هەولێر، بەدرێژی باسی ئەو ئاستەنگ و تەگەرانەی بۆ کردم کە کەسانێکی ناحەز و خۆویست لەبەردەم چاپکردن و پەخشی ئەو دوو بەرگەی دیوانەکەیان دادەنا و بەزۆر شێوەی دوور لە هەڵسوکەوتی ئەدیب و ڕوناکبیرەوە بەربەرەکانیان کردووە... مەسەلەکەش لەوە زیاتر نەبووە کە وەک لەمەوبەر باسمان کرد ویستراوە ئەو دیوانەی بەناوی خوالێخۆشبوو (موسلح جەلالی)یەوە ئامادە کراوە پێشکەوێ و زووتر بخرێتە بازاڕەوە!! خۆ کە دوو بەرگەکەش چاپ کرا، پڕ بوو لە هەڵەی چاپ و نارێکی لە ڕووی هونەرییەوە، هەرچەندە لە کاتی خۆیدا لیستێکی دوور و درێژی ئەو کەموکوڕی و هەڵەی چاپانە لە (هاوکاری)دا خرایە بەرچاو خوێنەران، بەڵام ئەمە ئەو نالەباری و ئەقڵە منالانە و ناکاملانەی هەندێ لەوانە پیشان دەدات کە داسەپاون بەسەر نێوەندە ئەدەبی و ڕۆشنبیریەکەماندا.

لازمه لەبەر غەم و حَسْرَت، بێ ئەشکرێژی مذلت
ئـەی دلاوەرانـی وطـن وەرنـە إمـــــــــداد
باوک بەپەرۆش لێـــتـــان ئەکـــا اســـتـــمـــداد

***

کــوردانی غظنفـر شکەنی مـعـرکـە ئاغــوش
نابێ بکەن ئەم باوکی خــۆتانە فــەرامــوش
زێرا کـــە دوو چاوی أبدیی ئێـــمـــە لە گــۆڕا
چاوی لە ظفــرتانە لە حـەرب و شـەڕ و شــۆڕا
باوک بەقــوربانتـــان بێ. ڕۆحـەکـەی فـداتان بێ
وقــتی فـرصت و إتفـاقـە. ڕۆژی لابردنی نفـاقـە
ئارەزوو ئەکـــەم ئێـــوە وقـــتی إحــتــضـــار
بەشـــان و ظـفـــرەوە بمبـــەن بۆ مـــەزار.

دایک:

بۆ دفـعی مظالم لە مــوانع مـەکـە پەرهیــز
سادەس بدەرە شیـر و تفـەنگ، خەنجەری خوونڕێز
بۆ ئێوە کـەوا غـیـرەتە یەکـدەفـعـە ڕەگ و ئێسک
حـاشـاکـە بەحـزنێکی ذلیـلانەوە فـرمـێـسک
لە چاوم بێـــتـــو بتکێ، دڵم یەکــــذەررە بشکێ
چونکو ئێـوە جسـور ئەبینم، نامـێنێ ئازاری برینم
شـیـرەکـەم حـلاڵتـان بێ، ڕۆژی هیـمـمـەتە
ڕۆحـەکـەم فـداتان بێ، وقـتی غـیـرەتە.

منالەکان:

نجـمـەی أملی ئێـمـە هەمـوو بەم دەس و بردە
خـەڵقـینە لە بۆ مـسـعـدتی مـیللەتی کـوردە
مـەوتێ کـــە حـیـــاتی وطنێکی لە دوابێ
ســەد ژینی ذلیــلانەی یارب بەفـــدابێ
ئەو کـەسـانەی جـبـانن، مـعنای ژیان نازانن

مـردنێ له ڕێگای مـیللەتا، چاکـتـره له ژین له ذلتـا
هەر کـــەس خـــۆی بکا بەقـــوربانـی مـــیللەت
له قـــبـــرا هەتا مـــحـــشـــر ناکـــێـــشێ ذلت.

ئافرەت بەمندالەوە:

یـاران و ڕەفـــیـــقـــان و دلێـــر و یەلی کـــوردان
شـەڕ جـەژنی هەمـوومـانە بڕۆین بۆ صـفی مـەیدان
وقـــتێ کـــە بەتوفـــیق و ظفـــر دێنەوە لامـــان
ئەوسـا گـوڵ ئەکـەین ئێـمـە بەشـاباشی قـدمـتـان
گەر له ئێوه چەند کەس شهید بێ، لازمه عزای ئێمه عید بێ
ئەم پڵـنـگ بەچانەی وا إنـتـــقـــام ســـێنن
گـەورەیان دەکـەین ئێـمـە، حـقـتـان ئەسـێنن.

کچەکان:

ئێـمـه کـه نەمـانکردووه بۆنی چەمـەنی شـوو
مـجـهـولی نظرمـانه گـوڵ و نەسـتـەرینی شـوو
ئەم تازه جـەوانانه لەبەر سـیـرتی ئێـمـه
گـەر بێـتـو بکەن ئارەزووی شـرکـتی ئێـمـه
لازمه که عودت بفەرموون، بێنەوە بەڕوویەکی گوڵگوون
یعنی چیـهـره ڕەنگین بن، بەشـان و ظفـر
خـوێنی دوشـمن بڕێژن بەنووکی خـەنجـەر.

چەک بەدەستەکان:

ئێـمـه کـه مـسلح له دەر و دەشت و له شـارین
سوێندخۆری حضوری حق و باب و کەس و کـارین
بۆ مـسـعـدتی ئەم وطن و مـیللەتی کـورده
ڕیشـه و ڕەگی ظالم ببـڕین بەم دەس و برده
تا کـەی له زەحـمـتـا بین، لەناو مـذلتـا بین

لازمە بەکەیف و مسرت، ڕۆح بکەین بەقوربانی میللەت
ذاتەن ئێمە خولقاوین بۆ خدمت کردن
بۆ ئەوەی فیداکار بین تا ڕۆژی مردن. (**)

م. نووری

(**) ئەم گۆرانییەمان لە نووسراوی (گۆرانی کوردی) وەرگرتووە، کە لە ساڵی ١٩٢٥دا، لە سلێمانیدا، لەلایەن شارەوانی سلێمانییەوە لە چاپخانەی شارەوانیدا چاپ کراوە. (ش. ف).

سەرنج: سەرجەمی بەرهەمی شاکر فەتاح، بەرگی سێیەم، دەزگای ئاراس، هەولێر، کۆکردنەوە و ڕێکخستنی: ئەحمەد سەیدعەلی بەرزنجی، ٢٠٠٤، ل ٣٠١ - ٣١٧.

# فەرهەنگۆک

## ئـ

ئاتەش کەدە: ئاگردان، ئاگردانی پەرستگاکانی زەردەشت.

ئاخیرەت: ڕۆژی قیامەت، جیهانی دووەم.

ئاسار: کۆی (أثر)ە. هەموو شتێکی کە وێنەی مابێتەوە، شوێن پێ.

ئاسیب: زیان، زەرەر.

ئاسیاب: ئاسیاو، ئاش.

ئاشفتە (ئاشوفتە): پەرێشان، ئاڵۆز و شێواو.

ئاشیانە: هێلانە.

ئاغاز: سەرەتا، دەست پێ کردن.

ئاغووش: باوەش، باخەڵ، هەمێز.

ئافاق: ئاسۆ، هەموو دنیاش دەگەیەنێ.

ئافات: بەلا، زیان، هەموو شتێ کە لە ناوبچێ، کۆی (آفة)یە.

ئافتاب: خۆر، هەتاو، ڕۆژ.

ئافەریدە: مەخلووق.

ئافەریدەکار: خالق.

ئاهن: (ف) ئاسن.

ئاهێستە: بەهێمن، لەسەرەخۆ، هێواشی.

ئالام: کۆی (ألم)ە، ئێش و ژان و ئازار.

ئامال: کۆی (أمل)ە، هیوا، ئامانج.

ئەبەد: بێ بڕانەوە.

ئەبر: (ف) هەور.

ئەبیەم: دەبیستم،

ئەختەر: (ف) ئەستێرە.

ئەخگەر: (ف) پشکۆ، پەنگر، سکڵ، پووڵوو.

ئەدنا: نزمتر، زەبوونتر.

ئەرکان: کۆی (روکن = رکن) کۆڵەگە، پایە، گەورەترین و بەهێزترین پارچە و بەش لە هەموو شتێک، شتی بنچینەیی.

ئەزەل: سەرەتای دروست بوون، ڕۆژی بناوان، هەر بووە و هەر دەبێ.

ئەسرار: کۆی (سر)ە، نهێنی.

ئەسفەلی سوفلا: ژێری ژێرەوە، بنی بنەوە.

ئەشک: (ف) فرمێسک.

ئەغیار: بێگانە، خەڵکی دوور.

ئەفسەر: تاج، تاجی پادشایان.

ئەفسوردە: کلاو، ساردبوون.

ئەفشان: بڵاوکەرەوە، ڕژاندن، پەخش.

ئەکوان: کۆی (کون)ە، هەرچی ئافەریدە و داهێنراوی عەرز و عاسمانە.

ئەلەست: ڕۆژی ئەلەست ئەو ڕۆژەیە کە خودا دنیای دروست کرد و لە ئەرواحی خەلقی پرسی (ألست بربکم؟).

ئەلەم ئەفزوود: (ف) دەردەدار.

ئەندوە: (ف) خەم.

ئەنسال: کۆی (نسل)ە، نەوە.

ئەنسار: أنصار، لایەنگیر.

ئەنوەر: هەرە ڕووناک. ڕووناکتر، درەوشاوەتر.

ئەنیس: خەم ڕەوێن، هاودەم، ئەوەی دڵ دەداتەوە.

ئەنین: أنین، ئازار، نووزە و نرکە.

ئەوج: (أوج) بڵندیی، بڵندترین، بەرزترین پلە.

ئەیوان: هەیوان، تاق، دیوەخانی شاهان.

ئەینەلمەفەر: (أين المفر) بۆ کوێ دەرچین؟ بۆ کوێ ڕادەکەی؟

ئیجلال: إجلال، گەورەکردن، بەرزکردنەوە.

ئیجمالی: إجمالي، پوختە و کورتە.

ئیتیهام: إتهام، تاوانبار کردن.

ئیحتیزار: إحتضار، گیانەڵا، ئاویلکە، ئاوزنگ دان، سەرەمەرگ.

ئێزەد: خوا، یەزدان.

ئێزەدی بێچوون: خوای بێ وێنە و بێ هاوتا.

ئیزتیراب: إضطراب، پەشێویی.

ئیستیخوان: (ف) ئێسقان، پێشە.

ئیستیغنا: إستغناء، بێ نیازیی.

ئیستیقبال: إستقبال، بەرەو پیرەوە چوون، پێشوازی.
ئیستیقلال: إستقلال، سەربەخۆیی.
ئیستیمداد: إستمداد، پەرەسەندن، بەهاوارەوە چوون.
ئیستیزلال: إستذلال، ملکەچی، سەر شۆری.
ئیستیقامەت: إستقامة، راستیی، راست بوونەوەی کارێک دوای خواری و خێچی.
ئیستیئناف: إستئناف، لەسەر ڕۆیین، دووبارەکردنەوە، چوونەوە سەر.
ئیستیهزا: إستهزاء، تەوس و لاقرتێ، گاڵتە پێکردن.
ئیزمیحلال: إضمحلال، لەناوچوو، پەڕاگەندە، بەرەو نەمان و نابووت بوون.
ئیعتیقاد: إعتقاد، باوەڕ.
ئیعتیلا: إعتلاء، سەرکەوتن، بەرزبوونەوە.
ئیقبال: ڕوو تێکردن، پێشوازی کردن، بەخت.
ئیقلیم: مەڵبەند.
ئیکراه: زۆری لێکردن، بەزۆر شتێ بەسەر کەسێکدا بسەپێنی کە خواستی خۆی لەسەر نەبێ.
ئیمتیحان: إمتحان، تاقیکردنەوە، ئەزموون.
ئیمداد: (إمداد) یاریدەدان، بەهانا گەیشتن.
ئین و ئان: (ف) ئەمە و ئەوە.
ئینشا: دروست کردن، وتنی قسەی جوان.
ئینقراز: قڕ تێکەوتن، لەناوچوون، کۆتایی هاتن بەجنس و توخم.
ئینتیقام: إنتقام، تۆڵە.
ئینقیلاب: إنقلاب، هەڵگێڕوداگێر، سەروبن.
ئیهمال: إهمال، پشتگوێ خستن، کەم تەرخەمی کردن.

## ب

باخەبەر: خەبەردار.
باسووق: دۆشاوی ترێی (ڕەش یان سپی) نەختێ ئاردی نیشاستەی تێدەکەن. لەسەر سینییەک دەیڕێژن، ئیتر دوایی دەمەیی و خەست دەبێتەوە و وەکو هەویری لێدێ. دوایی بەچەقۆ قاڵب قاڵب دەیبڕن.
باعیس: باعث، هۆ، سەبەب.
بەختە باران: مانگی مایس کە باران کەم دەبێتەوە و لەوانەیە بباریٰ یا نەباریٰ.
بەخشایشی خوا: خوا بەخشین و لێبووردنی زۆرە بۆ گوناه. هیچ باک و خەمت نەبێ.

بەدئەندێش: بەدخوا، بەددڵ، یەکێ بیری بەد بێ و خراپ بێ لە بارەی یەکێکی دی. نیاز خراپ.

بەدبیر: کارگوزار، ئیشکەر.

بەدنیهاد: نیەت و نیاز خراپی.

بەدنامی: بەدناوی، ڕیسوا بوون، ناوزڕان.

بەردووش: (ف) لەسەر شان و پشت، بەکۆڵەوەبوون.

بەرداش: بەردی ئاشی ئاو، کە گەنم و دانەوێڵە دەهاڕێ.

بەرگن: خوری ئەو کاوڕەیە، کە هێشتا نەبووە بە ساڵەوەختە، کە بوو بە مەڕ پێی دەڵێن (خوری) یان (ڕوینگ).

بەریدی خەیاڵ: پەیامی خەیاڵ.

بەسەر: بصر، بینین، چاو، دیدە.

بەسیرەت: بصیرة، بەرچاو ڕوونی.

بەقا: مانەوە.

بەکوللی: یەکجاری، هێجگاری.

بەلەک: جۆرە ڕووەکێکە ڕەگی هەیە، ڕەگەکەی دەردەهێنرێ و بۆ هەندێ کاروباری پیشەسازیی بەکاری دەهێنن و شیرینیشە.

بەندەگی: نۆکەری یان کۆیلایەتی.

بەندی جگەر: ڕیشەی جەرگ.

بەنی بەشەر: بنی بشر، مرۆڤ، ئادەمیزاد.

بەهەر سوو: (ف) بەهەر لادا، بەهەر شوێن. هەر جۆر.

براهمەن: پێشەوای ئاینی براهمییەکانە. لە شوێنی خۆیدا باسمان کردووە.

بوتکەدە: بوتخانە، پەرستگای بوتان.

بووزوو: لە ناوچەی ڕانیەدا بەکار دەهێنرێ. مەبەست شاڵی ڕانک و چۆغەیە، کە لە مەرەز دروست دەکرێ.

بورید: بڕاو.

بوریان: برژاو.

بونیاد: بنیات، دروستکراو. بنجوبناوان.

بنێمە کەنار: بنێمە لاوە.

بێ ئاشیانە: بێ هێلانە.

بێچوون: (ف) بێ هاوتا، بێ نەزیر، خوا، کە عەرەب بەخوا دەڵێن (لیس کمثله شيء).

بێ حەدد: بێ سنوور و کۆتایی.

بێخود: بێ هۆش، زەعیف، بێ حاڵ، بێ ئیختیار.

بێدار: نەنووستوو، خەو لێ نەکەوتوو، هۆشیار.

بێ ژەن: کوڕی (گیو) و خوشکەزای (ڕۆستەم) بووە، دڵی دەچێ لە (مەنیزەی) کچی (ئەفراسیاب)، جارێکیان (ئەفراسیاب) لە ماڵی کچەکەیدا دەیبینێ. دەیگرێ و لە چاڵێکدا بەندی دەکا. پاشان (ڕۆستەم)ی خاڵی دێت ڕزگاری دەکات.

بێ شومار: بێ ژمارە.

بێ گونەهـ: مەبەستی بێ (گوناح)ە.

بێ نەوا: بێ پەناو پشتیوان.

بی: صفصاف، دار بی.

بیروشەی خەو: خەوی قووڵ.

بیکران: بکر، نۆبەرە، سەرەتا و یەکەمی هەموو شتێک.

بیم: ترس، واهیمە، دوودڵی.

بیم ئاوەر: ترس هێنەر، ترسێنەر، ترسناک.

## پ

پارە پارە: پارچە پارچە.

پایەماڵ: ڕیسوا.

پەردەگوشا: پەردەکرانەوە.

پەژمووردە: ژاکاو.

پەرستش: پەرستن.

پەرستشگاهـ: معبد، شوێنی پەرستن.

پەرواز: فڕین.

پەرهێز: سڵەمینەوە، پارێز.

پەست: نزم، نەوی.

پەسمایە: (ف) بێ نرخ.

پەڵ: بەردی پڕ بەدەستی هاوێژراو.

پەڵە: پەڵە هەور.

پەڵە: پەڵە باران.

پەڵە: پارچە.

پەنهان: شاراوە، نادیار.

پەیک: نامەبەر، قاسید، تەتەر.

پەیکان: سەرەتیر.

پەیا: ئاسا.

پەیوەستە: پێکەوە لکاو.

پرتەو: ڕۆشنایی و تیشک.

پرتەو ئەفشان: پرشنگ هاوێژ، تیشک دەرەوە.

پرسە: پرسە، تەعزیە.

پرسش: پرسین.

پدەر: باوک، باب.

پسەر: کوڕ.

پشتێنی پێچکە لیرە: پشتێنی ئافرەت کە پلّپلّەکانی لیرە بێت.

پلووسک: ئەو تەنەکە یان دارەی لە سەربان دادەنرێت چۆڕاگەی بارانی پێدا دێتە خوارەوە، یان کانییەکی ئاو کە لە بەرزییەکەوە ئەو دارە کون کراوە یان تەنەکە چەمێنراوەی بۆ دادەنرێت تاکو ئاوەکە بەگلّری و کۆیی بێتە دەرەوە و بلاونەبێتەوە.

پوار: پوا، ڕزی، وردوخاش.

پێچ و تاب: ئەلّقە و لوول خواردوو.

پیشان: نێوچەوان، تەوێڵ.

پیری موغان: خاوەن مەیخانە.

## ت

تائیفە: کۆمەڵە کەسانێک، نەتەوە.

تاب: پێچ.

تابدار: بەپێچ.

تابان: درەوشەدار، تیشک دەرەوە، ڕووناک.

تارانی: پارەیەکی کۆنی عەجەمە، واتە ڕەشادییەکی عوسمانی، دوو قرووش، چوار عانە، (١٦) پوول.

تاعات: طاعة، پەرستن، مل کەچ کردن بۆ خوا و فرمایشتەکانی.

تالع: بەخت و چارەنووس.

تەجەللی: خۆ ئاشکراکردن، خۆ دەرخستن.

تەجەدود: نوێ، تازەبوونەوە.

تەجرەبە: تاقیکردنەوە، ئەزموون.

تەجهیز: ئامادە و تەیار.
تەئەمول: تأمل، ڕامان، بیرکردنەوە، خەیاڵ کردن، سەرنجدانی ورد، تێڕامان لە خۆ یان لە دەرەوەی خۆ.
تەئەننی: لەسەرخۆیی، ئارام و هێمنی.
تەتەر: نامەبەر.
تەحەمول: تحمل، خۆڕاگرتن لەبەر هەموو ناخۆشییەک.
تەختەنەرد: تەختەی یاریی تاوڵە.
تەدویر: لە (مدور)ەوە، کردنی بەشێوەیەکی بازنەیی.
تەرانە: گۆرانی، ئاواز.
تەرانەگۆ: گۆرانیبێژ، ئاوازبێژ.
تەرەقی: ترقي، بەرزبوون، بڵندبوون، پێشکەوتن.
تەرەب: شاد بوون، شادمان لە (طرب)ەوە.
تەرەننووم: گۆرانیی وتن، ئاواز دەرخستن.
تەرز: لق و پۆپی ڕاکشاوی ڕووەکی خشۆک وەکو کاڵەک و شووتی.
تەرغیب: ئارەزوو لا پەیدا کردن، بەڵام بە ئیرادە و دەسەڵاتی خۆی ئەو ئارەزووە پەیدا بێ.
تەڕکاڵ و دێمەکاڵ: ئەو زەوییەی بەراو بێت و کشتوکاڵەکەی ئاوی بێت.
تەزیین: (تزيين) جوان کردن، ئارایش کردن، ڕەونەقدان بە شتێ.
تەسویر: تصویر، دروستکردنی وێنەی کەسێک یان شتێک.
تەشپی: جۆرە قاپێکی پەلە، لە دار دروست دەکرێ.
تەشییعی جوسمانی: بەڕێ کردنی تەرمی مردوو.
تەقریر: نیشاندانی حاڵ، خستنە ڕوو، ئاشکرا کردن.
تەکرار: تکرار، دووبارەکردنەوە، پێداچوونەوە بەسەر شتێکدا.
تەلافی: لەناو چوون، نەمان.
تەمام: تمام، تەواو، هەموو، گشت، دروست.
تەمیز: دووبارەکردنەوەی بڕیاری دادگا، لای دادگای تایبەتی.
تەن: جسم، جەستە، لەش.
تەنگ دەست: هەژار و دەست کورت.
تەوەللا: هەڵوەدا، دوورخراو.
تەی: طی، پێچانەوە، قەدکردن، نووشتانەوە.
توربە: تربة، خاک و خۆڵ.
تورەیی موشکین:

توورڕە: ئەو دەستە مووەیە کە بەسەر نێوچەواندا دێتە خوارێ.

موشکین: نیسبەتە بۆ (موشک) کە مادەیەکی بۆن خۆشە لە ناوکی مامزی موشک دێتە دەرێ. مامزی موشک جۆرە مامزێکە وەکو نابی فیل دوو کەڵی درێژی هەیە، زۆرتر لە شاخەکانی هیمالایای هیندستان دەژی، لە ژێر زگی کیسەیەکی بچووکی وەک دوومەڵ هەیە ماددەیەکی پەیتی تێدا کۆدەبێتەوە. هەر کاتێکی کە کیسەکە پڕ دەبێ مامزەکە هەست بەئازار و خارشت دەکا، ناچار لە بەردی دەخشێنێ تا دوومەڵەکە دەتەقێ و ئاوی پۆرگەکە دەڕژێتە سەر ڕووی زەوی و وشک دەبێتەوە، ئەمە ماددەی موشکی بۆن خۆشە. مامزی تاتار و مامزی خوتەن و مامزی خەتاو مامزی موشکینیشی پێ دەڵێن. کەواتە ئەو دەستە مووە کە بەسەر نێوچەوانیدا هاتووەتە خوارێ ئەو دوو سیفەتەی هەیە:

١- بۆنی موشکی هەیە.

٢- ڕەشە، چونکە ڕەنگی موشکی هەیە.

تووڵی شەو: طول الليل، بەدرێژایی شەو.

توور: طیور، باڵندە، فڕندە، باڵدار.

توێخ: توێژاڵ، توێ، چەرم، پێست.

تیجوال: تجوال، هات و چۆ.

تیرەوتار: تاریک و نوتەک.

تیرەگی: تاریک، شەو.

## ج

جاه: پایە و پلە، شان و شکۆ، بەرزی، قەدر و قیمەت.

جان: گیانێکە دەزگای لەشی زیندەوەری لە ماوەی دیاریکراوی ژیانی ئەمْ سەرزەمینەدا پێ سپێرراوە.

جانان: دڵبەران، فارس بەجان و ڕەوان ناویان ناون.

جانی: پیاو خراپ و بەدکردەوە.

جاو: خام و بلووری ئێستایە، لە کاتی خۆیدا بەدەست پانە تەونی جۆلا چنیویانە و پێیان وتووە (جاو).

جاویدان: خلود، نەمری.

جەبان: جبان، ترسنۆک.

جەد: باپیر.

جەم: کوڕی تەهموورسە، یەکێکە لە شاهەنشاهە ئەفسانەییەکان، چوارەمین شاهەنشاهی پێشدادییانە بەپێی شانامە حەوسەد ساڵ فەرمانڕەوایی کردووە. جەژنی نەورۆز لە لایەن ئەوەوە بنیادنراوە، پیاڵەیەکی ئەفسانەیی هەبووە، کە لەو پیاڵەیەدا هەموو شتێکی دنیایی دەدیت. کورتەی ناوی جەمشیدە.

جەنەتولمەئوا: جنة المأوى. بەهەشتی حەوتەم، خۆشترینی هەموو بەهەشتەکان.

جەواڵ: هۆڕ، شۆلەکە لە بەن دەچنرێت بە تەون بەیەک تایی وەک گونییە یان بەدوو تایی وەک هۆڕ دروست دەکرێ.

جەوان: جوان، گەنج، لاو.

جگەری بورید: جگەری براو.

جوود: بەخشین، چاوتێریی، کەرەم.

جیلوە: پێشان دان، ئاشکرا کردن.

جینان: کۆی (جنة)، بەهەشت.

## چ

چاووگە: مصدر، سەرچاوە.

چاهی زەقەن: چاڵی چەناگە.

چاهی زەنەخدان: (ف) چاڵی چەناگە.

چەشمە: سەرچاوە، کانیی.

چەشم: (ف) چاو.

چەمەن: مێرغوزار، سەوزایی، چیمەن، زەوی سەوز و تەڕ، مێرگ.

چەمەنزار: جێگەیەک چیمەنی زۆر و فراوانی لێ بێ.

چراغ: (ف) چرا.

چست (چوست): چالاک، چاپووک، گورج و گۆڵ.

چیلکە و چەوێڵ: لقی باریک و وردی دار.

چۆڵی قفرە (چۆڵی قوڵفە): جاران بەڕێگای بەغدایان وتووە چۆڵی قفرە یان (قوڵفە). ئیشارەتە بەڕێگای نێوان سلێمانی - بەغدا (قفر) لە وشەی (قفراء - مقفر)ەوە هاتووە، واتە چۆڵ و بیابان.

چین و ختەن:

چین: ناوی ولاتێکە لە ڕۆژهەلاتدا.

ختەن یان خەتا: شارێکە لە ولاتی چین. ناوچەکانی باکووری چین کە بریتییە لە مەنشووریا و مەنگۆلستان و تورکستانی ڕۆژهەلات و بەشێکی سیبریا. لە شیعردا کینایەتە بۆ زوڵف و خەت و خاڵی یار، چونکە مامزی موشکی ئەوێ بەناوبانگ بووە، موشکیش ڕەش و بۆن خۆشە.

## ح

حاتەم: عارەبێکی هۆزی تەیە، کە بە دەهەندە ناوی دەرچووە.

حادیسە: ڕووداو، ئاشووب.

حەریم: ئەو بەشەی ئافرەتی تێدا ژیاوە لە ماڵە گەورەیەکدا یان پاشایەکدا.

حەزین: خەمناک.
حەسەد: ئیرەیی.
حەفلات: حفلات، بەزم و ئاهەنگ.
حەفید: نەوە، کوڕەزا و کچەزا.
حەق گۆ: ئەوانەی زمانیان بەقسەی ڕاست هەڵدێن.
حەلوەلا: هاوار و فریاد.
حەمییەت: غیرەت و ئازایی.
حەیران: حەپەساو، سەرسوڕماو.
حوزن: حزن، خەم، ناخۆشی.
حدوود: حدود، سنوور.
حیدەت: توندی، تیژی، تووڕەیی.
حیرس: حرص، مەیلی زۆر بۆ شتێک، ئارەزووی بەهێز.
حیسە: حصة، بەش.
حیشمەت: حشمت، ویقار و داوێن پاکی.
حلیف: حلف، پەیمان.

## خ

خاترجەم: دڵنیابە، بێ خەم بە.
خادیم: خزمەتکار، نۆکەر.
خار: دڕک.
خاروخەس: دڕک و پووش.
خاشاک: زبڵ و زاڵ، پروپووش، خڵتە.
خاکسار: خۆڵاویی.
خاکستەر: خۆڵەمێش، مشکی.
خانە: خانوو، ژوور، ماڵ.
خەجستەفەڕ: فەڕ و بەرەکەت هێنەر، پێ و قدووم خێر، موبارەک، بەپیت و بەرەکەت.
خەدەمات: خزمەتگوزاریی.
خەرابات: مەیخانە، شەرابخانە. لە بنجدا بەعەرەبی (خربات)ە. کۆی (خربة) بەمانای وێرانە و کاوولگە.
خەرار: چنینێکی شاشە، لە مووی بزن دروست دەکرێ، ئەوسا لە کۆندا هەرچی تووتنە دەکرایە

خەرارەوە.

خەستە: نەخۆش، دەردەدار.

خەسم: خصم، دوژمن، ناحەز.

خەلفەنەمام: لقی تازە ڕواو، یاخود ولژام.

خەممار: بادەفرۆش.

خەمیدە: کۆماوە، چەماوە.

خەندەفشان: ئەوکەسەی پێکەنین بلاو دەکاتەوە.

خریدار: کڕیار.

خزر: خضر، ناوی یەکێک لە نزیکان بەخوایە و مەرگی لێ دوورکەوتووەتەوە. دەڵێن ئاوی ژیانیشی خواردووەتەوە و هەمیشە هەر جوان دەمینێ.

خسووف و کسووف:

خسووف: گیران، کە بۆ مانگی دەڵێن.

کسووف: ڕۆژ گیران.

خورج: بەو دوو تاییبە دەڵێن کە لە کۆچ و باردا، کۆچەرییەکان شتومەکی نەختینەی تێدەکەن. وەک هۆڕ وایە، بەلام دەمەکەی لە سەرەوەیە. ئەوسا جێگەی کانتۆر و سندووقی گرتووە.

خوڕڕەم گوشادی: خۆشی و شادی، بەختیاری.

خورشید: خۆر، ڕۆژ.

خوسران: لە دەست چوون، دۆڕاندن، زیان کردن.

خولاسە: خلاصة، نویشکی هەموو شتێ، جەوهەری.

خولدزار: (خولد)، نەمری، بەهەشت.

خولدزار: بەمانای جێگەی نەمران، بەهەشت دەگرێتەوە.

خوم: (ف) کووپەی شەڕاب.

خونرێز: خوێنڕێژ.

خیرەد: عەقل و ئاوەز.

خیرەدمەند: زانا، دانا، هۆشیار، عاقل.

## د

دارک: دارکە بچووکەکەی ناو گەلا تووتنەکەیە.

دارماڵ: جاران «وشکەدان» وەکو گەنم و جۆ بە(مەن) و (تەنەکە) دەپێورا، ئنجا کە (مەن)ەکە یان (تەنەکە)کەیان پڕ دەکرد لەو وشکە دانە، پاشان دەیانپەست و دارێکیان بەسەری دادەهێنا. بەو کرداری دار بەسەر گەنم داهێنانە دەڵێن (دارماڵ). (پێوانەش) هەیە کە وشکەی دانەکە دەکرێتە ناو مەنێکەوە

یان تەنەکەیەکەوە، چەندی پێوە بەند بێت پێی دەڵێن (پێوانە).

دارولفنوون: زانست، نهضة، ڕێنسانس.

داری بەقا: دار البقاء، بەهەشت.

داری لیژنە: داری کەڵەکراو بۆ سووتاندن.

دانش: زانین، ئاگاداری.

دامی: (ف) داوی.

دانشوەر: دانا، عاقڵ، حکیم.

دەبدەبە: دەنگی پێی ولاغ، دەنگ و هەرای تەپڵ لێدان. ڕۆیشتنی پاشایان کە بەتەپڵەوە بەڕێ دەکرێن.

دەستەدوو: ئەو دارەیە کە دەکرێ بەپشتی هەوجارەکەدا، جووتیارەکە بەدەست دەیگرێ، تاکو هاوسەنگی هەوجارەکەی پێ ڕابگرێ، لەو کاتەی خۆی بەسەری دادەدا، تاکو قورس ببێ و بەزەویدا بچێ و هەڵی بدڕێ.

دەسماڵ: کۆڵوانە، جۆرە قوماشێکی سێ سووچییە ژنان دەیکەنە کۆڵیان.

دەفر: قاپوقاچاخ، حاجەتی شت تێکردن، دەوری.

دەنائەت: نەفس نزمی، نییەت پیسی.

دەوا: دواء، داوودەرمان.

دەوەن: درەختیلە.

دەهەن: زار، دەم، دەڵێن حەزرەتی یووسف لە ساڵە گرانییەکانی میسردا بەقسەی خۆش توانیویەتی متمانە بخاتە دڵی خەڵکەوە.

دەی: مانگی دەیەمی خورشیدی ئێرانییە، یەکەمی مانگی زستانە کە سەردەمی بەفر و باران و سەرما و سەختییە. مەولەوی دەڵێ:

ساقی باک نیەن جە سەردی دەی دەی
هەواوەش کەرۆن، نەشئەی نۆشای مەی

دەیجوور: تاریکیی تۆخ.

دراز: درێژ.

درەختی ساڵخوردە: درەختی ساوا، درەختی بەتەمەن بچووک، نەمام.

درەخشان: بریقەدەر.

درێغ: ئەفسووس، موخابن، داخی گران.

دڵڕوبا: دڵفڕێن.

دڵڕێش: دڵی بریندار.

دڵفریب: ئەوەی فریوی دڵ دەدا، ئەوەی دڵ دەبا.

دڵفیگار: دڵی بریندار، دڵی دەردەدار، زویر.

دڵی زار: دڵی ئازاردراو، دڵی شکاو.

دوجەیل: مەبەست سارای (دوجەویل)ە کە دەشتێکە مەجنوونی تێدا سەرگەردان بووە. وەک لەو شیعرەدا دیارە:

ئەمن مەجنوونم وێڵی دوجەیلم

ئاوارە لە شوێن زوڵفانی لەیلم

دوعا گۆ: ئەو کەسەی دوعا دەکا.

دوعای موستەجاب: ئەو کەسەی دوعای گیرا دەبێ.

دوکوم: حیساباتی هەموو قەزا و ناحییەکان و ناو شاریان کۆکردووەتەوە و سەرئەنجامەکەی ناونراوە (دوکوم).

دوودی هەناسە: دووکەڵی هەناسە.

دوون: نزم، نزم پەروەری. سپڵەیی.

دیار: کۆی (دار)ە واتە نیشتمان، وڵات.

دیبا: جۆرە قوماشێکی ئاوریشمییە، قوماشی ئاوریشمی ڕەنگاوڕەنگ لە عەرەبیدا بووە بە(دیباج).

دیرایەت: درایە. زانین، پسپۆڕی.

ڕ

ڕاه: ڕێ، ڕێگە.

ڕامی: ئۆقرە و ئاسوودەیی.

ڕەخشان: درەوشانەوە، ڕۆشنی.

ڕەخشندە: (ف) ئەو شتەی ڕووناکی دەدا، ڕۆشنایی دەر، بریقەدەر.

ڕەسەد خانە: مرصد، ئەو شوێنەیە کە چاودێری جووڵانەوەی ئەستێرەی لێوە دەکرێ.

ڕەستخێز: بعث، زیندووبوونەوەی ڕۆژی قیامەت.

ڕەعد: رعد، هەورە تریشقە، دەنگی هەور.

ڕەفعەت: رفعت، بڵندی جێگە، پلەی بڵند، مەزنی و گەورەیی و پایەداری.

ڕەم: ڕاکردن، بەمانای گەلەئاسکیش دێ، یان ڕاکردنی ئاسکە کێوییە.

ڕەند (ڕەندان): کەم ترس و بێ باک، زیرەک و چاپووک، فێڵباز، گوێ نەدەر.

ڕەوانی پاک: گیانی پاک.

ڕەوزەیی ڕیزوان:

ڕەوزە: روضة، گوڵستان، باخچەی گوڵ.

ریزوان: ریضوان، بەهەشت، واتە گوڵستانی بەهەشت.

ڕشێنە: پرژ، پرژی باران، بارانێکی کەم کە هەر ئەوەندە بێ ئاوڕشێنێکی زەوی بکات.

ڕوخی تابدار: (ف) ڕووی پڕشنگدار، ڕووی بریقەدار.

ڕۆژی وەصڵت: ڕۆژی سپی، ڕۆژی خۆشی و بەیەکتر گەیشتن.

ڕوفاه: رفاهیة، خۆشی و خۆشگوزەرانی، ئاسوودەیی.

ڕونما: ڕوو دەرکەوتوو.

ڕوخ: ڕوو، ڕوخسار، چەهرە.

ڕیققەت: رقت، ناسکی، نەرمی، تەنک.

ڕیحاب: گۆڕەپان، فراوان.

ڕێش: بریندار.

## ز

زاری: ناڵە، گریان، پاڕانەوە.

زایع: ضائع، بێ سوود، ون بوو.

زەدە: لە چاووگی (زدن)ەوە هاتووە، ئیسمی مەفعووله واتە لێدراو.

زەڕڕات: ذرة، شتی یەکجار بچووک، هەر یەکێکیش لەو شتە بچووکانەی لە هەوادا بڵاون و لەبەر تیشکی ڕۆژ دیار دەبن.

زەفەر: ظفر، سەرکەوتن، هیوا و ئامانج هاتنە دی.

زەقەن: ذقن، چەناگە.

زەکا: ذكاء، زیرەکی.

زەل: جۆرە گیایەکی درێژە، وشک دەکرێ، دەیبەستن بۆ گسک دروست کردن، یان بۆ پەردووی خانوو بەکاری دەهێنن. لە کوێستاندا (گەنمە) دەبەستن بۆ گسک دروست کردن. بەعەرەبی (ذرة المكانس)ی پێ دەڵێن.

زەمزەمە: ویرەویر.

زەنگەقلیشە: داری بەڕووی وشک و ناوقەد ئەستوور کە بەتەور دەیقلیشێنن و پارچە پارچەی دەکەن، ئەو پارچانە پێی دەڵێن زەنگەقلیشە.

زەوال: زوال، نەمان، لەناو چوون، فەوتان.

زەی: ذی، خاوەن.

زوبانی حاڵ: ئەو وەزعەیە کە ئادەمیزاد ڕاز و نیازی ناوەوەی خۆی تێدا دەردەخات، واتە زمانی دڵ.

زوڵمەت: تاریکایی.

زومرە: دەستە، گرووپ، تاقم.

زوننار: پشتێنی مەسیحییەکان، ئەو پشتێنەیە کە پیاوە ئاینییەکانی مەسیحی واتە (قەشەکان) لە پشتی خۆیانی دەبەستن، تا لە موسڵمانەکان جیا بکرێنەوە. ئەو پشتێنەیە کە سەلیبییەکان لە کاتی شەڕدا دەیان بەست و خۆیان پێ شەتەک دەدا بۆ گورج بوونەوە.

زیافشان: ڕووناکی پڕژێن.

زیلال: ظلال، سێبەر.

زی: دڕکە زی.

زیندەگیی: ژیان.

زیندەدار: بێدار.

زینهار: ئاگات لە خۆت بێ، نەکەی، دەخیلە.

## س

سابیت: ثابت، جێگیر، قایم، پێی لە جێی خۆی بێ و نەبزوێ.

ساغر: (ف) پیاڵەی مەی، قەدەحی مەی.

سالار: سەرۆک، سەردار.

ساڵی گوزەشتە: ساڵی ڕابردوو، ساڵی پار.

سانیحات یان (سونحەت): لە (سنوح)ەوە هاتووە، واتە دەربڕینی بیروڕا بەشێوەیەکی جوان. هەر شتێک بەدڵ خۆشی بێ.

سەبا: صبا، بای بەیانیان.

سەبات: ثبات، جێگیریی و نەبزووتن لە شوێنی خۆی.

سەبت: ثبت، ئۆقرە گرتن، قەرارگرتن.

سەبزە: سەوزایی.

سەبەل: جاران بەتەراخۆما وتراوە سەبەل.

سەبوو: (ف) گۆزە.

سەتوەت: دەست بەسەرداگرتنی زۆرەکی.

سەحەر: نزیکی بەیانی، سپێدەی بەیانی.

سەحەر ئەنگووت: هاتنی وەختی سەحەر، کاتی سەحەر هاتووە.

سەحنەیی میحنەت: مەیان سەرای میحنەت، گۆڕەپانی میحنەت.

سەراب: تراویلکە، لە بیاباندا پیاو لە دوورەوە شتێک دەبینێ بەئاوی دەزانێ، بەڵام ئاوێک لە ئارادا

نییە و چاوی فریو دەخوات، بەوە دەڵێن سەراب.

سەرد: سارد.

سەرزەدە: ئەوەی ڕووی دابێ و سەری هەڵدابێ، لەپڕ.

سەراسیمە: سەرلێشێواو، سەر سوڕماو.

سەرمەدییەت: ئەوەی سەرەتا و کۆتایی نەبێ. هەمیشەو بێ بڕانەوە.

سەرنگوون: سەراوژێر.

سەرگەشتە: سەرگەردان.

سەرووی سەهی: سەرووی زۆر بڵند و بەرز و ڕێک.

سەفاهەت: کەم عەقڵی و نەزانی، بێهۆشی.

سەفحە: ڕوو.

سەفیل: سەفیل و ڕەزیل دەگوترێ، سەرکز، ئەوەی لە ژێرەوە بێ.

سەفینە: سفینة، کەشتی، پاپۆڕ.

سەف: ڕیز.

سەقم: سقم، نەخۆشی.

سەمەر: ثمر، بەر، بەروبووم.

سەمەردار: بەردار.

سەمەن: سێ پەڕە.

سەنا: ستایش کردن، مەدح.

سەودازەدە: عاشق، شەیدایی عاشق.

سەوقی قەزا: مل کەچ کردن بۆ فەرمانی پێکهاتووی خودا.

سەهی: ڕاست و بێ گرێ.

سەیلی ڕەوان: فرمێسکی ڕەوان.

سەییاد: صیاد، نێچیرەوان، ڕاوچی.

سروورخواهان: ئەوانەی بەدوای کەیف خۆشی و ڕابواردندا دەگەڕێن.

سزاوار: (ف) شیاو، موستەحەق، لایق.

سوفلە: سەر بەرەو خوار.

سکووت: بێ دەنگی، ماتی، کپی.

سنجاق: ئالا، سنجاق.

سواڵەت: قاپێکە لە مس دروست کراوە، ئاوی تێ دەکرێ و بۆ باڵندە و ئاژەڵ بەکاری دەهێنن.

سوبحدەم: کاتی بەیانی، سەرەدەمی بەیانی.

سوپەر: بەکوردی پێی دەڵێن (سپێر) واتە (موضع) کە بۆ خۆ شاردنەوە دەچنە ناوییەوە .
سوحبەت: کۆڕی هەوالان.
سوخەن: قسەکردن، کەلام.
سوخەنداں: نووسەر، شاعیر، ئەوەی قسەی ڕاست و جوان بنووسێ و بڵێ، قسەزان. بەواتای تێکشکانیش دێ یان ڕووخان.
سوداع: صداع، سەریەشە.
سیا: ڕەش، تیر و تاریک.
سیاپۆش: ڕەشپۆش.
سدق: صدق، ڕاستگۆیی، ڕاست وێژی.
سیرەت: ڕەوشت.
سینان: سنان، سەره ڕم.
سینە چاک چاک: سینە لەت لەت.
سیواک: ئەو دارە سەر بەڕیشوالەیە کە مەلا لە پێش نوێژ و کاتی دەستنوێژ شووشتن دەیهێنێ بەددانیاندا.

## ش

شاخسار: (ناوە)، بەشی سەرەوەی درەخت کە پڕە لە لق و چڵ و پۆپ، هەندێ جار هەر بەمانای لق و چڵ دێت، هەندێ جار لە بری «شاخسار» بە«شاخسارە» دێت.
شامات: واتە شای شەترەنج لە کار کەوت و مرد.
شەئن: شأن، پایە، بەمانای (دەربارە)ش دێ.
شەبستان (شەبوستان): مەحرەم سرا، جێی نووستن.
شەتاب: خێرا، زوو بە زوو، دەستوبرد کردن.
شەتب: ڕەشکردنەوە، کوژانەوە.
شەشدەر: شەش خان، زاراوەیەکە لە یاری تاوڵە (نەرد)دا بەکار دەهێنرێ. بریتییە لەوەی کە یەکێ لە دوو یاریکەرەکە شەش خانی لای خۆی بگرێ، بەمە بەرامبەرەکەی دەبەستێتەوە و ناتوانێ پوولەکانی خۆی ببزوێنێتەوە.
شەعشەعە: ڕووناکایی و تیشکدان.
شەڕابی ناب: شەڕابی بێ خەوش (خالیس)، ئەو شەڕابەیە کە (٤٠) ساڵ لە کوپەدا بمێنێتەوە، چونکە تا کۆن بێت باشترین شەڕابی لێ دەردەچێ، بۆیە لە ناو فارساندا وتوویانە شەڕابی (٤٠) ساڵ و کچی (١٤) ساڵ.
شەککەرشەکەن: دەنگخۆش، یان بەشەکر لە دەم تەشبیە دەکرێ، لەب شەککەریش لە فارسیدا بۆ ئەو

ئافرەتانە بەکار دێت کە سەرووی لێویان چاڵێکی بچووکی تێ کەوتبێ.

شەهد: هەنگوین، شیلەی هەنگوین.

شەهی: پادشایی.

شمشاد: داری شمشاڵ.

داری شمشاد، دارێکی هەمیشە سەوزە، گەڵای خڕ و ورد و بچووک و ئەستوور و تیشکداری هەیە. دارەکەی ڕەق و پتەوە. بۆ دروستکردنی شتی جوان بەکاردێت.

شمشاد مییان: قەدبارێک.

شوعاع: شعاع، تیشک، تیرێژ.

شوعلە: کلپە، گڕ.

شوعلە ئەفزا: چرا نیشاندان.

شوهرە: شهرة، نێوبانگ.

شۆر: قیامەت.

شۆر و نشوور: ڕۆژی قیامەت و زیندووبوونەوەی مردووان.

شۆک و دۆشاو: دوو جۆر شیرینین لەسەر گەڵای دار بەڕوو کۆ دەبنەوە، دەگیرێن و دەکرێن بە(گەزۆ).

شیفتە: شێواو، عاشق، سەرگەردان.

شیقاق: دووبەرەکیی.

## ع

عاریز: عارض، دەموچاو، ڕوو.

عالی جەناب: وشەی ڕێز گرتنە بۆ گەوران.

عەسر: عصر، چەرخ، زەمانە.

عەهد: عهد، پەیمان، دەوران.

عەفاف: عفاف، پاک و بێگەرد.

عەیان: ئاشکرا، دیار.

عوشرەت: (عشرت) دۆستایەتی، ژیان لەگەڵ یەکتریدا.

عوزار: (عذار) مووی سەر نێوچەوان. ڕوخسار، ڕوومەت.

عوقدە: عقدة، گرێ.

عوقدەگوشا: گرێی کراوە.

عومرێکە: زەمانێکە.

عیسمەت: خۆ پاراستن لە گوناە و تاوان.

عیشوه: ناز و کریشمه، لووت بەرزی و لە خۆبایی بوون لە ڕووی جوانییەوە.
عیففەت: داوێن پاکیی.

## غ

غار: ئەشکەوت.
غەزەنفەرشکەن: شێر بەزێن.
غەم ئالوود: ئەوەی لەگەڵ غەم ڕاهاتبێ، ڕەفیقی خەم، تێکەڵی خەم.
غەمگوسار: غەمخوار.
غەمنیشان: نیشانە غەم.
غەنیمەت: غنیمة، دەسکەوت.
غوبار: غبار، تۆز و گەرد.
غوسسە: خەم.
غولیازەدە: خولیا لێدراو، خولیا لەسەری یەکێکی دابێ.
غەمزەدە: لارەوەبوو، ئەو کەسەی خەم لێی بدات.

## ف

فاریغ: فارغ، بێ ناووک، بۆش و بەتاڵ.
فاسق: ئەوانەی ڕوویان لە ئاین و خوا وەرگێڕاوە و دەستیان داوەتە کاری دنیایی.
فاشی: (ع) مەبەستی لە درکاندن و خستنە ڕووە.
فانی: لەناو چوو، نەبوون.
فەجاعەت: کارەسات.
فەجر: فجر، بەرەبەیان.
فەرەح: فرح، خۆشی.
فەریاد: هاوار.
فەزڵ: فضل، بەخشین، چاکە کردن، یاریدەدان.
فەزیلەت: پیاوەتی و چاکە کردن.
فەقید: فقید لە (فقد)ەوە هاتووە، لەکیس چوو.
فەلەک پەیما: فەلەک ئاسا.
فەنا: فناء، لەناوچوو.
فەنەر: چرادان، چرای ناو شووشە.
فەیز: فیض، بەرەکەت، بەهرە گەیاندن، ئاوی زۆر، سەرڕێژ.

فەیزوباب: فیضباب، فەڕ و بەرەکەت، بەختەوەر و ئاسوودە.

فتوور: سستی.

فراز و نشیب: بەرزی و نزمی زەمانە و ڕۆژگار، هەوراز و نشێو.

فرۆمایە: (ف) پەست، نزم، نەوی.

فریب: فێڵ، مەکر، هەڵخەڵەتاندن.

فریو: دەسخەڕۆ، خەڵەتان.

فوتووەت: فتوة، هەڕەتی لاوێتی.

فوغان (فیغان): شین و شەپۆر، فەریاد، هاوار و داد.

فیرت: فرط، زۆر کردن.

فیراق: فراق، جیابوونەوە، دەست لەیەک بەردان.

فیگار: دڵ بریندار و زویر.

## ق

قەدەح نۆش: مەی خۆر.

قەدەم: بەرپێ.

قەدیمولعەهد: قدیم العهد، کۆن، دێرینە.

قەرەقۆش: پادشایەکی زەبر بەدەست بووە.

قەعر: قعر، بن، ژێر.

قەلعەچی (قەلعەدار): پاسەوانی قەڵا.

قەڵەم قەڵەم: دەفعە دەفعە، دەڵێ هەرچی لە عەمارەکەماندا هەبوو بەیەک قەڵەم فرۆشتم.

قەوسەینی ئەو ئەدنا: دەگوترێ (قاب قوسين أو أدنى) کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە لە کاتێ کە پێغەمبەر (د.خ) چووبووە دیداری خوا. واتە بەئەندازەی ژێ کەوانێک.

قەیتوول: جێگەی لەشکر، قەڵا.

قدووم: هاتن.

قشپل: لە ناوچەی سلێمانیدا پێی دەڵێن (پشقل).

قفرە (قوڵفە): بەعەرەبی (قفراء)، چۆڵیی، سارایەک کەسی تێدا نەبێ.

قوتب: قطب، پیری هەرە پایە بەرز لە تەریقەتدا.

قوتبی ڕەببانی: پیری هەرە پایە بەرز لە تەریقەتی ئیلاهیدا.

قووت: خۆراک، خواردەمەنی.

## ک

کارەبای زەرد: جۆرە مووروویەکی زەردی سووکە، کە لە شتی دەخشێنی، گەرمایی پەیدا دەکات و پووش و پەلاش وەک موگناتیس لەگەڵ خۆی ڕادەکێشێ.

کاشانە: کۆخ، خانووی بچووک، خانووی هەژاران.

کامیاب: بەختیار، بەمراز گەیشتوو.

کامیابە دڵ: دڵ بەئاوات و مراز گەیشتووە.

کەدەر: خەفەت، ناخۆشی.

کەشک: لە مەنجەڵێکدا (دۆ) دەکوڵێنن تا بۆ خۆی سەردەدا، ئنجا بەتوورەکەی شیرێژی دادەکەن، بۆ ئەوەی بچۆڕێتەوە و خەستییەکەی بگرن. دوایی کابان دێت و دەری دەهێنێ و بەدەست دەیگووشێ و بۆ وشککردنەوە لەسەر سەبەتەی دادەنێ، خوێشی تێ دەکرێ بۆ ئەوەی خەراپ نەبێ.

کەشمەکەش: کێشمەکێش، گێرە و کێشە، تەنگوچەڵەمە، بگرە و بەردە.

کەفەن: (کفن) جلی مردوو.

کەڵەمە: ئەو دوو دارە باریکەیە، کە لە نیلەکەوە (نیر) دەرهاتووە لە ژێر ملی گاکەوە دەبەسترێت بۆ ئەوەی نیلەکە ملی گاکە قایم بکات.

کەمتەر: کەمتر، ئەحقەر، نزمتر.

کەوسەر: ناوی ڕووبارێکی ئەفسانەییە لە بەهەشتدا.

کەوی مەدان: کەوی بنار. کاتێ کەو لە بەیانییان دێتە بنار و دەخوێنێ و سەر لە ئێواران دەچنەوە سەر شاخ و کێوەکان. زۆرتر لە ناو مەنگورەکان بەکار دێ.

کەیل: ئەوەی ئارەزووی هەیە، هەڵبژاردە.

کولبە: زنج، کوختە، گۆشە. خانووی دەروێشانە.

کلێسا: کنیسە، جێگا و شوێنی پەرستنی مەسیحییەکان.

کوناودەر: کون بەدەر، کون تێکردن.

کووچە: کۆڵان، گوزەر.

کۆ: لە (کوبەکو)ی فارسییەوە هاتووە. کۆڵان. گوزەر.

کۆسار: ئەو جێیەی شاخ و کێوی زۆری لێیە، جێی شاخاوی.

کینەوەر: کینە لە دڵ.

## گ

گاه: تاوێ، جارێ.

گەزۆ: داربەڕوو و دارمازوو لێی دەبارێ.

گەردووش (گەردش): چەرخ، ڕۆژگار، گەردوون.

گەواهـ: شایەت

گرۆهـ: دەستە، تاقم، کۆمەڵ، گرووپ.

گریبان (گریب): یەخە، بەرۆک، پێسیر.

گرێ پێچ: لوول خواردوو.

گوزەشتە: ڕابردوو.

گوڵعوزار: کینایەتە، مەبەستی زوڵف وەکو گوڵە.

گۆڵگوون: گوڵ ڕەنگ.

گوڵنار: گوڵ هەنار.

گومراهـ: ئەوانەی ڕێیان لێ گووم بووە، سەرلێشێواو.

گورد: ئازا.

گوشا: کرانەوە، فراوان بوون.

گووم: ون، بزر.

گیرایە خوارەوە: داگرتنە خوارەوە، هێنانە خوارەوە.

گیرودار: بگرە و ڕابگرە، بەمانای شەڕ و شۆڕیش دێ.

گیسوو: بسک، کەزی، پرچی هۆنراو.

## ل

لاسدان: فریودان، خەڵەتاندن.

لاکێش: فەرشی لاکێشی مەبەستە.

لامونەناهی: لامتناهي، تاهەتایە، بێ کۆتایی.

لاهووت: خواوەندی، (ئیلاهی) لە ئەسڵەوە (لاهـ) بووە، واتە (اله) (وت)یشی بۆ موبالەغە چووەتە سەر. وەکو (وت)ی (جبروت) و (ملکوت).

لایق: پڕ بەپێست، شایان.

لایوفنا: لایفنی، لە ناو ناچێ.

لەبالەب: پڕ، لێواولێو.

لەب شەککەر: لە ناو فارساندا ئەو ئافرەتانەی سەرووی لێویان چاڵی تێ کەوتبێ پێیان دەڵێن لەب شەککەر، واتە لێو وەک شەککەر شیرین، لێو شیرین.

لە زاوییەی من: لە نەزەر منەوە، لە لایەن منەوە.

لەشکری جوود: لە شکری سەخا، بەلێشاو، بەرچاو تێربی.

لەعل: جۆرە گەوهەرێکی سووری بەنرخە.

لەمعان (لمعة): ترووسکە.

لە ناحییەی من: لە تەرەف من، لە لایەن منەوە.

لەوحی پیشان: تەختی تەوێڵ، ناوچەوان.

لە هەر سوو: لە هەر لاوە.

لە هەر دامانی شەو: لە هەموو دامانی شەو.

لۆندەرە: جاران واتە لە زەمانی عوسمانلی لە سلێمانی بە(لندن) گوتراوە (لۆندەرە).

لیباس: بەرگ، جلوبەرگ.

لیژنەی دار: داری سووتاندنی هەڵچنراو، یان کەڵەکەکراو لەسەریەک، گزرە.

لیس: داردەستێکی ئەستوورە، بەڵام وەک تۆپز سەرەکەی ئەستوور نییە.

لیوای عەزا: ئاڵای ماتەم، ئاڵای پرسە.

## م

ماه: مانگ.

ماتەم: ماتم، پرسە، تەعزییە.

ماتەم زەدە: ئەو کەسەی خەم و خەفەت لێی دەدات و ڕەنگی زەرد دەبێ، ئنجا ماتیی دایدەگرێ.

ماجەرا: ماجری، ڕووداو، ئەوەی ڕوویدا.

مادەر: دایک.

مازی: ماضی، ڕابردوو.

مانەند: وەکو.

ماهییەت: جەوهەری شتێک، سروشتی ڕاستیی شتێک.

مەبهووت: سەرسام، واق وڕمان.

مەتاع: کەلوپەل.

موالیبدە: (ف). لە (موالی)یەوە هاتووە، واتە مووالی بێت بە شتێ، لایەنگری شتێک بێت، عاشقی شتێ بێت، هۆگری دەگەیەنێ بەمانای موداریش دێت.

مەجال: مجال، بوار.

مەجلووب: مجلوب، ڕاکێشراو، پەلەکێش کردن.

مەجوور: مجهور، چۆڵکراو.

مەجهوول: مجهول، نەزاندراو، پەنهان و شاراوە.

مەحرەم: جێی نووستن، شوێنێ تاوان و گوناهی لێ نەکرێ.

مەددی بەسەر: چەندی چاو بڕکات، هەتەرکات.

مەدفوون: مدفون، نێژراو.

مەدوو: مەدوێ، مەئاخڤە.

مەدهۆش: لە هۆش چوو.

مەر: مەگەر.

مەزار: ئارامگا، گۆڕ.

مەزارستان: گۆڕستان.

مەزبەلە: مزبلة، زبڵخانە، گوفەک، سەرەنوێڵک.

مەساعی: کۆی (سعی) واتە هەوڵ، تەقەللا.

مەسەڕەت: لە (سرور)ەوە، شادی.

مەسدوود: مسدود، داخراو.

مەسعەدەت: بەختیاری، خۆشی.

مەسعوود: بەختیار، ئاسوودە.

مەمات: لە (موت)ەوە، مردن.

مەسنەد: دەسک، ئەو شتەی دەست یان ئانیشک ڕابگرێ، هەر شتێ هێزێ ڕاگیر بکا.

مەعبوود: کەسێ بپەرسترێت، لە بڕواوە یان لە خۆشەویستی.

مەعرەکە ئاغووش: ئەوەی ئەوەندە ئازایە، جەنگی لە باوەش گرتووە.

مەعسووم: دوور لە گوناە، بێ گوناە.

مەعنیدار: مانادار، واتادار.

مەغمووم : مغموم، غەمبار، خەفەتبار.

مەفتوون: شەیدا و تاسە کردن.

مەقام: مقام، جێگە، پایە و پلە.

مەقبەر: مقبر، گۆڕ.

مەقسەد: مقصد، مەبەست.

مەلەک: فریشتە.

مەلال: مەلوول، بێزار.

مەلامەت: گلەیی، لۆمە.

مەنتەقە: منطقة، ناوچە.

مەهتاب: (ف) مانگەشەو، تریفەی مانگ.

مەه ڕوخسار: ڕوخسار مانگ.

مەیی ناب: سیفەتە، ساف و پاک و خالیس و بێ غەش.

موئامەرە: موآمرة، پیلان، پیلان گێڕان.

موبتەلا: گیرۆدە.

موجەسسەم: بەرز و بەرچاو.

موجید: مجد، هێنانەکایەوە، داهێنان.

موحەققەر: بێ نرخ و سووک، شتێ لە نرخی خۆی کەمتری بۆ دابنرێ.

موخاتەبە: مخاطبة، قسەکردن و دوان لەگەڵ بەرامبەرەکەت، دەمەتەقێ.

موخالیف: ناتەبا، پێچەوانە.

مودام: (مەدام)، مەی، بەردەوام و بێ ڕاوەستان.

مورغ: (ف) باڵندە، تەیر.

موزەفەر: مظفر، سەرکەوتوو، بە مراز گەیشتوو.

موزمەحیل: مضمحل، نەبوون و نابوود، لەناوچوو.

موسەوەر: مصور، وێنەکێش، وێنەگر.

موشەققەت: زەحمەت.

موشفیق: دڵ نەرم، خاوەن سۆز و گوداز.

موعەتر: معطر، بۆن خۆش، عەتراویی.

موغبەر: مغبر، تۆزاوی، خۆڵاوی، خاکی.

موفەوەز: مفوض، موخەییەر، ئارەزوومەند بن لە هەڵبژاردن.

موقەرەر: مقرر، بڕیار دراو.

موکەدەر: شێڵووبوون. دڵتەنگ، بێزار و شێواو.

مول: (مل): شووشەی شەراب و مەی.

مۆمی ناو فـەنەر: (فـەنەر) چرادان، مۆمی ناو هەر قـوتوویەکی لە کـاغـەز یان دار یان مـەعـدەن دروستکراو. چرا و مۆمی لە ناو دابنرێ.

موناجات: پاڕانەوە، ڕازونیاز کردن.

موونس: هۆگر، ئاشنا.

مونقاد: پەلەکێش کراو، بەکێش کردن.

موهەیا: ئامادە. تەیار.

میللەتی غەییور: بەغیرەت.

مییان: ناوقەد.

## ن

نائیل: نائل، دەستی کەوێ، بیدرێتێ، پێی ببەخشرێ.

نابورد: نەبوون.

ناتەوان: بێ دەسەڵات.

نادان: نەزان، نەفام، بێ هۆش.

ناسووت: سروشت، جیهانی بەرجەستە، جیهانی ماددی لە وشەی ناس و (وت) دروست بووە.

ناکەردە: نەکردە.

ناگاه: لەپڕ، لە ناوەخت.

نالەرزیدە: نەلەرزین.

ناڵەبدووش: (ف) ناڵە لەسەرشان.

نەحیف: لەڕ و لاواز.

نەدامەت: پەشیمانی.

نەدارایی: نەبوونی و دەست کورتی.

نەدیم: هاودەنگ.

نەدیمی نەدەم: هاوڕێی پەشیمانی.

نەدیوی: ئەودیو گردێک. یان بەرزییەک کە نەبینرێ پێی دەڵێن (نەدیوی).

نەستەرەن: گوڵێکی بۆن خۆشە، ڕەنگی سوور یان سپی دەبێ، لەسەر هەموو لقێک چەند گوڵێک دەپشکوێ، دارەکەی دڕکاوییە.

نەشتەر: تیغی برین دڕین.

نەعرە: هاواری بەرز.

نەعش: نعش، تابووت، دارەمەیت، جەنازە.

نەغمە پەرداز: نەغمە خوێن.

نەغمە سورا: نەغمە خوێن.

نەفخی صوور: ئیشارەتە بەئایەتی (یوم ینفخ في الصور) واتە لێدانی شەیپوور لە لایەن ئیسرافیلەوە لە ڕۆژی قیامەتدا.

نەفع: نفع، سوود.

نەقیزە: ئەو دارەیە کە بەدەست جووتیارەکەوەیە، سەرێکی بزماری پێوەیە دەیکات بەلاڕانی گاکە و گاکەی پێ لێ دەخوڕێ، سەرەکەی دیکەشی ئاسنێکی پانی پێوەیە پێی دەڵێن (هیشەماڵە) کە قوڕی هیشەکەی پێ پاک دەکاتەوە.

نەوا پەرداز: نەوا خوێن.

نەوازش: دڵدانەوە.

نەوحەگەری: (ف) شیوەن.

نەودەمیدە: تازە پشکووتوو.

نەورەس: نۆبەرە، تازە پێگەیشتوو.

نەورەستە: تازە پەیدابوو.

نەورەسیدە: نۆبەرە.

نەوزاد: مولود، تازە لەدایک بوو.

نەوزهوور: نەو (ظهور). تازە دەرکەوتن. تازە پەیدابوون.

نەوشیروان: پادشایەکی ئێران بوو. بەخاوەن داد ناوی دەرکردبوو.

نەونیهال: نەمامی نوێ.

نەیزەن: (ف) نەی ژەن. ئەوەی نەی دەژەنێ.

نزا: دوعای خێر، بەپێچەوانەی تووک کە دوعای خەراپە.

نشوور: (نشور) زیندووکردنەوە، زیندووکردنەوەی مردووان لە ڕۆژی قیامەتدا.

نیگارێکی وەفادار: خۆشەویست و دڵبەرێکی بە ئەمەک. مەعشووقەیەکی بە وەفا.

نووری عەلانوور: (نور علی نور) نوور لەسەر نوور، ڕووناکی زۆر. نووری زۆر.

نۆت: بەپارەیەکی کاغەزی ئینگلیزی وتراوە (نوت).

نیدا: نداء. بانگ، بانگەواز.

نیزاع: دووبەرەکی.

نیسار: نثار، بلاوکردنەوە و هەڵبژاردن، پەراگەندەیی و پەرش و بلاوی.

نیفاق: دووڕوویی کردن.

نیقاب: ڕووبەند، پەچە.

نیگاهی واپەسین: ئاوڕ بۆ دواوە، نیگایەک بۆ دواوە بڕوانێ.

نیل (نیر): ئەو دارەیە کە دەخرێتە سەر ملی گاجووتەکان.

نیهال: نەمام، درەختێ تازە ڕوابێ و پشکووتبێ.

نیهایەت: نیهایة. کۆتایی، دوایی هاتن.

نیهان: بە نهێنی.

نێش: ئازار. بەمانای شتی نووک تیژیش دێ.

## و

واپەسین: دواوە، کۆتایی.

واژەگوون: هەڵگێڕانەوە، بەراوەژوو، پێچەوانە.

واله: حەیران.

وەچ: کە تووتن دەبڕێتەوە و دەیشکێننەوە، لقی تازە دەداتەوە، بەو لقە تازانە دەڵێن (وەچ).

وەحشەت: تەنیایی، خەڵوەت گرتن.

وەداع: وداع، ماڵئاوایی، خواحافیزی.

وەدوود: زۆر میهرەبان، دۆستدار.

وەرد: ئەو پارچە زەوییەیە کە گەنم و جۆی تێدا دەچێنن.

وەرسە: گیایەکە لە یەمەن دەڕوێ. کە دەمی کردەوە، چەند تاڵێکی لێ پەیدا دەبێ وەک موو وایە، ئەو تاڵانە وەک مووی زەعفەران وایە شتی پێ ڕەنگ دەکەن.

وەروەر: دەمانچە.

وەغا: جەنگ.

وجوود: بوون.

وشکەوەرد: ئەو وەرد بڕینەیە کە لە هاویندا دەبڕێ هەر بەهاوینیش دەچێنرێ، کە پەڵەی دا دەبڕدرێت.

ویقار: لەسەرخۆیی، هێمنی، گەورەیی، خۆقورس گرتن.

وێژەبەرە: ئەو قایشەیە کە لە کونی نیلەکە دایە کە مژانی پێوە دەبەسترێت. مژانیش دارێکی ڕێکە لە بەینی هەوجاڕ و نیلەکە دایە.

## هـ

هەبا: ئەو تۆزقاڵە تۆزانەن کە لە دەوری تیشکی خۆری ناو کولانچکەی ماڵ دەهاڵێن. هەوەنتە، خۆڕایی.

هەمتا: وەک یەک.

هەمراه: هاوڕێ، هاوڕێگا.

هەمراز: هاوڕاز، ڕازی دڵ و دەروون.

هەمنشین: هاونشین.

هەمهەمە: هاوار و فەریادێک کە لە دەمی ئادەمیزاد بێتە دەرێ.

هەنگامە: هەراو بەزم.

هەوجاڕ: ئەو دارەیە کە بۆ کێلان بەنیلەکەوە دەبەسترێ. هەوجاڕ و نیل بەیەکەوە دەبەسترێن. هەوجاڕ (هیس)یشی پێ دەڵێن. لە گەرمیاندا (قەرەمە)ی پێ دەڵێن.

هەولناک: پڕمەترسی، ترسناک، لە (أهوال)ەوە هاتووە.

هەیکەل: هیکل، پەیکەر.

هووەیدا: دیار، ئاشکرا.

هوما: باڵندەیەکی ئەفسانەییبە. دەڵێن سێبەرەکەی بکەوێتە سەر هەر کەسێک یان خۆی لەسەر هەر کەسێ بنیشێ دەبێتە خونکار و پادشا.

هۆڕ: جۆرە چنینێکە لە شێوەی دووتادا، بەیەکەوە نووساوە. دانەوێڵەی تێدەکەن و بەسەر پشتی ولاغی دادەدەن.

هیزە: ئەو پێستە حەیوانەیە کە تایبەتی ڕۆنی تێدەکرێ. بەدۆشاوی توو پێستەکە خۆش دەکرێ کە خۆشکردنەکە پێی دەڵێن (هالوێن)

## ی

یاساغ: قەدەغە.

یاوەر: هاودەم، ئەنیس، ئاشنا، هاوڕێ.

یەکتا: بێ وێنە، بێ نەزیر، تاقانە، یەکانە، تەنیا.

یەکانە: تاقانە، خوای تاک و تەنیا.

یێڵی کوردان: عێلی کوردان، یەلی کوردان.

# یەک دوو قسەی پێویست

نامەوێ بەسەرتانەوە بیکەم بە منەت؛ بەڵام ئامادەکردنی ئەم بیبلیۆگرافیایە بارتەقای کۆشش و تەقەللام لە ئامادە کردنی ئەم دیوانە هیلاکی کردووم. هۆی سەرەکیی ئەم ماندووبوونەش بۆ بایەخ پێنەدان و نەپاراستن و لە بەردەست نەبوونی ژمارەی تەواوی ڕۆژنامە و گۆڤارەکانمان دەگەڕێتەوە، چونکە تا ئێستا کتێبخانەیەک لە سەرتاپای کوردستاندا نییە تەواوی ژمارەکانی ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانەی تێدا پارێزرابێ. بەهۆی ئەو پشتگوێ خستن و بایەخ پێنەدانە لاپەڕەکانیان تووشی پوان دەبێت و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ هەڵدەوەرێن و لە کەڵک دەکەون. لە کاتێکدا کتێبخانەی پێشکەوتووی میللەتە خواپێداوەکانی دنیا دەخرێنە شوێنی تایبەتی نەوەک ئاووهەوا و کەش کاریان لێ بکات و بەچەندین جۆرە داوودەرمان دەیانپارێزن. ڕەنگە بڵێن ئەم لایەنە پێوەندی بەلایەنی پێشکەوتنی شارستانی میللەتەکەمانەوە هەیە، بەڵام بەلای ڕای منەوە دروست نەبوونی هۆشیاریی پێوست بۆ پاراستن و بایەخدان بەو ڕۆژنامە و گۆڤارانە، کارێکی وای کردووە بەدەستی ئەنقەست بەفەوتاندن بدرێن.

تاکو ئەمڕۆکە کتێبخانەکانمان ئەم ڕۆژنامە و گۆڤارانەیان بەناتەواوی و نیوە ناچڵی هێشتۆتەوە، بەبێ ئەوەی ئەو کەسانەی لە کتێبخانەکاندا ئیش دەکەن، مشووری پڕکردنەوەی ژمارە ناتەواوەکانی ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانە بخۆن و بۆ ئەم مەبەستە پەنا ببەنە بەکتێبخانە تایبەتییەکان، تا بەفۆتۆ (کۆپی) وێنەیان لەبەربگرنەوە و کاری لێتوێژەرەوە و خوێنەرانی پێ مەیسەر بکەن، بۆیە دانانی کەسانی لێوەشاوە و قەدرزان بۆ کتێبخانەکانی کوردستان کارێکی تا بڵێی پێویستە بۆ پاراستنی ئەو ژمارە کەمەی ئەمڕۆکە ماون، هیچ نەبێ ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانە نەدەنە دەست هەموو کەسێ تا هەر لاپەڕەیەکیان بوێت لێی بکەنەوە و بەئارەزووی خۆیان لەسەری بنووسن و بەبێباکی لاپەڕەکانی هەڵبدەنەوە و ئەمەش ببێتە هۆی دڕاندنی لاپەڕەکانیان.

بەداخەوە تا ئەمڕۆکە دەزگایەکی زانستی و ئەکادیمی وەکو «کۆڕی زانیاری عیراق - دەستەی کورد» هەوڵی نەداوە تەواوی ژمارەکانی ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانە پەیدا بکات و لە لای خۆی بیانپارێزێ. ئەگەر بۆیشی پەیدا نەبێ وێنەی ئەو ژمارانەی دەست دەکەون بگرێتەوە، یان هەوڵی کڕینیان بدات لەو کەسانەی نیازی فرۆشتنیان هەیە، یان ئەو

کەسانە هان بدات کە لەبارياندا هەيە ژمارەکانی ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانە ناو بەناو بەئۆفسێت لە چاپ بدەن و بکرێنە دياريی بۆ خوێنەرانی نەوەی ئەمڕۆکە.

ڕەنگە زۆر کەس هەبن وايان بەزەيندا بێت کە ئەم جۆرە کارانە زۆر بەسووک و سانايی بێنە دەست و ئەرکێکی گەورەی لەگەڵدا نەکێشرێ، يان وا دەزانن هەموو کەس ئەو حەوسەڵەيەيان هەيە، بتوانن لاپەڕە کۆنەکان هەڵبدەنەوە و لە هەمان کاتيشدا بەدوای پەيداکردنيان عەودالْ بن. نازانن ئەم جۆرە ئيشانە ئەگەر بە(داهێنان)يش نەژمێردرێن، ئەوە لە زۆر بۆرە شيعر و چيرۆکی بۆردراو و وتاری بێ ناواخن، بەکەڵکتر و قورسترە. وێڕای ئەوەی کتێبخانەيەک لە کوردستاندا نييە ژمارەی ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانەی تێدا پارێزرا بێ، ئەوە لە هەمان کاتيشدا تا ڕۆژی ئەمڕۆکە هيچ کتێبخانەيەکی گشتی، ياخود هيچ کەسێ هەوڵی نەداوە بيبليۆگرافيايەک - چ بەکتێبی چاپکراو و چ بەڕۆنيۆ - بۆ ناوەرۆکی ڕۆژنامە و گۆڤارەکان ساز بکات يان بيبليۆگرافيا بۆ ناوی نووسەرەکان بکات و پەنجە بۆ ئەو ژمارانە ڕابکێشێ کە بەشدارييان تێدا کردووە. تا ئەوانەی دەيانەوێ لەم جۆرە بيبلۆگرافيانەی لەمەڕ خۆمان سازيدەن، بەبێ ئەرکی هەڵدانەوەی لاپەڕە بەلاپەڕەی ڕۆژنامە و گۆڤارەکان، بگەڕێنەوە سەر ئەو باس و بابەتانەی گەرەکيانە سوودی لێ وەربگرن، کە ئەمڕۆکە لەبەر کەميی سەرچاوە بووەتە تاکە سەرچاوەی باوەڕپێکراو و بەردەستی ئێمە.

لە ڕۆژی ئەمڕۆکەماندا - بيبليۆگرافيا - سازدان بەتەواوکەری ساغکردنەوە و بڵاوکردنەوەی بەرهەمی شاعيران دەژمێردرێ کە بەبێ بوونی ئەو - بيبليۆگرافيايە - ديوانەکە هەرچەندە بێ کەموکورتی و ڕێکوپێک بێ، هێشتا کەلەبەری تێدەکەوێ و بەکەموکورتی بۆی دەنووسرێ. بۆيەشە لە وڵاتان ئەوانەی لە بواری ئەکاديميدا ئيش دەکەن، بەردەوام ڕەنجی فەرهادانە دەدەن لە پێناوی پێشخستنی ئەم لايەنە تەواوکەرە لە کاتی لە چاپدانی ديوانی شاعيرەکانيان.

ئەمڕۆکە ئەو زانستەی کە بايەخ بە«کتێبخانە» دەدات گەيشتووەتە ڕادەيەک دەتوانێ زۆر ڕێگای دوورودرێژ بۆ خوێنەران کورت بکاتەوە و دەستی لێتوێژەرەوەکانيش بگرێ. سازدانی (بيبليۆگرافيا)ش ڕۆژ لە دوای ڕۆژ نرخی زياتر دەبێ و پتر دەبێتە جێگای بايەخ و هەست بەگرنگی ئەم کارە دەکرێت و فەرامۆشکردن و پشتگوێ خستنی ئيشەکە بەنيوە ناچڵ دەهێڵێتەوە.

بيبليۆگرافيا سوودی زياتر دەگەيەنێتە خوێنەران و لێتوێژەرەوەکان تابتوانن لە

سەردەمێکی خێرا و ئاپۆرەی وەکو ئەمڕۆکە «کات»یان بەفیرۆ نەچێت، ئەمڕۆکە گرنگی ئەم بیبلیۆگرافیایانە لە لای میللەتە سەرفرازەکانی دنیا کە نرخی زانستیان لە لا هەیە، نەک هەر بەشێوەی کتێب ئەم جۆرە بیبلۆگرافیایانە دەبینرێ، بەڵکو لەناو هەر کتێبخانەیەکدا، هەر نووسەرێک بەپێی پیتەکانی ئەبجەد دۆسیەی تایبەتی خۆی هەیە و ئەم زانستە کە بەزانستی (التوثیق)[1] ناوزەد کراوە، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ قووڵتر دەکرێ و زیاتر دەبێتە مایەی سوود گەیاندن، ئینجا هەرکەسێ بیەوێ لە شاعیرێک، یان لە نووسەرێک بتۆژێتەوە، ئەوە یەکسەر ئەو باس و بابەتانەی کە نووسەرەکە نووسیویەتی یان لە بارەیەوە نووسراون هەمووی بەهۆی دۆسیەی تایبەتی ئەو کەسەوە دەخرێنە بەردەست، باس و بابەتەکانیش لەناو دۆسیەکە بەپێی کات و بابەت بۆ لێتوێژەرەوە جیاکراوەتەوە. هەموو ئەمانە بۆ کورت کردنەوەی ڕێگایە، تا بتوانێ هەر لایەنێکی کە بیەوێ، بەئاسانی بەدەستەوە بێت و کەرەستەی نووسینەکە گەلاڵە بکات. بەداخەوە جارێ ئێمە نەگەیشتووینەتە ئەو ئاستە پێشکەوتووەی کتێبخانەکانمان، تەنانەت ژیانمان بەو جۆرە ڕێکوپێک بخەین و بگرە زۆریشمان ماوە بیگەینێ.

بێگومان لەبەرئەوەی - شێخ نووری شێخ سالح - یەکەم جارە دیوانی شیعری بەم شێوەیە لە چاپ بدرێت و بەهۆی لە بەردەست نەبوونی دیوانی شیعریی ئەم شاعیرە لە زۆر لێکۆڵینەوەی ڕەخنەیی و ئەکادیمی ناوی خراوەتە ژێر لێوەوە، ئنجا ئەمە بەدەستی ئەنقەست بووبێ یان لەبەرئەوەی ئەوکەسانە نەیان ویستووە خۆیان هیلاک بکەن و تاقەتی پشکنین و هەڵدانەوەی لاپەڕەی ڕۆژنامە و گۆڤارەکانیان نەبووە، هەر بۆ ئەوەی ئەم بیبلیۆگرافیایە ببێتە تەواوکەرێکی ئەم ئیشەم و بۆ ئەوەی ئەو بەهانەیەش ببڕین کە هەندێ کەس خۆیان پێوە هەڵواسیوە و لە پێناوی ئەوەی دەستی یارمەتی بۆ خوێنەران و ڕەخنەگرانی ئەمڕۆ و پاشەڕۆژ درێژ بکەین و یارمەتی ئەوانەش بدەین کە لە پاشەڕۆژدا دەیانەوێ لەسەر بزووتنەوەی شیعری کوردی هاوچەرخ بنووسن، هاتم و دەستم دایە دروستکردنی ئەم بیبلیۆگرافیایە بۆ بەرهەمە شیعرییە بڵاوکراوەکانی ئەم شاعیرە، بگرە چەند جاریش بڵاوکراونەتەوە و ئنجا ئەو بەرهەمانەی وەک وتار و یادکردنەوە لەسەر ژیان و شیعری شێخ نووری نووسراون. لە پاڵ ئەمەش بەرهەمەکانی تری کە بریتییە لە وتاری مێژوویی و

(١) بۆ زانستی زیادە بڕوانە: جاک شومییە: (أصول التوثيق) - ترجمة انطوان عبده. منشورات عويدات، بيروت - باريس، الطبعة الثالثة، ١٩٨٢.

سیاسی و ئەدەبی، لەگەڵ ئەوانەش کە شیعری (شێخ نووری)یان کردووە بەپێنج خشتەکی یان وتار و شیعرییان وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی، هاتووم بەپێی بابەت ڕێکم خستوون، ئەم ئەرکەشم بۆیە خستە ئەستۆی خۆم، چونکە سەرەڕای ئەوەی کە تەواوکەری ئیشەکەمە، لە لایەکی ترەوە ژمارەی ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییانەمان کە زۆر پرش و بڵاون و زۆربەیانم لە کتێبخانە تایبەتییەکان دەرهێناوە، وایشی بۆ دەچم ئەو ژمارە کەمەی لەبەر دەستیشدا هەن ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەدەست کاربەدەستانی کتێبخانەی قەدر نەزان و بەهۆی بارودۆخەکە و کەمی هۆشیاریی خوێنەران لە گرنگیدان بەو ڕۆژنامە و گۆڤارانە لە کاتی هەڵدانەوە و خوێندنەوەیان، بەرەبەرە ڕوو لە کەمی دەکەن و ڕۆژێ لە ڕۆژان لەوانەیە ئەو ژمارانەش لەناو بچن، یان هەڵبگیرێن و بشاردرێنەوە، بۆیە تا ڕێگای سەخت و پڕ پێچوپەنا بۆ خوێنەران و ڕەخنەگران ئاسان و کورت بکرێتەوە. هیوادارین لەمەولا ئەو برایانەی لە چاپدانی دیوانی شاعیرێکیان پێ دەسپێررێ خەریکی ساغکردنەوەی دەبن لە دروستکردنی ئەم جۆرە بیبلیۆگرافیایانە بێ بەشی نەکەن و نەیخەنە پشتگوێ.

ئیتر با لەمەودواش بەهۆی ئەم شیعرانە و ئەم بیبلیۆگرافیایە (شێخ نووری) بەسەر بکرێتەوە و مافی شاعیرانەی خۆی بدرێتێ و ئەو ڕووپێوەی لە نەخشەی داهێنانی شیعری کوردی تازەدا لەسەری جوولاوەتەوە دیاری بکرێت و لە داهاتوویەکی نزیکدا ئەوانەی نیازیانە لە بارەی شیعر و شاعیرایەتی شێخ نووری بنووسن ئەوەندە ماندوو نەبن و ئەو ئەرکەی من کێشاومە، ئەوان دووبارە نەیکێشن و یەکسەر بەهۆی ئەو بیبلیۆگرافیایەوە بتوانن بگەڕێنەوە سەر ئەو سەرچاوانەی باسی شێخ نووری و شاعیرایەتییەکەی دەکەن. لەگەڵ ئەو تەقەللایەش کە داومە، هێشتا من ناڵێم ئەوەی کردوومە زۆر پوختە و تەواوە و هیچ کەموکورتی تێدا نییە. ڕەنگە لەگەڵ ئەو هەوڵەش کە داومە زۆرشتی تری بڵاوکراوەی شێخ نووری یان ئەو نووسینانەی دەربارەی ئەو نووسراون، بەر چاوم نەکەوتبن و لەم بیبلیۆگرافیایەدا جێگای بۆ نەکرابێتەوە، بەڵام ئومێدەوارم ئەمە ببێتە ڕچە شکاندنێک بۆ ئەوەی کەموکورییەکانم پڕ بکرێنەوە و لە هەمان کاتیشدا ببێتە ڕێوڕەسم و نەریتێک، لەمەولا پەیڕەو بکرێت.

## نووسین و وتارەکانی شێخ نووری

* ڕۆژنامەی پێشکەوتن.
ژمارە (٤٤)ی ساڵی (١)
(١٦)ی جمادي الآخر ١٣٣٩
(٢٤)ی فبروەری ١٩٢١ز
وتارێکی زمانەوانی بەناوی: (لەیەکچوونی حەرف)(*)

* ڕۆژنامەی پێشکەوتن.
ژمارە (٨٧)ی ساڵی (٢)
(٢٢)ی ربیع الآخر ١٣٤٠هـ
(٢٢)ی دیسمبر ١٩٢١ز
وتارێک بەناوی: (تووتن لە بەغدا نرخی شکاوە لە شرکت زیاتر چارەی نەماوە).

* ڕۆژنامەی پێشکەوتن.
ژمارە (٨٨)ی ساڵی (٢)
(٢٩)ی ربیع الآخر ١٣٤٠هـ
(٢٩)ی دیسمبر ١٩٢١ز
(پاشماوەی ژمارەی پێشوو).

* ڕۆژنامەی پێشکەوتن.
ژمارە (٨٩)ی ساڵی (٢)
(٧)ی جمادي الأول ١٣٤٠
(٥)ی جینیوەری ١٩٢٢
(پاشماوەی ژمارەی پێشوو).

---

(*) دکتۆر (ئەوڕەحمان حاجی مارف) لە کتێبەکەیدا (چی لە بارەی زمانی کوردی)یەوە نووسراوە، کە لە بەغدا لە ساڵی ١٩٧٣ چاپ کراوە، ئیشارەتی بۆ ئەم وتارە زمانەوانییە نەکردووە کە پێش هەوڵەکانی مامۆستایان: (سەعید سدقی کابان) و (تۆفیق وەهبی) کەوتووە (وەک دەستپێشخەرییەک).

* ڕۆژنامەی پێشکەوتن.

ژمارە (٩١) سالّی (٢)

(٢١)ی جمادي الأول ١٣٤٠

(١٩)ی جینیوەری ١٩٢٢ز

وتارێک بەناوی: (زبان) کە وەلامی ڕەخنەیەکە بۆ (ڕەسوولّ ناجی).(**)

* ڕۆژنامەی ڕۆژی کوردستان.

ژمارە (١)ی سالّی (١)

(٢٥)ی ربیع الأول ١٣٤١

(١٥)ی تشرین الثاني ١٩٢٢

وتارێک بەناوی: (بانگ کوردستان - ڕۆژی کوردستان).

* ڕۆژنامەی ڕۆژی کوردستان.

ژمارە (٢)ی سالّی (١)

(٢)ی ربیع الآخر ١٣٤١

(٢٢)ی تشرین الثاني ١٣٣٨ی ڕۆمی، ١٩٢٢ی ز.

وتارێک بەناوی: (مەتانەت و سەباتی قەومی کورد).

* ڕۆژنامەی ڕۆژی کوردستان.

ژمارە (٤)ی سالّی (١)

(٢٣)ی ربیع الآخر ١٣٤١

(١٣)ی کانوونی ئەوەل ١٣٣٨ ڕۆمی، ١٩٢٢ی ز

وتارێک بەناوی: (فەنی و ئیجتیماعی - میللەت).

* ڕۆژنامەی ڕۆژی کوردستان.

ژمارە (٥)ی سالّی (١)

---

(**) وەک د. ئەورەحمان حاجی مارف ئاماژەی بەو وتارە و وتارەکەی پێشتر نەکردووە (محەمەدئەمین غەفوور هەورامانی)ش کاتێ ئەو کتێبەی کردووە بەعەرەبی و بەناوی (ماکتب عن اللغة الکردیة) کە لە سالّی ١٩٧٨ لە بەغدا چاپی کردووە هیچ ئاماژەیەکی بۆ ئەو دوو وتارە نەکردووە، لە کاتێکدا خۆشی زمانەوانە و بایەخ بەزمانی کوردی دەدات.

(٣٠)ی ربیع الآخر ١٣٤١
(٢٠)ی کانوون الأول ١٣٣٨ی ڕۆمی، ١٩٢٢ز
سەروتارێک بەناوی: (موجادەلەی حەیات).

* ڕۆژنامەی ڕۆژی کوردستان.
ژمارە (٦)ی ساڵی (١)
(٩)ی جمادي الأول ١٣٤١
(٢٧)ی کانوون ئەوەل، ١٣٣٨ی ڕۆمی ١٩٢٢ی ز
سەر وتارێک بەناوی: (ولایەتی مووسڵ لە لۆزاندا).

* ڕۆژنامەی ڕۆژی کوردستان.
ژمارە (٨)ی ساڵی (١)
(٢٣)ی جمادي الأول، ١٣٤١
(١٠)ی کانوون الثاني، ١٣٣٨ی ڕۆمی
وتارێکی سیاسی بەناوی: (داوای حقووقی مەشرووعە).

* ڕۆژنامەی ڕۆژی کوردستان.
ژمارە (١٠)ی ساڵی (١)
(٧)ی جمادي الآخر، ١٣٤١
(٢٤)ی کانوون الثاني، ١٣٣٨ی ڕۆمی
سەروتارێک بەناوی: (قسەی ناحەق ڕەد ئەکرێتەوە).

* ڕۆژنامەی ڕۆژی کوردستان.
ژمارە (١٤)ی ساڵی (١)
(٨)ی ڕەجەب ١٣٤١
(٢٤)ی شوبات ١٣٣٨ی ڕۆمی
سەروتارێک بەناوی : (لە فەلاکەت عیبرەت).

* ڕۆژنامەی ڕۆژی کوردستان.
ژمارە (١٥)ی ساڵی (١)

(١٥)ی ڕەجەب، ساڵی ١٩٤١
(٣)ی مارت ساڵی ١٣٣٩ی ڕۆمی
لەتورکییەوە وتارێک بەناوی: (فاپیتولاسیون)و نووسراوە ماویەتی، کاتێ ڕۆژنامەکە دەرنەچووە ئیتر پچڕاوە.

* ڕۆژنامەی بانگی کوردستان.
ژمارە (١)ی ساڵی (١)
(٨)ی ذي الحجة ١٣٤٠
(٢)ی ئاغستۆس ١٩٢٢ز
وتارێکی بێ ناوونیشان لەلاپەڕە (٦)دا

* ڕۆژنامەی بانگی کوردوستان.
ژمارە (٢)ی ساڵی (١)
(٢٠)ی ذی الحجة ١٩٤٠
(١٤)ی ئاغستۆس ١٩٢٢
کورتە نووسینێ بەناوی: (ئەڵێن هەیئەتی ناسیحە لە بەغداوە دێت)[٢]

* ڕۆژنامەی بانگی کوردستان.
ژمارە (٣)ی ساڵی (١)
(٢٧)ی ذي الحجة ١٣٤٠هـ
(٢١)ی ئاغستۆس ١٩٢٢
وتارێک بەناوی (ماکینەی چاپ).

* ڕۆژنامەی بانگی کوردستان.

---

(٢) هەندێ نووسین و سەروتار لەو ڕۆژنامەیەدا هەیە، کە دەیخوێنیتەوە یەکسەر دەزانی ئەوە شێوازی «شێخ نووری»یە کە یەکێکە لە موحەرریرەکانی بەشە کوردی و فارسییەکە. کە کاک - جەمال خەزنەدار - یش لە کاتی دروستکردنی بیبلیۆگرافیایەک بۆ نووسەرەکانی ئەم گۆڤارە هەر وای بۆ چووە. بەڵام هەندێ وتاری تر هەن کە کاک (جەمال) بە هی (شێخ نووری) داناوە من لە ئاستیاندا وەستام، چونکە ئەو وتارانە بەئیمزای کەسانی تر نووسراون وەک (مستەفا پاشا)، کە من نەم خستنە ناو بیبلیۆگرافیایەکەوە.

ژماره (٥)ی سالی (١)
(١٢)ی موحەرەم
(٤)ی ئەیلوول ١٩٢٢
وتارێک بەناوی (موجادەلەی حەیات، ئەفکاری متەنەوعە، حسیاتی متەلەونە).

* ڕۆژنامەی بانگی کوردستان.
ژماره (٨)ی سالی (١)
(٧)ی صفر ١٣٤١
(٢٩)ی ئەیلوول ١٩٢٢
وتارێکی بێ ناوونیشان لەلاپەڕە (٢ - ٣).

* ڕۆژنامەی بانگی کوردستان.
ژماره (٩)ی سالی (١)
سەروتارێک کە ناوونیشانی نییە لەلاپەڕە (١- ٢- ٣- ٤) ئەگەرچی ناوی بەسەرەوە نییە، بەڵام دیارە هی (شێخ نووری)یە

* ڕۆژنامەی بانگی کوردستان.
ژماره (١٢)ی سالی (١)
(٥) ربیع الأول ١٣٤١هـ
(٢٧)ی تشرین أول ١٩٢٢
وتارێک بەناوی: (نەخۆشی ئیجتیماعی و چارەی تەداوی).
لاپەڕە (٣-٤).

* ڕۆژنامەی ژیانەوە.
ژماره (١٩)ی سالی (١)
(٧)ی شعبان ١٣٤٣
(٢)ی مارتی ١٩٢٥
وتارێک بەناوی: (تورک و کورد - گورگ و مەڕ).

* ڕۆژنامەی ژیان.

ژماره (٢٠)ی سالی (١)
(١٩)ی ذي القعدة ١٣٤٤، (١٠)ی حوزەیران ١٩٢٦
(بۆ دائیرەی عالیەی ژیان تەقدیمە). سەرەتایەکە بۆ وتارە ڕەخنەییەکانی، لەگەڵ بەشی یەکەمی (ئەدەبیاتی کوردی).

* ڕۆژنامەی ژیان.
ژمارە (٢١)ی سالی (١)
(٦)ی ذي الحجة ١٣٤٤
(١٧)ی حوزەیران ١٩٢٦
بەشی دووەمی وتاری: (ئەدەبیاتی کوردی).

* ڕۆژنامەی ژیان.
ژمارە (٢٢)ی سالی (١)
(٢٠)ی ذي الحجة ١٣٤٤
(١)ی تەمووز ١٩٢٦
بەشی سێیەمی وتاری: (ئەدەبیاتی کوردی).

* ڕۆژنامەی ژیان.
ژمارە (٢٣)ی سالی (١)
(٨)ی تەمووز ١٩٢٦
بەشی چوارەم لە وتاری (ئەدەبیاتی کوردی).

* ڕۆژنامەی ژیان.
ژمارە (٢٤)ی سالی (١)
(١٤) ی موحەڕەم ١٣٤٥
(١٥)ی تەمووز ١٩٢٦
بەشی پێنجەمی وتاری: (ئەدەبیاتی کوردی).

* ڕۆژنامەی ژیان.
ژمارە (٢٥)ی سالی (١)

(١١)ی موحەڕەم ١٣٤٥
(٢٢)ی تەمووزی ١٩٢٦
بەشی شەشەم لە وتاری: (ئەدەبیاتی کوردی).

* ڕۆژنامەی ژیان.
ژمارە (٢٦)ی سالی (١)
(١٨)ی موحەڕەم ١٣٤٥
(٢٩)ی تەمووز ١٩٢٦
وتارێک بەناوی: (جەواب بۆ غەزەتەی نەجمە).

* ڕۆژنامەی ژیان.
ژمارە (٢٧)ی سالی (١)
(٢٥)ی موحەڕەم ١٣٤٥
(٥)ی ئاغستۆس ١٩٢٦
پاشماوەی ژمارەی پێشوو: (جەواب بۆ غەزەتەی نەجمە).
لەگەڵ بەشی حەوتەمی وتاری: (ئەدەبیاتی کوردی).

* ڕۆژنامەی ژیان.
ژمارە (٢٨)ی سالی (١)
(٢)ی صفر ١٣٤٥
(١٢)ی ئاغستۆس ١٩٢٦
بەشی هەشتەمی وتاری (ئەدەبیاتی کوردی).

* ڕۆژنامەی ژیان.
ژمارە(٢٩)ی سالی (١)
(٩)ی صفر ١٣٤٥
(١٩)ی ئاغستۆس ١٩٢٦
بەشی نۆیەمی وتاری: (ئەدەبیاتی کوردی).

* ڕۆژنامەی ژیان.
ژمارە (٣١)ی سالی (١)

(٢٣)ی صفر ١٣٤٥
(٢)ی ئەیلوول ١٩٢٦
بەشی دەیەمی وتاری: (ئەدەبیاتی کوردی).

* ڕۆژنامەی ژیان.
ژمارە (٣٢)ی ساڵی (١)
(٣٠)ی صفر ١٣٤٥
(٩)ی ئەیلوول ١٩٢٦
بەشی یانزە لە وتاری: (ئەدەبیاتی کوردی).

* ڕۆژنامەی ژیان.
ژمارە (٣٣)ی ساڵی (١)
(٩)ی ربیع الأول ١٣٤٥
(١٦)ی ئەیلوول ١٩٢٦
بەشی دوانزە لە وتاری: (ئەدەبیاتی کوردی).

* ڕۆژنامەی ژیان.
ژمارە (٣٧)ی ساڵی (١)
(٧)ی ربیع الآخر ١٣٤٥
(١٥)ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٦
بەشی سیانزە لە وتاری: (ئەدەبیاتی کوردی).

* ڕۆژنامەی ژیان.
ژمارە (٣٨)ی ساڵی (١)
(١٤)ی ربیع الآخر ١٣٤٥
(٢١)ی تشرینی أول ١٩٢٦
بەشی چواردە لە وتاری: (ئەدەبیاتی کوردی).

* ڕۆژنامەی ژیان
ژمارە (٣٩)ی ساڵی (١)

(٢١)ی ربیع الآخر ١٣٤٥
(٢٨)ی تشرینی یەکەم ١٩٢٦
بەشی پانزە لە وتاری (ئەدەبیاتی کوردی).

* ڕۆژنامەی ژیان
ژمارە (٤٠)ی ساڵی (١)
(٢٨)ی ربیع الآخر ١٣٤٥
(٤)ی تشرینی دووەم ١٩٢٦
بەشی شازدە لە وتاری (ئەدەبیاتی کوردی).

* ڕۆژنامەی ژیان
ژمارە (٤١)ی ساڵی (١)
(٥)ی جمادی الأول ١٣٤٥
(١١)ی تشرینی دووەم ١٩٢٦
بەشی حەڤدە لە وتاری: (ئەدەبیاتی کوردی).

* ڕۆژنامەی ژیان
ژمارە (٤٢)ی ساڵی (١)
(١٢)ی جمادی الأول ١٣٤٥
(١٨)ی تشرینی دووەم ١٩٢٦
بەشی هەژدە لە وتاری: (ئەدەبیاتی کوردی).

* ڕۆژنامەی ژیان
ژمارە (٤٦)ی ساڵی (١)
(١٠)ی جمادي الآخر ١٣٤٥
(١٦)ی کانوونی یەکەم ١٩٢٦
بەشی نۆزدە لە وتاری: (ئەدەبیاتی کوردی).

* ڕۆژنامەی ژیان
ژمارە (٤٨)ی ساڵی (١)

(٢٤)ی جمادي الآخر ١٣٤٥
(٣٠)ی كانوونی يەكەم ١٩٢٦
بەشی بيستەم لە وتاری: (ئەدەبياتی كوردی).

* ڕۆژنامەی ژيان
ژمارەی (٥٣)ی ساڵی (٢)
(٧)ی شعبان ١٣٤٥
(١٠)ی شوبات ١٩٢٧
بەشی بيست و يەک لە وتاری: (ئەدەبياتی كوردی).

* ڕۆژنامەی ژيان
ژمارە (٥٤)ی ساڵی (٢)
(١٤)ی شعبان ١٣٤٥
(١٧)ی شوبات ١٩٢٧
بەشی بيست و دوو لە وتاری: (ئەدەبياتی كوردی).
هەر لەو ژمارەيەدا (ڕەشيد نەجيب) شيعرێكی بەناوی (ئينتيباعاتی هەورامان) پێشكەش بە(شێخ نووری) كردووە.

* ڕۆژنامەی ژيان
ژمارە (٥٥)ی ساڵی (٢)
(٢٤)ی شوباتی ١٩٢٧
بەشی بيست و سێ لە وتاری: (ئەدەبياتی كوردی).

* ڕۆژنامەی ژيان
ژمارە (٥٧)ی ساڵی (٢)
(٧)ی ڕەمەزان ١٣٤٥
بەشی بيست و چوار لە وتاری: (ئەدەبياتی كوردی).

* ڕۆژنامەی ژيان
ژمارە (٥٩)ی ساڵی (٢)

(٢١)ی ڕەمەزان ١٣٤٥
(٢٤)ی مارت ١٩٢٧
بەشی بیست و پێنج لە وتاری : (ئەدەبیاتی کوردی).

* ڕۆژنامەی ژیان
ژمارە (٨٥)ی ساڵی (٢)
(١٥)ی ربیع الآخر ١٣٤٥
(١١)ی تشرینی یەکەم ١٩٢٧
وتارێک بەناوی: (بەمناسەبەتی تەعینی عەلی عیرفان ئەفەندییەوە بۆ مەتبەعەی ژیان).

## شیعرە بڵاوکراوەکانی شێخ نووری لە ناو ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا

*** ڕۆژنامەی پێشکەوتن**

* ڕۆژنامەی پێشکەوتن
ژمارە (١٠)ی ساڵی (١)
(١٤)ی شەوال ١٣٣٨ھ
(١)ی جولای ١٩٢٠م
شیعری: (لە تەوسیف چاپخانە)

* ڕۆژنامەی پێشکەوتن
ژمارە (١١)ی ساڵی (١)
(٢١)ی شەوال ١٣٣٨ھ
(٨)ی جولای ١٩٢٠م
شیعری: (وەرە بادی سەبا، تۆ قاسیدی من بە بەمەردانە).

* ڕۆژنامەی پێشکەوتن.
ژمارە (٣٠)ی ساڵی (١)
(٦)ی ربیع الأول ١٣٣٩ھ
(١٨)ی نۆڤمبەر ١٩٢٠م
شیعری: (جووت و گا شتێکی چاکە).

* ڕۆژنامەی پێشکەوتن
ژمارە (٣٣)ی ساڵی (١)
(٢٧)ی ربیع الأول ١٣٣٩هـ
(٩)ی دیسمبر ١٩٢٠م
شیعری: (ئەی دولبەری جانی، بەخودا جانی جیهانی).

* ڕۆژنامەی پێشکەوتن.
ژمارە (١٤)ی ساڵی (١)
(٢٤)ی جمادي الآخر ١٣٣٩هـ
(٣)ی فبروری ١٩٢١م
شیعری: (موسەدەس لەسەر نیوە شیعرێکی سوڵتان سەلیم).

* ڕۆژنامەی پێشکەوتن.
ژمارە (٧٦)ی ساڵی (٢)
(٢)ی صفر ١٣٤٠هـ
(١٦)ی ئۆکتۆبەر ١٩٢١م
شیعری: (دەردی دڵی خۆم، جوملەیەکی بێنمە تەقریر).

* ڕۆژنامەی پێشکەوتن.
ژمارە (٧٨)ی ساڵی (٢)
(١٨)ی صفر ١٣٤٠ هـ
(٢٠)ی ئۆکتۆبەر ١٩٢١م
شیعری: (غەمی زەمانە وەکو پەردە، وا دڵی پۆشیم).

* ڕۆژنامەی پێشکەوتن.
ژمارە (٧٩)ی ساڵی (٢)
(٢٥)ی صفر ١٣٤٠هـ
(٢٧)ی ئۆکتۆبەر ١٩٢١م
شیعری: (پەشێوی پەرچەمی شۆخێکی بێ پەروا و بێ باکم).

* ڕۆژنامەی پێشکەوتن.
ژمارە (٨٠)ی ساڵی (٢)
(٣)ی نۆڤێمبر ١٩٢١هـ
(٢)ی ربیع الأول ١٣٤٠هـ
شیعری: (دڵ).

* ڕۆژنامەی پێشکەوتن.
ژمارە (٨١)ی ساڵی (٢)
(٩)ی ربیع الأول ١٣٤٠ هـ
(١٠)ی نۆڤمبر ١٩٢١م
شیعری: (ئەی فەلەک دیسان لەدەس تۆ شین و واوەیلا ئەکەم).

* ڕۆژنامەی پێشکەوتن.
ژمارە (٨٢)ی ساڵی (٢)
(١٦)ی ربیع الأول ١٣٤٠هـ
(١٧)ی نۆڤمبەر ١٩٢١م
شیعری: (ئیستیقبال بۆ تازە پێگەیشتووەکان).

* ڕۆژنامەی پێشکەوتن.
ژمارە (٩٢)ی ساڵی (٢)
(٢٨)ی جمادي الأول ١٣٤٠هـ
(٢٦)ی جەنیوەری ١٩٢٢م
وەرگێڕانی شیعری: (تەفەکور).

* ڕۆژنامەی پێشکەوتن.
ژمارە (٩٩)ی ساڵی (٢)
(١٧)ی ڕەجەب ١٣٤٠هـ
(١٦)ی مارچ ١٩٢٢م
شیعری: (شەو).
لە هەمان ژمارەدا شیعری: (ئەی دولبەری جانی بەخودا جانی جیهانی) بڵاوکراوەتەوە.

* ڕۆژنامەی پێشکەوتن.
ژمارە (١١٤)ی ساڵی (٣)
(٤)ی ذی القعدة ١٣٤٠هـ
(٢٩)ی جون ١٩٢٢م
شیعری(هەر مورغێ فڕی بۆ چەمەنستانی خەیاڵێ).

*** ڕۆژنامەی ڕۆژی کوردستان.**

* ڕۆژنامەی ڕۆژی کوردستان.
ژمارە (٥)ی ساڵی (١)
(٢٠)ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٢م - ١٣٣٨ی ڕۆمی
(٣٠)ی ربیع الآخر ١٣٤١
شیعری: (عەسکەر).

* ڕۆژنامەی ڕۆژی کوردستان.
ژمارە (٨)ی ساڵی (١)
(١٠)ی کانوونی دووەمی ١٩٢٢م - ١٣٣٨ ڕۆمی
شیعری فارسی بەناوی (وقت ارشاد است ای عالی همم اعیان ما).

* ڕۆژنامەی ڕۆژی کوردستان.
ژمارە (٩)ی ساڵی (١)
(١٧)ی کانوونی دووەمی ١٩٢٢م - ١٣٣٨ی ڕۆمی
شیعرێکی دووقۆڵی لەگەڵ (عەلی کەمال) بەناوی (وا موبەدەل بوو بەخۆشی...).

*** ڕۆژنامەی بانگی کوردستان.**

* ڕۆژنامەی بانگی کوردستان.
ژمارە (٣)ی ساڵی (١)
(٢٧)ی ذی الحجة ١٣٤٠هـ (٢١)ی ئاغستۆس ١٩٢٢ز
شیعری: (بانگ کردستان).
استقبال و خوش آمدی بانگ کردستان.

*** ڕۆژنامەی (ژیانەوە) و (ژیان) و (ژین) و چەند ڕۆژنامەیەکی تر.**

* ڕۆژنامەی ژیانەوە.
ژمارە (١٢)ی ساڵی (١)
(١٤)ی جمادي الآخر ١٣٤٣
(٩)ی کانوونی دووەم ١٩٢٤
شیعری: (گریەی خوسران).

* ڕۆژنامەی ژیانەوە.
ژمارە (١٤)ی ساڵی (١)
(٨)ی ڕەجەب ١٣٤٣
(٢)ی شوباتی ساڵی ١٩٢٥
شیعری: (هاواری وەتەن).

* ڕۆژنامەی ژیانەوە.
ژمارە (١٨)ی ساڵی (١)
(٢٤)ی شوباتی ١٩٢٥
(٢٩)ی ڕەجەب ١٣٤٣
شیعری: (ئەمشەو من لە خەوا...).

* ڕۆژنامەی ژیان.
ژمارە (٤)ی ساڵی (١)
(٢٦)ی ڕەجەب ساڵی (١٣٤٤)هـ
(١١)ی شوباتی ساڵی ١٩٢٦ز
شیعری: (لە کوردستاندا گرانی).

* ڕۆژنامەی ژیان.
ژمارە (٩)ی ساڵی (١)
(٣)ی ڕەمەزان ١٣٤٤
(١٨)ی مارت ١٩٢٦
شیعری (بەمناسەبەتی تەبدیلی ناوی ژیانەوە بۆ ژیان).

* ڕۆژنامەی ژیان.
ژمارە(٤٥)ی ساڵی (١)
(٣)ی جمادي الآخر ١٣٤٥هـ
(٩)ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٦ز
شیعری: (جووت و گا شتێکی چاکە).

* ڕۆژنامەی ژیان.
ژمارە (٤٩)ی ساڵی (١)
(٢١)ی ڕەجەب ١٣٤٥هـ
(٦)ی کانوونی دووەم ١٩٢٦
شیعری (ساڵی ١٩٢٦).

* ڕۆژنامەی ژیان.
ژمارە (٥٠)ی ساڵی (٢)
(٢٣)ی ڕەجەب ١٣٤٥هـ
(٢٧) کانوونی دووەمی ١٩٢٧ز
شیعری: (ئەم ئیجتیماعە بۆ مەهی عیزەت بەراعەتە).

* ڕۆژنامەی ژیان.
ژمارە (٥٩)ی ساڵی (٢)
(٢٤)ی مارت ١٩٢٧
شیعری: (نیسان).

* ڕۆژنامەی ژیان.
ژمارە (٢٤٦)ی ساڵی (٥)
(٢٢)ی موحەڕەم ١٣٤٩هـ
(١٩)ی حوزەیران ١٩٣٠ز
شیعری (بۆ یانەی سەرکەوتن).

* ڕۆژنامەی ژیان.

ژماره (٤٨٣)ی سالی (١١)
(١٣)ی حوزەیران ١٩٣٦ز
شیعری (شینی شێخ عەزیزی برام).

* ڕۆژنامەی ژیان
ژماره (٤٩٣)ی (١١)
(٥)ی جمادي الآخر ١٣٥٥هـ
(٢٢)ی ئاغستۆس ١٩٣٦ز
شیعری: (ڕوحی سەعدی).

* ڕۆژنامەی ژیان.
ژماره (٥٥٣)ی سالی (١٣)
(١٠)ی مارتی ١٩٣٨
(٨)ی موحەڕەمی ١٣٥٧
شیعری (دیاری ژیانە).

* ڕۆژنامەی ژین.
ژماره (٥٥٨)ی سالی (١٤)
(١١)ی موحەڕەم ١٣٥٨هـ
(٢)ی مارتی ١٩٣٩ز
شیعری: (نابینمەوە لێرە یەکێ یار و وەفادار).

* ڕۆژنامەی (ژین)
ژماره (٥٧٢)ی سالی (١٣)
(٢٩)ی حوزەیرانی ١٩٣٩
شیعری: (شێوەی زێوەر).

* ڕۆژنامەی ژین.
ژماره (٦١٧)ی سالی (١٥)
(١٧)ی موحەڕەم ١٣٦٠

(١٣)ی شوبات ١٩٤١
شیعری: (هاوار له دەس مالیه).

* ڕۆژنامەی ژین.
ژماره (٦٢١) سالی (١٥)
(١٥)ی صفر ١٣٦٠هـ
(١٧)ی مارت ١٩٤١ز
شیعری (حەقه ئەمڕۆ بدا تەعنه لەماهو مشتەری و ئەختەر).

* ڕۆژنامەی ژین.
ژماره (٦٢٤)ی سالی (١٥)
(٢١)ی ربیع الأول ١٣٦٠هـ
(١٧)ی نیسان ١٩٤١ز
شیعری: (بەم بەهاره) شیوەنی ئاوڕەحمانی خالۆزای.

* ڕۆژنامەی ژین.
ژماره (٦٦٦)ی سالی (١٦)
(٦)ی ربیع الثاني ١٣٦١هـ
(٢٣)ی نیسان ١٩٤٣ز
شیعری: (دیناری موظفین).

* ڕۆژنامەی ژین.
ژماره (٧٠٠)ی سالی (١٧)
(١٢)ی ربیع الأول ١٣٦٢هـ
(١٨)ی مارت ١٩٤٣ز
شیعری: (کۆچی مەلا ئەفەندی).

* ڕۆژنامەی ژین.
ژماره (٨٢٢)ی سالی (٢٠)
(١١)ی ربیع الثاني ١٣٦٥
شیعری (هیمەتی پیران).

* ڕۆژنامەی ژین.
ژمارە ١٠٢٦ ساڵی ١٩٥٠
شیعری: (شیوەنی برایمی برای).

* ڕۆژنامەی ژین.
ژمارە (١٣٦٥)ی ساڵی (٣٢)
١٩٥٧/١٠/١٧
شیعری: (نابی مونەوەر بەگوڵی یەخەیی چاکەت).

* ڕۆژنامەی ژین.
ژمارە (١٦٨٤)ی ساڵی (٣٧)
١٩٦٢/٧/١٢
شیعری: (ساڵی گوزەشتە)یان (بۆ ساڵی ١٩٢٦).

* ڕۆژنامەی ژین.
ژمارە (١٦٨٨)ی ساڵی (٣٧)
١٩٦٢/٨/٩
شیعری: (ئاوڕێک بۆ دواوە، بۆ ساڵی ١٩٣٤).
لە شێخ نوورییەوە بۆ (گۆران) بەزمانی (جەناب)ی کوڕییەوە.

* ڕۆژنامەی ژین.
ژمارە (١٦٩٧)ی ساڵی (٣٧)
١٩٦٢/١٠/١١
نامەیەکی شیعری لە نێوان «شێخ نووری» و «زێوەر». بەناوی: (ئەی بادی سەبا! پەیکی خەیالاتی ئەدیبان).

* ڕۆژنامەی بروا.
ژمارە (٦٩)ی ساڵی (٣)
ساڵی ١٩٦٢
شیعری (شینی عەزیز).

* ڕۆژنامەی بروا.
ژمارە (٩٠)ی ساڵی (٣)
ساڵی ١٩٦٢
شیعری: (ژیان).

* ڕۆژنامەی ڕاپەڕین.
ژمارە (١٢٧)ی ساڵی (٣)
(١٨)ی شوباتی ١٩٦٧
شیعری: (شیوەنی ئاوڕەحمانی خاڵۆزای) و (دیناری مووەزەف).

* ڕۆژنامەی ژین.
ژمارە (١٦)ی ساڵی (١)
١٩٧١/٤/١
شیعری: (جووت و گا).

* ڕۆژنامەی بیری نوێ.
ژمارە (٢٦)ی ساڵی (١) چوارشەممە ١٩٧٢/١٢/٢٠
نموونەیەک لە شیعری شێخ نووری شێخ ساڵح کە شیعری (نەورۆز)ە.

* ڕۆژنامەی ژین. (ساڵانی حەفتا)
ژمارە (١٠٥)ی ساڵی (٣)
١٩٧٣/٣/٣١
شیعری (نەورۆز).

* بڵاوکراوەی ڕۆشنبیری نوێ. (ڕۆژنامەیەک بوو، بە دە ڕۆژ جارێک لە بەغدا دەردەچوو)
ژمارە (٣٧)
(١١)ی کانوونی دووەمی ١٩٧٥
شیعری (پەچە) و لە هەمان ژمارەدا شیعری: (جووت و گا شتێکی چاکە) بڵاوکراوەتەوە.

*** ئەو گۆڤارانەی شیعری «شێخ نووری»یان تێدا بڵاوکراوەتەوە**

* گۆڤاری پەیژە

ژمارە (١)ی ساڵی (١)

ساڵی ١٩٢٧

خاوەنی مستەفا شەوقی، بەغدا، چاپخانەی فورات.

شیعری (هاواری وەتەن).

* گۆڤاری زاری کرمانجی.

ژمارە (٦)ی ساڵی (١)

(١٧)ی ربیع الثاني ١٣٤٥

ساڵی ١٩٢٧ز

شیعری: (بۆ زاری کرمانجی).

* گۆڤاری زاری کرمانجی.

ژمارە (٨)ی ساڵی (١)

(٢٠)ی شوبات ١٩٢٧

مامەند کەرکووکی وەڵامی شیعری، (بۆ ساڵی ١٩٢٦)ی داوەتەوە.

* گۆڤاری گەلاوێژ.

ژمارە (٥-٦) ساڵی دووەم

مایس و حوزەیران

ساڵی ١٩٤١

شیعری: (پەچە - ڕووپۆش).

* گۆڤاری گەلاوێژ.

ژمارە (٥)ی ساڵی چوارەم

تشرینی دووەمی ١٩٤٣

(ئەحمەد شێخ غەنی «فەوزی») شیعری (شەو)ی کردووە بەپێنج خشتەکی.

* گۆڤاری گەلاوێژ.
ژمارە (٥)ی ساڵی حەوتەم
مایسی ١٩٤٦
شیعری: (چ خۆشە شارەزوور).

* هنا بغداد.
ژمارە (٣)، ساڵی شەشەم
ئەیلوولی ١٩٥٦
صفر ١٣٧٦
ژمارە (١٤٩)ی عەرەبییەکە
شیعری: (شارەزوور).

* گۆڤاری پەیام
ژمارە (٨ - ٩)ی ساڵی هەشتەم
١٩٥٧ شیعری (دڵی من)

* هنا بغداد.
ژمارە (١٧١)ی مانگی تەمووزی ١٩٥٨
شیعری: (شارەزوور تاکو بڵێی جێگەیەکی بەردارە.)

* گۆڤاری نەورۆز.
ژمارە (١)ی ساڵی (١)
ساڵی ١٩٥٩
شیعری: (ژیان) لاپەڕە (٢٥)
شیعری: (نەورۆز) لاپەڕە (٦٠)

* گۆڤاری ڕۆژی نوێ.
ژمارە (٧)ی ساڵی (١)
تشرینی یەکەم ساڵی ١٩٦٠
شیعری: (هێنانەوەی تەرمەکەی شێخ مەحموود).

* گۆڤاری ڕۆژی نوێ.
ژماره (۹)ی ساڵی (۱)
کانوونی یەکەم ۱۹٦۰
شیعری: (بێکەس).

* گۆڤاری ڕزگاری.
ژماره (۲)ی ساڵی (۱)
(۲۷)ی نیسانی ۱۹٦۹
له لاپەڕەی دواوه و له ژێر ناوی (تۆمار) شیعری: (وا مویەدەل بوو...) که لەگەڵ (عەلی کەمال باپیر)ی شاعیر پێکەوه دایانناوه و بڵاوکراوەتەوه.

* گۆڤاری سلێمانی.
ژماره (۱۱)ی ساڵی (۱)
حوزەیرانی ۱۹٦۹
شیعری: (پەچه).

*** ئەو نووسینانەی له بارەی شێخ نووری-یەوه نووسراون**

* ڕۆژنامەی پێشکەوتن
ژماره (۸۳)ی ساڵی (۲)
(۲٤)ی ربیع الأول ۱۳٤۰
نۆڤێمبر ۱۹۲۱
(فائق) ناوێک بەشیعر جوابێکی بۆ جەنابی شێخ نووری نووسیوه.

* ڕۆژنامەی بانگی کوردستان
ژماره (۸)ی ساڵی (۱)
(۷) ی صفر ۱۳٤۱
(۲۹)ی ئەیلوول ۱۹۲۲
بۆ (ئەدیبی موحتەرەم شێخ نووری ئەفەندی) نووسینی (کوردێک).

* ڕۆژنامەی پێشکەوتن

ژماره (٣٨)ی ساڵی (١)
(٣)ی جمادی الأول ١٣٣٩
(١٣) جینیوەری ١٩٢١
شیعرێک لە لایەن (محەمەد ڕەشید)ەوە نووسراوە و بەناوی: (بەیادی سلێمانی نووری).

* ڕۆژنامەی ئومێدی ئیستیقلال
ژمارە (٤)ی ساڵی (١)
(٣٠)ی صفر ١٣٤٢
(١١)ی تشرینی یەکەم ١٩٣٩
شیعرێک کە مامۆستا (ڕەفیق حیلمی) نووسیویەتی بەناوی: (تەربیعی غەزەلی ئەدیبی موحتەرەم جەنابی م. نووری).

* ڕۆژنامەی ژین
ژمارە (٦٥٠)ی ساڵی (١٥)
(٢٩)ی ذو القعدة ١٣٦٠
(١٧)ی کانوونی أول ١٩٤١
وەلامی (محەمەد ڕەمزی - ڕەمزی مەلا مارف) بۆ (هاوار و حەسەب حاڵی شێخ نووری).

* گۆڤاری پێشکەوتن
ژمارە (١)ی ساڵی (١)
شوباتی ١٩٥٨
وتارێکی مامۆستا (ڕەفیق حیلمی) بەناوی: (ئینقیلاب لە شیعری کوردیدا).

* ڕۆژنامەی ژین
ژمارە (١٣٨٤) ساڵی (٣١)
١٩٥٨/٣/٦
گۆشەی شیعر و شاعیرەکانمان
کورتە باسێک و شیعری (بۆ یانەی سەرکەوتن).

* ڕۆژنامەی ژین
ژمارە (١٣٨٢) ساڵی (٣٣)
١٩٥٩/٢/٢٠
پێنج خشتەکی شێخ ئەحمەدی شێخ غەنی کە نازناوی (فەوزی)یە لەسەر شیعری (شەو).

* گۆڤاری بڵێسە
ژمارە (٨)ی ساڵی (١)
مارتی ١٩٦٠
وتارێک بەناوی: (بیرەوەری شاعیری بەناوبانگ شێخ نووری شێخ ساڵح)، بەبۆنەی تێپەڕبوون بەسەر کۆچیا.
(شێخ حەسیب شێخ ئەحمەد).

* ڕۆژنامەی ژین
ژمارە (١٥١٦)ی ساڵی (٣٥)
١٩٦٠/٣/١٠
وتارێک بەناوی: (یادی شاعیری نەمر: شێخ نووری شێخ ساڵح).
مامۆستا (نەجمەددین مەلا).

* ڕۆژنامەی ژین
ژمارە (١٧٠٤)ی ساڵی (٣٧)
١٩٦٢/١١/٢٩
گۆران
هەر ئەو ڕایەی لە دیوانی (بەهەشت و یادگار) نووسیویەتی، وەک خۆی ڕایان گوێزاوە و بڵاویان کردووەتەوە.

* ڕۆژنامەی ژین
ژمارە (١٥٧٩)ی ساڵی (٣٥)
١٩٦٠/١٢/٢٦
وتارێک بەناوی: (یادی شێخ نووری شێخ ساڵح).

ماموستا (نەجمەددین مەلا).

* ڕۆژنامەی برایی
ژمارە (٣٢٢)ی ڕۆژی شەممە
(شیعر و شاعیرەکانمان)،
١٩٦٧/٧/٢٧، محەمەد ڕەسووڵ هاوار

* ڕۆژنامەی ژین
ژمارەی (٢)ی ساڵی (١)
١٩٧٠/١٢/١٧
وتارێک بەناوی (یادی کۆچی «شێخ نووری شێخ ساڵح»).
(س . ع . شادمان).

* ڕۆژنامەی ژین
ژمارە (٣)ی ساڵی (١)
١٩٧٠/١٢/٢٤
وتارێک بەناوی (یادی شاعیری بەنرخ شێخ نووری شێخ ساڵح)
(أ . ب . هەوری).

* گۆڤاری برایەتی
ژمارە (١)ی ساڵی (١) خوولی دووەم
وتارێک بەناوی (پێداچوونەوەیەک بە«دلاوەران»ی دیوانی «بێخود»دا).
نووسینی: محەمەدی مەلا کەریم - ١٩٧٠.

* ڕۆژنامەی برایەتی
ژمارە (٢ - ٣)ی ١٩٧٢/١/٢١ - خوولی چوارەم - پێنجشەممە
(لە بیرەوەری هۆنەری ڕچەشکێنی نەمردا)
ڕەفیق چالاک

* ڕۆژنامەی برایەتی
ژمارە (١٢)ی ١٩٧٢/٨/٢٤

(ئەوەی ئەیزانم لە بارەی هونەرەوە)
نووسینی ڕەفیق چالاک

* ڕۆژنامەی (بیری نوێ)
ژمارە (٦٦)ی ساڵی دووەم
چوارشەممە ١٩٧٣/٩/٢٦
وتارێک لە ژێر ناوی: دیسانەوە لە بارەی پارچە شیعری «دلاوەرانەوە»
نووسینی: محەمەدی مەلا کەریم.

* کتێبی (شیعری کۆن و نوێ)
أ . ب . هەوری
سلێمانی - چاپخانەی کامەرانی - ١٩٧٥
(وێنەی شیعری جوان) نموونەی شیعری شێخ نووری ل٨

* بڵاوکراوەی ڕۆشنبیری نوێ
ژمارە (٣٧)
(١١)ی کانوونی دووەمی ١٩٧٥
(کە دەست کرا بەکوردی نووسین)
نووسینی: (جەمال بابان).

* ڕۆژنامەی بیری نوێ
ژمارە (٢٢١)
١٩٧٦/١٢/٢٥
وتارێک بەناوی: (بیرەوەری شێخ نووری شێخ ساڵح).
لەگەڵ بڵاوکردنەوەی شیعری (شەو).

* گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق «دەستەی کورد»
ژمارە (٧)ی ساڵی ١٩٨٠
(بنەڕەتییەکانی ڕەخنەسازی و هۆنراوەی دێرینی کوردی)
د. کامیل حەسەن عزیز البصیر.

* گۆڤاری بەیان
ژمارە (٧١)، نیسان و مایسی ١٩٨١
وتارێک بەناوی: ( شێخ نووری شێخ ساڵح) و چەند بیروڕا و سەرنجێکی ڕەخنەگرانە.
ئەژی گۆران.

* ڕۆژنامەی پاشکۆی عیراق
ژمارە (٤٤)
تەمووز و ئابی ١٩٨١
(ئەوەی شایانی باسە)
ئامادەکردنی: (ڕەزا حەمە).

* گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق «دەستەی کورد».
بەرگی دەهەم - ١٩٨٣
چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق
بەغدا، ١٩٨٣
(ڕەخنەسازێک و بیردۆزی هۆنراوە)
دکتۆر کامل بەصیر

* جريدة العراق - دوو لاپەڕە کوردییەکەی
ژمارە (٢١٩٧) الاربعاء
(٢٠) نیسان ١٩٨٣
(٧) رجب ١٤٠٢ هجرية - بغداد
لەم پاشکۆی کوردییەدا: وتارێک نووسراوە بەناوی: (شێخ نووری کانیاوی هۆنراوەی لە بارەگای «زانستی»دا تەقییەوە.) نووسینی: غەفووری میرزا کەریم.

* گۆڤاری بەیان
ژمارە (١٠٣)ی کانوونی دووەم ١٩٨٥
شێخ نووری: دەنگی ڕەسەنی شیعر ل٢٠

* ڕۆژنامەی هاوکاری

ژماره ٧٩٣، ١٣/٦/١٩٨٥.
(بۆ پێش چاوخستنی خوێنەران) نووسینی: (محەمەد سەعید سەلیم).

* ڕۆژنامەی هاوکاری
ژمارە ٨٠٨ ٢/١٠/١٩٨٥
وتارێک بەناوی شێخ نووری و دەنگی ڕەسەنی شیعرم خوێندەوە، حوسێن سەید ئیبراهیم سەید عارەب.

* ڕۆژنامەی برایەتی
ژمارە (١٢)،
(ئەوەی ئەیزانم لەبارەی هونەرەوە)، ڕۆژی ٢٤/٨/١٩٧٢، ڕەفیق چالاک.

* ڕۆژنامەی هاوکاری
ژمارە(٧٩٣) لە ١٣/٦/١٩٨٥
بۆ پێش چاوخستنی خوێنەران، محەمەد سەعید سەلیم، لە بارەی وەرگێڕانەکەی کە لە ڕۆژنامەی ژیان لە ساڵی ١٩٣٤دا بڵاوکراوەتەوە.

* ڕۆژنامەی العراق
ژمارە (٣١٨٨)
لە بارەی (دیوانی شێخ نووری شێخ ساڵح)ەوە، معتصم ساڵەیی، دوو لاپەڕە کوردییەکەی چوارشەممان، لە ١٦/٨/١٩٨٦.

* گۆڤاری بەیان
ژمارە (١٢٢)ی ئابی/ ١٩٨٦
وتاری دیسانەوە لە پێناوی دۆزینەوەی خاوەنی ڕاستەقینەی پارچە شیعری (دلاوەران)دا، محەمەدی مەلا کەریم.

* گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ
ژمارە(١١٣)، ساڵی ١٩٨٧
(عەرووز لە هەڵبەستی کوردیدا) عەبدولڕەزاق بیمار.

* گۆڤاری بەیان
ژمارە(١٣٤)

وتارێک بەناوی وەڵامێک ڕێگەی نیازی پاکی گرتووە، ئازاد عەبدولواحید، ئابی ١٩٨٧.

* ڕۆژنامەی هاوکاری
ژمارە(٩١٨)ی ٢٩/١٠/١٩٨٧
ڕازی نێوان شاعیران، مستەفا ساڵح کەریم، شیعری شێخ نووری بە ناوی جەناب بۆ گۆران و وەڵامی گۆران باس دەکات.

* گۆڤاری بەیان
ژمارە( ١٥٠ )، کانوونی یەکەم ١٩٨٨، بەشی یەکەمی بەرگی یەکەمی دیوانی شێخ نووری و چەند سەرنجێک، عەبدولڕەحمان موفتی.

* ڕۆژنامەی هاوکاری
ژمارە(٩٩٣)، شیعری «دلاوەران» هی (شێخ نووری)یە، نووسینی ئەحمەد هەردی، لە ١٩٨٨/٧/٢١.

* ڕۆژنامەی هاوکاری
ژمارە (٩٩٧)، سەرلەنوێ لە بارەی پارچە شیعری «دلاوەران»ەوە، محمدی مەلا کەریم، ١٩٨٨/٨/١١.

* ڕۆژنامەی هاوکاری
ژمارە( ١١٥٥ )، ٢٢/٢/١٩٩٠، ڕاست کردنەوەی هەندێ لە هەڵەکانی دیوانی شێخ نووری شێخ ساڵح، ئازاد عەبدولواحید.

* گۆڤاری کاروان
ژمارە(٨٩)ی ساڵی نۆیەم، ئەیلوول و تشرینی یەکەم ١٩٩٠، دەربارەی دیوانی شێخ نووری شێخ ساڵح، کاکەی فەللاح.

* ڕۆژنامەی هەرێمی کوردستان
شاعیری نوێکاری کورد شێخ نووری شێخ ساڵح، شارەزا، ژمارە(٣٨)، ١٩٩٦/١٢/٢٣.

* گۆڤاری ڕامان
ژمارە( ٤١ )، تۆفیق فیکرەت و شاعیرە نوێخوازەکانی کورد، ئەحمەد تاقانە، ١٩٩٩/١١/٥.

* گۆڤاری ڕامان
ژماره(٤٢)، تۆفیق فیکرەت و شاعیره نوێخوازەکانی کورد، ئەحمەد تاقانە، ١٩٩٩/١٢/٥.
* ڕۆژنامەی ژیان
ژماره (١ - ٨١)
ئامادەکردنی ڕەفیق سالح، لێکۆڵینەوە: سدیق سالح، بەرگی یەکەم، پێشەکییەکەی، سلێمانی ٢٠٠٢.
* پاشکۆی ئەدەب و هونەری کوردستانی نوێ
پێگەی شێخ نووری لە نوێگەری ئەدەبی کوردیدا، ژماره (٣٥٠)،
بەشی یەکەم، لوقمان ڕەووف، ٢٠٠٣/٨/٢٨.
* پاشکۆی ئەدەب و هونەری کوردستانی نوێ
پێگەی شێخ نووری لە نوێگەری ئەدەبی کوردیدا، ژماره(٣٥١)،
بەشی دووەم، لوقمان ڕەووف، ٢٠٠٣/٩/٤.
* پاشکۆی ئەدەب و هونەری کوردستانی نوێ
پێگەی شێخ نووری لە نوێگەری ئەدەبی کوردیدا، ژماره(٣٥٢)،
بەشی سێیەم، لوقمان ڕەووف، ٢٠٠٣/٩/١١.
* پاشکۆی ئەدەب و هونەری کوردستانی نوێ
ژماره(٣٥٣)، پێگەی شێخ نووری لە نوێگەری ئەدەبی کوردیدا،
بەشی چوارەم، لوقمان ڕەووف، ٢٠٠٣/٩/١٨.
* ڕۆژنامەی خەبات
ژماره (٢٣٦٠)، چوارشەممە، ٢٠ی کانوونی یەکەم ٢٠٠٦، ٢٩ی سەرماوەز (٢٧٠٦)ی کوردی. وتارێک بەناوی (لە ساڵڕۆژی کۆچی دوایی شاعیری نوێکەرەوەی شیعری کوردی شێخ نووری شێخ سالح)، کەریم شارەزا. لەم وتارەدا هاتووە و دەڵێ: (کاک ئازاد عەبدولواحید گرنگییەکی زۆری بە شاعیرییەت و شیعرەکانی داوە و لە دوو بەرگی گەورە و گراندا بە چاپی گەیاندوون و مافی ڕەوای خۆی بەو شاعیرە گەورەیە بە تەواوی داوە).
* گۆڤاری ڕامان

ژماره(١١٢)،
بەیادی مامۆستا عەلائەددین سەجادی-یەوە، ئازاد عەبدولواحید، ئەیلوولی ٢٠٠٦.
* ڕۆژنامەی خەبات
ژمارە (٢٤١١) لە ٢٠٠٧/٢/١٦، شێخ نووری شێخ ساڵح لە شیعری (پەچە)
پەچە لەسەر کێشەی ئافرەتان هەڵدەماڵێ،
شاخەوان فەرهاد محەمەد.
* گۆڤاری ڕۆژنامەنووس
بەسەرکردنەوەی دوو ڕۆژنامەنووسی فەرامۆش کراو،
ئازاد عەبدولواحید، ژمارە(١١)، هاوینی ٢٠٠٧.

*** کتێب و نامیلکەکان**

* گۆرانی کوردی
چاپخانەی - بلدیة - لە سلێمانی
لەسەر (ئەمری متەسەڕیف و موفەتیشی ئیداری لەچاپ دراوە)(کە ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ و کاپتن لاین بووە).
ساڵی ١٩٢٥ . شیعری (ئینتیباه) ل٧-١٠

* G.J Edomonds, A Kurdish News Paper "Rozhi- Kurdistan".
"Jornal of the Central Asian Society Vol. XII Part 1.1925. P 85. 86

* گۆرانی
کەریم سەعید.
١٣٤٦ - ١٩٢٨ ل١٤ - ١٩
چاپخانەی فوڕات - بەغدا
(ئینتیباه) و (کەشافەی کوردین ئێمە)

* گۆرانی
کوردی - مەریوانی.
چاپخانەی - أیتام - بەغدا
ساڵی ١٩٣٢

